عنوان : فه رهه نگی ئاوابیه کانی مه هاباد /نووسین وکوکردنه وه ی خالیدوه تمانی :زانکو خه لیفه
به هاوکاری جه لال مه‌حموودزاده
سر شناسه : وطمانی -خالد ۱۳۶۴. خلیفه اقدم -کریم ۱۳۶۵
مشخصات نشر: تهران :همایش دانش ۱۳۸۸
مشخصات ظاهری ۴۰۰ص مصور . جدول . عکس
شابک : ۲-۴۰-۸۲۵۴-۹۶۴-۹۷۸
وضعیت فهرست نویسی : فیپا
یادداشت : کردی
یادداشت : پشت جلد لاتین شده : FARHANGI AWAYIYEKANI MEHABAD
موضوع : مهاباد سیروسیاحت
شناسه افزوده : خلیفه اقدم .عبدالکریم -۱۳۶۵
شناسه افزوده : محمودزاده . جلال
رده بندی کنگره : ۱۳۸۸ ۶ و۳هـ / DSR ۲۱۲۱
رده بندی دیویی : ۹۵۵/۳۳۵۲
شماره کتابشناسی ملی : ۱۹۰۲۳۴۶

نیوی په رتووک : فه‌رهه‌نگی ئاوابیه کانی مه‌هاباد
نووسه ران : هه‌رمان وه‌تمانی و زانکو خه لیفه
پیداچوونه وه : سواره فتووحی
گرافیک : ساسان ئاقایی
تیراژ : ۲۰۰۰دانه
چاپی : یه‌که‌م
چاپخانه : ناسح
لیتوگرافی : ئارمان
شابک : ۲-۴۰-۸۲۵۴-۹۶۴-۹۷۸
نرخ : ۱۰۰۰۰ تمه‌ن

قل سيروا فى الأرض فانظروا كيف بدأ الخلق ثم الله ينشئ النشأة الأخرة إن الله على كل شىء قدير

**(آيه ٢٠سوره عنكبوت)**

**بێژە: گەشتێ لەم سەرزەمینە بدەن و تماشا کەن، چێکرنی چۆن دەس پێکرد، پاشان [هەر] خوا ئافراندنی؛ پاشانیش وەدی دەهێنێ، خودا توانای بە سەر هەموو شتدا هەیە.**

**قورئانی پیرۆز، مامۆستا هەژار موکریانی، ئینتشاراتی ئیحسان و تازە نیگاه، ساڵی ١٣٧٩**

## پێشکەش بە:

ـ گشت فـەرهـەنـگـنووسـان و هـەمـوو ئـەو کـەسـانەی لـەو بەستێنەدا هەنگاویان هەڵێناوەتەوە.

ـ هـەمـوو ئـەو کـەسـانەی بـە لـەخۆبـوردوویی‌یـەوە دەڕواننـە سامانی نەتەوەیی کوردستان تا لە فەوتان و ئاوێتە بـوون بـە فەرهەنگی میللەتانی دیکەوە بیپارێزرێن.

## سپاس و پێزانیین

سپاس و پێزانین بۆ گشت خەڵکی بەئەمەگی ئاواییەکانی شاری مەهاباد بەتایبەت دێهیارییەکان، شووراکانی ئیسلامی ئاوایی، بەساڵاچووان، پیاوان، ژنان، گەنجان و مێرمناڵان کە لە پێکهێنانی ئەم فەرهەنگەدا یارمەتییان داوین.

سپاس بۆ "ئەندازیار جەلال مەحموودزادە" کە بە یارمەتییە بێبڕانەوەکانی لە دژوارترین کاتدا یاریدەدەرمان بووە.

هەروەها ڕێزمان هەیە بۆ ئەو کەسانە کە بەردەوام پێوەندییان دەگەڵ ئێمە هەبووە و لە گشت بوارەکاندا بە هانامانەوە هاتوون:

### ڕێزداران:

١. محەممەد دێموکری، بەرپرسی ئیدارەی کشتوکاڵی شارستانی مەهاباد

٢. عەزیز وەلیانی

٣. زانیار قادرزادە

٤. ڕەحیم سوڵتانی

٥. حوسێن کوردە، دێهیاری ئاوایی حەوڵاکوردە

٦. کاڵێ گولابیئازەر (شەویار)

٧. هەوار خزرزادە

٨. پەخشان قەلەندەری

٩. خەیاڵ عەبدوڵڵازادە

١٠. وێنەگری زاگرۆس (خالید ڕەحمانی و لوقمان ڕەحمانی)

١١. ئەنوەر مەلامحەممەدی

## هەر گوندێکی کوردستان گەنجێکە

ڕوون و ئاشکرایە گوند و دێهاتەکانی کوردستان وەکوو خەزێنەیەکەن بۆ زمانی پاراو، وشەی ڕەسەن، دابونەریتی جوان، جوامێری، ئەخلاق و ڕەوشتی بەرز، بیری بەرزی نەتەوەیی و خۆشەویستیی نیشتمان، خاک و وەتەن، مۆسیقا و بەستە، قام، بەیت، حەیران، لاوک و... گشت بابەتێکی بەرز و تەرزی کوردی. ناساندن و پاراستنی ناو، دابونەریت، کەلتوور، زاراوە، دیالێکتی هەر مەڵبەندێک و ناوچەیەکی کوردستان، ئەرکێکی گرینگی مێژوویی هەموو خوێندەوار و تاکێکی دڵسۆزی کوردە. دیارە مەرج و کەرەسەی باش بەڕێوەبردنی ئەم ئەرکە گرینگە، تەنیا خوێندنی باڵا و بڕوانامەی ئاکادێمیایی نییە بەڵکوو ماکەی سەرەکی بۆ ئەم ڕێگا پیرۆزە، وردبینی، ئەوین و سووزێکی تایبەت و بێبڕانەوەیە. بەتایبەت ئێستا کە بە ئاوێتەبوونی بەشێکی بەرچاو لە فەرهەنگەکان و سڕینەوەی سنوورە دەسکردەکان و بەربڵاوی ڕاگەیەنەرە گشتییەکان، لە لایەکی دیکەوە بێدەرەتانی کەلتوور و کەلەپووری نەتەوەیەکی وەکوو کورد، زاڵبوونی کەلتووری نەتەوە سەردەستەکان و زمانە سەرپەڕەکان و فەرهەنگە زاڵ و جەمسەرەکان(** •های فرهنگی)، هەروەها ئێشتیای لە ڕادە بەدەریان کە کۆمپانیا و زلهێزەکانی ئابووری و سیاسییان لە پشتە و بە دیزاین و ستایلێکی جوان و سرنجڕاکێش کاڵاکانی کەلتووری خۆیان بۆ ئێمە ڕەوانە دەکەن، کەلتوورە بێ سەرپەناکان هەرچی زیاتر کەتوونەتە مەترسییەوە. ئەگەر بمانهەوێ کاکڵی کلتوور و فەرهەنگی کوردی لەم تۆفانەدا بە ساغی دەرچێ، دەبێ بیانپارێزتن و لێکدانەوە و وەرددانەوەیان بۆ بکرێ، هەر کەس چی لە دەست دێ خۆی لێ نەبوێرێ. بێگومان ئەگەر ئەمڕۆ مێژوو، فەرهەنگ و دابونەریتمان بە نەوەکانی ئێستا و داهاتووی کورد نەناسێنین، سبەینێ دەنگی پەکووپەکوومان بەرز دەبێتەوە و نەوەکانی داهاتوومان هیچ ئارشیو، فیلم، دەق و دیکۆمێنتێکیان لە بەردەستدا نابێ تا خۆیانی پێ بخوێننەوە و چارەنووس و سەربردەی خۆیان بزانن.

ئەم کتێبە کە بەشێکی بەرچاوی لە فەرهەنگ، دابونەریت، مێژوو و ناوی گەورەمرۆڤانی ناوچە و مەڵبەندێکی تایبەتی لە خۆ گرتووە، ئەو ئاوات و تاسەیە بوو کە خەونم پێوە دەدەی. ئەو کات کە بەرپرسی ئیدارەی کشتوکاڵی مەهاباد و پیرانشار بووم، دەچوومە زۆربەی گوندەکانی ناوچە و خەڵکەکەم دەدین و دەگەڵیان دەدوام ـ لە دیوی دەوام و سەردانەکانی ڕۆژانەم بۆ لادێیەکان ـ هەزاران وشەی ڕەسەنم دەبیستن، دابی عەنتیکەم دەدیتن، قسەی خۆش، فەرهەنگی تایبەت، دەنگخۆشی نەناسراو، تێکۆشەری بێ ناونیشان، شاعیری بەزەوق و بێ دیوان، پیری بەیتەوان، لاوی پڕ جەوهەر، شێرەژن و پیرێژنی حەکیم، مەلا و فەلای بەزیبکوزاکۆن و ... . هەر بۆیە بەردەوام خولیای ئەو خەون و ئاواتە بووم کە بگاتە ئەنجام و وەدی بێ و ئەم سامانە فیکری و ئابوورییانە و هتد بناسرێن و تۆمار بکرێن.

هاوینی ١٣٨٧ی هەتاوی تووشی دوو لاوی بەهەست هاتم، کاک زانکۆ و کاک هەرمان، دیار بوو ئەوانیش لەمێژ بوو خولیای ئەم ئاواتە بوون و بەشێکی ئەو کارەیان ئازایانە ڕاپەڕاندبوو. بە بیستنی ئەم هەواڵە ئۆخژنم گەیشتێ و شاگەشکە بووم، لەو نێوەدا مابۆوە ئەرکی من! تەنیا کاری من ناساندن، ئاسانکاری، هاندان و تەیار کردنی ئەم لاوانە بوو بۆ بڕینی ئەم ڕێگا پڕ کەندولەندە. لێرەدا بە ئەرکی خۆمی دەزانم پڕ بە دڵ دەستی ماندووی ئەم دوو لاوە ژیر و تێکۆشەرە بکوشم. هەروەها بە بۆنەی هاریکاری زۆربەی ئیدارەکانی شاری مەهاباد و چەند ئیدارەیەکی ورمێ و لە ئیختیارنانی زانیارییەکانی پێویست لەو بوارەوەدا و بۆ ڕاپەڕاندنی ئەو هەنگاوە، پڕ بە دڵ سپاسی ئەوانیش بکەم. سپاسی خەڵک بە گشتی، مامۆستایان، هونەرمەندان، شووڕا، دێهیارەکان، شارەزایان و خاوەنڕایان لە بەستێنی مێژوودا و بەگشتی سپاسی هەموو ئەو کەسانە دەکەم کە لەو بوارەدا ماندوویینەناسانە هەنگاویان هەڵێناوەتەوە.

"جەواهێر لەعل نەهرۆ"دەڵێ: گەلێک شارەزای مێژووی خۆی نەبێ، لە داهاتوودا سەرکەوتوو نابێ و ڕەنگە هەڵەوپەڵەکانی ڕابردووی دووپات کاتەوە. بەختەوەرم کە وەک نوێنەری شاری مەهاباد لە پارڵەمانی هەشتەمی ئێران، بارتەقای دەسەڵات و تواناییەکانی خۆم، وێڕای یارمەتی و پشتگیری مادی و فیکری لە گۆڤار و ڕۆژنامەنووسان؛ سەدان هەڵوێست، لێدوان، نامە، گەلاڵە و ڕەخنەی سیاسی، فەرهەنگیم بۆ دەوڵەمەند کردنی هەرچی زیاتری کەلتووری کورد و پێداگری لەسەر مافی کورد هەبووە. هیوادارم لە یارمەتی بۆ ڕاپەڕاندنی ئەم کتێبەشدا، هەنگاوێکی بچووکم لە ڕێی خزمەت بە میللەت و فەرهەنگێکی ئەئاوا مەزن و پیرۆزدا هەڵێنابێتەوە.

**جەلال مەحموودزادە**

**نوێنەری خەڵکی مەهاباد لە هەشتەمین خولی پارڵەمانی ئێران**

## پێویستییەکی حاشاهەڵنەگر

بە تێفکرین لە کۆمەڵگاکان هەر لە سەرەتاوە تا ئێستا، بە یەقین بەم دەرئەنجامە دەگەین کە دامەزران و چەقبەستنیان لە هەر شوێنێک و بە هەر شێوەیەک شوێن لە هەندێ فاکتەر و سوورگە وەردەگرێ تا مانەوەی خۆیانی پێ مسۆگەر کەن و شیاوی ئەوە بن کە بە کۆمەڵگای ئینسانی ناوزەد بکرێن. دێ کە فەزایەکی جۆگرافیاییە، لە چەند بنەماڵەیەک پێک هاتووە کە خاوەنی جۆرێک هەست، هۆگرایەتی و سۆزی هاوبەش سەبارەت بە یەکترن و ژیانیان لە رێی کەلک وەرگرتن لە زەوی و ئاژەڵ و هتد دابین دەبێ. ڕوون و ئاشکرایە کە پێناسە کردن و ناساندنی کۆمەڵگا ئینسانییەکان بەتایبەت ئاوایی و لادێیەکان بەبێ ڕەچاوکردنی ئەم پێناسەگەلە و هەروەها گرتنی رێژەیەکی چڕ و پوخت لە بوارەکانی تردا، ئەگەر کردەوەیەکی نادروست و هەڵە نەبێ بێ شک ناکارامە و نەزۆکە. کە وابێ ناسینی بنەما سترەکتۆرییەکانی (ساختار) کۆمەڵگا ئینسانییەکان بەشێکی هەرە گرینگە بۆ پێداچوونەوە و تاوتوێ کردنی ڕابردوو و مێژووی بەدیهاتنیان. دیارە ئەوەش جگە بە لێکۆڵینەوە، ماندوویەتی، دڵسۆزی و دەروەست بوونی کەسانی ژیر، دڵسۆز، لێهاتوو و خاوەن ئەزموون پێک نایە. ئەگەر بە زێدەڕەوی نەزاندرێ ڕەنگە بتوانم بڵێم گرینگترین و سەرەکیترین بنەمای ژیانی کۆمەڵایەتی مرۆڤ ئەوەیە کە مرۆڤ لە لایەکەوە گشت لایەنەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی و کۆمەڵایەتی بوونی ژیانی خوی بناسێ، ئەوەش بەرهەم و لێکەوتەی ئەوەیە کە ئەو جیهانەی مرۆڤ تێدا دەژی جیهانێکی بەساڵاچووە و گەلێ ڕووداوی سەیر و سەمەرەی بە خۆیەوە دیوە و هەر یەکەی بە شێوەیەکیش ئاسەواری خۆی دەرخستووە. لە لایەکی تریشەوە هەر ئەوە مرۆڤی هان داوە کە بیر لە بارودۆخی ژیانی خۆی بکاتەوە و لانیکەم لەم کاناڵەوە بەر بە بێشوناسبوون و بە کۆمەڵگا بوون و بێ پێناسە بوونی خۆی بگرێ، بەڵام ئەگەر بە دیدێکی سەلبی یا مەیلەو ڕەشبینییەوە بڕوانین، ڕەنگە بەو ئاکامە بگەین کە بە هۆی پڕ پێچ و پەنا بوونی چییەتی (ماهیت) و شوناسی مرۆڤ و لێکەوتەکانی ئەم خەسڵەتانەی مرۆڤ؛ ڕەنگە مرۆڤ بە هەر هۆیەک نەیتوانیبێ خۆی، خەسڵەت و کردەوەکانی و مەڵبەندی ژیانی وەک واقیع یا حەقیقەتێک بە تەواوی بناسێ یا تاوتوێی بکا و پێناسەی بکا. ئەوەی کە هزر، ئەندێشە و بیرۆکەی مرۆڤ لە سەرەتای دامەزراندنی کۆمەڵگا کە نموودی پتر و بەر لە هەموو شتێک لە دامەزراندنی لادێدا دیارە، ڕەنگە بەرهەمی ئەم بۆچوونەی مرۆڤ سەبارەت بە خۆی بێ کە هەمیشە خۆی وەک سەرسوڕهێنترین بوونەوەر و تەنانەت پرسیاری جیهان هێناوەتە ئاراوە و خۆی پێ ناساندووە و لاشی وایە پێشبینی نەناساندن و نەناسرانی لە داهاتوودا بە هیچ کەس ناکرێ. هەر ئەوەش هانی داوە کە لە چوار قوڕنەی ئەم جیهانەدا جێگایەک بۆ خۆی بدۆزێتەوە تا هەم سەرقاڵی چارەسەر کردنی وردە وردەی ئەم پرسیارە گەورە و مەزنەی خلقەت بێ لە کاناڵی ژیان و تایبەتمەندییەکانییەوە هەم بە بەهانەی ئەم ژیانە تێیدا بحاوێتەوە. ئیتر ئەم جێگا و شوێنە دەتوانێ لادێ بێ یا خود شار و شارۆچکە و هتد کە بە هەر حاڵ ڕەمزەکانی ژیان و مانەوەی تێدا دیارە کە هەرمانە.

بە هەر حاڵ سەرەڕای هەمووی ئەو بابەتانەی ئاماژەم پێکردن دان بەوەشدا بێنین کە مرۆڤ خۆی لە هەر کام لەو شوێن و مەڵبەندانەدا دۆزییەوە هاوکات بە شێوەیەکی زاتی، پێویستی بە رێکوپێکی و دیسیپلین هەیە و دەبێ ئەرکی سازماندان، کۆ کردنەوە، ئیدارە کردن و چەقبەستنی (متمرکز کردن) ژیانی کۆمەڵایەتی خۆی وە ئەستۆ بگرێ. دیارە بە پێی خەسڵەتەکان و بەرفرەوانی ئەم کۆمەڵگایەی مرۆڤ بۆ ژیان هەڵیدەبژێرێ، دەبێ لەگەڵ شێوەی ژیانیشی یەک لا بێتەوە تا لانیکەم بە تێگەیشتنێکی ڕێژەیی (بلوغ نسبی) لە بارەی خۆی و شوێنی ژیانی بگا. ناسین، ڕاڤە کردن، هەڵسەنگاندن و پێداچوونەوە بە مەکۆی ژیانی مرۆڤ، بەتایبەت لادێ، پێویستی بە هەندێ ڕێژە و ئەژمارەوە هەیە وەکوو وێنە و دیمەنی گوند، ناساندنی هەمەلایەنەی گوند، فۆلکلۆر بە هەموو شاخە و لایەنەکانییەوە (بەیت، حەیران، لاوک و...) و شێوەی کشتوکاڵ، ئاژەڵداری، ئەژماری کەسانی نیشتەجێ، کەسایەتییە گرینگەکان و بە گشتی هەموو ئەو کەسانەی بە هەر شێوەیەک مێژووی گەل و گوندیان خاوەن ناسنامە کردووە کە هەر کام لە لایەنێکی تایبەتەوە دەڕوانن؛ ئەوەی کە ئەم ڕێژە و ئەژمارەی لەم کتێبەدا هاتووە چەندە لە وڵاتانی تردا و بە چ نییەتێکەوە کراوە ڕەنگە

زۆری پێوەندی بە ئێمەوە نەبێ، بەڵام ئەوەی دیارە ئەوەیە کە لە نێو ئێمە و کۆمەڵگای کوردەواریدا بە دەگمەن هەڵکەوتوون کەسانێک کە بەشێکی زۆر لە کات و تەمەنی خۆیانیان بۆ تەرخان کردبێ تا بە جۆرێک بتوانن وڵامدەرەوەی ڕەنج و تێکۆشانی ئاوایینشینەکان بن یا لانیکەم لە بیر نەچوونەوەیان بسەلمێنن، ئەوەش ڕەنگە دوو لایەن بگرێتەوە: لە لایەکەوە بە شایەتی مێژوو و ئەزموونەکان، ئێمەی کورد لە زۆر بواراندا تەنیا بە چاوی کەسانی تر لە شوناس و پێناسەی خۆمان ڕوانیوە و هەر ئەوەش بواری کەمتەرخەمییەکی گشتی لە نێو ئێمەدا پێکهێناوە کە دەرئەنجامەکەی خۆ بە دەروەست و بەرپرس نەزانینمان بووە لە حاستی مێژوو، کەلتوور، کەلەپوورمان و هتد. لە لایەکی ترەوە ئەگەر بوار هەبێ و بمانهەوێ شانەی ئەم نەهامەتییە لە سەری شوێن یا کەسانێکی تردا بشکێنین، بێ گومان ئەوە حکوومەتەکان بوونە کە تا ئێستا بە هۆی دانەمەزراندنی بنکە و بریکارە فەرمییەکانی پێوەندیدار بە لادێ لە وڵاتدا، ڕاستەوخۆ بەریان بە سەرهەڵدان و بەرجەستە بوونی پوتانسیەلە فەرهەنگی، ئابووری و... ئاوایییەکان گرتووە.

بە هەر حاڵ من بەش بە حاڵی خۆم هێشتا هیچ کتێبێکی ئاوا بەو شێوە چڕ و پڕ و هەمەلایەنەم لەسەر ئاوایییەکان نەدیتووە، هەڵبەت مەبەستم ئەوە نییە بڵێم هێشتا کارێکی ئاوا لەو بوارەدا نەکراوە و ئەم کتێبە تەواو لایەن، زەرفییەت و توانایی ئاوایییەکانی مەهابادی دەرخستووە، بەڵام "فەرهەنگی ئاوایییەکانی مەهاباد" تا ڕادەیەکی زۆر ئەو تواناییەی هەیە بەشێکی بەرچاو لە پێداویستییەکانی خوێنەر دابین بکا و دەکرێ بڵێین کتێبی بەم شێوە، بۆ ئێستای کورد، پێویستییەکی حاشاهەڵنەگرە. با ئەم بەرهەمە دەسپێک و ئیستارتێک بێ بۆ درێژەدانی هەنگاوەکان لەم بەستێنانەدا لە لایەن کەسانێکەوە کە خۆیان بە دڵسۆز و بەرپرسی گەل دەزانن.

**ئەو کەسانەی گوێ لە قسان (بیروبۆچوون) ڕادەدێرن و بە شوێن چاکتریاندا دەچن، ئەوان خودا ڕێی بەرەو خۆی نیشان داون؛ ئەوان خاوەن ئاوەزن. (ئایەتی ١٨ سوورەتی زومەر)**

**((فالله خیر حافظا و هو ارحم الراحمین))**

**عەبدولقادر نیازی**

## چرایەکی پرشەنگداری تر

به ناوی بەرزەناو

دەڵێن شتێکی نەنووسرابێتەوە، ناشخوێندرێتەوە! ئەوە ڕاستە و ئەو بەشانەی لەسەر لاپەڕەکان تۆمار کران، ئەو بەشە بەختەوەرانەن کە لە مەترسی نەمان و فەوتان ڕزگارییان هاتووە.

لە ڕاستیدا گشت بەرهەم و نووسراوەکانی تا ئێستەمان، سەرمایەی فەرهەنگیی ئێمەن و ئەوانە نەدەخولقان مەگەر بە تێکۆشانی بێبڕانەوەی تاقمێکی دڵسۆز کە بەبێ هیچ چاوەڕوانییەک، ژیرانە قۆڵی هیممەتیان هەڵماڵیوە و دەگەڵ هەموو گرفتێک ئەم ئەرکانەیان ڕاپەڕاندووە. ئێستا دوو گەنجی ژیر و دڵسۆزی تر "زانکۆ خەلیفە" و "هەرمان وەتمانی" هاتوون تا بەردەوام دەوری خۆیان بۆ نەپسانەوەی ئەم کاروانە بگێڕن و بە بەرهەمێکی پێویست و سرنجڕاکێشی وەکوو "فەرهەنگی ئاواییەکانی مەهاباد" چاوی ئێمەیان ڕوون کردووەتەوە. ئەوەی لەم بەرهەمەدا زۆر گرینگە ئەوەیە کە نووسەرانی ئەو بەشە، دێ بە دێ و گوند بە گوند گەڕاون و هەموو شت بە پێی ئامار و ئەرقام تا ئەو جێگەیەی بۆیان لواوە ناونیشانی هەموو ئەو کەسایەتییە ئەدەبی و فەرهەنگییانەشیان بە نووسەر و شاعیر و دەنگخۆشەوە هێناوەتەوە و بۆتە چرایەکی پرشەنگداری تر بۆ ڕووناک داگیرساندنی ناوچەی نەنووسراوەی ئێمە و ڕێ خۆشکەرە بۆ ئەوەی نووسەرانی تر لە بەشەکانی تر بە کۆ کردنەوەی ئەم زانیارانە لە هەر ناوچەیەک، پازێلی ئەم پێناسەیە تێک خەنەوە و بەم چەشنە قەوارەی کوردستان دارێژنەوە.

دەگەڵ وەی کە ئەم کارە نەپرژاوەتە سەر تەواوی کەلێن و قوژبنەکانی ناساندنی "فەرهەنگی ئاواییەکان"، بەڵام بەشێکی گرینگە لە بە ئەنجام گەیاندنی پرۆسەی درێژخایەنی ناساندنی کەلتوور و پێناسەی یەک نەتەوە.

ئەگەر مامۆستا "هەژار" بە هەنبانەبۆرینە وشەکانی لە فەوتان ڕزگار کرد و وەڵامی ئەم پرسیارە گرینگەی داوە کە چ مانایەکیان هەیە، مامۆستا "ئەحمەد قازی" لە بواری ڕێنووسی زمانی کوردی هەنگاوی هەڵگرت، کاک "ئەحمەد بەحری" و کاک "عەزیز وەلیانی" بە خڕ کردنەوەی بەیتە کوردییەکان و کاک "سەلاح پایانیانی" فەرهەنگی زارەکی موکریانیان تۆمار کرد، ئەم بەرهەمەش دەگەڵ وەڵامی ئەم پرسیارانە ڕووبەڕوومان دەکاتەوە کە ئەم وشە، ڕێنووس، بەیتوباو، پەند و مەسەلانە لە کام گوند و ئاوایی و ناوچەیەکدا باون، دانیشتووانی ئەم گوندانە چەند کەسن؟ چەند کەس خوێندەوار و نەخوێندەوارن؟ چەند هێکتار زەوی بۆ کشتوکاڵ هەیە، چەندی دێمە، چەندی بەراوە و...؟ هیوادارم ئەم بەستێنە گرینگە بەردەوام هۆگرانی تر بۆ لای خۆی ڕاکێشی و ڕۆژ لە دوای ڕۆژ زیاتر پەرتووکخانەی کوردی پێ برازێتەوە.

**مریەم قازی**

**ئەندامی لێژنەی پێکهێنەری ئەنجومەنی ئەدەبیی مەهاباد**

# لە بری پێشەکی

پێشینیان کوتوویانە "لە کانییەک ئاوت خواردەوە بەردی تێماوێ"، ڕەنگە جارێکی دیکە هەر بۆخۆت بێیەوە سەر ئەم کانییە یان ڕێبوارێکی دیکە تێرتێر ئاوی لێ بخواتەوە.
خوای گەورە لە سوورەتی الانبیاء ئایەتی سیدا دەفەرموێ: "هەرچی زیندەوەرە لە "ئاو"ێمان خوڵقاندووە". بۆیە دەڵێن ئاو، ئاوەدانی دێنێ، بەبێ شک هەر وایە. شوێنی وشکارۆ ئاوەدان نابێتەوە و ئاسەواری ژیانیشی بە دەگمەن تێدا دەدۆزییەوە. هەر بە چاو پێداخشاندنێک بە سەر خەریتەی جوگرافیایی جیهان، بۆمان ڕوون دەبێتەوە ئەو ناوچانەی ئاوی خواردنەوەیان زیاتر لێ وەدەست دەکەوێ و لە درێژایی ساڵێدا بارانی زیاتریان لێ دەبارێ خەڵکێکی زیاتریشی تێدا نیشتەجێیە. واتا مرۆڤ هەر لە یەکەم قۆناغەکان و دەسپێکی ژیانی هاوبەشییەوە، ئەو شوێنانەی لێی دامەزراوە هەر پەنا ئاو و لێواری ئەو سەرینچاوانە بووە.
سازمانی خاروبار و وەرزێری (F A O)، ساڵی ١٩٤٩ی زایینی، لێکۆڵینەوەیەکی لە سەر "پێداویستییەکانی ئاسایشی ئاوایی" بڵاو کردەوە کە هەنگاوێک بوو بۆ تۆژینەوەی چییەتی (ماهیت) ئاسایشی ئاوایی و هۆکارەکانی کە تێیدا ڕەنگدانەوەیان هەیە و مەرجەکانی بایەخ پێدان بەم بابەتە.
سازمانی خاروبار و وەرزێریی نەتەوە یەکگرتوویەکان هەر لە ساڵی ١٩٥٣ی زایینییەوە بەو ئامانجەی کەسانێک سەبارەت بە لێکۆڵینەوەی چۆنییەتی ئابووریی ناوچەکانی کوێستانی پێ بگەیەنێ، هاوکاری خۆی لەگەڵ وڵاتانی ئۆتریش، فەرانسە، ئاڵمان، سویس، یوگسلاوی دەست پێکردەوە.
لە وڵاتانی پاشکەتوو و گەشەنەسەندوو کەمتر بایەخ بە توێژینەوە و لێکۆڵینەوە دەدرێ و تەنانەت هیچ پلانێکیشیان بۆ نییە. تاوتووێ کردنی کۆمەڵگایی، بە دوو دەستە دابەش دەبن: ١) چەمکیانە ٢) گشتی یان هەمەلایەنە. لە تاوتووێ کردنی چەمکیانەدا، توێژینەوە لەسەر لایەنەکانی تایبەتی دەکرێ، بەڵام لە تاوتوێکردنەکانی گشتیدا، ڕوانگەکان بەربڵاوترن و زیاتر بەها دەدەن بە لایەنەکان و بارودۆخی کۆمەڵگایەکی دیاریکراو دەخەنە ژێر باس و لێکۆڵینەوە.
ئەوەی کە ئاوایی چییە و بە چ شوێنێک دەڵێن ئاوایی، خۆی ڕەنگە هەوێرێک بێ ئاو زۆر هەڵگرێ و لە چەند ڕوانگەی جیاوازەوە دەتوانین تێڕوانینمان لە سەری هەبێ: لە دابەشکردنەکانی وڵاتی ئێراندا ئاوایی یان دێ بچووکترین یەکە و پێگەی نیشتەجێبوون و کۆمەڵایەتی — ڕامیارییە. ئێران بە سەر چەندین پارێزگادا و هەر پارێزگایەش خۆی بە سەر چەندین شارستان و هەر شارستانەش بە سەر چەندین بەخش و هەر بەخشەی بە سەر چەندین شار و لادێدا دابەش دەبێ. جێگای ئاماژەیە دێهستانیش بە کۆی چەند ئاواییەک دەڵێن کە یەکێک لە ئاواییەکان بە لەبەر چاو گرتنی هێندێک تایبەتمەندی وەک ناوەندی ئەو چەند ئاواییە واتا "دێهستان" دیاری دەکرێ. ئاوایی شوێنێکە کە دانیشتووانی بە پێی ئەو سۆز، ئەوین و هۆگرییەی بە یەکیانەوە هەیە لە دەوری یەک کۆیان دەکاتەوە و ژیانی ڕۆژانەیان بە هەرەوەز و دەستەواو و هاودڵی تێپەڕ دەبێ.
داهاتی زۆربەی دانیشتووانی ئاواییەکانی مەهاباد بەرهەمەکانی پێوەند بە کشتوکاڵ، ئاژەڵداری و باغدارییە.[1] دانیشتووانی ئاواییەکانی بەشی باشووری مەهاباد کە لە گەورکایەتی و بەشێک لە مەنگوڕایەتی هەڵکەوتووە، بە هۆی بارودۆخی تایبەتی ناوچەکە و کوێستانی بوونی ئەم شوێنانە، زیاتر سەرقاڵی ئاژەڵدارین. کار و پیشەی دانیشتووانی ئاواییەکانی دیکەی ئەم شارە کە ناوچەی مەنگوڕایەتی، محاڵ و شارەوێران دەگرێتەوە، بە شێوەیەکی بەرچاو وەرزێری و ئاژەڵدارییە، هەروەها بەشێکی بەرچاو لە داهاتی دەشتی شارەوێرانی مەهاباد باغدارییە.
لێرەدا پێویستە سەبارەت بە شێواز و چۆنیەتی کۆ کردنەوەی زانیارییەکان بۆ نووسینی ئەم فەرهەنگەی بەردەستتان بدوێین. هەموو ئەو ئاواییانەی کە ناویان هاتووە سەردانمان کردوون و ڕاستەوخۆ دەگەڵ دانیشتووانی ئاواییەکان سەبارەت بە مێژوو، فۆلکلۆر، ناوی چیا، کانیاو و هتد دوواوین. بۆ وەرگرتنی ئەو زانیارییانە چەند شێوازمان ڕەچاو کردوون، وەکوو: بڵاوکردنەوەی پرسیارنامە لە نێو خەڵکەکەدا، دیتنی هێندێک شوێن، وێنە و فیلم

1. وەرزێری و ئاژەڵداری و سازکردنی یەکەم خانووبەرکانی ژیان لە ئێران نزیک بە یەکسەد سەدە لەوەی پێش دەستی پێکردووە.
کۆنترین شێوەی ئاودێری لە ئێران کەلک وەرگرتن بووە لە سەرینچاوە و ڕووبارەکان. زۆربەی سەرچاوە و کانیاوەکان لە داوێنی کێو و بەرزاییەکان هەڵکەوتوون، هەر بۆیە ئەو ئاوانە بە سانایی شۆڕ دەبوونەوە و نەچوونەوە نێو زەوییەکان و خەڵکەکە زیاتر لە پەنا ئەو کانیاوانەدا دەژیان.

هەڵگرتنەوە و توێژینە لە سەر ئەو زانیارییانە. ئەو کەسانەی لە ئاواییەکان لەو بوارەدا پرسیاریان لێدەکرا بریتی بوون لە: بەساڵاچووەکانی ئاوایی چ ژن چ پیاو کە زانیارییەکی باشیان سەبارەت بە ڕابردوو و دۆخی هەنووکەی ئاوایی هەبوو، شووڕای ئاوایی، دێهیار، کوێخا و تەنانەت ئەو کەسانەی خوێندەواری ئاکادێمیایی‌یان هەبوو.

بۆ وەدەستهێنانی ئامار و ئەژمارەکانیش سەردانی بەڕێوەبەرایەتی و ئۆرگانەکانی دەوڵەتیمان دەکرد کە بە خۆشییەوە و بە سپاسەوە ئەوپەڕی هاوکارییان لەگەڵ دەکردین. شایانی باسە جیا لەم ١٩٦ گوندە ئاوەدانەی شاری مەهاباد، ئەو گوندانەی کە لە ماوەی چەند ساڵی ڕابردوودا لەم شارە ئەستێنراونەوە و ئێستاش هەر کێشەیان لە سەرە و دەبێ توێژینەوەیان لە سەر بکرێ، بەڵام بەداخەوە بە هۆی هێندێک کێشە و چوارچێوەی یاسایی ئەم دەرفەتەمان بۆ نەڕەخسا.

ئەم فەرهەنگە حەوت بەش لە خۆ دەگرێ و لە هەر بەشێکدا لایەنە جۆراوجۆرەکان وەک کورتەمێژوویەکی شاری مەهاباد، ناسینی ئاواییەکان، دابونەریتەکان، ژیاننامەی کەسایەتییە بەرچاوەکانی ئاوایی، شایی و شین، هێندێک ئامار و ئەژمار و فۆتۆگراف هاتوونە بەرباس و لێکۆڵینەوە و دیتن.

لە ڕەوتی کۆکردنەوە و نووسینەوە و تۆمار کردنی ئەم زانیارییانەدا بە هەموو توانامانەوە تێکۆشاوین تووشی هەڵە نەبین، نکۆڵی لەوە ناکرێ کە مرۆڤ هەڵە دەکا و هیوادارین ئێوەش هەڵەکانمان لە بێ‌ئەزموونیمان بزانن و دڵخۆشین بەوەی هەڵەکانمان بۆ ڕاست بکەنەوە.

لە کۆتایی‌دا هیوادارین لە داهاتوویەکی نیزیکدا فەرهەنگی ئاواییەکانی گشت شارەکانی کوردستان بنووسرێنەوە و بۆ هەتاهەتایە ناوی مێژوویی و ڕاستەقینەی گوند، چیا، ڕووبار و کانیاوەکانی کوردستان لە سەر لاپەڕەی مێژوو تۆمار بکرێن و چی دی گۆڕانیان بە سەردا نەیە[1].

**هەرمان وەتمانی، زانکۆ خەلیفە**

**مەهاباد**

# پێرست

# کورتەمێژوویەکی شاری مەهاباد

## بەشی یەکەم

کورتەمێژوویەکی شاری مەهاباد، دوو نەخشەی شاری مەهاباد لە دوو سەردەمدا، چوار ئاسەواری گرینگی مێژوویی لە ئاوایی‌یەکان، چەند عەشیرەت و دوو ناوچەی گرینگی مەهاباد

## کورتەمێژوویەکی شاری مەهاباد

ئازەربایجانی ڕۆژاوا بە پانتایی نزیک بە ٣٧،٠٥٩ کیلۆمیتری چوارگۆشە لە باکووری ڕۆژاوای ئێران لە نێوان ٣٥ پلە و ٥٨ خولەک تا ٣٩ پلە و ٤٧ خولەکی درێژایی باکووری و ٤٤ پلە و ١٤ خولەکی تا ٤٧ پلە و ١٩ خولەکی پانایی ڕۆژهەڵات لە نیسفوننەهاری گرینویچ هەڵکەوتووە. لە لای باکوورەوە دەگەڵ وڵاتانی ئازەربایجان و تورکیا، لە ڕۆژهەڵاتەوە دەگەل پارێزگاکانی ئازەربایجانی ڕۆژهەڵات و زەنجان و لە ڕۆژاواشەوە دەگەڵ وڵاتانی تورکیا و باشووری کوردستان هاوسنوورە. پارێزگای کوردستان، لە باشووری ئازەربایجانی ڕۆژاوا هەڵکەوتووە. بەرزایی پارێزگای ورمێ لە ڕووکەشی زەریاکان ١٣٤٠ میترە.

شاری مەهاباد بە پانتایی ٢٥٩١،٥٨٣ کیلۆمیتری چوارگۆشە لە باکووری ڕۆژاوای ئێران و لە باشووری پارێزگای ئازەربایجانی ڕۆژاوایە، لە نێوان ٤٥ پلە و ٢٣ خولەکی ڕۆژهەڵات و ٣٦ پلە و ٤٦ خولەکی درێژایی باکووری لە نیسفوننەهاری گرینویچ هەڵکەوتووە.

لە باشوورەوە دەگەڵ شاری سەردەشت و بەشێک لە شاری بۆکان، لە باکوورەوە دەگەڵ شارەکانی میاندواو و نەغەدە، لە ڕۆژهەڵاتەوە دەگەڵ شاری بۆکان و لە ڕۆژاواش دەگەڵ شاری پیرانشار (خانێ) هاوسنوورە.

ئاکامی لێکۆڵینەوەکانی مێژووناسان و ئاسەواری دیتراوە لەم دەڤەرە، ئەوە بابەتەمان بۆ دەردەخەن کە ناوچەی مەهاباد لە سەدەکانی هەزارەی هەوەڵی پێش زایینڕدا یەکێک بووە لەو ناوچە مێژینانەی کە مرۆڤی تێدا ژیاوە.

بەر لە ئێستا مەهاباد بە ناوەکانی "ساوجبڵاغ"، "سوقبڵاغ" کە وشەیەکی تورکیین و لە ناوچەکەش "سابڵاغ" یان "ساوجبڵاغی موکری"یان پێدەکوت، بەناوبانگ بوو. لە سەردەمی دەسەڵاتداری پەهلەویدا ناوی ئەم شارەش چەشنی هێندێک لە شارەکانی تری ئێران ئاڵوگۆڕیان بە سەردا هات.

لە "بورهانی قاتع"دا وشەی "مەهاباد"، ناوی پێغەمبەرێکی عەجەمە کە پەرتووکێکی بە ناوی "دەساتیر" لە دەستدایە. مەهاباد بەردەوام لانکەی بزووتنەوەکانی سیاسی و فەرهەنگی بووە و کەسایەتییەکانی وەکوو بوداق سوڵتان، سارم بەگ، پێشەوا قازی محەممەد و ... لەو شارە پەروەردە بوون. خەڵکەکەی مەهاباد و دەوروبەری بە زمانی کوردی زاراوەی موکریانی "سۆرانی" دەدوێن.

"حوسێن حوزنی موکریانی" لە پەرتووکی "کوردستانی موکریان" یا آتروپاتین (آذربایجان)دا نووسیویتی:" شاری سابڵاغ لە دوای ئەوە کە شیریەگی موکریانی لە دەست شاە عەباسی سەفەوی هەڵات، دێهاتەکانی سووتاند و هەڵات و گەڕاوە، ساڵی ١٠٣٩ی ئەو شارە ئاوەدان کراوەتەوە، بەڵام لە دەوری نادرشادا شارێکی گەورە بووە، ئەو شارە هەر جێی دانیشتنی حاکمانی موکریان بووە، ئەو شارە لە نێوانی چوار کێودا هەڵکەوتووە، ڕۆژهەڵاتی شار (کێوی داشامەجید)ە، جنووب [باشوور]ی شار (کێوی عەلی ئاباد)ە، ڕۆژئاوای شار (مەیدان بەڵەک)ە، شمال غربی [باکووری ڕۆژئاوا] (کێوی خەزایی)یە، باکووری ڕۆژهەڵاتی شار (کێوی قوڵقوڵاخ)ە، کلکەی قوڵقوڵاخ کە لە کەڵکی بەگزادانە ڕوو بە ڕۆژئاوا دەڕوا و چۆمی سابڵاخ لە کێوی خەزایی دەپچڕێنێتەوە. "

ساڵی ١٣٦٧ی هەتاوی، مەهاباد خاوەن حەوت دێهستان بووە کە بریتی بوون لە:

١. ئاختاچی ڕۆژهەڵات ٢. ئاختاچی ڕۆژاوا ٣. بێهی فەیزوڵڵابەیگی ٤. شاروێران ٥. گەورکی موکری ٦. مەنگوڕی ڕۆژهەڵات ٧. یەڵتەمر

لە گۆڕانکارییەکدا کە ساڵی ١٣٧٠ی هەتاوی لە دێهستانەکانی ئازەربایجانی ڕۆژاوادا ڕووی دا ٤٨ ئاوایی دێهستانی ئاختاچی ڕۆژهەڵات، ٦٥ ئاوایی دێهستانی بێهی فەیزوڵڵابەگی، ٣٧ ئاوایی دێهستانی ئاختاچی ڕۆژاوا، ٢٢ ئاوایی دێهستانی یەڵتەمر، ٥ ئاوایی لە دێهستانی شاروێران و ١٩ ئاوایی دێهستانی گەورکی موکری بوونە سەر بە شارەکانی بۆکان و میاندواو و نەغەدە.

لە پاش ئەو گۆڕانکارییە، ئەم جار مەهاباد دەبێتە خاوەن شەش دێهستان:

١. ئاختاچی ڕۆژاوا ٢. کانی بازاڕ ٣. موکریانی ڕۆژاوا ٤. موکریانی ڕۆژهەڵات ٥. موکریانی باکووری ٦. مەنگوڕی ڕۆژهەڵات.

دەبێ بڵێین بە داخوکەسەرێکی زۆرەوە ساڵی ١٣٧٠ی هەتاوی، مەهاباد دیسان تووشی نسکۆ و نەهامەتێکی تر دەبێ و دێهستانێکی دیکە بە ناوی موکریانی باکووری کە ٣١ ئاوایی لەخۆ دەگرێ لەم شارەی دادەبڕن و بە ناحەق دەدەرێ بە میاندواو، لەگەڵ ئەوەشدا خەڵکەکەی خۆیان هەر بە

مەهابادی دەزانن و ئێستاش خەفەتی ئەوە دەخۆن کە کاربەدەستانی ئەوکات چۆنیان توانی بەم جۆرە مافی سەرەکی خەڵکەکە لەبەرچاو نەگرن و وڵامدەری مێژوو بن؟!

ڕوون و ئاشکرایە لە زۆربەی وڵاتەکان کە شار و گوندەکان ڕادەیان زۆر دەبێ و لەبەریەک دەکشێنەوە، بە مەبەستی باشتر بوونی باروذۆخ، ڕەوتی ژیانی خەڵکەکە، پێڕاگەیشتنی زیاتر، دابینکردنی ئیمکاناتی بێهداشتی و دەرمانی، ئاسایش و حەسانەوەی زیاتر بە پێی پێوانەکانی خۆیان ناوچە و مەڵبەندەکان دابەش دەکەن، بەڵام دابەش کردن و دابڕانی دێهستانی موکریانی باکووری، نە تەنیا هیچ بەهرەیەکی نەبوو بەڵکوو خاوەنڕایان وەکوو خەسارێک سەیری دەکەن، نە تەنیا بۆ باشتر بوونی ڕەوتی ژیانی خەڵکەکە هیچ نەکرا بەڵکوو هێندێک حەساسیەتیشیان لە ناوچەکەدا ساز کرد.

خەڵکی ئاواییەکانی دێهستانی موکریانی باکووری ئێستاش خوازیاری ئەوەن گوندەکانیان بگەڕێتەوە سەر شاری مەهاباد تا جارێکی دیکە بتوانن لە پرۆسەی ئاوەدانی ئەم شارەدا دەورێکی بەرچاویان هەبێ.

**لە یەکەمین دابڕاندا گرینگترین ئاواییەکانی کە لە ئاختاچی ڕۆژاوا، یەڵتەمر، شارویران و گەورکی موکری جیا کرانەوە بریتین لە:**
خانەقا، شەرەفکەند، شێخاڵی، پیروەلیباغی، مەللالەر، ئاشیگوڵان، باخچە، کۆکە، ماسوێ، دایماو، کانیڕەش، خوراسانە، قازانسەر، کانیتومار، سەرچنار، قۆڵغەتەپە، قەرەداغ، ئیسکیبەغدا، دەرویشان، گورگە، گلۆلانی سەرێ و خوارێ، قالوێ شێخان و قالوێ ڕەسووئاغا.

**لە دووەمین دابڕاندا دێهستانی موکریانی باکووری بەم ئاواییانەوە دران بە شاری میاندواو:**
١. بەفرەوان ٢. تالاو ٣. دلکداش ٤. سیستەکی سەرێ ٥. شیرینئاو ٦. قزقەڵا ٧. قشلاقی تالاو ٨. قەلحەسەن ٩. مەرجانئاوا ١٠. دێوەیسئاغا ١١. ڕەسووئاوا ١٢. گزلان ١٣. گەنجاوا ١٤. تازەکەند ١٥. جەعفەرئاوا ١٦. حاجی حەسەن ١٧. خێراوا ١٨. دەوڵەتاوا ١٩. دێمەنسوور ٢٠. قشلاقی حاجی حەسەن ٢١. مەنسوورکەندی ٢٢. ئەرمەناکی خوارێ ٢٣. ئەرمەناکی سەرێ ٢٤. ئیسماعیلکەندی ٢٥. زەنگیاوا ٢٦. زەینالکەندی ٢٧. قشلاقی زەینالکەندی ٢٨. قشلاقی گردەقووڵ ٢٩. کۆخان ٣٠. مەلاکەندی ٣١. هۆبەکۆخان.

ئەم دێهستانە بە ناوەندییەتی ئاوایی حاجی حەسەن بە پانتایی ٢٤٣/٢٣٥ کیلۆمیتری چوارگۆشەیە.

**ئاواییەکانی تری مەهاباد کە بە هۆی بێئاوی و ئیشکەساڵییەکان، نەبوونی ئەمنییەت یان هەر هۆیەکی دیکەوە چۆل کراون:**
١. کۆنەگلێنان ٢. ئەمیرئاوا ٣. قزڵجەی سەرێ ٤. کانیشینکە ٥. کۆخان ٦. قماریە ٧. لەموونج ٨. نێلان ٩. مووسا دایکوژراو ١٠. قامیشاوێ ١١. تەقەگوێز ١٢. سووران

**مەهاباد خاوەن دوو بەشی "ناوەندی" و "خەلیفان"ە و بە پێنج دێهستان دابەش کراوە:**
بەشی ناوەندی خاوەنی سێ دێهستانە: دێهستانی ئاختاچی ڕۆژاوا بە پانتایی٤٨٥،٢١٠ کیلۆمیتری چوارگۆشەیە بە ناوەندییەتی ئاوایی "قەرەبلاغ" کە ٣٦ ئاوایی لەخۆ دەگرێ. دێهستانی موکریانی ڕۆژهەلات بە پانتایی ٣١٦،٢٧٦ کیلۆمیتری چوارگۆشە و ناوەندییەتی ئاوایی "گۆکتەپە" کە ١٨ ئاوایی دەخۆ دەگرێ، هەروەها دێهستانی موکریانی ڕۆژاوا بە پانتایی ٤٨٨،٠٥٤ کیلۆمیتری چوارگۆشە، خاوەنی ٢٦ ئاواییە بە ناوەندییەتی ئاوایی "دریاس".

بەشی خەلیفان خاوەنی دوو دێهستانە: کانی بازاڕ بە پانتایی ٦١٧،٩٤٧ کیلۆمیتری چوارگۆشە و ناوەندییەتی ئاوایی "کیتکە" خاوەنی ٤٤ ئاواییە، دێهستانی مەنگوڕی ڕۆژهەلات بە پانتایی ٦٨٤،٠٩٧ کیلۆمیتری چوارگۆشە و خاوەنی ٧٢ ئاواییە کە ناوەندی ئەم دێهستانە ئاوایی "حەولاکوردە"یە.
بەم جۆرە پانتایی بەشی ناوەندی مەهاباد ١٢٨٩،٥٣٩ کیلۆمیتری چوارگۆشەیە و بەشی خەلیفان پانتایی ١٣٠٢،٠٤٤ کیلۆمیتری چوارگۆشەیە.
چیای "لەندی شێخان" کە بەرزاییەکەی دەگاتە ٢٧٣٠ میتر، بەرزترین شوێنی ئەم شارەیە. نەویترین شوێنیشی لە ڕووکەشی زەریاوە کە ١٢٨٠ میترە، دەبێتە بەشی باکووری مەهاباد. نێوان بەرزایی مەهاباد ڕادەی ١٦٧٤ میترێک لە ڕووکەشی زەریاکانەوەیە، بەرزایی ناوەندی شاریش ١٣٨٥ میتر لە ڕووکەشی زەریاوەیە.

به پێی دوایین سەرژمێری (١٣٨٥ی هەتاوی) حەشیمەتی شاری مەهاباد: ١٣٦٠٤٩ کەسن کە ٦٧٢٨٢ کەسیان ژنن و ٦٨٧٦٧ کەسیشیان پیاون.
ڕادەی حەشیمەتی ئاوایی‌یەکانی مەهاباد: ٦٥١٠٥ کەسن کە ٣١٤٤٥ کەسیان ژنن و ٣٣٦٦٠ کەسیشیان پیاون.
بە گشتی خەڵکی شارستانی مەهاباد: ٢٠١١٥٤ کەسن. ئایینی خەڵکی مەهاباد ئیسلامە و مەزهەبیان سوننی شافعی‌یە.
حاسڵاتی وەرزێران: گەنم، جۆ، وێنجە، چەوەندەر، گوڵەبێغەمبەرە و هتد.
کەشوهەوای مەهاباد بە هۆی بەرزی و نزمی و هەروەها بە هۆی فێنک بوونی لە هێندێک شوێن جیاوازە.
ڕووباری مەهاباد لە داوێنی ڕۆژهەڵاتی چیاکانی "زاگرۆس"ەوە سەرچاوە دەگرێ و لە دوو لقی سەرەکی، ڕووبارەکانی "دێبۆکر" و "بەیتاس" پێکدێن و لە نزیک مەهاباد تێکەڵ دەبنەوە و چۆمی مەهاباد پێکدێنن. ڕادەی دەرکردنی ئاوی ئەو چۆمە لە پردی سوورەوە نزیک بە ٨٤٢ کیلۆمیتری چوارگۆشەیە.
لقەکانی ڕووباری مەهاباد بریتین لە لقی "کەوتەر" کە لقی سەرەکیتی و لە بەرزایی‌یەکانی باشوور و لە داوێنی چیاکانی "جانداران"ەوە سەرچاوە دەگرێ و بەرەو باکوور دەڕوا، ڕادەی دەرکردنی ئاوی ئەو لقە ٤١٢ کیلۆمیتری چوارگۆشەیە. لقی "بەیتاس" لە چیاکانی "ئاغاسوور" و شاخی قەل سەرچاوە دەگرێ و لە لێواری ڕۆژاوای ڕێگەی قیلەتاوی مەهاباد ــ سەردەشت بەرەو زەریاچە دەڕوا و ڕادەی دەرکردنی ئاوی تا زەریاچەی ئاوبەند ٢٧٠٠٠٠ کیلۆمیتری چوارگۆشەیە. لقی "دێبۆکر" بە پانتایی ٦١ کیلۆمیتری چوارگۆشە، لە چیاکانی "سەرمێرگان" لە باشووری ڕۆژاوای زەریاچەی ئاوبەندەوە سەرچاوە دەگرێ و بەرەو ڕۆژهەڵات ڕێ دەبڕێ.

**لە بواری کشتوکاڵەوە شەش جۆرە خۆڵمان لە مەهاباد هەیە:**

١. بۆ کشتوکاڵ: ئەو زەوییانەی بۆ ئاودێری گەلێک باش و لەبارن.
٢. بۆ کشتوکاڵ: ئەو زەوییانەی بۆ ئاودێری باشن.
٣. بۆ کشتوکاڵ: ئەو زەوییانەی تا ڕادەیەک بۆ ئاودێری باشن.
٤. زەوییەکانی بەیار: بە هێندێ مەرجی تایبەتی بۆ ئاودێری دەبن.
٥. زەوییەکانی بەیار: ئاودێری ئەو زەوییانە پێوەندی بە هێندێک مەرجەوە هەیە.
٦. زەوییەکانی بەیار: بە هیچ لەونێک بۆ ئاودێری نابن.

**تا کۆتایی ساڵی ١٣٨٧ی هەتاوی لە شاری مەهاباد ١١ ئەشکەوت تۆمار کراون:**

١. ئەشکەوتی ئاوی ـ مێژوویی "سەهۆڵان" لە ئاوایی سەهۆڵان
٢. ئەشکەوتی "کانیڕەش" لە ئاوایی کانیڕەش
٣. ئەشکەوتی قسڵی "بەردەبۆر" لە ئاوایی دێبۆکر
٤. ئەشکەوتی "قەڵاتی شا" لە نزیک ئاوایی‌یەکانی سەرتەنگ و سەرهۆڵان
٥. ئەشکەوتی "کارگێ" لە ئاوایی کارگ
٦. ئەشکەوتی "ئەشکەوتان" لە ئاوایی نێڵان
٧. ئەشکەوتی "مام قووچاق" لە ئاوایی ئاڵبلاغ
٨. ئەشکەوتی "کونەبا" لە ئاوایی حاجیالی‌کەند
٩. ئەشکەوتی "سێکونان" لە کێوی ماڵووک
١٠. ئەشکەوتی "قەیسەری" لە کێوی ماڵووک
١١. ئەشکەوتی "ڕفتە" لە دۆڵی‌شێخان

نەخشەی شارستانی مەهاباد، ساڵی ١٣٦٥:

نقشه شهرستان مهاباد به تفکیک بخش و دهستان

نقده

میاندوآب

سردشت

سقز

مرکز آمار ایران

نقشهٔ شهرستان مهاباد

نەخشەی شارستانی مەهاباد لە دوای جیا کردنەوەی بەشێکی زۆر لە ئاواییەکان بە پێی هۆز و ناوچە:

## چوار ئاسەواری گرینگی مێژوویی لە ئاوایی‌یەکان

### ١. خرێ‌هەنجیران:

ئەو بەردە نووسراوەیە لە ٢٨ کیلۆمیتری باشووری شاری مەهاباد و لە لای چەپی ڕێگای مەهاباد ـ سەردەشت لە بەرزایی ١٣٣٠ میتر لە ڕووکەشی زەریایەکان بە ژمارەی ٣٣٢٥ لە میراتی فەرهەنگی تۆمار کراوە. واژەی کوردی "خرێ" بە مانای "دۆڵ و شیو"ە و "هەنجیر"یش هەر مەبەست میوە و داری هەنجیرە.

لەوانەیە پێشتر ئەم شوێنە، واتا خرەهەنجیران، دار هەنجیری لێ بووبن کە دەگەڵ تێپەڕینی زەمان و بە هۆی پەرەگرتنی ئاژەڵداری لە ناوچەکە وردە وردە فەوتابن. ئەو شوێنە کە ئاسەوارێکی بەجێماوی دەورانی سێهەمی زەوی‌ناسییە، گەورەترین بەرد کە هەڵقەندراوەیەکی لەسەرە لە ناوەندی ئەم کۆبەردانەی خرەهەنجیران هەڵکەوتووە، بەردەکانی دیکە لە سەرووی ئەم بەردەوەن. یەکێکی دیکە لەم بەردانە کە مەودای لە بەردە گەورەکە هەر ٥٠ میترێک دەبێ لە بەشی ڕۆژهەڵات هەڵکەوتووە. هەڵقەندراوەی سەر بەردە گەورەکە ئاماژەیەکە بۆ هەزارەی سێهەمی بەر لە زایین، یانی نزیک بە ٤٠٠٠ ساڵ لەوەی پێش.

### ٢. ئەشکەوتی سەهۆڵان:

ئەشکەوتی "سەهۆڵان" یەکێکە لە ئاسەوارە جوانەکانی سروشت کە لە دوای ئەشکەوتی "عەلی سەدر"ی هەمەدان وەکوو دووەمین ئەشکەوتی ئاویی وڵاتی ئێران دێتە ئەژمار. ئەم ئەشکەوتە بە پانتایی ٢ هێکتار، لە نزیک ئاوایی سەهۆڵان هەڵکەوتووە و مێژووکەی دەگەڕێتەوە کۆتایی قۆناغی دووەمی زەوی‌ناسیی، هەڵبەت شوێنەوارەکانی سەردەمی پارتەکان، ئەشکانییەکان و تەنانەت دەورەی ئیسلامیشی تێدا دۆزراوەتەوە. ئەم ئەشکەوتە لە دوو بەش پێک هاتووە: بەشێکی ئاوە و قووڵایی هێندێک شوێنی ئاوەکە دەگاتە ٥٣ میتر و درێژاییەکەی نزیک بە ٢٥٠ میترە؛ بەشەکەی تری کە ویشکاییە، درێژاییەکەی نزیک بە ٢٥٠ میترە. سەرەڕای مێژوویی بوونی ئەو ئەشکەوتە سەد مخابن لە هیچ کتێب و سەرچاوەیەکدا باسێکی لێ نەکراوە و تەنانەت ناویشی نەهاتووە، بەڵام "ژان دۆمۆرگان" گەڕیدەی بەناوبانگی فەرەنسی کە ساڵی ١٨٩٢ی زایینی سەردانی ڕۆژهەڵاتی کوردستان دەکا، چۆنیەتی چوونە ژووری بۆ ئەشکەوتەکە لە دوو توێی کتێبی "جۆگرافیای ڕۆژاوای ئێران"دا هێناوەتە بەرباس.

ساڵی ١٣٧٠ی هەتاوی گرووپێک سەردانی ئەم ئەشکەوتە دەکەن و لە کۆتایی ساڵی ١٣٧٦ی هەتاوی ڕێگەی چوونە ژوورەوەیان کردەوە و لە ساڵی ١٣٧٩ی هەتاوی لە لایەن شارەداری مەهابادەوە بۆ ماوەیەکی کەم وەک شوێنێکی سروشتی کەلکی لێ وەرگیرا. هەنووکەش پێویستە گەلێک توێژینەوەی لە سەر بکرێ، بێ‌گومان بە هەوڵی کاربەدەستان و خاوەن‌ڕایان دەکرێ مێژوو و چۆنیەتی ئەم شوێنە زیاتر ڕوون ببێتەوە. لە میچی ئەشکەوتەکەوە چەند قەندیلێک شۆڕ بوونەوە کە هەر کامیان شێوەی بوونەوەرێک دەدەن و هەر بۆیە خەڵکی ناوچەکە هەر یەکەی ناوێکیان بەسەردا بریون، وەکوو: هێشووەترێ، کیسەڵ، پێ فیل و هتد. ئەشکەوت لە جۆری چالاک و زیندووە واتا ئەکتیوە و هۆی ئەم ئەکتیوبوونەشی هەڵدان و گەورەبوونی قەندیلەکانە.

بەشێکی تری ئەشکەوتەکە کە ویشکاییە بە "کونەماڵان" ناسراوە، بێ‌گومان ناودێر کردنی ئەو بەشە لە ئەشکەوتەکە دەگەڕێتەوە ئەو سەردەمەی کە ئەو شوێنە مرۆڤی تێدا ژیاوە بەتایبەت سەردەمی شەڕی دووەمی جیهانی کە حرووسان کەوتنە قەتڵوعام و کوشتاری خەڵکی کورد و ناچار خەڵکی دەوروبەر و ئاوایی‌یەکانی عیساکەند، سیچان‌بلاغ، یالاوە، سەهۆڵان و... پەنایان بۆ ئەم ئەشکەوتە بردووە. باڵندەی وەکوو شەمشەمەکوێرە و کۆتر لەم ئەشکەوتەدا دەژین، هەروەها زیندەوەرێکی نەرم‌پێست لە نێو ئاوی ئەشکەوتەکەدا دەژی کە "ئارتیمیا"ی پێدەڵێن. لە سنووری نێوان ئاو و ویشکایی ئەشکەوتەکەدا واتا ئەو جێیەی ئاوەکە دەبڕێتەوە هەورازێکی لێژ و چڕ بەرامبەرت قوت دەبێتەوە و لە کۆتایی هەورازەکەدا کونێکی باریک و درێژی ٢٠ تا ٣٠ میتری هەڵقەندراوە کە بە بڕوای کارناسان ڕۆژگارێک ڕێگای نهێنی نێوان قەڵای سەر کێوەکە و نێو ئەشکەوتەکە بووە و ئەو ڕێگایە بە هۆی بوومەلەرزە و تەکانەکانی زەوی کوێر بۆتەوە. بەردەکانی ئەم ئەشکەوتە لە ئاهەکی دۆلۆمیتی و ئاهەکی ڕسووبین، تەوژمی هەوا لە نێو ئەشکەوت ٨٩٢ میلی بارە، نم و تەڕایی‌یەکی (0/70 تا 0/80)ە. بەرزایی ئاو لە ڕووکەشی زەریاکانەوە ١٧٨٠ میترە، پلەی تینی هەوای نێو ئەشکەوتەکە ١٣ پلەیە، PH بەرانبەرە بە 6/8.

### ٣. حەمامی لەج:

مێژووی حەمامی یاوایی لەج دەگەڕێتەوە سەردەمی سەفەوییەکان (ساڵەکانی ١٠٥٠ تا ١١٠٠ی کۆچی مانگی). بەرزایی ئەم شوێنە ١٤١١ میتر لە ڕووکەشی زەریاکانە، لە میراتی فەرهەنگی بە ژمارەی ٦١٨٨ تۆمار کراوە و لە ئاوایی لەج هەڵکەوتووە. بناغەی حەمامەکە تا بەرزایی دوو میتر، بەردێکی قایمە و دیوارەکان و تاقە داپۆشراوەکانی بە مەلات داڕێژراون و لە خشتی چوارگۆشە کەلک وەرگیراوە.

### ٤. قەڵاتی شای:

لە ١٢٠ کیلۆمیتری باشووری ڕۆژاوای شاری مەهاباد هەڵکەوتووە، گابەردەکەی سەرووی چیایەکەی قەڵاکەی لە سەر داڕێژراوە نزیک بە ٨٠ میتر بەرزە و ڕێی وەسەرکەوتنی تەنیا لە لای ڕۆژاوایەوەیە.

لە نێو قەڵاکەدا جگە لە ئاسەواری ژیان، بە مەبەستی کۆکردنەوەی ئاوی بارانە، عەنباراوێک کە لە بەردێکی لێکولووس داتاشراوە هەڵکەوتووە.

دوای ڕووخانی بەشێکی بەرچاو لە قەڵاکە ئەم دوو ئاسەوارە بەجێ ماون:

١. دالانێکی ١٨/٥ میتری کە بە سەر دە هۆدەی ٥/٥*٣ میتردا دەکرێتەوە.

٢. دالانێک بە شکڵی (T) بە درێژایی ١٧/٥ میتر کە ٩ هۆدەی تێدایە.

بە پێی بەڵگەکانی مێژوویی، لە سەرەتای هەزارەی یەکەمی بەر لە زایین، یەکەم بەردی بناغەی ئەم قەڵا گەورە و سەیروسەمەرەیە لە لایەن دانیشتووانی ناوچەکە دانراوە، پاشان لە سەردەمی مادەکاندا پەرەیان پێداوە و بەشی دیکەیان لێ زیاد کردووە.

- **کورتەیەک لە شارستانی مەهاباد لە ساڵی ١٣٨٦ی هەتاوی، بە پێی بەڵگەکانی ئیدارەی کشتوکاڵی شارستانی مەهاباد**

ناوی شارستان: مەهاباد

پانتایی: ٤٥٨٥ کیلۆمیتری چوارگۆشە

بەش: ٢ بەش (ناوەندی ــ خەلیفان)

ڕادەی دێهستان: پێنج دێهستان

ئاواییە ئاوەدانەکان: ١٩٦ ئاوایی

حەشیمەتی شار: ١٣٦٠٤٩ کەس

حەشیمەتی ئاوایی: ٦٥١٠٥ کەس

حەشیمەتی شار و ئاوایی: ٢٠١١٥٤

ڕووبارەکان: ٢ ڕووبار

ڕادەی کانیاوەکان: ٣٩٢ کانیاو

کەرێزە: ٣٢ کەرێزە

چاڵاوی قووڵ و نیوەقووڵ: ١٠٠٠ دانە

گۆلاو: ٣٢٤٠ گۆلاو

کەلک وەرگرتنی ئاو لە بەشی وەرزێریدا: ١٧٥٠ میلیۆن میتری چوارپاڵو

**سەرچاوەی سروشتی و زەوییەکانی وەرزێری:**

پانتایی لەوەڕگە: ١٩٠٠٠٠ هێکتار

پانتایی لێڕەوار: ٤٠٠ هێکتار

پانتایی لەوەڕگەی بیابانی: ٤٠٠٠ هێکتار

زەوییەکانی کشتوکاڵ: ٨٠٠٠٠ هێکتار

زەوییەکانی بەراو: ٢٧٠٠٠ هێکتار

زەوییەکانی دێمی: ٥٣٠٠٠ هێکتار

**ڕادەی ئاژەڵ و پەلەوەر و شوێنە پیشەیی‌یەکانی شارستان:**

ئاژەڵی ورد: ٣٤٦٦١٧ سەر

ئاژەڵی گەورە: ٤٠٠٠٠ سەر

پەلەوەر: ٢٦٨٠٠٠٠

کەندووی مێشهەنگوین: ٢٥٠٠ کەندوو

**شیلات و ئاوزییان:**

مەکۆی پەروەردە کردن: لە ٣ شوێنان.

ڕادەی بەرهەم دە ساڵێدا: ٢٠ تۆن

**مێکانیزاسیۆن:**

ڕادەی تراکتۆر: ٢٧٧٢ دەزگا

کۆمباین: ٥٩ دەزگا

لاوێردە: ٧٠٠ دەزگا

گاسن: ٢٧٧٢ دانە

خەرمانکوب: ٣٩٤ دەزگا

دیسک: ٧٠٠ دەزگا

تۆوچێنەر: ٩٣ دەزگا

## چەند هۆز و عەشیرەتی گرینگ لە مەهاباد

### بەگزادە و حەسەنخاڵی

حوسێن حوزنی لە کوردستانی موکریاندا ئاوا باسی بەگزادەکان دەکا:

بەگزادە لە بنەماڵەی حاکم و میرانی کوردی موکریانن، هەموو خاوەن ماڵ، حەشەم، ملک و ماڵ، دێهات و سامانێکی زۆرن، گەلێک مرۆڤی ناودار و وریا، شاعیر و ئەدیبیان لێ هەڵکەوتووە.

عەشیرەتی حەسەنخاڵی لە عەشیرەتە کۆنەکانی موکریان دێنە ئەژمار و بە بنەماڵەی ئاغا و خاوەن ملک دەژمێردرێن. ئەوان لە گوندەکانی رۆژهەڵاتی شاری سابڵاخ، عیساکەند، مووساکەند، بورهان و ئەو شوێنانە نیشتەجێن.

### مەنگوڕ

هۆزی مەنگوڕ لە ئاواییەکانی نێوان پیرانشار، سەردەشت، مەهاباد و تا سنووری باشووری کوردستان بڵاوبوونەوە.

١. هۆزی مەنگوڕ بە سەرۆکایەتی "باپیر ئاغا" لە سەردەمی حوکمڕانی "کەریمخانی زەند" لە عێراقەوە کۆچیان کرد و ناوچەی یەڵتەمر و عەشیرەتی ئەوێیان هێنایە ژێر دەسەڵاتی خۆیان، هەروەها لە دژی "بوداقخان"، حاکمی مەهاباد وەستان. بوداقخان کە لە دەستیان وەزاڵە هاتبوو هەواڵی بۆ "ئەحمەدخان موقەدەم مەراغەیی" حاکمی ئەو کاتی مەراغە نارد کە بێ و فریای کەوێ.

ئەحمەدخان موقەدەم نەخشەیەک دادەڕێژێ و لە نامەیەکدا کە بۆ "باپیرئاغا"ی دەنێرێ، تێیدا دەنووسێ: نێوان من و حاکمی تەورێز تێکچووە و بڕیارم داوە هێرش بەرمە سەر تەورێز، ئەگەر ئێوە بێنە یاریدەم ئەوەی لە شەڕی تەورێزدا وەدەستی دێنین (غنایم) لەگەڵتان بەش دەکەم.

باپیرئاغا لەگەڵ نزیکەی هەزار کەس بەرەو تەورێز وەڕێ دەکەوێ، کاتێک دەگەنە ئاوایی هەمزاوا [لە نزیک شاری مەهاباد]، ئەسپی باپیرئاغا سەرسمێک دەدا، "ئیبراهیم سوڵتان" برای باپیرئاغا دەڵێ: "سەرسمدانی ئەسپی ئێوە بە ڕووداوێکی ناخۆش دەزانم، بە بڕوای من لەو سەفەرە پاشگەز ببنەوە باشترە."

باپیرئاغا بە تووڕەییەوە دەڵێ: "ئەگەر دەترسێی بگەڕێوە، چونکە منیش هاوڕێیەتی ترسەنۆکێکی وەک تۆ بە سەلاح نازانم."

ئیبراهیم سوڵتان لەوێڕا بە تەنێ دەگەڕێتەوە و باپیرئاغا وێڕای سوارەکانی بەرەو تەورێز ڕێ دەبڕێ. کاتێک دەگەنە مەراغە پێشوازێکی گەرمیان لێ دەکرێ و پیاوەکانی باپیرئاغا دووکەس دووکەس بەسەر ماڵەکانی مەراغەدا دابەش دەکرێن، باپیرئاغا دەگەڵ چەند کەسێک لە نزیکانی دەبنە میوانی ئەحمەدخان. دوو سەعاتێک کە لە شەو تێدەپەڕێ لە لایەن "ئەحمەدخان موقەدەم"ەوە فەرمان دەردەکرێ هەرچی ماڵی مەراغەیە و میوانی مەنگوریان هەیە بیانکوژن. وەک دەگێڕنەوە گۆیا تەنیا کەسێک بە ناوی "وەستا عوزەیر" کە زمانی تورکی زانیوە لەو گێژاوە و کارەساتە ڕزگاری دەبێ و ئەم بەسەرهاتە بۆ هۆزی مەنگوڕ دەگێڕێتەوە. ئەم ڕووداوە ساڵی ١١٩٥ کۆچی مانگی و لە کاتی حوکمڕانی "عەلیمورادخانی زەند" ڕووی داوە. هۆزی مەنگوڕ دوای ئەم بەسەرهاتە دڵتەزێنە بۆ ماوەیەکی درێژخایەن هیچ جووڵانەوەکیان نابێ.

لە سەردەمی دەسەڵاتداری "فەتحعەلیشای قاجار" بەرانبەر بە ساڵی ١٢٣٥ی کۆچی مانگی، کەسێکی تر هەر بە ناوی "باپیرئاغا"ی دووەم، نەوەی ئەو باپیرئاغایەی گۆڕین، لە نێو هۆزی مەنگوڕدا پەیدا دەبێ. باپیرئاغا بۆ ئەوەی ڕەچەڵەک و ئەولادی زۆر بن، چەند ژنان دێنێ. ناوی ژنەکانی بریتی بوون لە: زێڕن، شەم، مرۆت، ئامان و زین. ژنێکی دیکەشی هەر بە ناوی زین هەبووە، هەڵبەت هەموو ئەوانە وێکڕا ژنی نەبوون ـ چوونکە لە مەزهەبی ئیمامی شافعیدا هەر وەک مەزهەبەکانی دیکەی ئیسلامی لە چوار ژن زیاتر مارەیی نایە، ئەگەر یەکیان بمرێ یان تەڵاق بدرێ ئەوجار کابرا ئیزنی ئەوەی هەیە ژنێکی دیکە مارە کاتەوە ـ بەم جۆرە باپیرئاغا تا کۆتایی ژیانی بەردەوام چوار ژنی هەبوون و گۆیا ١٤ تا ٢١ منداڵی کوڕی هەبوون. مەنگوڕەکانی ئەوڕۆ هەر ڕەچەڵەکی ئەو باپیرئاغایەن و تایفەکانیشیان هەر بە ناوی ئەم ژنانە ناودێر کراون و خاوەن پێنج تایفەن: زێڕن، شەم، مرۆت، ئامان، زین، هەروەها تایفەی خدر. پێنج تایفەی هەوەڵ بە کادەرۆیشی ناسراون، بەڵام تایفەی "خدر"ی چوونکە لە ڕەچەڵەکی باپیرئاغا

و ژنەکانی ئەو نین بە کادەرۆیشی داناندرێن.

ئەو تایفانەی کە پێشتر لەم ناوچانە نیشتەجێ بوون و هۆزی مەنگوڕ بەسەریاندا زاڵ بوون بریتین لە: مەڕنەکەنە، بابڕەسوو، برایمە سەنە (ئیبراهیم حەسەن)، شێخ شەرەفی، ئالی سێمانە، فەقێ ئیسا یا فەقێ وەیسی، زوودی، سەلەکی، خەلەکی، کاڕەش، گوێڕەش، کەلهوڕ، وەستا خاڵە، باریک، هورمەزیار، چکاڵە و هتد.

سەرۆکی هۆزی مەنگوڕ لەساڵی ١٢٥٩ی هەتاویدا "هەمزاغا"ی کوڕی باپیرئاغا بووە، لەو ساڵەدا حاکمی مەهاباد "لوتفعەلیخان" ناسراو بە "شازادە کوڕی تەهماسب میرزا موئەیدودولە" بووە. نێوانی هەمزاغا و حاکمی مەهاباد تێکدەچێ و ناکۆکی دەکەوێتە مابەینیان، هەمزاغا لەگەڵ "شێخ عوبەیدوڵڵا" دەچن دە خاکی عوسمانییەوە. دەسەڵاتی ئێران زۆری پێ خۆش بوو ئەم گرفتە نەمێنێ و دەیهەویست بە هەر شێوەیەک بێ ئەم مەترسییە چارەسەر بکرێ. "ئەمیرنزام گەرووسی" بەڵێنی بە هەمزاغا دەدا کە دەسەڵاتی کوردستان و ساوجبلاغی موکری بداتێ و هەمزاغاش پێیوایە چون ئەمیرنزام وەک خۆی لە هۆز و عەشیرەتانە، دەڵێ: ئەمیرنزام ئەگەر سوێندم بۆ بخوا و پەیمانم دەگەڵ ببەستێ بڕوای پێدەکەم. ئەمیرنزام سوێندی بۆ دەخوا و لە پشتی قورئانێک ئاوای بۆ دەنووسێ: "تا ڕووحی من لەم دونیایەدا بێ و زیندوو بم دەگەڵ تۆم و پارێزگاریت لێ دەکەم و ئەگەر پێویست بێ گیانی خۆشم لە پێناوتدا دادەنێم" و بە مۆری خۆی پشت قورئانەکە مۆر دەکا.

هەمزاغا وێڕای چەند سوار و برازاکەی کە ناوی "سوارە" دەبێ، دەچنە شوێنی دیدار کە "باغی شێخ"یان پێ کوتووە - لە باشووری مەهاباد هەڵکەوتبوو و ئیستە هیچ ئاسەوارێکی نەماوە و لە چوارڕێی مەولەوی تا پشت مەیدانی حەیوانانی ئێستای دەگرتەوە - بە پێی پیلانێک کە پێشتر داڕێژرابوو دوای ماوەیەک حاکم بە بیانوویەک لەو خێوەتەی کە دەگەڵ هەمزاغا و هاوڕێیانی و هێندێک خزمەتکار و قاوەچی بوون دێتە دەرێ و دەچێتە خێوەتی بەرامبەری کە پێشتر قوڵکەیەکیان تێدا هەڵقەندبوو و لەوێدا خۆی حەشار دەدا. تەقە دەست پێدەکا و دوو تاقم فوج) سەرباز حەوت جاران چەکەکانیان پڕ دەکەنەوە و بەرەو چادری هەمزاغا دەیتەقێنن، دوای ئاگربەس خزمەتکارێک دێتە نێو خێوەتەکە تا سەری هەمزاغا لە لەشی جیا بکاتەوە و پاداشی خۆی لە دەسەڵات وەربگرێ، بەڵام ئاگای لەوە نییە کە هەمزاغا هێشتا گیانی لەبەردا ماوە و دەستێکی کارێ هەر دەکا، هەر بەم دەستە کابرا توند دەگرێ و بۆ لای خۆی ڕایدەکێشێ و وەبەر زەبری خەنجەرانی دەدا و شڕودڕی دەکا و پاشان خۆشی گیانی دەردەچێ.

هەمزاغا لە سێپتامبەری ١٨٨١ی زایینی کۆچی دوایی دەکا، گۆیا جلوبەرگەکانی هەمزاغا هەر ماون و لە ئاوایی "بەستامبەگ" هەڵگیراون.

### ٢. تایبەتمەندییەکانی ژیانی هۆزی مەنگوڕ:

بژیوی ژیانی ئەم هۆزە لە ڕێگای کشتوکاڵ و ئاژەڵدارییەوە دابین دەکرێ. هەوارەکانیان لە دەوروبەری مەهابادە و بریتین لە "گەدە"، "بێهەنگوین" و زیاتر مانگی "بانەمەڕ" و بۆ ماوەی چوار مانگان بۆ لەوەڕاندنی ئاژەڵەکانیان دەچنە ئەم هەوارانە، بەڵام هەنووکە بە هۆی بارودۆخی تایبەتی ناوچەکە کۆچ ناکەن و ناچنە هەوار. ڕێکخراوەی هۆزی مەنگوڕ بەم جۆرەیە: لکی نیشتەجێی مەهاباد لە باشووری مەهابادن، هەوارگەی ئەوان "گەدە"، "لاسیر" و "کاکن"ە. ئەوان خەریکی ئاژەڵدارین و تووتن، گەنم، جۆ، چەوەندەر و دانەوێڵەکانی دیکە وەکوو نۆک، نیسک و ... دەچێنن. ئەم هۆزە بەگشتی مسوڵمانن و شافعیمەزهەبن.

بە پێی دابەش کردنی ناوچەکانی مەهاباد بە بەش و دێهستان، دەبێتە دوو بەشی ناوەندی و خەلیفان و پێنج دێهستان کە هۆزی مەنگوڕ لە دێهستانەکانی بەشی باشووردا وەکوو کانیبازاڕ، مەنگوڕی ڕۆژهەلات، ڕادەیەکی کەم لە باشووری ئاختاچی ڕۆژاوا و ژمارێکی کەم لە باشووری موکریانی ڕۆژاوادا نیشتەجێن.

## گەورک

لە تۆرەمەی"وسمانئاغا" و "خدرئاغا"ن کە چەند ساڵ بەر لە هۆزی مەنگوڕ لە عێراقەوە هاتنە ئێران و لە سێ شوێن بڵاوبوونەوە:

١. بەشێکیان لە شاری مەهاباد بەشی خەلیفان، بەشی باشووری دێهستانی کانیبازاڕ و دوو ئاوایی لە دێهستانی مەنگوڕی ڕۆژهەڵات نیشتەجێن. ئاغاوەتەکانی ئەو ئاواییانە خاوەن ٥ تایفەن بە ناوەکانی عەزیزی، حەسەنی، محەممەدی، ئیبراهیمی و قادری. سەرۆک عەشیرەتی گەورکەکان بەردەوام هەر لە بنەماڵەی "عەزیزی"یەکان بووە، لە شەڕی دووەمی جیهانیدا "عەزیزئاغای عەزیزی" سەرۆک عەشیرەت بووە کە پاش مردنی ئەو، براکەی "ئەحمەدئاغا" بۆتە سەرۆک عەشیرە.

٢. دێهستانی "میرەدێ"ی شارستانی سەقز(دۆڵی میرەدێ) کە ئاغاوەتی ئەو شوێنە لە بنەماڵەی "جەوانمەردی"ین و سەردەمی شەڕی دووەمی جیهانی "عەلیئاغای جەوانمەردی" سەرۆک عەشیرە بووە. عەلیئاغا و براکەی "ڕەسووئاغا" لە سەردەمی کۆماری کوردستان یارمەتی "حەمەڕەشیدخانی بانەیی"یان داوە و ئەرتەشی ئێران کە مەهابادی داگیر کردەوە و پێشەوا "قازی محەممەد" و هاوڕێیانی لە دار دان، ئەوانیشی وێڕای چەند کەسێک لە ئێلی "فەیزوڵڵابەگی"یەکان لە شاری سەقز لە دار دان.

٣. بەشێکی دیکەیان لە شارستانی سەردەشت دەژین.

٤. بەشێکی دیکەیان لە دێهستانی بەشی ناوەندی شاری بۆکان دەژین.

گەورکەکان خەریکی وەرزێری و ئاژەڵدارین و زیاتر گەنم، جۆ، نۆک و نیسک دەچێنن. تەون کردن و چنینی هێندێک کەرەسە و شتی وەکوو بەڕماڵ و چارشێو، بەتایبەت ساڵانی پێشوو، لە نێو گەورکەکاندا باو بووە. ئەوان مسوڵمانن و لە سەر مەزهەبی ئیمامی شافعین.

بە پێی سەرژمێری ساڵی ١٣٤٢ی هەتاوی، کۆمیسیۆنی میللی یونیسکۆ لە ئێران ڕایگەیاندووە کە حەشیمەتی هۆزی گەورک لەم ساڵەدا نزیک بە ٣١٠٠ بنەماڵە بووە.

بە پێی توێژینەوەی نووسەرانی ئەم دێڕانە حەشیمەتی ئاواییەکانی گەورکایەتی مەهاباد دەگاتە ٦٠٦٥ کەس(٩١٢ ماڵ).

پێویستە ئاماژە بەو خاڵە بکەین بەگشتی عەشیرەتەکانی مەنگوڕ، مامەش، گەورک و پیران بە بلباس ناسراون.

## دێـبۆکری

دێبۆکری یەکێک لە ناسراوترین عەشیرەتەکانی پارێزگای ئازەربایجانی ڕۆژاوان. ئەوان وەکوو عەشیرەتێکی کورد لە سەر دینی پیرۆزی ئیسلامن و مەزهەبیان شافعییە. لە نێوان شارەکانی مەهاباد، بۆکان و نەغەدە بڵاوبوونەوە، بەڵام ئێستە زۆربەیان لە شاری بۆکان دەژین.

عەشیرەتی دێبۆکری بە سەرپرشتی بەیرەمئاغا ساڵی ١١٥٧ی کۆچی مانگی لە کۆتاییەکانی دەسەڵاتداری "نادرشای ئەفشار" وێڕای هێندێک بنەماڵە بە ناوی ئەشکەوتی لە دیاربەکرەوە ڕوویان لە ناوچەی موکریان کردووە.

ئەم عەشیرەتە سەرەتا لە شوێنێک بە ناوی "بیرمۆ" لە نزیک ئاوایی "شاوەلە" نیشتەجێ بوون و پاشان ئاوایی "دێبۆکر"یان کڕی و لەوێ گیرسانەوە.

گڵکۆی "بەیرەمئاغا" لە نێوان ئاوایی دێبۆکر و قازیاوا لە گۆڕستانی "پیروبایز"ە. ڕەسووئاغا، سولەیمان ئاغا و شێخئاغا، کوڕەکانی بەیرەمئاغا بوون.

ڕەسووئاغا سێ کوڕی هەبوون بە ناوەکانی:١. هەباسئاغا ٢. محەممەدئاغا ٣. مارفئاغا

### تایفەکانی دێبۆکری:

هەنووکە عەشیرەتی دێبۆکری پێنج تایفەن: مارفئاغا، محەممەدئاغا، عەباسئاغا، سولەیمانئاغا و شێخئاغا و هەر تایفەیەکیش بە سەر چەند تیرەیەکدا دابەش دەبن.

١. تایفەی مارفئاغا: موهتەدی، گولابی، پیرۆتی، ڕەسووڵی، حەمیدی، حیسامی، عەلیار، مەعرووفی و ئیلخانیزادە
٢. تایفەی محەممەدئاغا: دێبۆکری، موزەففەری، موجەڕەد، عەزیزی، محەممەدی، کەریمی، فەتاحی و سەدیقی.
٣. تایفەی هەباسئاغا: عەباسی، قادری، شەهابی و فەرید.
٤. تایفەی سولەیمانئاغا: دانیشمەند، فەتاحی، ئەبووبەکری، قارەمانی، سولەیمانی، بایەزیدی، ئەحمەدی و محەممەدی.
٥. تایفەی شێخئاغا: حەقیقی و شێخئاغایی.

## دوو ناوچەی گرینگی مەهاباد

### محاڵ

لە فەرهەنگی "هەنبانەبۆرینە" (لاپەڕەی٨٠١ ئەستوونی دووەم) لە ژێر ناوی محاڵ هاتووە: [١. شتێ کە ناشێ ڕوو بدا، لە دەسەڵاتی بنیادەم بەدەر؛ ٢. کۆمەڵەئاوایی‌یەک لە سەرزەمینێکدا کە سەر بە یەکترین، ناوچە: (محاڵی مەنگوڕان، محاڵی یەختەچی)؛ ٣. ناوی ناوچەیەکە لە ڕۆژهەڵاتی مەهاباد]. هەروەها لە فەرهەنگی کوردستانی گیو موکریانی محاڵ بە مانای هەرێم هاتووە.

ناوچەی "محاڵ"ی شاری مەهاباد نزیک بە ٥٢ ئاوایی‌یە و دانیشتووانی ١١٦٧٢ کەسن. بەشێکی دیکەی ناوچەی محاڵ دەکەوێتە شاری بۆکان. محاڵی مەهاباد خاوەن چەندین شوێنی مێژوویی و سروشتییە، وەکوو: ئەشکەوتی سەهۆڵان، بەرزایی‌یەکانی چەکوچ، ماڵوک، قوتڕ و هتد. لە ئاوایی‌یەکانی یالاوەی سەرێ و خوارێ لە محاڵی مەهاباد بەگزادە دەژین، هەروەها ئاوایی کولیجە لەم ناوچەیە هەر لە کۆنەوە بە گوندی سەیدان ناسراوە. خەڵکی ئەم ناوچەیە سەرقاڵی ئاژەڵداری و وەرزێری و تا ڕادەیەکیش باغدارین. خەڵکەکەی بەگشتی مسوڵمانن و لەسەر مەزهەبی ئیمامی شافعین.

### شاروێران

لە قامووسی دێهخۆدا ئاوا باس لە شاروێران کراوە:

[یەکێک لە شەش دێهستانی دەوروبەری مەهابادە، دەوروبەری شارستانی مەهاباد کە لە ١٩ ئاوایی گەورە و بچووک پێکهاتووە ژمارەی دانیشتووانی ٢٤٣٤٠ کەسن و ئاوایی‌یەکانی بەناوبانگی بریتین لە: ئیندرقاش، حاجی‌خۆش، کۆزەکەرێز، ئازاد و لەج. ناوەندی دێهستان ئاوایی قومقەڵایە].

بەڵام ئێستا شاروێران گۆڕانکارییەکی زۆر بەسەردا هاتووە، شاری مەهاباد بۆتە پێنج دێهستان، کە شاروێران خۆی دێهستان نییە بەڵکوو بەسەر دێهستانەکانی موکریانی ڕۆژهەڵات و موکریانی ڕۆژاوادا دابەش بووە. شاروێران پتر لە ١٩ ئاوایی گەورە و بچووکی لەخۆ گرتووە، ژمارەی دانیشتووانی لە ساڵی ١٣٨٥ی هەتاوی‌دا ٣٣٦٤٨ کەسن. گۆکتەپە ناوەندی دێهستانی موکریانی ڕۆژهەڵاتە و ئاوایی درياس دەبێتە ناوەندی دێهستانی موکریانی ڕۆژاوا.

## کۆی حەشیمەتی ئاواییەکانی مەهاباد بە پێی دابەشکردنی ناوچەکە

| ناوچە | شوێنی نیشتەجێ بوون | ڕادەی بنەماڵەکان | ڕادەی دانیشتووان |
|---|---|---|---|
| شارویران | بەشی ناوەندی دێهستانی موکریانی ڕۆژهەڵات | ١٩٩٠ | ١٠٠٦١ |
| | بەشی ناوەندی دێهستانی موکریانی ڕۆژاوا | ٤٤٧٤ | ٢٣٥٨٧ |
| | کۆ | ٦٤٦٤ | ٣٣٦٤٨ |

| ناوچە | شوێنی نیشتەجێ بوون | ڕادەی بنەماڵەکان | ڕادەی دانیشتووان |
|---|---|---|---|
| گەورکایەتی | بەشی خەلیفان دێهستانی کانیبازاڕ | ٨٧٣ | ٥٧٧١ |
| | بەشی خەلیفان دێهستانی مەنگوڕایەتی ڕۆژهەڵات | ٣٩ | ٢٩٤ |
| | کۆ | ٩١٢ | ٦٠٦٥ |

| ناوچە | شوێنی نیشتەجێ بوون | ڕادەی بنەماڵەکان | ڕادەی دانیشتووان |
|---|---|---|---|
| محاڵ | بەشی خەلیفان دێهستانی کانیبازاڕ | ١٦٥ | ١١٢٧ |
| | بەشی ناوەندی دێهستانی ئاختاچی ڕۆژاوا | ١٤٥٤ | ٧٩١٠ |
| | بەشی ناوەندی دێهستانی موکریانی ڕۆژهەڵات | ٤٧٩ | ٢٦٣٥ |
| | کۆ | ٢٠٩٨ | ١١٦٧٢ |

| ناوچە | شوێنی نیشتەجێ بوون | ڕادەی بنەماڵەکان | ڕادەی دانیشتووان |
|---|---|---|---|
| مەنگوڕایەتی | بەشی خەلیفان دێهستانی کانیبازاڕ | ٥٧١ | ٣٣٠١ |
| | بەشی خەلیفان دێهستانی مەنگوڕی ڕۆژهەڵات | ١١٥٢ | ٧٣٠١ |
| | بەشی ناوەندی دێهستانی موکریانی ڕۆژاوا | ٢٩٦ | ١٨٨٢ |
| | کۆ | ١٩٦٥ | ١٢٤٨٤ |

کۆی زەوییەکان، باغەکان، تراکتۆر، لاوێردە، کۆمباین و تۆوچێنەر:

١. ئاختاچی ڕۆژاوا:

کۆی زەوییەکانی دێم ١١٨٧٣/٥ هێکتار؛ زەوییەکانی بەراو ٤٧١٧ هێکتار؛ باغەکان ١٨٢٨ هێکتار؛ تراکتۆر ٦٥٦ دانە؛ لاوێردە ٧٨ دانە

٢. کانیبازاڕ:

کۆی زەوییەکانی دێم ٨١١٢ هێکتار؛ زەوییەکانی بەراو ١٧٠٩ هێکتار؛ باغەکان ٣٥٢ هێکتار؛ تراکتۆر ٥١٦ دانە؛ لاوێردە ٣١ دانە؛ کۆمباین ٩ دانە

٣. مەنگوڕی ڕۆژهەڵات:

کۆی زەوییەکانی دێم ٩١٠٤/٧١ هێکتار؛ زەوییەکانی بەراو ٣٦٦٩/٢٥ هێکتار؛ باغەکان ٧٥٦/٩ هێکتار؛ تراکتۆر ٣٠٤ دانە؛ لاوێردە ٩٠ دانە

٤. موکریانی ڕۆژاوا:

کۆی زەوییەکانی دێم ٩٢٧٥/٦ هێکتار؛ زەوییەکانی بەراو ١٠١١٧ هێکتار؛ باغەکان ٣٣٣٧/٧٥ هێکتار؛ تراکتۆر ٩٣١ دانە؛ لاوێردە ٢٤٧ دانە؛ کۆمباین ٥؛ تۆوچێنەر (بذرپاش) ٤٠ دانە

٥. موکریانی ڕۆژهەڵات:

کۆی زەوییەکانی دێم ١٢٣٨٦ هێکتار؛ زەوییەکانی بەراو ٩١٥٩ هێکتار؛ باغەکان ٢٦٩٦/٦ هێکتار؛ تراکتۆر ٨٠٧ دانە؛ لاوێردە ١٦٥دانە.

# ئاوایی یەکان

## بەشی دووەم

**بوارەکانی جۆگرافیایی، مێژوویی، کۆمەڵایەتی و ئامار و ئەژماری ١٩٦ ئاوایی ئاوەدانی شاری مەهاباد**

## ئاچی‌دەرێ (هاچی‌دەرێ)

ئەم گوندە لە 54 کیلۆمیتری باشووری ڕۆژهەڵاتی شاری مەهاباد، بەشی ناوەندی و دێهستانی کانی‌بازاڕ و ناوچەی محاڵ هەڵکەوتووە. لە ٣٥ ماڵ و ٢٧٧ کەس پێکهاتووە، لەمانە ١١٥ کەس پیاون و ١١٢ کەسیش ژنن، ژمارەی خوێندەوارانی ئەم ئاوایی‌یە ١١٨ کەسن کە ٧٢ کەسیان پیاون و ٤٦ کەسیشیان ژنن، هەروەها لە ٨٣ کەسی نەخوێندەوار ٣١ کەسیان پیاون و ٥٢ کەسیشیان ژنن.

پانتایی ئاوایی 6942/33 هێکتارە کە 441/33 هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و 6501 هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.

ئاچی‌دەرێ خاوەن ١٣٨ هێکتار زەوی دێم، ٥١ هێکتار زەوی بەراو، ٨ هێکتار باخ و ٢٥ تراکتۆرە.

مەودای ئاچی‌دەرێ تا ناوەندی خزمەتگوزارییەکانی وەرزێری کانی‌بازاڕ ١٣ کیلۆمیترە.

| ئاوایی‌یەکانی دەوروبەر: | چیاکانی دەوروبەری ئاوایی: |
|---|---|
| باشوور: ئاوایی‌یەکانی شارەزوور و قۆیتەڵ | باشوور: مامپیرۆتە |
| باکوور: ئاوایی بەرەجۆ | باکوور: ئەشکەوتەڕووخاو |
| ڕۆژهەڵات: ئاوایی قۆڵغەتەپە (سەر بە شاری بۆکان) | ڕۆژهەڵات: میرقاز |
| ڕۆژاوا: ئاوایی میرەدێ | ڕۆژاوا: کۆلکەڕەشی |

لە باکووری ئاوایی، چیایەک هەڵکەوتووە کە چەند ساڵێک بەر لە ئێستا بریسکەیەک لێیدەدا و بەشێکی دەڕووخێنێ، هەر لەو دەمەوە ئەو شوێنە بە "ئەشکەوتەڕووخاو" ناودێر کراوە. چەند کانیاوێکی ئەم گوندە بریتین لە: کانی‌ئەسحاب، درۆزنە، جەهانگیر و خەندان.

دیواری زۆربەی ماڵەکان لە قوڕ و بەردە، بەڵام تا ڕادەیەک لە بلووکیش کەلک وەرگیراوە، میچی گشت ماڵەکان هەر بە دار داپۆشراوە، زۆربەی ماڵەکان خاوەن حەوشەن. هێندێک لە کۆڵانەکانی ئاوایی ڕێک و ڕاستەڕێین و هێندێکیان خواروخێچن. لە ڕۆژاوای ئاچی‌دەرێ لە قەراغ چۆمی "قووڵەبووز" ئاسەوار و بناغەی خانووبەرە دێنە بەرچاو کە بە وتەی بەساڵاچووانی ئاوایی کە ئەوانیش لە باب و باپیرانی خۆیان بیستووە، گۆیا ئەو شوێنە پێشتر ئاوایی بووە و ئێستا بە "کەڵەکان" دەیناسن.

لە باشووری ڕۆژاوای دێ، ڕێگایەکی خاکی دەچێتەوە ئاوایی قۆیتەڵ، لە ڕۆژهەڵاتەوە ڕێگایەکی خاکی ئاوایی قۆڵغەتەپە دەگرێتەوە و لە ڕۆژاواش ڕێگایەکی دیکە کە قیلەتاو کراوە بەرەو ئاوایی میرەدێ دەچێ.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی 1376/08/25 کارەبای بۆ هاتووە. قوتابخانەی سەرەتایی "کەیوان"، (کوڕانە ـ کچانە)ی هەیە. مزگەوت کە بۆ چوارمین جار لە ساڵی 1385ی هەتاوی نۆژەن کراوەتەوە. خاوەن بنکەی مخابەراتییە، هەروەها ئاچی‌دەرێ "شووڕای ئیسلامی"شی هەیە. بۆ کەلک وەرگرتن لە بنکەی تەندروستی سەر بە ئاوایی "بەرەجۆ"یە. بۆ وەرگرتنی نەوت و کەلوپەلیش ڕوو دەکەنە شەریکەی خەلیفان.

جێگای ئاماژەیە بینای قوتابخانەی ئاوایی بە هاوکاری خەڵک و دەوڵەت لە ساڵی ١٣٧٧ی هەتاوی ساز کراوە، بەڵام لە کارەبا، ئاو، حەوشە و ئاودەستخانە بێ‌بەهرەیە.

قوتابیان پاش تەواو کردنی پۆلی سەرەتایی بۆ درێژەپێدان بە خوێندن ڕوو دەکەنە خەلیفان و شاری مەهاباد. شایانی باسە کچان ئەم هەلەیان کەمتر بۆ دەڕەخسێ تا درێژە بە خوێندن بدەن.

بە هۆی نەبوونی لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە، خەڵکەکەی ئاوایی لە ئاوی چاڵاو کەلک وەردەگرن، هەڵبەت خەڵکەکە بۆ دابین کردنی ئاو زیاتر کەلک لە سەرچاوەی "کانی‌ئەسحاب" وەردەگرن. کار و پیشەی زۆربەی خەڵکی ئاوایی وەرزێری، کرێکاری و ئاژەڵدارییە. ئەوەی وەرزێران زیاتر دەچێنن گەنم و نۆکە. ئەو ئاژەڵانەی زیاتر بەهرەیان لێ وەردەگرن گوێلک و مانگایە.

باخەکانی ئاچی‌دەرێ کە زیاتر دارەسێو و دارەقەیسیین زۆربەیان ساوان و لە هێندێک شوێنی گوندەکە دارەگێوژیش دەبیندرێ.

گرفتەکانی خەڵکی ئاوایی: نەبوونی بنکەی تەندروستی سەربەخۆ، نەبوونی لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە، نەبوونی دێهیاری.

گۆڕستانی ئاچی‌دەرێ لە باکووری ڕۆژهەڵاتی ئاوایی هەڵکەوتووە.

# ئـازاد

گوندی ئازاد لە ٢٩ کیلۆمیتری باکووری ڕۆژهەڵاتی شاری مەهاباد، بەشی ناوەندی و دێهستانی موکریانی ڕۆژهەڵات و ناوچەی محاڵ هەڵکەتووە. لە ٥٧ ماڵ و ٣١٩ کەس پێکهاتووە کە ١٥٠ کەسیان پیاون و ١٦٩ کەسیش ژنن، ١٩٤ کەس خوێندەوارن کە ١٠٩ کەسیان پیاون و ٨٥ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٨٢ کەسی نەخوێندەوار ٢٧ کەسیان پیاون و ٥٥ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ١٨٦٩ هێکتارە کە ١٣٠٩ هێکتاری بۆ خەڵکی گوندەکە جیا کراوەتەوە و ٥٦٠ هێکتاریشی پاوان و لەوەرگەی دێیە.

ئازاد خاوەنی ١١٧٥ هێکتار زەوی دێم، ٢٠٧/٥ هێکتار زەوی بەراو، ٢٤ هێکتار باخ، ٣٣ تراکتۆر و ٢ لاوێردەیە.

بەرزایی ئاوایی لە ڕووکەشی زەریاوە ١٥٥٠ میترە.

| ئاواییەکانی دەوروبەر: | چیاکانی دەوروبەری ئاوایی: |
|---|---|
| باشوور: ئاوایی حاجیالیکەند | باشوور: کێوی سەکلووی سەرێ |
| باکوور: ئاواییەکانی تەنگباڵەکە و قوڵقوڵە | باکوور: گردی کۆتانێ |
| ڕۆژهەڵات: ئاواییەکانی سنجاغ و باجەوەند | ڕۆژهەڵات: شاخە بازیە |
| ڕۆژاوا: ئاواییەکانی بۆزە و خاتوونباخ | ڕۆژاوا: شاخی قەلان و هەباسزارا |

کانیاوەکان بە هەباسزارای سەرێ، هەباسزارای خوارێ، کانیقەلان، کانیگوڵان، سەکلووی سەرێ، سەکلووی خوارێ ناسراون. کۆنەخانووەکانی ئازاد لە قوڕ و بەردن و میچەکانیان بە دار داپۆشراون، خانوو نوێیەکان بە بلوک، خشت، چیمەنتۆ و ئاسن ساز کراون. ماڵەکان بەگشتی حەوشەیان هەیە و زۆربەیان یان بەرەورووی ڕۆژهەڵات یان ڕۆژاوان. زۆربەی کۆڵانەکانی ئەم دێیە ناڕاست و نارێکن، ناوەندی دێ خانووبەرەی چۆل و کاولبووی لێیە.

ئازاد بە مانای ڕزگاری و سەربەستییە، ڕوون نییە چۆناوچۆنە ئەم ناوەی بە سەردا براوە؟ لە باشووری گوندەکەوە ڕێگەیەکی خاکیی دەچێتەوە ئاواییەکانی سنجاغ و بۆزە، لە باکوورەوە ئاواییەکانی قوڵقوڵە و تەنگباڵەکە دەگرێتەوە، لە ڕۆژاواش دەچێتەوە سەر دوو ئاوایی باجەوەند و سنجاغ.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی ١٣٦٥/٨/١٤ کارەبای بۆ هاتووە، لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە کە عەنباراویان بۆ لێداوە و سەرچاوەی ئاوەکەی لە کانی "کاکەمەم"ەوە دابین دەبێ، تەلەیفوونی ماڵ بە ماڵ، سیمکارتی مخابەراتی دێهات، قوتابخانەی سەرەتایی (کوڕانە ـ کچانە) بە ناوی "حاجی سەید ساڵح نوورانی"، دێهیاری (ساڵی ١٣٨٨)، شەریکەی دابەشینی نەوت و کەلوپەل، مزگەوتێک بە ناوی "حەزرەتی محەممەد" (د.خ) کە ساڵی ١٣٨٦ هەتاوی نۆژەن کراوەتەوە؛ هەروەها ئازاد خاوەن شوورای ئیسلامییە و بۆ کاری بنکەی تەندروستی سەر بە ئاوایی "قوڵقوڵە"ن.

خوێندکارانی کوڕ و کچ بۆ درێژەپێدانی خوێندن دەچنە ئاوایی گوێکتەپە و شاری مەهاباد. کاروپیشەی خەڵکی ئازاد وەرزێری، ئاژەڵداری، باخداری و کرێکارییە. وەرزێران گەنم، نۆک، جۆ، گوڵەبەڕۆژە، کۆلزا و چەوەندەر دەچێنن، ئاژەڵەکانیش مەڕ و مانگان. بەرهەمی باخەکانی ئەم دێیە سێو، هڵوو و قەیسییە.

گرفتەکانی خەڵکی ئازاد: کەمئاوی و نەبوونی بنکەیەکی تەندروستی سەربەخۆ.

لە "سەکلوو"ی سەرێ (هەڵکەوتوو لە باشووری دێ) هێندێک کۆنەقەبری لێنە و دیارە پێشتر قەبرستان لەو شوێنە بووە، بەڵام ئێستە مردووەکان لە شوێنێکی دیکە، واتا لە باشووری دێ دەنێژرێن.

بەیتبێژی بەناوبانگ "محەممەدخەلیلشا"ماوەیەک لەم ئاواییە ژیاوە. هەروەها ژنێک بە ناوی "خات تەنکێ" لەو گوندە بووە کە زوو لەبەر نەبوونی ئیمکاناتی بێهداشتی و بنکەی تەندروستی حەکیمایەتی کردووە و بە کەلک وەرگرتن لە گیاوگوڵی ناوچەکە چارەسەری زۆر نەخۆشیانی کردووە.

## ئاغاسوور

له ٤٠ کیلۆمیتری باشووری رۆژاوای شاری مەهاباد، بەشی خەلیفان و دێهستانی مەنگوڕی رۆژهەڵات و له ناوچەی مەنگوڕایەتی هەڵکەوتووه. له ٢٠ ماڵ و ١٧٩ کەس پێکهاتووه، لەمانه ٩٤ کەسیان پیاون و ٨٥ کەسیش ژنن، ژمارەی خوێندەوارانی ئەم ئاوایییه ٨٦ کەسن که ٦٠ کەسیان پیاون و ٢٦ کەسیش ژنن، هەروەها له ٦٩ کەسی نەخوێندەوار ٢١ کەسیان پیاون و ٤٨ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ٣٦٠٠ هێکتاره که ٢٢٥ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوه و ٣٣٧٥ هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیه.

ئاغاسوور خاوەن ٢١٠/١ هێکتار زەوی دێم، ٦٧/٢٥ هێکتار زەوی بەراو، ٤/٦ هێکتار باخ، ٥ تراکتۆر و ٥ لاوێردەیه.

ئاوایییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی مەحموودئاوا

باکوور: ئاوایی ئافان

رۆژهەڵات: ئاوایی قۆزلووی گەوره

رۆژاوا: ئاوایییەکانی میرەسێ و کیسەڵان

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باشوور: شێوەقووڵ

رۆژهەڵات: قوڵەرێواساوی، هەوارەبا

رۆژاوا: کەرخوراو، کۆگان، زەرە، ئاغاسووری چکۆله و ئاغاسووری گەوره

کانیاوەکانیش بریتین له: کانی قووڵەمشکێ، کانی شێوەقووڵ، کانی خیزی، کانی کەرخوراو، کانی بەرۆژی، کانی فارسان، کانی کۆگان، کانی چۆرچۆر، کانی عەولای و کانی دەراوەمەڕ. هۆی ناودێر کردنی "کانی فارسان" دەگەڕێتەوه سەر ئەو زەمانی، واتا نزیک به ٤٠ ساڵ لەمەوبەر که دەستەیەک فارس‌زمان هاتبوونه ئەو ناوچەیه تا له گیایەک به ناوی "گوێنی"، "کەتیرا"ی بگرن.

خانووبەرەکانی به قوڕ و بەرد داندراون و میچەکەیان به دار داپۆشراوه و له قەدیمەوه هیچ چەشنه ئاڵوگۆڕێکی بەرچاو به سەر خانوویەکاندا نەهاتووه. زۆربەی ماڵەکان حەوشەیان نییه و کۆڵانەکان نارێک و نالەبار هەڵکەوتوون. چۆمێک به قەراغ رێگای هاتنه نێو ئاوایییەکەدا دێ، ئەم چۆمه که له "شیوەقووڵ"وه سەرچاوه دەگرێ دەچێتەوه ئاوبەندی مەهاباد.

ئاغاسوور ئاسەواری مێژوویی بەرچاوی لێ نییه که تۆمار کرابێ و نیشانده‌ری سەردەمێکی تایبەت بێ، بەڵام خەڵکی ئاوایی دەڵێن زۆر جار که بۆ ساز کردنی خانوو یان به هەر هۆیەکی دیکەوه زەویان هەڵکۆڵیوه گۆزه و سواڵەتی شکاویان دیونەوه. گۆڕستانی "دەراوی کۆگان"ی ئاغاسوور که گۆڕستانێکی مێژوویی بووه له لایەن کەسانێکی نەناسراو داویانەتەوه و دەستدرێژی کراوەته سەر.

بەر له ئێستا "ئاغاسوور" له باکووری رۆژاوا هەڵکەوتبوو که به"ئاغاسووری گەوره" ناوبانگی دەرکردبوو. مێژووی ئاوەدانبوونەوەی ئەم ئاوایییه دەگەڕێتەوه ساڵەکانی ١٢٧٠ ـ ١٢٨٠ی هەتاوی که لەسەر ئەمری مامحەسەن ئاریا (عومەری) ئاوەدان کراوەتەوه، له دوایی‌دا به هۆی نەگونجاو بوون و نالەبار بوونی شوێنەکه و دووربوونی له مەزراکان، دێیەکەیان بۆ شوێنی ئێستای گواستۆتەوه.

ئاغاسوور له باریکەرێی باکووری رۆژهەڵاتەوه، دەچێتەوه سەر ئاوایییەکانی ئافان، شۆڕاوا، سلۆک و رفته و له کۆتایی‌دا دەچێتەوه سەر رێگای مەهاباد ـ سەردەشت. باریکەرێی باکووری رۆژاوای دەچێتەوه سەر ئاوایییەکانی سۆڵغه، ئەسحاب و میرەدێ.

ئیمکاناتی ئاوایی: رێکەوتی ١٣٧٧/٥/٢ کارەبای بۆ هاتووه، سیم کارتی مخابەراتی دێهات، قوتابخانەی سەرەتایی "محەممەد" (کوڕانه ـ کچانه)، مزگەوتی "چوار یاری نەبی" که ساڵی ١٣٧٣ی هەتاوی به خەرجی خەڵکی خێرخواز نۆژەن کراوەتەوه. هەروەها ئەم دێیه خاوەن شووڕای ئیسلامییه. خوێندکاران بۆ درێژەدان به خوێندن دەچنه ئاوایی خەلیفان و شاری مەهاباد، هەڵبەت تەنیا کوڕەکانن بەو مافه گەیشتوون و کچان لەم مافه بێبەرین. بۆ بنکەی تەندروستی سەر به ئاوایی "ئافان"ن و نەوت و کەلوپەل له شەریکەی هاوبەشیی ئاوایی "حەوڵاکوردە" وەردەگرن.

کاروپیشەی خەڵکی ئاغاسوور وەرزێری، ئاژەڵداری و کرێکارییه، وەرزێران گەنم و جۆ دەچێنن و ئاژەڵەکانیان مەڕ و مانگان، زیاترین بەرهەمی باخەکانی ئەم ئاوایییه سێو و ترێیه. ئاوی خواردنەوەیان چاڵاوه و ئەمه گەورەترین گرفته بۆ خەڵکەکه، له پەنا ئەم گرفته کێشەی رێگاوبان و دارمانی قوتابخانەکەیانه که نیازی به نۆژەن کردنەوەیه. گۆڕستانی "زەڕه" له باشووری دێ هەڵکەتووه.

## ئافان

ئەم گوندە لە ٣٥ کیلۆمیتری باشووری ڕۆژاوای شاری مەهاباد، بەشی خەلیفان و دێهستانی مەنگوڕی ڕۆژهەڵات و لە ناوچەی مەنگوڕایەتی هەڵکەوتووە. خەڵکەکەی لە هۆزی "مەنگوڕ"ن، لە ٢٥ ماڵ و ١٦٠ کەس پێکهاتووە، لەمانە ٨٨یان پیاون و ٧٢ کەسیشیان ژنن، لە ١٠١ کەسی خوێندەوار لەم ئاوایییە ٦٦ کەسیان پیاون و ٣٥ کەسیش ژنن، لە ٤٢ کەسی نەخوێندەوار ١٣ کەسیان پیاون و ٢٩ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ٦٠٠٠ هێکتارە، لەمە ٤٧٥/٥ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە، ٥٥٢٤/٥ هێکتاریش پاوان و لەوەڕگەی دێیە.

ئافان خاوەن ٣٦٤/٤ هێکتار زەوی دێم، ٩٠/٧٩ هێکتار زەوی بەراو، ١٤/١٥ هێکتار باخ، ٦ تراکتۆر و ٥ لاوێردەیە.

بەرزایی ئاوایی لە ڕووکەشی زەریایەوە ١٥٧٠ میترە.

ئاوایییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی ئاغاسوور

باکوور: ئاوایییەکانی شۆڕاوا و سڵۆک

ڕۆژهەڵات: گەنەدار، کۆنەدێ شۆگای، قۆزلووی چووک

ڕۆژاوا: ئاوایییەکانی مڕانە و سۆڵغە

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باشوور: تەمتەم

ڕۆژهەڵات: کاورخوراو

ڕۆژاوا: مامەڵا

کانیاوەکانی بریتین لە: کانی سەرمابردوان، کانی هەواری قوڕاوی، هەوار سێتا، کانی حەسەنخەلیف، میرەکەرێ، کانی پیاوان، کانی پوورەمێرێ، کانی وسێن کەڵکان، خرێ پیرێژنێ، قەبری مامۆسمانی، هەوارەبڵیندە، کانی گەوە، کانی کەندەڵ، کانی مامەڵا، کانی خۆلەپۆلێ، پەلی قادر ناسری.

پێشتر زووبەی خانووبەرەکان هەر لە قوڕ بووە، بەڵام ئێستا لە بەرد و قوڕە و میچەکانیان بە دار داپۆشراوە، کۆڵانەکان لێژ و ناڕێکن، ماڵەکانیان حەوشەیان نییە و بە گشتی بەرەوڕووی باشوور ساز کراون.

سەبارەت بە چۆنییەتی ئاوەدانکردنەوە و ناودێرکردی ئەو دێیە زانیارییەک لە بەردەستدا نییە. هێندێک ئاسەواری مێژوویی ئەم ئاوایییە بریتین لە: قەڵای "کەسنەکێل" کە قەڵایەکی لە مێژینەیە، هەروەها ئەو شوێنانەی وەکوو: خرێ فەقەوەیس، کیفاڕاوێ، سەمبووریان و کانی حەمەکۆڵ (تاقەدار) کە هێشتا شوێنەواری ژیانی پێوە دیارە.

لە باشوور لە مەودایەکی بڕێک دوور لە ئاوایی ڕێگایەکی خاکی دووڕییانێک دەگرێتەوە کە یەکیان بەرەو ڕۆژاوا، ئاوایییەکانی سۆڵغە، ئەسحاب و میریسێ دەگرێتەوە، ئەوی دیکەیان کە بەرەو باشوورە دەچێتەوە ئاوایی ئاغاسوور، لە ڕۆژهەڵاتەوە دەچێتەوە ئاوایییەکانی شۆڕاوا، سڵوک، ڕفتە و ڕێگای سەرەکی مەهاباد ـ سەردەشت.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی ١٣٧٥/٩/٣ کارەبای بۆ هاتووە، لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە ـ کە لە چاڵاو دابین دەبێ ـ سیم کارتی مخابەراتی دێهات GSM، بنکەی تەندروستی، قوتابخانەی سەرەتایی "سەدر" (کوڕانە ـ کچانە)، مزگەوت کە لە سەردەمی کۆماری ئیسلامیدا لە لایەن خەڵکەوە خاوێن کراوەتەوە و گەورە بۆتەوە. نەوت و شرەوبرە لە شەریکەی هاوبەشیی ئاوایی "حەوڵاکوردە" وەردەگرن.

پێشتر لە ئافان قوتابخانە نەبووە، بەڵام مامۆستای گوندەکە لە دیوەخان، وانەی ئایینی بە منداڵان گوتۆتەوە. دواتر لە سەردەمی پەهلەویدا قوتابخانەیان سازکردووە کە ساڵی ١٣٨٨ی هەتاوی نۆژەن کراوەتەوە. قوتابییەکان بۆ درێژەدان بە خوێندن ڕێگای مەهاباد و خەلیفان دەپێون، کچەکان بەهەڵکەوت دەتوانن درێژە بە خوێندن بدەن. وەرزێری و ئاژەڵداری کاروپیشەی سەرەکی خەڵکی "ئافان"ە، هەڵبەت هێندێکیش باخیان هەیە. وەرزێران گەنم و جۆ دەچێنن و ئاژەڵەکانیان مەڕ و بزن و مانگایە. بەرهەمی باخەکانی ئاوایی گوێز، سێو، بادام، هڵوو و قەیسییە.

ئافان بە هۆی ئەوەی لە خرودۆڵان نزیکە هەر بە چەند ساڵان سێڵاوێک دەیگرێتەوە. لە ساڵانی ١٣٤٥ ـ ١٣٣٥ سێڵاوێکی وا هاتووە کە سی و پێنج سەری گوێلک لەگەڵ خۆی بردووە و هیچ زیانی گیانی لێ نەکەوتۆتەوە.

قەبرستانی ئافان بە ناوی "قۆڵەقەبران" لە باکووری دێ هەڵکەوتووە. هونەرمەندی ناسراو "حاجی سمایل کاکەلاو" ـ حەیرانبێژ و بەیتبێژ ـ لەم ئاوایییە چاوی بە دنیا هەڵێناوە و ماوەیەکی زۆریش لە ئاوایی سڵۆک ژیاوە.

# ئاڵبلاغ

"ئاڵبلاغ" لە ١٢ کیلۆمیتری باکووری ڕۆژاوای شاری مەهاباد، بەشی ناوەندی و دێهستانی موکریانی ڕۆژاوا و ناوچەی شارویران هەڵکەوتووە. لە ٢٦ ماڵ و ١٤٥ کەس پێکهاتووە کە ٧٢ کەس پیاون و ٧٣ کەسیش ژنن، ژمارەی خوێندەوارانی ئاوایی ٩٠ کەسن کە ٤٧ کەس پیاون و ٤٣ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٤١ کەسی نەخوێندەوار ١٧ کەس پیاون و ٢٤ کەس ژنن.
پانتایی ئاوایی ٤٠٠٠ هێکتارە، لەمە ١٦٢ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە، ٣٨٣٨ هێکتار پاوان و لەوەرگەی دێیە.
ئاڵبلاغ خاوەن ٦٠ هێکتار زەوی دێم، ٣٠٠ هێکتار زەوی بەراو، ٩٠ هێکتار باخ، ١٧ تراکتۆر، ٥ لاوێردەیە و ٢ تۆوچێنەرە (بذرکار).
بەرزایی ئاوایی ١٦٥٠ میتر لە ژوور ئاوی زەریاکانە.

ئاوایییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی بایندەرێ

باکوور: ئاوایی گۆلێ

ڕۆژهەڵات: ئاوایی کەرێزەی شێخان

ڕۆژاوا: ئاوایی چۆمەڵان

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باشوور: کێوی شێخ داود

باشووری ڕۆژاوا: مامقۆچاغ

باکوور: گردی فەقێبرایم

ڕۆژهەڵات: ماسیان

ڕۆژئاوا: شارۆستەم

لە باشوور لە سەر کێوی شێخ داود ئەشکەوتێکی لێیە، هەروەها لە ڕۆژاواش لە سەر کێوی شارۆستەم ئەشکەوتێکی دیکە هەڵکەوتووە.
خەڵکی ئاوایی سەبارەت بە کێوی "مامقۆچاغ" دەڵێن: هۆی ناودێر کردنی ئەم کێوە بە مامقووجاغ، ناوی کابرایەک بووە کە گڵکۆکەی لە سەر ئەو کێوە بووە. لە سەر ئەوەش کە بۆچی پێی گوتراوە "مام قووجاغ" یان "مام وجاغ"، دوو بۆچوون هەیە، ئەو کەسە واتا مامقووجاغ منداڵی نەبووە و وجاغکوێر بووە، لە بۆچوونی دووەمدا دەڵێن ئەو کابرایە چونکە پیاوێکی ئازا و بوێر بووە وایان پێگوتووە.
کانیاوەکانی ئەم گوندە بریتین لە: کانی خیزی، کانیاوی ئاڵبلاغ (گۆلیان لەسەر هەڵبەستووە)، کانی کەریمەڕەش و کانی درۆزنە.
قوڕ، بەرد، خشت و بلووک لەگەڵ میچی دار و ئاسن کەرەسەی لەکارکراوی خانووبەرەکانی ئەم گوندە پێکدێنن. لە ناوەندی دێ کاولەکۆنی وا کە مۆرەی زوون دێنە بەرچاو. کۆڵانەکان بەرتەسک و نارێکن، زۆربەی ماڵەکان خاوەن حەوشەن و بەرەو هەموو لایەکان ساز کراون.
وەک دەگێڕنەوە دەبێ "شێخ داود"ناوێک "ئاڵبلاغ"ی ئاوەدان کردبێتەوە. ئاڵبلاغ ناوێکی تورکییە و بە مانای "کانی سوور" هاتووە. دەرکەوتنی کووپەشکاو و سواڵەت کە زەوی دەکێڵدرێن، مێژوویی بوونی ئەم ئاوایییە دەسەلمێنن.
ڕێگایەکی قیلەتاو لە ڕۆژهەڵاتی ئاوایی، گوندەکانی کەرێزەی شێخان و بایندەرێ دەگرێتەوە، لە باکووریشەوە ڕێگایەکی خاکی دەچێتەوە ئاوایییەکانی چۆمەڵان و گۆلێ.
ئیمکاناتی ئاڵبلاغ: ڕێکەوتی ١٣٧٤/٤/٢٨ کارەبای بۆ هاتووە، لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە ـ کە عەمباراویان بۆ داناوە و ئاوەکەی لە کانی خیزی و کونەگورگە دابین دەبێ ـ تەلەیفوونی ماڵ بە ماڵ، شەریکەی هاوبەشیی نەوت و کەلوپەل، قوتابخانەی سەرەتایی "کەیهان" (کوڕانە ــ کچانە) کە بینایەکەی حازربەدەستە، هەروەها ئەو دێیە مزگەوتی هەیە و خاوەن شووڕای ئیسلامییە.
خوێندکاران بۆ درێژەدان بە خوێندن دەچنە ئاوایییەکانی گۆکتەپە، کەرێزەی شێخان و شاری مەهاباد، هەڵبەت ڕادەی کوڕەکان لە کچەکان زیاترە.
مزگەوت هەوەڵ جار لە لایەن ئاغاکان بە قوڕ و بەرد ساز کراوە، پاشان لە لایەن "مەلا حەولا"ناوێک بە خشت و چیمەنتۆ نۆژەن کراوەتەوە. بۆ بنکەی تەندروستی سەر بە ئاوایی "چۆمەڵان"ن. وەرزێری، ئاژەڵداری و باخداری کاروپیشەی دانیشتووانی ئەم گوندەیە. وەرزێران گەنم، جۆ و نۆک دەچێنن و زۆربەی ئاژەڵەکانیان مەڕ، بزن و تا ڕادەیەکیش مانگایە. بەرهەمی باخەکان لە سێو، ترێ، گوێز، بادام و هڵوو پێکهاتووە.
گرفتەکانی خەڵکی ئاڵبلاغ: نەبوونی بینای باش بۆ قوتابخانە. مردووەکان بە گشتی لە "گردی فەقێ برایم" و منداڵان بەتایبەتی لە "گردی شێخ داود" بە خاک دەسپێردرێن.

## ئامێد

گوندی ئامێد لە 25 کیلۆمیتری باشووری ڕۆژاوای شاری مەهاباد، بەشی خەلیفان و دێهستانی مەنگوڕی ڕۆژهەلات و لە ناوچەی مەنگوڕایەتی هەڵکەوتووە. لە ٥٢ ماڵ و ٣٢٦ کەس پێکهاتووە، لەمانە ١٧٦ کەسیان پیاون و ١٥٠ کەسیش ژنن، ژمارەی خوێندەوارانی ئەم ئاواییە ١٨٧ کەسن کە ١٢٢ کەسیان پیاون و ٦٥ کەسیش ژنن، هەروەها لە ١٠٤ کەسی نەخوێندەوار ٣٨ کەسیان پیاون و ٦٦ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی 9600 هێکتارە کە 218/5 هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و 9381/5 هێکتار پاوان و لەوەرگەی دێیە.

ئامێد خاوەن ٢٩٤ هێکتار زەوی دێم، ٥٨/٩٩ هێکتار زەوی بەراو، ١١/٧٣ هێکتار باخ، ١٢ تراکتۆر و ١ لاوێردەیە.

ئاواییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی سڵۆک

باکوور: ئاوایی خاتوونئەستی

ڕۆژهەلات: ئاوایی دۆڵپەمۆ

ڕۆژاوا: ئاواییەکانی سەرتان و زێوە

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باشوور: گۆڕەشکێن

ڕۆژاوا: بۆگەنیوە و بادینەکوێر

کانی سارد، جمگەی پەلی مامەڵلای، کانی درێژ و کانی پیاوان، کانیاوە بەناوبانگەکانی ئاوایین. کانی "جمگە" هەڵکەوتوو لە باشووری ڕۆژهەلاتی ئاوایی. هەنووکەش، وەک ساڵانی ڕابردوو، بەیانیان و ئێواران خەڵکی ئاوایی لە سەر ئەو کانییە کۆ دەبێتەوە و کاتێکی خۆش لە پەنا یەک تێپەڕ دەکەن.

خانووبەرەکانی ئاوایی لە قوڕ و بەردە و میچەکەشیان دارەڕایە، هەروەها پێکهاتەی هێندێک لە خانووبەرەکان خشت، بلووک و چیمەنتۆیە.

ماڵەکان بەرەوڕووی باشوور هەڵکەوتوون، هێندێکیان خاوەن حەوشەن و کۆڵانەکانی ئاوایی نارێک و بەرتەسکن.

جێی ئاماژەیە شارێکی کوردان لە بەشی"بادینان"یش هەر ناوی "ئامێد"ە و "گیو موکریانی" دەڵێ: بنچینەی ئەم واژەیە لە ماد و میدیا وەرگیراوە[1].

بەری ڕۆژهەلاتی ئەم ئاواییە ڕێگایەکی خاکی سەخڵەت بە مەودای نزیک بە 3 کیلۆمیتر، دەچێتەوە سەر ڕێگای مەهاباد ـ سەردەشت و ڕێگای هامووشۆی ئاوایی هەر بەم ڕێگایەدایە.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی 1368/11/30 کارەباکەی هەڵکراوە، لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە ـ عەنباراویان بۆ داناوە کە ئاوەکەی لە کانیاوەکانی"گەرۆخورکە" و"گۆڕەشکێن"دابین دەبێ ـ، سیمکارتی مخابەراتی دێهات، بنکەی تەندروستی، قوتابخانەی سەرەتایی "حافز" (کوڕانە ـ کچانە) دێهیاری (ساڵی ١٣٨٨)، مزگەوت ساڵی 1383ی هەتاوی نۆژەن کراوەتەوە و هەروەها ئامێد خاوەن دێهیاری و شووڕای ئیسلامییە. خەڵکی ئەم دێیە نەوت و کەلوپەلی پێویستیان لە شەریکەی هاوبەشیی ئاوایی حەولاکوردە دابین دەکەن.

قوتابیان پاش تێپەڕ بوونی پۆلی سەرەتایی ڕەوانەی ئاوایی خەلیفان و شاری مەهاباد دەکرێن، هەڵبەت بەشێک لەم قوتابیانە ئەم هەلەیان بۆ دەرەخسێ و ڕێژەیەکی کەمتری کچان لە بەرانبەر کوڕاندا دەتوانن درێژە بە خوێندن بدەن.

وەرزێری، ئاژەڵداری، کرێکاری و باخداری کاروپیشەی خەڵکی ئاواییە. وەرزێران گەنم، جۆ، گوڵەبەڕۆژە و نۆک دەچێنن. ئاژەڵەکانیان بریتین لە: مەڕ، مانگا و بزن، بەرهەمی باخەکان تێکەڵاوێکە لە سێو، ترێ، گوێز و قەیسی، هەڵبەت دارەکانی خۆڕسکیش لە جۆری کرۆسک، گێوژ، چەقالەی کێوی (بادام) و سنجوو هەن.

گرفتەکانی خەڵکی ئاوایی: نەبوونی بینایەکی شیاو بۆ قوتابخانە، ناخۆش و سەخڵەت بوونی ڕێگاوبانی ئاوایی.

گۆڕستانێکی مێژوویی ناسراو بە "قەبری بووزان" لە ڕۆژهەلاتی ئاوایی هەڵکەوتووە کە"قاوەخانە"شی پێدەڵێن. گۆڕستانی ئاوایی کە ئێستا مردووی لێ دەنێژن لە بەری ڕۆژاوا نزیک بە ئاوایی هەڵکەوتووە، هەروەها لە بەری باشووری ئاوایی کۆنەگۆڕستانێکی بەرتەسکی ناسراو بە "دۆڵەبابا" لێیە.

بەڕێز "جەعفەر ئائینپەرەست" نوێنەری شاری مەهاباد لە حەوتەمین خولی مەجلیسی شووڕای ئیسلامی، خەڵکی ئەم گوندەیە، هەروەها خوالێخۆشبوو "مینە مراد" بەیتبێژی ناسراو لەم ئاواییە ژیاوە.

---

١- فەرهەنگی کوردستان، لاپەڕەی ١٧ ئەستوونی یەکەم

# ئسووكەند (وسووكەند)

ئسووكەند لە ٥ كیلۆمیتری باكووری شاری مەهاباد، بەشی ناوەندی و دێهستانی موكریانی ڕۆژاوا و لە ناوچەی شارویران هەڵكەوتووە، لە ٤٨٨ ماڵ و ٢٣٤٥ كەس پێكهاتووە، لەمانە ١٢١٦ كەسیان پیاون و ١١٢٩ كەسیش ژنن، لە ١٦١٢ كەس خوێندەواری ئەم ئاواییە ٩٣٤ كەسیان پیاون و ٦٧٨ كەسیش ژنن، هەروەها لە ٤٥٣ كەسی نەخوێندەوار ١٣٢ كەسیان پیاون و ٣٢١ كەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ٩٥٠ هێكتارە، لەمە ٥٠٣ هێكتار بۆ خەڵک جیا كراوەتەوە، ٤٤٧ هێكتار پاوان و لەوەرگەی دێیە.

ئسووكەند خاوەن ٢٠٠ هێكتار زەوی دێم، ٣٨٥ هێكتار زەوی بەراو، ٤٢٧/٥ هێكتار باخ، ٢٩ تراكتۆر، ٧ لاوێردەیە.

ئاواییەكانی دەورووبەر:

باشوور: شاری مەهاباد

باكوور: ئاوایی دریاز

ڕۆژهەڵات: ئاوایی خانەگێ

ڕۆژاوا: ئاوایی كەرێزەی‌شێخان

لە بەری ڕۆژاوای دێ كێوی ئەشكەوتان هەڵكەوتووە كە دوو ئەشكەوتی لێیە.

لەو گوندە بۆ سازكردنی خانوو هەر وەک شار لە خشت، بلۆوک و چیمەنتۆ كەڵک وەردەگرن، میچی ماڵەكانیان بە ئاسن داپۆشراوە، هەرچەند هەندێک لە خانووەكان هێشتا هەر لە قوڕ و بەردن و میچەكانیان دارەڕایە و ئەو ماڵانە دەكەونە كۆنەگەڕەكەكانی ئاوایی. ماڵەكان حەوشەیان هەیە و كۆڵانەكان ڕاست و بەرفرەوانن. لە ساڵی ١٣٨٦ی هەتاوییەوە گەڵاڵەی هادی* لە ئسووكەند دەستی پێكردووە.

"تەپكی شەیتان‌ئاوا"بە ژمارەی تۆماركراوی ١٥٩٤١ لە میراتی فەرهەنگی، دەگەڕێتەوە سەدەی ٥ تا ٤ی كۆچی مانگی و لە بەرزایی ١٣٥٥ میتر لە ڕووكەشی زەریاكان، لەم ئاواییە هەڵكەوتووە، هەروەها "تەپكی خەلوە" بە ژمارەی تۆماركراوی ١٥٩٧٢ لە میراتی فەرهەنگی و بەرزایی ١٥٠٦ میتر لە ڕووكەشی زەریاكان، لە ڕۆژاوای دێ، دەگەڕێتەوە سەر هەزارەی هەوەڵی پێش زایین ـ ئەشكانی.

لە ٨ كیلۆمیتری جادەی مەهاباد ـ ورمێ شوێنێكی دیكە هەیە كە مێژووی دەگەڕێتەوە سەر هەزارەی هەوەڵی پێش زایین بە ژمارەی تۆماركراوی ١٦٨٤ لە میراتی فەرهەنگی و بەرزایی ١٣٢٥ میتر لە ڕووكەشی زەریاكانە و بە "بەردەكونتە" ناسراوە.

سەبارەت بە ناوی ئسووكەند دەبێ بڵێین كە ئسوو هەمان (یۆسف)ە و ئەو ناوە ناوێكی عێبرانییە كە وشەكە لە زمانی كوردی‌دا بەو شێوە سواوە و بۆتە "ئسوو"، "كەند" پاشگرێكی توركییە و بە مانای "دێ"، واتا بە مانای "دێی وسوو".

ڕێگای قیلەتاوی مەهاباد ـ ورمێ لە باشوورەوە بەرەو مەهابادە، لە باكوورەوە بۆ ورمێ دەچێ، لە ڕۆژاواوە ڕێگایەكی خاكی ئاواییەكانی كەرێزەی شێخان و بایندەرێ دەگرێتەوە.

ئیمكاناتی ئاوایی: ڕێكەوتی ١٣٥٥/٧/١٨ كارەبای بۆ هاتووە، لوولەكێشیی ئاوی خواردنەوە ـ كە عەنباراویان بۆ داناوە و ئاوەكەی لە چاڵاو دابین دەبێ ـ ناوەندی مخابەرات، تەلەیفوونی ماڵ بە ماڵ، پۆستبانک، بنكەی تەندروستی، شەریكەی نەوت و كەلوپەل و چیمەنتۆ، باخچەی ساوایان، قوتابخانەی سەرەتایی كوڕانەی "عارف" و كچانەی "١٣ی ئابان"، ئاكابیری، مزگەوتی "فاڕووقی‌ئەعزەم" كە ساڵی ١٣٧٨ی هەتاوی نۆژەن كراوەتەوە، كارخانەی خۆراكی ئاژەڵ و پەلەوەر و ئاوژیان، ساردخانەی ئۆكسیژێن، چوار جووجەخانە، یەک گاوداری، دوو كارگای تیرچە بلووک، دوو نانەوەخانە، هێڵی ڕاگواستن و هەروەها ئەو دێیە خاوەن دێهیاری، شووڕای ئیسلامی و شووڕای چارەسەری كێشەكانە.

خوێندكاران بۆ درێژەدان بە خوێندن دەچنە مەهاباد و لەم بابەتەوە هیچ جیاوازییەک لە نێوان كوڕان و كچاندا بەدی ناكرێ.

---

* گەڵاڵەیەكە وێڕای نەزمدان و چاكسازی و چەندی و چۆنییەتی ئاوایی، شوێنی پەرەپێدان و پانوپۆڕ بوونەوەی داهاتوویی ئاوایی و شێوەی دروست كەڵک وەرگرتن لە زەوی‌وزار بۆ ساز كردنی خانوو، شوێنەكانی بازرگانی و كشتوكاڵ دیاری دەكا.

ئەو گوندە بە هۆی نزیک بوونی لە شار، شێوازی شارنشینی بەخۆیەوە گرتووە و ناتوانین ئاماژە بە چەند کاروپیشەی تایبەت بکەین، بەڵکوو سەرەڕای وەرزێری، ئاژەڵداری و باخداری، هێندێک لە خەڵکەکەی کارمەند، بازاڕی، بازرگان و ماشێنداریشن. بەشێکی بەرچاو لە خەڵکەکە بە ڕۆژ لە مەهاباد خەریکی کاسبین و ئێواران دەگەڕێنەوە ماڵەکانیان.

بەرەی جووتیار لە ئسووکەند گەنم، جۆ و چەوەندەر دەچێنن و ئاژەڵداران زۆرتر مانگا ڕادەگرن و تا ڕادەیەکی کەم مەڕدارن. بەرهەمی باخەکان بریتین لە: سێو، قەیسی، هڵوو و هێندێکی دارپستەش لێیە.

گرفتەکانی خەڵکی ئسووکەند: نەبوونی قوتابخانەی ناوەندی و دواناوەندی، قیلەتاو نەبوونی کۆڵانەکانی نێو دێ، نەبوونی ئاوەڕۆی گشتی و گرفتەکانی تایبەت بە ئاوبەندی ئسووکەند کە دەبێ قوڕ و لیتەکەی دەربدرێ و خاوین بکرێتەوە، نەبوونی ئیمکاناتی وەرزیشی، دەگەڵ ئەوەی لە ژێر جادەکە ژێرگوزەریان لێدراوە، بەڵام لەمپەری قەراغ جادەی نزیک ئاوایی بۆ بەرگری لە خێرایی ماشێنەکان پێویستە.

گۆڕستانەکانی بریتین لە: گۆڕستانی سەید ئەحمەد، گۆڕستانی ماڵە سالمپوور (لە بەری باشوورە) و گۆڕستانی مینەی شیلاناوێ (لە بەری باکوور). هەنووکە خەڵکەکەی بۆ ناشتنی مردووەکانیان کەلک لە گۆڕستانی "مینەی شیلاناوێ" وەردەگرن.

## ئۆتەمیش (وەتەمیش)

ئەم گوندە لە ٣٩ کیلۆمیتری ڕۆژهەڵاتی شاری مەهاباد بەشی ناوەندی و دێهستانی ئاختاچی ڕۆژاوا و لە ناوچەی محاڵ هەڵکەوتووە. لە ٧٠ ماڵ و ٣٩٤ کەس پێکهاتووە، لەمانە ١٩٣ کەسیان پیاون و ٢٠١ کەسیش ژنن، لە ٢٣٩ کەسی خوێندەوار ١٣٤ کەسیان پیاون و ١٠٥ کەسیش ژنن، هەروەها لە١٢٣ کەسی نەخوێندەوار ٤٣ کەسیان پیاون و ٨٠ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی١٤٠١/٧ هێکتارە، لەمە ٧٩٦/٦ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە،٦٠٥/١ هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.

ئۆتەمیش خاوەن ٥٢٢ هێکتار زەوی دێم، ٥٠٨ هێکتار زەوی بەراو، ٨٨ هێکتار باخ، ٢٣ تراکتور، ١ لاوێردەیە.

ئاواییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی خانەقا (سەر بە شاری بۆکان)

باکوور: ئاواییەکانی شێخاڵی و قۆرغان

ڕۆژهەڵات: ئاواییەکانی قازانەسەر و لەگز

ڕۆژاوا: ئاواییەکانی یالاوە و قەڵاجوغە

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باشوور: کێوەسپی

باکوور: کێوی بێژینگبەسەر

ڕۆژهەڵات: شاخەڕەش و بەشێک لە کێوەسپی

لە باشووری دێ و لەسەر کێوەسپی، ئەشکەوتێک هەر بەم ناوە هەیە.

کانیاوەکان: کانی ڕەجەباڵی، کانیخودا، کانی حەمەسنە و کانی کەریمەکوێر.

لە ساز کردنی خانووبەرەدا خشت، بلوک، چیمەنتۆ و ئاسن دەکار کراوە و تا ڕادەیەک خانووی بە قوڕ و بەرد و میچی دار هەر ماوە. خانووەکان بەرەو هەرچوار لا هەڵکەوتوون و کۆڵانە تازەکان بەرفرەوانن و کۆڵانەکانی پێشتر بەرتەسک و نارێکن، ماڵەکان حەوشە و دەرگایان هەیە.

لە ڕۆژهەڵاتی ئاوایی "گردەتووکنە" و لە ڕۆژاوا "گردی شاری" هەڵکەوتووە کە ئاماژە بە مێژوویی بوونی ئەم دێیە دەکەن.

لە باشوور ڕێگای قیلەتاو بە مەودای ٤/٢ کیلۆمیتر جادەی سەرەکی مەهاباد ــ بۆکان (جادەی بورهان) دەگرێتەوە، لە باکوورەوە ڕێگای خاکی دەچێتەوە ئاواییەکانی شێخاڵی و قۆرغان، لە ڕۆژهەڵاتەوە ڕێگای خاکی دەچێتەوە ئاواییەکانی لەگز و مەڵلالەر، لە ڕۆژاواش ڕێگایەکی خاکی ئاواییەکانی یالاوەی سەرێ و خوارێ و قەڵاجوغە دەگرێتەوە.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی ١٣٦٤/٩/١٤ کارەبای بۆ هاتووە، لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە کە ساڵی ١٣٨٧ی هەتاوی جێبەجێ کراوە و خاوەن عەنباراوە و ئاوەکەی لە چاڵاو دابین دەبێ، تەلەیفوونی ماڵ بە ماڵ کە سەر بە بۆکانە، بنکەی پۆست، بنکەی تەندروستی، قوتابخانەی سەرەتایی (کوڕانە ــ کچانە) بە ناوی "لوقمان"، قوتابخانەی ناوەندی (کوڕانە ــ کچانە) بە ناوی "پەروەریش" کە هەردووک قوتابخانەکە لە یەک بینادان. ئاکابیری، شەریکەی هاوبەشیینەوت و کەلوپەل، نانەوەخانە، مزگەوتێک بە ناوی "شێخ باڵی" کە ساڵی ١٣٧٦ی هەتاوی نۆژەن کراوەتەوە و هەروەها ئەو دێیە خاوەن دێهیاری و شووڕای ئیسلامییە. قوتابیان بۆ درێژەدان بە خوێندن دەچنە مەهاباد یان بۆکان.

وەرزێری، ئاژەڵداری، باخداری و کرێکاری کارویپیشەی خەڵکی ئەو گوندەیە. وەرزێرەکان گەنم، جۆ، نۆک، چەوەندەر و وێنجە دەچێنن و ئاژەڵەکانیان مەڕ، بزن و مانگان. زۆرترین بەرهەمی باخەکانیان "سێو"ە.

گرفتەکانی خەڵکی ئاوایی: خراپ بوونی ڕێگای قیلەتاوی دێ، بەڕێوە نەچوونی گەڵاڵەی هادی، نەبوونی پەڕتووکخانە، نەبوونی بینا بۆ دێهیاری و هەروەها داواکارن مخابەراتەکەیان بگەڕێتەوە سەر شاری مەهاباد.

لە باشوور تا ڕۆژهەڵاتی دێ دوو گۆڕستانی کۆن و نوێ تێکەڵ بوونەوە.

جێگای ئاماژەیە "مەلای پیرەباب" بۆ ماوەیەکی زۆر لە ئاوایی ئۆتەمیش ژیاوە.

## ئۆزنده‌رێی خوارێ (وزنده‌رێ)

وزنده‌رێی خوارێ له‌ ٩ کیلۆمیتری باشووری ڕۆژهه‌ڵاتی شاری مه‌هاباد، به‌شی ناوه‌ندی و دێهستانی ئاختاچی ڕۆژاوا و له‌ ناوچه‌ی محاڵ هه‌ڵکه‌وتووه‌.

له‌ ٤١ ماڵ و ٢٦٠ که‌س پێکهاتووه‌، له‌مانه‌ ١٤٠ که‌سیان پیاون و ١٢٠ که‌سیش ژنن، له‌ ١٦٦ که‌سی خوێنده‌وار له‌م دێیه‌ ٩٦ که‌سیان پیاون و ٧٠ که‌سیش ژنن، هه‌روه‌ها له‌ ٧١ که‌سی نه‌خوێنده‌وار ٢٦ که‌سیان پیاون ٤٥ که‌سیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ٩٠٠ هێکتاره‌، له‌مه‌ ١١٠/٥ هێکتار بۆ خه‌ڵک جیا کراوه‌ته‌وه‌، ٧٨٩/٥ هێکتار پاوان و له‌وه‌ڕگه‌ی دێیه‌.

وزنده‌رێی خوارێ و سه‌رێ پێکه‌وه‌ خاوه‌ن ١٩٧ هێکتار زه‌وی دێم، ٦٣ هێکتار زه‌وی به‌راو، ٣٥ هێکتار باخ، ٢٠ تراکتۆر و ٨ لاوێرده‌یه‌.

ئه‌م ئاواییه‌ له‌ به‌رزایی ١٦٠٠ میتری ڕووکه‌شی زه‌ریاکان هه‌ڵکه‌وتووه‌.

ئاوایی‌یه‌کانی ده‌وروبه‌ر:

باشوور: ئاوایی گرده‌به‌ردان

باکوور: ئاوایی کۆنه‌دێی قازی

ڕۆژهه‌ڵات: ئاوایی ئه‌مین‌ئاباد

ڕۆژاوا: ئاوایی وزنده‌رێی سه‌رێ

چیاکانی ده‌وروبه‌ری ئاوایی:

باکوور: کێوی کونه‌کۆتر

ڕۆژهه‌ڵات: کێوی هه‌واره‌با

ڕۆژاوا: کێوه‌سپی

له‌ باشووری دێ ئه‌شکه‌وتێک هه‌ڵکه‌وتووه‌یه‌ که‌ به‌ "خرێ ئه‌شکه‌وت" ناسراوه‌.

کانیاوه‌کانی دوو ئاوایی ئۆزنده‌رێی خوارێ و سه‌رێ به‌ کانی گه‌زگه‌سک، مووچه‌سڵێ، کانی سارد و چاخشووده‌رێ ناسراون.

خانووبه‌ره‌کان له‌م دێیه‌ به‌ گشتی له‌ قوڕ و به‌ردن و میچه‌کانیان له‌ داره‌، کۆڵانه‌کان نارێک، به‌رته‌سک و باریکه‌ڵانه‌ن، زۆربه‌ی ماڵه‌کان خاوه‌ن حه‌وشه‌ن و به‌ گشتی ڕوو له‌ باکوور و وزنده‌رێی سه‌رێن. وزنده‌رێ ناوێکی تورکییه‌ به‌ مانای "دۆڵ و ده‌رێکی درێژ".

ڕێگایه‌کی خاکی له‌ باشووری گونده‌که‌وه‌ ده‌چێته‌وه‌ ئاوایی گرده‌به‌ردان، ڕێگای خاکی له‌ باکووری دوو ئاوایی وزنده‌رێی خوارێ و سه‌رێ ده‌چێته‌وه‌ ئاوایی کۆنه‌دێی قازی، له‌ ڕۆژاوای دوو ئاوایی ڕێگایه‌کی قیله‌تاو ده‌چێته‌وه‌ شاری مه‌هاباد.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکه‌وتی ١٣٧٧/٧/١٤ی هه‌تاوی کاره‌بای بۆ هاتووه‌، لووله‌کێشیی ئاوی خواردنه‌وه‌ که‌ ئاوه‌که‌ی له‌ چاڵاو دابین ده‌بێ و عه‌نباراویان بۆ داناوه‌، ته‌له‌یفوونی ماڵ به‌ ماڵ، بنکه‌ی ته‌ندروستی، نانه‌وه‌خانه‌.

خوێندکاران له‌ قوتابخانه‌ی سه‌ره‌تایی (کوڕانه‌ ــ کچانه‌) به‌ ناوی "موحه‌قیق" ـ له‌ ئۆزنده‌رێی سه‌رێ ـ له‌ چه‌ند میتری ئه‌م دێیه‌ که‌ڵک وه‌رده‌گرن، بۆ درێژه‌پێدان به‌ خوێندن ته‌نیا کوڕان ده‌نێرنه‌ شاری مه‌هاباد و کچان بێبه‌ش کراون و هه‌روه‌ها ئاوایی شووڕای ئیسلامی هه‌یه‌. خه‌ڵکی ئه‌م دێیه‌ نه‌وت و که‌لوپه‌ل له‌ شه‌ریکه‌ی هاوبه‌شیی ئاوایی "پشته‌تەپ"ی مه‌هاباد دابین ده‌که‌ن.

زورتری خه‌ڵکی ئه‌م گونده‌ ئاژه‌ڵدارن، وه‌رزێری و کرێکاریش ده‌که‌ن، ئاژه‌ڵه‌کانیان زۆرتر مه‌ڕ، بزن و تا ڕاده‌یه‌کیش مانگایه‌. وه‌رزێران گه‌نم و جۆ ده‌چینن و چه‌ند باخێکی لێیه‌ که‌ به‌رهه‌مه‌کانیان سێوه‌.

گرفته‌کانی خه‌ڵکی وزنده‌رێی خوارێ: نه‌بوونی بینایه‌کی باش بۆ قوتابخانه‌ی دوو ئاوایی که‌ حازر به‌ده‌سته‌، که‌م ئاویی، نه‌بوونی قوتابخانه‌ی ناوه‌ندی بۆ دوو ئاوایی.

گۆڕستانی ئه‌م دوو ئاوایی‌یه‌ هاوبه‌شه‌ و له‌ به‌ری ڕۆژاوای ڕێگای ئاوایی‌یه‌که‌ هه‌ڵکه‌وتووه‌.

له‌ ڕوانگه‌ی خه‌ڵکی ناوچه‌که‌، ئه‌م دوو دێیه‌، هه‌ر به‌ یه‌ک ئاوایی داده‌ندرێ چونکه‌ ئه‌م دوو ئاوایی‌یه‌ مه‌ودایه‌کی وایان نییه‌، زۆربه‌ی خه‌ڵکه‌که‌ی خزموکه‌سن و شایی و شینیان هه‌ر پێکه‌وه‌یه‌، هه‌ردووک لا له‌ ئیمکاناتێکی هاوبه‌ش که‌ڵک وه‌رده‌گرن. له‌ ڕاستی‌دا ئه‌م دابه‌ش‌بوونه‌ ده‌گه‌ڕێته‌وه‌ سه‌ر ده‌سه‌ڵاتداری ئه‌ربابه‌کانی ئه‌م دوو شوێنه‌ به‌ سه‌ر ڕه‌عیه‌ته‌کان‌دا که‌ ئه‌م دوو گونده‌ له‌ نێوان ئاغاکان‌دا دابه‌ش بووه‌. (ئاغاکانی وزنده‌رێی خوارێ "عه‌بباس تاهیر"ییه‌کان بوون).

## ئوزندەرێی سەرێ (وزندەرێ)

ئەم ئاوایی‌یە لە ٩ کیلۆمیتری باشووری ڕۆژهەڵاتی شاری مەهاباد، بەشی ناوەندی و دێهستانی ئاختاچی ڕۆژاوا و لە ناوچەی محاڵ هەڵکەوتووە. لە ٢٢ ماڵ و ١٧٣ کەس پێکهاتووە، لەمانە ٨٤ کەسیان پیاون و ٨٩ کەسیش ژنن، ڕادەی خوێندەواران لەم گوندە ٨٩ کەسە کە ٥٥ کەسیان پیاون و ٣٤ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٦١ کەسی نەخوێندەوار ٢٠ کەسیان پیاون ٤١ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ١٨٠٢ هێکتارە، لەمە ١٩٨/٥ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە، ١٦٠٣/٥ هێکتار سەرچاوەی نەتەوەیی‌یە.

وزندەرێی خوارێ و سەرێ پێکەوە خاوەن ١٩٧ هێکتار زەوی دێم، ٦٣ هێکتار زەوی بەراو، ٣٥ هێکتار باخ، ٢٠ تراکتۆر، ٨ لاوێردەنە.

ئەم ئاوایی‌یە لە بەرزایی ١٦٠٠ میتری ڕووکەشی زەریاکان هەڵکەوتووە.

ئاوایی‌یەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی گردەبەردان

باکوور: ئاوایی کۆنەدێی قازی

ڕۆژهەڵات: ئاوایی وزندەرێی خوارێ

ڕۆژاوا: ئاوایی قەرەچەلان و شاری مەهاباد

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باکوور: کێوی کونەکۆتر

ڕۆژهەڵات: کێوی هەوارەبا

ڕۆژئوا: کێوەسپی

لە باشووری دێیەکە ئەشکەوتێک هەڵکەوتووە کە بە "خرێئەشکەوت" ناسراوە. کانیاوەکان هەر ئەوانەن کە لە وزندەرێی خوارێدا ئاماژەیان پێکرا.

گشت خانووبەرەکان لە قوڕ و بەرد ساز کراون و میچەکانیان دارڕایە، ماڵەکان بە گشتی حەوشە و دەرگایان هەیە و بەرەو باشوور هەڵکەوتوون، ئەم شوێنەی ئەم دێیەی لێ هەڵکەوتووە لێژ و هەورازە. چومێک ئەم دوو دوو ئاوایی‌یە لێک جیا دەکاتەوە، بەڵام کۆنەپردێکی لە دار و گڵ پێکەوەیان گرێ دەداتەوە. هەروەکوو پێشتر ئاماژەمان پێکرد خەڵکی ئەم دوو دێیە خۆیان بە یەک دێ دەزانن و پێکەوە زۆر تەباورەبان و داواکاریشیان لە دەسەڵات هەر ئەوەیە کە وەک ئاوایی‌یەک چاویان لێ بکرێ تا بتوانن لە ئیمکاناتێکی زۆرتر کەلک وەرگرن.

ئەو دێیە لە سەردەمی ئەرباب ـ ڕەعییەتی‌دا مڵکی ماڵە "قازی" بووە.

ڕێگایەکی خاکی لە باشووری گوندەکەوە دەچێتەوە ئاوایی گردەبەردان، ڕێگای خاکی لە باکووری دوو ئاوایی وزندەرێی خوارێ و سەرێ دەچێتەوە ئاوایی کۆنەدێی قازی، لە ڕۆژاوای دوو ئاوایی ڕێگایەکی قیلەتاو دەچێتەوە شاری مەهاباد.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی ١٣٧٧/٧/١٤ کارەبای بۆ هاتووە، لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە کە دەگەڵ وزندەرێی خوارێ پێکەوەیە و عەنباراویان بۆ داناوە و ئاوەکەی لە چاڵاو دابین دەبێ، قوتابخانەی سەرەتایی (کوڕانە ـ کچانە) بە ناوی "موحەقیق" کە بیناکەی حازربەدەستە، مزگەوتێک بە ناوی "خۆلەفای ڕاشیدین"، تەلەیفوونی ماڵ بە ماڵ، دەفتەری مخابەراتی. ئوزندەرێی سەرێ خاوەن شووڕای ئیسلامییە و هەروەها بنکەی تەندروستی و نانەوەخانەیان دەگەڵ ئوزندەرێی خوارێ هاوبەشە و نەوت و کەلوپەل لە شەریکەی پشتەپ لە مەهاباد وەردەگرن.

لەو دێیە بۆ درێژەپێدان بە خوێندن زۆربەی کوڕەکان دەنێردرێتە شاری مەهاباد و کچەکان لەو بابەتەوە بێ بەشن.

ئاژەڵداری وەک کاروپیشەی سەرەکی خەڵکی ئەم گوندەیە وەرزێری و کرێکاریش دەکەن، ئاژەڵەکانیان زیاتر مەڕن، مانگا و بزنیش بەخێو دەکەن، وەرزێرەکان گەنم، جۆ و نۆک دەچێنن.

ئەم دوو ئاوایی‌یە گرفتەکانیان هەر یەکن و سەرەڕای زۆر بوونی ژمارەی دانیشتووانی ئەم دوو ئاوایی‌یە ئیمکاناتێکی باشیان نەدراوەتێ.

گۆڕستانەکەیان هاوبەشە و لە بەری ڕۆژاواوە هەڵکەوتووە و هەردوو ئاوایی - ئوزندەرێی خوارێ و سەرێ - کەلکی لێ وەردەگرن.

## ئوزونتاش (وزنتاش)

وزنتاش لە ٦١ کیلۆمیتری باشووری ڕۆژهەڵاتی شاری مەهاباد، بەشی خەلیفان، دێهستانی کانی بازاڕ و لە ناوچەی گەورکایەتی هەڵکەوتووە، لە ٤٥ ماڵ و ٣٧١ کەس پێکهاتووە لەمانە ١٨٦ پیاون و ١٨٥ کەسیش ژنن، لە ١٩٥ کەسی خوێندەواریان١٢١ کەسیان پیاون و ٧٤ کەسیش ژنن، هەروەها لە ١٢٥ کەسی نەخوێندەواریان ٣٩ کەس پیاون و ٨٦ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ٥٥٠٠ هێکتارە، لەمە ٥٠٠ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە، ٥٠٠٠ هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.

وزنتاش خاوەن ١٧٠ هێکتار زەوی دێم، ٢٢ هێکتار زەوی بەراو، ٨ هێکتار باخ و ١٩ تراکتۆرە.

مەودای ئاوایی تا ناوەندی خزمەتگوزارییەکانی وەرزێری کانیبازاڕ ١١ کیلۆمیترە.

ئاواییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی باراوا

باکوور: ئاوایی یەڵتەمر

ڕۆژهەڵات: ئاوایی کانیسێو

ڕۆژاوا: ئاوایی چوارگا

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باشوور: کێوی گۆلان و گردەگرۆێ

باکوور: کۆنەکەرێز

ڕۆژهەڵات: شاخەسوور

ڕۆژاوا: کێوی کەماجار

کانیاوەکان بە ڕەحمانی سەیزادە، سەید عەلی، عەزیزی نادری، حاجی هەمزە و کانیگۆلان ناسراون.

بۆ سازکردنی خانووبەرەکان زیاتر قوڕ و بەرد دەکار کراوە و میچەکانیان دارەڕایە، بە ڕادەیەکی زۆر کەم خشت و بلووکیش دەکار کراوە. ماڵەکان خاوەن حەوشەن و کۆڵانەکان ڕێک و ڕاستن، مزگەوتەکەی لە ناوەندی دێیە. وزنتاش ناوێکی تورکییە و بە مانای "بەردی درێژ"ە.

لە ڕۆژهەڵاتی ئاوایی ڕێگایەکی ئامادە بۆ قیلەتاو بە مەودای ٣ کیلۆمیتر دەچێتەوە ئاوایی کانیسێو، لە باکووریشەوە ئاوایی یەڵتەمر دەگرێتەوە.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی ١٢/١٩/ ١٣٧٢ کارەباکەی هەڵکراوە، لولەکێشیی ئاوی خواردنەوە کە ئاوەکەی لە کانیگۆلان دابین دەبێ، سیمکاتی مخابەراتی دێهات، قوتابخانەی سەرەتایی "سینا" (کوڕانە ـــ کچانە)، دێهیاری(ساڵی ١٣٨٨ هـ)، مزگەوتێک بە ناوی "ئیمام عومەر" کە ساڵی ١٣٨٠ی هەتاوی نۆژەن کراوەتەوە و هەروەها ئەم دێیە خاوەن شووڕای ئیسلامییە.

خوێندکاران بۆ درێژەی خوێندن دەچنە ئاوایی خەلیفان و کچەکان بێ بەشن. بۆ بنکەی تەندروستی و وەرگرتنی کەلوپەل و نەوت سەر بە ئاوایی "کانی سێو"ن.

وەرزێری، ئاژەڵداری، کرێکاری و باخداری کاروپیشەی خەڵکی ئەم گوندەیە. وەرزێران گەنم، نۆک، جۆ و نیسک دەچێنن و ئاژەڵەکان مەڕ، بزن و مانگان. زۆرتری باخەکان ساوان.

گرفتەکانی خەڵکی ئاوایی: نەبوونی بنکەی تەندروستی سەربەخۆ، نەبوونی پردێک بۆ پەڕینەوە.

گۆڕستانی "پیرخدر" لە باشووری دێ و "قەبرەوردکان" لە باکووری دێیە. لە ڕۆژهەڵات لە شوێنێک بە ناوی "چاکەچکۆلە" مردووەکانیان دەنێژن و لە ڕۆژاواش گۆڕستانێکی دیکە بە ناوی "چاکی چەقالان" هەیە.

"ڕەسووڵ نادری"ی حەیرانبێژ و قسەخۆش، "خدر جەوانمەردی"ی بەیتبێژ کە ئێستا لە شاری بۆکان دەژی، لە ئەم ئاواییە لە دایک بوون.

## ئەسحاب

ئەسحاب لە ٤٨ کیلۆمیتری باشووری ڕۆژاوای شاری مەهاباد، بەشی خەلیفان و دێهستانی مەنگوڕی ڕۆژهەڵات و لە ناوچەی مەنگوڕایەتی هەڵکەوتووە.
لە ٢١ ماڵ و ٨٨ کەس پێکهاتووە، لەمانە ٤٣ کەسیان پیاون و ٤٥ کەسیش ژنن، لە ٣٥ کەسی خوێندەواری لەم ئاواییە ١٨ کەس پیاون و ١٧ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٣٧ کەسی نەخوێندەواریان ١٦ کەس پیاون و ٢١ کەسیش ژنن.
پانتایی ئاوایی ٧١٠/٥ هێکتارە، لەمە ١٣٠/٥ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە، ٥٨٠ هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.
ئەسحاب خاوەن ٢١ هێکتار زەوی دێم، ٢٢ هێکتار زەوی بەراو، ٣٣/٣٢ هێکتار باخ، ١ تراکتۆر، ١ لاوێردەیە.

ئاواییەکانی دەوروبەر:
باشوور: ئاوایی میرەسێ
باکوور: ئاوایی گۆمڵیان
ڕۆژهەڵات: ئاوایی سۆڵغە
ڕۆژاوا: ئاوایی هەرمێ

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:
ڕۆژهەڵات: کێوی خۆلەپۆلە
ڕۆژاوا: کێوی گۆزەڵە

دوو کانیاوەکەی ئەسحاب بریتین لە: "کانی شێخی" و "کانی نێو دێ".
خانووبەرەکان بە گشتی قوڕ و بەردن و میچەکانیان لە دارن، ماڵەکان بەرەو باشوور هەڵکەوتوون و حەوشەیان نییە، کۆڵانەکانیش باریکەڵانە و هەورازن. ئەسحاب ناوێکی عەرەبییە و بە مانای "یار و هاودەم" هاتووە کە لە ئایینی پیرۆزی ئیسلامدا بە یارانی پێغەمبەری خودا (د.خ) دەگوترێ، خەڵکەکەی دەڵێن لە گۆڕستانی دێ کە لە بەری باشوور هەڵکەوتووە قەبری ئەسحابەیەکی نەناسراوی لێیە.
لە باشووری ئاوایی ڕێگایەکی خاکی دەچێتەوە ئاوایی میرەسێ.
ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی ١٣٧٦/٩/٢٦ کارەباکەی هەڵکراوە، لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە کە عەنباراویان بۆ لێداوە، بنکەی مخابەرات، قوتابخانەی سەرەتایی "ئالی عومران" (کوڕانە ــ کچانە)، مزگەوتێک کە ساڵی ١٣٨٢ی هەتاوی لە قوڕ و بەرد ساز کراوە.
بۆ درێژەدان بە خوێندن کوڕەکان دەچنە ئاوایی خەلیفان و شاری مەهاباد، کچەکان تا ئێستا نەیانتوانیوە درێژە بە خوێندن بدەن.
کەلوپەل و نەوت لە ئاوایی سیاقوڵی خواروو وەردەگرن، بۆ بنکەی تەندروستی سەر بە ئاوایی "میرەسێ"ن.
وەرزێری، ئاژەڵداری، کرێکاری و تا ڕادەیەک باخداری کاروپیشەی خەڵکی ئەو گوندەیە. وەرزێران گەنم و جۆ دەچێنن و ئاژەڵەکانیان مەڕ و مانگان، بەرهەمی باخەکانی ئاوایی لە سێو، قەیسی و گوێز پێکهاتووە.
گرفتەکانی خەڵکی ئەسحاب: ڕێگای خاکی و ناخۆش، نەبوونی بینای باش بۆ قوتابخانە، نەبوونی بنکەی تەندروستی سەربەخۆ.
گۆڕستانەکەی لە باشووری ئاوایی هەڵکەوتووە.

## ئەمینئاباد

ئەمینئاباد لە ٣٠ کیلۆمیتری ڕۆژهەڵاتی شاری مەهاباد، بەشی ناوەندی و دێهستانی ئاختاچی ڕۆژاوا و لە ناوچەی محاڵ هەڵکەوتووە. لە ٩ ماڵ و ٦٨ کەس پێکهاتووە، لەمانە ٣٥ کەسیان پیاون و ٣٣ کەسیش ژنن، لە ٣٩ کەسی خوێندەواریان ٢٢ کەس پیاون و ١٧ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٢٢ کەسی نەخوێندەوار ١٠ کەسیان پیاون و ١٢ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ٩٤٣/٤٠ هێکتارە، لەمە ٩١/١٤ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و ٨٥٢/٢٦ هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.

ئەمینئاباد خاوەن ٣٩/٥ هێکتار زەوی دێم، ٢٢ هێکتار زەوی بەراو، ١١/٥ هێکتار باخ، ١ تراکتۆر، ١ لاوێردەیە.

ئاواییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی گردەبەردان

باکوور: ئاواییەکانی قزڵجەی سەرێ ـ ئێستە چۆڵە ـ شیلاناوێ و کۆنەدێی قازێ

ڕۆژهەڵات: ئاوایی قزڵجەی خوارێ

ڕۆژاوا: ئاواییەکانی وزندەرێی سەرێ و خوارێ

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باشوور: کێوی کەرزاوان

باکوور: کێوی شێخ هەیدەر

ڕۆژهەڵات: کێوی هێلانەهەڵۆ

ڕۆژاوا: کێوی میرزادەکوردە

لە بەری ڕۆژهەڵات و لە سەر کێوی "هێلانەهەڵۆ" ئەشکەوتێک بە ناوی "کونەورچ" هەڵکەوتووە.

کانیاوەکان: کانی مار، کانی سارد، کانی حەیزەکەچەڵ، گۆلی شاخی.

خانووبەرەکان بە گشتی لە قوڕ و بەرد داڕێژراون و میچەکانیان بە دار داپۆشراوە، زۆرتری ماڵەکان بەرەو ڕۆژهەڵاتن و خاوەن حەوشەن، دوو کۆڵانەکەی دێ نارێک و خواروخێچن و بە گەڕەکی سەرێ و خوارێ ناسراون. چۆمی "ڕژدان" کە سەرچاوەکەی هەر لە "ئەمینئاباد"وەیە بە نێو ئاواییدا تێپەڕ دەبێ و لەگەڵ چۆمی قزڵجە تێکەڵ دەبێتەوە و لە ئاکامدا دەچێتەوە میراوای بۆکان. بە وتەی بەساڵاچووانی ئاوایی، پتر لە سەد ساڵ لەمەوبەر کابرایەک بە ناوی سەید حەمەدەمین ئەو دێیەی ئاوەدان کردووتەوە و پاش ئەویش بنەماڵەی سەید "مەنسور"ناوێک هاتوون و بوون بە دوو ماڵ. دوور نییە ئەگەر بڵێین ناوی ئاوایی هەر بە ناوی سەید حەمەدەمین کرابێ و بە ئەمین ئاباد ناوی دەرکردبێ. لە باکووری ئەو دێیە قەڵایەکی لێیە کە بە قەڵای "کانی لووک" ناسراوە.

لە لای باشوورەوە ڕێگایەکی خاکی هەیە کە ئاوایی "گردەبەردان" دەگرێتەوە، لە باکووریشەوە ڕێگایەکی خاکی دیکە دەچێتەوە سەر ئاواییەکانی قزڵجەی سەرێ و دەرمان.

ئیمکاناتی ئاوایی: کارەبا، سیمکارتی مخابەراتی دێهات، قوتابخانەی سەرەتایی "مەسعوود"(کوڕانە ــ کچانە). بۆ کاروباری پێوەند بە تەندروستییەوە دەچنە بنکەی گردەبەردان. نەوت و کەلوپەل لە شەریکەی پشتەپ لە مەهاباد وەردەگرن.

ئاوی ئەمینئاباد لە چاڵاو و کانی ماڵان دابین دەبێ و لولەکێشی بۆ نەکراوە.

ئەو خوێندکارانەی درێژە بە خوێندن دەدەن دێنە شاری مەهاباد، ئەم مافە بۆ کچان و کوڕان پارێزراوە و هیچ جیاوازێک لە نێوان ئەواندا نییە.

وەرزێری، ئاژەڵداری، کرێکاری و تا ڕادەیەکی کەم باخداری کاروپیشەی خەڵکی ئەو گوندەیە. وەرزێران گەنم و نۆک دەچێنن و ئاژەڵەکانیان مەڕ، بزن و مانگان. بەرهەمی باخەکانیش سێو و گوێزن.

گرفتەکانی خەڵکی ئەمینئاباد: ڕێگای خاکی و ناخۆش ـ بەتایبەت لە وەرزی زستان و سەرماوسۆڵدا ـ نەبوونی لولەکێشی ئاوی خواردنەوە، نەبوونی بنکەی تەندروستی سەربەخۆ.

گۆڕستانەکەی بە ناوی "چاکی گوێنیان" لە باکووری ئەم گوندەکەوە هەڵکەوتووە.

## ئیندرقاش

ئیندرقاش لە ١٠ کیلۆمیتری باکووری شاری مەهاباد، بەشی ناوەندی و دێهستانی موکریانی ڕۆژاوا و لە ناوچەی شارویران هەڵکەوتووە. لە ٥٨٩ ماڵ و ٢٩١١ کەس پێکهاتووە، لەمانە ١٤٨٢ کەس پیاون و ١٤٢٩ کەسیش ژنن، لە ١٩١٣ کەسی خوێندەوار لەم دێیە ١٠٨١ کەسیان پیاون و ٨٣٢ کەسیش ژنن، لە ٧٠٨ کەسی نەخوێندەوار ٢٤٥ کەسیان پیاون و ٤٦٣ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ١٩٤٣ هێکتارە، لەمە ١١٩٦ هێکتار بەدەست خەڵکەوەیە،٧٤٧ هێکتاریشی پاوان و لەوەڕگەی دێیە.

ئیندرقاش خاوەن ٢٠٠ هێکتار زەوی دێم، ٧٥٠ هێکتار زەوی بەراو، ٨٥٠ هێکتار باخ، ٤٧ تراکتۆر و ٩ لاوێردەیە.

ئەم ئاوایی‌یە لە بەرزایی ١٣٣٠ میتری ڕووکەشی زەریاکان هەڵکەوتووە.

ئاوایی‌یەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی خانەگێ

باکوور: ئاوایی‌یەکانی قووم‌قەڵا و قەرەخان

ڕۆژهەڵات: ئاوایی گۆکتەپە

ڕۆژاوا: بەشێک لە ئاوایی قووم‌قەڵا و ئاوایی دریاز

ئەم دێیە دەشتایی‌یە و جگە لە هێندێک تەپۆڵکەی نەوی هیچ کێوێک بەدی ناکرێ.

خانووەکانیان لە خشت و چیمەنتۆیە، میچەکانیشیان بە ئاسن داپۆشراوە. کۆڵانەکانیان ڕێکوپێکن و قیلەتاو کراون و قاناویان تێگیراوە. ماڵەکان حەوشەیان هەیە و بەرەو هەر چوار لا ساز کراون. گەڵاڵەی هادی ساڵی ١٣٨٢ی هەتاوی لەم ئاوایی‌یە دەستی پێکردووە.

"شارویران" کە لە دایرەی میراتی فەرهەنگی ئازەربایجانی ڕۆژاوا، بە ژمارەی ٩ تۆمار کراوە لە نزیک ئیندرقاش هەڵکەوتووە. شارویران شوێنێکی مێژووییە کە "بەتلەمییووس" بە "داروشا" ناوی بردووە؛ "راولینسۆن" نووسەری بریتانی بە "داریاسی" ناوە هێناوە کە دریاس ئێستا ناوی ئاوایی‌یەکە لە ڕۆژاوای ئەم دێیە.

ئەشکەوتی دەسکردی "فەقرەقا"* بە ژمارەی تۆمارکراوی ٢٨٨ کە بەرزایی لە ڕووکەشی زەریاکانەوە ١٣٣١ میترە، لە باکووری ئیندرقاش هەڵکەوتووە. لێکۆڵەران و کەوناراناسان بە گلکۆی "فەرەوەرتیس" پاشای ماد و باوکی دیاکۆی دەناسن. لە ژوورەوەی ئەم ئەشکەوتە، ژوورێک هەڵقەندراوە و چوار کۆڵەکەی بەردین ئەم بینایەیان ڕاگرتووە. نێو فەقرەقا سێ گۆڕی تێدایە کە دراونەوە و تاڵان کراون.

---

* لە ژمارە ٨٠ ی گۆڤاری مەهاباد، لاپەڕەی ٢٠، "عومەر عەبدوڵلابەگی ' لە ژێر شناسنامەی وشە یا "ماکەی ناو"ی ئاوایی‌یەکان‌دا بۆ "فەقرەقا" نووسیویتی:

... پرۆفیسۆر گیرشمەن بە فەقرەقا دەڵێ: "فەخریگا"، پرۆفیسۆر دیاکۆنۆف بە فەقرەقا دەڵێ: "فەخریک" ، کاک مەحموود پێدڕام لە کتێبی "تمدن مهاباد"دا بەم شوێنەوارە دەڵێ: "فراگاه"، زۆر جار لێرە و لەوێ بە فەقرەقا دەڵێن (فەخرگا – فەقرگا).

بۆچوونی یەکەم: من پێم وایە تەواوی ئەو نێوانەی سەرەوە هەڵەن و تەنیا ئەوەی ئێستا لە سەر زاری خەڵکی ناوچەکە ماوەتەوە و ئەویش وشەی "فەقرەقا"یە ڕاستە. ئەم وشەیە لە ڕواڵەتدا لە دوو بەش پێکهاتووە، بەڵام لە نێوەرۆک و زاتی خۆی‌دا سێ بڕگەیە: (فەقرە = فاق + قەرە = ڕەشی قەڵەشاو، شکافتە) + (قا – قایا = تەلە سەنگ – لاشە سەنگ)

- وشەی فاق = قەڵەش ـ درز ـ شکاف ـ شکافتە

- وشەی قەرە = ڕەش ـ سیاه ـ وشەیەکی تورکییە

وشەی "فاق" لەگەڵ وشەی "قەرە" تێکەڵاو بووە وشەی "فەقرە"یان پێکهێناوە، یانی پیتی "ق"ی فاق و پیتی "ق"ی قەرە لە یەکتردا ئیدغام بوون(بە قەولی عەرەب) کە وابوو مانای سەرجەمی وشەی فەقرەقا دەبێتە: (بەردی ڕەشی قەڵشاو) یا (سنگ سیاه شکافتە)...

بۆچوونی دووەم: وشەی فەقرەقا لە دوو بەش ساز بووە: (فەقرە ـ فەخرە = شانازی ـ سەربەرزی) + (قا ـ قایا ـ تەلەسەنگ ـ تەختە سەنگ). لێرەدا مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە: (بەردی شانازی ـ بەردی سەربەرزی ـ سنگ افتخار). وێش دەچی، بەو هۆیە کە فەقرەقا شوێنی ناشتنی گەورەپیاوانیماننایی یان مادییە. من بەش بە حاڵی خۆم بۆچوونی یەکەم بە ڕاست دەزانم. دەبێ ئەوەشمان لەبیر بێ گەرچی فەقرەقا شوێنەوارێکی کۆنی بەر لە زایینە و بەر لە هاتنی تورکان بۆ ئێران دەبێ ناوێکی دیکەی بووبێ، بەڵام ئەو ناوەی ئێستای، پاش هاتنی تورکان بە سەری‌دا براوە و تورکییە...

"تەپەی گردعەلی" بە ژمارەی تۆمارکراوی ١٥٩٧٥ کە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمانی بەر لە مێژوو ـ سەدەی ٤ تا ٦ی کۆچی مانگی، بە بەرزایی ١٣١٠ میتر لە ڕووکەشی زەریاکان، لە دوو کیلۆمیتری باشووری ڕۆژهەڵاتی ئەو دێیە هەڵکەوتووە.

سەبارەت بە ناوی ئاوایی هێندێک دەڵێن لە "ئاگری گەش" هاتووە و بە درێژایی مێژوو گۆڕانکاری بەسەردا هاتووە و بۆتە ئیندرقاش، هێندێکی دیکە لایان وایە ئەم ناوە تورکییە.

سەردەمی هاتنی حرووسان بۆ ئەم ناوچەیە، کوشتارێکی زۆریان لە ئیندرقاش کرد کە بەساڵاچووەکان وەک ناخۆشترین ڕووداو ئاماژەی پێدەکەن، هەروەها لە سەرەتای شۆڕشی ئیسلامی هێندێک لە دانیشتووانی ئەم گوندە ـ بە هۆی شەڕی دەسەڵات لەگەڵ گروپەکانی دژ بە دەسەڵات ـــ بێ تاوان کوژران.

لە باشووری ئەم گوندەوە ڕێگایەکی خاکی دەچێتەوە ئاوایی خانەگێ، لە باکوورەوە ڕێگایەکی خاکی مەزراکان، فەقرەقا و ئاواییەکانی قوومقەڵا و قەرەخان دەگرێتەوە، لە ڕۆژهەڵاتەوە ڕێگایەکی قیلەتاو بە مەودای ١/٥ کیلۆمیتر دەچێتەوە سەر ڕێگای سەرەکی مەهاباد ـ میاندواو.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی ١٣٥٥/١٠/١٥ کارەبای بۆ هاتووە، لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە کە عەنباراویان بۆ داناوە و لە ئاوایی "خانەگێ"یەوە ئاوەکەی دابین دەبێ، تەلەیفوونی ماڵ بە ماڵ، سیمکارتی مخابەراتی دێهات، ناوەندی مخابەرات و پۆستبانک، قوتابخانەی سەرەتایی"عابید" (کوڕانە ـ کچانە)، قوتابخانەی ناوەندی "میرکازمی" (کوڕانە ـ کچانە). دوو مزگەوت: مزگەوتی جامیع کە لە لایەن خەڵک نۆژەن کراوەتەوە، مزگەوتەکەی تر کە عەردەکەی هی کەسێک بووە بە ناوی "قادر ڕیحانی" کە هەر بۆخۆی بناغەکەی داناوە، بەڵام ئەجەل مۆڵەتی نەداوە و براکەی "محەممەد ڕیحانی" مزگەوتەکەی تەواو کردووە. شەریکەی هاوبەشیینەوت و کەلوپەل، باخچەی ساوایان، ئاکابیری، دوو دەزگای هێڵی ڕاگواستن، خانەی ئاسایشت (بێهزیستی)، سێ نانەوەخانە (تایبەتی)، شەش ساردخانە (تایبەتی)، هەشت جووجەخانە (تایبەتی)، دوو گاوداری (تایبەتی)، کارخانەی سیرۆمسازی (تایبەتی)، کارگای بلووک و تیرچە (تایبەتی)، هەروەها ئیندرقاش خاوەن دێهیاری، شووڕای ئیسلامی و شووڕای چارەسەری کێشەکانە.

کوڕ و کچی ئەو گوندە بۆ درێژەدان بە خوێندن دەچنە مەهاباد.

باخداری، وەرزێری، ئاژەڵداری و هێندێک کاری جۆراوجۆر (دارتاشی، مکانیک، قەساب و...) کاروپیشەی خەڵکی ئەو گوندەی پێکهێناوە. زۆرترین بەرهەمی باخەکان سێوە. بەرهەمی وەرزێران گەنم، جۆ، نۆک و چەوەندەرە و ئاژەڵەکانیان زیاتر مانگایە و مەڕیان زۆر کەمە.

سەرەکیترین گرفت نەبوونی قوتابخانەی دواناوەندییە. شایانی باسە ئەو دێیە کە ساڵانە گەڕیدەیەکی زۆر لە ئێران و وڵاتانی ترەوە ڕووی تێدەکەن پێویستە کاربەدەستان و میراتی فەرهەنگی ئاوڕێکی بەحەق و جیددی لێ بدەنەوە.

"گۆڕستانی کافەتوڵا (کاک فەتحوڵڵا)" لە بەشی ڕۆژهەڵات هەڵکەوتووە و هەنووکە مردووی لێ دەنێژن، کۆنەگۆڕستانەکەشی هەر لەو بەرەی ئاواییە کە بەشێکی دەکەوێتە حەوشەی قوتابخانەی سەرەتایی و هەر لە کۆنەوە تا دوای کوشتاری حرووس مردووی لێ نێژراوە. لە بەشی باشوورەوە گۆڕستانی "بابا تورگەن" هەڵکەوتووە کە بە پێی قسەی خەڵکی ناوچە، شوێنێکی مێژوویییە.

هونەرمەند مەلا حوسێن عەبدوڵڵازادە (گۆرانیبێژ)، "ئیبراهیم محەممەد ڕەشپوور" ناسراو بە حاجیلەی ئیندرقاشی (حەیرانبێژ) ، "ئیسماعیل محەممەد ڕەشپوور" (حەیرانبێژ)، "سەعید عەلایی" (گۆرانیبێژ) و "مەحمەڵ" (بەیتبێژ و گۆرانیبێژی بەناوبانگ) لە هونەرمەندانی ئیندرقاشن. "حوسێن ڕەحیمی" ناسراو بە "حوسێنەسوور" پاڵەوانی وەرزیشی لەشجوانی، ماوەیەکی زۆر لەم ئاواییە ژیاوە. هەروەها قەدیم زۆربەی خەڵکەکەی شارۆێران و محاڵ کە نیازیان بە دکتۆر و دەواودەرمان بووە هاتوونە لای "حاجی حەمەسووڵتان" ناوێک کە حەکیم بووە و بە گیاوگۆڵ زۆر نەخۆشی و برینی تیمار کردوون.

## باجەوەند

ئەم گوندە لە ٣٦ کیلۆمیتری باکووری ڕۆژهەڵاتی شاری مەهاباد، بەشی ناوەندی و دێهستانی ئاختاچی ڕۆژاوا و لە ناوچەی محاڵ هەڵکەوتووە. لە ٣١ ماڵ و ١٦٣ کەس پێکهاتووە، کە لەمانە ٧٧ کەسیان پیاون و ٨٦ کەسیش ژنن، ڕادەی خوێندەواران ٩٣ کەسن کە ٥٣ کەسیان پیاون و ٤٠ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٥٧ کەسی نەخوێندەوار ١٩ کەسیان پیاون ٣٨ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ٨٤٦ هێکتارە، کە لەمە ٧٤٦ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و ١٠٠ هێکتار پاوان و لەوەرگەی دێیە.

باجەوەند خاوەن ١٠٦٩ هێکتار زەوی دێم، ٣٤٧ هێکتار زەوی بەراو، ٦ هێکتار باخ و ٢٤ تراکتۆرە.

بەرزایی ئاوایی لە پانتایی زەریاکانە ١٤٩٥ میترە.

ئاواییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی سنجاغ

باکوور: ئاواییەکانی گردەڕەش و خەتایی

ڕۆژهەڵات: ئاتابلاغی (سەر بە شاری بۆکان)

ڕۆژاوا: ئاواییەکانی ئازاد و قوڵقوڵە

لە باجەوەند شاخ و کێو نایەتە بەرچاو و هەتا چاو هەتەر دەکا هەر تەپۆڵکەنە و دەشتایی. لە لای باشوور لە شوێنێک بە ناوی "قازیەگۆلە" ئەشکەوتێک هەڵکەوتووە کە "ئەشکەوتی خدری برایمی عوسمان"ی پێدەڵێن

خانووبەرەکانی ئەم دێیە چ ئەوانەی کۆنن و چ ئەوانەی تازەسازن گشتیان هەر بە قوڕ و بەرد ساز کراون و میچەکانیان دارەڕایە، ماڵەکان خاوەن حەوشە و دەرگان، ناوەندی دێ چەند خانوویەکی کاول بووی لێیە. باجەوەند کۆڵانێکی سەرەکی و ڕاست و درێژی هەیە، ماڵەکان دەکەونە ئەو بەر و بەری ئاوایی.

لە بەری باشووری ڕۆژاوای باجەوەند ئاسەواری ئاواییەک ماوە کە دوو بۆچوونی لەسەرە: هێندێک لە خەڵکی ئاوایی دەڵێن: باجەوەند لە پێشدا لەو شوێنە دەژیان، بەڵام دوایە بە هەر هۆیەک بووبێ ئەو شوێنەیان بەجێ هێشتووە و لەم شوێنەی ئێستایان گیرساونەوە. بۆچوونی دووەم دەڵێ: ئەوێ باجەوەندی سەرێ بووە و ئەو خەڵکەی ئێستاش هەر لەو شوێنەی خۆیان بوون و باجەوەندی خوارێیان پێگوتووە، باجەوەندی سەرێ چۆڵ کراوە و خەڵکەکەی چونەتە ئاواییەکانی دیکە.

لە باشوورەوە ڕێگایەکی ئامادە بۆ قیلەتاو هەیە کە دەچێتەوە ئاوایی سنجاغ، لە باکوورەوە ڕێگای خاکی دوو ئاوایی گردەڕەش و خەتایی دەگرێتەوە، لە ڕۆژهەڵاتەوە ڕێگای خاکی دەچێتەوە ئاوایی ئاتابلاغی بۆکان.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی ١٣٦٥/٦/١٠ کارەبای بۆ چووە، لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە کە سەرچاوەکەی ئاوایی "سنجاغ"ە ، سیمکارتی مخابەراتی دێهات، قوتابخانەی سەرەتایی "لەعل" (کوڕانە ـ کچانە)، کۆنەمزگەوتێک، دوو کانگای بەرد، هەروەها ئەم دێیە خاوەن شووڕای ئیسلامییە. بۆ کاروباری پێوەند بە تەندروستی و وەرگرتنی نەوت و کەلوپەل سەر بە ئاوایی "ئازاد"ن.

قوتابیانی ئەم دێیە چ کچ و چ کوڕ بۆ درێژەپێدان بە خوێندن دەچنە شاری مەهاباد.

کاروپیشەی خەڵکی باجەوەند ئاژەڵداری، وەرزێری، کرێکاری و تا ڕادەیەکی کەم باخدارییە. ئاژەڵەکانیان بریتین لە مانگا و تا ڕادەیەک مەڕ و بزن. وەرزێران گەنم، نۆک و جۆ دەچێنن و بەرهەمی باخەکان سێو و ترێن.

گرفتەکانی خەڵکی باجەوەند: کەمئاوی کە بۆتە هۆی ئەوەی چەند ماڵێک لە ساڵی ١٣٨٦ی هەتاوی کۆچ بکەن.

کۆنەگۆڕستانی باجەوەند لە لای ڕۆژاوایە، ئەو گۆڕستانەی ئێستا مردووی لێ دەنێژن لە لای باشوورەوەیە.

## بادام

بادام لە ٣٠ کیلۆمیتری باکووری ڕۆژهەڵاتی شاری مەهاباد، بەشی ناوەندی و دێهستانی موکریانی ڕۆژهەڵات و لە ناوچەی محاڵ هەڵکەوتووە. لە ٥٠ ماڵ و ٢٤١ کەس پێکهاتووە کە لەمانە ١٠٥ کەسیان پیاون و ١٣٦ کەسیش ژنن، لە ١٣٨ کەسی خوێندەوار ٧٠ کەسیان پیاون ٦٨ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٨٤ کەسی نەخوێندەوار ٢٧ کەسیان پیاون و ٥٧ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ٣٢٥٠ هێکتارە، ١٨٤ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و ٣٠٦٦ هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.

بادام خاوەن ١٢٠٠ هێکتار زەوی دێم، ٣٥ هێکتار زەوی بەراو، ١٢ هێکتار باخ، ٢٠ تراکتۆر و ٣ لاوێردەیە.

ئاوایی‌یەکانی دەورووبەر:

باشوور: ئاوایی حەوڵاباد

باکوور: ئاوایی تاڵاو (سەر بە شاری میاندواو)

ڕۆژهەڵات: ئاوایی تەنگباڵەکە

ڕۆژاوا: ئاوایی بەردەڕەشان

چیاکانی دەورووبەری ئاوایی:

باشوور: قزڵداغ و شیلان و خەزێنە

باکوور: قەڵات

ڕۆژاوا: کێوی شەقە

لە بەشی باکوور ئەشکەوتی قەڵات هەڵکەوتووە.

کانیاوەکان بە کانی قزڵداغ، کانی کیسەڵ، کانی کوێرە، کانی خەزێنە، کانی ئەحمەد سریل و کانی ئەمیرئاباد ناسراون.

زۆربەی خانووبەرەکان لە قوڕ و بەردن و میچەکان بە داران داپۆشراون، هێندێک لە ماڵەکان بە کاگڵ سواغ دراون، ئێستا بۆ ساز کردنی خانوو لە ئامرازی تازە کەلک وەردەگرن. کۆڵانەکانی ڕێک نین و قاناویان بۆ لێ نەدراوە.

خەڵکی ئەم گوندە بەشێکی کوردن و بەشێکی تورک و پێکەوە زۆر تەباوڕەبان. "گوڵمەنبەر ئیبراهیمیان" کە بەتەمەنترین کەسی ئەو گوندەیە و هەنووکە تەمەنی ٩٨ ساڵە، باسی ساڵی "جۆڕەشە" دەکا ـ هەر ئەو ساڵەی گرانی و ئیشکەساڵی تەنگی بە خەڵکی هەڵچنیبوو، تورکێکی زۆر ڕوویان کردە ناوچەی کوردان و خەڵکی ئەم ناوچەیەش فریایان کەوتن؛ هێندێک لەوان تا ئێستا هەر لەو ئاوایی‌یە ماونەوە و نەچوونەوە ناوچەکەی خۆیان ـ ئیبراهیمیان باسی سەرەتای هاتنی خۆیان بۆ ئەو گوندە دەکا کە بادام بەر لە ئێستا ملکی "گولاوی‌ئاغا" بووە، پاشان بنەماڵەی قازی لێیان کڕیوە و "میرزا مەجیدخان سەعدولقۆزات" وەکوو شوێنی دەسەڵاتی خۆی لە بادام ماوەتەوە.

"میرزا مەجیدخان سەعدولقۆزات" کە سەرەتا گوندەکانی "پیرمکائیل" و "خاڵدەلیل"ی لە دەستدا بووە، پاشان ملکی "گردیاقووب" و "کۆنەدێ" دەکڕێ و سەرەنجام ئەم گوندانەش جێ دەهێڵێ و دێتە بادام.

"گوڵمەنبەر ئیبراهیمیان" لە مەڕ هاتنی حرووسان بۆ ئاوایی بادام دەڵێ: ئەو کات نزیک پازدە ساڵێکم تەمەن بوو؛ لێرە هیچ کەسیان نەکوشت، شەش کەس لە حرووسەکان بۆ ماوەیەک لەم ئاوایی‌یە مانەوە و لە دوایی ئەوانیش ڕۆیشتن.

ساڵی ١٣٤٢ی هەتاوی پاش دابەشینی زەوی‌وزار بە سەر ڕەعیەتەکاندا چەند ماڵێکی تورک، زەوی دەکڕن و هێندێکی دیکەش کارداری دەکەن، چەند جار ویستوویانە بڕۆنەوە بۆ ئەو شوێنەی پێشتر لێی دەژیان، بەڵام خەڵکە کوردەکەی بادام بە هۆی هۆگر بوونیان بە یەکترەوە ئێزنیان نەداون و پێیان خۆشە هەر پێکەوە بمێنن. سەبارەت بە ناوی ئەم دێیە خەڵکەکەی ڕایان وایە دەبێ زوو داربادامی لێ بووبێ هەر بۆیە بەم ناوە ناسراوە.

پێشتر لە باکووری دێ ئاوایی‌یەکی دیکە بە ناوی "ئەمیرئاوا" هەبووە کە زەوی‌وزاری ملکی ئاغاکانی بادام بووە، ئێستە ئەو گوندە چۆڵ کراوە و خانووبەرەکانی کاول بوون.

لە باکووری بادام ڕێگەیەکی قیلەتاو دەچێتەوە سەر ڕێگای سەرەکی مەهاباد ــ میاندواو، لە باشووری ڕۆژهەڵاتیشەوە ڕێگایەکی خاکی ئاوایی "تەنگباڵەکە" دەگرێتەوە.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی ١٣٥٨/١٢/٢٠ کارەبای بۆ چووە، لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە کە عەنباراویان بۆ داناوە و ئاوەکەی لە دوو کانیاوی

"بەردەکون" و "دووگۆلان" دابین دەبێ و هەروەها چالآویان بۆ لێداوە، سیمکارتی مخابەراتی دێهات، قوتابخانەی سەرەتایی "ڕەسووڵ" کوڕانە ــ کچانە)، دێهیاری (ساڵی ١٣٨٨)، ئاکابیری، دوو مزگەوت کە ئی سوننییەکان ناوی "سەعدولقۆزات"ە - بڕیارە لە لایەن ئیدارەی ئەوقافەوە نۆژەن بکرێتەوە - شیعەکان ساڵی ١٣٨٥ بۆ یەکەم جار مزگەوتی خۆیان بە ناوی "ئیمام حوسێن" لەو گوندە دامەزراند.
بۆ درێژەدان بە خوێندن قوتابییەکانی کچ و کوڕ دەچنە ئاوایی گۆکتەپە و شارەکانی مەهاباد و میاندواو. هەروەها بادام خاوەن شووڕای ئیسلامییە.
بۆ کاروباری پێوەند بە تەندروستی سەر بە ئاوایی "بەردەڕەشان"ن. نەوت و کەلوپەلیش لە شەریکەی هاوبەشیی ئاوایی ئازاد وەردەگرن.
کوردەکان بەگشتی وەرزێرن، تورکەکانیش ئاژەڵداری دەکەن، هەڵبەت هەر دووک لا کرێکاری و باخداریش دەکەن. وەرزێرەکان گەنم، نۆک، جۆ، نیسک و گوڵەبەڕۆژە دەچێنن و ئاژەڵەکانیشان زیاتر مەڕ، بزن و تا ڕادەیەکی کەم مانگان. بەرهەمی باخەکان سێو و قەیسییە.
گرفتەکانی خەڵکی ئاوایی: نەبوونی قوتابخانەی ناوەندی و تا ڕادەیەک ناخۆش بوونی کۆڵانەکانی دێ کە پێویستە قاناویان بۆ لێبدەن و ڕێک و ڕاست بکرێن.
بادام خاوەن دوو گۆڕستانە کە بە "قەبری کوردان" و "قەبری حەجەمان" ناسراون. ئێستە هیچ مردوویەک لەم گوندە نانێژن، کوردەکان لە گۆڕستانی شاری مەهاباد کەلک وەردەگرن و تورکەکانیش لە گۆڕستانی شاری میاندواو.
جێگای ئاماژەیە کە کێوی "قزڵداغ" لە باشووری دێ کە کۆنەگۆڕستانێکی لێیە، خەڵکەکە دەڵێن زوو ئاوایی لێ بووە.
بادام لە چەندین بوارەوە کەسایەتی بەناوبانگی هەبووە، پێنج برا بە ناوەکانی میرزا ئیبڕاهیم مەجیدی، میرزا قاسم مەجیدی، میرزا قادر مەجیدی، میرزا ئەحمەد قازی و میرزا عەزیز قازی کوڕەکانی میرزا مەجید سەعدولقۆزات و ئەویش کوڕی میرزا ئەحمەد قازی ساوجبلاغی کە بادامیان بە دەست بووە. میرزا ئیبڕاهیم لە کاربەدەستانی کۆماری کوردستان لە شاری مەهاباد بووە، میرزا قاسم هونەرمەند بووە و دەنگی تارەکەی و ئاوازی خۆشەکانی، ڕازێنەری مەجلیسان بووە. کاک تاهیری دەنگخۆش یەکێکی دیکە لە کەسایەتییەکانی بادام بووە. هەروەها نووسەر کاک ڕەحمان میسباحی قازی، خەڵکی ئەو ئاواییە بووە. چەندین کەسایەتی بەناوبانگی دیکە کە ئێستا لە ئێرانن و بەشێکیان لە تاراوگە دەژین هەر پەروەردەی ئەم ئاو و خاکەن.

## باراوا

"باراوا" لە ٦٧ کیلۆمیتری باشووری ڕۆژهەڵاتی شاری مەهاباد، بەشی خەلیفان و دێهستانی کانی بازاڕ و لە ناوچەی گەورکایەتی هەڵکەوتووە. لە ٢٧ ماڵ و ١٥٥ کەس پێکهاتووە کە ٧٩ کەسیان پیاون و ٧٦ کەسیش ژنن، لە ٦٤ کەسی خوێندەوار ٤٧ کەسیان پیاون و ١٧ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٧٣ کەسی نەخوێندەوار ٢٢ کەسیان پیاون و ٥١ کەسیش ژنن.

پانتایی ئەم گوندە ١٩٩٨/٤٩ هێکتارە، ١٨٤/٦ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و ١٨١٣/٨٩ هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.

باراوا خاوەن ١١٠ هێکتار زەوی دێم، ٢٠ هێکتار زەوی بەراو، ٤ هێکتار باخ و ٦ تراکتۆرە.

مەودای ئاوایی تا ناوەندی خزمەتگوزاریی وەرزێری کانی بازاڕ ١٤ کیلۆمیترە.

ئاوایییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی قالوێ شێخان (بۆکان)

باکوور: ئاوایی گامێشان

ڕۆژهەڵات: ئاوایی قالوێ زەندان

ڕۆژاوا: بەشێک لە ئاوایی گامێشان و ئاوایی زیندووقووڵ

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باشوور: کێوەکانی باخچە و هەڵاڵاوێ

باکوور: کێوی مووچێ بیان

ڕۆژهەڵات: بەشێک لە کێوی باخچە

ڕۆژاوا: بەشێک لە کێوی هەڵاڵاوێ

ئەم ئاوایییە دوو کانیاویشی لێیە کە ئەوانیش هەر ناوی چیاکانی "مووچێ بیان" و "هەڵاڵاوێ"یان لە سەرە.

خانووبەرەکان بە گشتی لە قوڕ و بەردن، میچەکانیان دارەڕایە و حەوشەیان هەیە و ڕوویان لە ڕۆژهەڵاتە. ئەم دێیە چەند کۆڵانێکی هەوراز و باریکەڵانە و نارێکی هەیە. باراوا لە داوێنی خڕ و دۆڵێکی بنبەست هەڵکەوتووە.

"باراوا" لە بارام+ ئاوا پێکهاتووە، ڕەنگە یەکەم جار "بارام"ناوێک ئەم دێیەی ئاوەدان کردبێتەوە. خەڵکەکەی ئاوایی لەم بارەوە ئاگادارییەکیان نەبوو.

باراوا ڕێگایەکی بە سەرەوەیە کە خاکییە و لە بەری ڕۆژهەڵات هەڵکەوتووە و ئاوایی قالوێ زەندان دەگرێتەوە.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی ١٣٧٦/١٢/٢ کارەبای بۆ هاتووە، سیمکارتی مخابەراتی دێهات، قوتابخانەی سەرەتایی"فاتیح" (کوڕانە ــ کچانە) کە بیناکەی لە بەرد و قوڕە، مزگەوتێک کە ساڵی ١٣٨٠ی هەتاوی هەر بە قوڕ و بەرد و دار نۆژەن کراوەتەوە.

ئەم دێیە لولەکێشی ئاوی خواردنەوە بۆ نەکراوە و لە چاڵاو کەلک وەردەگرن.

قوتابیانی کوڕ بۆ درێژەدان بە خوێندن دەچنە خەلیفان و مەهاباد و کچان لە دوای پێنجەمی سەرەتایی دەست لە خوێندن هەڵدەگرن.

نەوت و کەلوپەل لە شەریکەی کانیسێو وەردەگرن و بۆ کاروباری تەندروستی دەبێ ڕێگای ئاوایییەکەی قالوێ زەندان بپێون.

وەرزێری، ئاژەڵداری، کرێکاری و باخداری کاروپیشەی خەڵکی باراوایە. وەرزێران گەنم، جۆ و نۆک دەچێنن و ئاژەڵەکان زیاتر مەڕ، بزن و تا ڕادەیەکیش مانگایە. بەرهەمی باخەکانیان سێو، بادام و گوێزە. ڕێگای خاکی و ناخۆش و نەبوونی بنکەی تەندروستی سەربەخۆ لە گرفتەکانی خەڵکی باراوایە.

گۆڕستانەکەی ئاوایی لە باشووری ڕۆژاوا هەڵکەوتووە.

# باگردانی خوارێ

ئەم ئاوایییە لە ٣٩ کیلۆمیتری باشووری ڕۆژاوای شاری مەهاباد، بەشی خەلیفان و دێهستانی مەنگوڕی ڕۆژهەڵات و لە ناوچەی مەنگوڕایەتی هەڵکەوتووە. لە ٣٠ ماڵ و ١٦٣ کەس پێکهاتووە، لەمانە ٨٦ کەسیان پیاون و ٧٧یان ژنن و لە ٨٩ کەسیان خوێندەوار ٥٦ کەس پیاون و ٣٣ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٥٥ کەسی نەخوێندەوار ١٨ کەسیان پیاون و ٣٧ کەسیش ژنن.
پانتایی ئاوایی ٤٠٨٧/٥ هێکتارە، لەمە ٨٧/٥ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و ٤٠٠٠ هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.
باگردانی خوارێ خاوەن ١٠٣/٥ هێکتار زەوی دێم، ٧٨/٦ هێکتار زەوی بەراو، ٦/٤٤ هێکتار باخ و ١ تراکتۆرە.
بەرزایی ئاوایی لە ڕووکەشی زەریاکانەوە ١٥١٠ میترە.

ئاوایییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی حەسەنچەپ

باکوور: ئاوایییەکانی قشقوونە و قەرەقاچ

ڕۆژهەڵات: ئاوایییەکانی زێوە و سمێنو

ڕۆژاوا: ئاوایییەکانی شێخان و باگردانی سەرێ

لە باشووری ئەم دێیە کێوی "حەسەنچەپ" هەڵکەوتووە.
لە باگردانی خوارێ خانووبەرەکان لە قوڕ و بەرد و میچی دار ساز کراون، هەروەها لە ساز کردنی هێندێک خانووبەرەی نوێدا خشت، بلووک و چیمەنتۆ دەکار کراوە.
ئەم دێیە لە چەند کۆڵانێکی لێژ و درێژ پێکهاتووە، ماڵەکان حەوشەیان نییە و بەرەو ڕۆژهەڵاتن، مزگەوتەکەی لە خوارووی ماڵان هەڵکەوتووە.
"باگردان" هەر بەو ئامێرە دەڵێن کە بە سەر ئەو سەربانانەیدا دێنن و دەبن کە لە گڵە تا تەخت بێ و چاکتر خۆ بگرێ، باگردان، باگردێن، بانگلێر و بانگوێڕیشی پێدەڵێن و هەموو بە یەک مانان*، هەڵبەت ئەوە بەو مانایە نییە ئەم گوندە بەو بۆنەوە ناو نراوە باگردان، چونکە کەلک وەرگرتن لەم ئامێرە تایبەت بەم گوندەوە نییە و هۆی ناودێر کردنی ئەم گوندە بەم ناوە ڕوون نییە.
یەکێک لە دانیشتووانی ئاوایی دەڵێ: دوور نییە سەردەمێک لەم دێیە باگردان ساز کرابێ، ئەو باگردانانەی قەدیم ساز دەکران هەر لە بەردیان دادەتاشین؛ یەکی دیکە لە دانیشتووان بە ناوی کاک "مامەند محەممەدی" دەڵێ: وەکوو بیستوومە سەرەتا ناوی ئاوایی دەبێ "باگـــران" بووبێ کە بە مانای ئەو شوێنەیە کە بای زۆر دەگرێ.
باگردانی خوارێ لە سەر ڕێگای خاکی دۆڵی شێخان هەڵکەوتووە، لە ڕۆژهەڵاتەوە ڕێگایەکی ئامادە بۆ قیلەتاو دوو ڕێیانێک دەگرێتەوە کە هەر کام لەم دوو ڕێیانە ئاوایییەکانی سێلم، کەلەدەنداوا، زێوە و خانەگێ دەگرنەوە، لە ڕۆژاواوە ڕێگایەکی تر ئاوایییەکانی باگردانی سەرێ و شێخان دەگرێتەوە، لە باکوورەوە ڕێگایەکی خاکی دەچێتەوە ئاوایی قەرەقاچ.
ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی ١٣٦٨/٨/٨ کارەبای بۆ هاتووە، لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە، ساڵی ١٣٨٠ی هەتاوی جێبەجێ کراوە و دوو عەنباراوی هەیە، زۆرترین ئاو لە کانیاوی حاجی مینە وەردەگرێ، سیمکارتی مخابەراتی دێهات، قوتابخانەی سەرەتایی "شەهید خەلیلی" (کوڕانە ــ کچانە) کە بیناکەی حازربەدەستە، ئاکابیری، بنکەی تەندروستی، مزگەوتەکەی ساڵی ١٣٧٦ی هەتاوی بە خشت و چیمەنتۆ نۆژەن کراوەتەوە و هەروەها ئەم

---

* هەنبانەبۆرینە، لاپەڕەی ٤٥ ئەستوونی یەکەم.
فەرهەنگی کوردستان، گیوی موکریانی، لاپەڕەی ٥٨، ئەستوونی دووهەم

دێیە خاوەن شوورای ئیسلامییە. نەوت و کەلوپەلی خەڵکی ئەم دێیە لە شەریکەی هاوبەشییسیاقوڵی خوارێ دابین دەبێ.
خوێندکاران بۆ درێژەدان بە خوێندن دەچنە ئاوایی خەلیفان و شارەکەی مەهاباد و ئەو مافە زیاتر بۆ کوڕەکان پارێزراوە تا کچەکان.
زۆربەی خەڵکی ئەم گوندە خەریکی ئاژەڵداری، وەرزێری، باخداری، مێشداری، کرێکاری و کاروپیشەکانی دیکەن. ئاژەڵەکانیان مەڕ، بزن و مانگان.
وەرزێرەکانیش گەنم، جۆ، نۆک و نیسک دەچێنن و بەرهەمی باخەکانیان سێوە.
گرفتەکانی خەڵکی باگردانی خوارێ: کەمئاوی، دەرنەکردنی ئاوەڕۆ، ڕووخانی بینای بنکەی تەندروستی کە پێویستی بە نۆژەن کردنەوەیە.
"قەبری گوێلکەوان" ناوی گۆڕستانی ئەم دێیەیە.

کێوی سپی‌سەنگ (هەڵکەوتوو لە دۆڵی شێخان)

## باگردانی سەرێ

باگردانی سەرێ لە ٣٥ کیلۆمیتری باشووری ڕۆژاوای شاری مەهاباد، بەشی خەلیفان و دێهستانی مەنگوڕی ڕۆژهەلات و لە ناوچەی مەنگوڕایەتی هەلکەوتووە. لە ٢٣ مال و ١١٧ کەس پێکهاتووە کە لەمانە ٥٦ کەسیان پیاون و ٦١ کەسیش ژنن، لە ٦٢ کەسی خوێندەواریان ٣٩ کەسیان پیاون و ٢٣ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٤٤ کەسی نەخوێندەواریان ١١ کەس پیاون و ٣٣ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ٤٨١٣ هێکتارە، لەمە ٣١٣ هێکتار بۆ خەلک جیا کراوەتەوە و ٤٥٠٠ هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.

باگردانی سەرێ خاوەن ١٢٦/٤ هێکتار زەوی دێم، ٦٢/١ هێکتار زەوی بەراو، ٨/٤٥ هێکتار باخ و ٨ تراکتۆرە.

ئاواییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی حەسەنچەپ

باکوور: ئاواییەکانی باگردانی خوارێ و قەرەقاچ

ڕۆژهەلات: ئاواییەکانی خانەگێی مەنگوڕان و زێوە

ڕۆژاوا: ئاوایی شێخان

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باشوور: کێوی کۆخمامۆل

باکوور: باسکی قەرەقاچ

ڕۆژاوا: کێوی کانی مام سەیدی

کانیاوەکانی بریتین لە: کۆخمامۆل، قوولەخاشخاشک و کانی نێو مالان.

زۆربەی خانووبەرەکانی باگردانی سەرێ لە قوڕ و بەرد و میچیان لە دارە، حەوشەیان نییە و بەرەو ڕۆژهەلات و باشوور ساز کراون. بە ڕادەیەکی زۆر کەم خانووبەرەی لە خشت و چیمەنتۆ دێنە بەرچاو. بەگشتی کۆلانەکانی ئاوایی نارێکن.

باگردانی سەرێ لە بنەڕەتەوە مەزرا و لەوەڕگەی باگردانی خوارێ بووە، بەو شێوە کە سەردەمی ئەرباب ــ ڕەعیەتی یەکێک لە کوڕە ئاغاکانی باگردانی خوارێ (بنەمالەی قادری) ملکێک کە لە یەک کیلۆمیتری باشووری ڕۆژاوای ئەم گوندە هەلکەوتووە وەبەری دەکەوێ و ئاوەدانی دەکاتەوە و دەبێتە باگردانی خوارێ.

باگردانی سەرێ لە سەر ڕێگای دۆلی شێخان کە ڕێگایەکی خاکییە هەلکەوتووە. بەرەو باکوور، ڕێگایەکی ئامادە بۆ قیلەتاو ئاوایی باگردانی خوارێ دەگرێتەوە و ڕێگای باشووریش کە خاکییە چەندین ئاوایی وەکوو حەسەنچەپ، بێهەنگوێن و هتد دەگرێتەوە. درێژەی ڕێگاکەی دۆلی شێخان دەچێتەوە ئاواییەکانی شێخان و سێرو و هتد.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی ١٣٦٨/٨/٨ کارەبای بۆ هاتووە، لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە کە سەرچاوەکەی عەنباراوی باگردانی خوارێیە و ئاوەکەی لە کانی حاجی مینە دابین دەبێ، سیمکارتی مخابەراتی دێهات، قوتابخانەی سەرەتایی "خالەق" (کوڕانە ــ کچانە)، ئاکابیری، مزگەوت. بۆ کاروباری پێوەند بە بنکەی تەندروستی سەر بە ئاوایی باگردانی خوارێن، نەوت و کەلوپەلیش لە شەریکەی سیاقۆلی خوارێ وەردەگرن.

قوتابیانی ئەم دێیە بۆ درێژەدان بە خوێندن دەنێردرێنە خەلیفان و مەهاباد، بۆ ئەو بابەتە مافی کوڕەکان زیاتر پارێزراوە.

کاروپیشەی خەلکی ئەو دێیە ئاژەلداری، وەرزێری، باخداری و کرێکارییە. ئاژەلەکانیان مەڕ، بزن و مانگان. وەرزێرەکانیش گەنم، جۆ و نۆک دەچێنن. زۆربەی باخەکانی باگردانی سەرێ ساوان و زۆرتریان دارەسێون.

گرفتەکانی ئاوایی: نیاز بە قوتابخانەی ناوەندی بەگشتی بۆ ئەم ئاواییە و چەند ئاواییەکی دەوروبەری.

خەلکەکە بۆ ناشتنی مردووەکانیان کەلک لە گۆڕستانی باگردانی خوارێ وەردەگرن کە بە "قەبری گوێلکەوانی" ناسراوە.

## بایینده‌رێ

ئه‌م ئاوایی‌یه له ٧ کیلۆمیتری باکووری ڕۆژاوای شاری مه‌هاباد، به‌شی ناوه‌ندی و دێهستانی موکریانی ڕۆژاوا و له ناوچه‌ی شارویران هه‌ڵکه‌وتووه. له ٦٩ ماڵ و ٥٠٤ که‌س پێکهاتووه که ٢٥٦ که‌س پیاون و ٢٤٨ که‌سیش ژنن، له ٢٩٠ که‌سی خوێنده‌وار له‌م ئاوایی‌یه ١٧١ که‌سیان پیاون ١١٩ که‌سیش ژنن، هه‌روه‌ها له ١٦٠ که‌سی نه‌خوێنده‌واریان ٥٠ که‌س پیاون و ١١٠ که‌سیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ١٨٠٠ هێکتاره، له‌مه ٢٨٥/٥ هێکتار بۆ خه‌ڵک جیا کراوه‌ته‌وه و ١٥١٤/٥ هێکتار پاوان و له‌وه‌رگه‌ی دێیه.

بایینده‌رێ خاوه‌ن ٢١٠ هێکتار زه‌وی دێم، ٥٠ هێکتار زه‌وی به‌راو، ٤٠ هێکتار باخ، ١٩ تراکتۆر و ٥ لاوێرده‌یه.

ئاوایی‌یه‌کانی ده‌وروبه‌ر:

باشوور: ئاوایی قازیاوا

باکوور: ئاوایی ئاڵبلاغ

ڕۆژهه‌ڵات: ئاوایی که‌رێزه‌ی شێخان

ڕۆژاوا: ئاوایی سێله‌که

چیاکانی ده‌وروبه‌ری ئاوایی:

باشوور: کێوی گێوژ

باکوور: به‌ردی قه‌ڵای و به‌ردی خه‌جیجێ

ڕۆژهه‌ڵات: ملوشتر و که‌ماجار

ڕۆژاوا: قه‌ڵاته‌ڕه‌ش و مام قووجاق

له لای باکووری گونده‌که‌وه، ئه‌شکه‌وتێک به ناوی "کونه‌پێست" و له لای ڕۆژهه‌ڵاته‌وه ئه‌شکه‌وتێکی دیکه به ناوی "کونه‌ڕۆن" که له سه‌ر کێوی "کانی بناوێ"یه و جێگای سه‌د سه‌ر مه‌ڕ ده‌بێ هه‌ڵکه‌وتووه.

کانیاوه‌کان بریتین له: کانی سپی، کانی زه‌ندان، کانی قه‌ڵاتێ، کانی ڕه‌ش.

خانووبه‌ره‌کان زۆرتریان له قوڕ و به‌ردن، تا ڕاده‌یه‌کی که‌م خشت و بلووکیش ده‌کار کراوه و میچی گشت ماڵه‌کان له داره، هێندێک له خانووه‌کان حه‌وشه‌یان هه‌یه و هێندێکیان به‌بێ حه‌وشه‌ن، کۆڵانه‌کانی هه‌وراز و نارێکن و هێندێک کۆڵانی زۆر لیژن، ماڵه‌کان زۆربه‌یان ڕوویان له ڕۆژهه‌ڵاته.

"به‌ردی قه‌ڵای" و "گۆڕستانی به‌ردێ" دوو شوێنی مێژوویین له‌م ئاوایی‌یه.

له ڕۆژهه‌ڵاتی گونده‌که‌وه ڕێگایه‌کی قیله‌تاو به مه‌ودای ٣/٥ کیلۆمیتر جاده‌ی قیله‌تاوی که‌رێزه‌ی شێخان ده‌گرێته‌وه.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکه‌وتی ١٣٧٢/١٢/٣ کاره‌بای بۆ چووه، لووله‌کێشیی ئاوی خواردنه‌وه که عه‌نباراویان بۆ داناوه و له "کانی گوێز" و "گه‌ڵوو" دابین ده‌بێ، ته‌له‌یفوونی ماڵ به ماڵ، قوتابخانه‌ی سه‌ره‌تایی (کوڕانه ــ کچانه) و قوتابخانه‌ی ناوه‌ندی (کوڕانه ــ کچانه) هه‌ر دووکیان به ناوی "مه‌لیک" ناودێر کراون، مزگه‌وتێک که به خشت و چیمه‌نتۆ نۆژه‌ن کراوه‌ته‌وه و هه‌روه‌ها ئه‌م دێیه خاوه‌ن دێهیاری، شووڕای ئیسلامی و شووڕای چاره‌سه‌ری کێشه‌کانه. نه‌وت و که‌لوپه‌لی پێویست له پشتته‌پی مه‌هاباد وه‌رده‌گرن، بۆ کاری ته‌ندروستیش سه‌ر به "که‌رێزه‌ی شێخان"ن.

خوێندکاران له قوتابخانه‌کانی شاری مه‌هاباد درێژه به خوێندن ده‌ده‌ن و مافی کوڕه‌کان له‌و باره‌وه زیاتر پارێزراوه.

وه‌رزێری، ئاژه‌ڵداری، باخداری و کرێکاری کاروپیشه‌ی خه‌ڵکی ئه‌و گونده‌یه، وه‌رزێره‌کان گه‌نم، جۆ و نۆک ده‌چێنن و زۆربه‌ی ئاژه‌ڵداران و تا ڕاده‌یه‌ک بزن و مانگا ڕاده‌گرن، به‌رهه‌می زۆربه‌ی باخه‌کان هه‌ر سێون.

گرفته‌کانی خه‌ڵکی ئاوایی: نه‌بوونی بنکه‌ی ته‌ندروستی سه‌ربه‌خۆ، که‌م بوونی ئاوی خواردنه‌وه. هه‌روه‌ها ئاوای بایینده‌رێ سێ که‌سی که‌مئه‌ندام لێیه که گرفتی تایبه‌تی خۆیان هه‌یه و پێویسته پێیان ڕابگه‌ن و له لایان به‌رپرسانه‌وه ئاوڕیان لێ بدرێته‌وه.

ناوه‌ندی بایینده‌رێ سێ گۆڕستانی لێیه، که به ناوه‌کانی گۆڕستانی "به‌ردێ" یان "به‌رماڵان"، گۆڕستانی "مه‌لا برایم" له باشوور که ئێستا که‌لکی لێ وه‌رده‌گیرێ و گۆڕستانی "باخی تانجه" که کۆنه و له به‌ری ڕۆژاوایه هه‌ڵکه‌وتووه.

## برایمه

ئەم ئاواییە لە ٢١ کیلۆمیتری ڕۆژاوای شاری مەهاباد، بەشی ناوەندی و دێهستانی موکریانی ڕۆژاوا و لە ناوچەی مەنگوڕایەتی هەڵکەوتووە. لە 43 ماڵ و ٢٧٨ کەس پێکهاتووە، لەمانە ١٤٦ کەس پیاون و ١٣٢ کەسیش ژنن، لە ١١٦ کەسی خوێندەوار لەم ئاواییە ٨٢ کەسیان پیاون و ٣٤ کەسیش ژنن، هەروەها لە ١٣٨ کەسی نەخوێندەوار ٥١ کەس پیاون و ٨٧ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی 1085 هێکتارە، لەمە 161/7750 هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و 923/2250 هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.

"برایمە" خاوەن ٥٠ هێکتار زەوی دێم، ١٠ هێکتار زەوی بەراو، ٥ هێکتار باخ، ١٣ تراکتۆر و ٤ لاوێردەیە.

ئاوایییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی قماریە (ئێستا ئەم ئاوایییە چۆڵ کراوە)

باکوور: ئاوایی خەلیفە

ڕۆژهەڵات: ئاوایی دێبۆکر

ڕۆژئاوا: ئاوایییەکانی دێلکە، هەوشینان و کوورە

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باشوور: کۆخان و ئاغا جەیران

باکوور: ئادەمان و بەردەزەرد

ڕۆژهەڵات: بەردەبۆر

ڕۆژئاوا: جغانتوو

کانی خیزان، سەرچاوێ، سیسارد، زەلێ، زەرواوی گەورە و زەرواوی چکۆڵە کانیاوەکانی ئەم ئاوایییەن.

زۆربەی ماڵەکان لە قوڕ و بەردن و میچەکانیان بە دار داپۆشراوە، ماڵەکان بەرەو هەورازن و زۆریشیان حەوشەیان نییە، هێندێک لە ماڵەکان ڕوویان لە باشوورە.

بەساڵاچووانی ئاوایی دەگێڕنەوە کە ئاغایەک بە ناوی "برایمی ئادەمان" ئەم گوندەی ئاوەدان کردۆتەوە و برایمە هەر لە ناوی ئەم کەسایەتییە هاتووە، بەڵام ساڵی ئاوەدان کردنەوە و تەنانەت ئاگادارییەکمان لە سەر برایمی ئادەمان دەست نەکەوت.

لە ڕۆژهەڵاتەوە ڕێگایەکی 5 کیلۆمیتری ئامادە بۆ قیلەتاو هەڵکەوتووە کە دەچێتەوە سەر جادەی مەهاباد ــ پەسوێ، لە بەری ڕۆژئاواوە ڕێگایەکی خاکی دەچێتەوە ئاوایییەکانی دێلکە و کوورە.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی ١١ /1377/08 کارەباکەی هەڵکراوە، بنکەی مخابراتی، مزگەوت، قوتابخانەی سەرەتایی "عەلیم" (کوڕانە ــ کچانە)، ئاکابیری و هەروەها برایمە خاوەن شۆڕای ئیسلامییە. بۆ بنکەی تەندروستی و وەرگرتنی نەوت سەر بە ئاوایی (دێبۆکر)ن، کەلوپەلی پێویست لە شەریکەیی هاوبەشیی "پشتەپ"ی مەهاباد وەردەگرن.

شایانی باسە ئاوی ئەم دێیە لە کانیاو و چاڵاو دابین دەبێ، "کانی خیزێ" وەک سەرچاوەیەکی گشتی بۆ ئەم ئاوایییە بەکەلکە.

قوتابیان بۆ درێژەدان بە خوێندن ڕەوانەی ئاوایی خەلیفان یا شاری مەهاباد دەبن، جێگای ئاماژەیە کە گشت قوتابیان دوای تێپەڕ بوونی قۆناغی سەرەتایی درێژە بە خوێندن نادەن و تەنیا هێندێکیان ئەم هەلەیان بۆ دەڕەخسێ، کچەکان و کوڕەکان لەو بابەتەوە مافیان پارێزراوە.

ئاژەڵداری، وەرزێری و تا ڕادەیەکی کەم باخداری و مێشداری کاروپیشەی سەرەکی خەڵکی برایمەیان پێکهێناوە، زۆربەی ئاژەڵداران مەڕدارن و تا ڕادەیەک مانگا و بزنیش ڕادەگرن. وەرزێرەکان گەنم، نۆک و جۆ دەچێنن.

گرفتەکانیان بریتییە لە: نیاز بە لولەکێشیی ئاوی خواردنەوە، نەبوونی بنکەی تەندروستی سەربەخۆ، نەبوونی بینایەکی شیاو بۆ قوتابخانە کە قوتابخانەکەی ئێستای حازربەدەستە.

گۆڕستانی ئاوایی برایمە و دێبۆکر هاوبەشە و لە ڕۆژئاوای برایمە هەڵکەوتووە کە بە "قەبری هێڵان" ناسراوە.

ئاوایی برایمە شوێنێکی سروشتی بە ناوی "لووسێ" هەیە کە سەیرانگایەکی خۆشە و لاوێنەرە و وەرزی بەهاران خەڵکێکی زۆر لە داوێنی خۆی کۆدەکاتەوە.

## بورهان (برهان)

ئەم ئاواییە لە 27 کیلۆمیتری ڕۆژهەڵاتی شاری مەهاباد، بەشی ناوەندی و دێهستانی ئاختاچی ڕۆژاوا و لە ناوچەی محاڵ هەڵکەوتووە. لە ٤١ ماڵ و ٢١٤ کەس پێکهاتووە، لەمانە ١٠٩ کەسیان پیاون و ١٠٥ کەسیش ژنن، ژمارەی خوێندەوارانی ئەم ئاواییە ١٣٩ کەسن کە ٨١ کەس پیاون و ٥٨ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٥٨ کەسی نەخوێندەوار ١٨ کەسیان پیاون و ٤٠ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی 651/3 هێکتارە، لەمە 301/3 هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و 350 هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.

بورهان خاوەن ٥٢٢ هێکتار زەوی دێم، ١٩٥ هێکتار زەوی بەراو، ١٣٠ هێکتار باخ و ١٩ تراکتۆرە.

| ئاواییەکانی دەوروبەر: | چیاکانی دەوروبەری ئاوایی: |
|---|---|
| باشوور: ئاواییەکانی کولیجە و یاڵاوەی سەرێ | باشوور: پەری سیما |
| باکوور: ئاوایی قەمتەرە | باکوور: ئاڵماڵوو |
| ڕۆژهەڵات: ئاواییەکانی یاڵاوەی خوارێ و کانی کەوتێر | ڕۆژهەڵات: قەڵات |
| ڕۆژاوا: ئاواییەکانی حاجیالیکەند و خاتوونخاس | ڕۆژاوا: سوڵتان |

"کوێرەکانی"، "گۆلی عیسای" و دارسنجوو سێ کانیاوی ئەم گەندەن.

زۆربەی خانووبەرەکان لە قوڕ و بەردن، هێندێکیش خشت، بلووک و چیمەنتۆیان دەکار کردووە. میچی ماڵەکان بە گشتی بە دار داپۆشراون. ئاوایی بورهان لە چەند کۆڵانێکی درێژ و هێندێکیش کۆڵانی خواروخێچ و نارێک پێکهاتووە. زۆربەی ماڵەکان بەرەو باشوور هەڵکەوتوون. بەو هۆیە کە جادەی بورهان واتا جادەی مەهاباد ـ بۆکان بە نێوەڕاستی ئاواییدا دەڕوا، ماڵەکانی بورهان کەوتوونەتە هەردووک بەری جادەکە. سەبارەت بە ناوی بورهان دەبێ بڵێین وشەیەکی عەرەبییە کە بە مانای بەڵگە و حوججەت هاتووە کەچی ڕوون نییە بۆچی بەو ناوە ناودێر کراوە.

مزگەوتی ئاوایی کە دەگەڕێتەوە سەردەمی شێخ "وسوو بورهانی" و لە لای ڕۆژاوا هەڵکەوتووە، لە دایرەی میراتی فەرهەنگی بە ژمارەی 7736 تۆمار کراوە کە دەگەڕێتەوە سەردەمی قاجارەکان واتاساڵی 1293ی کۆچی مانگی (هەڵبەت ئەو کات بە خانەقا دەناسرا پاشان ئەم شوێنە بوو بە مزگەوت).

مزگەوتەکە چەند پلیکانێکی درێژ و بەرینی هەیە. هەیوانی مزگەوت بەرفرەوانە و چەند کۆڵەکەی داری تێگیراوە، میچەکەی مزگەوت بەو هۆیە کە دارەکانی بە شێوەیەکی ڕێکوپێک و جوان چندراون زۆر سرنج ڕاکێشە. دیوارەکانی بەرین و قایمن و لە ساڵەکانی 60ی هەتاوییەوە بە شێوەیەکی باش نۆژەن کراوەتەوە و بەشێکیشی پێوە زیاد کراوە.

ئاوایی بورهان لە سەر جادەی مەهاباد ـ بۆکان هەڵکەوتووە، لە ڕۆژهەڵاتەوە ڕێگایەکی خاکی بۆ ئاوایی کانی کەوتێر دەچێ، لە ڕۆژاواش ڕێگایەکی قیلەتاو دەڕواتەوە بۆ ئاوایی کولیجە.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی 1357/10/19 کارەبای بۆ هاتووە، لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە (١٣٦٥ هـ)، سیمکارتی مخابەراتی دێهات، مزگەوت، پازگای هێزی ئینتزامی، قوتابخانەی سەرەتایی"تەقوا" (کوڕانە ـ کچانە)، شەریکەی هاوبەشیینەوت و کەلوپەلی پێویست، هەروەها بورهان خاوەن شووڕای ئیسلامی و شووڕای چارەسەری کێشەکانە. بۆ کەلک وەرگرتن لە بنکەی تەندروستی سەر بە ئاوایی "کولیجە"ن.

هێندێک لە قوتابیان بۆ درێژەدان بە خوێندن دوای قۆناغی سەرەتایی ڕەوانەی شارەکانی مەهاباد و بۆکان دەبن. چەند ساڵێکە جیاوازی نێوان کچان و کوڕان بۆ خوێندن کەم بۆتەوە. وەرزێری، ئاژەڵداری، باخداری و کرێکاری کاروپیشەی خەڵکی ئەو گوندەیان پێکهێناوە. وەرزێران گەنم، جۆ و نۆک دەچێنن و ئاژەڵەکانیان بریتین لە: مەڕ، مانگا و بزن. بەرهەمی باخەکان پێکهاتووە لە سێو و قەیسی.

گرفتەکانی خەڵکی ئاوایی: گرفتی ئاو و نەبوونی بنکەی تەندروستی سەربەخۆ.

بورهان دوو گۆڕستانی هەیە کە یەکیان بە ناوی "باخی چوالە" زۆر کۆنە و لە ڕۆژاوا هەڵکەوتووە؛ ئەوی دیکەشیان گۆڕستانی مەلا "عەوڵا" لە باشووری ئاوایی هەڵکەوتووە کە هەنووکە مردووی خۆیانی لێ دەنێژن. شێخ "وسوو بورهانی" کە پێشتر ناوی هێنرا وەک ناسراوترین کەسایەتی ئەم ئاواییە و ناوچەکە بە گشتی جێگای ئاماژەیە. هەروەها سەید "عەوڵای سەید مینە" ناسراو بە سەید عەوڵای بورهانی، فۆلکلۆرزان و شاعیر بووە و نەخوێندەوار، بەداخەوە بەرهەمەکانی کۆ نەکراونەوە و ساڵی 1332ی هەتاوی کۆچی دوایی کردووە.

## بۆزە

بۆزە لە ٢٣ کیلۆمیتری باکووری ڕۆژهەڵاتی شاری مەهاباد، بەشی ناوەندی و دێهستانی ئاختاچی ڕۆژاوا و لە ناوچەی محاڵ هەڵکەوتووە. لە ٣٠ ماڵ و ١٧٧ کەس پێکهاتووە، لەمانە ٩٠ کەسیان پیاون و ٨٧ کەسیش ژنن، ڕادەی خوێندەواران ١٠٣ کەسن کە ٥٧ کەس پیاون و ٤٦ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٦٠ کەسی نەخوێندەوار ٢٤ کەسیان پیاون ٣٦ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ٢٠٥٠ هێکتارە، کە لەمە ٤٥٠ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و ١٦٠٠ هێکتار پاوان و لەوەرگەی دێیە.

بۆزە خاوەن ٦٢٠ هێکتار زەوی دێم، ٢٢٢/٥ هێکتار زەوی بەراو، ١٢ هێکتار باخ، ١٥ تراکتۆرە و ١ لاوێردەیە.

ئاوایی‌یەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی‌یەکانی کەپەکەند و بەردەمێش

باکوور: ئاوایی‌یەکانی حەولاباد و خاتوونباخ

ڕۆژهەڵات: ئاوایی ئازاد

ڕۆژاوا: بەشێک لە ئاوایی خاتوونباخ

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باشوور: کێوی چاکی مەردەکان

باکوور: شاخەڕەش و بێژینگبەسەر

ڕۆژهەڵات: کێوەسوور

ڕۆژاوا: مەرغەول

ساروباش، کانی بییان، گۆلی قازی، گۆلی نادر، گۆلی حاجیان، کانی سەیدی چەند کانیاوێکی ئەم ئاوایی‌یەن.

زۆربەی خانووبەرەکانی بۆزە لە قوڕ و بەرد و میچەکانیان بە دار داپۆشراون و بینا تازەکانیان بە خشت و چیمەنتۆ ساز کراون. ماڵەکان حەوشەیان هەیە و دەرگایان تێگیراوە و بەرەو باشوور و ڕۆژاوا هەڵکەوتوون، گوندەکە خاوەن چەند کۆڵانەیکی نارێک و ناڕاستە. سەبارەت بە ناوی "بۆزە" خەڵکی ئاوایی دوو بۆچوونیان هەیە: "بۆز" ناوی ڕەنگێکە. بۆچوونی دووەم دەڵێ ئەم ناوە تورکییە و بە مانای سەهۆڵ و شوێنێکی سارد هاتووە.

ڕێگایەکی خاکی لە لای باشووری ئاوایی‌یەوە دەچێتەوە ئاوایی‌یەکانی بەردەمێش و کەپەکەند، لە ڕۆژهەڵاتەوە ڕێگای خاکی ئاوایی ئازاد دەگرێتەوە، لە ڕۆژاواش ڕێگای قیلەتاو دەڕوا بۆ ئاوایی خاتوونباخ.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی ١٣٧٣/١١/٩ کارەبای بۆ چووە. لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە کە عەنباراویان بۆ داناوە و سەرچاوەکەی ئاوایی "کەپەکەند"ە. سیمکارتی مخابەراتی دێهات، قوتابخانەی سەرەتایی بە ناوی "ئەمیر حوسێنی ئازەر" (کوڕانە ـ کچانە)، ئاکابیری، مزگەوتێک بە ناوی "خولەفای ڕاشیدین" کە ساڵی ١٣٨١ی هەتاوی بە خشت، چیمەنتۆ و ئاسن نۆژەن کراوەتەوە و هەروەها بۆزە خاوەن شووڕای ئیسلامییە. بۆ کاروباری تەندروستی و وەرگرتنی نەوت و کەلوپەلی پێویست دەچنە ئاوایی خاتوونباخ.

قوتابیان تا سێهەمی ناوەندی لە خاتوونباخ درێژە بە خوێندن دەدەن پاشان دەچنە شاری مەهاباد.

وەرزێری، ئاژەڵداری، کرێکاری و باخداری کاروپیشەی خەڵکی بۆزەیە، وەرزێران گەنم، نۆک، جۆ و نیسک دەچێنن. ئاژەڵەکانیشیان مەڕ و مانگان.

بەرهەمی باخەکانی ئەم دێیە پێکهاتەیەکە لە سێو و قەیسی.

گەورەترین گرفتی خەڵکی ئاوایی کەم‌ئاوییە.

کۆنەگۆڕستانی مێژوویی بۆزە لە نێو مەزرایەکە بە ناوی "ئاختاکەرێز" لە بەری ڕۆژاوا و گۆڕستانی نوێشی لە نزیک ماڵانە.

## بەردەڕەشان

بەردەڕەشان لە ۲۷ کیلۆمیتری باکووری ڕۆژهەڵاتی شاری مەهاباد، بەشی ناوەندی و دێهستانی موکریانی ڕۆژهەڵات و لە ناوچەی محاڵ هەڵکەوتووە، لە ۱۰۲ ماڵ و ۵۷۹ کەس پێکهاتووە، لەمانە ۲۷۹ کەسیان پیاون و ۳۰۰ کەس ژنن، ژمارەی خوێندەوارانی ئەم ئاواییە ۳۷۸ کەسن کە ۲۱۵ کەسیان پیاوە و ۱۶۳ کەس ژنن، هەروەها لە ۱٤۸ کەسی نەخوێندەوار ٤٤ کەسیان پیاوە و ۱۰٤ کەس ژنە.
پانتایی ئاوایی 2479/44 هێکتارە کە 700/87 هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و 1778/57 هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.
بەردەڕشان خاوەن ۱۲۵ هێکتار زەوی دێم، ۲۳ هێکتار زەوی بەراو، ۸ هێکتار باخ، ۱۸ تراکتۆر و ٦ لاوێردەیە.

ئاواییەکانی دەوروبەر:
باشوور: ئاوایی حەوڵاباد
باکوور: ئاواییەکانی تالاو و قۆپی بابالی
ڕۆژهەڵات: ئاوایی بادام
ڕۆژئاوا: ئاواییەکانی ترشەکان و گردەگرۆێ

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:
باشوور: قزلداغ
باکوور: پۆلالوو
ڕۆژهەڵات: مێردەکان
ڕۆژئاوا: هەنجیران

لە بەری ڕۆژهەڵاتی ئاوایی ئەشکەوتێک بە ناوی بەردەڕەشان هەیە.
هەباس‌ئاغا، کانی قادر، مێردەکان، مووچە و قۆقمیش لە کانیاوە بەناوبانگەکانی ئاوایین.
خانووبەرەکان لە قوڕ و بەرد، خشت و بلووکە و زۆربەی میچەکانیان هەر لە دارە، کۆڵانی درێژ و ڕێک و ڕاست دەبیندرێ و زۆربەی ماڵەکان حەوشەی گەورەیان هەیە، هێندێک خانووی کاولبوو لە ئاوایی هەیە کە لە مۆرەی قەدیمن.
سەبارەت بە مێژووی ئاوایی خەڵکەکەی دەڵێن بەردەڕەشان پێکهاتەیەک بووە لە چوار ئاوایی بە ناوەکانی حاجی حەیز، کانی قادر، مامە کۆڵە و سەید مینە کە ئاواییەکانی ناوبراو بە هۆی بێ‌ئاوی لە بەردەڕەشان کە ئەو کات مەزرا بووە کۆ دەبنەوە و ئەو دێیە پێکدێنن، بەڵام ڕوون نییە لە چساڵێک و سەردەمی کام دەسەڵاتدارێک ئاوەدان بۆتەوە. "مێردەکان"، "کانی هەمزاغا"، "قەڵای پشتماڵان" و "تەپکی خەزێنە" لە شوێنەوارە مێژووییەکانی ئەم گوندەن. جێگای ئاماژەیە ئاسەواری بناغەی خانووبەرەکان لە هەر چوار ئاواییە کۆنەکان ماونەوە. سەبارەت بە ناوی بەردەڕەشان، لە چەند میتری ڕۆژئاوای ئەم دێیە، زنجیرەشاخێکی ڕەش و نە زۆر بەرز بە درێژایی زیاتر لە 500 میتر هەیە کە ئەم ئاواییە هەر بە ناو ئەم شاخەوە کراوە.
لە باکوورەوە ڕێگایەکی قیلەتاو بە مەودای نزیک بە 1/5 کیلۆمیتر دەگاتە سەر جادەی مەهاباد ــ میاندواو. لە ڕۆژهەڵاتەوە ڕێگایەکی خاکی دەچێتەوە ئاوایی بادام و لە ڕۆژئاواش ڕێگایەکی خاکی دووڕێیانێک دەگرێتەوە کە یەکیان دەچێتەوە سەر جادەی مەهاباد ــ میاندواو و ئەوی تر دەچێتەوە ئاوایی حەوڵاباد.
ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی 1357/10/19 کارەبا چووە، سیمکارتی مخابەراتی دێهات، ڕایەڵی ئاوی خواردنەوە (ڕێکەوتی 1387/11/22)، بنکەی تەندروستی، نەخۆشخانەی نێوان ڕێگا کە ڕۆژانە دانێک کار دەکا و دکتۆری لێیە، بنکەیەکی مانگی سوور (سەر بە شاری میاندواوە لە سەر جادەی مەهاباد ــ میاندواو و ڕێگای سەرەکی ئەم گوندەیە بۆ فریاکەوتن لە کاتی ڕوودانی هەر چەشنە ڕووداوێکی نەخوازراو وەک پێکدادانی ترۆمبیل، ئاگرتێبەربوون، سێلاو و هتد)، پازگای هێزی ئینتزامی، ۱۱۵ (ئۆرژانس)، قوتابخانەی سەرەتایی و ناوەندی "وەفایی" (کوڕانە ــ کچانە)، مزگەوتی پیاوان، مزگەوتی ژنان، کارگەی کۆکردنەوەی شیر (کەرتی تایبەتی)، دوو گاوداری (کەرتی تایبەتی)، جووجەخانە (کەرتی تایبەتی) و هەروەها بەردەڕەشان خاوەن دێهیاری و شووڕای ئیسلامییە. بۆ وەرگرتنی نەوت و کەلوپەلی پێویست سەر بە ئاوایی "ئازاد"ن. خوێندکاران بۆ درێژەپێدان بە خوێندن دەچنە شاری مەهاباد.

کۆنەمزگەوتی ئاوایی پاش نۆژەن کردنەوە و دوای ساز کردنی مزگەوتی نوێ، بۆ ژنان تەرخان کراوە و ڕێورەسمی پرسە و ماتەمینی ژنان لەم مزگەوتە بەڕێوە دەچێ. مزگەوتی نوێ لە ناوەندی دێیە و تەنیا پیاوان کەلکی لێ وەردەگرن، هەر لەم مزگەوتە چەند کەس وانەی ئایینی دەخوێنن و وەک حوجرەی فەقێیان کەلکی لێ وەردەگیرێ.

وەرزێری، ئاژەڵداری و کرێکاری کاروپیشەی خەڵکی ئاواییین. وەرزێران گەنم، نۆک، نیسک و گوڵەبەڕۆژە دەچێنن، ئاژەڵەکان مەڕ، مانگا و بزنن. ئەم ئاوایی‌یە بە هۆی گرفتی بێ‌ئاوی باخێکی وای نییە.

گرفتەکان: نەبوونی قوتابخانەی ناوەندی، بەڕێوە نەچوونی گەڵاڵەی هادی.

ئاوایی خاوەن دوو گۆڕستانی کۆن و نوێیە، کۆنەگۆڕستانەکەی کە هەر لە پێشەوەی ئاوایی هەڵکەوتووە و کێلەکانی درێژن و نووکیان تیژە، ڕوون نییە پێوەندی بە چ سەردەمێکەوەیە، گۆڕستانی نوێ لە باشووری دێ هەڵکەوتووە.

ناسراوترین کەسایەتی ئاوایی وەک هونەرمەند، کاک "ناسر ئاغابرا" شاعیری دڵڕوونی نەتەوەکەمانە کە بە هەر دوو شێوازی کلاسیک و نوێ شێعر دەڵێ، ئێستا نیشتەجێی مەهابادە و کۆمەڵەشێعرێکیشی بە ناوی "کەژاوەی دڵ" بڵاو کراوەتەوە.

کێوی بەردەڕەشان لە نزیک ئاوایی

## بەردەمێش

بەردەمێش لە 21 کیلۆمیتری باکووری ڕۆژهەڵاتی شاری مەهاباد، بەشی ناوەندی و دێهستانی ئاختاچی ڕۆژاوا و لە ناوچەی محاڵ هەڵکەوتووە، لە ٣٩ ماڵ و ٢٢١ کەس پێکهاتووە، لەمانە ١٠٩ کەسیان پیاون و ١١٢ کەسیش ژنن، ژمارەی خوێندەوارانی ئەم ئاواییە ١٤٦ کەسن کە ٨٣ کەس پیاون و ٦٣ کەسیش ژنن، لە ٥٤ کەسی نەخوێندەوار ١٦ کەس پیاون و ٣٨ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ٤٥٠ هێکتارە کە 363 هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و 87 هێکتار پاوان و لەوەرگەی دێیە.

بەردەمێش خاوەن ٢٣٢ هێکتار زەوی دێم، ١١٥ هێکتار زەوی بەراو، ٦٥ هێکتار باخ، ٢٠ تراکتۆرە و ٤ لاوێردەیە.

بەرزایی ئاوایی لە ڕووکەشی زەریاکانەوە ١٦٠٠ میترە.

ئاواییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی قەرەبلاغ

باکوور: ئاوایی خاتوونباخ

ڕۆژهەڵات: ئاوایی کەپەکەند

ڕۆژاوا: ئاوایی زگدڕاو

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باشوور: کێوەسپی

باکوور: بەردەکونتێ

ڕۆژهەڵات: شاخی گراوێ

ڕۆژئوا: مەرغەوڵ

کانی پانکە، شلێر و کانی جوامێر سێ کانیاوی ئاواییین.

لە بەری ڕۆژهەڵاتی ئاوایی دوو ئەشکەوت هەن کە هەر دووکیان بە ناوی"کەس نەکێڵ" ناسراون.

لە بەری باکووری دێ ئەشکەوتێک بە ناوی "سەیدە فەقیرە" هەیە. خانووبەرەکان لە قوڕ و بەردن، تەنیا چەند ماڵێک لە خشت و بلووک ساز کراون، میچی ماڵەکان بە گشتی لە دارە، ماڵەکان حەوشەیان هەیە و دەرِوازەیان تێگیراوە، زۆربەی ماڵەکان ڕوو لە باکوورن. قەڵای "گردەخۆڵینە" لە باشووری ئاوایی هەڵکەوتووە.

سەبارەت بە ناوی ئاوایی، گشت خەڵکی ئەم دێیە ڕایان وایە کە لە باشووری دێ لە سەر کێوی "کەلکەی کونەمێش" لە نێو قەڵشی شاخدا هەنگێکی گەورەی تێدایە، ئەو هەنگە زۆر لە مێژینەیە و بە بیری هیچ کەس نییە و بە هۆی زۆر بوونی مێش، حەستەم بوونی جێگاکەی و خۆش بوونی کەشوهەوای ناوچە هەر ماوەتەوە. بەردەمێش لە دوو وشەی بەردە + مێش پێکهاتووە و لەنێو بەردی "کلکەی بەردەمێش" ئەو مێشهەنگوینە تا ئێستاش هەر ماوەتەوە و ناوی ئاوایی هەر لەوە هاتووە.

لە باشوورەوە ڕێگایەکی ئامادە بۆ قیلەتاو دەچێتەوە سەر جادەی مەهاباد - بۆکان، لە باکوورەوە ڕێگایەکی خاکی دەڕوا بۆ ئاواییەکانی "بۆزە" و "خاتوونباخ"، لە ڕۆژهەڵاتەوە ڕێگایەکی تری ئامادە بۆ قیلەتاو ئاوایی "کەپەکەند" دەگرێتەوە.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی 1357/10/19 کارەبای بۆ چووە، لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە (عەنباراویان بۆ داناوە و لە کانی شیلان ئاوەکەی دابین دەبێ)، سیمکارتی مخابەراتی دێهات، قوتابخانەی سەرەتایی"عەدالەت" (کوڕانە ــ کچانە) ئاکابیری، مزگەوتێک بە ناوی "چوار یاری نەبی" کە بۆ یەکەم جار لە لایەن حاجی "مستەفا شاتری"یەوە ساز کراوە و لە ساڵی 1382 سەر لە نوێ دانرایەوە. هەروەها بەردەمێش خاوەن شووڕای ئیسلامییە. بۆ کەلک وەرگرتن لە بنکەی تەندروستی سەر بە ئاوایی خاتوونباخن، بۆ وەرگرتنی نەوت و کەلوپەلی پێویست سەر بە ئاوایی قەرەبلاغن.

هێندێک لە قوتابیان بۆ درێژەپێدان بە خوێندن پاش تێپەڕ بوونی قۆناغی سەرەتایی ڕەوانەی ئاوایی گۆکتەپە دەبن.

وەرزێری، ئاژەڵداری، باخداری و کرێکاری کاروپیشەی خەڵکی ئەم گوندەیە. وەرزێران گەنم، جۆ، نۆک و نیسک دەچێنن و ئاژەڵەکانیان بریتین لە مانگا، مەڕ و بزن. بەرهەمی باخەکانیان سێو، هڵوو و قەیسییە.

گرفتەکانی خەڵکی ئاوایی: نەبوونی بنکەی تەندروستی سەربەخۆ.

گۆڕستانەکەیان لە نزیک ئاوایی و لە بەری ڕۆژهەڵات هەڵکەوتووە.

## بەرەجۆ

ئەم ئاواییەیە لە ٥٣ کیلۆمیتری باشووری ڕۆژهەڵاتی شاری مەهاباد، بەشی خەلیفان و دێهستانی کانی بازاڕ و لە ناوچەی محاڵ هەڵکەوتووە. لە ٣٦ ماڵ و ٢٦٧ کەس پێکهاتووە، لەمانە ١٢٤ کەس پیاون و ١٤٣ کەسیش ژنن، لە ١٢٩ کەسی خوێندەوار ٦٧ کەس پیاون و ٦٢ کەسیش ژنن، هەروەها لە ١٠٣ کەسی نەخوێندەوار ٣٧ کەس پیاون و ٦٦ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ٤٥٠ هێکتارە، لەمە ٢٣٣/٥ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و ٢١٦/٥ هێکتار پاوان و لەوەرگەی دێیە.

بەرەجۆ خاوەن ٧٠ هێکتار زەوی دێم، ٣٠ هێکتار زەوی بەراو، ١٣ هێکتار باخ، ١٨ تراکتۆر و ١ لاوێردەیە.

مەودای بەرەجۆ تا ناوەندی خەدەماتی وەرزێری کانی بازاڕ ١١ کیلۆمیترە.

ئاوایییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی میرەدێ

باکوور: ئاوایی بەیرەم

ڕۆژهەڵات: کانی ڕەش، ئاچیدەرێ و بەشێک لە بەیرەم

ڕۆژئاوا: ئاوایی پیرمکائیل

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باشوور: کێوی بەردەبووکی

باکوور: کێوەکانی پیراییز و قەدی گاسووری

ڕۆژهەڵات: دیوی ئەشکەوتان (هەوارگەیە)

ڕۆژئاوا: چراغی و تەندووران

لە دیوی ئەشکەوتان دوو ئەشکەوتی لێیە بە ناوەکانی "دیوی شاخی" و "دیوی ئەشکەوتان".

کانی ماران، کانی چەقالان، کانی خانمی، کانی لاچین، سەرچاوە، کانیاوەکانی بەرەجۆن.

خانووبەرەکان لەم دێیە بە گشتی لە قوڕ و بەرد ساز کراون و میچەکانیان لە دارە، ماڵەکان ڕوویان لە ڕۆژئاوایە و جگە لە چەند خانوو، هیچیان حەوشەیان نییە، کۆڵانەکانی هەورازن و ڕێگایەک لە سەرووی ماڵانەوە تێپەڕ دەبێ. خەڵکی بەرەجۆ بەتایبەت ئەوانەی تەمەنیان زۆرە ڕایان وایە ناوی بەرەجۆ هەر لەوە هاتووە کە زوو لە بەر ماڵان جۆ کراوە.

لە باشووری دێ ڕێگایەکی قیلەتاو ئاوایی میرەدێ دەگرێتەوە، لە باکورەوە ڕێگایەکی تر دەچێتەوە ئاوایی بەیرەم، لە ڕۆژهەڵاتەوە ڕێگایەکی خاکی دەڕوا بۆ ئاوایی قۆڵغەتەپە سەر بە بۆکان، لە ڕۆژئاواوە ڕێگایەکی خاکی دەچێتەوە ئاوایی پیرمکائیل.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی ١٣٧٦/٩/١١ کارەباکەی هەڵکراوە، لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە کە عەنباراویان بۆ داناوە لە ساڵی ١٣٨٥ هەتاوی و ئاوەکەی لە کانی چەقالان دابین دەبێ، دەفتەری مخابەراتی، بنکەی تەندروستی، قوتابخانەی سەرەتایی "حەمید" (کوڕانە ــ کچانە) کە بیناکەی حازرپەدەستە، مزگەوتێک کە لە قوڕ و بەردە. هەروەها بەرەجۆ خاوەن شووڕای ئیسلامییە. خەڵکی ئاوایی بۆ وەرگرتنی نەوت و کەلوپەلی پێویست سەر بە شەریکەی هاوبەشییخەلیفانن.

قوتابیانی کوڕ بۆ درێژەدان بە خوێندن تا سێهەمی ناوەندی دەچنە ئاوایی میرەدێ کە قوتابخانەی ناوەندی لێیە، پاشان دەچنە خەلیفان و مەهاباد، کچانیش ئەو هەلەیان بۆ ڕەخساوە تا لە خەلیفان و مەهاباد درێژە بە خوێندن بدەن.

کاروپیشەی خەڵکی ئەو ئاواییەیە وەرزێری، ئاژەڵداری و کرێکارییە. وەرزێران گەنم، نۆک، جۆ و نیسک دەچێنن. زۆربەی ئاژەڵەکانیان مانگایە، تا ڕادەیەکیش مەڕ ڕادەگرن. زۆرترین بەرهەمی باخی ئەو دێیە هەر سێوە.

گرفتەکانی خەڵکی بەرەجۆ: نەبوونی تەلەیفوونی ماڵ بە ماڵ و بینایەکی باش بۆ قوتابخانە.

گۆڕستانی ئاوایی بە ناوی "بەردەبووک" لە بەری باشووری ئەم دێیە هەڵکەوتووە.

## بەسری

بەسری لە ١٨/٥ کیلۆمیتری ڕۆژهەڵاتی شاری مەهاباد، بەشی ناوەندی و دێهستانی ئاختاچی ڕۆژاوا و لە ناوچەی محاڵ هەڵکەوتووە. ڕەنگە بتوانین بڵێین خەڵکی زۆربەی ناوچەکان لەم ئاوایی‌یەدا دەژین وەکوو: محاڵی، شارویرانی، مەنگوڕ، گەورک، لاجان، هەروەها چەند کەسێک خەڵکی شارەکانی وەکوو کرماشان، سنە، سەقز و نەغەدە. بەسری لە ٢٤ ماڵ و ٥٩ کەس پێکهاتووە کە لەمانە ٣٠ کەسیان پیاون و ٢٩ کەسیش ژنن، ڕادەی خوێندەواران ٢٧ کەسن کە ١٥ کەسیان پیاون و ١٢ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٢٧ کەسی نەخوێندەوار ١٣ کەسیان پیاون ١٤ کەس ژنن.
پانتایی ئاوایی ١٥٢/٣ هێکتارە، لەمە ٥٠/٩ هێکتار بۆ خەڵک
بەسری خاوەن ٦٣ هێکتار زەوی دێم، ٢٠ هێکتار زەوی بەراو،٢ هێکتار باخ، ٢ تراکتۆرە و ٢ لاوێردەیە جیا کراوەتەوە و ١٠١/٤ هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە..

ئاوایی‌یەکانی دەوروبەر:
باشوور: ئاوایی‌یەکانی قەڵات و حەوتەوانان
باکوور: ئاوایی زگدڕاو
ڕۆژهەڵات: ئاوایی قەرەبڵاغ
ڕۆژاوا: ئاوایی سەیداوا

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:
باکوور: کێوی مەنجەڵشکێن
ڕۆژهەڵات: کێوی شێخ حەسەن
ڕۆژاوا: کێوی بێژینگبەسەر

لەم دێیە دوو کانیاو هەیە کە بە گۆلی شێری و گۆلی کەرێزە ناسراون.
زۆربەی خانووبەرەکان لە سەر شێوازێکی نوێ و یەکڕا لە سەردەمی دەسەڵاتی پەهلەوی‌دا لە لایەن دەسەڵات و خەڵکی خێرخواز ساز کراون، چەند خانوویەک بە قوڕ و بەرد ساز کراون و لە بەری ڕۆژاوا هەڵکەوتوون. چەند خانووبەرەیەک کە رووخاون و لە بەرد و قوڕن، لە زارکی ئاوایی بەسرین و ئاسەواری ئەو ماڵانەن کە خەڵکەکەی چۆڵیان کردوون. هەنووکە سەرەکی‌ترین کەرەسە بۆ ساز کردنی خانووەکانی بەسری خشت، بلووک، چیمەنتۆ و ئاسنە. گشت ماڵەکان بەرەو باشوورن و حەوشەیان نییە، بەر دەرگای زۆربەی ماڵەکان داری لێ چەقێندراوە و بێستان و باخچەیان کردووە. هێندێکیان پەرژینیان ساز کردووە و بەم چەشنە هەرێمی حەوشەی خۆیان دیاری کردووە.
سەبارەت بە زەمانی ئاوەدان کردنەوەی بەسری زانیارییەکی ئەوتۆ لە دەستدا نییە. بەر لە دەهەی پەنجای هەتاوی کە ئەم نەخۆشانەیان (جۆزام - نەخۆشی گولی) لە ئاوایی سیاقوڵەوە گوێزتەوە ئەم شوێنە، ئەو دێیە هەر ئاوەدان بووە و خەڵکی دیکەی ئەو ناوچەیەی لێ دەژیان، بەڵام لە دوای هێنانی ئەم نەخۆشانە، هێندێک لە خەڵکەکە بەسرییان بەجێ هێشت و چوونە شار و ئاوایی‌یەکانی دیکە، هێندێکی دیکەش هەر مانەوە و لە سەر مووچە و مەزرای خۆیان خەریکی وەرزێرین.
لە باشووری ڕۆژهەڵاتی دێ لە سەر کێوێک چاکێکی لێیە کە بە شێخ "حەسەن بەسری" ناسراوە و ئەم ئاوایی‌یە هەر بە ناوی ئەو کراوە.
لە سەر جادەی مەهاباد - بۆکان (ناسراو بە جادەی بورهان) بەر لە ئاوایی قەرەبڵاغ لە بەری باشوور، ڕێگایەکی ٢/٥ کیلۆمیتری قیلەتاو هەیە کە دەچێتەوە ناوەندی ئاوایی بەسری، هەروەها لە باشووری ئاوایی بەسری باریکەڕێیەک ئاوایی‌یەکانی قەڵات، سارەوانان و حەوتەوانان دەگرێتەوە.
ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی ١٣٦٣/١١/١ کارەبای بۆ چووە، لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە، قوتابخانەی سەرەتایی "شکوفە" (کوڕانە ـ کچانە)، بنکەی مخابەراتی، مزگەوتێک کە بە خشت، چیمەنتۆ و ئاسن لە لایەن خەڵکی خێرخواز و "ئەنجومەنی خاتمولئەنبیا" نۆژەن کراوەتەوە، حەمام بۆ نەخۆشان، چێشتخانەی گشتی، مەکینەی جلکشۆری گشتی - ئەو نەخۆشانەی توانای جلک شووشتنیان نییە بۆیان لە مەکینەی جلک شۆردن داوێن - نانەوەخانە و هەروەها بەسری خاوەن دێهیارییە.
نەخۆشەکانی ئەم دێیە لە ژێر چاوەدێری "ئەنجومەنی خاتمولئەنبیا" دان کە حەوتەی جارێک میوە و شیریان بۆ دێنن و کەلوپەلی پێویستیان

دەدەنێ.
خوێندکاران بۆ درێژەدان بە خوێندن دەچنە شاری مەهاباد .
ئەنجومەن لە مانگێکدا دوو جار پشکنین و پێداویستییەکانی بێهداشتیان بۆ جێبەجێ دەکا. ڕۆژانە دوو جەم چێشتی گەرمیان لە چێشتخانەی گشتی دەدەنێ. زۆرترین خەرجی دەرمانیی و هەزینەی دیکەی نەخۆشەکانی بەسری لە لایەن "ئەنجومەنی خاتمولئەنبیا"یەوە دابین دەبێ.
بەسری ٢٣ کەس نەخۆشی گولی تێدان، منداڵەکانیان ساغن و بنکەکانی تەندروستی ساغ بوونی ئەوانی سەلماندووە. ٢١ ماڵ ڕەشایین و تەنیا ٤ ماڵ خاوەن زەویوزارن. چەند ماڵیش مانگایان هەیە. نەخۆشەکانی بەسری توانای کار کردنیان نییە هەر بۆیە بەڕێوەبەرایەتیی ئاسایشت "دایرەی بێهزیستی" و "ئەنجومەنی خاتمولئەنبیا" مانگانە پارەیەکیان دەدەنێ و زۆربەی پێداویستییەکانیان جێبەجێ دەکەن، هەروەها خەڵکێکی خێرخوازیش دەستی خەڵکی بێبەشی ئەم گوندە دەگرن.
گرفتەکانی خەڵکی بەسری گەلێکن، ئەوان ئاماژە بە هەژاری، نەبوونی زەویوزار و گرینگتر لە هەموان بارودۆخی ناخۆش و نەبوونی سڵامەتی دەکەن.
لە بەری باشووری بەسری کۆنەگۆڕستانێک هەیە کە کەلکی لێ وەرناگیرێ، ئێستا بۆ ناشتنی مردووەکانیان لە گۆڕستانی ئاوایی حەوتەوانان کەلک وەردەگرن.
خزمەتگوزارییەکانی "ئەنجومەنی خاتمولئەنبیا" بەو نەخۆشانەی بەسری بریتین لە*:
دانی پارە و یارمەتییەکانی دیکە بۆ خەرجە پێویستییەکانی ئەوان، حەوتەی جارێک میوە و شیر، دابین کردنی سووتەمەنی زستان، حەمام و نانەوەخانە، قەرەبوو کردنەوەی خانووبەرەی نەخۆشەکان وەکوو قیلەتاو کردنیان، دەرگا و پەنجەرە و پتەو کردنیان، ئاوەڕۆ دەر کردن، جێبەجێ کردنی کەلوپەلی نێومال و چاکرنەوەی ئامرازەکانی کارەبایی، دابین کردنی خەرجی خوێندنی منالەکانیان کە لە دەرەوەی ئاوایی دەخوێنن، پەرەستار و "مددکار" بۆ نەخۆشان، پاکوخاوێنی و کۆ کردنەوەی زبڵوزاڵی دەوروبەر، ماڵینی بەفری سەربانان، پێکهێنان و دابەش کردنی جلک و پێڵاو لە لایەن کەسانی خێرخواز، دابەش کردنی گۆشتی قوربانی و گشت یارمەتییەکانی دیکە.
دەتوانین بڵێین نەخۆشی گولی بەرەو کۆتاییە. هەموو ساڵێک لە لایەن ناوەندی بنکەی تەندروستیەوە تێستی بێهداشتیان لێ وەردەگرنەوە، ئەگەر نیشانەی نەخۆشیان تێدا بەدی بکرێ داودەرمان دەکرێن. شایانی باسە ئەو کەسانەی نەخۆش نین و دەگەڵ ئەوان پێوەندییان هەیە هیچ جێگای مەترسی نییە کە ئەو نەخۆشییە بگرنەوە.

* ئەم زانیارییانە لە "ئەنجومەنی خاتمولئەنبیا" لە شاری مەهاباد وەرگیراوە.

## بەیتاس

بەیتاس لە ١٢ کیلۆمیتری باشووری شاری مەهاباد، بەشی خەلیفان و دێهستانی مەنگوڕی ڕۆژهەلات لە سەر ڕێگای مەهاباد ــ سەردەشت و لە ناوچەی مەنگوڕایەتی هەڵکەتووە. لە ٣٨ ماڵ و ٢٨٦ کەس پێکهاتووە، لەمانە ١٣٧ کەسیان پیاون و ١٤٩ کەسیش ژنن، لە ١٧٥ کەسی خوێندەوار ٩٢ کەس پیاون و ٨٣ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٨٥ کەس نەخوێندەوار ٣٣ کەس پیاون و ٥٢ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ٦٠٠٠ هێکتارە، لەمە ١٧٠ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و ٥٨٣٠ هێکتار پاوان و لەوەرگەی دێیە.

بەیتاس خاوەن ٢٢٩/٥ هێکتار زەوی دێم، ٥٥/١ هێکتار زەوی بەراو، ٣١/٨٥ هێکتار باخ، ٨ تراکتۆر و ٢ لاوێردەیە.

بەرزایی ئاوایی لە ڕووکەشی زەریاکانە ١٦٤٠ میترە.

ئاوایی‌یەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی‌یەکانی حەولاکوردە و کاوەیس

باکوور: ئاوایی هەمزاوا

ڕۆژهەلات: ئاوایی قەرەچەلان

ڕۆژاوا: ئاوایی حاجی‌مامیان

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باشوور: ئەسحاب

باشووری ڕۆژاوا: گۆڕان

باکوور: مۆسکە

ڕۆژهەلات: تەپکی پایەگا

لە سەر شاخی "لیسێ" لە باشووری ڕۆژهەلات ئەشکەوتێکی لێیە بە ناوی "هالاوێ" کە بەفر ناگرێ و لە کاتی بەفر بارینیدا هەڵمی لێهەڵدەستێ.

زۆربەی خانووبەرەکانی ئەم ئاواییە لە قوڕ و بەردن و میچەکانیان بە دار داپۆشراون و تەنێ قوتابخانە، مزگەوت و چەند خانووبەرەیەک خشت، چیمەنتۆ و ئاسنیان دەکار کردووە. کۆڵانەکانی ئاوایی لێژن و زۆربەی ماڵەکان حەساریان نییە، بەگشتی ماڵەکان ڕوویان لە باشوورە. ئەوەی کە ئەو دێیە لە چ سەردەمێکدا ئاوەدان بۆتەوە ڕوون نییە، هەروەها هۆی ئەم ناودێرکردنەش لێکۆڵینەوەیەکی بۆ نەکراوە و بەڵگەیەک بەدەستەوە نییە.

زۆربەی خەڵکی بەیتاس و ئاوایی‌یەکانی دەوروبەر ڕایان وایە کە بەیتاس بە درێژایی مێژووی خۆی هەر بنکەی ئاغا، بەگ و بەگزادان بووە. کاک "عەلی سالارعەشایری" (لە دایکبووی ساڵی ١٣١٦ی هەتاوی، کە لە ساڵی ١٣٣١ی هەتاوییەوە بە بنەماڵەوە لە ئاوایی بەیتاس گیرساونەوە) وەک دوایین ئاغاوەتی بەیتاس بەو شێوەیە لە سەر ئەو گوندە دەدوێ:

"ساڵی ١٢٨٤ی هەتاوی بەیتاس بە دەست باپیرم "باپیرئاغا سالارعەشایری"یەوە بووە، دوایە بۆتە مڵکی مامم "محەممەدئەمین سالارعەشایری". کە هاتینە ئێرە بیست ماڵێکی لێ بوو، بەشێکیان جووتبەندە بوون و بەشێکیش ڕەشایی*".

لە باکووری بەیتاسەوە ڕێگای مەهاباد ــ سەردەشت دەڕوا بەرەو ئاوایی هەمزاوا، هەروەها لە لای باشوور ئەم ڕێگایە، ئاوایی حەولاکوردە و ئاوایی‌یەکانی دیکە هەر کام بە باریکەڕێیەکدا و ڕێگایەکی تایبەتی‌دا لە قەراغ جادە دەگرێتەوە.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی ١٣٥٧/١٠/١٩ کارەبای بۆ هاتووە، لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە کە عەنباراویان بۆ داناوە و ئاوەکەی لە "کانی ژنان و "کانی پیاوان" دابین دەبێ، سیمکارتی مخابەراتی دێهات، قوتابخانەی سەرەتایی "قائیم" (کوڕانە ــ کچانە)، کۆنەمزگەوتێک کە لە نێو ماڵان دایە، مەزگەوتی نوێ لە خوارووی ماڵانەوەیە و بە یارمەتی خەڵکی خێرخواز ساڵی ١٣٨٨ی هـ ساز کراوە. بۆ بنکەی تەندروستی و وەرگرتنی نەوت و کەلوپەل سەر بە ئاوایی "حەولاکوردە"ن.

قوتابیان تا پۆلی سێهەمی ناوەندی دەچنە ئاوایی هەمزاوا و لە دوای تەواو کردنی ئەم پۆلە ڕەوانەی شاری مەهاباد دەبن، لەم بوارەدا جیاوازییەکی ئاشکرا لە نێوان کوڕان و کچاندا هەیە و کچان کەمتر دەرفەتی خوێندنیان بۆ دەرەخسێ.

کاروپیشەی خەڵکی بەیتاس وەرزێری، ئاژەڵداری، باخداری و کرێکارییە، وەرزێران گەنم، جۆ، نۆک و وێنجە دەچێنن و ئاژەڵەکانیشان مەڕ و مانگان، هەروەها بەرهەمی باخەکانی ئاوایی سێو و گوێز و قەیسییە.

---

* ڕەشایی: بە کەسێکیان دەگوت کە زەوێ و ئاژەڵیان نەبووایە و کارداری خەڵکی بووبا.

گرفتێکی گەورەی ئاوایی دوو خڕ و دۆڵن کە لە پشت ماڵان هەڵکەوتوون و هەموو ساڵێ وەرزی بەهار و پاییزان زیان و زەرەدێکی زۆری بۆ ماڵوحاڵی خەڵکەکە هەیە. لێدانی سێزدە بەربەند، هێشتا نەیتوانیوە پێش بەو لافاوانە بگرێ.
گرفتێکی دیکە بایەخنەدان بەو ئاسەوارە مێژووییانەیە کە زۆر جاران لەم دێیە دەدۆزرێنەوە و دەفەوتێن یان بە تاڵان دەچن.
لە سەردەمی ڕێگا خۆش کردنی مەهاباد ـ سەردەشتدا بەشێکی بەرچاو لە گۆڕستانی "چاکەچکۆلە"ی بەیتاس وەبەر کەوت. کێلی قەبرەکانی ئەم گۆڕستانە بەردێکی بەرز و نووکتیژن و هەمووی بە یەک شێوەن. هەنووکە خەڵکەکەی بەیتاس مردووەکانی خۆیان لە باشووری ڕۆژاوای ئاوایی لە شوێنێک بە ناوی "کانی هەمزاغا" دەنێژن.
یەکێک لە سەرچاوەکانی ڕووباری مەهاباد چۆمەکەی بەیتاسە کە ئاوەکەی لە کێوەکانی ئاغاسوور و شاخی قەل دابین دەبێ و لە قەراغی ڕۆژهەڵاتی ڕێگای مەهاباد ـ سەردەشتەوە دەچێتەوە ئاوبەندی مەهاباد.

ئاوایی بەیتاس

## بەیرەم

بەیرەم لە ١٨ کیلۆمیتری باشووری ڕۆژهەڵاتی شاری مەهاباد، بەشی خەلیفان و دێهستانی کانی بازاڕ و لە ناوچەی محاڵ هەڵکەوتووە. لە ٤١ ماڵ و ٢٩٢ کەس پێکهاتووە کە ١٤٧ کەسیان پیاون و ١٤٥ کەسیش ژنن، لە ١٦٩ کەسی خوێندەوار ١٠٠ کەس پیاون و ٦٩ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٩٥ کەسی نەخوێندەوار ٣٤ کەس پیاون و ٦١ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ٧٥٠هێکتارە، لەمە ٤٠٨ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و ٣٤٢ هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.

بەیرەم خاوەن ٣٥٠ هێکتار زەوی دێم، ١٢٠ هێکتار زەوی بەراو، ١٦ هێکتار باخ و ١٧ تراکتۆرە. مەودای بەیرەم تا ناوەندی خزمەتگوزاریی وەرزێری کانیبازاڕ ١٤ کیلۆمیترە.

ئاواییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی بەرەجۆ

باکوور: ئاوایی قزڵجەی خوارێ

ڕۆژهەڵات: حوسێنئاباد و کانی ڕەش و قزڵجەی خوارێ

ڕۆژاوا: ئاواییەکانی گردەبەردان و عەینەمەلا

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باکوور: کێوی چۆمی تالانێ

ڕۆژهەڵات: زەرگەتان

ڕۆژاوا: بەرۆژەبڵیند

کانیاوەکانی بریتین لە: سەرچاوەی داودی، کانی تاوکان، کانی سپێ، میانداوان و کانی حەنیفێ.

داود و کەس نەجووکە (لە باشوور)، کوێستانەکانی ئەم دێیەن کە ئێستاش هەواری دەچێتێ.

زۆرتری خانووبەرەکانی ئەم ئاواییە لە قوڕ و بەرد ساز کراون و میچەکانیان لە دارن، بەشێک لە ماڵەکان خاوەن حەوشەن، کۆڵانەکان هەورازن و گشت ماڵەکان ڕوویان لە باشوورە. "قەڵاتگە" لە باکوور و "قەڵای قوڵقوڵە" لە باشوور، دوو شوێنی مێژوویی ئەم ئاواییەن.

لە باشووری بەیرەم ڕێگایەکی خاکی دەچێتەوە ئاواییەکانی بەرەجۆ و میرەدێ، لە باکوورەوە کوێرەڕێگایەک ئاوایی قزڵجەی خوارێ دەگرێتەوە، لە ڕۆژهەڵاتیش ڕێگایەکی خاکی دەچێتەوە ئاوایی گردەبەردان.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی ١٣٧٦/٨/٢٤ کارەباکەی هەڵکراوە، لولەکێشیی ئاوی خواردنەوە کە عەنباراویان بۆ داناوە، بنکەی مخابەراتی، قوتابخانەی سەرەتایی "سەمەد" (کوڕانە ــ کچانە) کە بیناکەی حازربەدەستە، دێهیاری (ساڵی ١٣٨٨)، مزگەوت کە ساڵی ١٣٨٠ی هەتاوی نۆژەن کراوەتەوە و لە بەرد و قوڕە و میچەکەی دارڕایە و هەروەها بەیرەم خاوەن شووڕای ئیسلامییە. خەڵکی بەیرەم بۆ کاروباری پێوەند بە بنکەی تەندروستی دەبێ بچنە ئاوایی گردەبەردان، نەوت و کەلوپەلی پێویستیش لە شەریکەی دابەشینی "پشتتەپ"ی مەهاباد وەردەگرن.

خوێندکاران بۆ درێژەدان بە خوێندن دەچنە خەلیفان و مەهاباد، کەم وا هەیە کچێک بتوانێ درێژە بە خوێندن بدا.

وەرزێری و ئاژەڵداری سەرەکیترین کاروپیشەی خەڵکی ئەم گوندەیە، وەرزێران گەنم، جۆ، نۆک و گوڵەبەڕۆژە دەچێنن و ئاژەڵەکانیشیان مەڕ و مانگان.

باخەکان زۆریان تازە لێدراون و زۆرتر دارسێون.

گرفتەکانی خەڵکی بەیرەم: ڕێگای خاکی و ناخۆش، نیاز بە پردێک، چارەسەری گرفتی ئاوەڕۆی ئاوایی، کەمئاوی، نەبوونی ئاودەست بۆ مزگەوت، نەبوونی بینایەکی باش بۆ قوتابخانە.

گۆڕستانی ئاوایی لە لای باکوور هەڵکەوتووە.

وەکوو ناسراوترین کەسایەتییەکانی ئاوایی دەتوانین ئاماژە بە دوو بەیتبێژی ناسراو کاک "محەممەد ڕەسووڵی" (محەممەدی خاڵەی) و "محەممەد خەزالی" (حەمەدی بەیتان) بکەین.

## بێهەنگوین

ئەم ئاوایی‌یە لە ٤٧ کیلۆمیتری باشووری ڕۆژاوای شاری مەهاباد، بەشی خەلیفان و دێهستانی مەنگوڕی ڕۆژهەڵات و لە ناوچەی مەنگوڕایەتی هەڵکەوتووە. لە ٢٧ ماڵ و ١٦٤ کەس پێکهاتووە کە لەمانە ٨٠ کەسیان پیاون و ٨٤ کەسیش ژنن، لە ٩٦ کەسی خوێندەوار ٥٧ کەسیان پیاون و ٣٩ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٤٩ کەسی نەخوێندەوار ١٥ کەسیان پیاون و ٣٤ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ٦٢٢٧ هێکتارە، لەمە ٢١٧ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و ٦٠١٠ هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.

بێهەنگوین خاوەن ٢٣/٥ هێکتار زەوی دێم، ١٧٠/٢ هێکتار زەوی بەراو، ٢٠/٣٧ هێکتار باخ و ٧ تراکتۆرە.

ئاوایی‌یەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی‌یەکانی کارگ و هەرمێ

باکوور: ئاوایی حەسەنچەپ

ڕۆژهەڵات: ئاوایی‌یەکانی گۆمڵیان و ئەسحاب

ڕۆژاوا: ئاوایی کانیەکلێ (سەر بە شاری پیرانشار)

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باشوور: شاخی قوبڵەی

باکوور: قەڵاتگر

ڕۆژهەڵات: کێوی شیوی چاڵان

ڕۆژاوا: ئەسپی‌سەنگ و مەیدانئەستەر

کانیاوەکانی بێهەنگوین بریتین لە: هەواری گۆڕێ، پەرەسلێرکان و کانی ماران.

خانووبەرەکانی ئەم دێیە بە گشتی لە قوڕ و بەردن و میچەکانیان لە دارە؛ ماڵەکان حەوشەیان نییە، بە گشتی ڕوویان لە باشوورە و شوێنی هەڵکەوتنیان هەوراز و لێژە. مزگەوتی ئەم گوندە هەر لە بەرەوەی ماڵانە.

لە باکووری بێهەنگوین ڕێگایەکی خاکی دەچێتەوە ئاوایی دووچۆمان و ڕێگای hاموشۆی ئاوایی هەر ئەم ڕێگایەیە.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی ١٣٧٧/٣/١ کارەباکەی هەڵکراوە، لولەکێشیی ئاوی خواردنەوە کە لە کانی ماران دابین دەبێ، بنکەی مخابەرات، قوتابخانەی سەرەتایی بە ناوی "محەممەدئەمین ئەحمەدی" (کوڕانە ـــ کچانە) کە بیناکەی لە قوڕ و بەردە. مزگەوتەکەی بە ناوی "محەممەدڕەسووڵڵا" (د.خ)، ساڵی ١٣٧٨ی هەتاوی لە قوڕ و بەرد ساز کراوە. هەروەها ئەم دێیە خاوەن شووڕای ئیسلامییە. خەڵکی بێهەنگوین بۆ بنکەی تەندروستی سەر بە ئاوایی "باگردانی خوارێ"ن و نەوت و کەلوپەلی پێویست لە شەریکەی هاوبەشیی ئاوایی سیاقوڵی خوارێ وەردەگرن.

خوێندکارانی کوڕ بۆ درێژەدان بە خوێندن دەچنە خەلیفان یان شاری مەهاباد و کچان لە پاش تەواو کردنی دەورەی سەرەتایی پێیان ناخوێندرێ.

وەرزێری، ئاژەڵداری و مێشداری کاروپیشەی خەڵکی ئەو گوندەیە، وەرزێران گەنم و جۆ دەچێنن و ئاژەڵەکانیان هەر مەڕن. زۆربەی باخەکان ساوان و دار سێون.

گرفتەکانی ئاوایی: ڕێگای خاکی و ناخۆش، پێویستی بە پردێک بۆ نێو ئاوایی، نەبوونی بنکەی تەندروستی سەربەخۆ و پێویستی بە ساز کردنەوەی بینای قوتابخانە.

ئەم ئاوایی‌یە خاوەن دوو گۆڕستانە، یەکیان کۆنەگۆڕستانەکەی بە ناوی "چەقالان" و گۆڕستانە تازەکەی ناوی "بۆن خۆشکان"ە.

# پاشبەرد

پاشبەرد لە ٥٨ کیلۆمیتری باشووری ڕۆژهەلاتی شاری مەهاباد، بەشی خەلیفان و دێهستانی کانی بازاڕ و لە ناوچەی گەورکایەتی هەلکەوتووە. لە ١٣ ماڵ و ٧٥ کەس پێکهاتووە، لەمانە ٣٦ کەسیان پیاون و ٣٩ کەس ژنن، ڕادەی خوێندەواران ٥٠ کەسە کە ٢٥ کەسیان پیاون و ٢٥ کەسیش ژنن، لە ١٧ کەسی نەخوێندەوار ٦ کەسیان پیاون و ١١ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ٤٨٥ هێکتارە، لەمە ١٠٠/٥ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە، ٣٨٤/٥ هێکتار پاوان و لەوەرگەی دێیە.

پاشبەرد خاوەن ١٦٠ هێکتار زەوی دێم، ١٠ هێکتار زەوی بەراو، ٢ هێکتار باخ و ٣ تراکتۆرە.

ئاواییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی سۆیناس

باکوور: ئاوایی یاڕاڵی

ڕۆژهەلات: ئاوایی گامێشان

ڕۆژئاوا: ئاوایی کاوڵانی خوارێ

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باشوور: کێوی شاخەڕەش

ڕۆژهەلات: بەشێک لە شاخەڕەش

ڕۆژئاوا: قەلات

کانیاوەکانی بە کانی گوێزان، کانی پاشبەرد، کانی ژنان، کانی ماڵان و کانی خڕی مەلاک ناسراون.

خانووبەرەکان لە قوڕ و بەردن و میچیان لە دارە، هێندێک لە ماڵەکانی ئاوایی بە بەرد پەرژینیان بۆ ساز کردوون و بوون بە حەوشە، بەڵام دەرگایان تێنەگیراوە، ماڵەکان بەرەو ڕۆژهەلاتن و لە شوێنێکی هەوراز هەلکەوتوون. خەڵکی گوندەکە دەڵێن: ئەم گوندە سێ جاران گوێزراوەتەوە تا لە شوێنی ئێستای دامەزراوە؛ بۆ وێنە پێشتر ئەم گوندە لە ڕۆژهەلاتی ئاوایی بووە و ئاسەوارەکەشی هەر ماوە. سەبارەت بە چۆنیەتی ناودێر کردنی ئەم ئاواییە بە "پاشبەرد"، خەڵکی ئاوایی دەڵێن ئەم ناوە بە پێی ناوی ئەو "قەلات"یە کە لە ڕۆژاوای دێ هەلکەوتووە.

لە ڕۆژهەلاتەوە ڕێگایەکی خاکی دەچێتەوە ئاواییەکانی گامێشان و زیندووقووڵ، ڕێگایەکی خاکی لە باکوورەوە مەهاباد ــ سەردەشت دەگرێتەوە.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی ١٣٧٧/١١/١٥ کارەبای بۆ هاتووە، لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە کە عەنباراویان بۆ داناوە، بنکەی مخابەرات، قوتابخانەی سەرەتایی "ئەخلاق" (کوڕانە ــ کچانە). مزگەوتێک کە ساڵی ١٣٧٥ی هەتاوی نۆژەن کراوەتەوە، بنکەی تەندروستی. بۆ وەرگرتنی نەوت و کەلوپەلی پێویست سەر بە شەریکەی هاوبەشیی "کاوڵانی خوارێ"ن.

خوێندکاران لە خەلیفان و مەهاباد درێژە بە خوێندن دەدەن.

کاروپیشەی خەڵکی ئەم دێیە ئاژەڵداری، وەرزێری و کرێکارییە، ئاژەڵەکانیان مەڕ و مانگان، وەرزێران گەنم، نۆک و گوڵەبەڕۆژە دەچێنن، لەم دواییانەدا هێندێک دار سێو چێندراون.

گرفتەکانی خەڵکی پاشبەرد: ناخۆشی ڕێگا، پێویستی بە لێدانی پردێک بۆ پەڕینەوە، کەمئاوی.

خەڵکی پاشبەرد پێشتر مردوویان لە گۆڕستانی شێخ هەمزە، لە ئاوایی یاڕاڵی بە خاک دەسپاردن، ئێستا لە باکووری دێ گۆڕستانیان هەیە. لە پاشبەرد کۆنەگۆڕی زۆر لێنە.

## پەڵکێ

ئەم ئاوایییە لە 47/5 کیلۆمیتری باشووری ڕۆژاوای شاری مەهاباد، بەشی خەلیفان و دێهستانی مەنگوڕی ڕۆژهەڵات و لە ناوچەی مەنگوڕایەتی هەڵکەوتووە. لە 7 ماڵ و 48 کەس پێکهاتووە، لەمانە 25 کەسیان پیاون و ٢٣ کەسیش ژنن، ژمارەی خوێندەوارانی ئەم ئاوایییە 20 کەسە کە 12 کەس پیاون و ٨ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٢٠ کەسی نەخوێندەوار ٩ کەسیان پیاون و ١١ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی 348 هێکتارە، لەمە 49 هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و 299 هێکتار پاوان و لەوەرگەی دێیە.

پەڵکێ خاوەن ٣٠ هێکتار زەوی دێم، ٥ هێکتار زەوی بەراو و ١ تراکتۆرە.

ئاوایییەکانی دەورووبەر:

باشوور: ئاوایییەکانی داغە و مەزرا

باکوور: ئاوایی کەوتەر

ڕۆژهەڵات: ئاوایییەکانی سیاقۆڵی خوارێ و حاجیمامیان

ڕۆژاوا: ئاوایی سێلمساغۆڵ

چیاکانی دەورووبەری ئاوایی:

باشوور: بەردەسووران

باکوور: کێچان و هەواری حەمەدئاغا

ڕۆژهەڵات: قەلامشکان

ڕۆژاوا: سمێڵقووچ

لە بەری ڕۆژهەڵاتی ئەم دێیە ئەشکەوتی "قەلای مشکان" هەڵکەوتووە.

کانی پەڵکێ، دووبەردووک و هەڵووچان سێ کانیاوی ئاوایین.

خانووبەرەکان بە گشتی لە قوڕ و بەرد ساز کراون و میچەکانیان لە دارە، بە هۆی ڕادەی کەمی خانووبەرەکان کۆڵانێک لە ئاوایی‌دا بەدی ناکرێ و ماڵەکان بەبێ حەوشەن.

سەبارەت بە مێژووی ئەم دێیە، خەڵکەکەی دەڵێن: دەپێش‌دا مەزرای ئاوایی سێلمساغۆڵ بووە و ئاوەدان کراوەتەوە. سەبارەت بە ناودێرکردنیشی گۆیا ئەم شوێنە داری "پەڵکی" زۆر لێبووە، دارە پەڵک جۆرێک دارە و شوولکەکانی ڕاست و درێژ و باریکن.

لە باشووری پەڵکێ ڕێگایەکی خاکی لێیە کە ئاوایی سێلمساغۆڵ دەگرێتەوە، لە باکوورەوە ڕێگایەکی خاکی ڕوو لە ئاوایی "کەوتەر" دەکا، لە ڕۆژهەڵاتەوە ڕێگایەکی خاکی دەچێتەوە سیاقۆڵی خوارێ (ئێستا کوێر بۆتەوە).

ئیمکاناتی ئاوایی: کارەبا، قوتابخانەی سەرەتایی "داود " (کوڕانە ــ کچانە). خەڵک بۆ کەلک وەرگرتن لە بنکەی تەندروستی و وەرگرتنی کەلوپەلی پێوست ڕێگای ئاوایی کەوتەر دەپێون و بۆ وەرگرتنی نەوت سەر بە شەریکەی ئاوایی"دێبۆکر"ن.

ئاوی ئەم ئاوایییە لوولەکێشیی بۆ نەکراوە، هەر بۆیە لە چاڵاو و کانیاوی "هەڵووچان" کەلک وەردەگرن.

خوێندکاران کەمتر وا هەیە لە دوای پۆلی سەرەتایی درێژە بە خوێندن بدەن.

ئاژەڵداری، وەرزێری و کرێکاری کاروپیشەی خەڵکی ئەم گوندەن. خەڵکی ئاوایی تا چەند ساڵ لەوەی پێش دەچوونە هەواری "لەندی شێخان" کەچی چەند ساڵێکە هەر لە ئاوایی خۆیان دەمێننەوە و ناچن. ئاژەڵەکانیان بریتین لە مەڕ، مانگا و بزن. وەرزێران گەنم و نۆک دەچێنن.

گرفتەکانیان: ڕێگاوبانی ناخۆش، نەبوونی پردێک لە دەم ڕووبار بۆ پەڕینەوە، نەبوونی بنکەی مخابەراتی و شووڕای ئیسلامی لادێ لە گرفتەکانی خەڵکی ئاوایین.

گۆڕستانی "چاکەچکۆڵە" لە باکووری ئاوایی هەڵکەوتووە .

## پیربەلە

ئەم ئاواییە لە ٢ کیلۆمیتری ڕۆژهەڵاتی شاری مەهاباد، بەشی ناوەندی و دێهستانی ئاختاچی ڕۆژاوا و لە ناوچەی محاڵ هەڵکەوتووە. لە ٢ ماڵ و ١١ کەس پێکهاتووە.

پانتایی ئاوایی ٢٣١٣/٥ هێکتارە، لەمە ١٣/٥ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە، ٢٣٠٠ هێکتار پاوان و لەوەرگەی دێیە.

پیربەلە خاوەن ١٠١ هێکتار زەوی دێم، ٢٤ هێکتار زەوی بەراو، ٢ هێکتار باخ و ٢ تراکتۆرە.

ئاوایییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی لاچین

باکوور: ئاوایی سەیداوا

ڕۆژهەڵات: ئاوایی حەوتەوانان

ڕۆژاوا: شاری مەهاباد

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باشوور: قەڵای سارمێ

باکوور: کێوی پشت ماڵان

ڕۆژهەڵات: بەردەقەل

"قەڵای سارمێ" لە نێوان پیربەلە و لاچین، شوێنگەی حەماسە دلێرانەکەی "سارمبەگی موکری" بە دژی ئیمپراتۆری سەفەوییەیە. لە ژێر قەڵاکەوە ئەشکەوتێک هەر بەو ناوە هەڵکەوتووە.

"کانیە جووجەی" و "کانی سەرمابردوو"، دوو کانیاوی ئەم ئاوایییەن.

"سەرما بردوو" سەیرانگا و شوێنی حەسانەوەی خەڵکی شار و ناوچەیە، شاخەوانان ڕووی تێدەکەن و سەردانی قەڵای سارمێ دەکەن و لە وێیەوە بۆ دیمەنی جوانی شاری مەهاباد دەڕوانن.

لەم دێیە زۆر کاولە کۆن وەبەر چاو دەکەوێ. خانووبەرەکان هەر لە قوڕ و بەردن و میچەکانیان دارە. خەڵک دەڵێن ئەم دێیە بە ناوی شەخسێک کراوە کە ناوی "پیروەلی" بووە و لە ڕۆژهەڵاتی دێ نێژراوە کە ئەم وشەیە دەگەڵ ڕەوتی زەمان سوواوە و بۆتە "پیروەلە و "پیربەلە".

لە باشووری ڕۆژاوا ڕێگایەکی خاکی دەچێتەوە ئاوایی لاچین، لە ڕۆژاواوە ڕێگای خاکی گەرەکی مەجبووراوای شاری مەهاباد دەگرێتەوە.

لە بواری ئیمکاناتەوە ئەم ئاوایییە تەنیا کارەبای هەیە، ئاوەکەی لە چاڵاو دابین دەبێ. بەر لەساڵی ١٣٦٢ی هەتاوی کۆنەمزگەوتێکی هەبوو کە تێکڕما. خوێندکاران لە شاری مەهاباد دەخوێنن. بۆ کەلک وەرگرتن لە بنکەی تەندروستی و دابین کردنی نەوت و کەلوپەلی پێوست هەر دێنە نێو شار.

پیربەلە بەر لە ساڵی ١٣٦٢ی هەتاوییەوە پتر لە ١٠ ماڵ بووە کە بە هۆی شەڕ و نەبوونی ئەمنییەت لە ناوچەکە، ئاوایییەکەیان چۆل کردووە و ئیتر نەگەڕاونەتەوە ماڵەکانیان و تەنیا لە مەزراکان کار دەکەن.

وەرزێری و تا ڕادەیەک ئاژەڵداری کاروپیشەی خەڵکی ئەم گوندەیە، وەرزێران گەنم، جۆ، نۆک و نیسک دەچینن و ئاژەڵەکانیان زۆرتر مەڕە و تا ڕادەیەکیش مانگا ڕادەگرن.

ئەم ئاوایییە گۆڕستانی نییە، هەر بۆیە مردووەکانی خۆیان هەر لە گۆڕستانی "سەیداوا" یان شاری مەهاباد دەنێژن.

## پیرمکائیل

پیرمکائیل لە ٥٢ کیلۆمیتری باشووری ڕۆژهەڵاتی شاری مەهاباد، بەشی خەلیفان و دێهستانی کانی بازاڕ و لە ناوچەی مەنگوڕایەتی هەڵکەوتووە. لە ١٧ ماڵ و ١١١ کەس پێکهاتووە، لەمانە ٥٤ کەس پیاون و ٥٧ کەسیش ژنن، لە ٤٣ کەسی خوێندەوار لەم دێیە ٢٨ کەس پیاون و ١٥ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٥٣ کەسی نەخوێندەوار ١٨ کەس پیاون و ٣٥ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ٤٥٠ هێکتارە، لەمە ٢٢٥ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە، ٢٢٥ هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.

ئاواییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی خاڵدەلیل

باشووری ڕۆژهەڵات: ئاوایی میرەدێ

باکوور: ئاواییەکانی عەینەمەلا و گردەبەردان

ڕۆژهەڵات: ئاواییەکانی بەیرەم و بەرەجۆ

ڕۆژئاوا: ئاواییەکانی خرەجۆ و قۆزلووجە

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باشوور: پیرمکائیل

باکوور: مەلا ڕەحیم

ڕۆژهەڵات: سووتمان

ڕۆژئاوا: گوێزیلە

کانیاوەکان بە گولبەندان، گاڕانەڕێ، مەلا ڕەحیم و کانی ماڵان ناسراون.

دوو ماڵ لەو دێیە دەچنە هەواری چەکووچ و ماڵووک کە لە ئاوایی قزڵجەی سەرێ هەڵکەوتوون.

ماڵەکان لە قوڕ و بەرد ساز کراون و میچەکانیان دارە، کۆڵانەکان خواروخێچ و ناڕێک و هەورازن. لەم ئاواییەدا تەنیا دوو ماڵ خاوەن حەوشەن، ماڵەکان بە گشتی ڕوویان لە ڕۆژهەڵاتە.

پیرمکائیل نزیک ساڵی ١٣١١ی کۆچی مانگی ئاوەدان کراوەتەوە، بە پێی بەڵگەیەک کە هێشتا لە لای بنەماڵەی "مەجیدی" ماوەتەوە کاتێک کوڕەکانی "کاک ئەحمەد قازی" (میرزا عەبدولمەجیدخان سەعدولقوزات، میرزا عەبدولەتیف) ئاوایی خاڵدەلیل و پیرمکائیل بۆ مڵکداری خۆیان لە "میرزا عەبدولئەکبەرخان کوڕی عەبدولسەمەد، تاجری بەناوبانگی تەورێزی، دەکڕن، لە وێدا ئاماژە کراوە کە پیرمکائیل تازە ئاوەدان کراوەتەوە. گۆیا ئەو ئاواییە بە ناوی شەخسێک کراوە هەر بەم ناوە کە لە باشووری ئاوایی نێژراوە.

لە باشووری دێ ڕێگایەکی خاکی و سەخڵەت ئاوایی خاڵدەلیل دەگرێتەوە، لە باکوورەوە ڕێگایەکی خاکی کە لە نێوەی ڕێوە دەبێتە دووڕییانێک و یەکیان ئاوایی "عەینەمەلا" و ئەوی دیکەیان ئاوایی "گردەبەردان" دەگرێتەوە، لە ڕۆژهەڵاتیش ڕێگایەکەی خاکی دەچێتەوە ئاواییەکانی میرەدێ و بەرەجۆ.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی ١٣٧٧/٢/٥ کارەبای بۆ هاتووە، سیمکارتی مخابەراتی دێهات، قوتابخانەی سەرەتایی بە ناوی"عروج" (کوڕانە ــ کچانە) کە بیناکەی حازربەدەستە، ئاکابیری، مزگەوت کە ساڵی ١٣٨٤ی هەتاوی ساز کراوە. بۆ کاروباری بنکەی تەندروستی سەر بە ئاوایی "گردەبەردان"ن، نەوت و کەلوپەلی پێویستیش لە شەریکەی ئاوایی "کیتکە" وەردەگرن. لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە بۆ نەکراوە هەر بۆیە لە کانیاوی ماڵان کەلک وەردەگرن.

خوێندکاران کەمتر دەتوانن درێژە بە خوێندن بدەن، تاقمێک لە خوێندکاران خەلیفان و مەهاباد وەک دوو شوێنی درێژەدان بە خوێندن هەڵدەبژێرن.

وەرزێری، ئاژەڵداری و کرێکاری کاروپیشەی خەڵکی ئاواییین، هەروەها ماڵێک باخدارە و ماڵێکی دیکە مێشدار، وەرزێران گەنم ، جۆ و نۆک دەچێنن و ئاژەڵەکان مەڕ، مانگا و بزنن، بەرهەمی باخی ئەم دێیە سێوە.

گرفتەکانی ئاوایی: ڕێگای خاکی و ناخۆش، پێویستی بە ڕایەڵی ئاو، پێویستی بە لێدانی پرد و نەبوونی بنکەی تەندروستیی سەربەخۆ لە گرفتەکانی خەڵکی پیرمکائیل بە ئەژمار دێن.

گۆڕستانی ئاوایی لە بەشی باشوور هەڵکەوتووە.

# ترشەکان

ترشەکان لە ١٧ کیلۆمیتری باکووری ڕۆژهەڵاتی شاری مەهاباد، بەشی ناوەندی و دێهستانی موکریانی ڕۆژهەڵات و لە ناوچەی شارۆێران هەڵکەوتووە.
لە ٨٨ ماڵ و ٤٠٤ کەس پێکهاتووە، لەمانە ٢٠٠ کەسیان پیاون و ٢٠٤ کەسیش ژنن، لە ٢٥٨ کەسی خوێندەوار ١٣٩ کەسیان پیاون و ١١٩ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٩٧ کەسی نەخوێندەوار ٣٦ کەسیان پیاون و ٦١ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ٣٤٧٠ هێکتارە، لەمە ٤٧٠ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە، ٣٠٠٠ هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.

ترشەکان خاوەن ٥٢٠ هێکتار زەوی دێم، ٨٦ هێکتار زەوی بەراو، ١٨ هێکتار باخ، ١٢ تراکتۆر و ٥ لاوێردەیە.

ئاواییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی گۆکتەپە

باکوور: ئاوایی گردەگرۆێ

ڕۆژهەڵات: ئاواییەکانی بەردەڕەشان، بادام و حەوڵاباد

ڕۆژاوا: ئاوایی حاجیخۆش

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باکوور: کێوی سەوزەپۆش

ڕۆژهەڵات: کێوی کەرێزەمەروان

ڕۆژاوا: تەپکەی کانی سپی

کانیاوەکان بریتین لە: کەرێزە، خڕێ گەزان و کانی سپی.

زۆربەی خانووبەرەکان لە بلوک و خشتن، قوڕ و بەرد دەکار نەکراوە، میچەکان لە دار و ئاسنن و ڕوویان لە هەر چوارلایانە. ماڵەکان حەوشە و دەرگایان هەیە و کۆڵانەکان نارێکن. مزگەوت لە خوارووی ماڵانە. هۆی ناودێرکردنی ئەم دێیە بە "ترشەکان"، خەڵکی ئاوایی دەڵێن: لە سەرووی ماڵان کانیاوێکی لێیە کە دەکەوێتە بەری باکوور و چونکە ئاوەکەی تفت و سوێرە لە کۆنەوە پێیان گوتوە "ترشەکانی"، هەر لەبەر ئەوە ناوی ئەو ئاواییەشیان ناوە "ترشەکان". لە ترشەکان چەند دارەبوورێیەکەی لێیە کە زۆر قەدیمین.

کەمەربەندیی میاندواو ـ مەهاباد بۆ ورمێ، بەم دێیەدا تێپەڕ دەبێ. لە ڕۆژاوا ڕێگای قیلەتاوی کێچاوا ـ گابازەڵە هەیە.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی ١٣٥٧/١٠/١٩ کارەبای بۆ چووە. لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە کە عەنباراویان بۆ داناوە و ئاوەکەی لە چاڵاو دابین دەبێ، تەلەیفوونی ماڵ بە ماڵ، سیمکارتی مخابەراتی دێهات، باخچەی ساوایان، قوتابخانەی سەرەتایی "نەجم" (کوڕانە ـ کچانە)، دوو مزگەوت کە یەکیان کۆنەمزگەوتە و لە قوڕ و بەرد ساز کراوە و ئێستا کەڵکی لێوەرناگیرێ، ئەوی دیکەیان مزگەوتی جامیع، ساڵی ١٣٧٤ی هەتاوی لە خشت، چیمەنتۆ و ئاسن ساز کراوە، نانەوەخانە، ساردخانە، جووجەخانە، باسکۆڵ، ناوەندی کۆکردنەوەی شیری موکریان، کارخانەی پودری باریت (کە ئەم شەشانەی دوایی تایبەت بە کەسانێکن)، پۆمپی بێنزین. هەروەها "ترشەکان" خاوەن دێهیاری، شوورای ئیسلامی و شوورای چارەسەری کێشەیە. بۆ بنکەی تەندروستی سەر بە ئاوایی "حاجی خۆش"ن. نەوت و کەلوپەلی پێویست لە شەریکەی گۆکتەپە وەردەگرن. لە نزیک ئەم ئاواییە شەهرەکێکی پیشەسازی بە پانتایی ٣٢/١٧٠٤ هێکتار ساز کراوە

قوتابیانی ئەم دێیە بۆ درێژەدان بە خوێندن ڕێگای ئاوایی گابازەڵە و شوێنەکانی دیکە کە قوتابخانەی ناوەندی و دواناوەندی لێیە دەگرنە بەر و لەو بارەوە هیچ چەشنە جیاوازییەک لە نیوان کوڕان و کچاندا نییە.

وەرزێری، ئاژەڵداری، باخداری، کرێکاری و هێندێک پیشەی دیکە وەکوو دووکانداری و مکانیکی و... کاروپیشەی خەڵکی ئەم گوندەیە. وەرزێران گەنم، جۆ، نۆک، گوڵەبەڕۆژە و کۆلزا دەچێنن، ئاژەڵەکانیشیان بریتین لە: مەڕ، بزن، مانگا و گامێش. بەرهەمی باخەکانی ترشەکان سێوە.

گرفتەکانی خەڵکی ئاوایی: قوتابخانەکەی بچووکە و حەوشی نییە، ناخۆش بوون و نارێکبوونی کۆڵانەکانی ئاوایی، نەبوونی بنکەی تەندروستی سەربەخۆ و مەترسی جادەی سەرەکی کە بە نێو ئاواییدا تێپەڕ دەبێ.

گۆڕستانەکەی ئاوایی لە بەری باشوور هەڵکەوتووە.

## تووتاخاج (توتاغاج)

تووتاخاج لە ١٥ کیلۆمیتری باکووری ڕۆژاوای شاری مەهاباد، بەشی ناوەندی و دێهستانی موکریانی ڕۆژاوا و لە ناوچەی شارویران هەڵکەوتووە. لە ٣٨ ماڵ و ٢٣٧ کەس پێکهاتووە، لەمانە ١٢٢ کەسیان پیاون و ١١٥ کەسیش ژنن، ژمارەی خوێندەوارانی ئەم ئاواییە ١٣٨ کەسە کە ٨٢ کەسیان پیاون و ٥٦ کەسیش ژنن، لە ٧٨ کەسی نەخوێندەوار ٢٩ کەسیان پیاون و ٤٩ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ٩٦٠ هێکتارە، لەمە ٥٥٦ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و ٤٠٤ هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.

تووتاخاج خاوەن ٢٦٠ هێکتار زەوی دێم، ١٥ هێکتار زەوی بەراو، ٣٠ هێکتار باخ، ١٧ تراکتۆر و ٧ لاوێردەیە.

ئاوایی‌یەکانی دەورووبەر:

باشووری ڕۆژاوا: ئاوایی ئاڵبلاغ

باکوور: ئاوایی کۆزەکەرێز

ڕۆژهەڵات: ئاوایی دریاز

ڕۆژاوا: ئاوایی چۆمەڵان و بەشێک لە ئاوایی ئاڵبلاغ

چیاکانی دەورووبەری ئاوایی:

باشوور: شێخ مراد

باشووری ڕۆژاوا: جیقناوێ

باکوور: ئۆزنداغ

ڕۆژهەڵات: شاخەسوور

ڕۆژاوا: ئەسحابان

هەروەها کانیاوەکانی ئەو ئاوایی‌یە بە شیخ مراد و سەرچاوەی تۆتاغاج ناودێر کراون.

ئەشکەوتی جیقناوێ هەیە کە لە باشووری ڕۆژاوایە و ئەشکەوتی شێخ مراد لە باشووری دێ هەڵکەوتووە.

لە ساز کردنی خانووبەرەکانی ئاوایی‌دا خشت، بلووک و چیمەنتۆ دەکار کراوە، بەدەگمەن خانووی لە قوڕ و بەردیش هەر ماوە. جگە لە چەند ماڵێک کە بۆ میچەکەی ئاسنیان دەکار کردووە، میچی زۆربەی ماڵەکان هەر لە دارە. خەڵکی ئاوایی لە سەر ئەو باوەڕەن کە بەر لە ئێستا لەم ئاوایی‌یە ماڵە شێخێکی لێ بووە کە دەگەڵ هاتنی حرووسان کۆچیان کردووە و حرووسەکان سەیدێکیان لەم ئاوایی‌یە کوشتووە کە لە لای شاخی ئەسحابان نێژراوە و کوشتاری دیکەشیان کردووە و لە تۆتاخاج گۆڕی بە کۆمەڵی لێیە.

تووتاخاج وشەیەکی تورکییە و بە مانای دارەتوویە، هەر لەم ئاوایی‌یە پۆلێکی دارەتووی گەورە و لە مێژینە لێیە کە ڕەنگە ناوی ئاوایی هەر بە بۆنەی ئەم داراتوویانە بووبێ. خەڵکەکە دەڵێن گۆیا ئەو دارانە بە دەست ئەم شێخانە چەقاندراون. جێگەی ئاماژەیە کە لەم ئاوایی‌یە حەوزێکی لەمێژینە و هێندێک کۆنەگۆڕیشی لێیە.

هەروەها خەڵکەکە لەوەش دەدوێن کە بەر لە ئێستا لە باشووری تووتاخاج ئاوایی‌یەک هەبووە بە ناوی "شێخ مراد" کە ئاسەوار و بناغەی خانووبەرەکانی هەر ماون. ئەم شێخ مرادە لە ڕەچەڵەکی ئەم شێخانە بووە کە لە سەرەوە باسمان کردن.

لە بەری ڕۆژهەڵاتی دێ، ڕێگایەکی ئامادە بۆ قیلەتاو دەچێتەوە سەر جادەی مەهاباد ــ ورمێ و باریکەڕێیەک بەرەو باشوور دەچێ و ئاوایی دریاز دەگرێتەوە.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی ١٣/ ١٣٦٣/٩ کارەبای بۆ چووە، لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە کە دوو عەنباراویان بۆ داناوە و ئاوەکەی لە کەرێزە دابین دەبێ، سیمکارتی مخابەراتی دێهات، قوتابخانەی سەرەتایی بە ناوی "تەبلیغ" (کوڕانە ــ کچانە)، مزگەوتی محەممەدڕەسوڵڵا (د.خ) کە ساڵی ١٣٧٨ی هەتاوی نۆژەن کراوەتەوە، هەروەها ئەم دێیە خاوەن شووڕای ئیسلامییە. بۆ بنکەی تەندروستی سەر بە ئاوایی "دریاز"ن، نەوت و کەلوپەلی پێویست لە شەریکەی "پشتەپ"ی شاری مەهاباد وەردەگرن.

خوێندکاران بۆ درێژەپێدانی خوێندن دەچنە ئاوایی‌یەکانی دریاز و قووم‌قەڵا و شاری مەهاباد.

کاروپیشەی خەڵکی تووتاخاج وەرزێری، ئاژەڵداری و تا ڕادەیەک باخداری و کرێکارییە. وەرزێران گەنم، جۆ، نۆک و نیسک دەچێنن و ئاژەڵەکانیان بریتین لە: مەڕ، بزن و مانگا. بەرهەمی باخەکانی ئەم دێیە سێوە.

گرفتەکانی ئەم ئاوایی‌یە: نەبوونی بنکەی تەندروستی سەربەخۆ. خەڵکی ئاوایی مردووەکانیان لە باشووری دێ دەنێژن، جیا لەم گۆڕستانە کۆنەگۆڕستانێک لە بەری باشووری ئەم ئاوایی‌یە بە ناوی شێخ مراد.

## تەنگباڵەکە

ئەم ئاوایییە لە ٣٥ کیلۆمیتری باکووری ڕۆژهەڵاتی شاری مەهاباد، بەشی ناوەندی و دێهستانی موکریانی ڕۆژهەڵات و لە ناوچەی محاڵ هەڵکەتووە.
لە ٣٥ ماڵ و ١٦٣ کەس پێکهاتووە، لەمانە ٨٥ کەسیان پیاون و ٧٨ کەسیش ژنن، لە ٨٦ کەسی خوێندەوار ٥٥ کەسیان پیاون و ٣١ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٦١ کەسی نەخوێندەوار ٢٢ کەسیان پیاون و ٣٩ کەسیش ژنن.
پانتایی ئاوایی ٢٦٠٠ هێکتارە، لەمە ٥٧٦ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و ٢٠٢٤ هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.

ئاوایییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی قوڵقوڵە
باکوور: ئاوایییەکانی قۆپیباباڵی و بەردەڕەشان
ڕۆژهەڵات: ئاوایی گردەڕەش
ڕۆژئاوا: ئاوایی بادام

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باشوور: کێوی قزڵداغ
ڕۆژهەڵات: بەردەزەرد
ڕۆژئاوا: بەشێک لە قزڵداغ

دوو کانیاوی دێیەکە "بەردەزەرد" و "کانی ماڵان"یان ناوە.
زۆربەی خانووبەرەکان لە قوڕ و بەرد ساز کراون و میچەکانیان لە دارە، چەند خانوویەک و مزگەوتی ئاوایی لە خشت، چیمەنتۆن و میچیان لە ئاسنە. خانووبەرەکان بەرەو هەر چوارلا ساز کراون، گشت ماڵەکان حەوشەی گەورەیان هەیە و زۆربەیان دەرگایان تێگیراوە. ئەم گوندە چەند کۆڵانێکی ناڕێکی هەیە و لە ناوەندی دێ چەند خانوویەکی کاولبوو وەبەر چاو دەکەوێ.
لە بەری باکووری گوندەوە ڕێگایەکی قیلەتاو هەیە کە دەچێتەوە سەر جادەی مەهاباد ـ میاندواو، لە ڕۆژهەڵاتەوە ڕێگایەکی خاکی، ئاوایی قوڵقوڵە دەگرێتەوە، لە ڕۆژئاوا ڕێگای خاکی دەچێتەوە ئاوایی بادام.
ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی ١٣٥٨/١٢/١٥ کارەبای بۆ هاتووە، لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە کە لە ئاوایی قوڵقوڵەوە سەرچاوە دەگرێ، تەلەیفوونی ماڵبەماڵ، سیمکارتی مخابەراتی دێهات، قوتابخانەی سەرەتایی "تەوەکۆل" (کوڕانە ـ کچانە)، ئاکابیری، مزگەوتێک بە ناوی حەزرەتی عومەر کە ساڵی ١٣٨٢ی هەتاوی بە خشت، چیمەنتۆ و ئاسن نۆژەن کراوەتەوە. بۆ کاری بنکەی تەندروستی سەر بە ئاوایی "قوڵقوڵە"ن، نەوت و کەلوپەلی پێویست لە شەریکەی ئاوایی ئازاد وەردەگرن.
قوتابیانی ئەم دێیە بۆ درێژەدان بە خوێندن دەچنە شاری مەهاباد و لەم بارەوەدا جیاوازییەک لە نێوان کوڕان و کچاندا نییە.
کاروپیشەی خەڵکی ئاوایی وەرزێری، ئاژەڵداری و کرێکارییە. وەرزێران دانەوێڵەکانی وەکوو گەنم و جۆ دەچێنن و ئاژەڵەکانیان لە مەڕ، بزن و مانگا پێکهاتووە.
گرفتەکانی خەڵکی تەنگ باڵەکە: کەمئاوی، نەبوونی بنکەی تەندروستی سەربەخۆ، نەبوونی بینایەک بۆ قوتابخانە (لە ماڵاندا وانە دەگوترێتەوە).
کۆنەگۆڕستانی "قەبری بابۆلان" لە باشووری دێیە، گۆڕستانە نوێیەکەی لە بەری ڕۆژهەڵاتە.

## تیکانلوجە

تیکانلوجە لە 12 کیلۆمیتری باکووری شاری مەهاباد، بەشی ناوەندی و دێهستانی ئاختاچی ڕۆژاوا و لە ناوچەی محاڵ هەڵکەوتووە. لە ٣٧ ماڵ و ١٨٨ کەس پێکهاتووە، لەمانە ١٠٢ کەس پیاون و ٨٦ کەسیش ژنن، ژمارەی خوێندەوارانی ئەم ئاوایییە ١٢١ کەسە کە ٧٥ کەس پیاون و ٤٦ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٥٥ کەسی نەخوێندەوار ٢٣ کەس پیاون و ٣٢ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی 1500 هێکتارە، لەمە 175/5 هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و 1324/5 هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.

تیکانلوجە خاوەن ١٩٤ هێکتار زەوی دێم، ١١٠ هێکتار زەوی بەراو، ٤٠ هێکتار باخ، ١٣ تراکتۆر و ٢ لاوێردەیە.

ئاوایییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایییەکانی بەسری و زگدڕاو

باکوور: ئاوایی کەرێزەی ئاڵیبایز

ڕۆژهەڵات: ئاوایی خاتوونباخ

ڕۆژاوا: ئاوایییەکانی دۆستاڵی و ئیندرقاش

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باشوور: مەنجەڵشکێن و بەردەهەڵۆ

باکوور: شاخەسوور

ڕۆژهەڵات: مەرغەوڵ و شاخی برایمە

ڕۆژاوا: بەنددروو

نێوداران، سێخڕان، مێوێ، بەردەهەڵۆ، خیزماڵک، مام کەریم و دارەسنجوو کانیاوەکانی ئەم ئاوایین.

خانووبەرەکان لە قوڕ و بەرد یان خشت و بلووکن و میچەکانیان لە دارن، زۆربەی ماڵەکان بەرەو ڕۆژهەڵات و ڕۆژاوایە هەڵکەوتوون. کۆڵانە خواروخێچ و بەرتەسکەکانی ئەم ئاوایییە بەرچاون. زۆربەی ماڵەکان حەوشەیان هەیە. تیکانلوجە ناوێکی تورکییە و بە مانای شوێنی "تیکان" (جۆرێک دڕوو)، لە بەری ڕۆژهەڵات و لە داوێنی کێو و بەندەنەکان ئەم ئاوایییە گەلێک "تیکان" دێنە بەرچاو.

"تەپەی دارەتوان" کە لەم گوندە هەڵکەوتووە بە ژمارەی تۆمارکراوی 607 لە میراتی فەرهەنگی بە بەرزایی ١٥٢٣ میتر لە رووکەشی زەریاکان، دەگەڕێتەوە بۆ هەزارەی هەوەڵی پێش زایین.

لە سەرەتای شۆڕشی گەلانی ئێران بە هۆی نائەمنی ناوچەکە، چەند مانگێک ئاوایی چۆڵ کرابوو.

لە باشووری ئاوایی ڕێگایەکی خاکی هەیە بە مەودایەکی کەم کە دەچێتەوە سەر جادەی مەهاباد ــ بۆکان، لە باکوورەوە ڕێگایەکی خاکی، ئاوایییەکانی کەرێزەی ئاڵیبایز و خاتوونباخ دەگرێتەوە.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی 1357/10/19 کارەبای بۆ هاتووە، لوولەکێشی ئاوی خواردنەوە (عەنباراویان بۆ داناوە و ئاوەکەی لە کانی بەردەهەڵۆ دابین دەبێ)، تەلەیفوونی ماڵبەماڵ، سیمکارتی مخابەراتی دێهات، قوتابخانەی سەرەتایی "حەکیم" (کوڕانە ــ کچانە)، مزگەوتی"محەممەدڕەسووڵەڵا" کە ساڵی 1382ی هەتاوی نۆژەن کراوەتەوە و هەروەها تیکانلوجە خاوەن شووڕای ئیسلامییە.

بۆ کەلک وەرگرتن لە بنکەی تەندروستی سەر بە ئاوایی"ئیندرقاش"ن، نەوت و کەلوپەلی پێویست لە شەریکەی قەرەبلاغ وەردەگرن.

وەرزێری، ئاژەڵداری، کرێکاری و باخداری کاروپیشەی خەڵکی ئەو گوندەن. وەرزێران گەنم، جۆ، نیسک و نۆک دەچێنن، هەروەها ئاژەڵەکانیان بریتین لە مانگا، مەڕ و بزن. بەرهەمی باخەکانی ئەم ئاوایییە سێوە.

گرفتە سەرەتایییەکانی خەڵکی تیکانلوجە: قیلەتاو نەبوونی جادەی 50 میتری ئاوایی، نەبوونی بینایەکی شیاو بۆ قوتابخانە، دەرنەکردنی ئاوەڕۆ و نەبوونی بنکەی تەندروستی سەربەخۆ.

گۆڕستانەکەی "کێلەکۆن"ی ئەم ئاوایییە لە بەری باکوور هەڵکەوتووە.

## جانداران

جانداران لە ٦٢ کیلۆمیتری باشووری ڕۆژاوای شاری مەهاباد، بەشی خەلیفان و دێهستانی مەنگوڕی ڕۆژهەڵات و لە ناوچەی گەورکایەتی هەڵکەوتووە.

لە ٣١ ماڵ و ٢٢٢ کەس پێکهاتووە، لەمانە ١٢٦ کەسیان پیاون و ٩٦ کەسیش ژنن، لە ١٢٣ کەسی خوێندەوار ٨٨ کەسیان پیاون و ٣٥ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٨٠ کەسی نەخوێندەوار ٢٥ کەسیان پیاون و ٥٥ کەسیش ژنن.ی

پانتایی ئاوایی ٣٣٤٣/٢٤ هێکتارە، لەمە ١٧٠/٩٣ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و ٣١٧٢/٣١ هێکتار پاوان و لەوەرگەی دێیە.

جانداران خاوەن ١٢ هێکتار زەوی دێم، ٨٩/١ هێکتار زەوی بەراو، ١٣/٥٧ هێکتار باخ و ١ تراکتۆرە.

بەرزایی ئاوایی ١٧٨٥ میتر لە ڕووکەشی زەریاکانە.

ئاوایییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی دۆڵەتووێ (سەردەشت)

باکوور: ئاوایی گاگەشی خوارێ

ڕۆژهەڵات: ئاوایی چۆمەڵ

ڕۆژاوا: ئاوایی گەرۆر (سەردەشت)

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باشوور: کێوی خاڵەبات

باکوور: گردەدوولک

ڕۆژهەڵات: ورتکان

ڕۆژاوا: فێرەک

لە بەری ڕۆژهەڵاتی ئەم گوندە ئەشکەوتێک هەڵکەوتووە بە ناوی "کونەگوێلار".

کانیاوەکان بە خدرئاغای، باریکێ، کانی ڕەسووی، کانی شەهیدان، دەشتەبیلێ و کانی درێژێ ناسراون.

خانووبەرەکان هەر لە قوڕ و بەردن، میچەکانیشیان لە دارە و حەوشەیان نییە. چەند کۆڵانێکی ئاوایی نارێک و بەرتەسکن.

سەبارەت بە ناوی جانداران، خەڵکی دێ دەڵێن: ڕەنگە ئەم ناوە هۆیەکەی ئەوە بێ کە پێشتر لە کوێستانەکان و دەروبەری دێ گیانداری وەکوو ورچ، گورگ، بەراز و هێندێک ئاژەڵی درندەی زۆر لێ بووبێ. جگە لەم بۆچوونە "جاندار"* بە لشکرچی ترکان (وەسمانی) مانا کراوەتەوە.

گردی برایمخانی، سێگردان و گوڵەزەردان، سێ شوێنن لە جانداران کە دێنە ڕیزی ئاسەواری مێژوویی. ڕێگای سەرەکی دێ کە هاموشۆی پێدا دەکرێ و دەچێتەوە ئاوایییەکانی دیکە و شاری مەهاباد، لە بەری باکوور گوندەکە هەڵکەوتووە.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی ١٣٧٩/٢/١ کارەباکەی هەڵکراوە، بنکەی مخابەرات، قوتابخانەی سەرەتایی "عادیات" (کوڕانە ــ کچانە)، مزگەوتی "حەزرەتی عومەری بنی خەتاب" کە ساڵی ١٣٨٤ی هەتاوی نۆژەن کراوەتەوە. خەڵکی جانداران نەوت و کەلوپەلی پێویست لە شەریکەی هاوبەشیی ئاوایی میرەسێ وەردەگرن و بۆ بنکەی تەندروستی هەر سەر بەم گوندەنە.

لوولەکێشی ئاوی خواردنەوەی نییە و خەڵکەکەی لە کانیاو بەتایبەت لە کانی "سەرچاوێ" و چاڵاو کەلک وەردەگرن.

خوێندکارانی کوڕ و کچی ئەم دێیە بە هۆی دەست نەڕۆیشتن و بێ دەرەتانی لە دوای پۆلی سەرەتایی زۆر کەم وا هەیە درێژە بە خوێندن بدەن.

ئاژەڵداری، وەرزێری، کرێکاری و تا ڕادەیەک مێشداری کاروپیشەی خەڵکی جاندارانە. وەرزێران گەنم، جۆ و نۆک دەچێنن. تازە هێندێک دارسێو لە ئاوایی چەقێندراون.

گرفتەکانی خەڵکی جانداران: ڕێگای خاکی و ناخۆش، نەبوونی پردێک بۆ پەڕینەوە لە ئاوایی، نەبوونی سیمکارتی مخابەراتی و بنکەی تەندروستی سەربەخۆ.

گۆڕستانی دێ بە "کانی شەهیدان" ناسراوە. خەڵکی سێ ئاوایی سوورخاو، جانداران و کیسەڵان زۆر جار لە "دۆڵەتووێ" مردووەکانیان بە خاک دەسپێرن.

---

* جاندار: لشکرچی ترکان........ هەنبانە بۆرینە، لاپەڕەی ١٨١ ستوونی هەوەڵ

## چوارگا

چوارگا لە 46/5 کیلۆمیتری باشووری ڕۆژهەڵاتی شاری مەهاباد، بەشی خەلیفان و دێهستانی کانی بازاڕ و لە ناوچەی مەنگوڕایەتی هەڵکەوتووە. لە ٣٣ ماڵ و ١٦٣ کەس پێکهاتووە، لەمانە ٨٣ کەس پیاون و ٨٠ کەسیش ژنن، ژمارەی خوێندەوارانی ئەم ئاواییە ٩٢ کەسە کە ٥٣ کەس پیاون و ٣٩ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٦٢ کەسی نەخوێندەوار ٢٣ کەس پیاون و ٣٩ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی 1713/982 هێکتارە، لەمە 251/325 هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و 1462/657 هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.

چوارگا خاوەن ٩٥ هێکتار زەوی دێم، ٤٠ هێکتار زەوی بەراو، ٤ هێکتار باخ، ١١ تراکتۆر و ١ لاوێردەیە.

ئاواییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی زیندووقووڵ

باکوور: ئاوایی گوێچکەدەرێ

ڕۆژهەڵات: ئاوایی ئۆزونتاش

ڕۆژئاوا: ئاوایی قۆزلوێ چووک

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باشوور: دۆڵەباخ

باکوور: شارەزوور

ڕۆژهەڵات: کەماجار

ڕۆژئاوا: قەیمەز

کانی سپیلکێ، چەوەندەران، مەلا مینە، ئەمەرەکۆس، سێوی و کەچکێ کانیاوە بەناوبانگەکانی ئەم ئاواییەن.

خانووبەرەکان چوارگا لە قوڕ و بەردن و ئێستا لە خشت و چیمەنتۆ کەلک وەردەگرن، میچی ماڵەکان لە دارە، ماڵەکان ڕوو لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا ساز کراون کە حەوشەیان نییە، هێندێک لە خانووبەرەکان لە شوێنێکی هەوراز ساز کراون و کۆڵانەکانی ئاوایی باریکەڵانە و بەرتەسکن.

تەپە و گۆڕستانی "چوار دیوار" بە ژمارەی تۆمارکراوی 1239 لە میراتی فەرهەنگی، مێژوویەکی دەگەڕێتەوە سەردەمی ساسانییەکان.

بەساڵاچووان سەبارەت بە مێژووی مزگەوت دەڵێن: 50 -40 ساڵ لەوەی پێش تەنیا ژوورێکی بچووک بووە کە پێیان دەگوت "تەکیەی سەیدی زەنبیل" و دروێش و خەلیفەی لێبوون، پاشان ئەم ژوورەیان تێکدا و گەورەیان کردەوە و کردیانە مزگەوت، هەڵبەت جێگای ئاماژەیە ساڵی 1363ی هەتاوی بە هۆی شەڕ و نائەمنی ناوچەکە، مزگەوتەکە وێران کرا و پاشان بە شێوازێکی نوێ ساز کرایەوە. هەروەها سەبارەت بە مێژووی ئاوایی دەڵێن ئەم ئاواییە تاکوو ئێستا سێ جار سووتاوە، جارێکیان ڕوون نییە لە چ ساڵێکدا بووە و هەر لە کۆنەوە وایان گوێ لێبووە، جاری دووهەم سەردەمی هێرشی حرووسان بۆ سەر ناوچەکە و جاری سێهەمیش ساڵی 1363 بە هۆی شەڕ و پێکدادانی ئەو سەردەمی.

لە بەری باکوورەوە ڕێگایەکی قیلەتاو کە تەنیا ڕێگا و سەرەکیترین ڕێگای دێیە، دەچێتەوە سەر جادەی مەهاباد ـ سەردەشت.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی 1376/05/19 کارەبای بۆ چووە. لوولەکێشی ئاوی خواردنەوە (عەنباراویان بۆ داناوە کە لە کانی چەوەندەران ئاوەکەی دابین دەبێ)، قوتابخانەی سەرەتایی"حەقیقەت" (کوڕانە ـ کچانە)، بنکەی مخابراتی، مزگەوت، هەروەها شووڕای ئیسلامیی هەیە. بۆ کەلک وەرگرتن لە بنکەی تەندروستی سەر بە ئاوایی "گوێچکەدەرێ"ن و نەوت و کەلوپەلی پێویستیان لە شەریکەی هاوبەشیی ئاوایی کیتکە دابین دەبێ. لەم ساڵانەدا پردێک لە سەر ڕووباری ئاوایی کە بە ڕووباری "سوێناس" ناسراوە هەڵبەستراوە کە ترومبیلیشی بە سەردا دەڕوا.

هێندێک لە قوتابیانی کچ و کوڕ دوای تێپەڕکردنی قۆناغی سەرەتایی ڕەوانەی ئاوایی خەلیفان و شاری مەهاباد دەبن.

وەرزێری، ئاژەڵداری و کرێکاری کاروپیشەی خەڵکی ئەو گوندەن، وەرزێران گەنم، جۆ و نۆک دەچێنن، خەڵکەکە مانگا ڕادەگرن و تەنیا ماڵێک مەڕ و بزنیان هەیە. چوارگا دوو باخی ساوای هەیە کە ڕیشەی دارسێو و بادامی لێ چەقێندراوە.

گرفتەکانی خەڵکی ئاوایی: کەمئاوی و نەبوونی بنکەی تەندروستی سەربەخۆ.

گۆڕەستانی ئاوایی لە بەری ڕۆژئاوا هەڵکەوتووە.

# چۆمەڵ

چۆمەڵ لە ٥٧ کیلۆمیتری باشووری ڕۆژاوای شاری مەهاباد، بەشی خەلیفان و دێهستانی مەنگوڕی ڕۆژهەڵات و لە ناوچەی گەورکایەتی هەڵکەوتووە.
لە ٨ ماڵ و ٧٢ کەس پێکهاتووە، لەمانە ٣٨ کەسیان پیاون و ٣٤ کەسیش ژنن، لە ٤٠ کەسی خوێندەوار ٢٨ کەسیان پیاون و ١٢ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٣٠ کەسی نەخوێندەوار ٩ کەسیان پیاون و ٢١ کەسیش ژنن.
پانتایی ئاوایی ١٧٧٩ هێکتارە، لەمە ٤٩/٣٤ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و ١٧٢٩/٦٦ هێکتاری پاوان و لەوەڕگەی دێیە.
چۆمەڵ خاوەن ٧٦ هێکتار زەوی دێم، ١٩ هێکتار زەوی بەراو، ٥/٢٣ هێکتار باخ و ٢ تراکتۆرە.

ئاوایی‌یەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی‌یەکانی چوالان و کانی سپان
باکوور: ئاوایی‌یەکانی سوورخاو و کوران
ڕۆژهەڵات: ئاوایی کەڵەکاوێ و بەشێک لە ئاوایی کوران
ڕۆژاوا: ئاوایی جانداران

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باشوور: کێوەکانی زیندووێ گامۆڵ، وەستاباس و شێخ غەزای
باکوور: نێرخاسان
ڕوژهەڵات: کانی ساردان و قەبری پوورە زێنێ
ڕۆژاوا: قۆچە کاکەڕەش

دۆڵی ئەشکەوتانی ئەم دێیە پتر لە دە ئەشکەوتی تێدایە.
سێ کانیاوی بەناوبانگی ئەم ئاواییە بریتین لە: چۆمەڵ، مەرکلوو، گۆلان و ئەشکەوتان.
گشت ماڵەکان لە قوڕ و بەردن و میچەکانیان لە دارە و حەوشەیان نییە. ڕووبارەکەی نێو دێ ماڵەکان دەکاتە سێ بەش. کۆڵانەکانی ئاوایی ناڕێکن.
چۆمەڵ بە هۆی شەڕ و نەبوونی ئەمنییەت، ماوەیەک چۆل بووە کەچی دوایە حاجی ڕەسوو، حاجی سمایل و حاجی خێلە، سەرلەنوێ ئاوەدانیان کردۆتەوە. قەڵایەکی مێژوویی "جالالان" لەم ئاواییە هەڵکەوتووە.
چۆمەڵ پێنج ڕووبار بەم ناوانە لەخۆ دەگرێ: قورخێ، شێخ غەزای، گۆلان، مەرکلوو، خالاجی کە لە ئاکامدا یەک دەگرنەوە و دەبنە چۆمێک و خەڵک دەڵێن ناوی دێ هەر لە بوونی ئەم چۆمانەیە.
ئەم دێیە یەک ڕێگای هەیە بەرەو ڕۆژاوا دەچێ و دەچێتەوە سەر ڕێگای سەرەکی هاموشۆی ئاوایی‌یەکان.
ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی ١٣٧٩/٧/٧ کارەباکەی هەڵکراوە، بنکەی مخابەرات، قوتابخانەی سەرەتایی "یونس" (کورانە ــ کچانە)، مزگەوتێک بە ناوی "حەزرەتی عومەر بنی خەتاب" کە ساڵی ١٣٨١ی هەتاوی نۆژەن کراوەتەوە، قوتابخانەی ئاوایی هەر لە ژێرخانی مزگەوتی ئاواییدایە.
خوێندکارانی کوڕ و کچ بۆ درێژەدان بە خوێندن دەچنە خەلیفان و مەهاباد. بۆ بنکەی تەندروستی و وەرگرتنی نەوت و کەلوپەلی پێویست سەر بە ئاوایی "میرەسێ"ن. ئەم دێیە لوولەکێشی ئاوی خواردنەوەی نییە و لە کانیاوەکان کەلک وەردەگرن بەتایبەت کانی پالاوێ.
سەرەکی‌ترین کاروپیشەی خەڵکی چۆمەڵ ئاژەڵدارییە و تا ڕادەیەک وەرزێری. ئاژەڵەکانیان زیاتر مانگان و تا ڕادەیەکیش مەڕ ڕادەگرن. وەرزێران گەنم، نۆک و جۆ دەچێنن و هێندێک لە خەڵکەکە ڕەزیان هەیە.
گرفتەکانی خەڵکی چۆمەڵ: ڕێگای خاکی و ناخۆش، نەبوونی پردێک بۆ پەڕینەوە، نەبوونی بنکەی تەندروستی سەربەخۆ، نەبوونی شووڕای ئیسلامی و نەبوونی بینا بۆ قوتابخانە.
گۆڕستانی "کانی لاجان"، منداڵی لێدەنێژن و گۆڕستانی "ئەسحابەی نێومالان"، پێشتر مردوویان لێ دەناشت، مردووەکان ئێستا لە گۆڕستانی "جانداران" دەنێژن.

## چۆمەڵان

چۆمەڵان لە ١٥ کیلۆمیتری باکووری ڕۆژاوای شاری مەهاباد، بەشی ناوەندی و دێهستانی موکریانی ڕۆژاوا و لە ناوچەی شارویران هەڵکەوتووە. لە ٣١ ماڵ و ١٥٤ کەس پێکهاتووە، لەمانە ٨٢ کەسیان پیاون و ٧٢ کەسیش ژنن، لە ٨٨ کەسی خوێندەوار ٥٦ کەسیان پیاون و ٣٢ کەسیش ژنن، لە ٤٥ کەسی نەخوێندەوار ١٤ کەسیان پیاون و ٣١ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ٢٦٠٠ هێکتارە، لەمە ١٥٨ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە، ٢٤٤٢ هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.

ئاوایییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی سێلەکە

باکوور: ئاوایی گۆلێ

ڕۆژهەڵات: ئاوایی ئاڵبلاغ

ڕۆژاوا: ئاوایی مەحمەشەی سەرێ (سەر بە شاری نەغەدە)

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باشوور: مام قوجاغ

باکوور: یەدیللەر

ڕۆژهەڵات: شارۆستەم و قوڕپاسانە

ڕۆژاوا: نەردەکان

دوو ئەشکەوت لە بەری باشوور بە ناوی "جۆشە" و لە باکوور "بەڵمان" هەڵکەوتوون.

کانیاوەکانی دێ: کانی سپی، هوومان، کانی فەقێیان و کانی مام قوجاغ.

زۆربەی خانووبەرەکان لە قوڕ و بەرد ساز کراون، خشت و بلووک تا ڕادەیەکی کەم دەکار کراوە و میچەکانیان بە دار داپۆشراون، ماڵەکان زۆربەیان حەوشەیان هەیە و بەرەو ڕووی باکوورن. ئاوایی چەند کۆڵانێکی ناڕێکە و بەشێک لە ماڵەکان لە لێژایی ساز کراون.

"مەحوەتەی هووشان" وەک شوێنەوارێکی ئەم گوندە بە ژمارەی تۆمارکراوی ١٦٦٢٢ی میراتی فەرهەنگی، بە بەرزایی ١٩٤٥ میتر لە ڕووکەشی زەریاکان، دەگەڕێتەوە سەر هەزارەی هەوەڵی بەر لە زایین.

وشەی "چۆمەڵان" پێکهاتووە لە "چۆم" بە مانای ڕووبار و پاشگری "لان" کە بە مانای شوێنێکە کە چۆمی لێیە. ناودێر کردنی ئەم ئاوایییە بۆ چۆمەڵان لە خۆڕا نەبووە، چونکە لە ناوەندی ئەم دێیە حەوزێکی گەورە ساز کراوە کە ئاوی چۆمەکانی دەوروبەر هەمووی لەوێدا کۆ دەبنەوە.

لە باشوور ڕێگایەکی خاکی، ئاوایی سێلەکە دەگرێتەوە، لە باکوورەوە ڕێگایەکی خاکی دەچێتەوە ئاوایی گۆلێ و لە ڕۆژهەڵاتەوە ڕێگایەکی دیکەی خاکی بەرەو ئاوایی ئاڵبلاغ دەڕوا.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی ١٣٧٥/٧/٨ کارەبای بۆ هاتووە، لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە کە عەنباراویان بۆ داناوە و لە سەرچاوەی "ماڵان" دابین دەبێ، تەلەیفوونی ماڵ بە ماڵ، بنکەی تەندروستی، قوتابخانەی سەرەتایی بە ناوی "بەرادەرانی جەلیلنیژاد" (کوڕانە ـ کچانە)، مزگەوتێک کە ساڵی ١٣٨٦ی هەتاوی نۆژەن کراوەتەوە. ئەم دێیە خاوەن شووڕای ئیسلامییە. نەوت و کەلوپەلی پێویستیان لە شەریکەی هاوبەشیی ئاوایی ئاڵبلاغ وەردەگرن.

بۆ درێژەدان بە خوێندن جیاوازی لە نێوان کوڕان و کچاندا نییە و شوێنی درێژەپێدانی خوێندنیان قوتابخانەکانی کۆزەکەرێز، گۆکتەپە و مەهابادە.

وەرزێڕی، ئاژەڵداری، باخداری و کرێکاری کارووپیشەی خەڵکی چۆمەڵانە، وەرزێران گەنم، جۆ، نۆک و نیسک دەچێنن و زۆرتری ئاژەڵەکان مەڕن و کەمتر مانگا و بزن ڕادەگرن. بەرهەمی باخەکانیشیان سێو، گوێز، بادام و ترێیە.

کەمایەسییەکانی ئەم گوندە: قیلەتاو نەبوونی ڕێگاکەی گوند، خراپ بوونی لوولەکێشی ئاوی خواردنەوەیان، نەبوونی هێڵی ڕاگواستن

چۆمەڵان سێ گۆڕستانی لێیە، یەکیان لە ڕۆژاوا و لە قەراغ دێیە کە "بەرماڵ سپی" پێدەڵێن، گۆڕستانی "هوومان" لە باشوورە، ئێستا لە بەری چۆم لە گۆڕستانێکی دیکە مردووەکانیان دەنێژن.

وەکو ناسراوترین کەسایەتی دەتوانین ئاماژە بە کاک "خەلیل فەتاحیقازی" و "محەممەدسووڵتان فەتاحی" و بنەماڵەی "جەلیلنیژاد" بکەین کە بۆ ئاوەدان کردنەوە و پەرەگرتنی ئەم دێیە گەلێک تێکۆشاون.

## حاجی‌ئاوا

ئەم ئاوایی‌یە لە ٢٢ کیلۆمیتری باکووری شاری مەهاباد، بەشی ناوەندی و دێهستانی موکریانی ڕۆژاوا و لە ناوچەی شارویران هەڵکەوتووە. لە ٨ ماڵ و ٤٦ کەس پێکهاتووە، لەمانە ١٨ کەسیان پیاون و ٢٨ کەسیش ژنن، لە ٢٨ کەسی خوێندەوار ١٤ کەسیان پیاون و ١٤ کەسیش ژنن، هەروەها لە ١٣ کەسی نەخوێندەوار ٣ کەسیان پیاون و ١٠ کەسیش ژنن.
حاجی‌ئاوا خاوەن ٣٥ هێکتار زەوی بەراو، ٤ هێکتار باخ، ٤ تراکتۆر و ٢ لاوێردەیە.

ئاوایی‌یەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی‌یەکانی قەرەخان و قوومقەڵا

باکوور: ئاوایی لەج

ڕۆژهەڵات: ئاوایی ترشەکان و بەشێک لە ئاوایی لەج

ڕۆژئاوا: ئاوایی دارەلەک

ئەم ئاوایی‌یە دەشتاییە و کێوی نییە.
بەرد و قوڕ، خشت، بلووک، میچی دار و ئاسن کەرەسەی پێکهێنەری ماڵەکانی ئەم گوندەن، هێندێک لە ماڵەکان حەوشەیان هەیە و کۆڵانەکانی گوندەکە ڕێک نین.
لە باشووری ڕێگای خاکییەوە، ئاوایی‌یەکانی قوومقەڵا و قەرەخان هەڵکەوتووە، لە بەری باکوورەوە کە چۆمی پێدا دەڕوا لە وەرزی کەم‌ئاوی‌دا دەبێتە ڕێگایەک بۆ چوونە ئاوایی لەج، لە ڕۆژاواشەوە ڕێگایەکی خاکی دەچێتەوە ئاوایی دارەلەک.
ئیمکاناتی ئاوایی: کارەبا، لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە کە لە ئاوایی خانەگێ دابین دەبێ، تەلەیفوونی ماڵ بە ماڵ.
بۆ پێوەند بە بنکەی تەندروستییەوە و وەرگرتنی نەوت و کەلوپەلی پێویست سەر بە ئاوایی "دارەلەک"ن.
بەو هۆیەی کە حاجی‌ئاوا قوتابخانەی لێ نییە، خوێندکاران لە سەرەتاوە دەبێ بچنە ئاوایی لەج و بۆ درێژەپێدان بچنە شاری مەهاباد، زۆربەی خوێندکاران کوڕن، کچان کەمتر بۆیان هەیە درێژە بە خوێندن بدەن.
وەرزێری، ئاژەڵداری، کرێکاری و باخداری کاروپیشەی خەڵکی ئەو گوندەن، وەرزێران گەنم، جۆ و چەوەندەر دەچێنن، ئاژەڵەکانیان مەڕ، بزن و مانگان، زۆرترین بەرهەمی باخەکان سێوە.
گرفتەکانی خەڵکی حاجی‌ئاوا: نەبوونی هێڵی ڕاگواستن، ڕێگای خاکی و ناخۆش، نەبوونی پردێک لە سەر چۆمی ئاوایی، نەبوونی قوتابخانە و مزگەوت.
هەرچەند لە نزیک حاجی‌ئاواوە گۆڕستانێک هەیە، بەڵام خەڵکەکە مردووەکانیان لە گۆڕستانی "لەج"ێ دەنێژن.

## حاجیاڵیکەند

ئەم ئاوایییە لە ٣٠ کیلۆمیتری ڕۆژهەڵاتی شاری مەهاباد، بەشی ناوەندی و دێهستانی ئاختاچی ڕۆژاوا و لە ناوچەی محاڵ هەڵکەوتووە. لە ١١٠ ماڵ و ٧٦٥ کەس پێکهاتووە، لەمانە ٣٧١ کەسیان پیاون و ٣٩٤ کەسیش ژنن، ڕادەی خوێندەواران ٤٧٣ کەسە کە ٢٥١ کەسیان پیاون و ٢٢٢ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٢٠٠ کەسی نەخوێندەوار ٧٧ کەسیان پیاون ١٢٣ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ٢٢٨٣ هێکتارە، لەمە ٦٨٣ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە، ١٦٠٠ هێکتار پاوان و لەوەرگەی دێیە.

حاجیاڵیکەند خاوەن ٧٧١ هێکتار زەوی دێم، ٦٧٩ هێکتار زەوی بەراو، ١٠٧ هێکتار باخ، ٧١ تراکتۆر و ٨ لاوێردەیە.

بەرزایی ئاوایی لە ڕووکەشی زەریاکانەوە ١٧٠٠ میترە.

ئاوایییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی دەرمان

باکوور: ئاوایی ئازاد

ڕۆژهەڵات: ئاوایییەکانی خاتوونخاس و بورهان و کانی کەوتێر و قەمتەرە

ڕۆژاوا: ئاوایی کەپەکەند و بەشێک لە ئاوایی ئازاد

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باشوور: سوڵتان

باکوور: قورتوولوو

ڕۆژهەڵات: ئاڵماڵوو

ڕۆژاوا: کێوەسوور و کانی کیسەڵ

دوو ئەشکەوتی ئەم دێیە بە ناوەکانی "کونەبا" و کونەپێست" ناسراون.

ساڵانی ڕابردوو خەڵکی ئاوایی و ئاوایییەکانی دەوروبەر، پەنیر، شیرێژ و ڕۆنیان دەێنا و لە کونەپێست دایاندەنا یان دەیانئاخنێوە و کەسێکیان بە کرێ گرتبوو کە چاوەدێریان بکا، ئەم کەسە بە "کونەوان" ناسرابوو، ئەو کەسە سەرەڕای وەرگرتنی ئەو پارەیەی کە بابەتی پارێزگاری کردن وەری دەگرت لەو خواردەمەنیانەش بەشی دەکەوتێ.

کانیاوەکانی ئاوایی بە سەرچاوەی قابیان، کانی سپی، سوێرەکانی و کانی شینکە ناسراون.

کەرەسەی زوربەی خانووبەرەکان مۆرە، بەرد و قوڕن و میچەکانیان لە دارە؛ هەنووکە خشت، بلووک و بەردی سپی داتاشراو و چیمەنتۆ یان قوڕ دەکار دەکەن، میچەکانیشان بە ئاسن دادەپۆشن. هێندێک لە ماڵەکان خاوەن حەوشەن، هەروەها گشت ماڵەکان بەرەو باشوور هەڵکەوتوون.

کۆڵانەکانی ئاوایی هەوراز و لێژن و لە شانی ڕۆژهەڵاتی شاخی "قورتوولوو"وە تا شانی ڕۆژاوای ئەم کێوە خانوو ساز کراون و ماڵەکان لە داوێنی ئەم کێوە هەڵکەوتوون.

ڕوون نییە ئەم دێیە کەی ئاوەدان کراوەتەوە، کاک "بازید بایەزیدی" بەساڵاچووی ئەم دێیە، سەبارەت بە ناوی ئاوایی دەڵێ: وەکوو لە پێشینیانیشم بیستووە، ڕۆژاوای دێ شوێنێکی لێیە کە "کـــەنداڵەسوور"ی پێدەڵێن، حاجیاڵی هەمان حاجی عەلییە کە ناوی کەسێکە و زووتر ناوی ئەم ئاوایییە "کەنداڵی حاجی ئاڵی" بووە، لە پاشان بۆتە "حاجی ئاڵیکەنداڵ" و لەگەڵ ڕەوتی زەمان وشەکەش سوواوە و بۆتە"حاجیاڵیکەند".

بە بۆچوونی هێندێکی دیکە پاشگری "کەند"ی لە زمانی تورکیدا بە مانای دێیە، هەروەها دەڵێن کە کەند مانای کانی و کەن دەدا.

شوێنێک لە بەری ڕۆژهەڵاتی ئاوایی هەیە کە پێی دەڵێن "سەرقەڵا"، ئەو شوێنە ئاسەوار و لادیواری لێیە.

لە باشوورەوە ڕێگایەکی قیلەتاو بە مەودای ٤ کیلۆمیتر دەچێتە سەر جادەی مەهاباد ــ بۆکان (جادەی بورهان)، لە باکوورەوە ڕێگایەکی خاکی دەچێتەوە ئاوایی سنجاغ، لە ڕۆژاواوە ڕێگایەکی خاکی دەچێتەوە ئاوایی کەپەکەند.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی ١٣٥٧/١٠/١٩ کارەبای بۆ هاتووە، لوولەکێشی ئاوی خواردنەوە، سیمکارتی مخابەراتی دێهات، بنکەی تەندروستی، شەریکەی هاوبەشیی دابەشینی نەوت و کەلوپەلی پێوست، قوتابخانەی سەرەتایی و ناوەندی "ئەعزەم"، ئاکابیری، مزگەوتێک بە ناوی "عومەر بنی

خەتاب" کە ساڵی ١٣٨٤ی هەتاوی بە خشت، چیمەنتۆ و ئاسن نۆژەن کراوەتەوە و هەروەها خاوەن دێهیاری، شووڕای ئیسلامی و شووڕای چارەسەری کێشەکانە.

خوێندکارانی ئەم دێیە بۆ درێژەدان بە خوێندن دەچنە شاری مەهاباد.

کاروپیشەی خەڵکەکەی وەرزێری، ئاژەڵداری، باخداری و کرێکارییە. وەرزێران گەنم، جۆ، نۆک و نیسک دەچینن و ئاژەڵەکانیان مەڕ، بزن و مانگان.

بەرهەمی باخەکانیان سێو، قەیسی و بادامە.

گرفتەکانی خەڵکەکە نەبوونی مەکۆیەکی تایبەت بۆ ڕشتن و کۆکردنەوەی زبڵوزاڵ و هەروەها کەمئاوی.

گۆڕستانەکەی لە باشووری دێ هەڵکەوتووە.

پێشتر کە لەم گوندە بنکەی تەندروستی و بێهداشتی لێ نەبووە و هاتووچۆ دژوار بووە، خەڵکی ئاوایی بۆ چارەسەری نەخۆشییەکانیان دەچوونە لای ژنێک بە ناوی "سەیزادەی ئەحمەدشای" کە برین و هێندێک نەخۆشی بە گیاوگۆڵ چارەسەر دەکردن، دەنا دەچوونە لای "حاجی حەمەسوڵتان" لە ئاوایی ئیندرقاش.

"حەسەنی حەمەی" وەک بەیتبێژ و حیکایەتخوان و خۆشخوانی مەجلیسی ئاغایان لەو گوندە ژیاوە. "عەلیبەگ حەیدەری" ئاغای ئەم ئاواییە شێعری گوتوون و بەداخەوە کۆ نەکراونەوە. "عەزیزی حەمەخڕە" گۆرانیبێژ بووە و "پوورخانزاد" حەیرانبێژ بووە.

***

وردەباسێک لە سەر ئەو سەردەمی کە حرووسەکان ڕوویان لەم گوندە کردووە لە زمان کاک "بازید بایەزیدی" بەساڵاچووی ئەم دێیە:

باپیرم ئاوای بۆ گێڕامەوە: "لەم ئاواییەی حاجیاڵیکەند کابرایەک دەژیا کە سەید "خەلیل"یان پێدەکوت، خەڵکەکەی ئاوایی بەو هۆیە کە ئەو سەید بوو و پیاوێکی باش بوو زۆریان خۆش دەویست و ڕێزیان بۆی دادەنا. کاتێک کە حرووس ڕوو دەکاتە ناوچە و خەڵکەکە قەتڵوعام دەکا، سەید خەلیل ڕۆژێ دوو کەس لە خەڵکی ئاوایی دەنێرێتە سەر کێوەکەی پشت ماڵان تا کێشک بدەن و ئاگایان لە دەوروبەری خۆیان بێ و هەر لشکری حرووسان گەیشتێ بە خەڵکی ئاوایی ڕابگەێنن و خۆ بگەێننە ئەشکەوتی "کونەبا" و خۆ حەشار بدەن.

ڕۆژێک کێشکچییەکان ڕادەگەیەنن حرووسان ئەوە لە ئاوایی "ئازاد"ن، خەڵک هەموو ڕوو دەکەنە کێوی قورتوولوو و لە ئەشکەتی"کونەبا"دا خۆیان حەشار دەدەن و هێندێک ژن و منداڵ و بەساڵاچووان پەنا بۆ ماڵێکی جوولەکە لە ئاوایی دەبەن. - ئەو سەردەمی حاجیاڵیکەند شەش ماڵی جوولەکەی لێ بوون - حرووسان کە گەیشتنە حاجیاڵیکەند لە دەم ڕووبار تووشی کابرایەک دەبن کە "مام ساڵە"یان پێدەکوت. مام ساڵە ژنەکەی دەگەڵ دەبێ، یەکێک لە فەرماندەکان چاو لە سەر ژنە هەڵناگرێ، مام ساڵە هێرشی دەکاتە سەری و کابرای بریندار دەکا، بەڵام هەر لەوێ مام ساڵەی دەکوژن و ژنەی دەگەڵ خۆیان دەبن. ماڵە جوولەکەکان دێنە دەرێ، حرووسەکان ئاماژە بە ڕدێنی جوولەکەکان دەکەن کە ئەمە چییە؟ دەڵێن ئێمە جوولەکەین، کاتێک دەزانن ئەوان جوولەکەن و پەنای خەڵکیان داوە، وازیان لێ دێنن و کەس ناکوژن.

## حاجیخۆش

حاجیخۆش لە ٣٠ کیلۆمیتری باکووری شاری مەهاباد، بەشی ناوەندی و دێهستانی موکریانی ڕۆژهەڵات و لە ناوچەی شارویران هەڵکەتووە. لە ١٤٤ ماڵ و ٩٠٧ کەس پێکهاتووە، لەمانە ٤٧٩ کەس پیاون و ٤٢٨ کەسیش ژنن، لە ٥٨٩ کەسی خوێندەوار ٣٥٩ کەس پیاون و ٢٣٠ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٢٢٢ کەسی نەخوێندەوار ٧٣ کەس پیاون و ١٤٩ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ٥٥٨ هێکتارە، لەمە ٤٥٢ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە، ١٠٦ هێکتار پاوان و لەوەرگەی دێیە.

حاجیخۆش خاوەن ٣٢٠ هێکتار زەوی دێم، ٧٨٠ هێکتار زەوی بەراو، ١٤٠ هێکتار باخ، ٤٤ تراکتۆر و ١٢ لاوێردەیە.

بەرزایی ئاوایی ١٢٨٥ میتر لە ڕووکەشی زەریاکانە.

ئاواییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی گۆکتەپە

باکوور: ئاوایی گردەگرۆێ

ڕۆژهەڵات: ئاواییەکانی بەردەڕەشان و ترشەکان

ڕۆژاوا: ئاواییەکانی لەج و گاپیس

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

ڕۆژهەڵات: کێوی سەوزەپۆش

حاجیخۆش زۆرتر دەشتاییە و لە باکووری ڕۆژهەڵاتی ئاوایی چەند ئەشکەوتێک هەڵکەوتووە کە بە "کلکەی ئەشکەوتان" ناسراون.

دەوروبەری گوندەکە چەند دارێکی وەکوو بادامەکێوی و گێوژ لێیە. دوو کانیاوی ئەم دێیە ناوەکانیان "قامیش" و "سەوزەپۆش"ە.

کۆنەخانووەکان بەردەوام بە خشت، چیمەنتۆ و ئاسن هەروا نۆژەن دەکرێنەوە. زۆربەی ماڵەکان خاوەن حەوشە و دەرگان. ڕێگایەکی قیلەتاو بە ناوەندی دێدا تێپەڕ دەبێ و ماڵەکان دەکەونە دوو بەری ڕێگاکەوە. کۆڵانەکانی ئەم دێیە ڕێک و ڕاستن و زیاتر شێوازی شاریان بە خۆوە گرتووە.

سەبارەت بە سەردەمی ئاوەدان بوونەوەی حاجیخۆش زانیارییەکی ئەوتۆ لە بەردەستدا نییە، بەڵام وەک خەڵک دەڵێن ئەم دێیە بە ناوی شەخسێک کراوە کە لە شاخی "سەوزەپۆش" لە بەری ڕۆژهەڵات نێژراوە و حاجی بووە و بە هۆی سروشتی جوان و ڕازاوە و خۆشی ئەم کێوە و ناوچەی دەوروبەری، هەر لە زووە "حاجیخۆشیان" پێ گوتووە.

"تەپەی قەیتەران" و گۆڕستانە مێژوویەکەی نێوان گردەگرۆێ و حاجی خۆش، هەروەها "کلکەسوور" سێ شوێنی مێژوویی ئەم گوندەن.

لە باشووری ئاوایی ڕێگایەکی خاکی دەچێتەوە ئاوایی گۆکتەپە، لە باکوورەوە ڕێگایەکی قیلەتاو ئاوایی گابازەڵە دەگرێتەوە و ڕێگایەکی دیکەی خاکی دەچێتە ئاوایی گردەگرۆێ.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی ١٣٥٧/١٢/١٥ کارەباکەی هەڵکراوە، لولەکێشیی ئاوی خواردنەوە، تەلەیفوونی ماڵ بە ماڵ، سیمکارتی مخابەراتی دێهات، پۆستبانک، بنکەی تەندروستی، شەریکەی هاوبەشیی دابەشینی نەوت و کەلوپەل، باخچەی ساوایان، قوتابخانەی سەرەتایی (کوڕانە ـــ کچانە) بە ناوی "بێعسەت"، قوتابخانەی ناوەندی کچانە بە ناوی "بونیادی ١٥ی خورداد"، مزگەوتێک کە ساڵی ١٣٧٠ی هەتاوی نۆژەن کراوەتەوە، نانەوەخانە و هەروەها ئەم دێیە خاوەن دێهیاری، شووڕای ئیسلامی و شووڕای چارەسەری کێشەکانە.

کوڕانی قوتابی ئەم دێیە بۆ خوێندن لە پۆلی ناوەندی دەچنە ئاوایی "گابازەڵە" و بۆ پۆلی دواناوەندی دەبێ بچنە شاری "مەهاباد". کچەکان تەنیا دەتوانن تا کۆتایی پۆلی ناوەندی لە ئاواییدا بخوێنن.

وەرزێری، ئاژەڵداری، باخداری و هێندێک پیشەی بەربڵاوی دیکە وەکوو دووکانداری، شۆفیری و هتد کاروپیشەی خەڵکی ئەم گوندەن.

وەرزێران گەنم، جۆ و گوڵەبەڕۆژە دەچێنن و ئاژەڵەکانیشیان مەڕ، بزن، مانگا و گامێشن. بەرهەمی باخەکان پێکهاتووە لە سێو و هڵوو.

گرفتەکانی خەڵکی ئاوایی: نەبوونی قوتابخانەی دواناوەندی، حەوشەیەک بۆ قوتابخانە، گۆڕەپانی وەرزیشی، نەبوونی هێڵی ڕاگواستن.

خەڵکی حاجیخۆش مردووەکانیان لە بەری ڕۆژهەڵاتی دێ دەنێژن. مەلا "مارف کۆکەیی" شاعیری بەناوبانگی کورد خەڵکی ئەم ئاواییە بووە.

## حاجی مامیان

ئەم ئاوایی‌یە لە ١٦ کیلۆمیتری باشووری ڕۆژاوای شاری مەهاباد، بەشی خەلیفان و دێهستانی مەنگوڕی ڕۆژهەلات و لە ناوچەی مەنگوڕایەتی هەڵکەوتووە. لە ٢١ ماڵ و ١٧٩ کەس پێکهاتووە، لەمانە ١٠٢ کەسیان پیاون و ٧٧ کەسیش ژنن، لە ١٠٤ کەسی خوێندەوار ٦٦ کەسیان پیاون و ٣٨ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٥٩ کەسی نەخوێندەوار ٢٥ کەسیان پیاون و ٣٤ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ٣٥٠٠ هێکتارە، لەمە ٣١٤ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و ٣١٨٦ هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.

حاجی مامیان خاوەن ٦٥/٥ هێکتار زەوی دێم، ١٧ هێکتار زەوی بەراو، ٣١/٩٨ هێکتار باخ و ١٢ تراکتۆرە.

ئاوایی‌یەکانی دەورووبەر:

باشوور: ئاوایی سیاقوڵی خواریّ

باکوور: ئاوایی هەمزاوا

ڕۆژهەلات: ئاوایی بەیتاس

ڕۆژاوا: ئاوایی‌یەکانی کەوتەر و پەڵکێ

چیاکانی دەورووبەری ئاوایی:

باشوور: کێوی خورینج

باکوور: کێوەکانی شێرە و کەرێزە

ڕۆژهەلات: کێوی گوڵبەهار

ڕۆژاوا: کێوی لۆدروان

کانی سێو، لووسێ، حەوزی پیاوان، کەرێزە و کانی شێرە چەند کانیاوی ئەم دێیەن.

زۆربەی خانووبەرەکانی ئەم گوندە لە قوڕ و بەرد و میچەکانیان لە دارە، هەنووکە بۆ چێکردنی خانووەکان لە خشت و چیمەنتۆ کەلک وەردەگرن، زۆربەی ماڵەکان حەوشەیان نییە و کۆڵانەکان نارێکن و هێندێکیان هەورازن، بەشێکی زۆر لە ماڵەکان ڕوویان لە باشوورە.

سەبارەت بە مێژووی ئاوایی دەبێ بڵێین تەپەی حاجی مامیان بە بەرزایی ١٤٢٩ میتر لە ڕووکەشی زەریاکان بە ژمارەی تۆمارکراوی ١٦٦٣٥ لە میراتی فەرهەنگی، دەگەڕێتەوە سەردەمی کالکۆلێکتیک ـ ساسانی.

وەکو خەڵکەکە باس دەکەن سروشتی جوان و ڕازاوەی ئەم دێیە، تا بەر لە ساڵی ١٣٢٤ی هەتاوی، ببوو بە پێگەی حەسانەوەی میری نەورۆز و هاوڕێیانی. (میری نەورۆزی، وەکوو ڕەسمێکی بەرەبەری ساڵی تازە لە شاری مەهاباد بەڕێوە دەچوو).

لە ڕۆژهەلاتەوە، ڕێگایەکی ٢/٥ کیلۆمیتری قیلەتاو دەچێتەوە سەر جادەی قیلەتاوی سیاقوڵی خواریّ.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی ١٣٧٥/١٠/٦ کارەباکەی هەڵکراوە، لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە کە ئاوەکەی لە "حەوزی پیاوان" دابین دەبێ، سیمکارتی مخابەراتی دێهات، قوتابخانەی سەرەتایی"مسوڵمان" (کوڕانە ــ کچانە)، مزگەوتێک کە ساڵی ١٣٧٥ی هەتاوی بە خشت، چیمەنتۆ و ئاسن نۆژەن کراوەتەوە. بۆ کاری بنکەی تەندروستی و وەرگرتنی نەوت و کەلوپەلی پێویست دەچنە ئاوایی سیاقوڵی خواریّ.

قوتابیان بۆ درێژەپێدان بە خوێندن ڕێگای خەلیفان و شاری مەهاباد دەگرنە بەر و لەو بابەتەوە ئەو مافە بۆ کوڕان و کچان پارێزراوە.

کاروپیشەی خەڵکی ئەم دێیە ئاژەڵداری، وەرزێری، باخداری و کرێکارییە. زۆربەی ئاژەڵەکان هەر مەڕن و تا ڕادەیەک بزن و مانگاش ڕادەگرن، وەرزێران گەنم، جۆ، نۆک و باقلە دەچێنن، بەرهەمی باخەکانیشیان سێو و بادامە.

گرفتەکانی خەڵکی حاجی مامیان: کەم‌ئاوی و خراپ بوونی لوولەکێشیی ئاوەکەیان.

گۆڕستانی "خاڵەخەت" تایبەت بە منداڵانە، گۆڕستانی گشتی لە باشووری دێ هەڵکەوتووە.

"ڕەحمانی حاجی مامیان" وەکوو هونەرمەند و گۆرانی‌بێژ خەڵکی ئەم گوندەیە.

## حەسەنچەپ

حەسەنچەپ لە ٤٢ کیلۆمیتری باشووری ڕۆژاوای شاری مەهاباد، بەشی خەلیفان و دێهستانی مەنگوڕی ڕۆژهەلات و لە ناوچەی مەنگوڕایەتی هەڵکەوتووە. لە ١٩ ماڵ و ١٠٨ کەس پێکهاتووە، لەمانە ٥٣ کەس پیاون و ٥٥ کەسیش ژنن، لە ٥٩ کەسی خوێندەوار ٣٥ کەسیان پیاون و ٢٤ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٣٧ کەسی نەخوێندەوار ١٢ کەسیان پیاون و ٢٥ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ٦٠٧٦ هێکتارە، لەمە ٧٦ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە، ٦٠٠٠ هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە. هەروەها لەم ساڵانەدا لە ٦٠٧٦ هێکتار پانتایی ئەم ئاوایییەدا، گوندێکی دیکە بە ناوی "قەرەقاچ" ساز کراوە کە تەنیا مافی ساز کردنی خانوویان هەیە و پانتایی قەرەقاچ دیاری نەکراوە. حەسەنچەپ خاوەن ١١٦ هێکتار زەوی دێم، ٩٥/٢ هێکتار زەوی بەراو، ١٧/٨٤هێکتار باخ، ٦ تراکتۆر و ٣ لاوێردەیە.

ئاوایییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایییەکانی بێهەنگوین و دووچۆمان

باکوور: ئاوایییەکانی باگردانی سەرێ و خوارێ

ڕۆژهەڵات: ئاوایییەکانی خانەگێ مەنگوڕان و زێوە

ڕۆژاوا: ئاوایی قەڵاتی سنان

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باشوور: کێوی چرووش

باکوور: شاخی مێشی

ڕۆژاوا: کۆخڕۆستەم و بەردی پەپۆیان

لە ڕۆژهەڵاتی دێ چەند ئەشکەوتێکی لێیە کە بچووکن و شوێنەکەیان بە "خرێ‌ئەشکەوتان" ناسراوە.

چەند کانیاوی ئاوایی بریتین لە: کانی قودرەت، کانی کوڕ و کچان، کانی قەڵشەبەردێ و کانی کۆخڕۆستەم.

کانی قودرەت پێشتر ناوی "کانی جندۆکان" بووە، ئەو کانیاوە بەردەوام ئاوەکەی نایە و ساڵێ چەند جارێک ئەویش بە ماوەی دوو سێ سەعات دەر دەبێ و پاشان ئیشک دەبێ، ساڵی وایە هەر حەوتوویەی جارێک یان مانگێ جارێک یان بە دوو مانگان جارێک ئاوەکەی دێ و هەبووە کە لە ساڵێکدا چەند جار ئاوەکەی دەربدات.

خەڵک دەڵێن نزیک بێست ساڵ لەوەی پێش مامۆستایەکی ئایینی کە ئەمەی دیت، گوتی دەبێ ناوەکەی بگۆڕن، هەر جار بە دیتنی ئەمە قودرەت و توانای خوداتان لە بیر بێتەوە هەر بۆیە بە کانی قودرەت ناسرا.

گشت خانووبەرەکانی ئەو دێیە لە قوڕ و بەرد ساز کراون، میچی گشت ماڵەکانیش لە دارە، کۆڵانەکان وەکو داڵان هەڵکەوتوون و بەرتەسک و هەورازن، ماڵەکان حەوشەیان نییە و بەرەو باشوور و ڕۆژهەڵات ساز کراون.

سەبارەت بە مێژوو و ناوی ئاوایی زانیارییەکی ئەوتۆ لە بەردەستدا نییە، بەڵام خەڵکەی ئاوایی دەڵێن لەوانەیە کەسێک بە ناوی "حەسەن"، ئەم دێیەی ئاوەدان کردبێتەوە و بە هۆی دوورەپەرێز بوونی دێیەکە و بە قەولی کوردەواری چەپ هەڵکەوتنی بە "حەسەنچەپ" ناسرابێ.

لە ڕۆژهەڵاتەوە ڕێگایەکەی خاکی دووڕێیانێکی لێ دەبێتەوە کە ئاوایییەکانی دووچۆمان و بێهەنگوین دەگرێتەوە.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی ١٣٧٧/٢/١٩ کارەبا بۆ چووە، لوولەکێشی ئاوی خواردنەوەی، بنکەی مخابەرات، قوتابخانەی سەرەتایی (کوڕانە ـ کچانە) بە ناوی"کووشا" کە پێویستە بیناکەی نۆژەن بکرێتەوە. خەڵکی ئاوایی بۆ کاروباری شووڕا، بنکەی تەندروستی و وەرگرتنی نەوت و کەلوپەلی پێویست سەر بە ئاوایی "باگردانی خوارێ"ن.

ئەوانەی کە درێژە بە خوێندن دەدەن دەچنە خەلیفان و مەهاباد و تەنیا کوڕەکانی ئاوایی ئەو مافەیان هەیە.

کارووپیشەی خەڵکی حەسەنچەپ وەرزێری، ئاژەڵداری و کرێکارییە، وەرزێران گەنم، نۆک و جۆ دەچێنن.

گرفتەکانی خەڵکی حەسەنچەپ: نەبوونی بنکەی تەندروستی سەربەخۆ، نەبوونی مزگەوت، ڕێگای ناخۆش و کەم‌ئاوی.

ئەم دێیە دوو گۆڕستانی لێیە، یەکیان کۆنە و بە"چوار دیوار" ناسراوە و ئەوی تریان کە ئێستە مردووی لێ دەنێژن ناوی "شێخ وەتمان"ە.

## حەوتەوانان

لە ٢٠ کیلۆمیتری ڕۆژهەڵاتی شاری مەهاباد، بەشی ناوەندی و دێهستانی ئاختاچی ڕۆژاوا و لە ناوچەی محاڵ هەڵکەتووە. لە ٧ ماڵ و ٤٦ کەس پێکهاتووە، لەمانە ٢٨ کەسیان پیاون و ١٨ کەسیش ژنە، لە ٢٩ کەسی خوێندەوار ٢٠ کەسیان پیاون و ٩ کەسیش ژنن، هەروەها لە ١٤ کەسی نەخوێندەوار ٦ کەس پیاون و ٨ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ٣٧١/٣٧ هێکتارە، لەمە ١٤٤/٥٨٥ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە، ٢٢٦/٧٨٥ هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.

حەوتەوانان خاوەن ١٩ هێکتار زەوی دێم، ٨٥ هێکتار زەوی بەراو، ٧/٥ هێکتار باخ، ٢ تراکتۆر و ٣ لاوێردەیە.

ئاواییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی سارەوانان

باکوور: ئاوایی قەڵات

ڕۆژهەڵات: ئاوایی سارەوانان

ڕۆژاوا: ئاواییەکانی سەیداوا و پیربەلە

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باشوور: کێوی گۆلی سەیدی

باکوور: کێوی چاکەچکۆلە

کانی سێو، کانی سارد، کانی حەوتەوانان سێ کانیاوی ئەم گوندەن.

گشت خانووەکانی حەوتەوانان لە قوڕ و بەرد و میچی دار ساز کراون، زۆربەی ماڵەکان خاوەن حەوشەن و دەرگیایان هەیە، ئەم ماڵانە لە سەر تەپکێک ساز کراون و بەرەو ڕۆژاوان.

بۆچوونێک سەبارەت بە ناوی حەوتەوانان لە زمان خەڵکەوە ئەوەیە کە حەوتەوانان هەر لە ناوی گۆڕستانی "حەوت برایان"ەوە کە لە بەری ڕۆژهەڵات هەڵکەوتووە، هاتووە، گۆیا ئەوان شەهید کراون و ئێستا لە خاکی ئاوایی قەڵات و نزیک لە حەتەوانانە. هێندێکی دیکە دەڵێن سەرەتا ئەو ئاواییە حەوت ماڵ بوونە بۆیە وایان پێگوتووە، هەروەها حەوتەوانە بە پەیرەوانی ئایینی "یاری"ش دەگوترێ کە لە پارێزگای کرماشان و چەندین شاری عێراقدا دەژین*. هەروەها کۆمەڵەئەستێرەیەک هەیە کە "حەوتەوانە"ی پێدەڵێن.

لە باشوورەوە ڕێگایەکی خاکی ئاوایی سارەوانان دەگرێتەوە، لە ڕۆژهەڵاتەوە ڕێگایەکی خاکی دەچێتەوە ئاوایی قەڵات، لە ڕۆژاواش ڕێگایەکی خاکی دەچێتەوە ئاواییەکانی شیلاناوێ و لاچین.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی ١٣٧٨/١٢/٢٥ کارەباکەی هەڵکراوە، بنکەی مخابەرات، مزگەوت کە بە قوڕ و بەرد دانراوە و "حەزرەتی نووح" ناودێر کراوە. خەڵکی ئاوایی نەوت و کەلوپەلی پێویست لە شەریکەی هاوبەشییی پشتەپ وەردەگرن.

لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوەی نییە هەر بۆیە لە کانیاوەکان کەلک وەردەگرن، بۆ کاروباریی پێوەند بە بنکەی تەندروستییەوە دەچنە ئاوایی لاچین.

خوێندکاران لە سەرەتاوە بۆ خوێندن دەبێ بچنە مەهاباد یان قوتابخانەی ئاواییەکانی نزیک لە حەوتەوانان و ئەمە بۆتە هۆکاری نەخوێندەواری زۆربەی منداڵانی ئەم گوندە، ساڵان قوتابخانەی سەرەتایی لێبوو، بەڵام لە ساڵی١٣٨٧ەوە مامۆستایان نەداونێ.

کاروپیشەی خەڵکی ئاوایی ئاژەڵداری و وەرزێرییە، ئاژەڵەکان مەڕ و مانگان، وەرزیرەکان گەنم، نۆک و جۆ دەچێنن، زۆربەی ماڵەکان هەر ئاژەڵدارن.

گرفتەکانی خەڵکی حەوتەوانان بریتین لە نەبوونی ڕێگایەکی خۆش، نەبوونی قوتابخانە تەنانەت قوتابخانەی سەرەتایی، نەبوونی بنکەی تەندروستی سەربەخۆ.

گۆڕستانەکەی لە بەری باشووری دێیە و ئاواییەکانی دیکەش وەکوو "قەڵات" و "سارەوانان" مردووی لێدەنێژن.

---

* ئەو ئایینە پێکهاتەیەکە لە کەونەئایینەکانی ئێرانی وەکوو: زەروان، میترا و زەردەشت، سەرەتای سەرهەڵدانی دەگەڕێتەوە سەر بۆهلول ماهی لە سەدەی دوویەمی کۆچی. نووسراوەکانی ئەم ئایینە بە زاراوەی گۆرانی نووسراونەوە. ئایینی پەدیوەر یا دوایین نامە (نامەی سەرئەنجام) خاوەن حەوت بەشە. وەکوو بەشەکانی گلیم وە کول ـ بارگە بارگە.

## حەولاباد

حەولاباد لە ١٧ کیلۆمیتری باکووری ڕۆژهەلاتی شاری مەهاباد، بەشی ناوەندی و دێهستانی موکریانی ڕۆژهەلات و لە ناوچەی شارویران هەلکەوتووە.
لە ٣٩ مال و ٢٥٨ کەس پێکهاتووە، لەمانە ١٢٤ کەسیان پیاون و ١٣٤ کەسیش ژنن، ڕادەی خوێندەواران ١٦٣ کەسە کە ٨٦ کەسیان پیاون و ٧٧ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٦٩ کەسی نەخوێندەوار ٢٣ کەس پیاون ٤٦ کەسیش ژنن.
پانتایی ئاوایی ١٢٧٩ هێکتارە، لەمە ٧٩ هێکتار بۆ خەلک جیا کراوەتەوە، ١٢٠٠ هێکتار پاوان و لەوەرگەی دێیە.
حەولاباد خاوەن ٤٩٠ هێکتار زەوی دێم، ١٣١ هێکتار زەوی بەراو، ٣١ هێکتار باخ، ٢١ تراکتۆر و ٢ لاوێردەیە.

ئاواییەکانی دەوروبەر:
باشوور: ئاوایی خاتوونباخ
باکوور: ئاوایی بەردەڕەشان
ڕۆژهەلات: ئاوایی ئازاد
ڕۆژاوا: ئاوایی گۆکتەپە

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:
باشوور: گردی پێش مالان
باکوور: کێوی قزلداغ
ڕۆژهەلات: شاخەڕەش
ڕۆژاوا: کێوی چڕی سپی

کانیاوەکان بە کانی سارد و کانی کولتەپە ناسراون.
خانووبەرەکان بە گشتی لە قوڕ و بەرد و میچیان لە دارە، بەلام ئێستە لە ساز کردنی خانوودا خشت و چیمەنتۆش دەکار دەکەن، مالەکان حەوشەیان هەیە و بە گشتی ڕوویان لە باشوورە، ئەم دێیە چەند کۆلانێکی ناڕێک و بەرتەسکی هەیە. لە بەری ڕۆژاوا قەلایەکی لێیە کە بە "تەپکی تیکانان" ناسراوە.
لە باشوورەوە ڕێگایەکی خاکی بە مەودای ٢/٥ کیلۆمیتر دەچێتەوە ئاوایی خاتوونباخ، لە باکوورەوە ڕێگایەکی خاکی دەچێتەوە سەر جادەی مەهاباد ـ میاندواو و ئاوایی بەردەڕەشان.
ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی ١١/٤/ ١٣٧٣ کارەباکەی هەلکراوە، سیمکارتی مخابەراتی دێهات، قوتابخانەی سەرەتایی"شەرافەت" (کوڕانە ـ کچانە) کە بیناکەی حازربەدەستە، مزگەوت کە خێرخوازێک بە ناوی "حاجی حەمە سولتان"سازی کردووە و سالی ١٣٧٥ی هەتاوی نۆژەن کراوەتەوە. بۆ کاری بنکەی تەندروستی و بۆ وەرگرتنی نەوت و کەلوپەلی پێویست دەچنە ئاوایی خاتوونباخ.
لوولەکێشی ئاوی خواردنەوەی نییە، چەند مالێک چالاویان لێداوە و مالەکانی دیکەش لە کانیاوەکان کەلک وەردەگرن.
خوێندکاران بۆ درێژەدان بە خوێندن دەچنە ئاواییەکانی خاتوونباخ و گۆکتەپە و ئەو مافە تا ڕادەیەکی زۆر بۆ کچەکانیش پارێزراوە.
وەرزێری، ئاژەلداری، باخداری و کرێکاری بەتایبەت لە کانگای بەرد کاروپیشەی خەلکی ئەم گوندە پێکدێنن. وەرزێران گەنم، جۆ، گولەبەڕۆژە، بەرە و چەوەندەر دەچێنن، ئاژەلەکانیشان مەڕ و مانگان، زۆرترین بەرهەمی باخەکانی ئاوایی سێوە.
گرفتەکانی خەلکی حەولاباد: نەبوونی لوولەکێشی ئاوی خواردنەوەی، ڕێگای خاکی و ناخۆش کە پێویستی بە قیلەتاوە، نەبوونی بنکەی تەندروستی سەربەخۆ.
دوو گۆڕستانی کۆن و نوێ لە باشووری دێن کە مەودای کۆنەگۆڕستانەکە تا ئاوایی زۆرە.

## حەولاكوردە

حەولاكوردە لە ١٦ كیلۆمیتری باشووری ڕۆژاوای شاری مەهاباد، بەشی خەلیفان و دێهستانی مەنگوڕی ڕۆژهەلات و لە ناوچەی مەنگوڕایەتی هەلكەتووە. لە ١٣ مال و ٩٥ كەس پێكهاتووە، لەمانە ٤١ كەسیان پیاون و ٥٤ كەسیش ژنن، لە ٦٨ كەسی خوێندەوار ٣٢ كەس پیاون و ٣٦ كەسیش ژنن، هەروەها لە ١٥ كەسی نەخوێندەوار ٥ كەس پیاون و ١٠ كەسیش ژنن.

حەولاكوردە خاوەن ٦٨/٥ هێكتار زەوی دێم، ١٥/٥ هێكتار زەوی بەراو، ١٠/٢٣ هێكتار باخ، ٢ تراكتۆر و ٢ لاوێردەیە.

حەولاكوردە ناوندی دێهستانی مەنگوڕی ڕۆژهەلات بە پانتایی (٦٨٤٠٩٧) كیلۆمیتری چوارگۆشەیە و خاوەن حەفتا و دوو ئاوایی كە شێست و هەشت ئاوایی ئاوەدانە و چواریان چۆل كراون.

ئاوایییەكانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی گولێار

باكوور: ئاوایییەكانی قەرەچەلان و بەیتاس

ڕۆژهەلات: ئاوایییەكانی گیادروان، خرەجۆ و قۆزلووجە

ڕۆژاوا: ئاوایی كاوەیس

چیاكانی دەوروبەری ئاوایی:

باكوور: بەردەبۆق

ڕۆژهەلات: شاخەڕەش

ڕۆژاوا: مایندتۆپیو

باكوور: بەردەبۆق

چۆمەكانی بریتین لە: چۆمی "تیتیلوو" كە لە "خرەجۆ"وە سەرچاوە دەگرێ، چۆمێك كە لە "ئاغاسوور"ەوە دەست پێدەكا و بە ئاوایی بەیتاسدا تێدەپەڕێ و دەچێتەوە ئاوبەندی شاری مەهاباد.

دوو ئاوایی حەولاكوردە و كاوەیس لە مەودای سێسەد میتری یەكن كە هەر ئەو چۆمەی لە "ئاغاسوور"ەوە سەرچاوە دەگرێ لێكیان جیا دەكاتەوە و پردێك كە بە چیمەنتۆ داڕێژراوە، ئەم دوو ئاوایییە بە یەكەوە گرێ دەداتەوە.

هەروەها كانیاوەكان بە "تاقەدار" و "زیندان" ناویان دەركردووە.

زۆربەی خانووەكان لە خشت و چیمەنتۆیە و چەند خانووبەرەیەكیش بە قوڕ و بەرد ساز كراون و بە كاگل سواغ دراون، میچەكان لە ئاسن یا دارن. مالەكان حەوشەیان نییە و زۆربەیان بەرەورووی ڕۆژاوان.

ئەم گوندە سالی ١٣٠٠ی هەتاوی لە لایەن كەسێكەوە بە ناوی "حەولا كوردە"، لە دایك بووی ١٢٧٥ی هەتاوی لە شاری "ئادانا"ی سەر بە كوردستانی "توركیا" ئاوەدان كراوەتەوە، ئەو هاوڕێ دەگەل بنەمالەكەی دێنە ئێران و لە ئاوایییەكانی ناوچەكە نیشتەجێ دەبن. حەولاكوردە سالی ١٣٠٠ی هەتاوی دێتە ئەم شوێنەی كە ئێستا باسی لەسەر دەكەین و سالگارێك لە وێ قاوەخانەی دەبێ و تاقەمالە دەبێ، زەویوزاری دەوروبەر دەكڕێتەوە و دەست دەكا بە ئاوەدانی، زۆربەی بەسالاچووانی ناوچە بیرەوەرییان لێی هەیە و بە پیاوێكی خێرخوازی دەناسن. بەر لە "حەولاكوردە" كەسانێكی دیكە لەو بەری چۆمی ئاوایی كە بە "دەرەی ڕەن" ناسراوە ژیاون كە هەنووكەش ئاسەواری خانووبەرەكانیان هەر ماون و زۆر جار لەم شوێنە لەتكەسوالەتی شكاو دەبینرێتەوە.

تا بەر لە سالی١٣٥٧ی هەتاوی، "حەولاكوردە" هەر دوو مال بووە و لە بەری ڕۆژهەلاتی ڕێگای مەهاباد ـ سەردەشت نیشتەجێ بوون، كەچی لەم سالەدا بە هۆی شەڕ و پێكدادان، خانووبەرەكانیان دەسووتێ و تالان دەكرێن، حكوومەت لە بەری ڕۆژاوا خانووی بۆ ساز كردوونەوە. ئێستە ئەم ئاوایییە بووژاوەتەوە و ئاوەدان بۆتەوە و لە هەر دووك بەری ڕێگاكە خانوو ساز كراون.

ڕێگاكەی قیلەتاوی مەهاباد ـ سەردەشت كە دەكەوێتە باشووری ئاوایییەوە، چەندین ئاوایی تر لە ڕێگایەكی خاكییەوە دەچنەوە سەر ئەو ڕێگا قیلەتاوەوە. لە باكوورەوە ڕێگای مەهاباد ـ سەردەشت دەچێتەوە ئاوایییەكانی بەیتاس و هەمزاوا، لە باشووری ڕۆژهەلاتەوە ڕێگایەكی خاكی دووڕیانێكی لێ دەبێتەوە كە یەكیان ئاوایییەكانی گیادروان، قۆزلووجە و خرەجۆ دەگرێتەوە و ئەوی دیكە دەڕواتەوە گوندەكانی قەرەچەلان و

کەوڵەی سەر مێرگان.
ئیمکاناتی ئاوایی: ساڵی ١٣٦٦ی هەتاوی کارەبای بۆ چووە، سیمکارتی مخابەراتی دێهات، قوتابخانەی سەرەتایی بە ناوی"تلووع" (کوڕانە ــ کچانە) ساڵی ١٣٥٣ هـ، بنکەی تەندروستی، دەرمانگا، ناوەندی خزمەتگوزارییەکانی وەرزێری، شەریکەی هاوبەشیی نەوت و کەلوپەلی پێویست، سیلۆ، ئاش، کارگای قوتوو ساز کردن و هەروەها لە ساڵی ١٣٨٣ی هەتاوییەوە ئەم دێیە خاوەن دێهیارییە، پاسگای هێزی ئینتزامی، مەقەڕی بەسیج و ناوەندی فریاکەوتنی پزیشکی.
ئاوی حەوڵاکوردە لوولەکێشی بۆ نەکراوە بەڵکوو لە چاڵاو کەلک وەردەگرن.
خوێندکاران بۆ درێژەدان بە خوێندن دەچنە شاری مەهاباد.
دەرمانگای حەوڵاکوردە لە لایەن سازمانی یونیسێف ساز کراوە کە زەوییەکەی لە لایەن کەسێکەوە بە ناوی "قادرکوردە" پێشکەش کراوە، ئەم دەرمانگایە نەشتەرگەیی ڕاڕەوی (عمل سرپایی) و مامایی دەکا.
جێگای ئاماژەیە تەواوی زەوییەکانی ئۆرگانەکان لەم دێیە بە خۆڕایی لە ئیختیاریان نراوە.
کاروپیشەی خەڵکی حەوڵاکوردە لە وەرزێری، ئاژەڵداری و باخداری و بەشێکی کەم سەنعات پێکهاتووە، وەرزێران گەنم، جۆ و نۆک دەچێنن، زۆربەی ئاژەڵەکانیان مانگان و تا ڕادەیەکی کەم مەڕیان هەیە. ئاوایی چەند باخێکی هەیە کە بەرهەمەکەیان سێوە.
گرفتەکان: هەرێمی جادە و چۆم بۆتە هۆکارێک کە خەڵکەکە نەتوانن چیتر پەرە بە ئاوایی بدەن، لوولەکێشی ئاوی خواردنەوەی نییە، نەبوونی قوتابخانەی ناوەندی، بایەخ نەدان بە ئاسەواری مێژوویی و ئاسەواری ئەو خانووبەرانەی ماون.
گۆڕستانەکەی لە بەشی باکووری ڕۆژهەڵاتی ئاوایییە و دیواریان بۆ کێشاوە و وەک باس دەکرێ بەر لە حەوڵاکوردەش ئەم گۆڕستانە هەبووە.
هەر لەم ساڵەدا کە حرووسان هێرشیان کردە سەر شاری سابڵاغ و ئاوایییەکانی دەوروبەر، خەڵکێکی زۆریان لە گیادروان و خرەجۆ و قۆزلووجە بەبێ تاوان کوشت و تەرمەکانیان لە گۆڕە بە کۆمەڵەکاندا چاڵ کران، ئەم گۆڕستانە بەشێک لە کوژراوەکانی ئەو کارەساتە دەخۆ دەگرێ. هەروەها "حەوڵاکوردە" بۆخۆشی کە ساڵی ١٣٤٨ی هەتاوی کۆچی دوایی کردەوە هەر لەم گۆڕستانە نێژراوە.

***

کاک "عەلی مەحموودی" بە تەمەنترین کەسی ئاوایی "کاوەیسئاوا"، لە مەڕ کەسایەتیی "حەوڵاکوردە"وە دەڵێ:
پیاوێکی کورتەباڵا و هەتا بڵێی بەغیرەت بوو، ئەو کات دووسەد سێسەد کەویژ گەنمی هەبوو، شەش حەوت کەڵ و عارەبەی هەبوون و گەلێکیش خێرخواز بوو. ڕۆژێ جارێک بە سواری بارگین، لە چاڵەبەفرێک کە بۆخۆی سازی کردبوو سەهۆڵی دەهێنا و دۆی بە خۆڕایی دەدا بە خەڵک و ڕێبواران و کاروانچییان و هەر بە بارگینان ڕێگاوبانی بۆ خەڵکی خۆش دەکرد و زۆر تێکۆشەر بوو.
هەر لەو سەردەمانەی کە ئاوایی "کاوەیـــس" لە پەلامار و مەترسی تاڵان کردندا بوو، بە پێشنیاری "حەوڵاکوردە" خەڵکەکەی هاتنە تەنیشت قاوەخانەی حەوڵاکوردە و لە بەری ڕۆژاوای چۆم و داوێنی کێو خانوویان ساز کردن، بەڵام سەرەڕای ئەوەی کە دانیشتووانی ئەم دوو ئاوایییە پێکەوە زۆر باش بوون، خەڵکی کاوەیس قەت حازر نەبوون دەگەڵ ئاوایی حەوڵاکوردە تێکەڵ ببنەوە، هۆیەکەشی هەر ئەوە بوو کە بەوە ڕازی نین ناوی ئاوایی "کاوەیس" کوێر بێتەوە.

## خاتوونئەستی

خاتوونئەستی لە ٢٤ کیلۆمیتری باشووری ڕۆژاوای شاری مەهاباد، بەشی خەلیفان و دێهستانی مەنگوڕی ڕۆژهەلات و لە ناوچەی مەنگوڕایەتی هەلکەوتووە. لە ١٠ مال و ٤٧ کەس پێکهاتووە، لەمانە ٢٥ کەس پیاون و ٢٢ کەسیش ژنن، لە ٢٣ کەسی خوێندەوار ١٦ کەس پیاون و ٧ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٢٠ کەسی نەخوێندەوار ٩ کەس پیاون و ١١ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ٢٦٧٦/٥ هێکتارە، لەمە ١٧٦/٥ هێکتار بۆ خەلک جیا کراوەتەوە و ٣٥٠٠ هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.

خاتوونئەستی خاوەن ١٥٩/١ هێکتار زەوی دێم، ٦٧/٧ هێکتار زەوی بەراو، ٣/٢١ هێکتار باخ و ٢ تراکتۆرە.

ئاواییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی ئامێد

باکوور: ئاوایی دووسەید

ڕۆژهەلات: ئاوایی گولیار

ڕۆژاوا: ئاوایی سیاقوولی خوارێ

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باشوور: سووران، قولکە

باکوور: خرێ هەنجیران

ڕۆژاوا: ورچەکێ

کانیاوکانی بریتین لە: کانی "کەرێزە" و کانی "ژنان".

خانووبەرەکان ئەم گوندە لە قوڕ و بەرد و دار پێکهاتووە. مالەکان حەوشەیان نییە و بەرەورووی باشوورن و شوێنەکەیان تا ڕادەیەک هەورازە.

لە ڕۆژهەلاتی دێ ڕێگایەکی خاکی جادەی مەهاباد ـ سەردەشت دەگرێتەوە.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی ١٣٧٦/٤/٧ کارەبای بۆ هاتووە، سیمکارتی مخابەراتی دێهات. ئاوی ئەم دێیە لوولەکێشی بۆ نەکراوە و لە چالاو کەلک وەردەگرن. بۆ بنکەی تەندروستی، وەرگرتنی نەوت و کەلوپەلی پێویست سەر بە ئاوایی"حەولاکوردە"ن.

بە هۆی نەبوونی قوتابخانە لە ئاوایی، خوێندکاران دەبێ هەر لە سەرەتاوە بۆ خوێندن بچنە شوێنەکانی دیکە بەتایبەت شاری مەهاباد. مافی خوێندن بۆ کوڕان و کچان پارێزراوە.

کاروپیشەی خەلکی ئاوایی وەرزێرییە و ئاژەلداری، وەرزێران گەنم، جۆ، نۆک و نیسک دەچێنن و ئاژەلەکانیان مەڕ، بزن و مانگان. خەلکەکەی لەم دواییانە هێندێک دارەمیوەیان لێدراوە.

گرفتەکانی خەلکی ئاوایی: ڕێگای خاکی و ناخۆش، نەبوونی بنکەی تەندروستی سەربەخۆ، نەبوونی شوورای ئیسلامی، پێویستی بە لوولەکێشی ئاوی خواردنەوەیە.

گۆڕستانی "چاکەچکۆلە" لە باشووری دێ هەلکەوتووە کە ئێستا بۆ ناشتنی ئەو مندالانەی بە هەر هۆیەک دەمرن کەلکی لێوەردەگرن، بە گشتی خەلک بۆ ناشتنی مردووەکانیان، لە گۆڕستانەکەی ئاوایی "گولیار" کەلک وەردەگرن.

## خاتوونباخ

خاتوونباخ لە ١٩ کیلۆمیتری باکووری ڕۆژهەڵاتی شاری مەهاباد، بەشی ناوەندی و دێهستانی ئاختاچی ڕۆژاوا و لە ناوچەی محاڵ هەڵکەوتووە. لە ٣٢ ماڵ و ٥٥٢ کەس پێکهاتووە، لەمانە ٢٧٧ کەس پیاون و ٢٧٥ کەسیش ژنن، ڕادەی خوێندەواران ٣٧٠ کەسە کە ٢١٢ کەس پیاون و ١٥٨ کەسیش ژنن، هەروەها لە ١٤١ کەسی نەخوێندەوار ٤٥ کەس پیاون و ٩٦ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ٣٢٢٩ هێکتارە، لەمە ٧٢٩ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و ٢٥٠٠ هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.

خاتوون باخ خاوەن ٤٢٨ هێکتار زەوی دێم، ٣٠٢ هێکتار زەوی بەراو، ٨٧ هێکتار باخ، ٣٤ تراکتۆر و ٤ لاوێردەیە. بەرزایی ئاوایی ١٤٩٠ میتر لە ڕووکەشی زەریاکانە.

ئاوایی‌یەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی بەردەمێش

باکوور: ئاوایی گۆکتەپە

ڕۆژهەڵات: ئاوایی‌یەکانی حەوڵاباد و ئازاد

ڕۆژاوا: ئاوایی‌یەکانی تیکانلووجە و کەرێزەی ئالی‌بایز

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باشوور: کێوی مەرغەول

ڕۆژهەڵات: شاخەڕەش

کانیاوەکان: کانی خیزی، ئاختاکەرێز، کانی تۆمار و تەرسەتۆر. لە ڕۆژهەڵاتی ئاوایی و لە سەر شاخەڕەش ئەشکەوتێک هەڵکەوتووە.

زۆربەی خانووبەرەکانی خاتوونباخ لە قوڕ و بەردن و میچەکانیان دارن. ئێستە بۆ ساز کردنی خانووبەرەکانیان خشت و بلووک دەکار دەکەن.

ماڵەکان حەوشە و دەرگای چوونە ژوورەوەیان هەیە و زیاتریان بەرەو ڕۆژهەڵات و باشوور هەڵکەوتوونن. چەند کۆڵانێکی دێ هەورازن و ڕێگای قیلەتاو بە ناوەندی ئاواییدا تێپەڕ دەبێ.

ڕوون نییە ئەم دێیە کەی ئاوەدان بۆتەوە، سەبارەت بە ناودێرکردنیشی خەڵکی دێیەکە زانیارییەکی وایان نییە، تەنیا بۆچوونێک ئەوەیە کە دەبێ لەم دێیە خاتوونێک کە خاوەن باخ بووە ژیابێ و ئەوەش ڕوون نییە کە لە چ سەردەمێکدا و چەند ساڵ لەمەوبەر بووە.

لە ڕۆژهەڵاتی ئاوایی ڕێگای قیلەتاو "بۆزە" دەگرێتەوە، لە ڕۆژاواوە ڕێگای قیلەتاو دەچێتە سەر جادەی مەهاباد - میاندواو، لە باکوورەوە ڕێگایەکی خاکی دەڕوا بۆ ئاوایی حەوڵاباد.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی ١٣٦٣/٢/٢٦ کارەباکەی هەڵکراوە. لوولەکیسی ئاوی خواردنەوە، سیمکارتی مخابەراتی دێهات، قوتابخانەی سەرەتایی (کوڕانە ـ کچانە) بە ناوی "هیجرەت"، قوتابخانەی ناوەندی بە ناوی "ئیدریس"، ئاکابیری، شەریکەی هاوبەشیی نەوت و کەلوپەل، بنکەی تەندروستی، مزگەوتێک بە ناوی "حەزرەتی عومەر" کە ساڵی ١٣٨٠ی هەتاوی بە خشت، چیمەنتۆ و ئاسن نۆژەن کراوەتەوە، دوو کانگای بەرد.

قوتابیانی کوڕی ئەم دێیە بۆ درێژەپێدان بە خوێندن دەچنە شاری مەهاباد و کچەکانیان لەو مافە بێ بەشن و بەدەگمەن ئەگەر کچێک لەم دێیە بتوانێ درێژە بە خوێندن بدا.

کاروپیشەی خەڵکی خاتوونباخ وەرزێری، ئاژەڵداری، باخداری و کرێکارییە. وەرزێران گەنم، جۆ، نۆک، چەوەندەر و گوڵەبەڕۆژە دەچێنن و ئاژەڵەکانیان مەڕ و مانگان، بەرهەمی باخەکانیشیان سێو و ترێیە.

گرفتەکانی خەڵکی خاتوونباخ: کەم بوونی ئاو، ڕێگای ئاوایی قیلەتاوە، بەڵام ئەو ماشێنە گەورە بارکێشانەی بەرد لە کانگا و مەعدەنی بەرد ڕادەگوێزن بە ناوەندی ئاواییدا تێدەپەڕن و هەر ئەو بابەتە گرفتی بۆ خەڵکەکە ئاوایی ساز کردووە و دەبێ چارەیەکی بۆ بدۆزرێتەوە.

لە بەری ڕۆژهەڵاتی ئاوایی کۆنەگۆڕستانێکی لێیە کە "ئاختاکەرێز"ی پێدەڵێن کە دەبێتە گۆڕستانی ئاوایی‌یەکانی بۆزە و خاتوونباخ، گۆڕستانی"قەبری سەری هۆڵان" لە نزیک ئاواییە و لەم گۆڕستانەش کەلک وەردەگیرێ.

گرفتەکانی خەڵکی ئاوایی: ڕێگاوبانی خاکی، لوولەکێشی ئاوی خواردنەوەی نییە، نەبوونی بنکەی تەندروستی سەربەخۆ.

# خاتوونخاس

ئەم ئاوایییە لە 35 کیلۆمیتری ڕۆژهەڵاتی شاری مەهاباد، بەشی ناوەندی و دێهستانی ئاختاچی ڕۆژاوا و لە ناوچەی محاڵ هەڵکەوتووە. لە ٣٥ ماڵ و ١٨٣ کەس پێکهاتووە، لەمانە ١٠٢ کەس پیاون و ٨١ کەسیش ژنن، ژمارەی خوێندەوارانی ئەم ئاوایییە ١١٣ کەسە کە ٧٤ کەس پیاون و ٣٩ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٥١ کەسی نەخوێندەوار ١٨ کەس پیاون و ٣٣ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی 637/3 هێکتارە کە 337/3 هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە، 300 هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.

خاتوون خاس خاوەن ٣٢٨ هێکتار زەوی دێم، ١١٠ هێکتار زەوی بەراو، ١١ هێکتار باخ، ٢١ تراکتۆر و ١٠ لاوێردەیە.

ئاوایییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایییەکانی قەمتەرە و بورهان

باکوور: ئاوایی سنجاخ

ڕۆژهەڵات: ئاوایییەکانی شێخاڵی (سەر بە بۆکان) و قۆرغان

ڕۆژاوا: ئاوایی حاجیاڵیکەند

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باشوور: ئاڵمەڵوو

ڕۆژهەڵات: ماهی سوور

ڕۆژاوا: باسکەدرێژە

ئەشکەوتی "ماهی سوور" لە ڕۆژهەڵاتی ئاوایی هەڵکەوتووە.

کانی ماڵان، چۆرچۆرە و گۆلی سپیجان، کانیاوە بەناوبانگەکانی ئاواییین.

خانووبەرەکان لە قوڕ و بەرد پێکهاتووە، چەند خانووبەرەیەکی نوێ لە خشت و بلووک پێکهاتوون و میچی ماڵەکان لە دارە، گشت ماڵەکان حەوشەیان هەیە و دەرگایان تێگیراوە، هەروەها چەند کۆڵانێکی ڕێکوپێک لە ئاوایی دێتە بەر چاو.

لە باشوورەوە ڕێگایەکی خاکی دەچێتەوە ئاوایی سنجاغ، لە ڕۆژاواوە ڕێگایەکی خاکی دەچێتەوە ئاوایی حاجیاڵیکەند.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی 1375/11/09 کارەباکەی هەڵکراوە، سیمکارتی مخابەراتی دێهات، مزگەوتی "ئەسحابی کەهف"، قوتابخانەی سەرەتایی (کوڕانە ــ کچانە) بە ناوی "ئەسحابی کەهف" و هەروەها خاتوونخاس خاوەن شووڕای ئیسلامییە. بۆ بنکەی تەندروستی سەر بە ئاوایی "سنجاغ"ن، هەروەها نەوت و کەلوپەلی پێویست لە شەریکەی هاوبەشیئاوایی حاجیاڵیکەند وەردەگرن.

قوتابیانی ئاوایی بە گشتی پاش تێپەڕاندنی پۆلی سەرەتایی لە ئاوایی سنجاغ پۆلی ناوەندی تێپەڕ دەکەن.

ئاوی ئاوایی ڕایەڵی بۆ نەکراوە، زۆربەی ماڵەکان چاڵاویان لێداوە، هەروەها "کانی ماڵان" وەک شوێنێکی گشتی بۆ دابین کردنی ئاوی خواردنەوە کەلکی لێوەردەگیرێ.

کاروپیشەی خەڵکی ئاوایی وەرزێری و ئاژەڵدارییە، هەڵبەت تا ڕادەیەک باخداری و کرێکاریش دەکەن. وەرزێران گەنم، جۆ، نۆک و نیسک دەچێنن، ئاژەڵەکانیان بریتین لە: مەڕ، مانگا و بزن، بەرهەمی باخەکانیشیان سێوە.

گرفتەکانی خەڵکی ئاوایی: ڕێگاوبانی خاکی، نەبوونی لوولەکێشی ئاوی خواردنەوە، نەبوونی بنکەی تەندروستی سەربەخۆ.

گۆڕستانەکەیان لە ڕۆژاوای دێ هەڵکەوتووە.

کاک "حەمەڕەسووڵی خاتوونخاس"ی حەیرانبێژ و بەیتبێژی بەناوبانگ لەم گوندە دەژی، هەروەها "ڕەسووڵ نادرمیران" حیکایەتخوانی ئاوایی بووە.

## خاڵدەلیل

خاڵدەلیل لە ٤٧ کیلۆمیتری باشووری ڕۆژهەڵاتی شاری مەهاباد، بەشی خەلیفان و دێهستانی کانی بازاڕ و لە ناوچەی مەنگوڕایەتی هەڵکەوتووە. لە ٢٦ ماڵ و ١٩٦ کەس پێکهاتووە، لەمانە ٩٥ کەسیان پیاون و ٩٧ کەسیش ژنن، لە ١١١ کەسی خوێندەوار ٦٧ کەس پیاون و ٤٤ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٥٤ کەسی نەخوێندەوار ١٦ کەسیان پیاون و ٣٨ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ٤٠٠ هێکتارە، لەمە ٢١٦ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە، ١٨٤ هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.

خاڵدەلیل خاوەن ٢١٠ هێکتار زەوی دێم، ٤٥ هێکتار زەوی بەراو، ٧ هێکتار باخ (٥ هێکتاری سێوە) و ١٥ تراکتۆرە.

مەودای ئاوایی تا ناوەندی خزمەتگوزارییەکانی وەرزێری "کانی بازاڕ" ١١ کیلۆمیترە.

| ئاوایی‌یەکانی دەوروبەر: | چیاکانی دەوروبەری ئاوایی: |
| --- | --- |
| باشوور: ئاوایی کانی میران | باشوور: هەوارەبڵیندە |
| باکوور: ئاوایی پیرمکائیل | باکوور: شاخی ماهی |
| ڕۆژهەڵات: ئاوایی میرەدێ | ڕۆژهەڵات: دەروو |
| ڕۆژاوا: ئاوایی‌یەکانی خرەجۆ و قەڵاجۆغە | ڕۆژاوا: قارەمان |

بەری باکووری ئاوایی ئەشکەوتێکی لێیە کە ناسراوە بە "ماهی" و لە بەری باشووریش "کونەوشەک" لێیە کە بە پێی قسەی خەڵک کەس نەیتوانیوە بچێتە ژوورەوەی.

کانی سپی، سەرچاوەی قارەمانی، کانی هەوارەبڵیندە، کانی ماڵان، کانی دارگوێز و کانیلان کانیاوەکانی ئەم گوندەن.

لە خاڵدەلیل زۆربەی خانووبەرەکان لە قوڕ و بەرد و میچی دار ساز کراون، بلووک تا ڕادەیەکی کەم و لەم دواییانە دەکار کراوە. زۆربەی ماڵەکان حەوشەیان نییە و بە شێوازێکی نارێک و بەرەو باشوور لە پەنا یەک ساز کراون.

بە پێی بەڵگەیەکی بنەماڵەی مەجیدییەکان، ئاوایی‌یەکانی "خاڵدەلیل" و "پیرمکائیل" ڕێکەوتی ٥ی مانگی شەوالی١٣١١ لە لایەن "موعتەمیدولسوڵتان میرزا ئەکبەرخان" کارگێڕی مەئمووری دەرەوەی وڵات، جێگری خەلفولسەدرعەبدولسەمد، بازرگانی تەورێزی، بە "میرزا عەبدولمەجید سەعدولقوزات"و میرزا "عەبودولەتیف" جێگرانی میرزا "ئەحمەد قازی" بە نرخی سێ هەزار و دووسەد تمەنی ئەوکات دەفرۆشترێ، لە قەراری شەش هەزار و چوار سەد تمەن نەزر و کرێی ٩٩ ساڵە، ساڵ بە ساڵ لە قەراری هەر ساڵەی ٣٣ تمەن.

ئەم بەڵێننامەیە لە شاری مەراغە نووسراوە و سنوورەکان ئاوا دیاری کراون: شەش دانگی خاڵدەلیل و پیرمکائیل، لە ڕۆژهەڵات بردەکورسی، لە ڕۆژاوا گەردەنەی قارەمان، لە باشوور گەردەنەی کانی سپی، لە باکوور گەردەنەی بەردان و مەزرای ناسراو بە سێوەسوور و مەزرای مەشهوور بە یقواغ و هەر زەوی و خانوویەک لە خزرئاسکە بۆ لای ئاوایی و پیرمکائیل کە تازە ئاوەدان کراوەتەوە.

ئەم بنەماڵەیە دوای ماوەیەک لە وێ دەڕۆن و ئاغاکانی دیکە دەسەڵاتداری بەسەردا دەکەن.

لە بەری باشووری دێ ڕێگایەک قیلەتاو، دەچێتەوە ئاوایی‌یەکانی کانی میران و کیتکە، لە بەری باکوورەوە ڕێگایەکی خاکی دەچێتەوە ئاوایی پیرمکائیل، لە ڕۆژهەڵاتەوە ڕێگایەکی خاکی ئاوایی‌یەکانی میرەدێ و ئاچی‌دەرێ دەگرێتەوە.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی ١٣٧٦/٢/٥ کارەباکەی هەڵکراوە، بنکەی مخابەراتی، قوتابخانەی سەرەتایی (کوڕانە ـ کچانە) بە ناوی "مدثر"، مزگەوتێک بە ناوی "چواریاری نەبی" کە ساڵی ١٣٨٠ی هەتاوی بە خشت و چیمەنتۆ و ئاسن نۆژەن کراوەتەوە، لە سەر شاخی گوێزیلێ کانگای بەردی گرانیت هەیە. هەروەها نەوت و کەلوپەلی پێویست لە ئاوایی کیتکە وەردەگرن و بۆ بنکەی تەندروستی سەر بە ئاوایی"بەرەجۆ"ن. ئاوای خاڵدەلیل کە لولەکێشی بۆ نەکراوە و لە کانیاوەکان یان چاڵاو کەلک وەردەگرن

خوێندکاران بۆ درێژەدان بە خوێندن دەچنە خەلیفان و مەهاباد و لەم ئاستەدا جیاوازێکی بەرچاو لە نێوان کوڕان و کچاندا نابیندەرێ.

وەرزێری، ئاژەڵداری، باخداری و کرێکاری کاروپیشەی خەڵکی "خاڵدەلیل"ە، وەرزێران گەنم، جۆ، نۆک و نیسک دەچێنن و ئاژەڵەکانیشیان مەڕ و مانگان. بەرهەمی باخەکانی خاڵدەلیل لە سێو، قەیسی و گوێز پێکهاتووە.

گرفتەکانی خەڵکی ئاوایی: کەم‌ئاوی، نەبوونی بینایەکی باش بۆ قوتابخانە.

لە باشووری دێ، گۆڕستانی "مەلا ئۆمەر" هەڵکەوتووە کە خەڵک دەڵێن کێل و بەردی سەر گۆڕی مەلا ئۆمەر هێندێک نەقش و نیگاری وەکوو مانگ و ئەستێرەی لە سەر بووە و بە تاڵانیان بردووە. لە باکووری ئاوایی لە گۆڕستانی"قەبرەورکان"یش چەند قەبر دراونەوە.

## خانەگێ

خانەگێ لە پێنج کیلۆمیتری باکووری شاری مەهاباد، بەشی ناوەندی و دێهستانی موکریانی ڕۆژاوا و لە ناوچەی شارویران هەڵکەوتووە. لە ٤١٨ ماڵ و ١٨٣٢ کەس پێکهاتووە، لەمانە ٩٥٠ کەس پیاون و ٨٨٢ کەسیش ژنن، ژمارەی خوێندەوارانی ئەم دێیە ١١٧٧ کەسە کە ٦٨٨ کەس پیاون و ٤٨٩ کەسیش ژنن، لە ٤١٥ کەسی نەخوێندەوار ١٤٤ کەس پیاون و ٢٧١ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ٩٧٢/٨٣٢ هێکتارە، لەمە ٣٠٥ هێکتار لە دەست خەڵکدایە و ٦٦٧/٨٣٢ هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.

خانەگێ خاوەن ٨٧ هێکتار زەوی دێم، ٢٥٢ هێکتار زەوی بەراو، ٢٥٠ هێکتار باخ، ٢٧ تراکتۆر و ٤ لاوێردەیە.

ئاواییەکانی دەوروبەر:

باشوور: شاری مەهاباد

باکوور: ئاوایی ئیندرقاش

ڕۆژهەڵات: شاری مەهاباد

ڕۆژاوا: ئاوایی ئسووکەند

ئەم دێیە دەشتاییە و جگە لە هێندێک تەپۆڵکە هیچ کێوێکی لە دەوروبەر نییە.

کەرەسەکانی دەکارکراو بۆ ساز کردنی خانووبەرەکان هەر وەک هی شارن، هێشتا هێندێک کۆنەخانووی لە قوڕ و بەرد لە نێو ئاواییدا هەر ماون. گشت ماڵەکان خاوەن حەوشەن و ئاوایی لە سەر بەرزایی هەڵکەوتووە. کۆڵانە تازەکان ڕاست و ڕێکن، بەڵام کۆڵانەکانی پێشوو ناڕێک و نالەبار هەڵکەوتوون.

سەبارەت بە ناوی ئەم ئاواییە زۆربەی بەساڵاچووان ئاوایی ڕایان وایە کە "خانەگێ" ناوی ئاواییە و مانای دەگەڵ ئەو ناوەی کە لە ئۆرگانەکانی دەوڵەتی بە"خانقاه" ناوی دەبەن جیاوازە، خانەگێ لە "خان" بە مانای دەسەڵاتدار و "گێ" کە پاشگرە چەندین مانای لە کوردیدا هەیە و ڕوون نییە بە دروستی مەبەست چییە، بەڵام خانەقا شوێنێکە کە دەروێش لێی کۆ دەبنەوە کە واتا تەکیەیشی پێدەگوترێ.

لە بەری باشووری دێ ڕێگای قیلەتاو دەچێتەوە شاری مەهاباد، لە باکوورەوە ڕێگای خاکی ئاوایی ئیندرقاش دەگرێتەوە، لە ڕۆژهەڵاتەوە ڕێگایەکی خاکی دەچێتەوە سەر ڕێگای قیلەتاوی مەهاباد ـ میاندواو.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی ١٣٥٦/١٠/٢٨ کارەبای بۆ هاتووە، لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە کە عەنباراویان بۆ داناوە و ئاوەکەی لە چاڵاو دابین دەبێ، سیمکارتی مخابەراتی دێهات، تەلەیفوونی ماڵ بە ماڵ، پۆستبانک، بنکەی تەندروستی، قوتابخانەی سەرەتایی کوڕانە، قوتابخانەی سەرەتایی کچانە هەر دوو بە ناوی "دوازدەی فەروەردین"ن، ئاکابیری، باخچەی ساوایانی ئاوایی، مزگەوتی جامیع بە ناوی "ئیمامی عوسمان"، مزگەوتی "حاجی حوسێن پیرۆتی"، بلووکبڕی (کەرتی تایبەتی) و هەروەها ئەم ئاواییە خاوەن دێهیاری، شووڕای ئیسلامی و شووڕای چارەسەری کێشەکانە. بۆ وەرگرتنی نەوت و کەلوپەلی پێویست سەر بە ئاوایی "ئسووکەند"ن. بڕیارە لەم ئاواییە بنکەی بەڕێوەبەرایەتی "ژینگەپارێزی" دابمەزرێ.

قوتابیانی ئەم دێیە بۆ درێژەدان بە خوێندن هاتووچۆی شاری مەهاباد دەکەن.

زۆربەی خەڵکی ئەم گوندە کاری ئازاد دەکەن یان کرێکارن و هێندێک لە خەڵکەکەش خەریکی باخداری، ئاژەڵداری و وەرزێرین.

بەرهەمی باخەکانیان سێوە. پێنج ماڵی گەندەکە ئاژەڵدارن کە چواریان مەڕدارن و ماڵێک مانگا ڕادەگرن. پێنج ماڵ وەرزێرن و گەنم و جۆ دەچێنن.

گرفتەکانی خەڵکی ئاوایی خانەگێ: خزمەتگوزارییەکانی بنکەی تەندروستی بە هۆی بێ ئیمکاناتی بەرچاو نییە، پێویستە لەم ئاواییە گەڵاڵەی هادی بەڕێوە بچێ، نەبوونی قوتابخانەی ناوەندی و دواناوەندی، کەمبوونی بەشەئارد.

گۆڕستانەکەی ئاوایی لە باکووری دێ هەڵکەوتووە.

## "خانەگێ"ی مەنگوڕان

ئەم ئاوایییە لە ٤٣ کیلۆمێتری باشووری ڕۆژاوای شاری مەهاباد، بەشی خەلیفان و دێهستانی مەنگوڕی ڕۆژهەلات و لە ناوچەی مەنگوڕایەتی هەڵکەوتووە. لە ١٥ ماڵ و ٨٢ کەس پێکهاتووە، لەمانە ٤٣ پیاون و ٣٩ کەسیش ژنن، لە ٤٠ کەسی خوێندەوار ٢٨ کەس پیاون و ١٢ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٣٦ کەسی نەخوێندەوار ١٤ کەس پیاون و ٢٢ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ١٢٠١ هێکتارە، لەمە ٢٠١ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و ١٠٠٠ هێکتار پاوان و لەوەرگەی دێیە.

"خانەگێ"ی مەنگوڕان خاوەن ٥٨/٧ هێکتار زەوی دێم، ٦٠/٣ هێکتار زەوی بەراو، ١٠/٧٨ هێکتار باخ و ١ تراکتۆرە.

ئاوایییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی سەرتان

باکوور: ئاوایی باگردانی خوارێ

ڕۆژهەلات: ئاوایی زێوە

ڕۆژاوا: ئاوایی بێهەنگوین

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باشوور: کێوی زڕەلۆ

باکوور: کێوی تەنگێقەبران

ڕۆژهەلات: خرێ جوێ

ڕۆژاوا: شاخەڕەشە

کانیاوەکان بریتین لە: تاڵەگورگێ، شاخەڕەشە، بووزێ و کانی بەرماڵان.

خانووبەرەکان لە قوڕ و بەردن و میچەکانیان لە دارە، هێندێک لە خانووەکان کاگڵ کراون، هیچ کام حەوشەیان نییە و بەرەو باشوور هەڵکەوتوون، بەشێک لە ماڵەکانی خانەگێ جێگەکەیان هەورازە. مزگەوت و قوتابخانە لە خوارووی ماڵانن. لە بەری باکوور قەلایەکی لێیە کە ڕوون نییە ئی چ سەردەمێکە.

لە سەر جادەی خاکی دۆڵی زێوە ئەگەر لە دەراوی ئاوایی زێوە تێپەڕ بی بۆ لای ڕۆژاوا ڕێگایەکی سەخڵەت بە مەودای یەک کیلۆمیتر دەچێتە ئاوایی "خانەگێ"ی مەنگوڕان. ئەم دێیە هەر ئەو ڕێگایەی هەیە.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی ١٣٧٧/٣/١ کارەباکەی هەڵکراوە، بنکەی مخابەرات، قوتابخانەی سەرەتایی "ئیقبال" (کوڕانە ـ کچانە)، مزگەوتێک کە ساڵی ١٣٨١ی هەتاوی نۆژەن کراوەتەوە و دیوارەکانی لە قوڕ و بەردن. ئاوی ئەم دێیە لوولەکێشیی بۆ نەکراوە و ئاوی خواردنەوەیان لە کانی بەرماڵان دابین دەبێ. خەڵکی خانەگێ بۆ بنکەی تەندروستی ڕێگای باگردانی خوارێ دەپێون، نەوت و کەلوپەلی پێویستیش لە شەریکەی هاوبەشییسیاقوڵی خوارێ وەردەگرن.

خوێندکاران بۆ درێژەدان بە خوێندن دەچنە خەلیفان و شاری مەهاباد کە لەو بارەوە مافی کوڕان و کچان بەرامبەرە و پارێزراوە.

وەرزێری، ئاژەڵداری و کرێکاری کاروپیشەی خەڵکی ئەو گوندەن، وەرزێران دانەوێڵەکانی وەکوو گەنم، جۆ، نیسک و نۆک دەچێنن و ئاژەڵەکانیشیان مەڕ و مانگان، دوو باخی لێیە کە بەرهەمەکانیان سێو و قەیسییە.

گرفتەکانی خەڵکی "خانەگێ"ی مەنگوڕان: نەبوونی پردێک بۆ سەر چۆمی پێش ماڵان کە لە کاتی بارین بە تایبەت لە وەرزی بەهار، پاییز و زستان ڕێگای هاموشۆ زۆر دژوار دەبێ و ڕێگا دەبەسترێ، ڕێگای سەخڵەت و ناخۆشی ئاوایی کە پێویستە چارەسەر بکرێ، نەبوونی بینایەک بۆ قوتابخانە.

ئەم دێیە خاوەن گۆڕستانی تایبەت بە خۆیەتی.

# خڕەجۆ

خڕەجۆ لە ٢٣ کیلۆمیتری باشووری شاری مەهاباد، بەشی خەلیفان و دێهستانی مەنگوڕی ڕۆژهەڵات و لە ناوچەی مەنگوڕایەتی هەڵکەتووە. لە ١٥ ماڵ و ١٥٠ کەس پێکهاتووە، لەمانە ٧٤ کەس پیاون و ٧٦ کەسیش ژنن، لە ٨٩ کەسی خوێندەوار ٥١ کەس پیاون و ٣٨ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٤٣ کەسی نەخوێندەوار ١٦ کەس پیاون و ٢٧ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ٢٠١٨٣ هێکتارە، لەمە ١٨٣ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و ٢٠٠٠ هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.

خڕەجۆ خاوەن ١٥٩/٩ هێکتار زەوی دێم، ٢٨/٧ هێکتار زەوی بەراو، ١١/٣٢ هێکتار باخ، ٩ تراکتۆر و ١ لاوێردەیە.

ئاواییەکانی دەورووبەر:

باشوور: ئاوایی قەڵاجۆغە

باکوور: ئاوایی قۆزلووجە

ڕۆژهەڵات: ئاواییەکانی پیرمکائیل، گردەبەردان، عەینەمەلا و خاڵدەلیل

ڕۆژئاوا: ئاواییەکانی مازەڵێ، دۆڵپەمۆ، گوڵیار و کامەم

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باکوور: قارەمان، دوڵدوڵ، بەردەبلووسک

ڕۆژهەڵات: شاخی ڕەش

ڕۆژئاوا: گۆڕان

خڕەکانی ئاوایی بە خڕەترش، خڕەپیرێژن، خڕەسێو، خڕەشاخان، خڕەدوودڕکان و خڕەدوڵدوڵ ناسراون.

کانیاوەکانی ئەم دێیە بریتین لە: کانی دوڵدوڵ، کانی خڕەسێو، کانی گۆلی جیقنێ، کانی دووبەردووکە، کانی سارد و کانی جۆزەردان.

چۆمی خڕەجۆ کە دەچێتەوە نێو ئاوبەندی شاری مەهاباد لە کێوی دووبەردووکەی قارەمانی، دۆڵی خڕەجۆ و بەردەبلووسک سەرچاوە دەگرێ.

لەم دێیە گشت خانووبەرەکان لە قوڕ و بەرد و میچی دار ساز کراون، ماڵەکان حەوشەیان نییە، کۆڵانەکان بەرتەسک و تا ڕادەیەک ڕاست و ڕێکن.

سەبارەت بە ناوی خڕەجۆ خەڵکی ئەم ئاواییە بەتایبەت بەساڵاچووان دوو ڕا دەربڕن: یەکیان ئەوەیە کە لەم دێیە خڕێکی لێیە کە گەنم و جۆی لێدەکرێ و لە کۆنەوە هەروا بووە، بۆیە هەر بەم ناوە ناسراوە. ڕای دووهەم ئەوەیە کە زوو لەم ئاواییە جۆرە جۆیەکیان چاندووە بە ناوی "گەوڵـــەجۆ" کە هەشت ڕیز بوو، ئەو جۆیە بەراو دەکرا و لە ناوچەدا تایبەتی ئەم دێیە بووە، بۆیە وایان پێگوتووە.

لە باشوورەوە ڕێگایەکی خاکی بەرەو ڕۆژئاوا دەچێ و ئاوایی دۆڵپەمۆ دەگرێتەوە، هەروەها لە باکووری ئاوایی ڕێگایەکی ئامادە بۆ قیلەتاو ئاوایی قۆزلووجە دەگرێتەوە.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی ١٣٧٩/٢/١ کارەبای بۆ چووە، سیمکارتی مخابەراتی دێهات، قوتابخانەی سەرەتایی "خەیبەر" (کوڕانە ــ کچانە) دوو مزگەوت کە یەکیان کۆنەمزگەوتە و ئەوی دیکەیان ساڵی ١٣٨٢ی هەتاوی بە یارمەتی خەڵکی ئاوایی و وەستا "عەزیز خاڵدەلیل" نۆژەن کراوەتەوە. بۆ بنکەی تەندروستی سەر بە ئاوایی"قۆزلووجە"ن، نەوت و کەلوپەلی پێویستیش لە ئاوایی حەوڵاکوردە وەردەگرن.

ئاوی خڕەجۆ لوولەکێشیی بۆ کراوە و عەنباراویان بۆ داناوە کە ئاوی گشت ماڵەکان دابین ناکا هەر بۆیە لە کانیاوەکان کەلک وەردەگرن.

خوێندکاران بۆ درێژەدان بە خوێندن دەنێردرێنە خەلیفان و شاری مەهاباد و لەم بارەوە مافی کچەکان بەتەواوی نەپارێزراوە.

کاروپیشەی خەڵکی ئاوایی وەرزێری، ئاژەڵداری و تا ڕادەیەک باخدارییە، وەرزێران گەنم و جۆ دەچێنن و ئاژەڵەکانیان مەڕ، بزن و مانگان، هەروەها بەرهەمی باخەکان پێکهاتەیەکە لە سێو، قەیسی و گوێز. لە خڕەجۆ هێندێک دارسماق (ترش) هەیە کە خۆڕسکن و بەرهەمەکەی ئی خاوەن مەزراکانە، هەڵبەت بەشی ماڵەکانی تری ئاواییش دەدەن.

لە ڕێکەوتی ١٣٨٥/١/٣٠ی هەتاوی بە هۆی لافاوێک کە لە خڕەجۆ هات کەسێک بە ناوی "فەتاح محەممەدی" تەمەن ٤٨ ساڵ، گیانی لە دەست دا و زیانێکی زۆری ماڵی لە خەڵکی خڕەجۆ کەوت و گەنم و جۆی نێو ئەنباران ئاو بردنی. لە کاتی هاتنی لافاو، تەنیا خڕی بەردووکە بەربەندی ئاوخێزداری لێبوو کە نەیتوانی بەربەستێکی بەهێز بێت لە بەرانبەر لافاودا، هەر بۆیە لە ساڵی ١٣٨٥ی هەتاوی چەند بەربەندی ئاوخێزداری دیکەیان لێداوە. گرفتەکانی خەڵکی ئاوایی: نەبوونی بینایەکی باش بۆ قوتابخانە.

گۆڕستانی ئاوایی لە "خڕەلاسان" هەڵکەوتووە، تاقمێک لە خەڵکی ئاوایی مردووەکانیان لە گۆڕستانی ئاوایی قۆزلووجە بە خاک دەسپێرن.

## خورخورە

ئەم ئاوایییە لە ٣٢ کیلۆمیتری باکووری شاری مەهاباد، بەشی ناوەندی و دێهستانی موکریانی ڕۆژاوا و لە ناوچەی شارویران هەڵکەوتووە. لە 222 ماڵ و 1270 کەس پێکهاتووە، لەمانە 637 کەس پیاون و 633 کەسیش ژنن، ژمارەی خوێندەواران ٧٤٤ کەسە کە ٤٥٤ کەس پیاون و ٣٢٠ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٣٥٨ کەسی نەخوێندەوار ١١٠ کەس پیاون و ٢٤٨ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ٤٠٠٠ هێکتارە، لەمە ٤٦٣ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و ٣٥٣٧ هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.

خورخورە خاوەن ٢٧ هێکتار زەوی دێم، ٧٢٠ هێکتار زەوی بەراو، ١٣٠ هێکتار باخ، ٧٢ تراکتۆر و ١٨ لاوێردەیە.

بەرزایی ئاوایی لە ڕووکەشی زەریاکانەوە ١٢٥٠ میترە.

ئاوایییەکانی دەورووبەر:

باشوور: ئاوایییەکانی گاپیس و قجیئاوا

باکوور: ئاوایییەکانی گردیاقووب و کۆنەدێ

ڕۆژهەڵات: ئاوایی قەرەداغ

ڕۆژاوا: ئاوایی قەرەقشلاق

چیاکانی دەورووبەری ئاوایی:

باشوور: شاخی گردیاقووب

ڕۆژهەڵات: گردی نێواو و چاکەچکۆڵە

تالاوی کانی بەرازان لەم گوندە هەڵکەوتووە کە شوێنێکی سروشتی و سەیرانگایەکی سرنج ڕاکێشە، ئەم شوێنەوارە بەناوبانگە کە هەموو ساڵێ بە دەیان گەڕیدەی جیهانی و هەزاران گەڕیدەی وڵات سەردانی دەکەن، پانتایی 907 هێکتارە، ئەم تالاوە لە بەرزایی ١٢٧٥ میتری ڕووکەشی زەریاکان هەڵکەوتووە، گیاوگۆڵە گرینگەکانی ئەم تالاوە پێکهاتەیەکەن لە قامیش، بوریا، جەگەن، گەز و هتد. ئەو گیاندار و باڵندانەی لەم تالاوەدا دەژین بریتین لە: سوورەقورینگ، ڕەشبەشە، مراوی، مراوی خەنەیی، شاوە سوڵتانی، سێروو، قەلمراوی بچووک، کەڵکی سپی و هتد. تالاوی گەرووس و سروشتی شام دوو شوێنی دیکە لەم ئاوایییەن.

خانووبەرەکان لە خشت، بلووک و چیمەنتۆیە، هەڵبەت چەند کۆنەخانووبەرەیەکیش ماون کە بە بەرد و قوڕ ساز کراون، میچی ماڵەکان لە ئاسن و دارە، کۆڵانەکانی ئاوایی هێندێکیان نارێکن و هێندێک ڕاست و ڕێکن، هێندێک لە کۆڵانەکان قاناویان بۆ لێدراوە. زۆربەی هەرەزۆری ماڵەکان حەوشەیان هەیە و دەرگای گەورەیان تێگیراوە. گەڵاڵەی هادی ساڵی ١٣٧٨ی هەتاوی لەم ئاوایییە دەستی پێکردووە.

گردی نێواو (نێوئاو) بە ژمارەی تۆمارکراوی ١٦٦٠٤ی میراتی فەرهەنگی و لە بەرزایی ١٣١٢ لە ڕووکەشی زەریاکانەوە، لە خورخورە هەڵکەوتووە. مێژووی ئەم شوێنە دەگەڕێتەوە سەدەی ٤ تا ٦ی کۆچی مانگی.

لە باشوورەوە ڕێگایەکی قیلەتاو دەچێتەوە ئاوایییەکانی گاپیس و قجیئاوا، لە ڕۆژهەڵاتەوە ڕێگایەکی خاکی ئاوایی قەرەداغ دەگرێتەوە، لە ڕۆژاواش ڕێگایەکی قیلەتاو بۆ ئاوایییەکانی کۆنەدێ، گردیاقووب و قەرەقشلاق دەچێ.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی 1367/06/15 کارەباکەی هەڵکراوە، لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە (عەنباراو هەر لەم ئاوایییە دانراوە)، تەلەیفوونی ماڵ بە ماڵ، سیمکارتی مخابەراتی ئاوایی، قوتابخانەی سەرەتایی (کوڕانە ــ کچانە) بە ناوی "حاجی تاغی"، قوتابخانەی ناوەندی کچانەی "مەتین"، قوتابخانەی دواناوەندی "سەلمانی فارسی"، نانەوەخانە، مزگەوت کە نۆژەن کراوەتەوە، بنکەی تەندروستی، شەریکەی هاوبەشیی دابەشینی نەوت و کەلوپەلی پێویست و هەروەها ئاوایی خاوەن دێهیاری، شووڕای ئیسلامی و شووڕای چارەسەری کێشەکانە.

بۆ درێژەدان بە خوێندن قوتابیانی کچ و کوڕ بەبێ جیاوازی ڕەوانەی شاری مەهاباد دەبن.

ئاژەڵداری و وەرزێری کارویپیشەی سەرەکی خەڵکی ئاوایییە. هەڵبەت کەسانێک وەکوو دووکاندار، قەساب، دارتاش، بەرگدروو، جۆشکار و هتدیش لەم گوندە خەریکی کاروکاسپین. ئاژەڵەکان بریتین لە: مەڕ، مانگا و بزن، وەرزێران گەنم، جۆ، چەوەندەر و گوڵەپێغەمبەرە دەچێنن و بەرهەمی چەند باخی ئاوایی سێوە.

گرفتەکانی ئاوایی: ناخۆش بوونی ڕێگای خاکی کە مەوداکەی ١٠٠ میترێک دەبێ.

ئاوایی گۆڕستانێکی هەیە کە خەڵکی ئاوایی قەرەداغیش هەر کەلکی لێ وەردەگرن.

## خەتایی

خەتایی لە ٤١ کیلۆمیتری باکووری ڕۆژهەڵاتی مەهاباد، بەشی ناوەندی و دێهستانی موکریانی ڕۆژهەڵات و لە ناوچەی محاڵ هەڵکەوتووە. لە ٧٠ ماڵ و ٣٩٨ کەس پێکهاتووە، لەمانە ١٩٦ کەس پیاون و ٢٠٢ کەسیش ژنن، ژمارەی خوێندەواران ٢١٠ کەسە کە ١٢٦ کەس پیاون و ٨٤ کەسیش ژنن، لە ١٤٠ کەسی نەخوێندەوار ٤٤ کەس پیاون و ٩٦ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ٤٠٠٠ هێکتارە کە ٥٥٥ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و ٣٤٤٥ هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.

خەتایی خاوەن ٦٧٩ هێکتار زەوی دێم، ١٢٥ هێکتار زەوی بەراو، ٢٧ هێکتار باخ، ٤٥ تراکتۆر و ٢ لاوێردەیە.

بەرزایی ئاوایی ١٣٥٠ میتر لە ڕووکەشی زەریاکانە.

ئاواییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی باجەوەند

باکوور: ئاوایی سەوزی (سەر بە شاری میاندواو)

ڕۆژهەڵات: ئاوایی قەرەگۆل (سەر بە شاری بۆکان)

ڕۆژاوا: ئاوایی گردەڕەش

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باشوور: قەڵا کۆن، گردی قەرەوڵی باجەوەند

ڕۆژهەڵات: شێخ هەمزە

ڕۆژاوا: گردی باخی

سەرچاوەی خەتایی و گەرموک بە دوو کانیاوی ئاوایی ناسراون.

لە ساز کردنی خانووبەرەدا لەم ئاواییە زۆرتر قوڕ و بەرد و دار بۆ میچەکان دەکار کراوە، ئێستا لە خشت، بلوک و چیمەنتۆش کەلک وەردەگیرێ و بۆ داپۆشینی میچەکانیان لە جیاتی دار ئاسن دەکار دەکەن. ماڵەکان حەوشەیان هەیە، چۆمێک بە ناوەندی ئاواییدا دێ و ماڵەکان دەکاتە دوو بەش، کۆڵانەکان نارێک و بەرتەسکن.

سەبارەت بە ئەم ئاواییە بەساڵاچووان دەڵێن: زوو ئێرە شار بووە و ناوی "خەتا و خوتەن"بووە، پاشان ڕادەی دانیشتووانی کەم بۆتەوە و بۆتەوە ئاوایی.

لە باشووری دێ "گردی قەڵاکۆن" و "گردی قەڵای باخی" لە قەراغ ماڵان کە ئەشکەوتێکی لە سەرە، بە دوو شوێنەواری مێژوویی ناسراون.

لە باشووری دێ ڕێگایەکی خاکی ئاوایی باجەوەند دەگرێتەوە، لە باکوورەوە ڕێگایەکی قیلەتاو دەچێتەوە سەر جادەی مەهاباد ـ میاندواو، لە ڕۆژهەڵاتەوە ڕێگایەکی خاکی ئاواییەکانی قەرەگۆل، ئاتابلاغی دەگرێتەوە و لە ڕۆژاواش ڕێگایەکی خاکی دەچێتەوە ئاوایی گردەڕەش.

ئیمکاناتی ئاوایی: کارەبا، لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە کە عەنباراویان بۆ لێداوە و ئاوەکەی لە چاڵاو دابین دەبێ، سیمکارتی مخابەراتی دێهات، قوتابخانەی سەرەتایی (کوڕانە ـ کچانە) بە ناوی "ئەیووب"، مزگەوتێک بە ناوی "ئیمام حوسێن" کە لە خشت و چیمەنتۆ و ئاسنە. هەروەها خەتایی خاوەن دێهیاری، شووڕای ئیسلامی و شووڕای چارەسەری کێشەکانە. بۆ کاری بنکەی تەندروستی سەر بە ئاوایی "گردەڕەش"ن، نەوت لە ئاوایی قوڵقوڵە وەردەگرن و بۆ کەلوپەلی پێویستیش سەر بە شەریکەی هاوبەشیی"گۆکتەپە"ن.

قوتابیان بۆ درێژەدان بە خوێندن ڕێگای سەرچناری بۆکان یان شاری مەهاباد دەپێون.

کاروپیشەی خەڵکی ئاوایی لە وەرزێری، ئاژەڵداری، تا ڕادەیەکی کەم باخداری و کرێکاری پێکهاتووە، وەرزێران گەنم، جۆ، چەوەندەر و کۆلزا دەچێنن، ئاژەڵەکانیان مەڕ، بزن، مانگا و گامێشن، بەرهەمی زۆرتری باخەکان سێو و ترێیە. لەم ئاواییە بێستانیش دەکرێ کە بەرهەمەکەی زیاتر کاڵەک و شووتییە. هەروەها خەتایی خاوەن دوو کانگای بەردە کە خاوەنەکەی خەڵکی ئاوایی نین.

گرفتەکانی خەڵکی خەتایی بریتین لە: نەبوونی بنکەی تەندروستی سەربەخۆ، بەڕێوە نەچوونی گەڵاڵەی هادی.

ئەم گوندە چوار گۆڕستانی لێیە، یەکیان بە گۆڕستانی "سەوزی" ناسراوە و لە بەری باکوورە، گۆڕستانی "چاکەچکۆڵە"و گۆڕستانی نوێ لە ڕۆژهەڵات، گۆڕستانی قەدیمی لە ڕۆژاوا و لە لای حەوشەقووڵ هەڵکەوتووە.*

---

* هێندێک دەڵێن ئەم ئاواییە دەگەڵ ئاواییەکانی " گردەڕەش، ئازاد، قولقوڵە " محاڵن و هێندێکی تر لە خەڵکی ئاوایی لایان وایە بەشێکن لە شاروێرانی سەروو.

## خەلیفان

خەلیفان لە ٤٥ کیلۆمیتری باشووری ڕۆژهەڵاتی شاری مەهاباد، بەشی خەلیفان و دێهستانی کانی بازاڕ و لە ناوچەی مەنگوڕایەتی هەڵکەوتووە. لە ٧٧ ماڵ و ٤٢٥ کەس پێکهاتووە، لەمانە ٢٣٨ کەس پیاون و ١٨٦ کەسیش ژنن، ژمارەی خوێندەوارانی ئەم ئاواییە ٢٦٦ کەسە کە ١٧٢ کەس پیاون و ٩٤ کەسیش ژنن، هەروەها لە ١٠٨ کەسی نەخوێندەوار ٣٨ کەس پیاون و ٧٠ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ١١٠٠ هێکتارە، لەمە ٢٧٩ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و ٨٢١ هێکتار سەرچاوەی نەتەوەییە.

خەلیفان خاوەن ٣٥٠ هێکتار زەوی دێم، ٧٩ هێکتار زەوی بەراو، ١٧ هێکتار باخ و ٣٥ تراکتۆرە.

شارستانی مەهاباد خاوەن دوو بەشە کە خەلیفان بەشێکێتی و بەشەکەی دیکە بە ناوەندی ناسراوە.

بەشی خەلیفان خاوەن دوو دێهستانە، کانی بازاڕ (پانتایی ٦١٧،٩٤٧ کیلۆمیتری چوارگۆشە) بە ناوەندێتی "کیتکە"، ٤٤ ئاوایی لەخۆ دەگرێ کە یەکێکیان چۆل کراوە. دێهستانی مەنگوڕی ڕۆژهەڵات (پانتایی ٦٨٤،٠٩٧ کیلۆمیتری چوارگۆشەی) خاوەن ٧٢ ئاواییە کە ٤ ئاوایی چۆل کراوە؛ ناوەندی ئەم دێهستانە "حەولاکوردە"یە.

بەشی خەلیفان پانتایی ١،٣٠٢،٠٤٤ کیلۆمیتری چوارگۆشەیە.

بەرزایی ئاوایی لە رووکەشی زەریاکانە ١٥١٠ میترە.

ئاواییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاواییەکانی یەڵتەمر و کۆرەگێ

باکوور: ئاواییەکانی گۆلان و کانی میران

ڕۆژهەڵات: ئاواییەکانی قۆیتەڵ و شارەزوور

ڕۆژئاوا: ئاواییەکانی کیتکە و گوێچکەدەرێ

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باشوور: کەماجار

باکوور: قەڵاکۆن

ڕۆژهەڵات: نەزەرگە

کانی ڕۆستەم، کەرێزاو و کانی نێو دێ چەند کانیاوی بەناوبانگی ئاوایین.

زۆربەی ماڵەکانی خەلیفان لە بلووک، خشت، چیمەنتۆ و میچی ئاسن و دار سازکراون، هەڵبەت چەند کۆنەخانووشی هەر لێ ماوە، ئێستا خانووی لە قوڕ و بەرد ساز ناکەن. گەڵاڵەی هادی دەستی پێکردووە و کۆڵانەکانی ئاوایی ڕێک و ڕاست و جەدوەلکێشی کراون و قاناویان تێگیراوە، لە هەر دوو لای شەقامی سەرەکی ئاوایی، ئۆرگانەکانی دەوڵەتی و دووکان و ناوەندی خزمەتگوزارییەکانی هەڵکەوتووە.

لە فەرهەنگی "هەنبانەبۆرینە"دا هاتووە: (خەلیفە:١. ڕاسپاردەی شێخی تەریقەت لە بریکاری شێخ ٢. سەرۆکی مسوڵمانان / ل ٢٦٦، ئەستوونی دووهەم).

لە بەری باشوورەوە ڕێگایەکی خاکی ئاواییەکانی یەڵتەمر و گۆرەگێ دەگرێتەوە، لە باکوورەوە ڕێگایەکی خاکی دەچێتەوە ئاوایی شێخ یۆسف (گۆلان)، لە ڕۆژهەڵاتەوە ڕێگایەکی قیلەتاو دەچێتەوە ئاواییەکانی قۆیتەڵ و شارەزوور، لە ڕۆژئاواوە ڕێگایەکی قیلەتاو دەڕواتەوە ئاوایی میران و لەوێش بۆ سەرجادەی مەهاباد ــ سەردەشت.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی 1357/10/19 کارەبا هەڵکراوە، لولەکێشیی ئاوی خواردنەوە، ناوەندی پەروەردەی لاوان و مێرمناڵان (کانون شکوفایی)، شەریکەی هاوبەشیی نەوت و کەلوپەلی پێویست، تەلەیفوونی ماڵ بە ماڵ، پۆستبانک، سیمکارتی مخابەراتی ئاوایی، ئاکابیری، قوتابخانەی سەرەتایی سەید قوتب، قوتابخانەی ناوەندی "قانوون" کە ڕۆژێ دوو دان وانەی تێدا دەگوترێتەوە (دانێک کوڕانە و دانێک کچانە)، قوتابخانەی شەوانەڕۆژی دواناوەندی "کەشاوەرز" (بە گشتی بەشی خەلیفان هەر دوو دێهستانەکەی کانی بازاڕ و مەنگوڕی ڕۆژهەڵات قوتابی هەیە)، مزگەوتی "چوار یاری نەبی" (ساڵی١٣٨٣ نۆژەن کراوەتەوە)، باخچەی ساوایان، بنکەی تەندروستی، نانەوەخانە (دوو دانە).

هەروەها خەلیفان خاوەن ئەو بەڕێوەبەرایەتی و شوێنانەیە بۆ خزمەت گەیاندن بە خەڵک:

بەخشداری، دێهیاری، شوورای ئیسلامی، شوورای چارەسەریی کێشەکان، ناوەندی خزمەتگوزاریی وەرزێری، نوێنەرایەتی بیمەی کۆمەڵایەتی ئاوایی و

عەشیرەیی، بەڕێوەبەرایەتی مخابەرات، نوێنەرایەتی بەڕێوەبەرایەتی پۆست، بەڕێوەبەرایەتی دوخانییات، بەڕێوەبەرایەتی سەرچاوە سروشتییەکان، نوێنەرایەتی بەڕێوەبەرایەتی فێرگە و ڕاهێنان، سیلۆ، هێزی ئینتزامی، مەقەڕی بەسیج، هێزی سپای پاسداران.

ئاوی خەلیفان لە ئاوایی یەڵتەمر دابین دەبێ و بە هۆی کەم بوونی ئاو، جۆگەیەکیشیان لە ئاوایی شارەزوور بۆ هەڵبەستووە و تێکەڵ بە سەرچاوەی ئاوی خەلیفانیان کردۆتەوە.

بۆ درێژەدان بە خوێندن لە دوای پۆلی دواناوەندی و بەر لە چوون بۆ زانکۆ یان هونەرستان، قوتابیان بۆ شاری مەهاباد ڕەوانە دەکرێن و کوڕان و کچان هیچیان لەو مافە بێبەری نین.

سەرەکیترین کاروپیشەی خەڵکی ئەم گوندە ئاژەڵداری، وەرزێری و کرێکارییە. هەروەها لەم دێیە ٦ کارگەی بلووک بڕینی لێیە و بەشێکی زۆر لە خەڵک کاری ئازادیان هەیە. ئاژەڵەکانیان بریتین لە: مەڕ، مانگا و بزن، وەرزێران گەنم، جۆ و نۆک دەچینن، بەرهەمی باخەکانیشیان زیاتری هەر سێوە.

خەڵکی ئەم دێیە مردووەکانیان لە گۆڕستانی ئاوایی "یەڵتەمر" دەنێژن.

"قالە شین" و خوداڵێخۆشبوو "ئەحمەدی کاڕەسووی" دوو بەیتبێژی ناسراوی گەلەکەمان، خەڵکی ئەم گوندەن، هەروەها "محەممەد خەلیفانی" گۆرانیبێژی ناسراو خەڵکی ئەو ئاواییەیە بووە.

گرفتەکانی ئاوایی: داواکارن خەلیفان ببێتە شار، ئاوەدانی و خزمەت کردن بە دوو دێهستانی بێبەشی کانی بازاڕ و مەنگوڕی ڕۆژهەڵات بە پێویست دەزانن.

ڕێکەوتی ٨٩/١٠/٢٧ خەلیفان پلەی شاری درایە و لەو ڕێکەوتەوە بە شاری خەلیفان دەناسرێ.

## خەلیفە

لە 21 کیلۆمیتری ڕۆژاوای شاری مەهاباد، بەشی ناوەندی و دێهستانی موکریانی ڕۆژاوا و لە ناوچەی شاروێران هەڵکەوتووە. لە ٤ ماڵ و ٣٢ کەس پێکهاتووە، لەمانە ١٨ کەسیان پیاون و ١٤ کەسیش ژنن، لە ١٤ کەسی خوێندەوار لەم گوندە ٩ کەس پیاون و ٥ کەسیش ژنن، هەروەها لە ١٢ کەسی نەخوێندەوار ٤ کەس پیاون و ٨ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی 1800 هێکتارە، لەمە 114 هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و 1668 هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.

خەلیفە خاوەن ٧٠ هێکتار زەوی دێم، ٢٠ هێکتار زەوی بەراو، ١٥ هێکتار باخ و ١ تراکتۆرە.

ئاواییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی برایمە

باکوور: ئاوایی ماسوێ (سەر بە نەغەدە)

ڕۆژهەڵات: ئاوایی دێبۆکر

ڕۆژاوا: ئاوایی سەیداوا (سەر بە پیرانشار)

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باشوور: بەردی سەرمێرگان

باکوور: مام بایزبەگ

ڕۆژهەڵات: قەڵاتەسوور

ڕۆژاوا: سەری مەیدان و جغانتو

لە ڕۆژاوای دێ ئەشکەوتی سپیلکان هەڵکەوتووە.

کانی سپی، کانی ماینان، گۆلی مەنگە شیلاناوێ و کانی حرووسان (هەڵکەوتوو لە مەزرای چوارگوڵ) کانیاوە بەناوبانگەکانی ئاوایین.

سەیرانگای "سەری مەیدان" وەک شوێنێکی دڵڕفێن لەو گوندە هەڵکەوتووە و لایەنگرانی سروشت و کەژەوانان بەتایبەت لە وەرزەکانی بەهار و هاویندا ڕووی تێدەکەن.

خانووبەرەکان بە گشتی لە قوڕ و بەرد و میچی دار ساز کراون، ماڵەکان هەوراز هەڵکەوتوون و بە گشتی ڕوویان لە باشوورە، بە هۆی کەم بوونی ماڵەکان لە ئاواییدا کۆڵانێک لە ئارادا نییە. خەڵکەکەی دەڵێن زەمانی حرووسان لەم گوندە قاوەخانەیەک بە ناوی "مەنگەنە"هەبووە.

"خەلیفە" لە سەر جادەی قیلەتاوی مەهاباد ـ پەسوێ هەڵکەوتووە و دەبێتە دوایین ئاوایی سەر جادە شاری مەهاباد.

ساڵانی پێشوو ئەم دێیە زۆر ئاوەدانتر بووە، بەڵام لە سەرەتای زستانی 1360ی هەتاوی، لە زستانێکی سارد و سەخڵەتدا بە هۆی نائەمنی ناوچەکە خەڵک ئاوارەی گوندەکانی دەوروبەر و شارەکانی پیرانشار و مەهاباد بوون و ئاوایی خەلیفە بە تەواوی چۆڵ کرا، ئەم چۆڵکرانە 21 ساڵی خایاند و لە ئاکامدا ساڵی1381ی هەتاوی هێندێک خەڵک گەڕاونەوە و ئەم دێیەیان ئاوەدان کردووەتەوە، هەر ئەم چۆڵکرانە بوو بە هۆی بێبەش بوون لە زۆربەی ئیمکانات.

ئیمکاناتی ئاوایی: زستانی ساڵی1387هـ کارەبای بۆ چووە، دەفتەری مخابەراتی، سیمکارتی مخابەراتی دێهات. بۆ کەلک وەرگرتن لە بنکەی تەندروستی و وەرگرتنی نەوت سەر بە ئاوایی"دێبۆکر"ن، بۆ کەلوپەلی پێویستیش سەر بە شەریکەی هاوبەشیی شاری مەهاباد لە گەڕەکی "پشتتەپ"ن.

ئاوی ئەم دێیە لوولەکێشیی بۆ نەکراوە و لە کانیاو و چاڵاو کەلک وەردەگرن.

خوێندکارانی ئاوایی بۆ خوێندنی سەرەتایی دەبێ ڕەوانەی ئاواییەکانی کەوتەر، پەسوێ (سەر بە پیرانشار) یا شاری مەهاباد بن کەچی کچان بە تەواوی لە خوێندن بێ بەشن.

وەرزێری و ئاژەڵداری کارو پیشەی خەڵکی خەلیفەن، هەڵبەت تا ڕادەیەکی نە زۆر بەرچاویش باخداری دەکەن و باخەکانیان ساوان و دارسێو، گوێز و بادامیان چەقاندوون. وەرزێران گەنم و جۆ دەچێنن و ئاژەڵەکانیان بریتین لە: مەڕ، مانگا و بزن.

ئەم دێیە یەکێکە لە بێبەشترین دێیەکانی شاری مەهاباد، هەر بۆیە گرفتەکانی لە ئەژمار نایەن، بەڵام چەند گرفتێکی بنەڕەتی ئەم ئاواییە بریتین لە: نەبوونی قوتابخانەیەکی سەرەتایی، نەبوونی مزگەوت، نەبوونی بنکەی تەندروستی سەربەخۆ، نیاز بە لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە، پێویستی بە ساز کردنەوەی خانووبەرەکانیان لە لایەن دەسەڵاتەوە. گۆڕستانی ئاوایی لە بەری باشووری گوندەکە هەڵکەوتووە، لە مەزرای شیلاناوێ لە ئاوایی خەلیفە کۆنەگۆڕستانێک دێتە بەرچاو.

## دارەلەک

دارەلەک لە ٢٠ کیلۆمیتری باکووری شاری مەهاباد، بەشی ناوەندی و دێهستانی موکریانی ڕۆژاوا و لە ناوچەی شاروێران هەڵکەوتووە. لە ٢٦٢ ماڵ و ١٤٥٤ کەس پێکهاتووە، لەمانە ٧٢٥ کەس پیاون و ٧٢٩ کەسیش ژنن، لە ٩٣٢ کەسی خوێندەوار ٥٢٣ کەس پیاون و ٤٠٩ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٣٥٢ کەسی نەخوێندەوار ١٢٠ کەس پیاون و ٢٣٢ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ١٩٥٠ هێکتارە، لەمە ٩٦٦ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و ٩٨٤ هێکتار پاوان و لەوەرگەی دێیە.

دارەلەک خاوەن ٦٠٠ هێکتار زەوی دێم، ٧٣١ هێکتار زەوی بەراو، ١٥٧ هێکتار باخ، ٦٣ تراکتۆر و ١٦ لاوێردەیە.

بەرزایی ئاوایی لە ڕووکەشی زەریاکانە ١٢٧٥ میترە.

ئاواییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی قوومقەڵا

باکوور: ئاوایی قزڵقۆپی

ڕۆژهەڵات: ئاوایی لەج

ڕۆژاوا: ئاوایی گولێ

ئەم دێیە لە دەشتاییە، تەنیا لە بەری باکوورەوە کێوێک دێتە بەرچاو کە هێندە بەرز نییە و ناوی "مەلا زەند"ە.

دارەلەک زۆرتر ڕووخساری شاری بەخۆوە گرتووە، بیناکانی کە لە قوڕ و بەردن زۆربەیان بە خشت و چیمەنتۆ نۆژەن دەکرێنەوە، میچەکانیان بە دار داپۆشراون کە بەرەبەرە خەریکن دەبن بە ئاسن، کۆڵانەکان ڕێک و ڕاستن و قاناویان بۆ داناون، گشت ماڵەکان حەوشەیان هەیە.

خەڵکی ئاوایی دەڵێن سەرەتای ئاوەدان کردنەوەی ئەم گوندە ـ کە ڕوون نییە چەند ساڵ بەر لە ئێستایە ــ یەک ماڵی "لەک"ی لێبووە ـ لەک بەشێکن لە ڕەگەزی کورد، بەڵام هێندێکی دیکە دەڵێن "دارەلەک" ناوێکی کوردییە لە "دار" بە مانای درەخت و "لەک" کە لە زۆر شوێنان وەک پاشگر و نیشانەی بچووک دێتە ئەژمار کە واتا مانای دارێکی بچووک دەدا. "تەپەی گردخۆلینە"بە ژمارەی تۆمارکراوی ١٦٦٢٣ لە میراتی فەرهەنگی، بە بەرزایی ١٣٢٥ لە پانتایی زەریاکان، دەگەڕێتەوە بۆ هەزارەی هەوەڵی بەر لە زایین.

لە بەری باشووری دارەلەک ڕێگایەکی خاکی ئاوایی "قوومقەڵا" دەگرێتەوە، لە باکوورەوە ڕێگایەکی قیلەتاو دەچێتەوە ئاواییەکانی حاجیخۆش، قجیئاوا و قزڵقۆپی، لە ڕۆژهەڵاتەوە ڕێگایەکی خاکی دەچێتەوە لای ئاواییەکانی لەج و حاجیئاوا، لە ڕۆژاواشەوە کەمەربەندیی سێڕای دارەلەک و ڕێگای مەهاباد ــ ورمێ هەڵکەوتووە.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی ١٣٥٧/١٠/١٩ کارەباکەی هەڵکراوە، لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە کە سەرچاوەکەی ئاوایی خانەگێیە، ناوەندی مخابەرات، پۆستبانک، تەلەیفوونی ماڵ بە ماڵ، سیمکارتی مخابەراتی دێهات، بنکەی تەندوستی، شەریکەی هاوبەشیی دابەشینی نەوت و کەلوپەلی پێویست، قوتابخانەی سەرەتایی "بەهەشت" و "ئیسلام"(کوڕانە ــ کچانە)، قوتابخانەی ناوەندی "شەهید ئەمینی"(کوڕانە ــ کچانە)، قوتابخانەی دواناوەندیی کچانە کە هەر لە بینای بەشی ناوەندیدا وانە دەخوێنن، ئاکابیری، باخچەی ساوایانی ئاوایی، مزگەوت بە ناوی "خزر خزرزادە" کە ساڵی ١٣٨١ی هەتاوی نۆژەن کراوەتەوە، نانەوەخانە، دوو هێڵی ڕاگواستن، دوو ساردخانە (کەرتی تایبەتی). ئەم دێیە خاوەن دێهیاری، شووڕای ئیسلامی، شووڕای چارەسەری کێشەکان، پادگانی ئیمام سەجاد، پاسگای هێزی ئینتزامی و ئیستی بازرەسی.

بۆ درێژەدان بە خوێندن هیچ جیاوازییەک لە نێوان کوڕان و کچاندا نییە و دەتوان لە قوتابخانەکانی مەهاباد درێژە بە خوێندنیان بدەن.

وەرزێری، ئاژەڵداری، باخداری، کرێکاری و هێندێ کاری جۆراوجۆری وەکوو دوکانداری، کاروپیشەی خەڵکەکەی پێکهێناوە. وەرزێران، گەنم، جۆ، وێنجە و چەوەندەر دەچێنن و زۆربەی ئاژەڵەکاین ئەم دێیە مەڕن و بزن و تا ڕادەیەکیش مانگا ڕادەگرن. زۆرترین بەرهەمی باخەکان سێو و ترێیە.

گرفتەکانی خەڵکی دارەلەک: بە تەواوی بەرێوەنەچوونی گەڵاڵەی هادی، گرفتی کەم بوونی ئاو بۆ ئاوداشتن، پێویستی بە نانەوەخانەیەکی دیکەیە، نەبوونی قوتابخانەی دواناوەندی بۆ کوڕان، مەترسیی ڕووخانی بینای قوتابخانەی ناوەندی و دواناوەندی.

دوو گۆڕستانی ئەم دێیە لە بەری باکوور هەڵکەوتوون، گۆڕستانی "چاکە چکۆلە" کە تایبەت بە منداڵانە و گۆڕستانی"مەلا زەند" کە گشتییە.

## داشتەمر

ئەم ئاوایییە لە ٥ کیلۆمیتری باشووری ڕۆژاوای شاری مەهاباد، بەشی ناوەندی و دێهستانی موکریانی ڕۆژاوا و لە ناوچەی مەنگوڕایەتی هەڵکەوتووە. لە ١٤ ماڵ و ٨٤ کەس پێکهاتووە، لەمانە ٤٥ کەس پیاون و ٣٩ کەسیش ژنن، ژمارەی خوێندەوارانی ئەم ئاوایییە ٤٩ کەسە کە ٢٩ کەس پیاون و ٢٠ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٢٦ کەسی نەخوێندەوار ١٠ کەس پیاون و ١٦ کەسیش ژنن.
پانتایی ئاوایی ٢٥٨٠/٥ هێکتارە، لەمە ١٠/٥ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و ٢٥٠٠ هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.
داشتەمر خاوەن ٣١١/٦ هێکتار زەوی دێم، ٢٧ هێکتار زەوی بەراو، ١٣/٧٥ هێکتار باخ، ١١ تراکتۆر و ٤ لاوێردەیە.
بەرزایی ئاوایی لە ڕووکەشی زەریاکانە ١٣٧٥ میترە.

ئاوایییەکانی دەوروبەر:
باشوور: شاری مەهاباد
باکوور: ئاوایی قازیاوا و بەشێک لە ئاوبەندی مەهاباد
ڕۆژهەڵات: ئاوایی هەمزاوا و بەشیک لە ئاوبەندی مەهاباد
ڕۆژاوا: ئاوایی کەوتەر

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:
باشوور: بەردەسووران
باکوور: کێوی نوورەددین کە دەکەوێتە ئەو بەری ئاوبەند لە لای قازیاوا
ڕۆژهەڵات: شاخەڕووخاو
ڕۆژاوا: کۆڵبیل

هەروەها کانیاوەکان بە کوڵبیل، قشلاق و حەیزاوا ناسراون. لە ڕۆژاوای دێ ئەشکەوتێکی بچووک بە ناوی "کۆڵبیل" هەڵکەوتووە.
خانووبەرەکانی ئەم دێیە زۆرتریان هەر لە قوڕ و بەردن و میچەکانیان بە دار داپۆشراوە و خشت و بلووک زۆر کەم دەکار کراوە، ماڵەکان بەرەو هەوراز هەڵکەوتوون، گشتیان حەوشەیان هەیە و ڕوو بە ڕۆژهەڵاتن.
سەبارەت بە مێژووی ئەم ئاوایییە دەبێ بڵێین کە "داشتەمر"ی پێشوو وێڕای چەند ئاوایییەکەی دیکە وەکوو "هەمزاوا" وەبن ئاوبەندی مەهاباد کەوتن و بەشیک لە خەڵک ڕوویان لەم شوێنە کرد و دەوروبەریساڵی ١٣٤٧ی هەتاوی ئاوەدانیان کردۆتەوە.
سەبارەت بە ناوی ئاوایی خەڵکەکەی دەڵێن "داش" بە مانای بەردە و "تەمر" لە تەیموور کە ناوێ کەسێکە وەرگیراوە. هێندێک خەڵک لە سەر ئەو باوەڕەن کاتێک "تەیمووری لەنگ" ڕووی کردە ئەم مەڵبەندە، لە قەراغ ئاوایی لە سەر بەردێک دانیشتووە و هەر لەو دەمەوە بەو ئاوایییەیان گوتووە "داشتەمر".
لە بەری ڕۆژهەڵاتی دێ، ڕێگایەکی ئاوی بە سەر ئاوبەندی مەهاباد دەچێتەوە سەر جادەی مەهاباد ـ سەردەشت کە بە لۆتکە لێی دەپەڕنەوە.
لە بەری باشوورەوە ڕێگایەکی خاکی دەوری ئاوبەند لێدەداتەوە و دێتەوە سەر جادەی مەهاباد ـ سەردەشت (نزیک ئاوایی هەمزاوا).
ئیمکاناتی ئاوایی: کارەبا، شێرەی ئاوی گشتی، بنکەی مخابەرات، مزگەوت کە ساڵی ١٣٧٨ی هەتاوی نۆژەن کراوەتەوە. بۆ بنکەی تەندروستی سەر بە ئاوایی "هەمزاوا"ن، نەوت و کەلوپەلی پێویست لە شەریکەی هاوبەشیی "پشتتەپ"ی مەهاباد وەردەگرن. مەیدانی تیر و مانۆری لەشکری ٦٤ ورمێ بە پانتایی ٦١/٤٥ لەم ئاوایییە. ئەم گوندە قوتابخانەی سەرەتایی هەیە، بەڵام بە هۆی ناخۆش بوونی ڕێگا، مامۆستای قوتابخانەیان نییە، هەر بۆیە دەبێ بچنە شوێنەکانی دیکە بەتایبەت لە شاری مەهاباد بخوێنن. بەختەوەرانە کوڕ و کچ بۆیان هەیە درێژە بە خوێندن بدەن.
ئاوی دێ بۆ گشت ماڵەکان ڕانەکێشراوە و تەنیا شێرەیەکی گشتیان هەیە کە ئاوەکەی لە کانی "کۆڵبیل" دابین دەبێ.
کار و پیشەی خەڵکی ئاوایی وەرزێری، ئاژەڵداری و باخدارییە، وەرزێران گەنم، جۆ، وێنجە و نۆک دەچێنن و ئاژەڵەکان لە مەڕ، بزن و مانگا پێکهاتوون، هەروەها سێو و قەیسی بەرهەمی باخەکانیانن.
گرفتەکانی خەڵکی داشتەمر: گەورەترین گرفتیان هاتووچۆیە کە دەبێ بە لۆتکە بپەڕنەوە و ئەوەش بۆخۆی جێی مەترسییە و لە وەرزی بارین و سەرما گرفتی جیدی بۆ خەڵکەکە هەیە، ڕێگای دوور و ناخۆش، نیاز بە لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە بۆ گشت ماڵەکان، نەبوونی قوتابخانە و شووڕای ئیسلامی. گۆڕستانی ئاوایی لە بەری باشوورە کە بە "قەبری سەیزادە" ناسراوە.

## داشخانه

داشخانه له ۳۷ کیلۆمیتری باکووری شاری مەهاباد، بەشی ناوەندی و دێهستانی موکریانی ڕۆژاوا و له ناوچەی شارویٚران هەڵکەتووه. له ٥٥ ماڵ و ۳٥۰ کەس پێکهاتووه، لەمانه ۱۷٥ کەسیان پیاون و ۱۷٥ کەسیش ژنن، له ۱۸۱ کەسی خوێندەوار ۱۰۷ کەسیان پیاون و ۷٤ کەسیش ژنن، هەروەها له ۱۳۳ کەسی نەخوێندەوار ٤۹ کەسیان پیاون و ۸٤ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ٦۱۰ هێکتاره، لەمه ۲۷٤ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوه و ۳۳٦ هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیه.

داشخانه خاوەن ۲۹۱ هێکتار زەوی بەراو، ۸ هێکتار باخ، ۱٤ تراکتۆر و ۸ لاوێردەیه.

ئاواییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاواییەکانی قەرەقشڵاق، کۆنەدێ و گردیاقووب

باکوور: شام و بەحری ورمێ

ڕۆژهەڵات: ئاواییەکانی بەفرەوان و قوڵەسەن (سەر بە میاندواو) و خوڕخوڕه

ڕۆژاوا: ئاوایی گردەقیت (سەر بە نەغەده)

ئەم ئاواییه له دەشتایی هەڵکەوتووه. وەکوو ئاسەواری سروشتی دەتوانین ئاماژه به "شام" بکەین که هەر له نزیکی دێیه.

له داشخانه کەلک وەرگرتن له قوڕ و بەرد بۆ خانوو چێکردن به گشتی کۆتایی پێهاتووه، ئێستا له بەردێکی سپی چوار گۆشه و داتاشراو کەلک وەردەگرن و چیمەنتۆ بەکار دێنن، میچی ماڵەکان له ئاسن یان داره، زۆربەی ماڵەکان حەوشەیان نییه و پەڕژینیان لێداوه، کۆڵانەکان هێندێکیان ڕێک و هێندێک نارێکن و بەرەو هەر چوار لا خانوو ساز کراوه.

سەبارەت به مێژووی داشخانه خەڵک ڕایان وایه نزیک به ٦۰ ساڵ لەمەوبەر یەکێک له ئاغاکان به ناوی "عەزیزئاغای عەزیزی" خەڵکی ئاوایی "خەلیفەلیان" سەر به شاری نەغەده، ئەم دێیەی ئاوەدان کردووەتەوه. ئەو سەردەمی داشخانه زەوی چاکی بۆ کشتوکاڵ و وەرزێری هەبووه و هۆی ئاوەدان بوونەوەشی هەر ئەوه بووه. سەبارەت به ناوی داشخانه، بەساڵاچووانی ئەم دێیه دەڵێن ساڵگارێک بەر له ئێستا هێندێک تورک (ئازەری) هاتبوون و لەم دێیه حەسیر و شتی دیکەیان له قامیش ساز دەکردن، چەند بەردێکیان هێنابوو تا ئەو قامیشانەی پێ بشکێنن، ئەم بەردانه وەکوو قەنەک و گرێل وابوون، تورکەکان بەم بەردانەیان دەگوت "داش" که له زمانی تورکیدا به مانای "بەرد"ه و هەر بەو هۆیه ناوی ئەم ئاواییه بوو به "داشتەمر".

له بەری باشووری دێ ڕێگایەکی خاکی دەچێتەوه ئاوایی "مێمەند" سەر به شاری نەغەده، له باشووری ڕۆژاوا ڕێگایەکی قیلەتاو ئاواییەکانی کۆنەدێ و گردیاقووب دەگرێتەوه.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی ۱۳۷۲/۷/٥ کارەباکەی هەڵکراوه، لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوه، سیمکارتی مخابەراتی دێهات، قوتابخانەی سەرەتایی (کوڕانه ـ کچانه) به ناوی "مهاجر"، مزگەوتێک به ناوی "حەزرەتی عومەر" که ساڵی ۱۳٦٦ی هەتاوی ساز کراوه، نانەوەخانه، هەروەها داشخانه خاوەن دێهیاری و شووڕای ئیسلامییه. بۆ بنکەی تەندروستی سەر به ئاوایی "خوڕخوڕه"ن و نەوت و کەلوپەلی پێویست له شەریکەی هاوبەشیی ئاوایی "قەرەقشڵاق" وەردەگرن.

خوێندکاران بۆ درێژه پێدان به خوێندن دەچنه ئاوایی خوڕخوڕه و شاری مەهاباد، ئەو قوتابییانەی درێژه به خوێندن دەدەن زیاتریان کوڕن.

ئاژەڵداری، وەرزێری و کرێکاری کاروپیشەی خەڵکی ئەم گوندەن، ئاژەڵەکانیان مەڕ، بزن، مانگا و گامێشه. بەرهەمی وەرزێرەکانیش گەنم، جۆ و تا ڕادەیەکیش چەوەندەره.

گرفتەکانی خەڵکی ئاوایی: کەم بوونی ئاوی خواردنەوه، کشتوکاڵ و نەبوونی بنکەی تەندروستیی سەربەخۆ.

خەڵکی ئاوایی مردووکانیان له گۆڕستانی "شەبەک" که له زەوییەکانی ئاوایی قەرەداغه، دەنێژن. ساڵی ۱۳۷٤ی هەتاوی ئاوەکەی بەحری ورمێ هەڵکشا و ئاو هاته نێو ئاوایی و له دواییدا که ئاوەکه کشاوه شۆرەکاتی له پاش خۆی بەجێ هێشت و زەرەدێکی زۆری له وەرزێران دا. "شۆڕه" و "سڵمۆکه" دوو گیا و ڕەوکن که لەم ئاواییه دەڕوێن و بۆ خواردن و بەتایبەت بۆ نێو دۆکڵیو وەکوو کەنگر کەلکی لێ وەردەگرن.

## داغه

داغه له ٢٣ کیلۆمیتری باشووری ڕۆژاوای شاری مه‌هاباد، بەشی خەلیفان و دێهستانی مەنگوڕی ڕۆژهەڵات و له ناوچەی مەنگوڕایەتی هەڵکەوتووه. له ٧ ماڵ و ٣٠ کەس پێکهاتووه، لەمانه ١٧ کەس پیاون و ١٣ کەسیش ژنن، له ١٣ کەسی خوێندەوار ٧ کەسیان پیاون و ٦ کەسیش ژنن، هەروەها له ١٤ کەسی نەخوێندەوار ٧ کەسیان پیاون و٧ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ٣٥٠٤ هێکتاره، لەمه ٩٧ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوه و ٣٤٠٧هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیه.

داغه خاوەن ٢٨ هێکتار زەوی دێم، ٦ هێکتار زەوی بەراو و ٢/٤١ هێکتار باخه.

ئاواییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاواییەکانی مەزرا و کەڵەدنداوا

باکوور: ئاوایی پەڵکێ

ڕۆژهەڵات: ئاواییەکانی سیاقوڵی سەرێ و قاوەخانه

ڕۆژاوا: ئاوایی سێلم

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باکوور: تەسلوو

ڕۆژهەڵات: گڵەسپی

ڕۆژاوا: مەدەد

له بەری باشووری ئاوایی ئەشکەوتێکی بچووک هەڵکەوتووه که به ئەشکەوتی داغه ناسراوه.

کانیاوەکانی بریتین له: هەوار، بناو و تەسلوو.

خانووبەرەکانی ئەم گونده له قوڕ و بەرد و میچەکانیان له داره، هیچ کام له ماڵەکان حەوشەیان نییه و به گشتی ڕوویان له باشووره.

له باشووری ئەم دێیه شوێنێکی مێژوویی به ناوی "قەڵاتی کێلەشین" هەیه که بەداخەوه چەند جار له لایەن کەسانێکەوه دەستدرێژی کراوەتە سەر. سەبارەت به ناودێر کردنی ئاوایی هیچ ئاگادارییەکمان دەست نەکەوت، بەڵام هیچ دوور نییه شوێنێک بووبێ بۆ چزاندن و داغ کردنی ئاژەڵەکان بۆ ئەوی هەر ماڵێک ئاژەڵەکانی خۆی بناسێتەوه و لێیان نەگۆڕێن، هەروەها "داغه" چەند مانایەکی دیکەش هەیه: "داغه" جۆرێک هەڵپەڕکێی کوردییه و به خەم و پەژارەش مانا کراوەتەوه.

له باشووری دێ ڕێگایەکی خاکی به مەودای دوو کیلۆمیتر دەگەڵ جادەی خاکی ئەو دۆڵه تێکەڵ دەبێتەوه، له باشووری داغه یانی له ڕۆژاوای ئاوایی مەزرا و له ڕۆژهەڵاتی ئاوایی کەڵەدنداوا، ڕێگایەک بەرەو باشوور دەڕوا و دۆڵی زێوه دەگرێتەوه، باریکەڕێیەک دەڕوا بۆ باگردان له بەری ڕۆژاوا.

ئیمکاناتی ئاوایی: ساڵی ١٣٨٤ کارەباکەی هەڵکراوه، سیمکارتی مخابەراتی دێهات، قوتابخانەی سەرەتایی (کوڕانه ــ کچانه) به ناوی "زمزم". ئەم دێیه لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوەی نییه و له وەرزه کەمئاوەکانیشدا ناچارن به تراکتۆر له مەزراکانیان ئاو بێنن، بۆ بنکەی تەندروستی و وەرگرتنی نەوت و کەلوپەلی پێویست سەر به ئاوایی "سیاقوڵی خوارێ"ن.

زۆر کەم وا هەیه له ئاوایی داغه خوێندکاران له دوای پۆلی سەرەتایی بتوانن درێژه به خوێندن بدەن.

کاروپیشەی خەڵکی داغه له وەرزێری و کرێکاری پێکهاتووه، وەرزێران گەنم و جۆ دەچێنن، ئاژەڵەکانیان مانگان، هەروەها لەو چەند ساڵەی دواییدا پیشەداریان لێداون که سێو و گوێزن.

گرفتەکانی خەڵکی داغه: نەبوونی لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوه، نەبوونی مزگەوت و بینایەکی باش بۆ قوتابخانه، هەژاری و دەستەنگی خەڵکی ئاوایی.

گۆڕستانەکەی له باشووری داغه هەڵکەوتووه، هەروەها له گۆڕستانی ئاوایی "سێلم" کەلک وەردەگرن.

## دریاز (دریاس)

دریاز لە ١٢ کیلۆمیتری باکووری شاری مەهاباد، بەشی ناوەندی و دێهستانی موکریـانی ڕۆژاوا و لـە ناوچـەی شـارویران هەڵکـەوتووە. لـە ٣٠٠ مـاڵ و ١٦٠٥ کەس پێکهاتووە، لەمانە ٧٨٩ کەسیان پیـاون و ٨١٦ کەسـیش ژنـن، لـە ١٠١٤ کەسـی خوێنـدەوار ٥٧٥ کـەس پیـاون و ٤٣٩ کەسـیش ژنـن، هەروەها لە ٣٩٨ کەسی نەخوێندەوار ١٢٨ کەسیان پیاون و ٢٧٠ کەسیش ژنن.
پانتایی ئاوایی ١٩٠٧ هێکتارە، لەمە ٩٩٢ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و ٩١٥ هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.
دریاز خاوەن ٥٠٠ هێکتار زەوی دێم، ٥٩١ هێکتار زەوی بەراو، ١٨٨/٥ هێکتار باخ، ٥٦ تراکتۆر، ٢١ لاوێردە و ٢ کۆمباینە.
بەرزایی ئاوایی لە ڕووکەشی زەریاکانەوە ١٣٥٠ میترە.

ئاوایییەکانی دەوروبەر:
باشوور: ئاوایی ئسووکەند
باکوور: ئاوایی توتاغاج
ڕۆژهەڵات: ئاوایی قووموقەڵا
ڕۆژاوا: ئاوایی دارەلەک

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:
باکوور: شاخەسپی
ڕۆژاوا: کێوی تەقتەقان

"پیرمکائیل" و "چەڵەغان" دوو کانیاوی ئاواییـن، ئاوی خواردنەوەی دێ لە کانیاوی "چەڵەغان" دابین دەبێ و عەنباراویان بۆ لێداوە.
دریاز هەر وەکوو شار وایە، کۆڵانەکان ڕاستن و قاناویان تێگیراوە، ماڵەکان زۆرتریـان لـە کەرەسـە نوێیـەکان وەکـوو خشـت، چیمـەنتۆ و ئاسـن سـاز کراون و خاوەن حەوشە و دەرگان. گەڵاڵەی هادی ساڵی ١٣٨٥ی هەتاوی لەم گوندە دەستی پێکردووە.
ئاوایی دریاز مێژوویەکی دووروودرێژی هەیە، وەکوو لێکۆڵەران و مێژووناسان ئاماژەیـان کـردووە تـەپکی گـردی دریـاز دەگەڕێتـەوە پـێش مێـژوو، ئـەم تەپکە لە بەرزایی ١٣٤٢ میتری ڕووکەشی زەریاکانە بە ژمارەی تۆمارکراوی ٦٠٨ لە میراتی فەرهەنگی.
هەروەها ئەشکەوتی دریاز و زیارەتگای شێخ مراد و پیرمکائیل لە دریاز مێژوویین.
لە باشووری دێ ڕێگایەکی خاکی ئاوایی ئسووکەند دەگرێتەوە، لە باکوورەوە ڕێگایەکی خاکی دەچێتەوە ئـاوایی توتاغـاج، لـە ڕۆژهەڵاتـەوە ڕێگایـەکی قیلەتاو بە مەودای یەک کیلۆمیتر دەڕواتەوە سەر جادەی مەهاباد ـ ورمێ، لە بەری ڕۆژاواش ڕێگای مەزراکان دیارن.
ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی ١٣٥٦/٩/٢٨ کارەباکەی هەڵکراوە، لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە کە لە کـانی چەڵـەغان دابـین دەبـێ و عـەنباراویان بـۆ داناوە، قوتابخانەی سەرەتایی و ناوەندی کوڕانە بە ناوی "شکوە" و "ئینقلاب"، قوتابخانـەی سـەرەتایی و ناوەنـدیی کچانـە بـە نـاوی "فەرهـەنگ" و "ئیستقلال"، باخچەی ساوایانی ئاوایی، ئاکابیری، مزگەوتی"محەممەدڕەسووڵڵا" (د.خ) کە ساڵی ١٣٨٦ی هەتاوی بە یارمەتی خەڵک نۆژەن کراوەتەوە، تەلەیفوونی ماڵ بە ماڵ، سیمکارتی مخابـەراتی دێهات، پۆسـتبانـک، ناوەنـدی خزمـەتگوزاریی وەرزێـری، شـەریکەی هاوبەشـیی نـەوت و کـەلوپـەلی پێویست، حامیلی چیمەنتۆ، بنکەی تەندروستی، دەرمانگا، هۆڵی وەرزیشی (کوڕانە و کچانە)، ناوەندی کۆ کردنەوەی شـیر، دوو جووجەخانـە (کـەرتی تایبـەتی)، یـەک گاوداری (کـەرتی تایبـەتی)، بلـووک بـڕین (کـەرتی تایبـەتی)، دوو نانـەوەخانـە (کـەرتی تایبـەتی)، کارخانـەی جوجەکێشـی (کەرتی تایبەتی)، کانگای بەرد (کەرتی تایبەتی)، دوو هێڵی ڕاگواستن، سیستێمی کـۆ کردنـەوەی زبـڵوزاڵ، وێسـتگەی نـاردنی شـەپۆلی ڕادیویی (لـە لایـەن دەنگ و ڕەنگی مەهاباد دانراوە) و هەروەها دریاز خاوەن دێهیاری، شووڕای ئیسلامی، شووڕای چارەسەری کێشە و مەقەڕی بەسیجە.
لە دریاز شارۆچکەیەکی گوڵخانەیی لە ساڵی ١٣٨٨ی هەتاوی ساز کراوە کە لە زەوییەک بە پانتایی ٣٠ هێکتار لە ٢٩ هۆڵی گوڵخانەیی‌دایە.
بۆ درێژەدان بە خوێندن خوێندکاران ڕەوانەی شاری مەهاباد دەبن.
وەرزێری، ئاژەڵداری، باخداری، کرێکاری، شۆفیری و ماشێنداری بەتایبەت ماشێنی گەورە، کارویپشەی خـەڵکی ئـەو گونـدەن. وەرزێـران گـەنم، جۆ،

نۆک، گوڵەبەڕۆژە، وێنجە و چەوەندەر دەچێنن، زۆربەی ئاژەڵدارەکان مەڕدارن، هەروەها خەڵکی ئەم ئاواییە بزن، گامێش و مانگاش ڕادەگرن.
بەرهەمی باخەکانیش پێکهاتەیەکەن لە سێو، ترێ و قەیسی.
گرفتەکانی خەڵکی دریاز: تەواو بەڕیوە نەچوونی گەلاڵەی هادی، کەم بوونی ئاوی وەرزێری و نەبوونی قوتابخانەی دواناوەندی.
دریاز دوو گۆڕستانی لێیە یەکیان کۆنە و لە بەری باشوورە، ئەوی دیکەیان لە ناوەندی دێیە و نوێیە.
دوو کەسایەتیی ناسراو و هونەرمەندی ئەم دێیە، "سۆفی مستەفا بووارۆ" ناسراو بە "مستەفا دریازی" (بەیتبێژ و حەیرانبێژ) و "محەممەد ڕەسووڵ دەبیر فەلەک" (شمشاڵ ژەن).

# دۆستاڵی

دۆستاڵی لە ٦ کیلۆمیتری باکووری ڕۆژاوای شاری مەهاباد، بەشی ناوەندی و دێهستانی ئاختاچی ڕۆژاوا و لە ناوچەی محاڵ هەڵکەوتووە. لە ٩٨ ماڵ و ٤٢٤ کەس پێکهاتووە، لەمانە ٢٠٩ کەس پیاون و ٢١٥ کەسیش ژنن، ژمارەی خوێندەوارانی ئەم ئاوایییە ٢٨٥ کەسە کە ١٥٢ کەس پیاون و ١٣٣ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٨٣ کەسی نەخوێندەوار ٣١ کەس پیاون و ٥٢ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ٩٩٢ هێکتارە، لەمە ٣٩٢ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و ٦٠٠ هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.

دۆستاڵی خاوەن ٣٢١ هێکتار زەوی دێم، ١٠٤/٥ هێکتار زەوی بەراو، ٦٧ هێکتار باخ و ١٣ تراکتۆرە.

ئاوایییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی سەیداوا

باکوور: ئاوایییەکانی کەرێزەی ئاڵی بایز و تیکانلووجە

ڕۆژهەڵات: ئاوایی زگدڕاو

ڕۆژاوا: ئاوایی خانەگێ و شاری مەهاباد

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باشوور: زینوێ سەیداوا

ڕۆژهەڵات: زینوێ تیکانلووجە

ڕۆژاوا: قوڵقوڵاغ، زینوێ مووسای و زینوێ شاری

لە سنووری نێوان دۆستاڵی و مەهاباد دوو ئەشکەوت هەڵکەوتوون کە یەکیان بە دیوی مەهاباد دایە و بە ئەشکەوتی "قوڵقوڵاغ" ناسراوە و ئەوی دیکەیان بە دیوی ئاوایی دایە و بە ئەشکەوتی "زینوێ مووسای" ناسراوە، ئەم دوو ئەشکەوتە لە سەر کێوی قوڵقوڵاغ هەڵکەوتوون.

کانیاوەکانی دۆستاڵی بە کانی قەتار، گۆلی تەکیە، گۆلی حاجی و گۆلی قادر جۆڵا ناسراون.

زۆربەی خانووبەرەکان بە خشت و بلووک و هێندێکیش بە بەرد و قوڕ ساز کراون، میچی ماڵەکان لە ئاسن یان دارن. بەشێک لە کۆڵانەکانی ئەم دێیە ڕێک و لەبار و بەشێکیان نارێک و نالەبار هەڵکەوتوون، ماڵەکان حەوشەیان هەیە و دەروازەیان تێگیراوە.

"تەپەی دۆستاڵی" بە ژمارەی تۆمارکراوی ١٦٦١٩ لە لایەن میراتی فەرهەنگییەوە، بەرزایەکەی لە ڕووکەشی زەریاکانەوە ١٤٤٥ میترە و مێژووەکەی دەگەڕێتەوە سەدەی ٤ تا ٦ی کۆچی مانگی. ناوی ئاوایی لە دوو وشەی دۆست + عەلی پێکهاتووە، کە لە زاراوەی خەڵکدا بە قەولی عەرەب ئیدغام کراوە یانی واتاکەی کورت کراوەتەوە و بۆتە دۆستاڵی.

لە بەری باکووری ئاوایییەوە ڕێگایەکی قیلەتاو کە نزیک بە ٣ کیلۆمیترە، دەچێتەوە سێڕێیانی بورهان.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی 1362/12/13 کارەبای بۆ هاتووە، لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە (عەنباراوەکەی لە ئاوایییە و ئاوەکەی لە گۆلی حاجی و گۆلی قادر جۆڵا دابین دەبێ)، سیمکارتی مخابەراتی دێهات، قوتابخانەی سەرەتایی بە ناوی "کەریم مام ئەحمەدی" (کوڕانە ـ کچانە)، دوو مزگەوت کە یەکیان کۆنەمزگەوتە و ئەوی تریان نوێیە کە ساڵی ١٣٨٠ی هەتاوی نۆژەن کراوەتەوە، نانەوەخانە، دوو جووجەخانە (کەرتی تایبەتی)، ناوەندی دابەشینی کوود، کۆستانترە و ساردخانە و هەروەها دۆستاڵی خاوەنی دێهیاری، شووڕای ئیسلامی و شووڕای چارەسەری کێشەکانە. خەڵکی ئەم دێیە بۆ کەلک گرتن لە بنکەی تەندروستی و وەرگرتنی نەوت و کەلوپەلی پێویست سەر بە ئاوایی "ئیندرقاش"ن.

قوتابیانی ئاوایی بۆ درێژەدان بە خوێندن ڕەوانەی ئاوایی گوکتەپە و شاری مەهاباد دەکرێن.

وەرزێری، ئاژەڵداری، باخداری و کرێکاری سەرەکیترین کاروپیشەی خەڵکی ئەم گوندە پێکدێنن. وەرزێران گەنم و جۆ دەچێنن و ئاژەڵەکانیان بریتین لە: مەڕ، مانگا و بزن، بەرهەمی باخەکانیشیان سێو و هڵوویە.

گرفتەکانی خەڵکی ئاوایی: کەمبوونی ئاو، نەبوونی بنکەی تەندروستیی سەربەخۆ، بەڕێوەنەچوونی گەڵاڵەی هادی.

گۆڕستانەکەی ئاوایی لە باشووری دێ هەڵکەوتووە.

"مام عەزیز مەحموودی" ساڵانی ڕابردوو وەک حیکایەتخوانێک لەم دێیە ژیاوە، هەروەها "حوسێنی مەحموودشەشە" (حوسێن کەنیلە) بەیتبێژ و فۆلکلۆرزانی بەناوبانگی کورد، ساڵگارێک لەم ئاوایییە ژیاوە.

## دۆڵبەهاروو

ئەم ئاوایییە لە ٣٨/٥ کیلۆمیتری باشووری ڕۆژاوای شاری مەهاباد، بەشی خەلیفان و دێهستانی مەنگوڕی ڕۆژهەڵات و لە ناوچەی مەنگوڕایەتی هەڵکەوتووە. لە ٤ ماڵ و ٣٦ کەس پێکهاتووە، لەمانە ٢١ کەس پیاون و ١٥ کەسیش ژنن، لە ٢٠ کەسی خوێندەوار ١٤ کەس پیاون و ٦ کەسیش ژنن، هەروەها لە ١٢ کەسی نەخوێندەوار ٤ کەسیان پیاون و ٨ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ١٥٨٠هێکتارە، لەمە ٨٠ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و ١٥٠٠ هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.

دۆڵبەهاروو خاوەن ٥٦ هێکتار زەوی دێم، ٢٥ هێکتار زەوی بەراو، ١/١٢ هێکتار باخ، ٥ تراکتۆر و ٢ لاوێردەیە.

ئاوایییەکانی دەورووبەر:

باشوور: ئاوایی مرانە

باکوور: ئاوایی مەحمووداوا

ڕۆژهەڵات و باکووری ڕۆژهەڵات: ئاوایی سلۆک

ڕۆژاوا: ئاوایی گۆمڵیان

چیاکانی دەورووبەری ئاوایی:

باشوور: گۆزەڵ

باکوور: بۆگەنیوە

ڕۆژهەڵات: شاخەڕەشە

ڕۆژاوا: قەبری وەتمانی

کانیاوەکان بە کانی گۆزەڵ، گۆلان، هەباس ئاغا و شاخەڕەشە ناسراون.

خانووبەرەکان ئەم دێیە لە قوڕ و بەردن و میچەکانیان لە دارە، هیچ کام لە ماڵەکان حەوشەیان نییە و بەرەو ڕۆژهەڵات و باشوور هەڵکەوتوون، بە هۆی کەمبوونی ماڵەکان کۆڵانی لێ هەڵنەکەوتووە. سەبارەت بە ناوی دۆڵ بەهاروو لە زمان خەڵکەوە دوو بۆچوون هەیە، یەکیان ئاماژە بەوە دەکا کە بەر لە ئێستا لە خڕ و دۆڵەکانی ئەم ئاوایییە "بەهاروو" کراوە، مەبەست لە گەنمی وەرزی بەهارە، هەروەکوو چۆن ئێستاش تا ڕادەیەک "بەهاروو" دەکرێ. بۆچوونی دوویەم دەڵێ: چونکە ئەم دۆڵە سەرسەوز بووە، بەتایبەت لە وەرزی بەهاردا، بۆیە وایان پێ گوتووە، هەرچەند خەڵکی ئاوایی بۆخۆیان بۆچوونی یەکەمیان پێ ڕاستە.

لە باکووری ئاوایی کورتەڕێگایەکی خاکی دەچێتەوە ئاوایی مەحمووداوا، لە ڕۆژهەڵاتەوە ڕێگایەکی خاکی دووڕێیانێکی لێ دەبێتەوە، یەکیان دەڕوا بۆ ئاوایی مرانە و ئەوی دیکەیان دەچێتەوە ئاوایی سەرتان، لە ڕۆژاواوە ڕێگایەکی خاکی بە مەودای دوو کیلۆمیتر، جادەی خاکی دۆڵی زێوە دەگرێتەوە.

ئیمکاناتی ئاوایی: کارەبا، بنکەی مخابەرات، قوتابخانەی سەرەتایی (کوڕانە ــ کچانە) بە ناوی "دەهر". بۆ بنکەی تەندروستی دەبێ ڕێگای ئاوایی سەرتان بپێون و نەوت و کەلوپەل لە شەریکەی هاوبەشیی "سیاقوڵ"ی خوارێ وەرگرن.

ئەم ئاوایییە لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوەی نییە هەر بۆیە لە چاڵاو و کانیاوەکان بەتایبەت لە کانی "خڕی سەیدی" کەلک وەردەگرن.

خوێندکاران لە دوای پۆلی سەرەتایی درێژە بە خوێندن نادەن و یەکێک لە هۆکارە بەرچاوەکانی نەبوونی ئیمکانات و دەستنەڕۆیشتنی خەڵکەکەیەتی.

کاروپیشەی خەڵکی ئەم گوندە لە ئاژەڵداری و وەرزێری پێکهاتووە، ئاژەڵەکان مەڕ و مانگان و وەرزێران گەنم، جۆ، نۆک و تا ڕادەیەک "گەنمەبەهاروو" دەچێنن.

گرفتەکانی خەڵکی ئاوایی: نەبوونی بنکەی تەندروستی لە دوو ئاوایی "دۆڵبەهاروو" و "مەحمووداوا" کە لە پەنای یەکن، ڕێگاوبانی ناخۆش، کەم ئاوی.

گۆڕستانەکەی دوو ئاوایی - دۆڵبەهاروو و مەحمووداوا - بە "قەبرەوردان" ناسراوە.

## دۆڵپەمۆ

ئەم ئاوایی‌یە لە ٣١ کیلۆمیتری باشووری شاری مەهاباد، بەشی خەلیفان و دێهستانی مەنگوڕی ڕۆژهەڵات و لە ناوچەی مەنگوڕایەتی هەڵکەوتووە. لە ٤ ماڵ و ٣٨ کەس پێکهاتووە، لەمانە ١٧ کەس پیاون و ٢١ کەسیش ژنن، لە ٢١ کەسی خوێندەوار ١٢ کەسیان پیاون و ٩ کەسیش ژنن، هەروەها لە ١٣ کەسی نەخوێندەوار ٥ کەس پیاون ٩ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ٢٠٠ هێکتارە، لەمە ٤٠ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و ١٦٠ هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.

دۆڵ پەمۆ خاوەن ١١٢/٥ هێکتار زەوی دێم، ٣٥/٥ هێکتار زەوی بەراو، ٦/٢٦ هێکتار باخ، ١ تراکتۆر و ١ لاوێردەیە.

ئاوایی‌یەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی کامەم

باشووری ڕۆژئاوا: ئاوایی ڕفتە

باکوور: بەشێک لە ئاوایی خرەجۆ و ئاوایی مازڵێ

ڕۆژهەڵات: ئاوایی خرەجۆ

ڕۆژئاوا: ئاوایی ئامێد

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باشوور: کێوی کامەم، کێوی بەردەبووک

باکوور: کێوی گوڵیار، کێوی مازەڵێ

ڕۆژهەڵات: کێوی خرەجۆ

کانیاوەکان بە مۆڵەگاران، سەیدە کوڵە، گۆلی برایم ئاغای و گۆلی سێوێ ناسراون.

لەو ئاوایی‌یەدا خانووەکان هەموو لە قوڕ و بەرد و میچەکانیان بە دار داپۆشراوە، ماڵەکان لەپاڵ یەکدان و حەوشەیان نییە، کۆڵانەکانی ئاوایی نارێکن.

"خرێ هەنجیران" لە ٢٨ کیلۆمیتری باشووری شاری مەهاباد، لە بەری چەپی جادەی مەهاباد ـ سەردەشت، لە نێوان ئاوایی‌یەکانی کامەم و دۆڵپەمۆ هەڵکەوتووە کە بەرزایی‌یەکەی لە ڕووکەشی زەریاکانەوە ١٣٣٠ میترە و لە میراتی فەرهەنگی بە ژمارەی ٣٣٢٥ تۆمار کراوە. خڕ بە مانای دۆڵێکی بچووکە و هەنجیریش کە دیارە مەبەست هەمان میوەی هەنجیرە؛ بەو پێیە پێشتر دەبێ دارهەنجیر لەو ناوچەیە زۆر بووبێ و بە هۆی پەرەگرتنی ئاژەڵداری لە ناوچەکە، بەشێکی زۆر لەم هەنجیرانە فەوتابن. لە نێو کۆمەڵەبەردەکانی خرێ هەنجیران کە پاشماوەی دەورانی سێهەمی زەوی‌ناسییە، گەورەترین بەردێک کە هەڵقەندراوی لە سەر کراوە لە جەرگەی ئەم کۆمەڵەبەردەدایە و بەردەکانی تر لە سەرەوەوی ئەم بەردەن. بە پێی هەڵقەندراوە و نیشانەکانی سەر ئەم بەردە گەورە، دەگەڕێتەوە بۆ هەزارەی سێهەمی پێش زایین واتا پێشینەیەکی نزیک بە چوار هەزار ساڵەی هەیە.

هەروەها سەبارەت بە شاخی "سپیان" دەگێڕنەوە کە ئەشکەوتێکی تێدا بووە کە زۆر گەورە بووە و جێگای سەد مەڕ بۆتەوە، بەڵام ئێستا نەماوە و پڕ بۆتەوە.

مێژووی دۆڵپەمۆ ڕوون نییە و ئەو کەسانەی لەوێ دەژین وەکوو باس دەکەن لە ڕابردوودا، واتا زیاتر لە سەد ساڵ لەمەوبەر، دۆڵپەمۆ ئاوەدانتر بووە.

"عەبدولکەریم چوارگوشە"یەکێک لە بەساڵاچووترین کەسانی ئەو ئاوایی‌یە کە سەد و دە ساڵ عومری کردووە و لە ساڵی ١٣٨٣ی هەتاوی‌دا کۆچی دوایی کردووە کوتوویە: بیست و پێنج ساڵە بوومە کە هاتوومە دۆڵپەمۆ، حەوت ساڵ لێرە دەزگیرانم هەبووە و دۆڵپەمۆ هەر ئاوەدان بووە و بە بیری من نییە.

"دۆڵپەمۆ" کە (دۆڵچەپە)شیان پێگوتووە، لە چۆنییەتی ناودێرکردنی ئەم ئاوایی‌یە کەس ئاگاردار نییە، ڕەنگە زەمانێک "پەمۆ"ی زۆری لێ کرابێ.

لە باشوورەوە ڕێگایەکی خاکی دەچێتەوە ئاوایی کامەم، لە باکوورەوە بە ڕێگایەکی خاکی‌دا ئاوایی مازەڵێ دەگرێتەوە، لە ڕۆژهەڵاتەوە ڕێگایەکی

خاکی دەچێتەوە ئاوایی خرەجۆ، لە ڕۆژاواشەوە ڕێگایەکی خاکی دەچێتەوە سەر جادەی مەهاباد ــ سەردەشت کە مەوداکەی دوو کیلۆمیترە.
ئیمکاناتی ئاوایی: ساڵی ١٣٨٠ کارەبای بۆ هاتووە، سیمکارتی مخابەراتی، قوتابخانەی سەرەتایی (کوڕانە ــ کچانە) بە ناوی "کەماڵ".
هەر ماڵەی ئاوی خواردنەوەی خۆی لە کانیاوێکرا کێشاوە و لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە بۆ ئاوایی نەکراوە. بۆ بنکەی تەندروستی و وەرگرتنی نەوت و کەلوپەل سەر بە ئاوایی "حەوڵاکوردە"ن.
کوڕان و کچانی ئاوایی تا پێنجەمی سەرەتایی لە قوتابخانەی ئاوایی دەخوێنن لە پاشان کوڕەکان بۆ درێژەدان بە خویندن دەچنە قوتابخانەی خەلیفان، بەداخەوە کچەکانی ئاوایی دەرفەتی ئەوەیان بۆ ناڕەخسێ تا پەرە بە خوێندنی خۆیان بدەن، بەڵام جاری وایە هەڵدەکەوێ کەسێک کچەکەی بنێرێتە قوتابخانە و پێی بخوێنێ.
کاروپیشەی خەڵکی ئاوایی وەرزێری و ئاژەڵدارییە، وەرزێران گەنم و جۆ دەچێنن و ئاژەڵەکانیان زۆرتر مەڕن و ئاژەڵی گەورە وەکوو مانگا کەمتر ڕادەگرن.
گرفتی خەڵکی دۆڵپەمۆ ئەوەیە کە خەڵکەکەی مزگەوتیان نییە، لەگەڵ ئەوەشدا سەرەکی‌ترین گرفتیان وەرزی زستانانە کە جاری وایە ڕێگاوبان دەگیرێ و بە بیست ڕۆژ ناتوانن هاتووچۆ بکەن، هەروەها سێلاویش زۆر جاران زەرەدی گەیاندۆتە ئاژەڵ و دەغڵودانی ئەم ئاواییە؛ بۆ وێنە لافاوی ساڵی ١٣٨٤ی هەتاوی بوو بە هۆی قڕکردنی مەڕ و ماڵاتێکی زۆری خەڵکی ئاوایی.
گۆڕستانەکەی دۆڵپەمۆ لە بەری ڕۆژاوایە هەڵکەوتووە.

سروشتی دۆڵپەمۆ

## دووچۆمان (ئیسلام‌ئاوا)

ئەم ئاوایی‌یە لە ٤٢ کیلۆمیتری باشووری ڕۆژاوای شاری مەهاباد، بەشی خەلیفان و دێهستانی مەنگوڕی ڕۆژهەلات و لە ناوچەی مەنگوڕایەتی هەلکەوتووە. لە ٢٥ ماڵ و ١٣٦ کەس پێکهاتووە، لەمانە ٦٧ کەس پیاون و ٦٩ کەسیش ژنن، لە ٥٠ کەسی خوێندەوار ٣٤ کەسیان پیاون و ١٦ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٦٦ کەسی نەخوێندەوار ٢٣ کەس پیاون و ٤٣ کەسیش ژنن.

پێشتر ئەو دێیە ملکی ئاوایی "حەسەن‌چەپ" بووە، بەڵام بە هۆی ئالۆزبوونی ناوچەکە لە سالانی دوای شۆڕشی گەلانی ئێران، سێ ئاوایی "کۆخان"، "لەموونج"، "قامیشاوێ" کاول کران و خەلکەکەی لە سالی ١٣٦٦ی هەتاوی بۆ ئەم شوێنەی ئێستا - دووچۆمان - ڕاگوێزران و دەولەت خانووی بۆ سازکردن و هێندێک ئیمکاناتی دانێ. هەنووکە خەلکەکەی ئەم دێیە جگە لە چەند شوێنێکی دیاریکراو، مافی ئەوەیان نییە لە زەویی و لەوەرگەکانی دەوروبەر کەلک وەرگرن و گشت زەویوزار و لەوەرگەکانی ئەم ناوە، ملکومالی ئاوایی‌یەکانی "حەسەن‌چەپ" و "بێهەنگوین" و "خانەگێ"ن، هەر بۆیە ناچارن لە زەویوزار و لەوەرگەی سێ ئاوایی‌یە چۆلکراوەکەی خۆیان، بە مەبەستی چوونە هەوار، کشتوکاڵ و لەوەرگە بۆ ئاژەلەکانیان کەلک وەردەگرن.

ئاوایی‌یەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی بێهەنگوین

باکوور: ئاوایی‌یەکانی باگردانی سەرێ و خوارێ

ڕۆژهەلات: ئاوایی‌یەکانی "خانەگێ"ی مەنگوڕان و گۆملیان

ڕۆژاوا: ئاوایی حەسەن‌چەپ

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باکوور: تەپکەی سەر ئاوەلان

ڕۆژاوا: کێوی بەردەقەل

زۆربەی خانووبەرەکانی ئەم دێیە لە خشت و چیمەنتۆ و میچەکانیان لە دارن. - هەلبەت ئەم خانووانە دەولەت سازی کردوون - ئەو بینایانەی خەلکەکە بۆخۆیان لە قوڕ و بەرد دروستیان کردوون بۆ ئەنبار و هۆڵ و... کەلکیان لێ وەردەگرن.

مالەکان بەرەو ڕۆژهەلات سازکراون و حەوشەیان نییە، کۆلانەکانی ڕێک و ڕاستن، بەلام مەودایەکی وایان نییە، هێندێک لە مالەکان هەوراز هەلکەوتوون.

ناوی "دووچۆمان" لەوەڕایە کە لە بەری ڕۆژاوا و ڕۆژهەلاتی ئاوایی دوو چۆم تێپەڕ دەبن کە لە باشوورەوە و لە دوو ئاوایی "بێهەنگوین" و "لەموونج"ەوە سەرچاوە دەگرن.

لە باشووری ئەم دێیەوە ڕێگایەکی خاکی دەچێتەوە ئاوایی بێهەنگوین، لە باشووری ڕۆژاوا ڕێگایەکی سەخلەت و ناخۆش، ئاوایی‌یەکانی لەموونج، کۆخان، قامیشاوێ دەگرێتەوە، لە ڕۆژاواشەوە ڕێگایەکی خاکی دەڕواتەوە ئاوایی "حەسەن‌چەپ".

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی ١٣٧٧/٣/١ کارەبای بۆ چووە، لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوەی هەیە کە لە "کانی بووزان" دابین دەبێ، بنکەی مخابەرات، قوتابخانەی سەرەتایی "نەشر"(کوڕانە ـ کچانە) کە لە بنەڕەتەوە بینایەکی تایبەت بە قوتابخانەی نییە و قوتابییەکان هەر سالەی لە مالێکی ئاوایی‌دا وانە دەخوێنن و فێرەسەواد دەبن، مزگەوتێک کە سالی ١٣٨٠ی هەتاوی ساز کراوە. بۆ وەرگرتنی نەوت و کەلوپەل سەر بە ئاوایی "سیاقۆڵ"ی خوارێن و بۆ بنکەی تەندروستی دەبێ بچنە ئاوایی "باگردان"ی خوارێ.

بۆ درێژەدان بە خوێندن، هەلبەت زیاتر کوڕەکان دەنێردرێنە خەلیفان و مەهاباد و کچەکانی ئاوایی کەمتر ئیزنی درێژەپێدانی خوێندنیان پێدەدرێ.

وەرزێری، ئاژەلداری و کرێکاری کاروپیشەی خەلکی ئەم گوندەن. وەرزێران گەنم، جۆ و نۆک دەچێنن و ئاژەلەکان زۆرتر مەڕن، تا ڕادەیەکی کەم مانگاش ڕادەگرن. بەرهەمی چەند باخێکی ئاوایی سێوە.

گرفتەکانی خەلکی دووچۆمان (ئیسلام ئاوا): ڕێگای خاکی و ناخۆش، نەبوونی شووڕای ئیسلامی ئاوایی، نەبوونی بینا بۆ قوتابخانە، نەبوونی بنکەی تەندروستیی سەربەخۆ، پێویستی بە ئیمکاناتی وەرزیشی بۆ لاوەکان. خەلکی ئەم دێیە مردووەکانیان لە گۆڕستانی "چوار دیوار" بە خاک دەسپێرن.

## دووسەید

دووسەید لە ٢٤/٥ کیلۆمیتری باشووری ڕۆژاوای شاری مەهاباد، بەشی خەلیفان و دێهستانی مەنگوڕی ڕۆژهەڵات و لە ناوچەی مەنگوڕایەتی هەڵکەوتووە. لە ٨ ماڵ و ٦٦ کەس پێکهاتووە، لەمانە ٤٣ کەسیان پیاون و ٢٣ کەسیش ژنن، لە ٣٨ کەسی خوێندەوار ٣١ کەس پیاون و ٧ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٢١ کەسی نەخوێندەوار ٨ کەسیان پیاون و ١٣ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ٢٤٥٧/٥ هێکتارە، لەمە ١٥٧/٥ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و ٢٣٠٠ هێکتار پاوان و لەوەرگەی دێیە.

دووسەید خاوەن ٢٧٣/١٤ هێکتار زەوی دێم، ٥٥/٥ هێکتار زەوی بەراو، ١٤/٠٦ هێکتار باخ، ٥ تراکتۆر و ٢ لاوێردەیە.

ئاواییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی خاتوونئەستی

باکوور: ئاواییەکانی کاوەیس و حەوڵاکوردە

ڕۆژهەڵات: ئاوایی گوڵیار

ڕۆژاوا: ئاوایی سیاقۆڵی خوارێ

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باشوور: هەوارەقوڕان

باکوور: تانجبڵاغ

ڕۆژاوا: شاخەسپیان

کانیاوەکانی ئەم ئاواییە بە خڕەپەمۆ، قازی، کەرێزە، هەوارەقوڕان، کانی پیاوان و کانی ژنان ناسراون.

ئەشکەوتی "کونەپێست" لە نزیک ماڵەکانی ئەم دێیە هەڵکەوتووە.

خانووبەرەکان لە قوڕ و بەردن و میچەکانیان دارە، ماڵەکان بە گشتی ڕوو لە باشوورن و حەوشەیان نییە، کۆڵانەکان کورت و ناڕێکن و لە ناوەندی ئاواییدا کاولەکۆن وەبەر چاو دێن. ماڵەکان تا ڕادەیەک هەوراز هەڵکەوتوون. خەڵکی ئاوایی دەڵێن ئەم دێیە کە زوو دوو سەیدی لێبوون بە ناوی ئەوان کراوە.

لە بەری ڕۆژهەڵاتی دێ، ڕێگایەکی خاکی دەبێتە دووڕییانێک کە یەکیان دەڕواتەوە سەر جادەی مەهاباد - سەردەشت، ئەوی دیکەیان دەچێتەوە بۆ بەری باشوور و ئاوایی "خاتوونئەستی" دەگرێتەوە.

ئیمکاناتی ئاوایی: کارەبا، سیمکارتی مخابەراتی دێهات، قوتابخانەی سەرەتایی"تۆخوەت" (کوڕانە ــ کچانە) کە لە بنەڕەتەوە هیچ بینایەک وەکوو قوتابخانە لە ئارادا نییە و لە مزگەوتی ئاوایی کەلک وەردەگرن. بۆ کاروباری بنکەی تەندروستی و وەرگرتنی نەوت و کەلوپەلیش سەر بە ئاوایی "حەوڵاکوردە"ن. لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوەی نییە و لە چاڵاو و کانی ژنان کەلک وەردەگرن. ڕادەیەکی کەم لە قوتابیان درێژە بە خوێندن دەدەن و ڕێگای خەلیفان یان مەهاباد دەگرنە بەر.

کاروپیشەی خەڵکی ئاوایی وەرزێری، ئاژەڵداری و باخدارییە، وەرزێران گەنم، جۆ و نۆک دەچێنن و ئاژەڵەکانیان مەڕ، بزن و مانگایە، بەرهەمی باخەکانیشیان سێو، قەیسی و گوێزە.

گرفتەکانی خەڵکی ئاوایی: ڕێگاوبانی ناخۆش، نەبوونی بنکەی تەندروستی سەربەخۆ، نەبوونی بینا بۆ قوتابخانە، نەبوونی لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە. گۆڕستانەکەی دووسەید بە "چاکەچکۆلە" ناسراوە.

## دەرمان

دەرمان لە ٢٤ کیلۆمیتری ڕۆژهەڵاتی شاری مەهاباد، بەشی ناوەندی و دێهستانی ئاختاچی ڕۆژاوا و لە ناوچەی محاڵ هەڵکەوتووە. لە ١١ ماڵ و ٦٦ کەس پێکهاتووە، لەمانە ٢٩ کەسیان پیاون و ٣٧ کەسیش ژنن، ژمارەی خوێندەوارانی ئەم ئاوایی‌یە ٤٧ کەسەن کە ٢٣ کەس پیاون و ٢٤ کەسیش ژنن، هەروەها لە ١٣ کەسی نەخوێندەوار ٢ کەسیان پیاون و ١١ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ١٥٢٥ هێکتارە، لەمە ٣٢٥ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و ١٢٠٠ هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.

دەرمان خاوەن ٣٥٣ هێکتار زەوی دێم، ١٤٩ هێکتار زەوی بەراو، ٣٨ هێکتار باخ، ٧ تراکتۆر و ١ لاوێردەیە.

بەرزایی ئاوایی لە ڕووکەشی زەریاکانەوە ١٩٧٠ میترە.

ئاوایی‌یەکانی دەورووبەر:

باشوور: ئاوایی قزڵجەی سەرێ

باکوور: ئاوایی‌یەکانی قەرەبڵاغ و کەپەکەند

ڕۆژهەڵات: ئاوایی قەمتەرە

ڕۆژاوا: ئاوایی‌یەکانی سارەوانان و شیلاناوێ

چیاکانی دەورووبەری ئاوایی:

باشوور: قەڵا

باکوور: پشت ماڵان

ڕۆژهەڵات: سوڵتان

ڕۆژاوا: کڵاوکوور

باریکە، تەختە پۆش، جوبرەئیل و سەرچاوە چەند کانیاوی ئەم گوندەن.

خانووبەرەکان لە قوڕ و بەرد و میچی دارە، بە هۆی کەلک وەرگرتنی گشت ماڵەکان لە جۆرە بەردێک کە بەردێکی بۆرە، ئاوایی یەکرەنگ دەنوێنێ، چەند خانووبەرەیەکیش لە خشت ساز کراون، ماڵەکان زۆربەیان ڕوویان لە ڕۆژهەڵاتە. خرێک بە ناوەندی ئاوایی‌دا هاتووە و ئاوایی کردۆتە دوو کەرت، ماڵەکان لە یەک ڕیزدا هەڵکەوتوون.

مێژووی ئاوایی ڕوون نییە، بە ڕای خەڵک ئەو ئاوایی‌یە کۆن و لەمێژینەیە و پێشتر ئاوایی "قەرەبڵاغ"یش هەر بەشێک بووە لە مەزرای ئاوایی دەرمان و پاشان ئاوەدان بۆتەوە. دەڵێن کانیاوێک لە ناوەندی ئاوایی هەڵکەوتووە بە هۆی زوڵاڵ و خۆش بوونی ئاوەکەی هەر لە کۆنەوە وتوویانە ئەو ئاوە دەرمانی نەخۆشیانە.

لە بەری باشوور ئاوایی‌یەوە ڕێگایەکی خاکی بۆ ئاوایی‌یەکانی شیلاناوێ و قزڵجەی خوارێ دەچێ، لە باکوورەوە ڕێگایەکی خاکی نزیک بە 1/5 کیلۆمیتری سەر جادەی مەهاباد ــ بۆکان دەگرێتەوە.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی 1357/10/19 کارەباکەی هەڵکراوە، لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوەی هەیە، سیمکارتی مخابەراتی دێهات، قوتابخانەی سەرەتایی"ئیفتیخار" (کوڕانە ــ کچانە)، مزگەوتی"ئیمامی عومەر"، هەر لەم ساڵانەدا ئەم مزگەوتە بۆ جاری سێهەم لە بناغەوە داندراوەتەوە. خەڵکی ئاوایی بۆ کەلک وەرگرتن لە کاروباری بنکەی تەندروستی و وەرگرتنی نەوت و کەلوپولی پێویست سەر بە ئاوایی "قەرەبڵاغ"ن.

قوتابیان بۆ درێژەدان بە خوێندن ڕێگای شاری مەهاباد دەگرنە بەر و مافی کچان و کوڕان لەو بارەدا پارێزراوە.

ئاژەڵداری و وەرزێری کاروپیشەی خەڵکی دەرمانیان پێکهێناوە. ئاژەڵەکان مەڕ، مانگا و بزنن، وەرزێران گەنم، جۆ، نۆک و نیسک دەچێنن. بەرهەمی باخەکان سێو و قەیسییە.

گرفتەکانی خەڵکی ئاوایی: نەبوونی بنکەی تەندروستی سەربەخۆ، پێویستی بە نۆژەن کردنەوەی لوولەکێشیی ئاوی خواردنە هەیە، نەبوونی شووڕای ئیسلامی، خاکی بوونی نزیک بە 1/5 کیلۆمیتر تا جادەی سەرەکی ئاوایی، دەرنەکرانی ئاوەڕۆی ئاوایی.

گۆڕستانەکەی دەرمان بەر لە ئاوایی هەڵکەوتووە.

جێگای باسە ساڵی١٣٦١ی هەتاوی بە هۆی شەڕی نێوان دەسەڵات و گرووپەکانی دژ بە کۆماری ئیسلامی، ئەو ئاوایی‌یە بە تەواوی بە بۆڵدزێر خاپوور

کرا و خەڵکەکەی دەربەدەر بوون. ئەو سەردەمی ئاوایی نزیک بە ٥٠ ماڵ بوون کەچی پاشان ژمارەیەکی زۆر کەم لە ماڵەکان گەڕانەوە ئاوایی و سەر ماڵوحاڵی خۆیان.

جێگای ئاماژەیە مامۆستا حاجی مەلا عەبدوڵڵا ئەحمەدیان کە خاوەن گەلێک نووسراوەی ئەدەبی، فەرهەنگی و ئایینییە، لەم گوندە چاوی بە دنیا هەڵێناوە.

حاجی سەعید جەهانگیری، حیکایەتخوان و بەیتبێژی ناسراو لە دەرمان ژیاوە.

"ڕەسووڵ شیرمۆخ" بەیتبێژی ناسراوی ناوچە زۆرتری تەمەنی لەم ئاواییە تێپەڕ کردووە، بەڵام لە بنەڕەتەوە خەڵکی گوندی سارەوانان بووە و ساڵی ١٣٧٦ لە شاری مەهاباد کۆچی دوایی کردووە.

***

"فاتیمە عەبدوڵڵاپوور"، تەمەن ٨٦ ساڵ خەڵکی دەرمان ئاوامان باسی حرووسان بۆ دەکا:

وەکوو باوکی خەزوورم بۆی دەگێڕامەوە، حرووسان کە ڕوویان لەم ناوچەیە کرد زەرەدێکی زۆریان لەو خەڵکە دا. گۆیا تۆپێکیان هاویشتۆتە نێو دەرمان کە وە مێگەلەمەڕێ ئاوایی کەوتووە و زۆری قڕ کردن، خەڵک لە ترسی گیانی خۆیان بە پیلیانەوە چوون و گاوگەردوونیان بۆ کردوون و ئەوانیش خەڵکیان نەکووشتووە و دەرمانیان بەجێ هێشتووە.

خانووی بە قوڕ و بەرد

## دێبۆکر

دێبۆکر لە 16 کیلۆمیتری ڕۆژاوای شاری مەهاباد، بەشی ناوەندی و دێهستانی موکریانی ڕۆژاوا و لە ناوچەی مەنگوڕایەتی هەڵکەوتووە. لە ۸۲ ماڵ و ۵۳۹ کەس پێکهاتووە، لەمانە ۲۹۱ کەس پیاون و ۲٤۸ کەسیش ژنن، ژمارەی خوێندەوارانی ئەم ئاوایی‌یە ۲۸۳ کەسە کە ۱۸٦ کەس پیاون و ۹۷ کەسیش ژنن، هەروەها لە ۲۰٤ کەسی نەخوێندەوار ۷٤ کەس پیاون و ۱۳۰ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی 15000 هێکتارە کە 240 هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و 14760 هێکتار پاوان و لەوەرگەی دێیە.

دێبۆکر خاوەن ۲۳۰ هێکتار زەوی دێم، ۱۱۰ هێکتار زەوی بەراو، ۳۰ هێکتار باخ، ۳۰ تراکتۆر و ۷ لاوێردەیە.

بەرزایی ئاوایی لە ڕووکەشی زەریاکانەوە ۱۵۰۰ میترە.

| ئاوایی‌یەکانی دەورووبەر: | چیاکانی دەورووبەری ئاوایی: |
|---|---|
| باشوور: ئاوایی‌یەکانی سێلمساغۆڵ و قماریە (چۆڵ کراوە) | باشوور: بەردە بۆر |
| باکوور: ئاوایی خەلیفە | باکوور: بەردە تاڵەسێو |
| ڕۆژهەڵات: ئاوایی‌یەکانی کەوتەر و قازیاوا | ڕۆژهەڵات: قووڵەگۆران |
| ڕۆژاوا: ئاوایی برایمە | ڕۆژاوا: بەردەنەورۆز |

جندۆکێ، کانی ڕەش و کانی سپی سێ کانیاوی بەناوبانگی ئاواییین. لە ڕۆژاوای ئاوایی دوو ئەشکەوت بە ناوەکانی "کوونەپێست" و "بەردەبۆر" هەڵکەوتوون.

خانووبەرەکان زۆرتر لە قوڕ و بەرد و میچیان لە دارە، ڕادەیەکی زۆر کەم خانووبەرە بە خشت و بلووک ساز کراوە. بەشێک لە ماڵەکان هۆڵ و ئاغەڵەکانیان لە داوێنی کێو ساز کردووە، کۆڵانەکان لەم دێیە پێچاوپێچ و خواروخێچن، ماڵەکان حەوشەیان هەیە.

سەبارەت بە ناوی ئاوایی سەرەتا ئێلی دێبۆکری لە دیاربەکری باکووری کوردستان کۆچیان کردووەتە ئەم ئاوایی‌یە و ئاوایی هەر بە ناوی ئەوان کراوە و پاشان لەوێ ڕۆیشتوون. لە باکووری ئاوایی دوو تەپەی مێژوویی هەیە بە ناوەکانی "گردە" و "قەڵاتەسوور".

لە بەری باشووری گوندەوە ڕێگایەکی خاکی دەچێتەوە مەزرای ئاوایی‌یەکانی چۆڵکراوی "قماریە"، لە باکوورەوە ڕێگایەکی قیلەتاو نزیک بە 2/5 کیلۆمیتری بۆ سەر جادەی مەهاباد ــ پەسوێ دەچێ، لە ڕۆژاواوە ڕێگایەکی خاکی ناخۆش و هەوراز ئاوایی برایمە دەگرێتەوە.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی 362/11/19 کارەبای بۆ چووە، لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوەی هەیە، سیمکارتی مخابەراتی دێهات، مزگەوتێک کە ساڵی 1362 نۆژەن کراوەتەوە، قوتابخانەی سەرەتایی (کوڕانە ــ کچانە) بە ناوی "سەبیل"، قوتابخانەی ناوەندی بە ناوی "سەهەند"، بنکەی تەندروستی، شەریکەی هاوبەشیی نەوت، نانەوەخانە. هەروەها دێبۆکر لە ساڵی 1382ی هەتاوییەوە خاوەن دێهیارییە، شوورای ئیسلامی و شوورای چارەسەری کێشەکان. کەلوپەلی ئەم دێیە لە شەریکەی هاوبەشیی مەهاباد، گەڕەکی "پشتتەپ" دابین دەبێ.

لەم گوندە قوتابیان بەتایبەت قوتابیانی کوڕ بۆ درێژەدان بە خوێندنیان پاش پۆلی ناوەندی ڕەوانەی ئاوایی‌یەکانی خەلیفان، گۆکتەپە و شاری مەهاباد دەکرێن.

کاروپیشەی خەڵکی دێبۆکر ئاژەڵداری و وەرزێرییە، هەڵبەت تا ڕادەیەکی کەمتر باخداری و مێشداریش دەکەن.

ئاژەڵەکانیان بریتین لە: مەڕ، مانگا و بزن، وەرزێران گەنم، جۆ و بایمە دەچێنن و بەرهەمی باخەکان سێو، گوێز و قەیسییە.

دەرنەکردنی ئاوەڕۆ و بەڕێوە نەچوونی گەڵاڵەی هادی لە گرفتە سەرەتایی‌یەکانی خەڵکی ئاواییین.

خەڵکی ئاوایی مردووەکانیان لە گۆڕستانی "هێلان" کە لە ڕۆژاوای ئاوایی برایمە هەڵکەوتووە دەنێژن، گۆڕستانەکەی "شەهیدان" کە لە ڕۆژاوای دێبۆکرە، زۆرتر منداڵی لێ دەنێژن، لە بەری ڕۆژهەڵاتی ئاواییش ئاسەواری کۆنەگۆڕستانێکی لێیە.

## ڕفته

ڕفته له 30/5 کیلۆمیتری باشووری شاری مەهاباد، بەشی خەلیفان و دێهستانی مەنگوڕی ڕۆژهەڵات و له ناوچەی مەنگوڕایەتی هەڵکەوتووه. له ۹ ماڵ و ٦٨ کەس پێکهاتووه، لەمانه ٣٤ کەسیان پیاون و ٣٤ کەسیش ژنن، ژمارەی خوێندەوارانی ئەم ئاوایییە ٣٧ کەسه که ٢٥ کەس پیاون و ١٢ کەسیش ژنن، هەروەها له ١٩ کەسی نەخوێندەوار ٥ کەسیان پیاون و ١٤ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ٣٢٠٠ هێکتاره، لەمه ١٤٦ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوه و ٣٠٥٤ هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیه.

ڕفته خاوەن ١٠٢ هێکتار زەوی دێم، ١١ هێکتار زەوی بەراو، ٦/٨٢ هێکتار باخ، ٣ تراکتۆر و ١ لاوێردەیه.

| ئاوایییەکانی دەوروبەر: | چیاکانی دەوروبەری ئاوایی: |
|---|---|
| باشوور: ئاوایییەکانی سلۆک و شۆڕاوا | باشوور: مازەڵێ چکۆڵه |
| باکوور: ئاوایی دۆڵپەمۆ | باکوور: بەیرەم جانوو |
| ڕۆژهەڵات: ئاوایی کامەم | ڕۆژهەڵات: گێوژەچکۆڵه و گێوژەگەوره |
| ڕۆژاوا: ئاوایی ئامێد | ڕۆژاوا: شاخەڕەشان |

چەند کانیاوی ڕفته بریتین له: کۆڕی شێخ ئەڵڵا، ساردی، مەلا، کۆڕی عەلیخان، سواران و چۆڕچۆڕه.

خانووبەرەکان به گشتی له قوڕ و بەردن و میچەکانیان داره، حەوشەیان نییه و بەرەوڕووی ڕۆژاوا هەڵکەوتوون، چۆم به ناوەندی ئاواییدا تێپەڕ دەبێ. له فەرهەنگی "هەنبانەبۆرینه"ی مامۆستا هەژار، لاپەڕەی ٣٤٧، ستوونی هەوەڵدا، ئاوا ڕفته مانا دەکاتەوه: ڕفته؛ ڕفت: بارانی بەتەوەژم، ڕێژنه 'ف' (رگبار شدید باران).

مێژووی ئاوەدان کردنەوەی ئاوایی ڕوون نییه، زۆربەی خەڵکی ئاوایی و ناوچه ئاوا باس لەو گونده دەکەن: ئەو دێیه خاوەن چەند ماڵێک بووه و له یەکێک لەو ماڵانەدا پیرێژنێک دەژیا، ڕۆژێکی دەبینێ پشیلەکەیان فەرخەکانی هەڵدەگرێ و دەیانباته بن شاخێک لەو بەری ئاوایی، پیرێژن هەر وەک بیستوویه دەزانێ ئاژەڵەکان بەر له هاتنی بوومەلەرزه، جمگه و هتد هەست پێدەکەن، پیرێژنه ئەو قسەیه به خەڵکی ئاوایی ڕادەگەیێنێ و دەڕوا ، کەچی خەڵکەکه گوێی نادەنێ، بۆ شەوێ بارانێکی زۆر توند دەبارێ و له ئاکامدا جمگەیەک دێت و ئاوایی خاپوور دەکا و بۆخۆی بەرەو ئاوایی ئامێد وەڕێ دەکەوێ که له ئاکامدا هەر ئەم پیرێژنه ڕزگاری دەبێ. ساڵی ئەو ڕووداوه ڕوون نییه؛ ئێستاش شوێنەواری ئەم جمگەیه ماوه و گڵی ڕۆژاوای ئاوایی سووره، گڵی ڕۆژهەڵات بۆره کەچی گردێکی بچووک لەم گڵه سووره تێکەڵی گڵه بۆره بووه و به تەواوی هەست بەوه دەکرێ که ئەمه شتێکی ئاسایی نییه.

ئەم ئاوایییه له سەر جادەی دۆڵی ئافان هەڵکەوتووه که ساڵی ١٣٨٧ی هەتاوی تا نێو ئاوایی قیلەتاو کراوه، له بەری باشووری گوندەوه ڕێگایەکی خاکی دەڕواته ئاوایییەکانی سلۆک و شۆڕاوا، له باکوورەوه ڕێگایەکی قیلەتاو دەچێتەوه سەر جادەی سەرەکی مەهاباد ـ سەردەشت.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی 1374/05/04 کارەبای بۆ چووه، قوتابخانەی سەرەتایی "مێهر" (کوڕانه ـ کچانه)، سیمکارتی مخابەراتی دێهات. بۆ کەلک وەرگرتن له بنکەی تەندروستی سەر به ئاوایی "ئافان"ن، نەوت و کەلوپەلی پێویست له شەریکەی هاوبەشیی ئاوایی حەوڵاکورده وەردەگرن.

ئاوی خواردنەوەی ڕفته لوولەکێشیی نەکراوه و هەر ماڵێک بۆخۆی چاڵاوی خۆی لێداوه.

هێندێک له قوتابیان بۆ درێژەدان به خوێندن ڕەوانەی خەلیفان و مەهاباد دەبن و کچان و کوڕانی ئاوایی دەرفەتی خوێندنیان پێدەدرێ.

وەرزێری و ئاژەڵداری کاروپیشەی خەڵکی ئەم ئاوایییه. وەرزێران گەنم و جۆ دەچێنن و ئاژەڵەکانیان بریتین له مەڕ، مانگا و بزن. ئەم ئاوایییه بێجگه له چەند دارەگوێز، قەیسی، بادام، ترێ باخی نییه.

گرفتەکانی خەڵکی ئاوایی: نەبوونی مزگەوت، نەبوونی بنکەی تەندروستیی سەربەخۆ، نەبوونی شووڕای ئیسلامی، نەبوونی لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوه.

کۆنەگۆڕستانێک له بەری باشووری گوند هەڵکەوتووه که به "تاتۆکه" ناسراوه.

## زگدڕاو

زگدڕاو لە ١٦ کیلۆمیتری ڕۆژهەڵاتی شاری مەهاباد، بەشی ناوەندی و دێهستانی ئاختاچی ڕۆژاوا و لە ناوچەی محاڵ هەڵکەتووە. لە ٩ ماڵ و ٤٠ کەس پێکهاتووە، لەمانە ٢١ کەسیان پیاون و ١٩ کەسیش ژنن، لە ٢٢ کەسی خوێندەوار ١٢ کەس پیاون و ١٠ کەسیش ژنن، هەروەها لە ١٦ کەسی نەخوێندەوار ٧ کەسیان پیاون و ٩ کەسیش ژنن.
پانتایی ئاوایی ٤٠٠ هێکتارە، لەمە ٢٥٢ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و ١٤٨ هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.
زگدڕاو خاوەن ١٦٩/٥ هێکتار زەوی دێم، ١٦ هێکتار زەوی بەراو، ٣١ هێکتار باخ و ٧ تراکتۆرە.

ئاوایییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی بەسری

باکوور: ئاوایییەکانی بەردەمێش و خاتوونباخ

ڕۆژهەڵات: ئاوایی قەرەبڵاغ

ڕۆژاوا: ئاوایی تیکانلوجە

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باشوور: مەنجەڵشکێن و مەرغەول

باکوور: شاخی برایمە

ڕۆژاوا: ئاشەکۆن

"هەوارەقوڕ" یەکێکە لە کانیاوەکانی ئەم گوندە.
خەڵک دەڵێن ئەم ئاوایییە تا بەر لە ساڵەکانی ١٣٥٥ی هەتاوی، سی ماڵ بووە، پاشان وردەوردە لە ژمارەی دانیشتووان و ماڵەکان کەم بۆتەوە.
گشت خانووبەرەکان لە قوڕ و بەرد و میچی دار ساز کراون، لە خانووە نوێیەکاندا بلووکیش دەکار کراوە، ماڵەکان خاوەن حەوشەن و دەرگایان هەیە و بەرەو باشوور ساز کراون، لە ناوەندی ئاوایی گەلێک کاولەخانوو دێنە بەرچاو.
ئاوایی دوو ڕێگای هەیە یەکیان لە لای ڕۆژهەڵاتە و دەڕوا بۆ ئاوایی بەردەمێش، ئەوی دیکەیان لە باشوورە و بە مەودایەکی کەم دێتەوە سەر جادەی مەهاباد ـ بۆکان.
ئیمکاناتی ئاوایی: ١٣٥٨/١٠/١٩ کارەباکەی هەڵکراوە، سیمکارتی مخابەراتی دێهات، مزگەوتێک کە لە ساڵی ١٣٧٥ی هەتاوی ساز کراوە، هەروەها کۆنەمزگەوتێکی دیکە بە قوڕ و بەرد ساز کراوە. بۆ بنکەی تەندروستی و وەرگرتنی نەوت سەر بە ئاوایی"قەرەبڵاغ"ن، کەلوپەلی پێویست لە ئاوایی "خاتوونباخ" وەردەگرن.
ئەم گوندە لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوەی نییە و ئاوەکەیان لە چاڵاو دابین دەبێ، چەند ساڵێکە قوتابخانەی سەرەتایی ئەم ئاوایییە نەماوە و مامۆستایان بۆ نانێرن، هێندێک لە خوێندکاران بە گرفتێکی زۆرەوە لە قوتابخانەکانی شاری مەهاباد درێژە بە خوێندن دەدەن.
کاروپیشەی خەڵکی زگدڕاو ئاژەڵداری، وەرزێری و کرێکارییە. ئاژەڵەکانیان بریتین لە مەڕ و مانگا، زۆربەی ماڵەکان مەڕدارن، وەرزێرانیش گەنم و جۆ و نیسک دەچێنن. لە زگدڕاو چەند باخێک هەیە، بەڵام خاوەنەکەی خەڵکی ئاوایی نین و خاوەنەکانیان ئەو کەسانەن کە لە شار و شوێنەکانی دیکەڕا هاتوون و زەوییەکەیان کڕیوە و باخیان لێداوە، بەرهەمی ئەم باخانە سێو و هڵوویە.
گرفتەکانی خەڵکی ئاوایی: نەبوونی قوتابخانەی سەرەتایی، قیلەتاو نەبوونی مەودای ئاوایی تا جادەی سەرەکی کە مەودایەکە زۆر کەمە، نەبوونی لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە. گۆڕستانەکەی ئەم گوندە لە باشووری دێ لە مەودایەکی نزیک لە جادە هەڵکەوتووە.
زوو لە زگدڕاو دوو کەسی لێبوون بە ناوەکانی "خەلیل" و "بارام" کە بەیتبێژ بوون و لە ناوچەکەدا ناسراو بوون.

## زیندووقووڵ (زیندەقووڵ)

زیندووقووڵ لە ٥٧ کیلۆمیتری باشووری ڕۆژهەڵاتی شاری مەهاباد، بەشی خەلیفان و دێهستانی کانی بازاڕ و لە ناوچەی گەورکایەتی هەڵکەوتووە. لە ٢٧ ماڵ و ٢٠٨ کەس پێکهاتووە، لەمانە ٩٢ پیاون و ١١٦ کەسیش ژنن، لە ١١٢ کەسی خوێندەوار ٦٣ کەس پیاون و ٤٩ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٧٧ کەسی نەخوێندەوار ٢٢ کەسیان پیاون و ٥٥ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ٢٩٢٩ هێکتارە، لەمە ٢٢٩ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و ٢٧٠٠ هێکتار پاوان و لەوەرگەی دێیە.

زیندووقووڵ خاوەن ١١٠ هێکتار زەوی دێم، ٥ هێکتار زەوی بەراو، ٣ هێکتار باخ، ١١ تراکتۆر و ٢ لاوێردەیە.

مەودای ئاوایی تا ناوەندی خزمەتگوزارییەکانی وەرزێری "کانی بازاڕ" ٢٢ کیلۆمیترە.

ئاواییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاواییەکانی پاشبەرد و گامێشان

باکوور: ئاواییەکانی ئۆزونتاش و چوارگا

ڕۆژهەڵات: ئاوایی باراوا

ڕۆژئاوا: ئاوایی کولتەپە

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باشوور: کێوەکانی شەخسی و حەوشەی حەولاکەڵەی

باکوور: کێوی هەوەڵباس

ڕۆژهەڵات: کێوی نیسێ پرچنێ

ڕۆژئاوا: کێوی کاروانسەرا

کانیاوەکان بە کانی شەخسی (کانی کەوان)، خرەسێو، کانی سەید ئەحمەد، کەرێزەگەورە و کەرێزەچکۆڵە ناسراون.

زۆربەی ماڵەکان هەر لە قوڕ و بەرد و میچی دار ساز کراون، بلووک تا ڕادەیەکی کەم دەکار کراوە. ماڵەکان حەوشەیان هەیە و بە گشتی ڕوویان لە باشوورە و هەوراز هەڵکەوتوون، ئەم دێیە دوو کۆڵانی تێدایە کە ڕێک و ڕاستن و دوو چۆم بە ئاواییدا تێپەڕ دەبن کە لە شوێنێکدا یەک دەگرنەوە.

وەک بەساڵاچووان دەگێڕنەوە دەبێ یەکەم جار "مام بایز"ناوێک ئەم دێیەی ئاوەدان کردبێتەوە، پاشان ئەم دێیە بەجێ هێشتووە و لە "قالوێ شێخان" گیرساوەتەوە. لە دوای ئەم کەسە تایفەکانی "محەممەد ئەمینی" ، "ڕەسووڵزادە" ، سەید "ڕەحمان هاشمی" و لە دوای ئەوانیش کەسانێکی دیکە هاتوون و پەرەیان بە ئاوەدانی داوە. خەڵکی ئاوایی لە مێژوویەکی ١٥٠ تا ٢٠٠ساڵەی ئەم گوندە دەدوێن.

لە ڕۆژاوای زیندووقووڵ قەڵایەکی لێیە کە ڕوون نەبۆتەوە پێوەندی بە چ سەردەمێکەوەیە. خەڵکەکە لەگەڵ کێڵانی زەوی و مەزراکان زۆر جار تووشی دیزە و گۆزەی شکاو دێن کە مێژوویی بوونی ئاواییەکە دەردەخەن. لە باشووری دێ ڕێگایەکی خاکی دەچێتەوە ئاوایی گامێشان، لە ڕۆژاواوە ڕێگایەکی خاکی ئاوایی کولتەپە و لەوێرا ڕێگای قیلەتاوی مەهاباد ـ سەردەشت دەگرێتەوە.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی ١٣٧٥/١٢/٤ کارەباکەی هەڵکراوە، بنکەی مخابەرات، قوتابخانەی سەرەتایی (کوڕانە ـ کچانە) بە ناوی "عێرفان"، مزگەوتێک کە لە قوڕ و بەرد ساز کراوە و میچەکەی لە دارە و دیوی دەرێی چیمەنتۆیە. ئەو دێیە خاوەن شووڕای ئیسلامییە.

ئاوی دێ لە چاڵاو دابین دەبێ و لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوەی نییە. بۆ وەرگرتنی کەلوپەل و نەوت، ڕێگای ئاوایی "کیتکە" دەپێون و بۆ بنکەی تەندروستی سەر بە ئاوایی "کولتەپە"ن.

خوێندکاران کە زۆرتر کوڕن بۆ درێژەدان بە خوێندن دەچنە خەلیفان و مەهاباد.

وەرزێری، ئاژەڵداری، باخداری و کرێکاری کاروپیشەی خەڵکی زیندووقووڵە، وەرزێران گەنم، جۆ، نۆک، پەرش، گوڵەپێغەمبەرە و وێنجە دەچێنن و ئاژەڵەکانیان مەڕ، بزن و مانگان. هەروەها بەرهەمی باخەکان پێکهاتەیەکە لە سێو، قەیسی، گوێز، ئاڵووباڵوو و ترێ.

گرفتەکانی خەڵکی ئاوایی: پتەو نەبوونی پردی پەڕینەوەی کولتەپە و زیندووقووڵ بۆ ترۆمبیلەکان، ڕێگای خاکی و ناخۆش، گرفتی ئاو و دەرنەکردنی ئاوەڕۆ، هەر چەند بینای قوتابخانە لەمێژ نییە ساز کراوە، بەڵام لە بنەڕەتەوە خراپ ساز کراوە.

گۆڕستانی "قەبری چەقالە" و گۆڕستانی "زیندووی باخی" گۆڕستانەکانی ئەم گوندەن.

# زێوه

زێوه له ٣٥ کیلۆمیتری باشووری ڕۆژاوای شاری مەهاباد، بەشی خەلیفان و دێهستانی مەنگوڕی ڕۆژهەڵات و له ناوچەی مەنگوڕایەتی هەڵکەوتووه. له ٣٨ ماڵ و ١٣٩ کەس پێکهاتووه، لەمانه ٧٢ کەسیان پیاون و ٦٧ کەسیش ژنن، ژمارەی خوێندەوارانی ئەم ئاوایییه ٦٢ کەسه که ٤٣ کەس پیاون و ١٩ کەسیش ژنن، هەروەها له ٥٥ کەسی نەخوێندەوار ١٦ کەسیان پیاون و ٣٩ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ٤٥٨٥ هێکتاره، لەمه ٨٥ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوه و ٤٥٠٠ هێکتار پاوان و لەوەرگەی دێیه.

زێوه خاوەن ٢٥٣ هێکتار زەوی دێم، ١٥٢/١ هێکتار زەوی بەراو، ٣٤/٤٧ هێکتار باخ، ٦ تراکتۆر و ٢ لاوێردەیه.

بەرزایی ئاوایی له ڕووکەشی زەریاکانەوه ١٥٠٠ میتره.

ئاوایییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی سەرتان

باکوور: ئاوایی سمێنو

ڕۆژهەڵات: ئاوایی ئامێد

ڕۆژاوا: ئاوایی خانەگێ مەنگوڕان

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باشوور: تووان

باکوور: دووکچه

ڕۆژهەڵات: بۆگەنیوه

کانی کەندۆڵان، کانی چیا، کانی پیاوان، کانی ژنان، کانی بەرگوێزان، کانی شێخی و کانی دووکچه چەند کانیاوێکی ئاوایین. جێگای سرنجه ئەو ئاوایییه خاوەن ٣٢ کانیاوه.

ماڵەکان له قوڕ و بەردن و گشتیان میچەکانیان له داره، کۆڵانەکان خێچوخوار و بەرەو هەوراز هەڵکەوتوون، ماڵەکان حەوشەیان نییه و هەیوانیان هەیه که چەند کۆڵەکەیان بۆ داکوتاون و زۆربەیان بەرەورووی باشوور هەڵکەوتوون.

سەبارەت به مێژووی ئاوایی هیچ زانیارییەک له بەردەستدا نییه، ناوەکەشی وەک مێژووەکەی جێگای لێکۆڵینەوەیه و هاوناوی ئەم گونده له چەند ناوچەی کوردستان بەتایبەت له شاری سەقز هەیه که شوێنەوارێکی کەونارایه، زێوه له فەرهەنگی "هەنبانەبۆرینه"دا* به مانای چاک و پیر هاتووه. خەڵکی ئاوایی ڕایان وایه ناوی ئاوایییەکەیان له "زێ"وه هاتووه و ئەوەش به هۆی نزیک بوونی زێ له ئاوایییەکەیانه.

له ڕۆژاوای زێوه ڕێگایەکی خاکی نزیک به ٥٠٠ میتر تێکەڵی ڕێگای سەرەکی خاکی دەبێتەوه.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی 1373/12/05 کارەباکەی هەڵکراوه، لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوه (عەنباراویان نییه و زیاتر له ئاوی چاڵاو و کانیاو کەلک وەردەگرن)، مزگەوتێک که ساڵی ١٣٧٢ نۆژەن کراوەتەوه، شەریکەی هاوبەشیی نەوت، قوتابخانەی سەرەتایی (کوڕانه ـ کچانه) به ناوی "تۆحۆد"، بنکەی مخابەرات. هەروەها ئاوایی خاوەن شووڕای ئیسلامییه. بۆ وەرگرتنی کەلوپەل سەر به ئاوایی "سیاقۆڵ"ن، بۆ کەلک وەرگرتن له بنکەی تەندروستی، ڕێگای ئاوایی "سەرتان" دەپێون.

بۆ درێژەدان به خوێندن ڕێژەیەکی زۆر کەم له قوتابیان ئەویش تەنیا کوڕەکان ڕەوانەی ئاوایی خەلیفان یا شاری مەهاباد دەکرێن.

وەرزێری، ئاژەڵداری، کرێکاری و تا ڕادەیەکی زۆر کەم باخداری کاروپیشەی خەڵکی ئەم گوندەیان پێکهێناوه. وەرزێران گەنم، جۆ و نۆک دەچێنن و ئاژەڵەکانیان بریتین له: مەڕ، مانگا و بزن، هەروەها بەرهەمی باخەکان سێوه.

گرفتەکانی خەڵکی ئاوایی: ڕێگاوبانی سەخڵەت و ناخۆش که پێویسته چارەسەرێکی بۆ بدۆزنەوه، نەبوونی بنکەی تەندروستیی سەربەخۆ، نەبوونی قوتابخانەی ناوەندی.

زێوه خاوەن سێ گۆڕستانه بەم ناوانه: له بەشی باشوور گۆڕستانی "بەلابادینان"، له ڕۆژهەڵات "شێخی سەر ئاوەڵه" و له ڕۆژاوا "دەراوی ماڵان" و له هەر سێ گۆڕستان کەلک وەردەگیرێ.

مامۆستا مەلا "ئیبراهیم مەنگوڕی" ومەلا "محەممەد موهاجیری" وەکوو دوو زانا و کەسایەتیی ناسراوی ئایینی لەم ئاوایییه جێگای ئاماژەن.

---

* ل ٣٩٥، ستوونی دوویەم

## سارەوانان

سارەوانان لە ١٧ کیلۆمیتری ڕۆژهەڵاتی شاری مەهاباد، بەشی ناوەندی و دێهستانی ئاختاچی ڕۆژاوا و لە ناوچەی محاڵ هەڵکەوتووە. لە ١٠ ماڵ و ٦٣ کەس پێکهاتووە، لەمانە ٣٨ کەسیان پیاون و ٢٥ کەسیش ژنن، ژمارەی خوێندەوارانی ئەم ئاوایییە ٣٥ کەسە کە ٢٧ کەس پیاون و ٨ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٢٢ کەسی نەخوێندەوار ٦ کەسیان پیاون و ١٦ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ٥١٩ هێکتارە، لەمە 139/09 هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و 379/91 هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.

سارەوانان خاوەن ١٥٢ هێکتار زەوی دێم، ٢١ هێکتار زەوی بەراو، ٤ هێکتار باخ، ٤ تراکتۆر و ١ لاوێردەیە.

ئاوایییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی شیلاناوێ

باکوور: ئاواییەکانی حەوتەوانان و قەڵات

ڕۆژهەڵات: ئاوایی دەرمان

ڕۆژاوا: ئاوایییەکانی شیلاناوێ و لاچین

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باشوور: بۆزداغ و گوێڕەشان

باکوور: حەوت برایان

ڕۆژهەڵات: گامرێن و کڵاوکوور

گوڵبەندان، گۆل، بیران و حەمەشەریف لە کانیاوە بەناوبانگەکانی ئاوایین.

خانووبەرەکانی ئاوایی پێکهاتووە لە قوڕ، بەرد و مۆرە، بە گشتی میچەکانیان لە دارە، کۆڵانەکانی ئاوایی بەرەو هەوراز و ڕێکن، ماڵەکان ڕوو بە ڕۆژهەڵات ساز کراون و ئاوایی سارەوانان لە شوێنێکی بڵیند هەڵکەوتووە.

سەبارەت بە ناوی سارەوانان خەڵک دوو بۆچوونیان هەیە کە یەکیان دەڵێ: سارەوانان لە "سارەوان" وەرگیراوە کە بە مانای "وشترەوانە". جێگای ئاماژەیە ئەو ناوچەیە تا ساڵی ١٣٥٠ وشتری هەر لێ بووە. بۆچوونی دوویەم دەڵێ: لە ڕاستیدا پێشتر ئەم گوندە ناوی ساردەوانان بووە کە بە مانای شوێنێکی ساردە و پاشان لەگەڵ ڕەوتی ژیان و زمان وشەکە سوواوە و بۆتە "سارەوانان".

لە باکووری ئاوایی ڕێگایەکی خاکی هەیە کە دەچێتەوە ئاوایییەکانی حەوتەوانان و قەڵات، لە ڕۆژاواوە ڕێگایەکی خاکی ئاوایییەکانی شیلاناوێ و لاچین دەگرێتەوە.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی 1387/02/25 کارەبای بۆ چووە، بنکەی مخابەرات، قوتابخانەی سەرەتایی "ئارام" (کوڕانە - کچانە)، مزگەوتێک کە ساڵی ١٣٦٢ نۆژەن کراوەتەوە. خەڵکی ئاوایی بۆ کاروباری بنکەی تەندروستی سەر بە ئاوایی "لاچین"ن، نەوت و کەلوپەلی پێویستیش لە شەریکەی هاوبەشیی "پشتتەپ"ی مەهاباد دابین دەبێ.

قوتابیان بۆ درێژەدان بە خوێندن ڕەوانەی شاری مەهاباد دەکرێن، هەڵبەت کچەکان ناتوانن درێژە بە خوێندن بدەن.

بۆ ئاوی خواردنەوە زۆربەیان چاڵاویان لێداوە و کانییەکی پشت ماڵان وەک شوێنێکی گشتی کەلکی لێ وەردەگیرێ.

وەرزێری و ئاژەڵداری سەرەکیترین کاروپیشەی خەڵکی ئەم گوندەن.

وەرزێران گەنم، جۆ، نۆک، گوڵەبەڕۆژە و نیسک دەچێنن، ئاژەڵەکانیشیان مانگان.

گرفتەکانی خەڵکی ئاوایی: ڕێگاوبانی ناخۆش و خاکی، نەبوونی بنکەی تەندروستیی سەربەخۆ، نەبوونی بینایەکی باش بۆ قوتابخانە، پێویستی بە لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە و نەبوونی شووڕای ئاوایی.

گۆڕستانی هەر دوو ئاوایی "سارەوانان" و "حەوتەوانان" هاوبەشە و لە نێوان هەر دووک ئاواییدا هەڵکەوتووە و تەنانەت خەڵکی ئاوایی قەڵاتیش مردووی خۆیانی لێ دەنێژن.

## سلۆک

سلۆک لە 30/5 کیلۆمیتری باشووری ڕۆژاوای شاری مەهاباد، بەشی خەلیفان و دێهستانی مەنگوڕی ڕۆژهەلات و لە ناوچەی مەنگوڕایەتی هەڵکەوتووە. لە ٥٥ ماڵ و ١٥٦ کەس پێکهاتووە، لەمانە ٨٠ کەس پیاون و ٧٦ کەسیش ژنن، ژمارەی خوێندەوارانی ئەم ئاواییە ٩٥ کەسە کە ٥٩ کەسییان پیاون و ٦٦ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٥٠ کەسی نەخوێندەوار ١٥ کەسیان پیاون و ٣٥ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی 2753/5 هێکتارە، لەمە 253/5 هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و ٢٥٠٠ هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.

سلۆک خاوەن ٨٢/٩٤ هێکتار زەوی دێم، ٢٧/٧٥ هێکتار زەوی بەراو، ٨/٤١ هێکتار باخ، ٩ تراکتۆر و ٦ لاوێردەیە.

ئاواییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاواییەکانی شۆڕاوا و ئافان

باکوور: ئاواییەکانی ڕفتە و ئامێد

ڕۆژهەلات: ئاوایی کامەم

ڕۆژاوا: ئاواییەکانی مرانە، سەرتان، دۆڵبەهاروو و مەحموودئاوا

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باشوور: خەزێنە

باکوور: شاخەڕەشان

ڕۆژهەلات: مازەڵێ

ڕۆژاوا: تووان

کانی پیاوان، کانی سارد، تاتووکە، مەندۆکجار و گێوژێ لە کانیاوە بەناوبانگەکانی ئەم ئاواییەن.

خانووبەرەکانی ئاوایی لە قوڕ و بەردن و میچەکانیان لە دارن و تەنیا لە چەند ماڵێک بلووک دەکار کراوە، کۆڵانەکانی ئاوایی خێچوخوار و ناڕێکن و ماڵەکان حەوشەیان نییە، زۆربەی ماڵەکان بەرەو باشوور هەڵکەوتوون.

بەساڵاچووانی ئاوایی دەڵێن ئەم دێیە پێشوو لە بەری ڕۆژاوای شوێنەکەی ئێستای بووە کە بە هۆی سەخڵەتی شوێن و جێگاکەی گوێستوویانەتەوە، ئێستاش شوێنەواری کۆنەسلۆک هەر ماوە.

لە ڕۆژهەڵاتی ئاوایی ڕێگایەکی کە کیلۆمیترێک نابێ، دەگەڵ ڕێگاکەی قیلەتاوی دۆڵی ئافان تێکەڵ دەبێتەوە.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی 1375/05/04 کارەباکەی هەڵکراوە، سیمکارتی مخابەراتی دێهات، قوتابخانەی سەرەتایی (کوڕانە — کچانە) بە ناوی "جەننەت"، مزگەوت. هەروەها ئەم دێیە لە شووڕای ئیسلامی بەهرەمەندە. بۆ کاروباری بنکەی تەندروستی سەر بە ئاوایی "ئافان"ن، نەوت و کەلوپەلی پێویست لە شەریکەی ئاوایی "حەوڵاکوردە" وەردەگرن.

ژمارێکی کەم لە قوتابیان کە بۆیان دەرەخسێ درێژە بە خوێندن بدەن ڕەوانەی ئاوایی خەلیفان و شاری مەهاباد دەبن، کچان پاش تێپەڕ بوونی پۆلی سەرەتایی بە تەواوی دەست لە خوێندن هەڵدەگرن.

ئاوی خواردنەوەی خەڵکی ئاوایی لە "کانی پیاوان"ی ئەم گوندە دابین دەبێ.

کاروپیشەی خەڵکی "سلۆک" ئاژەڵداری، وەرزێری و تا ڕادەیەکیش باخدارییە. ئاژەڵەکانیان بریتین لە: مەڕ، مانگا و بزن، وەرزێران گەنم و جۆ دەچێنن و بەرهەمی باخەکانیان سێو، بادام و ترێیە.

گرفتەکانی خەڵکی ئاوایی: نەبوونی بینایەکی شیاو بۆ مزگەوت، نەبوونی بینا بۆ قوتابخانە، نەبوونی لوولەکێشی ئاوی خواردنەوە، نەبوونی بنکەی تەندروستیی سەربەخۆ.

گۆڕستانی ئاوایی لە بەری ڕۆژاوا هەڵکەوتووە.

هونەرمەندی ناسراو "مەحمەڵ"ی حەیرانبێژ و بەیتبێژ، ماوەیەکی زۆر لەم ئاواییە ژیاوە.

## سمێنوو

سمێنوو لە ٣١ کیلۆمیتری باشووری ڕۆژاوای شاری مەهاباد، بەشی خەلیفان و دێهستانی مەنگوڕی ڕۆژهەڵات و لە ناوچەی مەنگوڕایەتی هەڵکەوتووە.
لە ٢٢ ماڵ و ٨٧ کەس پێکهاتووە، لەمانە ٤٠ کەس پیاون و ٤٧ کەسیش ژنن، ژمارەی خوێندەوارانی ئەم ئاواییە ٤٦ کەسە کە ٢٣ کەس پیاون و ٢٣ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٣٣ کەسی نەخوێندەوار ١٤ کەس پیاون و ١٩ کەسیش ژنن.
پانتایی ئاوایی 3330/5 هێکتارە، لەمە 130/5 هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و ٣٢٠٠ هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.
سمێنوو خاوەن ٨٠ هێکتار زەوی دێم، ٤٩ هێکتار زەوی بەراو، ٢٣/٤٢ هێکتار باخ، ٢ تراکتۆر و ١ لاوێردەیە.

ئاواییەکانی دەوروبەر:
باشوور: ئاوایی زێوە
باکوور: ئاوایی مەزرا
ڕۆژهەڵات: ئاوایی سیاقوڵی سەرێ
ڕۆژاوا: ئاواییەکانی سێلم و کەڵەدنداوا

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:
باشوور: پشتماڵان
باکوور: کورتێ
ڕۆژهەڵات: بۆگەنیوە
ڕۆژاوا: خرێ بەرازی

خاڵە فەقێ، هەوار ئایشێ، گۆڕێ مشکێ و شیوەڕەش لە کانیاوە بەناوبانگەکانی ئاواییین.
بۆ ساز کردنی خانووەکانی ئاوایی قوڕ، بەرد و دار دەکار کراوە، ماڵەکان ڕوو لە باشوورن و هێندێک ڕوو لە ڕۆژاوان و شوێنەکانیان هەورازن، هێندێک لە ماڵەکان حەوشەیان هەیە، بەڵام دەروازەیان تێنەگیراوە.
بەساڵاچووانی ئاوایی سەبارەت بە مێژووی ئاوایی کە لە باب و باپیرانیان گوێ لێبووە دەگێڕنەوە: پێشتر ئەم دێیە کە ڕێکەوتەکەی تەواو ڕوون نەبۆوە، بەڵام خەڵک لایان وایە نزیک بە ١٥٠ ساڵ دەبێ، لە بەری ڕۆژهەڵاتی شوێنی ئێستای، لە داوێنی کێوی شیوەڕەش بووە کە پاشان بە هۆی سەخڵەت بوونی شوێن دەیگوێزرێتەوە.
لە ڕۆژاوای دێ ڕێگایەکی سەخڵەت و خاکی نزیک بە دوو کیلۆمیتر تێکەڵی جادەی سەرەکی دەبێتەوە.
ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی 1382/07/22 کارەبای بۆ هاتووە، سیمکارتی مخابەراتی دێهات، قوتابخانەی سەرەتایی (کوڕانە ــ کچانە) بە ناوی "مسباح". بۆ بنکەی تەندروستی ڕێگای باگردانی خوارێ دەپێون، نەوت و کەلوپەل لە شەریکەی هاوبەشیی سیاقوڵی خوارێ وەردەگرن. ئاوی دێ لە کانیاوێک بە ناوی "خاڵە فەقێ" دابین دەبێ.
بۆ درێژەدان بە خوێندن هێندێکی کەم لە قوتابیانی کوڕ ڕەوانەی خەلیفان و مەهاباد دەبن و کچان بە تەواوی بێبەش کراون.
کاروپیشەی خەڵکی ئاوایی ئاژەڵداری و وەرزێرییە، ئاژەڵەکان بریتین لە: مەڕ، مانگا و بزن. وەرزێرەکان گەنم، جۆ، نۆک و نیسک دەچێنن و وەکوو باخ، تازە نەمامی سێویان لێداوە.
گرفتەکانی ئاوایی: ڕێگاوبانی ناخۆش، نەبوونی لوولەکێشی ئاوی خواردنەوە، نەبوونی مزگەوت، نەبوونی بنکەی تەندروستیی سەربەخۆ، نەبوونی شووڕای ئیسلامی و نەبوونی بینایەکی شیاو بۆ قوتابخانە.
ئاوایی خاوەن گۆڕستانێکی تایبەت بە مندالانە کە لە بەری ڕۆژاوا هەڵکەوتووە، خەڵکی سمێنوو مردووەکانیان لە گۆڕستانی "بەرلانکێ" لە ئاوایی "سێلم" یان لە ئاوایی "زێوە" دەنێژن.

## سنجاغ (سنجاخ)

سەنجاغ لە ٣٤ کیلۆمیتری ڕۆژهەڵاتی شاری مەهاباد، بەشی ناوەندی و دێهستانی ئاختاچی ڕۆژاوا و لە ناوچەی محاڵ هەڵکەوتووە. لە ٨٩ ماڵ و ٤٧٩ کەس پێکهاتووە، لەمانە ٢٣٨ کەس پیاون و ٢٤١ کەسیش ژنن، ژمارەی خوێندەوارانی ئەم ئاوایی‌یە ٢٨٧ کەسە کە ١٥٤ کەس پیاون و ١٣٣ کەسیش ژنن، هەروەها لە ١٤٢ کەسی نەخوێندەوار ٥٤ کەس پیاون و ٨٨ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی 1156/35 هێکتارە، لەمە 652/7 هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و 503/65 هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.

سنجاغ خاوەن ٧٣٥ هێکتار زەوی دێم، ٢٦٢ هێکتار زەوی بەراو، ١٦٢ هێکتار باخ، ٤١ تراکتۆر و ٣ لاوێردەیە.

ئەم گوندە لە ڕووکەشی زەریاکانەوە لە بەرزایی ١٥٦٠ میتر هەڵکەوتووە.

ئاوایی‌یەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی‌یەکانی خاتوونخاس و حاجیالی‌کەند

باکوور: ئاوایی‌یەکانی باجەوەند و ئازاد

ڕۆژهەڵات: ئاوایی مەنوچێر

ڕۆژاوا: ئاوایی ئازاد

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باشوور: ئالمەلوو

باکوور: سوور

ڕۆژهەڵات: گلەسپیە

ڕۆژاوا: قەرەولوو

کەرەیزەی شێخەبەگی، کەوە، باستام، خدر بێ‌سێو، چۆرچۆرە و کانی سارد، کانیاوە بەناوبانگەکانی ئاوایین.

زۆرتری خانووبەرەکانی ئەم ئاوایی‌یە لە قوڕ و بەرد ساز کراون و خانووبەرەی تازەی بە بلووک و خشت کەمتر دێتە بەرچاو، زۆربەی میچی ماڵەکان لە دارە، زۆرتری خانووبەرەکان بەرەورووی ڕۆژهەڵات و باشوور ساز کراون، حەوشەیان هەیە و دەرِوازەیان تێگیراوە. ئاوایی لە چەند کۆڵانێکی دووروودرێژ و نارێک پێکهاتووە.

"قەڵاتگە" لە ڕۆژهەڵاتی ئاوایی و "قەڵاکۆن" لە نێو ماڵان وەک دوو شوێنەواری مێژوویی دێنە بەر چاو. لە بەری ڕۆژهەڵاتی ئاوایی، ئاسەواری ئاوایی‌یەکی چۆڵ کراوی "باستام" دەبیندرێ. ئەوە ڕوون نیە چۆنە ناوی ئاوایی بۆتە سنجاغ.

لە بەری باشوورەوە ڕێگای خاکی ئاوایی‌یەکانی خاتوون خاس و حاجیالی‌کەند دەگرێتەوە، لە باکوورەوە ڕێگایەکی خاکی دەچێتەوە ئاوایی باجەوەند، لە بەری ڕۆژهەڵاتەوە ڕێگایەکی خاکی دەچێ بۆ ئاوایی "مەنوچێر"، لە ڕۆژاواوە ڕێگایەکی ئامادە بە قیلەتاو ئاوایی ئازاد و بۆزە دەگرێتەوە.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی 1365/06/10 کارەبای هەڵکراوە، لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە (عەنباراو هەر لە نێو دێیە کە ئاوەکەی لە چاڵاوی قووڵ دابین دەبێ) جێگای ئامازەیە ئاوبەندی سنجاغ ساڵی ١٣٨٨ دامەزرا، سیمکارتی مخابەراتی دێهات، قوتابخانەی سەرەتایی و ناوەندی بە ناوی "حۆر"، بنکەی تەندروستی، مزگەوت و هەروەها ئاوایی لە دێهیاری و شووڕای ئیسلامی بەهرەمەندە. بۆ وەرگرتنی نەوت و کەلوپەل سەر بە شەریکەی هاوبەشیی ئاوایی "حاجیالی‌کەند"ن.

قوتابیان بۆ درێژەدان بە خوێندن ڕەوانەی شاری مەهاباد دەبن کە جیاوازییەکی ئەوتۆ لە نێوان کچان و کوڕاندا بۆ خوێندن نییە.

وەرزێری، ئاژەڵداری، باخداری و کرێکاری لە کوورەخانە و مەعدەنی ئاوایی، سەرەکی‌ترین کاروپیشەی خەڵکی ئەم گوندەن.

وەرزێران گەنم، جۆ و نۆک دەچێنن، ئاژەڵەکان بریتین لە: مانگا و تا ڕادەیەک مەڕ و بزنیش ڕادەگرن. بەرهەمی باخەکان بریتین لە: سێو، هڵو، قەیسی و بادام.

گرفتەکانی خەڵکی ئاوایی: کەم‌ئاوی و بێکاریی لاوەکان. سنجاغ گۆڕستانێکی تایبەت بە خۆی هەیە.

## سۆڵغە

سۆڵغە لە 40 کیلۆمیتری باشووری ڕۆژاوای شاری مەهاباد، بەشی خەلیفان و دێهستانی مەنگوڕی ڕۆژهەڵات و لە ناوچەی مەنگوڕایەتی هەڵکەوتووە.
لە 24 ماڵ و 197 کەس پێکهاتووە، لەمانە 95 کەس پیاون و ١٠٢ کەسیش ژنن، ژمارەی خوێندەوارانی ئەم ئاواییە 118 کەسە کە ٦٤ کەس پیاون و ٥٤ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٥٢ کەسی نەخوێندەوار ١٦ کەسیان پیاون و ٣٦ کەسیش ژنن.
پانتایی ئاوایی 1103 هێکتارە، لەمە 183/25 هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و 919/75 هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.
سۆڵغە خاوەن ١٣٦/٧ هێکتار زەوی دێم، ١٦/٣ هێکتار زەوی بەراو، ٣/١٠ هێکتار باخ، ٣ تراکتۆر و ١ لاوێردەیە.

ئاواییەکانی دەوروبەر:
باشوور: ئاوایی میرەسێ
باکوور: ئاوایی مرانە
ڕۆژهەڵات: ئاوایی ئەسحاب
ڕۆژاوا: ئاوایی ئافان

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:
باشوور: کاک حەسەنە
ڕۆژهەڵات: خۆلەپۆلێ
ڕۆژاوا: گۆزەڵ

کانی لووسێ و زیارەتێ دوو کانیاوی بەناوبانگی ئاوایین.
گشت ماڵەکان لە قوڕ و بەرد و میچی دار ساز کراون، هیچ کام لە ماڵەکان حەوشەیان نییە و ڕوو لە ڕۆژاوان، مزگەوت لە خوارووی ئاوایی هەڵکەوتووە کە لە خشت و چیمەنتۆ و ئاسنە، کۆڵانەکان خواروخێچ و بەرەو هەوراز هەڵکەوتوون.
مێژووی ئەم ئاواییە لە 70 ساڵ تێپەڕ نابێ وەک بەساڵاچووان باس دەکەن بەردی بناغەی لە لایەن مام سلەمان حاجی نەبی دانراوە و خەڵکەکەی لە ئاوایی "مرانە"وە ڕوویان لەم شوێنە کردووە. "مام سلەمان" بۆخۆی و خزم و کەسی لەم گوندە سەقامگیر بوون. سەبارەت بە ناوەکەشی دەبێ بڵێین پێش ئاوەدان کردنەوە، ئەو شوێنە مەزرا بووە و هەر بە مەزرای سۆڵغە ناسراوە.
لە باکووری ئاوایی ڕێگایەکی خاکی بۆ ئاوایی مرانە دەچێ، لە ڕۆژهەڵاتەوە ڕێگایەکی خاکی تێکەڵ ڕێگای دۆڵی ئافان دەبێتەوە.
جێگای ئاماژەیە گەردەنەی "خۆلەپۆلێ" لە ڕۆژاوای سۆڵغە هەڵکەوتووە و 14 ئاوایی بەم شوێنەدا هامووشۆ دەکەن کە لە زستانانی سەخڵەتدا جاری وایە بە ماوەی یەک حەفتە یا زیاتر بە هۆی ڕنوو و بەفر دەگیرێ و هاتووچۆ لەم دێیانە تووشی گرفت دەبێ.
ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی 1387/03/18 کارەباکەی هەڵکراوە، سیمکارتی مخابەراتی دێهات، قوتابخانەی سەرەتایی"قەڵەم" (کوڕانە ـــ کچانە)، مزگەوتی"محەممەدڕەسووڵەڵلا " (د.خ) و هەروەها سۆڵغە خاوەن شووڕای ئیسلامییە. بۆ بنکەی تەندروستی سەر بە ئاوایی "مرانە"ن و نەوت و کەلوپەل لە ئاوایی سیاقوڵی خوارێ وەردەگرن.
شایانی باسە قوتابخانەکەیان لە ڕیزی ئەو قوتابخانانە ڕاگەیەندراوە کە مەترسیی ڕووخانی هەیە، تاقمێکی زۆر کەم لە قوتابییە کوڕەکان، دوای پۆلی سەرەتایی، بۆ درێژەدان بە خوێندن ڕەوانەی ئاوایی خەلیفان یا شاری مەهاباد دەبن.
خەڵکەکەی ئاژەڵداری، وەرزێری و کرێکاری دەکەن. ئاژەڵەکانی ئەم ئاواییە مەڕ، مانگا و بزنە. وەرزێران گەنم، نۆک و جۆ دەچێنن. چەند ماڵ لەم دێیە لە وەرزی بەهار تا بەرەبەری پاییز ڕوو لە هەوارەکانی "جانداران" و "پیرەسەنان" دەکەن.
گرفتەکانی خەڵکی ئاوایی: ڕێگاوبانی ناخۆش و خاکی، کەمئاوی، نەبوونی بنکەی تەندروستی سەربەخۆ و نەبوونی بینای قوتابخانە. خەڵکی سۆڵغە ئێستاش لە ئاوی خواردنەوەی بێهداشتی بەهرەمەند نین و هەر کەس لە ماڵە خۆی چاڵاوی لێداوە یان لە کانی لووسێ بە تونگە و گۆزان ئاو دەبەنەوە.
ئەوان مردووەکانیان لە گۆڕستانی ئاوایی "ئەسحاب" دەنێژن، هەڵبەت خۆیان خاوەن گۆڕستانێکن کە تایبەت بەو منداڵانن کە دەمرن.

# سوورخاو

سوورخاو لە ٥٧ کیلۆمیتری باشووری ڕۆژاوای شاری مەهاباد، بەشی خەلیفان و دێهستانی مەنگوڕی ڕۆژهەڵات و لە ناوچەی مەنگوڕایەتی هەڵکەوتووە. لە ١٠ ماڵ و ١٠٧ کەس پێکهاتووە، لەمانە ٦٠ کەس پیاون و ٤٧ کەسیش ژنن، گشت ئەو کەسانەی کە لەم ئاواییە خوێندوارن ٦٢ کەسن کە ٤٦ کەسیان پیاون و ١٦ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٤١ کەسی نەخوێندەوار ١١ کەس پیاون و ٣٠ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ١٠٦٨/٣٦ هێکتارە، لەمە ٤٠/٠٨ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە، ١٠٢٨/٢٨ هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.

سوورخاو خاوەن ٦١ هێکتار زەوی دێم، ٣١ هێکتار زەوی بەراو، ٨/٩٤ هێکتار باخ و ٢ تراکتۆرە.

ئاوایی‌یەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی چۆمەڵ

باکوور: ئاوایی‌یەکانی مەحموودئاوا و کیسەڵان

ڕۆژهەڵات: ئاوایی‌یەکانی کوران و یاراڵی

ڕۆژاوا: ئاوایی‌یەکانی جانداران و گاگەشی خوارێ

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باشوور: شاخی مێشێ

باکوور: شاخی قەرەیەخە

ڕۆژهەڵات: نێرخاسان

ڕۆژاوا: گردەلووک

کانیاوەکان بە مام سوار، کانی نێرخاسان، قۆرغێ و نێوماڵان ناسراون.

ئەم گوندە خاوەن کوێستانەکانی نێرخاسان، مام سوار و سەرچاوەی قۆرغێیە.

خانووبەرەکان هەر لە قوڕ و بەردن و میچەکان لە دارن، ماڵەکان ڕوو لە باشوورن و کەمتر خاوەن حەوشەن، کۆڵانەکان بچووک و بەرتەسک هەڵکەوتوون و هەروەها بەرەو هەورازن ، چۆمێک بە نزیک ئاوایی‌دا تێپەڕ دەبێ.

سەبارەت بە ئاوەدان کردنەوەی ئەم گوندە دانیشتووانی دەڵێن: سوورخاو ئاوایی‌یەکی لەمێژینەیە، بەڵام ماوەیەکی زۆر چۆڵ بووە و داویین جار نزیک بە ٦٠ ساڵ لەمەوبەر کەسێک بە ناوی مەلا "ڕەسووڵ زەکی" لە ئاوایی "ترکەش" هاتووە و ئاوەدانی کردۆتەوە.

لە ڕۆژهەڵاتی سوورخاو قەڵایەک هەڵکەوتووە بە ناوی نێرخاسان. سەبارەت بە ناوی ئاواییش دەگێڕنەوە کە لەم ناوچەیە ژنێک حوکمڕانی کردووە بە ناوی "سوورخان" کە قەڵای نێرخاسان مەقەڕی بووە و ناوی ئاوایی دەبێ لە ناوی ئەو ژنەوە وەرگیرابێ [ئەوە ڕا و بۆچوونی خەڵکی ئاوایی‌یە و هیچ بەڵگەیەکی مێژووییمان لەو بوارەوە بەدەستەوە نییە].

لە بەری باکوورەوە ڕێگایەکی خاکی ئاوایی‌یەکانی کیسەڵان و جانداران دەگرێتەوە، لە ڕۆژهەڵاتەوە ڕێگایەکی خاکی و سەخڵەت دەچێتەوە ئاوایی کوران.

ئیمکاناتی ئاوایی: ١٣٧٩/١/٣١ کارەباکەی هەڵکراوە، بنکەی مخابەرات، قوتابخانەی سەرەتایی (کوڕانە ـ کچانە) بە ناوی "عەدڵ"، کانگای بەرد. بۆ بنکەی تەندروستی و وەرگرتنی نەوت سەر بە ئاوایی "مێرەسێ"ن، کەلوپەلیش لە شەریکەی هاوبەشیی "حەوڵاکوردە" وەردەگرن. ئاوی ئەم دێیە لوولەکێشیی بۆ نەکراوە و هەر کەس لە کانیاوێکڕا ئاوی بۆ ماڵە خۆی کێشاوە. مزگەوتیان نییە، بەڵام لە پەنا کانیاوەکان چەند "تات"ێکی گەورە و تەختیان بۆ نوێژ کردن داناوە.

ڕادەیەکی کەم لە کوڕانی قوتابی پۆلی سەرەتایی دەتوانن لە خەلیفان و مەهاباد درێژە بە خوێندن بدەن.

کاروپیشەی دانیشتووانی سوورخاو ئاژەڵداری، وەرزێری و مێشداریییە، ئاژەڵەکان مەڕ، مانگا و بزنن، وەرزێران گەنم، جۆ و نۆک دەچێنن.

گرفتەکانی خەڵکی ئاوایی: ڕێگاوبانی ناخۆش، نەبوونی بنکەی تەندروستیی سەربەخۆ، نەبوونی بینای قوتابخانە، نەبوونی شووڕای ئیسلامی و پێویستی بە لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوەیە.

ئەو دێیە خاوەن دوو گۆڕستانە، لە باکووری ڕۆژاوا "قەبری مەلا ڕەحمان" هەڵکەوتووە کە منداڵی لێ دەنێژن، لە ڕۆژاوا "مەرقەدی مەلا عەلی" کە گۆڕستانی گشتییە، هەروەها بۆ ناشتنی مردووکان لە گۆڕستانی ئاوایی جاندارانیش کەلک وەردەگرن.

## سوێناس

سوێناس لە ٦٦ کیلۆمیتری باشووری ڕۆژهەڵاتی شاری مەهاباد، بەشی خەلیفان و دێهستانی کانی بازاڕ و لە ناوچەی گەورکایەتی هەڵکەوتووە. لە ٦٢ ماڵ و ٣٩٤ کەس پێکهاتووە، لەمانە ١٩١ کەسیان پیاون و ٢٠٣ کەسیش ژنن، لە ٢٥٥ کەسی خوێندەوار ١٤٢ کەس پیاون و ١١٣ کەسیش ژنن، هەروەها لە ١٠٥ کەسی نەخوێندەوار ٣٦ کەسیان پیاون و ٦٩ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ٤٩٥٠ هێکتارە، لەمە ٢٢١/٢ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و ٤٧٢٨/٨ هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.

سوێناس خاوەن ١٢٠ هێکتار زەوی دێم، ٢٠ هێکتار زەوی بەراو، ٢٢ هێکتار باخ (٨ هێکتار سێوە)، پێنج تراکتۆر و یەک لاوێردەیە.

ئەم گوندە لە ڕووکەشی زەریاکانەوە لە بەرزایی ١٥٩٠ میتر هەڵکەوتووە.

ئاواییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی گردشیلان

باکوور: ئاواییەکانی پاشبەرد و گامێشان

ڕۆژهەڵات: ئاواییەکانی ئاغوەتمان و گورگە (سەر بە بۆکانن)

ڕۆژاوا: ئاواییەکانی کاوڵانی سەرێ و خوارێ، قەرەنیئاوا و کانی ڕەش

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باشوور: کوێستانی تۆرە

باکوور: کێوی قەڵاتەڕەش

ڕوژهەڵات: کێوی ماینەخوار

ڕۆژاوا: کێوکاوێ

کانی کەتیرەکەران، خڕی هارۆییان، خڕی سەختێ و قەبرەوردان چەند کانیاوێکی "سوێناس"ن.

جگە لە چەند خانوویەک گشت خانووبەرەکان لە قوڕ و بەرد و میچی دار ساز کراون.

زۆربەی ماڵەکان بەرەوڕووی باشوورن و حەوشەیان نییە و هەوراز هەڵکەوتوون، ڕێگا بە ناوەندی ئاواییدا تێپەڕ دەبێ و بە ڕادەیەکی زۆر لە ماڵەکان پشتیان لە ڕێگایە و لە خوارەون.

لە ڕۆژهەڵاتی ئەم گوندە شوێنێک هەیە بە "کۆنەشار" ناسراوە کە ئێستاش ئاسەواری هەر ماوە، دەڵێن پێشتر ئەو جێگایە ئاوەدان بووە.

لە ڕۆژهەڵاتی دێ ڕێگایەکی خاکی ئاواییەکانی ماژگە و گردشیلان دەگرێتەوە، هەر ئەم ڕێگایە ڕێگایەکی دیکەی لێ دەبێتەوە کە دەچێتەوە شاری بۆکان، لە ڕۆژاواش ڕێگایەکی خاکی بە مەودای ٧ کیلۆمیتر دەچێتەوە سەر ڕێگای قیلەتاوی مەهاباد ـ سەردەشت.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی ١٣٧٣/١٢/٢ کارەباکەی هەڵکراوە، لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە کە عەنباراویان بۆ داناوە و لە "خڕی هارۆییان" و "خڕی سەختێ" ئاوەکەی دابین دەبێ، تەلەیفوونی ماڵ بە ماڵ، پۆستبانک، ناوەندی مخابەرات، بنکەی تەندروستی، قوتابخانەی سەرەتایی (کوڕانە ـ کچانە) بە ناوی "یاسر"، مزگەوتێک کە کۆنە و لە ناوەندی دێیە و هەروەها ئەو دێیە خاوەن دێهیاری و شووڕای ئیسلامییە. کەلوپەل و نەوت لە شەریکەی هاوبەشیی ئاوایی "کاوڵان"ی خوارێ وەردەگرن. خوێندکاران بۆ درێژەدان بە خوێندن ڕەوانەی خەلیفان و شاری مەهاباد دەبن، کچان کەمتر توانیویانە لە خوێندن بەهرەمەند بن.

ئاژەڵداری، وەرزێری و کرێکاری کاروپیشەی خەڵکی ئەم گوندەن، زۆرتری ئاژەڵەکان مانگان و تا ڕادەیەکی کەمتر مەڕ و بزن ڕادەگرن. وەرزێران گەنم، جۆ و نۆک دەچێنن، لە سوێناس تازە هێندێک دارسێو، بادام و مێو لێدراون.

گرفتەکانی خەڵکی سوێناس: ڕێگای خاکی و ناخۆش، مەترسی ڕووخانی بینای قوتابخانە و بنکەی تەندروستی، ئاوەکەی دێ هەرچەند لوولەکێشیی بۆ کراوە، بەڵام بێهداشتی نییە.

سوێناس سێ گۆڕستانی لێیە، لە بەری باشوورەوە: گۆڕستانی "سەیدەچکۆلە" و گۆڕستانی "تازە"، لە ڕۆژهەڵاتەوە "قەبرەوردان" کە گۆڕی منداڵانە.

## سەرتان

سەرتان لە ٣٤ کیلۆمیتری باشووری ڕۆژاوای شاری مەهاباد، بەشی خەلیفان و دێهستانی مەنگوڕی ڕۆژهەڵات و لە ناوچەی مەنگوڕایەتی هەڵکەوتووە.
لە ٥١ ماڵ و ٢٥٠ کەس پێکهاتووە، لەمانە ١٣٣ کەسیان پیاون و ١١٧ کەسیش ژنن، لە ١٠٨ کەسی خوێندەوار ٦٧ کەس پیاون و ٤١ کەسیش ژنن، هەروەها لە ١١٤ کەسی نەخوێندەوار ٤٩ کەسیان پیاون و ٦٥ کەسیش ژنن.
پانتایی ئاوایی ٩٩٨ هێکتارە، لەمە ١٧٩/٨ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و ٨١٨/٢ هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.
سەرتان خاوەن ١٧١/٥ هێکتار زەوی دێم، ٧٩/٥ هێکتار زەوی بەراو، ٩/٥٩ هێکتار باخ، ٧ تراکتۆر و ٢ لاوێردەیە.

ئاواییەکانی دەوروبەر:
باشوور: ئاواییەکانی دۆڵبەهاروو و مەحمووداوا
باکوور: ئاواییەکانی "خانەگێ"ی مەنگوڕان و زێوە
ڕۆژهەڵات: ئاوایی ئامێد
ڕۆژاوا: ئاوایی گۆمڵیان

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:
باشوور: کێوی بەهارەواران
باکوور: پاش خانوان
ڕۆژهەڵات: بۆگەنیوە

سەرتان دوو کانیاوی هەیە بە ناوەکانی: هەباس ئاغا و گۆلان.
جگە لە چەند خانووبەرەیەکی ئەم ئاواییە کە بە خشت، چیمەنتۆ و ئاسن ساز کراون، خانووبەرەکان هەموویان لە قوڕ و بەردن و میچیان لە دارە، ماڵەکان حەوشەیان نییە و هێندێکیان هەیوانیان هەیە، بەشێکی زۆر لە ماڵەکان بەرەو باشوور ساز کراون و هەوراز هەڵکەوتوون، لەو بەری ئاوایی هێندێک ماڵی دیکە هەن کە ڕوویان لە باکوورە، کۆڵانەکان پێچاوپێچ و نارێکن و هێندێک هەورازن.
لە ڕۆژهەڵاتی گوندەوە کوێرەڕێیەک بە پشت کێوی بەهارەواراندا دەچێتەوە ئاواییەکانی دۆڵبەهاروو و مەحمووداوا، لە ڕۆژاواوە ڕێگایەکی خاکی بە مەودای یەک کیلۆمیتر خاکی، دەچێتەوە سەر ڕێگای دۆڵی زێوە.
ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی ١٣٧٦/٦/١١ کارەبای بۆ چووە، لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە کە لە کانی ماڵان دابین دەبێ و ساڵی ١٣٨٧ی هەتاوی جێبەجێ کراوە، بنکەی مخابەرات، بنکەی تەندروستی، قوتابخانەی سەرەتایی "ئیمام عەلی" (کوڕانە ـ کچانە)، کۆنەمزگەوتێک و هەروەها ئەم دێیە خاوەن شووڕای ئیسلامییە. نەوت لە ئاوایی "سێلم" وەردەگرن و بۆ کەلوپەلی پێویستیش سەر بە "سیاقوڵی خوارێ"ن.
خوێندکارانی کوڕ بۆ درێژەدان بە خوێندن ڕەوانەی خەلیفان و مەهاباد دەبن و کچان دەست لە خوێندن هەڵدەگرن.
وەرزێری، ئاژەڵداری و کرێکاری کاروپیشەی خەڵکی ئەم گوندەن، سێ ماڵ باخدارن، وەرزێران گەنم، جۆ و نۆک دەچێنن و ئاژەڵەکانیان مەڕن و تا ڕادەیەک بزن و مانگاش ڕادەگرن، باخەکانیان ساوان و دار سێون.
گرفتەکانی خەڵکی سەرتان: ڕێگای خاکی و ناخۆش کە پێویستە قیلەتاو بکرێ، تا ڕادەیەکیش کەمئاوی.
گۆڕستان لە نزیکی ئاوایی هەڵکەوتووە.

## سەرتەنگ

سەرتەنگ لە ٤٤ کیلۆمیتری باشووری ڕۆژاوای شاری مەهاباد، بەشی خەلیفان و دێهستانی مەنگوڕی ڕۆژهەلات و لە ناوچەی مەنگوڕایەتی هەڵکەوتووە. لە ٤ ماڵ و ٢٤ کەس پێکهاتووە، لەمانە ١٠ کەسیان پیاون و ١٤ کەسیش ژنن، لە ٦ کەسی خوێندەوار ٤ کەس پیاون و ٢ کەسیش ژنن، هەروەها لە ١٧ کەسی نەخوێندەوار ٥ کەس پیاون و ١٢ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ١١٥٠ هێکتارە، لەمە ٢٨/٣ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و ١١١٨/٣ هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.

سەرتەنگ خاوەن ٢٣ هێکتار زەوی دێم، ٣٣/٥ هێکتار زەوی بەراو و ٣/٩ هێکتار باخە.

ئاواییەکانی دەورووبەر:

باشوور: ئاواییەکانی قەڵاتی سنان و نێڵان

باکوور: ئاوایی سەرهۆڵان

ڕۆژهەڵات: ئاوایی شێخان

ڕۆژاوا: ئاواییەکانی کانی زەرد و بەردەسپیان و هەوشینان

چیاکانی دەورووبەری ئاوایی:

باشوور: شاخی قاتر

باکوور: کێوی ڕەش هەرمێیان

ڕۆژهەڵات: شاخەسوور

ڕۆژاوا: کێوی لەندی شێخان

لەم دێیە ئەشکەوتێکی لێیە بە ناوی "گۆمەشین"، ئەشکەوتی "قەڵاتی شای" لە بەشی ڕۆژاوایە و هەروەها قەڵاتی "سەرتەنگ" لە نزیک ئاوایی هەڵکەوتووە.

هێندێک داری خۆڕسک وەکوو گێوژ، کرۆسک، شیلان و هەنجیر لە کێو و بەندەنەکانی ئەم ئاواییە ڕووارن. لە کێوەکان و دەورووبەری ئەو دێیە هەست بە بوونی هێندێک بوونەوەری وەکوو گورگ، ورچ، ڕێوی و... دەکرێ.

کانیاوەکانی سەرتەنگ بە مەولوود ڕیحان، گێوژێ و کانی سەرتەنگی (کانی پیاوان) ناسراون.

لەم دێیە گشت خانووەکان لە قوڕ و بەرد ساز کراون و میچەکانیان هەر لە دارە، هەڵبەت خانوویەک بە خشت ساز کراوە، هیچ کام لەو خانووانە حەوشەیان نییە و بە گشتی ڕوویان لە باشوورە.

لە باکووری ئاوایی ڕێگایەکی خاکی هەیە دەچێتە سەرهۆڵان، لە باشوورەوە ڕێگایەکی خاکی ئاواییەکانی قەڵاتی سنان و سێروو دەگرێتەوە.

سەرتەنگ لە ساڵی ١٣٨٢ی هەتاوییەوە کارەبای بۆ هاتووە و بنکەی مخابەراتیشی هەیە. بۆ وەرگرتنی نەوت و کەلوپەل سەر بە شەریکەی هاوبەشیی ئاوایی "سیاقۆڵی خوارێ"ن، بۆ بنکەی تەندروستی دەچنە ئاوایی باگردانی خوارێ.

خوێندکاران دەبێ بۆ پۆلی سەرەتایی بچنە ئاوایی سەرهۆڵان کە لەم دێیە نزیکە و زۆر کەم وا هەیە بتوانن لە دوای تەواو کردنی پۆلی سەرەتایی درێژە بە خوێندن بدەن.

لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوەیان نییە و لە ئاوی کانیاوەکان کەلک وەردەگرن.

کاروپیشەی خەڵکی سەرتەنگ ئاژەڵدارییە. هەموو ماڵەکان دەچنە هەوارەکانی لەندی شێخان و کانی کەچکێ. ئاژەڵەکانیان مەڕ و بزنە. تا ڕادەیەکیش مێشداری دەکەن، بەرهەمی باخەکانیان سێوە و بەریان کەمە و هەر بەشی خەڵکی گوندەکە دەکا.

گرفتەکانی خەڵکی سەرتەنگ زۆرن، بەڵام سەرەکیترین گرفتەکان بریتین لە: ڕێگای ناخۆش و خاکی، نەبوونی قوتابخانە، نەبوونی مزگەوت، نەبوونی بنکەی تەندروستیی سەربەخۆ.

ئەم ئاواییە خاوەن یەک گۆڕستانە کە خەڵکی ئاوایی "سەرهۆڵان"یش مردووی خۆیانی لێ دەنێژن.

## سەرهۆڵان

سەرهۆڵان لە ٤٦ کیلۆمیتری باشووری ڕۆژاوای شاری مەهاباد، بەشی خەلیفان و دێهستانی مەنگوڕی ڕۆژهەڵات و لە ناوچەی مەنگوڕایەتی هەڵکەوتووە. لە ٦ ماڵ و ٤٤ کەس پێکهاتووە، لەمانە ٢٨ کەس پیاون و ١٦ کەسیش ژنن، لە ٢٣ کەسی خوێندەوار ١٧ کەسیان پیاون و ٦ کەسیش ژنن، هەروەها لە ١٦ کەسی نەخوێندەوار ٧ کەس پیاون و ٩ کەسیش ژنن.
پانتایی ئاوایی ١٢٠٠ هێکتارە، لەمە ٥٦ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و ١١٤٤ هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.
سەرهۆڵان خاوەن ٨/٥ هێکتار زەوی دێم، ١٣/٥ هێکتار زەوی بەراو و ٤/٩ هێکتار باخە.

ئاواییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاواییەکانی سەرتەنگ و نێلان
باکوور: ئاواییەکانی قشقوونەی سەرێ و خوارێ
ڕۆژهەڵات: ئاواییەکانی شێخان و سێروو
ڕۆژاوا: ئاواییەکانی کانی زەرد و بەردە سپیان و هەوشینان
(سەر بە شاری پیرانشار)

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باشوور: شاخەسوور
باکوور: کێوی ڕەشهەرمێیان
ڕۆژهەڵات: بەشێک لە شاخەسوور
ڕۆژاوا: لەندی شێخان

لە کێوەکانی ئەم دێیە هێندێک بوونەوەری وەکوو کەروێشک، گورگ، ورچ، ڕێوی، جووشک و هتد دەژین.
سیکەرۆیان، کوێرەکانی، کانی ڕەش و کانی وەنەوشە چەند کانیاوی ئەو دێیەن.
خانووبەرەکان لە سەرهۆڵان بە گشتی لە قوڕ و بەرد ساز کراون و میچەکانیان لە دارە، سێ خانوو لە ڕیزێک و خانوویەکی دیکە بەرانبەریانە، سێ خانووبەرە ڕوویان لە ڕۆژاوایە، هیچ کام لەو ماڵانە حەوشەیان نییە.
لە باکووری ئاوایی شوێنێکی مێژوویی بە ناوی "قەڵاتگە" هەیە.
لە باشووری سەرهۆڵان ڕێگایەکی خاکی هەیە کە دەچێتەوە ئاوایی سەرتەنگ و لەوێڕا بۆ ئاواییەکانی دیکە.
ئیمکاناتی ئاوایی: ساڵی ١٣٨٢ کارەبای هەڵکراوە، بنکەی مخابەرات، قوتابخانەی سەرەتایی"تەها" (کوڕانە ــ کچانە)، بۆ کاری بنکەی تەندروستی سەر بە ئاوایی"باگردان"ی خوارێن، نەوت و کەلوپەلیش لە "سیاقۆڵ"ی خوارێ وەردەگرن.
ئاوی ماڵەکان لە کانیاو دابین دەبێ و لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوەیان نییە، ماڵەکان بۆخۆیان لە دوو کانیاوەکەی گوند کانی "وەنەوشە" و کانی "ڕەش" بە شیلانگ ئاوایان ڕایەڵ کردووە.
خوێندکاران کەمتر ئەو هەلەیان بۆ ڕەخساوە درێژە بە خوێندن بدەن، تەنیا تاقمێک لە کوڕەکان کە توانیویانە درێژە بە خوێندن بدەن دەچنە خەلیفان و مەهاباد.
ئاژەڵداری، وەرزێری و کرێکاری کاروپیشەی خەڵکی سەرهۆڵانە، ئاژەڵەکانیان لە مەڕ و مانگا پێکهاتووە، دانەوێڵەش گەنم و جۆ دەچێنن. بە هۆی سەخڵەت بوون و کوێستانی بوونی ئەم ئاواییە، زەوییەکانی بۆ کێڵان و کشتوکاڵ باش نیین، هەر بۆیە وەرزێری بەرەوی نییە.
گرفتەکانی خەڵکی ئاوایی: نەبوونی لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە، نەبوونی مزگەوت، پێویستی بە بینایەکی باش بۆ قوتابخانە و ڕێگای ناخۆش.
خەڵکی سەرهۆڵان مردووەکانیان لە گۆڕستانی "سەرتەنگ" بە خاک دەسپێرن.

## سەهۆڵان

سەهۆڵان لە ٤٢ کیلۆمیتری باکووری ڕۆژهەڵاتی شاری مەهاباد، بەشی ناوەندی و دێهستانی ئاختاچی ڕۆژاوا و لە ناوچەی محاڵ هەڵکەوتووە. لە ٣٠ ماڵ و ١٤٩ کەس پێکهاتووە، لەمانە ٨٢ کەسیان پیاون و ٦٧ کەسیش ژنن، ژمارەی خوێندەوارانی ئەم ئاوایییە ٨٣ کەسە کە ٥٠ کەس پیاون و ٣٣ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٤٣ کەسی نەخوێندەوار ١٦ کەسیان پیاون و ٢٧ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ٨٢٢ هێکتارە، لەمە ٢٧٢ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و ٥٥٠ هێکتار پاوان و لەوەرگەی دێیە.

سەهۆڵان خاوەن ٣٢٨ هێکتار زەوی دێم، ٢٥٠ هێکتار زەوی بەراو، ٦٧ هێکتار باخ و ١٦ تراکتۆرە.

ئاوایییەکانی دەوروبەر:

باشوور: نیسکاوا، قادراوا و خانەقا (گشتیان سەر بە بۆکانن)

باکوور: ئاوایییەکانی سیچانبلاغ و کولیجە

ڕۆژهەڵات: ئاوایی عیساکەند

ڕۆژاوا: ئاوایی قزڵجەی خوارێ

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باشوور: قەڵا

باکوور: قەڵای کونە کۆتر

ڕۆژاوا: قۆتڕ

لە باشووری ئاوایی قەڵایەک هەڵکەوتووە کە ناوێکی دیاریکراوی نییە و هەر قەڵای پێش ماڵانی پێدەڵێن، هەروەها لە باکووری ئاوایی لە سەر ئەشکەوتی سەهۆڵان شوێنێک هەیە بە ناوی قەڵای کونەکوتر. سەرچاوەی سەهۆڵان و بەردەگەورە، کانیاوە بەناوبانگەکانی ئاواییین.

بنەمای خانووبەرەکانی ئەم ئاوایییە لە بەرد و قوڕ، یان بلووک، خشت و چیمەنتۆیە، کۆڵانەکانی ئاوایی بە گشتی ڕێک و ڕاستن و بەردچن کراون و دیمەنێکی جوان و خاوێنی بە ئاوایی بەخشیوە، ماڵەکان حەوشەیان هەیە و هەموویان دەروازەیان تێگیراوە. گەڵاڵەی هادی ساڵی ١٣٨٣ی هەتاوی لەم دێیە دەستی پێکردووە.

ئاسەواری قەڵای سەهۆڵان بە ژمارەی تۆمارکراوی ١٥٩٨٨ لە میراتی فەرهەنگی، بە بەرزایی ١٨٧٠ میتر لە ڕووکەشی زەریاکان لە باکووری ڕۆژهەڵاتی ئاوایی هەڵکەوتووە کە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە قۆناغی کالکۆلیتیک ـ هەزارەی یەکەمی پێش زایین.

ئەم گوندە یەکێک لە ئاوایییە مێژوویییەکانی ناوچەیە، بە وتەی کارناسان لە نزیک ئاوایی، لە نێو ئەشکەوتی سەهۆڵان، سواڵەت و کووپەی سەردەمی ئەشکانی و هەروەها جامی مسی سەردەمی ئیلخانییەکانی مەغوول دیتراونەوە و تۆمار کراون. سەهۆڵان لە (سەهۆڵ+ ان) پێکهاتووە کە "ان" لێرەدا پاشگری کۆیە، گشت وشەکە بە مانای جێگای سەهۆڵ یا قوڵکەئاوێک کە بەستبێ؛ خەڵکی ئاوایی بەتایبەت بەساڵاچووان باس لە کوێستانی بوونی ئەم شوێنە دەکەن و دەڵێن ساڵانی ڕابردوو بەفر و سەرمایەکی دژوار ئەم ناوچەیەی دادەگرت و تا درەنگایەک لە ساڵ بەفری کێوەکان نەدەچۆوە و تا نزیک ٣٠ ساڵ لەمەوبەر ڕێگاوبانی ئەو ئاوایییە بە دەیان ڕۆژ دەگیرا و خەڵکەکە دەمانەوە.

ئەشکەوتی سەهۆڵان یەکێکە لە دیمەنە جوانەکانی سروشت کە لە دوای ئەشکەوتی "عەلی سەدر"ی شارەکەی هەمەدان، دووهەمین ئەشکەوتی ئاویی وڵاتی ئێرانە و مێژووەکەی دەگەڕێتەوە دواقۆناغی دوویەمی زەویناسیی، هەڵبەت ئاسەواری سەردەمی پارتەکان، ئەشکانیەکان و دەورەی ئیسلامیشی تێدا دۆزراوەتەوە.

بەشی دووەمی ئەشکەوت ویشکاییە و "کونەماڵان"ی پێدەڵێن. بێ گومان کونەماڵان سەردەمێک مرۆڤی تێدا ژیاوە، بەتایبەت سەردەمی شەڕی دووەمی جیهانی کە حرووسان کەوتنە کوشتوکوشتاری خەڵکی کورد و خەڵکی گوندەکانی دەوروبەر وەکوو عیساکەند، سیچانبلاغ، یاڵاوە و سەهۆڵان پەنایان بۆ ئەم ئەشکەوتە بردووە. لەم ئەشکەوتە باڵندەی وەکوو شەمشەمەکوێرە و کۆتر دەژین، هەروەها "ئارتیمیا"جۆرێک زیندەوەری نەرمپێستە کە لە نێو ئاوی ئەم ئەشکەوتەدا دەژی.

لە ڕۆژهەڵاتی ئاوایی ڕێگایەکی قیلەتاو نزیک بە ٤ کیلۆمیتر دەچێتەوە ئاوایی عیساکەند واتا سەر جادەی مەهاباد ــ بۆکان. لە باکووری ڕۆژاوا ڕێگایەکی سەخڵەت و خاکی بە پشت کێوی قۆتڕدا، ئاوایی سیچانبلاغ و کولیجە دەگرێتەوە، لە باشووری ڕۆژاواوە باریکەڕێگایەکی خاکی ڕوو لە

ئاوایی‌یەکانی نیسکاوا، قادراوا دەکا.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی 1376/06/25 کارەبای هەڵکراوە، لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە (خاوەن عەنباراوە)، مزگەوت کە ساڵی ١٣٨٤ نۆژەن کراوەتەوە، قوتابخانەی سەرەتایی دکتۆر "کەماڵ خاتەمی" (کوڕانە ـ کچانە) ساڵی ١٣٧٩ بیناکەی ساز کراوە، دێهیاری (ساڵی ١٣٨٨)، پێگەی ڕاو (پایگاه شکاری) "محیط بانی" (١٣٨٥) و نوێنەرایەتی گەشتیاری و هەروەها ئاوایی لە شووڕای ئیسلامی بەهرەمەندە. خەڵکی ئاوایی بۆ کاروباری بنکەی تەندروستی و وەرگرتنی نەوت سەر بە ئاوایی "عیساکەند"ن و کەلوپەلی پێویستیان لە شەریکەی هاوبەشیی قەرەبڵاغ دابین دەبێ.

قوتابیان بۆ درێژەدان بە خوێندن دەچنە شاری مەهاباد و ئەو مافە بۆ کوڕان و کچان پارێزراوە.

وەرزێری، ئاژەڵداری، مێشداری، دووکانداری، باخداری و کارکردن لە ئەشکەوتی سەهۆڵان سەرەکی‌ترین کاروپیشەی خەڵکی ئەم دێیە پێکدێنن. لە دەم ئەشکەوتەکە بازارێک دامەزراوە کە هەموو پێداویستییەکانی گەڕیدەکان دابین دەکا، ئەم بازاڕە نزیک بە ١٥ دووکان لەخۆ دەگرێ.

وەرزێرەکان گەنم و جۆ دەچێنن، ئاژەڵەکان مەڕ، مانگا و بزنن و بەرهەمی باخەکان لە سێو، ئاڵوباڵوو و قەیسی پێکهاتووە.

گرفتەکانی خەڵکی ئاوایی: نەبوونی مزگەوتێکی شیاو، پێویستی بە هێڵی ڕاگواستن و هاتووچۆ، نەبوونی بنکەی تەندروستیی سەربەخۆ و نەبوونی نانەوەخانە.

ئاوایی گۆڕستانێکی هەیە کە زۆر کەم مردووی لێ دەنێژن و مردووەکانیان زیاتر دەبەنە ئاوایی‌یەکانی خانەقا، قادراوا و نیسکاوا کە سەر بە "بۆکان"ن.

ئەشکەوتی سەهۆڵان

## سەیداوا

سەیداوا لە ٢ کیلۆمیتری ڕۆژهەڵاتی شاری مەهاباد، بەشی ناوەندی و دێهستانی ئاختاچی ڕۆژاوا و لە ناوچەی محاڵ هەڵکەوتووە. لە ٣٨ ماڵ و ١٣٨ کەس پێکهاتووە لەمانە ٧٢ کەس پیاون و ٦٦ کەسیش ژنن، لە ٩٣ کەسی خوێندەوار ٥٤ کەس پیاون و ٣٩ کەسیش ژنن، هەروەها لە ١٩ کەسی نەخوێندەوار ٤ کەس پیاون و ١٥ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ١٧١٦ هێکتارە، لەمە ٧٨٤هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و ٩٣٢ هێکتار پاوان و لەوەرگەی دێیە.

سەرەتا باس لەوە بکەین ژمارەی دانیشتووانی سەیداوا لەم ئامارەی کە سازمانی سەرژمێری و ئامار لە ساڵی ١٣٨٥ی هەتاوی دیاری کردووە یەکجار زۆرتر بووە، هەروەها خەڵک کەمتر وەک ئاوایی چاو لە سەیداوا دەکەن و بە گەڕەکێکی شاری دەزانن و ساز کردنی خانووبەرەکانی سەیداوا ڕۆژ بە ڕۆژ پەرە دەستێنێ.

سەیداوا خاوەن ١٢٤هێکتار زەوی دێم، ٧٢ هێکتار زەوی بەراو، ٩ هێکتار باخ و ٦ تراکتۆرە.

ئاواییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی پیربەلە

باکوور: ئاوایی دۆستاڵی

ڕۆژهەڵات: ئاوایی بەسری

ڕۆژاوا: شاری مەهاباد

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باشوور: قەڵای سارمێ

باکوور: قوڵقوڵاغ

ڕۆژهەڵات: بەردەسوور

ئەشکەوتی بەردەسوور لە سەر کێوی بەردەسوورە. کانیاوەکان بە بەردەسوور، گۆلی پادان و کانی قیبلەی ناسراون.

خانووبەرەکانی سەیداوا چەشنی شار بە خشت، چیمەنتۆ و ئاسن ساز کراون، ماڵەکان خاوەن حەوشەن و کۆڵانەکانی ڕاست و ڕێکن.

لە ڕۆژاوا ڕێگایەک گەڕەکی فەجری شاری مەهاباد دەگەڕێتەوە.

ئیمکاناتی ئاوایی: کارەبا، تەلەیفوونی ماڵ بە ماڵ، قوتابخانەی سەرەتایی بە ناوی "خاقانی"، ئاکابیری، مزگەوت.

ئاوای سەیداوا لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوەی نییە، زۆربەی ماڵەکان لە چاڵاو کەلک وەردەگرن، هەروەها "کانی پاردان" کەلکی باشی بۆ خەڵک هەیە.

بۆ بنکەی تەندروستی هاتووچۆی شاری مەهاباد دەکەن، نەوت و کەلوپەلیش هەر لە شاری مەهاباد (گەڕەکی پشتتەپ) وەردەگرن.

خوێندکاران بۆ درێژەدان بە خوێندن هاتووچۆی مەهاباد دەکەن.

کاروپیشەی خەڵکی سەیداوا بەربڵاوە و دەتوانین بڵێین هەموو جۆرە کاروپیشەیەک دەکەن، ئەوەی لە زۆوە ماڵی لە سەیداوایە وەرزێری دەکا و گەنم، جۆ، نۆک و نیسک دەچێنێ، چەند ماڵ باخدارن، بەرهەمەکانیان سێو و قەیسین و دوو ماڵیش ئاژەڵدارن، هەروەها دووکانداری و هێندێک کاروپیشەی ئازادی دیکە لە ئاواییدا هەیە.

گەورەترین گرفتی سەیداوا ئەوەیە کە کاربەدەستان پێی ڕاناگەن، ڕێگای خاکی و کۆڵانەکانی قیلەتاو نەکراوە، لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوەی نییە، فەزای سەوزی نییە، پێویستی بە قوتابخانەی ناوەندییە و گەڵێک ئیمکاناتی دیکە.

سەیداوا گۆڕستانی هەیە، بەڵام زۆربەی خەڵکەکەی مردووکانیان لە گۆڕستانی شاری مەهاباد دەنێژن.

## سیاقوڵی خوارێ

ئەم ئاوایییە لە ١٨ کیلۆمیتری باشووری ڕۆژاوای شاری مەهاباد، بەشی خەلیفان و دێهستانی مەنگوڕی ڕۆژهەڵات و لە ناوچەی مەنگوڕایەتی هەڵکەوتووە. لە ٢٢ ماڵ و ١٤٢ کەس پێکهاتووە، لەمانە ٧٦ کەس پیاون و ٦٦ کەسیش ژنن، لە ٨١ کەسی خوێندەوار ٥٢ کەس پیاون و ٢٩ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٤٩ کەسی نەخوێندەوار ١٧ کەس پیاون و ٣٢ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ٤٥٨٤ هێکتارە، لەمە ٨١/٣ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و ٤٥٠٢/٧ هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.

سیاقوڵی خوارێ خاوەن ٢٣٧/٥ هێکتار زەوی دێم، ١٠٢ هێکتار زەوی بەراو، ٩/٩٨ هێکتار باخ، ٣ تراکتۆر و ١ لاوێردەیە.

ئەم گوندە لە بەرزایی ١٦٠٠ میتر لە ڕووکەشی زەریاکان هەڵکەوتووە.

ئاوایییەکانی دەوروبەر:

باشوور: سیاقوڵی سەرێ و قاوەخانەی حاجی کەریمی

باکوور: ئاوایی حاجی مامیان

ڕۆژهەڵات: ئاوایییەکانی دووسەید و خاتوونئەستی

ڕۆژاوا: ئاوایی پەڵکێ

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باشوور: کێوی پێش ماڵان

باکوور: خرێ بناوان

ڕۆژهەڵات: زینداندەرێ

ڕۆژاوا: زیندووێ سپی

سێ کانیاوی کەرێزە، کانی پیاوان و کانی هەمزاغا لەم دێیە هەڵکەوتوون.

لەم ئاوایییە زۆربەی ماڵەکان لە قوڕ و بەرد و میچی دار ساز کراون، چەند خانووبەرەیەک لە سەرووی ماڵانەوە بە خشت و چیمەنتۆ ساز کراون، هێندێک لە ماڵەکان حەوشەیان نییە و لە هەیوان و ڕارەوێک پێکهاتوون، زۆربەی ماڵەکان ڕوویان لە ڕۆژهەڵات و باشوورە، ئاوایی خاوەن چەند کۆڵانێکی ناڕێک و هەورازە. "قەڵات" کە لە بەری ڕۆژهەڵاتە و "زینداندەرێ" لەم دێیە، وەک دوو شوێنی مێژوویی چاویان لێدەکرێ.

لە لای باشوورەوە ڕێگایەکی قیلەتاو کە تا ناوەندی دێ هاتووە دێتەوە نێو ئاوایی و دەچێتەوە سەر جادەی مەهاباد ـ سەردەشت.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی ١٣٧٦/٧/١٥ کارەباکەی هەڵکراوە، لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە کە لە کانی پیاوان دابین دەبێ، سیمکارتی مخابەراتی دێهات، بنکەی تەندروستی، ئاکابیری، قوتابخانەی سەرەتایی (کوڕانە ـ کچانە) بە ناوی "ئینفاق" کە بیناکەی حازربەدەستە، مزگەوت کە هەوەڵ جار حاجی کاکە سوار ئاریا، سازی کردووە و لە پاشان بە خشت و چیمەنتۆ و ئاسن نۆژەن کراوەتەوە، شەریکەی هاوبەشیی نەوت و کەلوپەل، گاوداری (کەرتی تایبەتی) و هەروەها ئەم دێیە خاوەن شووڕای ئیسلامییە.

خوێندکارانی بۆ درێژەدان بە خوێندن دەچنە خەلیفان یان مەهاباد.

کاروپیشەی خەڵک ئاژەڵداری، وەرزێری، باخداری و کرێکارییە، ئاژەڵەکان زۆرتری مەڕن، بزن و مانگا تا ڕادەیەک کەمتر ڕادەگیرێ، وەرزێران گەنم، جۆ، نۆک و نیسک دەچێنن، هەروەها بەرهەمی باخەکان سێو، قەیسی، گوێز، هڵوو و هەڵووچەیە.

گرفتەکانی خەڵکی ئاوایی: نەبوونی شوێنێکی دیاریکراو بۆ ڕشتنی زبڵوزاڵی ئاوایی، دەرنەکردنی ئاوەڕۆی ئاوایی کە دیمەنێکی ناحەزی پێکهێناوە و کەمئاوی.

گۆڕستانی سیاقوڵی خوارێ لە باشوور هەڵکەوتووە.

لە سیاقوڵی خوارێ خودالێخۆشبوو "برایمەڕەش" حەیرانبێژ بووە، ئێستا کەسێکی دیکەی لێیە بە ناوی "ئارەحمـــــان" کە حەیرانبێژە و دەنگێکی لاوێنەر و خۆشی هەیە.

## سیاقوڵی سەرێ

ئەم ئاوایی‌یە لە ٢٢ کیلۆمیتری باشووری ڕۆژاوای شاری مەهاباد، بەشی خەلیفان و دێهستانی مەنگوڕی ڕۆژهەلات و لە ناوچەی مەنگوڕایەتی هەڵکەوتووە. لە ١٥ ماڵ و ١٢٦ کەس پێکهاتووە، لەمانە ٦٠ کەس پیاون و ٦٦ کەسیش ژنن، لە ٨٠ کەسی خوێندەوار ٤٠ کەس پیاون و ٤٠ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٣٢ کەسی نەخوێندەوار ١٢ کەس پیاون و ٢٠ کەسیش ژنن.
پانتایی ئاوایی ٢٧١٧ هێکتارە، لەمە ٢١٧ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و ٢٥٠٠ هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.
سیاقوڵی سەرێ خاوەن ٦٤٦/٤ هێکتار زەوی دێم، ١٥٦ هێکتار زەوی بەراو، ٣١/٩ هێکتار باخ، ٧ تراکتۆر و ٢ لاوێردەیە.
ئەم گوندە لە بەرزایی ١٦٧٠ میتر لە ڕووکەشی زەریاکان هەڵکەوتووە.

ئاوایی‌یەکانی دەوروبەر:
باشوور: ئاوایی‌یەکانی ئامێد و سەرتان
باکوور: ئاوایی‌یەکانی قاوەخانە و سیاقوڵی خوارێ
ڕۆژهەلات: ئاوایی‌یەکانی خاتوونئەستی و ئامێد
ڕۆژاوا: ئاوایی‌یەکانی سمێنوو و زێوە

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:
باشوور: بۆگەنیوە
ڕۆژهەلات: کێوی گۆڕی مەلا حەسەن
ڕۆژاوا: سەربلاو
باشوور: بۆگەنیوە

کانیاوەکانیش بە کانی فارسان، هەوارە ترکە و پووره فاتێ ناسراون.
خانووبەرەکانی ئەم ئاوایی‌یە لە قوڕ و بەردن و میچەکاکیان لە دار ساز کراون، هێندێک لە ماڵەکان هەیوانیان هەیە و لە وەرزی بەهار و هاویندا گوڵی لێ پەروەردە دەکەن، ماڵەکان حەوشەیان نییە و بە گشتی ڕوویان لە ڕۆژهەلاتە، مزگەوت لە ناوەندی دێ بە خشت و چیمەنتۆ ساز کراوە، هێندێک لە ماڵەکان لە دالاندا ساز کراون، کۆڵانەکان ناڕێک و نالەبارن.
سیاقوڵی سەرێ لە دوو کیلۆمیتری جادەی دۆڵی سیاقوڵ لە بەشی باشوور هەڵکەوتووە، تەنیا ڕێگای هامووشۆیان هەر ئەو ڕێگایەیە و مەوداکەی تا سەر پردی حاجی مامیان ٨ کیلۆمیترە.
ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی ١٣٧٦/٧/١٥ کارەباکەی هەڵکراوە، سیمکارتی مخابەراتی دێهات، قوتابخانەی سەرەتایی"ئیسار" (کوڕانە ـــ کچانە)، مزگەوت و هەروەها سیاقوڵی سەرێ خاوەن شووڕای ئیسلامییە. بۆ کاری بنکەی تەندروستی و وەرگرتنی نەوت و کەلوپەل سەر بە ئاوایی "سیاقوڵ"ی خوارێن.
ئەم دێیە لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوەی نییە و زۆربەی ماڵەکان لە کانی "پووره فاتێ" کەلک وەردەگرن.
خوێندکارانی ئاوایی کە زۆرتریان کوڕن، بۆ درێژەدان بە خوێندن دەچنە خەلیفان و مەهاباد.
ئاژەڵداری، وەرزێری و تا ڕادەیەکی کەم باخداری کاروپیشەی خەڵکی ئەم گوندەیە. ئاژەڵەکانیان مەڕ، بزن و مانگایە و وەرزێران گەنم، جۆ و نۆک دەچێنن، بەرهەمی باخەکانیشیان سێو، قەیسی و هڵوویە.
گرفتەکانی خەڵکی ئاوایی: ڕێگای خاکی و ناخۆش، پێویستی بە لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوەیە، کەمئاوی و نەبوونی بینا بۆ قوتابخانەی سەرەتایی.
ئەو دێیە خاوەن دوو گۆڕستانە، کۆنەگۆڕستانەکەی ناوی "قەبری سەیدان"ە و ئەوی تازەتری ناوی "خاڵ باپیر"ە.

## سیچان‌بلاغ

ئەم ئاوایی‌یە لە ٤١ کیلۆمیتری باکووری ڕۆژهەڵاتی شاری مەهاباد، بەشی ناوەندی و دێهستانی ئاختاچی ڕۆژاوا و لە ناوچەی محاڵ هەڵکەوتووە. لە ١٠ ماڵ و ٥٣ کەس پێکهاتووە، لەمانە ٢٧ کەس پیاون و ٢٦ کەسیش ژنن، ژمارەی خوێندەوارانی ئەم ئاوایی‌یە ٣١ کەسە کە ١٦ کەس پیاون و ١٥ کەسیش ژنن، هەروەها لە ١٩ کەسی نەخوێندەوار ١٠ کەس پیاون و ٩ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی 418/6 هێکتارە، لەمە ٦/١٦٨ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و ٢٥٠ هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.

سیچان‌بلاغ خاوەن ٦٤/٥ هێکتار زەوی دێم، ٥٧/٥ هێکتار زەوی بەراو، ٤٠ هێکتار باخ و ٥ تراکتۆرە.

ئاوایی‌یەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی سەهۆڵان

باکوور:ئاوایی‌یەکانی بورهان و کولیجە

ڕۆژهەڵات: ئاوایی یالاوەی سەرێ

ڕۆژاوا: ئاوایی کولیجە

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باشوور: قۆتڕ

لە داوێنی کێوی قۆتڕ گوڵ و گیای وەکوو سوومبوول، سوێسنە، مێلاق، جاترە و نەعنا دەڕوێن.

لە کێوی قۆتڕ، باشووری سیچان‌بلاغ، ئەشکەوتێک هەیە کە خەڵک دەڵێ پانایی و بەرینایی زۆرە و بەرفرەوانە و بە ئەشکەوتی قۆتڕ ناسراوە.

کانی بالابان(کە بەشێک لە سێ بەشی هی ئاوایی‌یە و دوو بەشەکەی دیکە بۆ یالاوەی سەرێ دەچێ و هەر لە قەدیمەوە کە فرۆشراوە ئەوە بەشێک لە قەولنامەیە.)، کانی سەرچاوە و کانی نێو دێی لە کانیاوە بە ناوبانگەکانی ئاوایین.

خانووبەرەکان لە قوڕ و بەرد و میچیان لە دارە و ئەوانی تازەتر بلووکیان دەکار کردووە، کۆڵانەکان خواروخێچ هەڵکەوتوون، حەوشەی خانووەکان بە گشتی بەرفرەوان و گەورەن و دەرگایان تێگیراون.

وەک باس دەکرێ سیچان‌بلاغ دەبێ لە سەردەمی سۆهرابخانی موکری ئاوەدان کرابێتەوە و لە پێشدا مەزرای یالاوە بووە و پاشان لە لایەن خەلیل‌بەگ(ئاغای یالاوە) بە ئاغاکانی کولیجە، واتا بە بنەماڵەی شەمسی‌بورهانی فرۆشراوە. سەبارەت بە ناوەکەشی، واتا "سیچان‌بلاغ" وشەیەکی تورکییە کە بە مانای "کانی مشکان"ە.

سیچان‌بلاغ بە ژمارە تۆماری ١٦٦٣٣ لە لایەن میراتی فەرهەنگی بە بەرزایی ١٨٦٠ میتر لە ڕووکەشی زەریاکان، دەگەڕێتەوە سەدەی ٤ تا ٦ کۆچی مانگی. قەڵای "خەڵق" بە ژمارە ١٦٦١٥ بە بەرزایی ١٩٣٢ میتر لە ڕووکەشی زەریاکان مێژووەکەی دەگەڕێتەوە سەر سەدەی ٤ تا ٦ کۆچی مانگی لە لایەن میراتی فەرهەنگی تۆمار کراوە.

لە باشووری ڕۆژاواوە ڕێگایەکی سەخڵەت و خاکی بە پشت کێوی قۆتڕدا دەچێتەوە ئاوایی سەهۆڵان، لە باکوور ڕێگایەکی خاکی نزیک بە ٢ کیلۆمیتر، ئاوایی کولیجە دەگرێتەوە، لە ڕۆژهەڵاتەوە ڕێگایەکی خاکی نزیک بە ٤ کیلۆمیتر، دەچێتەوە سەر جادەی مەهاباد ـ بۆکان.

ئیمکاناتی ئاوایی: کارەبا، سیمکارتی مخابەراتی ئاوایی، مزگەوت (ساڵی ١٣٧٦ نۆژەن کراوەتەوە). بۆ بنکەی تەندروستی سەر بە ئاوایی کولیجەن، نەوت و کەلوپەل لە شەریکەی هاوبەشیی "بورهان" وەردەگرن. جێگای سرنجە ئاوی سیچان‌بلاغ لە چاڵاو دابین دەبێ و خەڵکەکە بە گشتی لە "کانی ماڵان" کەلک وەردەگرن. قوتابیان بۆ درێژەپێدان بە خوێندن ڕەوانەی شارەکانی مەهاباد، بۆکان یا ئاوایی گۆکتەپە دەبن و کچان بە تەواوی لە درێژەدان بە خوێندن بێ بەشن.

مزگەوتی ئەم ئاوایی‌یە پێشتر حوجرەی فەقێیانی لێ بووە کە دوایین جار مامۆستا مەلا "عەلی خەزاڵ" وانەی تێدا گوتۆتەوە.

وەرزێری، ئاژەڵداری، باخداری و کرێکاری سەرەکی‌ترین کاروپیشەی خەڵکی ئەم ئاوایی‌یە پێکدێنن. وەرزێران گەنم، جۆ، نۆک و نیسک دەچێنن، ئاژەڵەکانیان بریتین لە: مەڕ، مانگا و بزن، هەروەها بەرهەمی باخەکان پێکهاتەیەکە لە سێو، قەیسی، گێلاس، بادام و ئاڵووباڵوو.

گرفتە سەرەتایی‌یەکان: نەبوونی بینا بۆ قوتابخانە (بە هۆی نەبوونی بینا قوتابیان لە ئاوایی کولیجە دەخوێنن)، ڕێگاوبانی ناخۆش و خاکی، پێویستی بە لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوەیە، نەبوونی بنکەی تەندروستیی سەربەخۆ و نەبوونی شووڕای ئیسلامی.

گۆڕستان لە باشووری ئاوایی هەڵکەوتووە کە ئێستا مردووی لێ نانێژن، مردووەکانیان دەبەنە گۆڕستانی "بابە ڕۆستەم" لە ئاوایی کولیجە.

بە وتەی خەڵک تا چەند ساڵ لەمەوبەر گۆڕستانی ئاوایی دوو کێلی نووسراوەیان بووە کە بە داخەوە دەزراون، هەروەها لە کانی بالەبان بەردە نووسێکی دیکەش هەبووە کە ئەویش بە تاڵان چووە.

## سێروو (سێروێ)

له ٤١ کیلۆمیتری باشووری ڕۆژاوای شاری مەهاباد، بەشی خەلیفان و دێهستانی مەنگوڕی ڕۆژهەڵات و له ناوچەی مەنگوڕایەتی هەڵکەوتووه. له ١٦ ماڵ و ٦٦ کەس پێکهاتووه، لەمانه ٣٠ کەس پیاون و ٣٦ کەسیش ژنن، له ٣٥ کەسی خوێندەوار ١٩ کەسیان پیاون و ١٦ کەسیش ژنن، هەروەها له ٢٣ کەسی نەخوێندەوار ٧ کەس پیاون و ١٦ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ٢٤٣٥ هێکتاره، لەمه ٣٥ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوه و ٢٤٠٠ هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیه.

سمێنوو خاوەن ٨٠ هێکتار زەوی دێم، ٤٩ هێکتار زەوی بەراو، ٢٣/٤٢ هێکتار باخ، ٢ تراکتۆر و ١ لاوێردەیه.

ئاواییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاواییەکانی قەڵاتی سنان و حەسەنچەپ

باکوور: ئاوایی سەرتەنگ

ڕۆژهەڵات: ئاوایی شێخان

ڕۆژاوا: ئاوایی قەڵاتی سنان

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باشوور: کێوی خەتیب

ڕۆژهەڵات: کێوی گیای مرادی

ڕۆژاوا: هێڵبەگ

کانیاوەکان به گیای مرادی و کانی خەتیب ناسراون.

خانووبەرەکان له قوڕ و بەرد ساز کراون و میچەکانیان له داره، تەنیا قوتابخانه به بلوک ساز کراوه، هیچ کام له ماڵەکان حەوشەیان نییه و به گشتی بەرەو باشوورن و شوێنەکەیان هەورازه، ئەم ئاواییە چەند کۆڵانی نارێکی هەیه.

ڕێگایەک به بەری ڕۆژاوای سێرووڤا دێ که دەبێته دووڕییانێک، یەکیان بەرەو باکووره و دەچێتەوه ئاوایی سەرتەنگ، ئەوی دیکەیان بەرەو ڕۆژاوایه و دەچێتەوه ئاوایی قەڵاتی سنان.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی ١٣٧٧/١١/٧ کارەبای بۆ هاتووه، بنکەی مخابەرات، قوتابخانەی سەرەتایی "شەهامەت" (کوڕانه ـ کچانه) که به بلوکان ساز کراوه. خەڵکی ئەم گونده بۆ بنکەی تەندروستی دەبێ بچنه باگردانی خوارێ، هەروەها نەوت و کەلوپەل له شەریکەی هاوبەشیی "سیاقوڵ"ی خوارێ وەردەگرن.

خوێندکاران کەمتر توانیویانه درێژه به خوێندن بدەن و ئەوانەی که له خەلیفان و مەهابادیش درێژه به خوێندن دەدەن، تەنیا کوڕەکانن.

سێروو لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوەی نییه و ئاوەکەی له چاڵاو دابین دەبێ، هێندێکیش له کانیاوڕا ئاویان بۆ ماڵەکانیان کێشاوه.

ئاژەڵداری، وەرزێری و کرێکاری کاروپیشەی خەڵکی ئەم گوندەن، زۆرتری ئاژەڵەکان مانگان، تا ڕادەیەکیش مەڕ و بزن ڕادەگرن، ورزێران گەنم و جۆ دەچێنن. بەرهەمی باخەکان سێوه.

گرفتەکانی خەڵکی ئاوایی: ڕێگای ناخۆش و خاکی، پێویستی به لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوه هەیه، نەبوونی مزگەوت و بنکەی تەندروستیی سەربەخۆ.

له ناوەندی ئاوایی کۆنەگۆڕستانێک هەیه به ناوی "دارباپیره"، ئێستا خەڵکی سێروو دەگەڵ خەڵکی ئاوایی قەڵاتی سنان مردووەکانیان له قەڵاتی سنان دەنێژن.

## سێلم

سێلم لە 30 کیلۆمیتری باشووری ڕۆژاوای شاری مەهاباد، بەشی خەلیفان و دێهستانی مەنگوڕی ڕۆژهەڵات و لە ناوچەی مەنگوڕایەتی هەڵکەوتووە.
لە ٤٤ ماڵ و ٢٣١ کەس پێکهاتووە، لەمانە ١١٧ کەس پیاون و ١١٤ کەسیش ژنن، لە ١١٤ کەسی خوێندەوار ٧١ کەس پیاون و ٤٣ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٩٢ کەسی نەخوێندەوار ٣٠ کەس پیاون و ٦٢ کەسیش ژنن.
پانتایی ئاوایی 3135 هێکتارە، لەمە 135 هێکتار لە دەست خەڵکدایە و 3000 هێکتار پاوان و لەوەرگەی دێیە.

ئاوایییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایییەکانی زێوە و باگردانی خوارێ

باکوور: ئاوایییەکانی داغە و مێرگەرۆ

ڕۆژهەڵات: ئاوایی کاڵەدەنداوا

ڕۆژاوا: ئاوایی قەرەقاچ

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باشوور: گردی پایەگا

باکوور: چاکی ئەسحاب

ڕۆژاوا: پیرەسەما

لە ئاوایی سێلم خانووبەرەکان لە قوڕ و بەردن و میچەکانیان دارە و هێندێک ماڵ لە بلۆوک و خشت کەلکیان وەرگرتووە، ماڵەکان بەرەو باشوور هەڵکەوتوون، کۆڵانەکانیان هەورازن و خواروخێچ و نارێکن، ماڵەکان هیچیان حەوشەیان نییە، مزگەوت لە ناوەندی ئاوایییە و بە خشت و چیمەنتۆ ساز کراوە.
بە وتەی خەڵک سەرەتا ئەم گوندە ناوی "سەلیم" بووە و هۆی ئەو ناوە ئارام و هێمن بوونی خەڵکەکەی بووە.
سێلم لە سەر ڕێگای دۆڵی شێخان هەڵکەوتووە و لە باکووری ئاوایی ڕێگایەکی خاکی دەچێتەوە سەلیم ساغوڵ.
ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی 1368/08/06 کارەباکەی هەڵکراوە، لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە کە بەهاری 1387ی هەتاوی جێبەجێ بووە و ئاوی لە کانی پیاوان و چاڵاو دەچێتە نێو عەنباراو، سیمکارتی مخابەراتی دێهات، تەلەیفوونی ماڵ بە ماڵ، بنکەی تەندروستی، قوتابخانەی سەرەتایی (کوڕانە ـ کچانە) بە ناوی "میساق" کە بیناکەی حازربەدەستە، مزگەوتی "ئیمام حوسێن" کە ساڵی ١٣٨٦ی هەتاوی نۆژەن کراوەتەوە، هەروەها ئەم ئاوایییە خاوەنی شووڕای ئیسلامییە. بۆ وەرگرتنی نەوت و کەلوپەل سەر بە ئاوایی سیاقوڵی خوارێن.
قوتابییەکانی ئەم گوندە کە زۆربەیان هەر کوڕەکانن، زۆر کەم درێژە بە خوێندن دەدەن.
وەرزێری، ئاژەڵداری، کرێکاری و مێشداری کاروپیشەی خەڵکی ئاوایین. وەرزێران دانەوێڵەکانی گەنم، جۆ و نۆک دەچێنن و ئاژەڵەکان لە مەڕ، مانگا و بزن پێکهاتوون، هەروەها ئەم دێیە خاوەنی چەند باخی ساوایە کە دارسێون.
گرفتەکانی ئاوایی: ڕێگاوبانی ناخۆش، نەبوونی بینا بۆ قوتابخانە، نەبوونی پرد بۆ پەڕینەوەی ترومبیل کە هاتووچۆی ١٥ ئاوایی بە سەرەوەیە، نالەبار بوونی ئاوایی لە بواری زبڵوزاڵ و ئاوەڕۆوە، نیازی بە قوتابخانەیەکی ناوەندی هەیە بەو هۆیە کە زیاتر لە ١٥ ئاوایی هاموشۆیان بە سەر ئەم ئاوایییەدایە.
لە ڕۆژهەڵاتی ئاوایی سێلم گۆڕستانی لەمێژینەی "قەبری بەرلانکێ" هەڵکەوتووە کە ئاوایییەکانی داغە، مەزرای داغە و کاڵەدەنداواش بۆ ناشتنی مردووەکانیان هەر لەم شوێنە کەلک وەردەگرن.

## سێلمساغۆڵ

ئەم ئاواییە لە 25 کیلۆمیتری باکووری ڕۆژاوای شاری مەهاباد، بەشی ناوەندی و دێهستانی موکریانی ڕۆژاوا و لە ناوچەی مەنگوڕایەتی هەڵکەوتووە. لە 37 ماڵ و 225 کەس پێکهاتووە، لەمانە ۱۲۳ کەس پیاون و ۱۰۲ کەسیش ژنن، لە ۱٤۲ کەسی خوێندەوار ۸۸ کەس پیاون و ٥٤ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٦۳ کەسی نەخوێندەوار ۲٤ کەسیان پیاون و ۳۹ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی 14400 هێکتارە، لەمە 228 هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و 14172 هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.

سێلم ساغۆڵ خاوەن ۲۲۰ هێکتار زەوی دێم، ٥۰ هێکتار زەوی بەراو و ۲۰ هێکتار باخە.

ئەم گوندە لە بەرزایی ۱٥٥۰ میتر لە ڕووکەشی زەریاکان هەڵکەوتووە.

ئاوایییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی سێلم

باکوور: ئاوایی کەوتەر

ڕۆژهەڵات: ئاوایی پەڵکێ

ڕۆژاوا: ئاوایی مێرگەڕۆ

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باشوور: غەریبیان و مەتەرێز

باکوور: هەارە بێ

باکووری ڕۆژاوا: قەڵای قۆچیکوڕ و مێهراب

ڕۆژهەڵات: دووبەردووک

ڕۆژاوا: ئیشکەڵە

فەقێ وسێنی، گوێزیلێ و ئیشکەڵان سێ کانیاوی ناوداری ئاواییین.بە گشتی خانووبەرەکانی سێلم ساغۆڵ لە قوڕ و بەرد ساز کراون و میچەکانیان لە دارە، ماڵەکان لەسەر هەورازن و ڕوویان لە باشوورە و حەوشەیان نییە.

سەردەمی شەڕی جیهانی دووهەم حرووسان ڕوویان کردە سێلم ساغۆڵ و دەگەڵ "باپیرئاغا" شەڕیان کرد، حرووسەکان لە کێوی ڕۆژهەڵاتی ئاوایی واتە لە "دووبەردووک"ەوە ئەم گوندەیان تۆپباران کرد و لەو شەڕەدا "حەمەدی باپیرئاغا" کوژرا. مزگەوتی ئاوایی یەکەم جار لە لایەن "باپیرئاغا" و "یای مرۆت" ساز کراوە.

بینای ماڵی "باپیرئاغا" ئێستاش هەر ماوە و نەوەکانی تێیدا دەژین. جێگای ئاماژەیە ئەم بینایە هەر چەند گەلێک کۆنە، بەڵام ئێستاش هەر پتەو و خۆڕاگرە، دیوارەکانی ئەم خانووبەرەیە نزیک بە 1/5 میتر پانن و زیاتر لە چەند دیوی گەورەی لە یەک ڕیز دان و گشتیان لە ڕێی دەرگایەکی بچووک یا دەلاقەیەکەوە پێوەندییان بە یەکەوە هەیە، زەمانی باپیرئاغا یەکەم ژووری کە شەش لە شەش میتردایە، چێشتخانە بووە و بەو دەرگا و دەلاقانەدا ئەو چێشتەی لێندراوە تا دوایین ژوور بۆ ئاغا ڕۆیوە.

قەڵای قۆچیکوڕ و مێهراب شوێنەوارێکی مێژووین و لە باکووری ڕۆژاوای ئاوایی هەڵکەوتوون، هەروەها لە بەری ڕۆژهەڵاتی ئاوایی، کۆنەگۆڕستانێکی لێیە کە بە "پیر عەبباس" ناسراوە، ئەم شوێنانە چەندین جار لە لایەن کەسانێکی نەناسراوەوە دراونەتەوە.

لە باشووری ئاوایی، ڕێگایەکی خاکی دەچێتەوە ئاوایییەکانی سێلم و کەڵەدنداوا، لە بەری باکوورەوە، ڕێگایەکی ئامادە بە قیلەتاو ئاوایییەکانی دێبۆکر و پەڵکێ دەگرێتەوە.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی 1368/08/03 کارەباکەی هەڵکراوە، لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە کە لە چاڵاوی قووڵ دابین دەبێ، بنکەی مخابەرات، قوتابخانەی سەرەتایی(کوڕانە ـ کچانە) بە ناوی "ئیلهام"، مزگەوتێک کە لە ساڵی 1385 نۆژەن کراوەتەوە و هەروەها ئەم دێیە خاوەن شۆڕای ئیسلامییە. بۆ کەلک وەرگرتن لە بنکەی تەندروستی سەر بە ئاوایی "کەوتەر"ن، نەوتەکەیان لە ئاوایی "دێبۆکر" دابین دەبێ و کەلوپەل لە شەریکەی هاوبەشیی شاری مەهاباد گەڕەکی "پشتەپ" وەردەگرن. بە ڕادەیەکی زۆر کەم قوتابیانی کوڕ بۆ درێژەدانی خوێندن، دوای پۆلی سەرەتایی، دەنێردرێنە شاری مەهاباد. ئاژەڵداری، وەرزێری، باخداری و کرێکاری کاروپیشەی خەڵکی ئاواییین. زۆربەی ئاژەڵدارەکان مەڕدارن، هەڵبەت تا ڕادەیەکیش مانگا و بزن ڕادەگرن، وەرزێران گەنم، نۆک، جۆ دەچێنن و بەرهەمی باخی زۆربەیان هەر سێوە.

نەبوونی ئیمکانات بۆ قوتابخانە، نەبوونی بنکەی تەندروستی سەربەخۆ و دێهیاری لە گرفتەکانی خەڵکی ئەم گوندەن.

گۆڕستانی مێژوویی "پیرعەبباس" لە بەری ڕۆژهەڵات، گۆڕستانی مێژووی "ئەسحابولحەسەن" لە ڕۆژاوا و گۆڕستانی "سەدان" کە لە ڕۆژاوا هەڵکەوتووە و ئێستا کەلکی لێ وەردەگیرێ، سێ گۆڕستانی "سێلمساغۆڵ"ن.

## سێلەکە

لە ٢٠ کیلۆمیتری باکووری ڕۆژاوای شاری مەهاباد، بەشی ناوەندی و دێهستانی موکریانی ڕۆژاوا و لە ناوچەی شارویران هەڵکەوتووە. لە ٢٠ ماڵ و ١٠٩ کەس پێکهاتووە، لەمانە ٥٦ کەس پیاون و ٥٩ کەسیش ژنن، لە ٦٤ کەسی خوێندەوار لەم گوندە ٣٥ کەس پیاون و ٢٩ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٣٢ کەسی نەخوێندەوار ١٦ کەسیان پیاون و ١٦ کەسیش ژنن.

پانتایی ١٥٩٧ هێکتارە، لەمە ١٣٠ هێکتار لە دەست خەڵکدایە و ١٤٦٧ هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.

سێلەکە خاوەن ١٣٠ هێکتار زەوی دێم، ٤٥ هێکتار زەوی بەراو، ٤٢ هێکتار باخ، ٦ تراکتۆر و ٣ لاوێردەیە.

ئاواییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی قازیاوا

باکوور: ئاواییەکانی مەحمەشەی سەرێ و چۆمەڵان

ڕۆژهەڵات: ئاواییەکانی بابیندەرێ و ئاڵبلاغ

ڕۆژاوا: ئاواییەکانی ماسوێ و دایماو(سەر بە شاری نەغەدە)

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باشوور: کێوەکانی خوری شۆر، کانی مەلا، گوڵوکەزەردان

باکوور: گردی چارشێوبەسەر

ڕۆژهەڵات: پشتماڵان و کێوی کانی سەفەر

ڕۆژاوا: بەردەزەرد

دوو ئەشکەوتی ئاوایی بە "بەرەبووک" لە باکوور و "گوڵەبەڕۆنان" لە باشوور ناسراون.

کانیاوەکانی سێلەکە بریتین لە: کۆخە، دوڕوان، خوریشۆر، مەلا، باریکێ، سارد.

خانووبەرەکان بە گشتی لە قوڕ و بەرد ساز کراون و میچەکانیان لە دارە، خشت زۆر کەم دەکار کراوە و زۆربەی ماڵەکان خاوەن حەوشەن و لە ناوەندی دێ کاولەکۆنێکی زۆر هەڵکەوتوون.

دەڵێن سێلەکە جارێکیان چۆڵ بووە "خدری حاجی مەدەی" ئاوەدانی کردۆتەوە و دوایە خەڵکانێکی دیکە ڕوویان تێکردۆتەوە، هەروەها بەساڵاچووان دەگێڕنەوە کاتێک حرووسان ڕوویان لەم ناوچەیە کرد سێلەکەیان سووتاند،

لە ڕۆژهەڵاتەوە ڕێگایەکی خاکی دەچێتەوە ئاوایی چۆمەڵان.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی ١٣٧٧/١١/٢٢ کارەبای هەڵکراوە، لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە کە لە "کوێرەگۆل" دابین دەبێ و عەنباراویان بۆ داناوە، تەلەیفوونی ماڵ بە ماڵ، قوتابخانەی سەرەتایی "غەفوور"(کوڕانە ـ کچانە) کە بیناکەی حازربەدەستە، مزگەوت(ساڵی ١٣٧٢ی هەتاوی، لە لایەن خەڵکی خێرخوازی ئاوایی بە خشت و چیمەنتۆ و میچی دار، نۆژەن کراوەتەوە) هەروەها ئەم دێیە خاوەن شوورای ئیسلامییە. بۆ کاری بنکەی تەندروستی دەچنە چۆمەڵان و نەوت و کەلوپەل لە شەریکەی هاوبەشیی ئاڵبلاغ وەردەگرن.

خوێندکارانی ئاوایی لە دوای پۆلی سەرەتایی دەنێردرێنە گۆکتەپە و مەهاباد تا درێژە بە خوێندن بدەن، کچان زۆر کەم ئەم هەلەیان بۆ ڕەخساوە تا بتوانن هاوشانی کوڕان پەرە بە خوێندن بدەن.

کاروپیشەی خەڵکی سێلەکە وەرزێری، ئاژەڵداری و باخدارییە، وەرزێران گەنم، نۆک، نیسک و جۆ دەچێنن و زۆربەی ئاژەڵەکانیان هەر مەڕە، بەرهەمی باخەکانیان سێو، قەیسی، گوێز و بادامە.

لەم دێیە دارتووییەکی گەورەی لێیە و بەری باشی هەیە و هەموو خەڵکی ناوچەکە کەلکی لێ وەردەگرن.

گرفتەکانی خەڵکی ئاوایی: ڕێگای خاکی یەکجار ناخۆش، لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوەی نییە، بێکار بوونی لاوەکان.

لە بەری ڕۆژهەڵاتی ئاوایی گۆڕستانی "بابەشێخ" هەیە، لە باشوورەوە "چاکەفاتمە" و گۆڕستانی "مناڵان" هەڵکەوتوون.

## شارەزوور

شارەزوور لە ٤٨ کیلۆمیتری باشووری ڕۆژهەڵاتی شاری مەهاباد، بەشی خەلیفان و دێهستانی کانی بازاڕ و لە ناوچەی مەنگوڕایەتی هەڵکەوتووە. لە ٤٧ ماڵ و ٢٧٩ کەس پێکهاتووە، لەمانە ١٤٧ کەس پیاون و ١٣٢ کەسیش ژنن، ژمارەی خوێندەوارانی ئەم ئاواییە ١٥٧ کەسە کە ٩٦ کەسیان پیاون و ٦١ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٩٦ کەسی نەخوێندەوار ٣٩ کەسیان پیاون و ٥٩ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی 4001/33 هێکتارە، لەمە 256/33 هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و ٣٧٤٥ هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.

شارەزوور خاوەن ٢٩٠ هێکتار زەوی دێم، ٢٠ هێکتار زەوی بەراو، ١١ هێکتار باخ، ٢٢ تراکتۆر و ١ لاوێردەیە.

مەودای ئاوایی تا ناوەندی خزمەتگوزارییەکانی وەرزێری "کانی بازاڕ" ٣ کیلۆمیترە.

ئاواییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاواییەکانی قۆیتەڵ و کانی سێو

باکوور: ئاواییەکانی شێخ یۆسف و ئاچیدەرێ

ڕۆژهەڵات: ئاوایی گراوێ

ڕۆژاوا: ئاوایی خەلیفان

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باشوور: چاکی پەڕشان

باکوور: موقری قڕان (موکری قڕان)

ڕۆژهەڵات: حەوشەی حەزەی

ڕۆژاوا: بابڕەسوو

گرینگترین کانیاوی ئەم دێیە کانی "پەڕشان"ە.

زۆربەی خانووبەرەکان لە قوڕ و بەرد و میچەکانیان لە دارە، دیواری ماڵەکان بە قوڕی سوور سواغ دراون. چەند خانووبەرەکیش کە بە بلووک و خشت ساز کراون دەبیندرێن. ماڵەکان حەوشەیان هەیە و دەرگایان تێگیراوە، کۆڵانەکانی ئاوایی کورتن و دووردرێژ.

شایانی باسە کە لە باشووری شاری "سولەیمانی"یش (کوردستانی ئێراق) مەڵبەندێکی بەرفراوانی هەر بەو ناوە (شارەزوور) لێیە و هۆی ناودێر کردنی ئەم ئاواییە و هاوناو بوونی دەگەڵ ئەو ناوچەیە ڕوون نییە.

تەپەی شارەزوور بە ژمارەی تۆمارکراوی ١٢٤٠ لە لایەن میراتی فەرهەنگی، بە بەرزایی ١٥٠٨ میتر لە ڕووکەشی زەریاکان، مێژووەکەی دەگەڕێتەوە سەر هەزارەی یەکەمی پێش زایین.

لە ڕۆژهەڵاتی ئاوایی ڕێگایەکی قیلەتاو بۆ ئاوایی گراوێ دەچێ، لە ڕۆژاواوە ڕێگایەکی قیلەتاو، ئاوایی گلێنان دەگرێتەوە.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی 1366/12/27 کارەبا بۆ چووە، لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە، سیمکارتی مخابەراتی دێهات، قوتابخانەی سەرەتایی (کوڕانە ـ کچانە) بە ناوی ئەندازیار "خۆڕڕەمی"، دێهیاری (ساڵی ١٣٨٨)، مزگەوتێک کە ساڵی ١٣٨٦ی هەتاوی بە خشت، چیمەنتۆ و ئاسن نۆژەن کراوەتەوە، هەروەها ئاوایی لە شووڕای ئیسلامی بەهرەمەندە. بۆ کاروباری بنکەی تەندروستی و وەرگرتنی نەوت و کەلوپەلیش سەر بە ئاوایی "خەلیفان"ن.

قوتابیان بۆ درێژەپێدان بە خوێندن ڕەوانەی ئاوایی خەلیفان و شاری مەهاباد دەبن.

وەرزێری، ئاژەڵداری و تا ڕادەیەک کرێکاری کاروپیشەی خەڵکی ئەم گوندەن. وەرزێران گەنم و جۆ دەچێنن و ئاژەڵەکان مەڕ، مانگا و بزنن. زۆرترین بەرهەمی باخەکانیش هەر سێوە.

گرفتەکانی خەڵکی شارەزوور: نەبوونی قوتابخانەی ناوەندی و نەبوونی بنکەی تەندروستیی سەربەخۆ.

ئاوایی خاوەن گۆڕستانێکی کۆنە، خەڵکی ئاوایی مردووەکانیان لە گۆڕستانی ئاوایی قۆیتەڵ یا گراوێ دەنێژن. ئەندازیار "جەلال مەحموودزادە" نوێنەری خەڵکی مەهاباد لە هەشتەمین خۆلی مەجلیسی شووڕای ئیسلامی خەڵکی ئەم گوندەیە.

# شۆڕاوا

شۆڕاوا لە ٣١ کیلۆمیتری باشووری ڕۆژاوای شاری مەهاباد، بەشی خەلیفان و دێهستانی مەنگوڕی ڕۆژهەلات و لە ناوچەی مەنگوڕایەتی هەڵکەوتووە.

لە ٦ ماڵ و ٤٢ کەس پێکهاتووە، لەمانە ١٧ کەس پیاون و ٢٥ کەسیش ژنن، ژمارەی خوێندەوارانی ئەم ئاوایییە ٢٥ کەسە کە ١٢ کەسیان پیاون و ١٣ کەسیش ژنن، هەروەها لە ١٥ کەسی نەخوێندەوار ٤ کەس پیاون و ١١ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی 2999/33 هێکتارە، لەمە 79/66 هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و ٢٩٢٠ هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.

شۆڕاوا خاوەن ٥٩/٨ هێکتار زەوی دێم، ٢٢/٢ هێکتار زەوی بەراو، ٦/٢٢ هێکتار باخ، ٢ تراکتۆر و ١ لاوێردەیە.

ئاوایییەکانی دەورووبەر:

باشوور: ئاوایی ئافان

باکوور: ئاوایییەکانی سلۆک و ڕفتە

ڕۆژهەلات: ئاوایی کامەم

ڕۆژاوا: ئاوایی مرانە

چیاکانی دەورووبەری ئاوایی:

ڕۆژهەلات: بی

ڕۆژاوا: تووان

خڕێ توانی سەرێ، خڕێ تووانی خوارێ، نێو گیای، مەندۆکجاڕ، بەڕۆژ، خاڵەمینە و خڕێ بی، کانیاوەکانی ئاوایین.

خانووبەرەکان لە قوڕ و بەرد و میچی دارە، ڕووبار بە ناوەندی ئاواییدا تێپەڕ دەبێ و ئاوایی دەکاتە دوو بەش، ماڵەکان زۆربەیان بەرەو ڕۆژاوا هەڵکەوتوون و حەوشەیان نییە.

بە پێی زانیارییەکانی خەڵکی ئەم دێیە، بەتایبەت کاک "برایم کوێخا قادری"، لە ساڵی ١٣٢٦ی هەتاوی لە سەر پێشنیاری "ئەحمەد قادرپوور" کە ئاغای ئاوایی "سلۆک" بووە، بەردی بناغەی شۆڕاوا داندراوە. ئەم شوێنە پێشوو مەزرای ئاوایی سلۆک بووە، هۆی ناودێر کردنیشی ڕوونە کە بە دەستی وەستای لێهاتووی ناوچەکە، واتا وەستا "شۆڕۆ" داندراوە و خۆی لە سەر بەردێکی ڕەشی دیواری ماڵە برایمی کوێخا قادری ساڵی ئاوەدانبوونەوەی ئەم ئاوایییەی دەستنیشان کردووە. وەستا "شۆڕۆ" وەستای لێهاتووی مەنگوڕان بووە، زۆر دیو و دیوەخان، مزگەوت و... لەم ناوچەیە داناوە. بە دانانی شۆڕاوا چەند ماڵێکی ئاوایی "سلۆک"یش هاتن و لەو وێ نیشتەجێ بوون.

لە باشووری ڕۆژاوای دێ جادەی قیلەتاوی دۆڵی ئافان هەڵکەوتووە کە باشووری ئەم ڕێگایە ئاوایی ئافان دەگرێتەوە و باکووری ڕۆژهەلاتیش دەچێتەوە ئاوایییەکانی سلۆک و ڕفتە.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی 1375/09/10 کارەبای بۆ چووە، سیمکارتی مخابەراتی دێهات. خەڵکی ئاوایی بۆ کەلک وەرگرتن لە بنکەی تەندروستی سەر بە ئاوایی "ئافان"ن و نەوت و کەلوپەلیشیان لە شەریکەی هاوبەشیی "حەولاکوردە" دابین دەبێ.

ئاوی شۆڕاوا لوولەکێشیی نەکراوە و لە چاڵاو دابین دەبێ.

قوتابیانی ئەو گوندە دەبێ لە سەرەتاوە بۆ خوێندن ڕێگای ئاوایییەکانی دەورووبەر بەتایبەت سلۆک بپێون، هەر بۆیە زۆربەی قوتابیان ناتوانن بخوێنن و تەنانەت لە خوێندنی سەرەتاییش بێ بەشن.

وەرزێری، ئاژەڵداری و باخداری کاروپیشەی خەڵکی شۆڕاوایە. وەرزێران گەنم، جۆ و نۆک دەچێنن و ئاژەڵەکانیان بریتین لە: مەڕ، مانگا و بزن، هەروەها بەرهەمی باخەکان لە سێو، بادام و ترێ پێکهاتووە.

گرفتەکانی خەڵکی شۆڕاوا: پێویستی بە لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوەیە، نەبوونی مزگەوت، نەبوونی شووڕای ئیسلامی، نەبوونی مامۆستای قوتابخانە.

ئاوایی خاوەن کۆنەگۆڕستانێکە بە ناوی "قەبری خڕێ تووان"ە، هەڵبەت خەڵکی ئاوایی مردووەکانیان لە گۆڕستانی ئاوایی سلۆک دەنێژن. کاک عەلی قادرپوور کە بە "کا عەلی شۆڕاوا"یە ناسراوە، شکستەبەندێکی کارامە و لێهاتووی ئەم گوندە و تەواوی ناوچەکە بووە.

## شەکریەگ

شەکریەگ لە ٥٤ کیلۆمیتری باشووری ڕۆژاوای شاری مەهاباد، بەشی خەلیفان و دێهستانی مەنگوڕی ڕۆژهەڵات و لە ناوچەی مەنگوڕایەتی هەڵکەوتووە. لە ١٦ ماڵ و ١١١ کەس پێکهاتووە، لەمانە ٥٥ کەس پیاون و ٥٦ کەسیش ژنن، لە ٤٨ کەسی خوێندەوار ٣٧ کەس پیاون و ١١ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٤٧ کەسی نەخوێندەوار ١٢ کەسیان پیاون و ٣٥ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ١٢٠٠ هێکتارە، لەمە ٣٠٤ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و ٨٩٦ هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.

شەکریەگ خاوەن ١٩ هێکتار زەوی دێم، ٧/٥هێکتار زەوی بەراو، ٧/٤٩هێکتار باخ و ١ تراکتۆرە.

ئاوایییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی گاگەشی خوارێ

باکوور: ئاوایییەکانی هەرمێ و کارگ و میرەسێ

ڕۆژهەڵات: ئاوایی کیسەلان

ڕۆژاوا: ئاوایی گاگەشی سەرێ

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باشوور: گۆڕمووسا

باکوور: قووڵەستێو

ڕۆژهەڵات: بەریلاکان

ڕۆژاوا: هەوارقوراوی

لە بەری باشوور ئاوایییەوە ئەشکەوتێک بە ناوی ئەشکەوتی "کانی شیلان" هەڵکەوتووە.

کانی باوەمەر - هەر ئەو کانیاوەی لە بەیتی ناسر و ماڵماڵ باسی کراوە -، کانی ناسر و ماڵماڵ کە ئاوی دێی لێ دابین دەبێ، دوو کانیاوی ئاواییین.

لەم دێیە هێندێک ماڵ دەچنە هەوار، یەکێک لەو هەوارانەی دەچن "خڕێ جمگێ"یە.

خانووبەرەکان لە قوڕ و بەرد و میچی دارە، ماڵەکان حەوشەیان نییە و هێندێکیان خاوەن هەیوان و پێشخانەن.

ڕێگایەکی خاکی لە باشوورەوە ئاوایییەکانی گاگەشی خوارێ و سەرێ دەگرێتەوە، لە باکوورەوە ڕێگایەکی خاکی دەچێتەوە ئاوایی میرەسێ، لە ڕۆژهەڵاتەوە ڕێگایەکی سەخڵەت و ناخۆش دەچێتەوە ئاوایی کیسەلان.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی ١٣٧٥/١٢/٢٥ کارەباکەی هەڵکراوە، بنکەی مخابەرات، قوتابخانەی سەرەتایی"توانا" (کوڕانە ـ کچانە)، بۆ کاری بنکەی تەندروستی سەر بە ئاوایی "گاگەش"ی خوارێن، نەوت و کەلوپەلیش لە شەریکەی هاوبەشیی "میرەسێ" وەردەگرن. ئاوی ئەم گوندە لوولەکێشیی بۆ نەکراوە هەر بۆیە بە سۆندە، لە کانی ناسر و ماڵماڵ، ئاویان بۆ ماڵەکانیان کێشاوە.

خوێندکاران بە هۆی نەبوونی بینای قوتابخانە لە ژووری ماڵاندا وانە دەخوێنن و لە دوای پۆلی سەرەتایی، درێژە بە خوێندن نادەن.

ئاژەڵداری، وەرزێری و کرێکاری بەتایبەت لە کانگاکانی بەرد، کارو پیشەی خەڵکی "شەکریەگ"یان پێکهێناوە، ئاژەڵەکان مەڕ و مانگان و وەرزێران گەنم، جۆ و بەهاروو دەچێنن. باخەکان بەرهەمەکانیان سێوە.

گرفتەکانی خەڵکی شەکریەگ: پێویستی بە لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوەیە، نەبوونی بینا بۆ قوتابخانە، نەبوونی بنکەی تەندروستیی سەربەخۆ، ڕێگای خاکی و ناخۆش و نەبوونی مزگەوت.

لە باشووری ڕۆژاوا گۆڕستانێکی مێژوویی هەیە بە ناوی "ناسر و ماڵماڵ"، زۆر کەس دەڵێن ناسر و ماڵمال لەو گۆڕستانە نێژراون، ئی وایە دەڵێ لە مەودای کانی باوەمەرەوە هەتا گۆڕستان ناشتراون، بەم چەشنە یەکیان دەکەوێتە سەر جادەیە و ئەوی دیکەیان لە بەر جادەیە.

خەڵکی شەکریەگ و گاگەشی خوارێ بۆ ناشتنی مردووەکانیان کەلک لەم گۆڕستانە وەردەگرن.

یەکێک لە دانیشتووانی ئاوایی بە ناوی مام "فەتاح فەهیمیفەڕ" لە دایک بووی ساڵی ١٣٠٧ی هەتاوی، سەبارەت بە حرووسان ئاوامان بۆ دەگێڕێتەوە:

وەکو بۆیان گێڕاومەتەوە، ئەو سەردەمی حرووسان ڕوو لە شەکریەگ دەکەن بە پانەوە خەڵکەکەی هەڵدێن و کەسیان لێ ناکوژرێ. حرووسان دەڕۆن و لە سەرچاوەی کانی شینکێ [کە دەڵێن زوو ئاوایی بووە و لە باشووری گاگەشی خوارێیە] لە سەر تەپۆڵکەیەک بۆ ماوەی چەند مانگ دەمێننەوە، ئێستاش ئەو تەپکەیە بە ناوی "تەپکەحرووسان" ناوی دەرکردووە.

## شێخان

شێخان لە ٤١ کیلۆمیتری باشووری ڕۆژاوای شاری مەهاباد، بەشی خەلیفان و دێهستانی مەنگوڕی ڕۆژهەڵات و لە ناوچەی مەنگوڕایەتی هەڵکەوتووە.
لە ١٥ ماڵ و ٦٢ کەس پێکهاتووە، لەمانە ٣٦ کەس پیاون و ٢٦ کەسیش ژنن، لە ٢٧ کەسی خوێندەوار ٢٠ کەس پیاون و ٧ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٣١ کەسی نەخوێندەوار ١٤ کەس پیاون و ١٧ کەسیش ژنن.
پانتایی ئاوایی ٦٠٦٦ هێکتارە،لەمە ٥٦ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و٦٠١٠ هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.
شێخان خاوەن ٦٣/٥ هێکتار زەوی دێم، ٣٧/٥ هێکتار زەوی بەراو، ٢/٨٥ هێکتار باخە.

ئاوایی‌یەکانی دەوروبەر:
باشوور: ئاوایی حەسەنچەپ
باکوور: ئاوایی قشقوونەی خوارێ
ڕۆژهەڵات: ئاوایی باگردانی سەرێ
ڕۆژاوا: ئاوایی سێروو

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:
باشوور: کێوی ڕەشهەرمێیان
باکوور: کێوی سەرقووڵان
ڕۆژهەڵات: شاخەڕەش
ڕۆژاوا: تیرەگەی قەبران

لە باشووری ئەم دێیە ئەشکەوتێکی ئاوی لێیە کە بە "سێ کۆی ئەشکەوتان" ناودێر کراوە.
کانی مام سەیدی، سەرقووڵان، کانی شێخان، ڕەش هەرمێیان و لایەق ڕەحمەتی چەند کانیاوی ئاواییین.
زۆربەی خانووبەرەکان لە شێخان لە قوڕ و بەرد و میچی دار ساز کراون، لە بینای تازەدا بلووک و خشتیش دەکار کراوە، هیچ کام لە ماڵەکان حەوشەیان نییە و بە گشتی بەرەو باشوور ساز کراون، کۆڵانەکانی ئاوایی نارێکن.
بە پێی قسەی خەڵکی ئەوێ سەرەتا بنەماڵەی شێخێکی نەناسراو لەم ئاوایی‌یە ژیاون کە ملکی مەنگوڕان بووە، نزیک بە سەد و پەنجا ساڵ لەوەی پێش کابرایەک بە ناوی سەید "ماهی" لە بۆکانەوە دێ و ملکی ئەم دێیە دەکڕێ و سەرلەنوێ ئاوەدانی دەکاتەوە و دەگەڵ بنەماڵەکەی هەر لەوێ دەژین.
ئەم دێیە لە سەر ڕێگای دۆڵی شێخان هەڵکەوتووە کە بۆ بەری ڕۆژهەڵاتەوە دەچێتەوە ئاوایی باگردانی سەرێ و بۆ لای ڕۆژاواش ئاوایی سێروو دەگرێتەوە کە ڕێگاکان خاکین.
ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی ١٣٧٧/٣/١ کارەباکەی هەڵکراوە، بنکەی مخابەرات، قوتابخانەی سەرەتایی"دێخۆدا" (کوڕانە ــ کچانە) کە بیناکەی حازربەدەستە، مزگەوت بە ناوی "ئیمام عومەر بنی خەتاب" لە خشت و چیمەنتۆیە و میچەکەی دارە و ساڵی ١٣٧٢ی هەتاوی نۆژەن کراوەتەوە. بۆ کاری بنکەی تەندروستی سەر بە ئاوایی "باگردان"ی خوارێن، بۆ وەرگرتنی نەوت و کەلوپەلیش سەر بە شەریکەی هاوبەشیی ئاوایی "سیاقۆڵ"ی خوارێن.
لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە بۆ ئاوایی نەکراوە، زۆربەی خەڵک لە کانیاوی "لایەق ڕەحمەتی" کەلک وەردەگرن، هێندێک لە ماڵەکان چاڵاویان لێداوە یان هەر لە کانیاو ئاویان بە سۆندە ڕایەڵ کردووە.
خوێندکاران بۆ پەرەپێدان بە خوێندنیان دەچنە خەلیفان و مەهاباد و لەو بارەوە جیاوازی نێوان کوڕان و کچان بەرچاوە.
ئاژەڵداری، وەرزێری و کرێکاری کاروپیشەی خەڵکی ئاواییین. ئاژەڵەکان مەڕ و بزنن و بە ڕادەیەکی کەمیش مانگا ڕادەگرن، وەرزێران گەنم، جۆ و پەڕش و نیسک دەچێنن. دوو ماڵ مێشداری دەکەن، بەرهەمی باخەکان کە زۆر کەمە، سێوە.
گرفتەکانی خەڵکی ئاوایی: ڕێگای خاکی و ناخۆش، پێویستی بە بنکەی تەندروستی سەربەخۆیە،نیازیان بە لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوەیە.
ئەم دێیە خاوەن گۆڕستانێکی کۆنە.

## شێخ یۆسف (گۆلان)

ئەم ئاوایی‌یە لە ٤٦ کیلۆمیتری باشووری ڕۆژهەڵاتی شاری مەهاباد، بەشی خەلیفان و دێهستانی کانی بازاڕ و لە ناوچەی مەنگوڕایەتی هەڵکەوتووە.
لە ١٤ ماڵ و ٩٥ کەس پێکهاتووە، لەمانە ٤٢ کەس پیاون و ٥٣ کەسیش ژنن، ژمارەی خوێندەوارانی ئەم ئاواییە ٦٤ کەسە کە ٣٣ کەس پیاون و ٣١ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٢٤ کەسی نەخوێندەوار ٦ کەس پیاون و ١٨ کەسیش ژنن.
پانتایی ئاوایی 2499/66 هێکتارە، لەمە 194/66 هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و ٢٣٠٥ هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.
شێخ یۆسف خاوەن ٣٦٠ هێکتار زەوی دێم، ٣٥ هێکتار زەوی بەراو، ١٧ هێکتار باخ و ٦ تراکتۆرە.
مەودای ئاوایی تا ناوەندی خزمەتگوزاریی وەرزێری کانی بازاڕ ٣ کیلۆمیترە.

ئاوایی‌یەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی‌یەکانی خەلیفان، قۆیتەڵ و شارەزوور

باکوور: ئاوایی‌یەکانی خاڵدەلیل و میرەدێ

ڕۆژهەڵات: ئاوایی ئاچی‌دەرێ

ڕۆژاوا: ئاوایی کانی میران

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باکوور: هەواری مەلا برایمی

ڕۆژهەڵات: بەردەقووچ

ڕۆژاوا: شێخ یۆسف

کانی شێخ وسوو و کانی گۆلان دوو کانیاوی بەناوبانگی ئاوایین.
خانووبەرەکان بە گشتی لە قوڕ و بەرد و میچی دارە، هێندێک لە ماڵەکان خاوەن حەوشەن و ئاوایی لە بەرزایی هەڵکەوتووە.
مێژووی ئاوەدان کردنەوەی ئەو دێیە لە ٦٠ ساڵ تێپەڕ نابێ، لە سەر داخوازی "باپیرئاغای نەوزەری" ئاوەدان کراوەتەوە و لە پێشدا مەزرای ئاوایی خەلیفان بووە.
ئەم ئاواییە دوو ناوی هەیە "شێخ یۆسف" کە ناوی چاکێکە لە ڕۆژاوای دێ و "گۆلان" کە زۆربەی خەڵکەکە هەر وای پێدەڵێن.
لە باشووری ئاوایی ڕێگایەکی خاکی نزیک بە ٣ کیلۆمیتر هەڵکەوتووە کە تێکەڵ ئاوایی خەلیفان دەبێتەوە.
ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی 1377/05/22 کارەبای هەڵکراوە، لوولەکێسی ئاوی خواردنەوە، سیمکارتی مخابەراتی دێهات، مزگەوت و قوتابخانەی سەرەتایی"ناس" (کوڕانە ـ کچانە)، بۆ کاروباری بنکەی تەندروستی و وەرگرتنی نەوت و کەلوپەل سەر بە ئاوایی "خەلیفان"ن.
قوتابیان بۆ درێژەدان بە خوێندن دەچنە خەلیفان و مەهاباد.
ئاژەڵداری، وەرزێری و باخداری کاروپیشەی خەڵکی ئاوایین.
ئاژەڵەکان مەڕ، مانگا و بزنن، وەرزێران گەنم و نۆک دەچێنن و بەرهەمی باخەکان لە قەیسی، هڵوو و سێو پێکهاتووە.
گرفتەکانی خەڵکی ئاوایی: ڕێگاوبانی خاکی، نەبوونی بنکەی تەندروستیی سەربەخۆ و نەبوونی شووڕای ئیسلامی.
گۆڕستانی ئاوایی بە "تەپکی قەبران" ناسراوە.

## شیلاناوێ

شیلاناوێ لە 10 کیلۆمیتری باکووری ڕۆژهەڵاتی شاری مەهاباد، بەشی ناوەندی و دێهستانی ئاختاچی ڕۆژاوا و لە ناوچەی محاڵ هەڵکەوتووە. لە ٣٤ ماڵ و ١٦١ کەس پێکهاتووە، لەمانە ٧٨ کەس پیاون و ٨٣ کەسیش ژنن، لە ٨٥ کەسی خوێندەوار لەم دێیە ٥١ کەس پیاون و٣٤ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٦٣ کەسی نەخوێندەوار ٢١ کەس پیاون و ٤٢ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی 3419 هێکتارە، لەمە 216 هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و 3203 هێکتار پاوان و لەوەرگەی دێیە.

شیلاناوێ خاوەن ٧٨ هێکتار زەوی دێم، ٧٠ هێکتار زەوی بەراو، ٢٦ هێکتار باخ، ١٢ تراکتۆر و ٣ لاوێردەیە.

ئاواییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی قزڵجەی سەرێ

باکوور: ئاوایی لاچین

ڕۆژهەڵات: ئاوایی سارەوانان

ڕۆژاوا: ئاوایی کۆنەدێی قازی

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باشوور: کێوە ڕەش و لانەکووند

باکوور: بۆزداخ و قووڵڕفتە

ڕۆژهەڵات: گامرێن، حەلی بەگیان و هەوارەبەرد

ڕۆژاوا: سوێی چاکی و کانی پیرێژن

ناودارترین کانیاوەکانی ئاوایی بریتین لە: سەرچاوەی بەردەقووچ، کانی مەلازادە، کانی فەقێیان و کانی سارد.

زۆربەی ماڵەکان لە قوڕ و بەردن و میچیان لە دارە، بەدەگمەن خشت دەکار کراوە و لە بینا تازەکاندا بەکاری دێنن ، ماڵەکان و کۆڵانەکان هەوراز هەڵکەوتوون، هێندێک لە خانووبەرەکان خاوەن حەوشەن و دەرگایان نییە و زۆربەی ماڵەکان ڕوویان لە ڕۆژاوایە.

وەکوو باس دەکرێ و دیارە هۆی ناودێرکردنی ئەم ئاواییە "شیلاناوێ" ئەو شیلانە زۆر و زەوەندە بن کە لەم ئاواییە و دەوروبەرەکەیەتی؛ ئێستاش شیلان لەم گوندە کەم نییە و جگە لە شیلان، کرۆسک، هەرمێ، گێوژ و زریشکی کێویش تا ڕادەیەک هەیە.

لە لای باکووری ئاوایی ڕێگایەکی خاکی بۆ ئاواییەکانی لاچین و سارەوانان دەڕوا، لە لای ڕۆژهەڵاتەوە کوێرەڕێگایەکی خاکی ئاواییەکانی قزڵجە و دەرمان دەگرێتەوە.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی 1368/06/01 کارەبای هەڵکراوە، لوولەکێسی ئاوی خواردنەوە کە ئاوەکەی لە کانی فەقێیان دابین دەبێ، دوو مزگەوت کە یەکیان تازە ساز کراوە لە ١٣٨٤ی هەتاوی و مزگەوتی کۆنیش لە قوڕ و بەردە، قوتابخانەی سەرەتایی (کوڕانە ـ کچانە) بە ناوی "عەداڵەت"، بنکەی مخابەرات. خەڵکی ئەم دێیە بۆ وەرگرتنی نەوت و کەلوپەل سەر بە شەریکەی هاوبەشیی گەڕەکی "پشتتەپ"ی مەهابادن، هەروەها بۆ بنکەی تەندروستیش ڕێگای ئاوایی لاچین دەپێون.

بینای قوتابخانەی ئەم گوندە بە هۆی کۆن بوون و شەڕ بوونی حوکمی ڕووخانی ڕاگەیەندراوە. قوتابیانی ئاوایی بە هۆی نەبوونی قوتابخانەی ناوەندی لە ئاوایی و لە ناوچەدا، پاش تێپەڕ کردنی پۆلەکانی سەرەتایی، زۆر کەم هەڵدەکەوێ درێژە بە خوێندن بدەن، بەڵام ئەو قوتابیانەی بۆیان ڕەخسا درێژە بە خوێندن بدەن دەبێ بچنە ئاوایی گۆکتەپە یا شاری مەهاباد.

ئاژەڵداری، وەرزێری و باخداری کاروپیشەی خەڵکی ئاواییـن، زۆرتری ماڵەکان مەڕدارن و چەند ماڵێکیش مانگایان هەیە. وەرزێران گەنم و جۆ دەچێنن، بەرهەمی باخەکانیش سێو، قەیسی، بادام و گوێزە.

ڕێگاوبانی ناخۆش، پێویستی بە ساز کردنی بینا بۆ قوتابخانە و نەبوونی بنکەی تەندروستیی سەربەخۆ، وەک سێ گرفتی سەرەکی خەڵکی ئەم ئاواییە جێگای باسن.

بەری ڕۆژاوای دێ، دوو گۆڕستانی لێیە کە یەکیان هەر لە سەر ڕێگاکەیە و "قەبری قاسمئاغا"ی پێدەڵێن و ئەوی دیکەیان کە تازەیە بە "سوێی چاکی" ناسراوە. سروشتی جوان و ڕازاوە، کێو و ڕووباری پڕ خرۆش، بەندەن و تەلانی شیلاناوێ لە بیر و نووسینی "هێمن موکریانی"دا بێ-بەهرە نەبووە. "مامۆستا هێمن" شاعیری ڕەسەنی کوردی وەک خۆی لە ژیاننامەکەیدا باسی دەکا دوای ماوەیەک مانەوە لە ئاوایی لاچین ڕوو لە ئاوایی شیلاناوێ دەکا و لەوێ نیشتەجێ دەبێ.

## عەینەمەلا

ئام ئاوایی‌یە لە ٢٣ کیلۆمیتری باشووری ڕۆژهەڵاتی شاری مەهاباد، بەشی خەلیفان و دێهستانی کانی بازاڕ و لە ناوچەی مەنگوڕایەتی هەڵکەوتووە.
لە ٥ ماڵ و ٣٩ کەس پێکهاتووە، لەمانە ٢١ کەسی پیاون و ١٨ کەسیش ژنن، لە ٢٢ کەسی خوێندەوار لەم دێیە ١٤ کەس پیاون و ٨ کەسیش ژنن، هەروەها لە ١٥ کەسی نەخوێندەوار ٦ کەس پیاون و ٩ کەسیش ژنن.
پانتایی ئاوایی ١٨٠ هێکتارە، لەمە ٧٣ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و ١٠٧ هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.
عەینەمەلا خاوەن ٨٠ هێکتار زەوی دێم، ١٥ هێکتار زەوی بەراو، ٣ هێکتار باخ و ٢ تراکتۆرە.

ئاوایی‌یەکانی دەوروبەر:
باشوور: ئاوایی پیرمکائیل
باکوور: ئاوایی گردەبەردان
ڕۆژهەڵات: ئاوایی‌یەکانی بەیرەم و بەرەجۆ
ڕۆژاوا: ئاوایی‌یەکانی قۆزلووجە و خرەجۆ

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:
باشوور: کانی زێڕ
باکوور: ڕەسوڵئاغا
ڕۆژهەڵات: بەڕۆژەبڵیند
ڕۆژاوا: شاخی عەینەمەلا (شاخی کورەخانە)

کانیاوەکانی ئاوایی بە "کانی زێڕ" و "کانی حەنیفە" ناسراون.
خانووەکانی ئەم ئاوایی‌یە لە قوڕ و بەرد و خشت ساز کراون و میچەکانیان بە دار داپۆشراوە، ماڵەکان ڕوویان لە ڕۆژهەڵاتە و هیچ کامیان حەوشەیان نییە، ئەو شوێنەی ئاوایی عەینەمەلای لێ هەڵکەوتووە قووڵە.
دەڵێن ئەو ئاوایی‌یە لە دوای ئاوایی "پیرمکائیل" ئاوەدان بۆتەوە و پێشتر سەر بە پیرمکائیل بووە، وەکوو بەساڵاچووان باس دەکەن نزیک بە ٨٠ ساڵ دەبێ کە "عەینەمەلا" ئاوەدان کراوەتەوە. ناوی ئاوایی هەر ناوی ئەو چیایە کە لە بەری ڕۆژاوای گوندەکە هەڵکەوتووە.
لە باشووری ئاوایی ڕێگایەکی خاکی هەیە و دەچێتەوە ئاوایی پیرمکائیل، لە باکوورەوە ڕێگایەکی خاکی ئاوایی گردەبەردان دەگرێتەوە و لە ڕۆژهەڵاتیش ڕێگایەکی خاکی دەچێتەوە ئاوایی بەرەجۆ.
ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی ١٣٧٨/٤/١ کارەبا بۆ چووە، سیمکارتی مخابەراتی دێهات، کانگای بەردی گرانیت (کەرتی تایبەتی). بۆ کاروباری بنکەی تەندروستی سەر بە ئاوایی "گردەبەردان"ن، نەوت و کەلوپەل لە شەریکەی هاوبەشیی "خەلیفان" وەردەگرن.
لوولەکێسی ئاوی خواردنەوەیان نییە هەر بۆیە لە کانیاوی "چۆڕچۆڕ"ەوە بە جەڕڕە و گۆزە و تونگان ئاوێ دێنن.
خوێندکارانی ئەم گوندە بە هۆی نەبوونی قوتابخانە، زۆربەیان دەستیان لە خوێندن هەڵگرتووە، چەند کەسێکی قوتابی هەیە کە لە شاری مەهاباد درێژە بە خوێندن دەدەن.
کارو‌پیشەی خەڵک وەرزێری، ئاژەڵدارییە و چەند کەسێکیش باخدارن. وەرزێران گەنم، جۆ و نۆک دەچێنن و ئاژەڵەکانیان بریتین لە: مەڕ، بزن و مانگا. بەرهەمی زۆرتری باخەکانیشیان هەر ترێیە.
گرفتەکانی خەڵکی ئاوایی عەینەمەلا: ڕێگای خاکی و ناخۆش، پێویستی بە هەبوونی پردێک بۆ نێو ئاوایی، نەبوونی بنکەی تەندروستی سەربەخۆ و پێویستیان بە لوولەکێسی ئاوی خواردنەوەتە.
خەڵکی ئەم دێیە مردووەکانیان لە گۆڕستانی ئاوایی "گردەبەردان" بە خاک دەسپێرن.

## عیساکەند

عیساکەند لە ٣٢ کیلۆمیتری ڕۆژهەڵاتی شاری مەهاباد، بەشی ناوەندی و دێهستانی ئاختاچی ڕۆژاوا و لە ناوچەی محاڵ هەڵکەوتووە. لە ٦٣ ماڵ و ٣٨٩ کەس پێکهاتووە، لەمانە ١٨٢ کەس پیاون و ٢٠٧ کەسیش ژنن، ژمارەی خوێندەوارانی ئەم ئاواییە ٢٤٢ کەسە کە ١٢٦ کەس پیاون و ١١٦ کەسیش ژنن، هەروەها لە ١٠٧ کەسی نەخوێندەوار ٣٥ کەس پیاون و ٧٢ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ٢٣٠٠ هێکتارە، لەمە ٣٢٩ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و ١٩٧١ هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.

عیساکەند خاوەن ٢١٦ هێکتار زەوی دێم، ٢١١ هێکتار زەوی بەراو، ٥٢ هێکتار باخ و ٣٨ تراکتۆرە.

بەرزایی ئاوایی لە ڕووکەشی زەریاکانەوە ١٥١٥ میترە.

ئاواییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاواییەکانی قادراوا، نیسکاوا و خانەقا

باکوور: ئاواییەکانی یاڵاوەی سەرێ و خوارێ

ڕۆژهەڵات: ئاوایی ئۆتەمیش

ڕۆژاوا: ئاواییەکانی سیچانبڵاغ و سەهۆڵان

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باشوور: نیسەی گەورە

باکوور: پایەگا

ڕۆژاوا: قۆتڕ

بەرداشی، کەرێزاو، کولتەپە، قەڵا ماران، سێ کانیان، شێخە و چۆمی حەوڵای کاکە، چەند کانیاوی ئاواییەن.

خانووبەرەکان لە قوڕ و بەردن و میچەکانیان لە دارن، دەرەوەی دیواری هێندێک لە ماڵەکان بە کاگڵ سواغ دراون، کۆڵانەکانی ئاوایی ناڕێک و بەرتەسکن، لە ساز کردنی بینا نوێیەکاندا خشت و بلوک دەکار دێنن، زۆربەی ماڵەکان حەوشەیان هەیە.

ئاوایی عیساکەند لە سەر جادەی مەهاباد ــ بۆکان هەڵکەوتووە. لە باشوورەوە ڕێگایەکی قیلەتاو دەچێتەوە ئاوایی سەهۆڵان، لە باکوورەوە ڕێگایەکی خاکی دەچێتەوە ئاوایی یاڵاوەی خوارێ.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی 1362/11/27 کارەبای هەڵکراوە، سیمکارتی مخابەراتی دێهات، بنکەی تەندروستی، قوتابخانەی سەرەتایی (کوڕانە ـ کچانە) بە ناوی "خەیام"، ئاکابیری، مزگەوت ساڵی ١٣٧٨ی هەتاوی نۆژەن کراوەتەوە و هەروەها ئاوایی لە دێهیاری و شووڕای ئیسلامی بەهرەمەندە.

خەڵکی ئەم گوندە نەوت و کەلوپەل لە شەریکەی هاوبەشیی ئاوایی "بورهان" وەردەگرن.

هێندێک لە قوتابیان بۆ درێژەدان بە خوێندن ڕوو لە ئاواییەکانی گۆکتەپە و ئۆتەمیش یا شارەکانی مەهاباد و بۆکان دەکەن.

کاروپیشەی خەڵکی عیساکەند لە وەرزێری، ئاژەڵداری و تا ڕادەیەک باخداری پێکهاتووە.

وەرزێران گەنم و جۆ دەچێنن و ئاژەڵەکانیان بریتین لە: مەڕ، مانگا و بزن. هەروەها بەرهەمی باخەکان لە سێو و قەیسی پێکهاتووە.

گرفتەکانی خەڵکی ئاوایی: نەبوونی لوولەکێسی ئاوی خواردنەوە، نەبوونی قوتابخانەی ناوەندی.

گۆڕستانی ئاوایی لە باشووری ئاوایی هەڵکەوتووە، ئەم گۆڕستانە قەبری کۆنیشی لێیە.

بەساڵاچووانی ئاوایی دەڵێن ئەم ئاواییە زوو ژنێکی لێ بووە بە ناوی خات "فاتمی حەمەسادق" کە حەکیمایەتی کردووە.

هونەرمەندی ناسراو برایم قادری (گۆرانیبێژ) خەڵکی ئەم گوندەیە، هەروەها مەکۆی ژیانی "قادربەگ"ی حەیرانبێژ بووە.

"حەمەجان"ی بەیتبێژ و فۆلکلۆرزان، خەڵکی سێوەدینی ناوچەی تازەقەڵای شاری بۆکان بووە کە هۆگرییەکی زۆر لە نێوان ئەو و خەڵکی ئەو گوندەدا هەبووە، حەمەجان زۆر لەم دێیە ماوەتەوە.

## قازیاوا

قازیاوا لە 8 کیلۆمیتری ڕۆژاوای شاری مەهاباد، بەشی ناوەندی و دێهستانی موکریانی ڕۆژاوا و لە ناوچەی شارویران هەڵکەوتووە. لە ٤٦ ماڵ و ٢٤١ کەس پێکهاتووە، لەمانە ١١٧ کەس پیاون و ١٢٤ کەسیش ژنن، ژمارەی خوێندەوارانی ئەم ئاوایییە ١٥٤ کەسە کە ٨٨ کەس پیاون و ٦٦ کەس ژنن، هەروەها لە ٦٥ کەسی نەخوێندەوار ١٧ کەس پیاون و ٤٨ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی 8000 هێکتارە، لەمە 393 هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و 7607 هێکتار پاوان و لەوەرگەی دێیە.

قازیاوا خاوەن ٢٠٠ هێکتار زەوی دێم، ٣٥ هێکتار زەوی بەراو، ١٦ هێکتار باخ، ٨ تراکتۆر و ١ لاوێردەیە.

ئاوایییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایییەکانی کەوتەر و داشتەمر

باکوور: ئاوایی بایندەرێ

ڕۆژهەڵات: شاری مەهاباد

ڕۆژاوا: ئاوایی خەلیفە

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باکوور: دەرەی سماقان

ڕۆژاوا: گورینگان و کێلەسوور

شیوە توێ، سماقان، کێلەسوور، ولوودەرێ و چۆڕاوکێ چەند کانیاوی ئەم گوندەن.

ماڵەکان زۆرتر لە قوڕ، بەرد، خشت، بلووک و چیمەنتۆش دەکار کردووە، زیاتری میچەکانیش لە دارن و خانووبەرەکان حەوشەیان هەیە. ئاوایی لە دوو کۆڵانی ڕێک و ڕاست پێکهاتووە. قازیاوا لە دەشتایی داوێنی کێو هەڵکەوتووە و نێو دێ هەورازی کەمە. خەڵک دەڵێن ناوی قازیاوا دەگەڕێتەوە سەر دەسەڵاتداری بنەماڵەی "قازی" بە سەر ئەم دێیەدا.

سەبارەت بە مێژووی ئاوایی وەکوو خەڵک لە زمان میرزا "وەهاب قازی" دەیگێڕنەوە دەبێ ئەو ئاوایییە چەند جار چۆڵ کرابێ و ئاوەدان کرابێتەوە، بەڵام ئەوەی ڕوونە ئەوەیە کە شوێنی ئێستا پێشتر مەزرای "محەممەدئەمین مەعرووفی" بووە و بە گورینگان ناسرابوو. ساڵی 1347ی هەتاوی کاتێک ئاوبەندی مەهاباد لێدرا، خەڵکی هێندێک لە ئاوایییەکانی دەوروبەری ئاوبەند، بە ناچار زەوییەکانیان یا بە دەوڵەت فرۆشت یا لە شوێنێکی تر مووچە و مەزرایان دانێ، وەک ئاوایی "داشتەمر"ی خوارێ و "هەمزاوا". قازیاواش لەم گوندانە بوو کە وەبن ئاوبەند کەوت، بەڵام خەڵکەکەی گوێزتیانەوە بۆ شوێنی ئێستا. تەپکەی قازیاوا بە بەرزایی 1384 میتر لە ڕووکەشی زەریاکان، لە باشووری ئاوایی هەڵکەوتووە، ژمارەی تۆمارکراوی ئەو تەپکەیە لە میراتی فەرهەنگی (15977)ە کە دەگەڕێتەوە سەر هەزارەی یەکەمی پێش زایین. هەروەها لە باشووری ئاوایی تەپەی کەونی "کوورە گێوژێ" هەڵکەوتووە. لە 500 میتری باکووری ئاوایی جادەی مەهاباد ـ پەسوێ تێپەڕ دەبێ.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی 1358/12/15 کارەباکەی هەڵکراوە، لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە (عەنباراویان بۆ داناوە)، بنکەی مخابەراتی، مزگەوت کە بۆ سێهەمین جار لە ساڵی 1380ی هـ بە یارمەتی خەڵک نۆژەن کراوەتەوە، قوتابخانەی سەرەتایی (کوڕانە ــ کچانە) بە ناوی "جیهاد" کە بیناکەی نوێیە و بە هاوکاری دەوڵەت و خەڵک دانداروە، هەروەها ئاوایی خاوەن شووڕای ئیسلامی و شووڕای چارەسەری کێشەکانە. بۆ کەڵک وەرگرتن لە بنکەی تەندروستی سەر بە ئاوایی "دێبۆکر"ن و نەوت و کەلوپەل لە شەریکەی هاوبەشیی"پشتەپ" وەردەگرن. قوتابیان پاش تێپەڕ کردنی پۆلی سەرەتایی ڕوو لە شاری مەهاباد یا ئاوایی گۆکتەپە دەکەن.

وەرزێری، ئاژەڵداری و باخداری کاروپیشەی خەڵکی ئەم گوندەن، بە دەگمەن کرێکاری و مێشداریش دەکەن. وەرزێران گەنم، جۆ، نۆک و نیسک دەچێنن، ئاژەڵەکان بریتین لە: مەڕ، مانگا و بزن، بەرهەمی باخەکانیشیان سێوە.

نەبوونی بنکەی تەندروستیی سەربەخۆ، نەبوونی دێهیاری، پێویستی بە قیلەتاو کردنی ڕێگای ٥٠٠ میتری ئاوایی بۆ سەر ڕێگای سەرەکی مەهاباد ـ پەسوێ لە گرفت و داخوازییە سەرەتایییەکانی خەڵکی ئەم ئاوایییە. گۆڕستانی ئاوایی لە باشوور هەڵکەوتووە، گۆڕستانی "پیروبابز" ناوی کۆنەگۆڕستانەکەیەتی کە لە باشووری ڕۆژاوا و لە دەرەوی دێیە. لە کەسایەتییە بەناوبانگەکانی ئەم دێیە دەتوانین ئاماژە بە نووسەر، وەرگێڕ مامۆستا "ئەحمەد قازی" و هەروەها خۆشنووس و نەقاش و شاعیر کاک "ڕەحمان قازی" بکەین.

## قالوێ زەندان

ئەم ئاوایییە لە ٦٥ کیلۆمیتری باشووری ڕۆژهەڵاتی شاری مەهاباد، بەشی خەلیفان و دێهستانی کانی بازاڕ و لە ناوچەی گەورکایەتی هەڵکەوتووە.
لە ٦٣ ماڵ و ٤٣٨ کەس پێکهاتووە، لەمانە ٢٢٤ کەس پیاون و ٢١٤ کەسیش ژنن، لە ٢٦٤ کەسی خوێندەوار ١٦٠ کەس پیاون و ١٠٤ کەسیش ژنن، هەروەها لە ١٣٦ کەسی نەخوێندەوار ٤٣ کەس پیاون و ٩٣ کەسیش ژنن.
پانتایی ئاوایی ١٢٨٧ هێکتارە، لەمە ٥٨٧ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و ٧٠٠ هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.
قالوێ زەندان خاوەن ١٢٠ هێکتار زەوی دێم، ٥٠ هێکتار زەوی بەراو، ٨ هێکتار باخ، ٢١ تراکتۆر و ١ لاوێردەیە.
مەودای ئاوایی تا ناوەندی خزمەتگوزاریی وەرزێری کانی بازاڕ ١٢ کیلۆمیترە.

ئاوایییەکانی دەوروبەر:
باشوور: ئاوایی قالوێ ڕەسووڵئاغا
باکوور: ئاوایی کانی سێو
ڕۆژهەڵات: ئاوایی قالوێ شێخان
ڕۆژئاوا: ئاوایی باراوا

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:
باشوور: کێوی بنەشۆڕ
باکوور: کێوەکەی ناوی نییە
ڕۆژهەڵات: کێوی نیسێسووتاو
ڕۆژئاوا: کێوی باخی تشان

کانی چناران و کانی نێو دێ دوو کانیاوی ئەم دێیەن.
لە قالوێ زەندان زۆربەی ماڵەکان هەر لە قوڕ و بەرد و میچی دار سازکراون، خشت و بلووک زۆر کەم وەبەر چاو دێ، خانووبەرەکان بەرەو باشوورن و هێندێک خاوەن حەوشەن و هێندێک حەوشەیان نییە، کۆڵانەکانی ئاوایی تا ڕادەیەک ڕێک و ڕاستن.
ئاوایی قالوێ زەندان، قالوێ شێخان و قالوێ لە پەنا یەک هەڵکەوتوون کە پێشتر هەر سێ سەر بە مەهاباد بوون. ناوی ئەم سێ ئاوایییە زۆر لێک نزیکن و هۆیەکی ڕوون نییە، ڕەنگە زوو هەر سێ ئاوایی لە ژێر دەسەڵات و مڵکی ئاغایەکدا بووبێ.
لە ڕۆژهەڵاتی دێ ڕێگایەکی خاکی دەچێتەوە چەندین ئاوایی و یەکێک لە ڕێگایەکانی چوون بۆ شاری بۆکان، لە ڕۆژئاوای دێ ڕێگایەکی خاکی هەیە کە دەبێتە دووڕێیانێک و یەکیان دەڕواتەوە ئاوایی کانی سێو و ئەوی دیکە دەچێتەوە ئاوایی باراوا.
ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی ١٣٧١/٣/١٧ کارەباکەی هەڵکراوە، لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە کە عەنباراویان بۆ داناوە و ئاوەکەی لە کانیاوی "هێلۆ" دابین دەبێ، سیمکارتی مخابەراتی دێهات، بنکەی تەندروستی، قوتابخانەی سەرەتایی (کوڕانە کچانە) بە ناوی "خاجە نەسیرەددین تووسی"، مزگەوتێک بە ناوی "محەممەدڕەسووڵڵا" (د.خ) کە ساڵی ١٣٨٣ی هەتاوی نۆژەن کراوەتەوە و دوو نهومە بۆ پیاوان و ژنان، نانەوەخانە و هەروەها ئەم دێیە خاوەن دێهیاری و شووڕای ئیسلامییە. نەوت و کەلوپەلیش لە شەریکەی هاوبەشیی ئاوایی کانی سێو وەردەگرن.
خوێندکاران بۆ درێژەدان بە خوێندن دەچنە خەلیفان و مەهاباد و مافی کچ و کوڕان لەو بارەوە پارێزراوە.
وەرزێری، ئاژەڵداری، کرێکاری و تا ڕادەیەک باخداری کاروپیشەی خەڵکی ئەم گوندەن، وەرزێران گەنم، جۆ و نۆک دەچێنن و ئاژەڵەکان لە مەڕ، بزن و مانگا پێکهاتوون، بەرهەمی باخەکانیشیان سێو، ترێ و ترش (سماق)ە.
گرفتەکانی خەڵکی قالوێ زەندان: نەبوونی قوتابخانەی ناوەندی، نەبوونی ئیمکاناتی وەرزیشی.
گۆڕستانی ئاوایی بە "مەلازادان" ناسراوە و لە باکوور هەڵکەوتووە.

## قاوەخانەی حاجی کەریمی

ئەم ئاوایییە لە ٢٣ کیلۆمیتری باشووری ڕۆژاوای شاری مەهاباد، بەشی خەلیفان و دێهستانی مەنگوڕی ڕۆژهەڵات و لە ناوچەی مەنگوڕایەتی هەڵکەوتووە. لە ٥ ماڵ و ٢٨ کەس پێکهاتووە، لەمانە ١٦ کەس پیاون و ١٢ کەسیش ژنە، لە ١٥ کەسی خوێندەوار ٩ کەس پیاون و ٦ کەسیش ژنن، هەروەها لە ١١ کەسی نەخوێندەوار ٦ کەس پیاون و ٥ کەسیش ژنن.
ئەم دێیە هیچ لەوەرگەیەکی نییە و پێشتر مەزرای سیاقۆڵ بووە.

ئاوایییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی سیاقۆڵی سەرێ
باکوور: ئاوایی پەڵکێ
ڕۆژهەڵات: ئاوایی سیاقۆڵی خوارێ
ڕۆژاوا:ئاواییەکانی مەزرا و داغە

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باشوور: هەواری سێوێ
باکوور: خڕی گوڵان
ڕۆژهەڵات: خڕێبیژوو
ڕۆژاوا: گڵەسپی

کانی خڕی بیژوو و کانی هەمزاغا کە ئاوەکەی بۆ ئاوایی سیاقۆڵ دەچێ دوو کانیاون لەم گوندە.
خانووبەرەکان لە دوو ڕیز هەر دووک بەرەو ڕۆژهەڵات ساز کراون، ڕیزێک لە سەروون و ڕیزێک لە خواروو، ماڵەکانی خواروو بە داڵاندا بەرەو ماڵەکانی لای سەروو دەچن، خانووبەرەکان لە قوڕ و بەرد و میچی دار ساز کراون و حەوشەیان نییە و هەیوانیان هەیە.
خەڵکی ئەم ئاواییە پێشتر لە ئاوایی سیاقۆڵی خوارێ دەژیان. لە ساڵەکانی هەوەڵی دوای دابەشینی زەوی بە سەر ڕەعیەتاندا (تقسیم اراضی) نزیک ساڵی١٣٤٧ی هەتاوی، چەند برا لە سیاقۆڵی خوارێ هاتنە سەر مەزراکانیان و هەر لەوێ خانوویان ساز کرد و مانەوە. سەبارەت بە ناوەکەی دەبێ بڵێین کە ئەم شوێنە قاوەخانەیەکی لێ بووە کە خاوەنەکەی "مام حەمەدەمین حاجی کەریم"ناوێک بووە کە ساڵی ١٣٨٧ی هەتاوی هەر لەم ئاواییە کۆچی دوایی کردووە، چونکە ئەم دێیە سەر ڕێگای زۆربەی ئاواییەکان بووە خەڵک دەهاتن لێی دەحەسانەوە بەتایبەت ئەو کات کە لەم ناوچەیە ترۆمبیل نەبوو یان زۆر کەم بووە، ئەو قاوەخانە بیست ساڵ لەوە پێش کۆ کرایەوە.
قاوەخانەکە لە سەر ڕێگای دۆڵی سیاقۆڵ هەڵکەوتووە، لە باشووری گوندەوە ڕێگایەکی خاکی دەچێتەوە ئاوایی سیاقۆڵی سەرێ و لە باکوورەوە دەچێتەوە سیاقۆڵی خوارێ.
ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی ١٣٧٩/١١/١٤ کارەباکەی هەڵکراوە. بۆ بنکەی تەندروستی و وەرگرتنی نەوت و کەلوپەل سەر بە "سیاقۆڵ"ی خوارێن.
لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوەی نییە، بەڵکوو لە چاڵاو دابین دەبێ بەتایبەت لە ویشکەساڵەکاندا ناچارن لە کانیاوەکانڕا بە گۆزان ئاو بێنن.
منداڵان بە هۆی نەبوونی قوتابخانە، نەخوێندەوار ماونەوە و بەداخەوە هیچ حەولێک بۆ چارەسەری ئەم گرفتە نەدراوە.
ئاژەڵداری و وەرزێری کاروپیشەی خەڵکی ئەم گوندەن، گشت ماڵەکان مەڕدارن و وەرزێرەکان هەر گەنم دەچێنن.
گرفتەکانی خەڵکی ئاوایی: کەمئاوی، نەبوونی لەوەڕگە، نەبوونی قوتابخانە و نەخوێندەواری منداڵانی ئاوایی.
خەڵکی قاوەخانە مردووەکانیان لە گۆڕستانی سیاقۆڵی خوارێ یان سەرێ دەنێژن.

## قجی‌ئاوا

قجی‌ئاوا لە ٢٥ کیلۆمیتری باکووری شاری مەهاباد، بەشی ناوەندی و دێهستانی موکریانی ڕۆژاوا و لە ناوچەی شارویران هەڵکەوتووە. لە ٥٦ ماڵ و ٣٠٥ کەس پێکهاتووە، لەمانە ١٧٣ کەس پیاون و ١٣٢ کەسیش ژنن، ژمارەی خوێندەوارانی ئەم ئاوایییە ٢٠٠ کەسە کە ١٢٤ کەس پیاون و ٧٦ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٨٣ کەسی نەخوێندەوار ٣٢ کەسیان پیاون و ٥١ کەسیش ژنە.

پانتایی ئاوایی 362/5 هێکتارە، لەمە ٤٨ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و 314/5 هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.

قجی‌ئاوا خاوەن ١٢ هێکتار زەوی دێم، ٢٩٨ هێکتار زەوی بەراو، ٥٨ هێکتار باخ، ١٧ تراکتۆر و ٣ لاوێردەیە.

ئاوایی‌یەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی دارەلەک

باکوور: ئاوایی گاپیس

ڕۆژهەڵات: ئاوایی‌یەکانی کێچاوا و گابازەڵە

ڕۆژاوا: ئاوایی قزڵقۆپی

تەنیا لە باکووری ئاوایی کێوێک هەیە کە "تاقەدار"ی پێدەڵێن. قجی‌ئاوا هیچ کانیاوی لێ نییە.

خانووبەرەکان لە خشت، بلوک، چیمەنتۆ و ئاسن ساز کراون، کۆڵانەکان ڕاست و ڕێک هەڵکەوتوون، ماڵەکان خاوەن حەوشە و دەرگای گەورەن.

سەبارەت بە ناوی ئاوایی بە بۆچوونی خەڵک: لە ئاوایی جۆرێک گیا هەیە کە "قجیلکە"ی پێدەڵێن و ئەم ئاوایییە هەر بەو ناوە کراوە. گردی قجی‌ئاوا بە ژمارەی تۆمارکراوی ٦٠٥ لە لایەن میراتی فەرهەنگی، مێژوویەکەی دەگەڕێتەوە سەر نیوەی یەکەمی هەزارەی پێنجی پێش زایین. گردی قەیتەران بە ژمارەی تۆمارکراوی ١٥٩٤٤ لە لایەن میراتی فەرهەنگی، لە پێنج کیلۆمیتری باکووری ئاوایی هەڵکەوتووە و بەرزایەکەی ١٣١١ میتر لە ڕووکەشی زەریاکانە کە مێژوویەکەی دەگەڕێتەوە هەزارەی یەکەمی پێش زایین.

لە ڕێکەوتی ١٩٨٧/٢/١ زایینی بەرانبەر دەگەڵ ١٣٦٥/١١/١٢ی هەتاوی، ئاوایی قجی‌ئاوا دەگەڵ چەند ئاوایی دیکە لە لایەن بەعسەوە بۆردومان کرا.

لە باشووری دێ ڕێگایەکی قیلەتاو هەیە کە دەچێتەوە ئاوایی دارەلەک، لە باکوورەوە ڕێگایەکی قیلەتاو ئاوایی‌یەکانی گاپیس و خورخورە دەگرێتەوە.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی ١٣٥٧/١٠/١٩ کارەباکەی هەڵکراوە، لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە (ئاوی هەر سێ ئاوایی قجی‌ئاوا، گاپیس و قەرەداغ لەم دێیە کە چاڵاوی قووڵی بۆ لێدراوە دابین دەبێ)، قوتابخانەی سەرەتایی (کوڕانە ـ کچانە) بە ناوی سەید عەبدولعەزیز فەرزاد، دێهیاری (ساڵی ١٣٨٨)، سیمکارتی مخابەراتی دێهات، مزگەوت (لە ساڵی ١٣٨٦ی هەتاوی نۆژەن کراوەتەوە) و زەوییەکەی لە لایەن خێرخوازێک بە ناوی "زەینالی‌زادە" پێشکەش کراوە و هەروەها ئەم گوندە خاوەن دێهیاری و شووڕای ئیسلامییە. نەوت و کەلوپەل لە شەریکەی هاوبەشیی "دارەلەک" وەردەگرن و بۆ بنکەی تەندروستیش هاتووچۆی ئەم ئاوایییە دەکەن.

قوتابیان بۆ درێژەدان بە خوێندن ڕەوانەی ئاوایی‌یەکانی خورخورە، دارەلەک و شاری مەهاباد دەبن.

کاروپیشەی خەڵکی ئاوایی وەرزێری، ئاژەڵداری و باخدارییە. بەرهەمی وەرزێرەکان گەنم، جۆ، وێنجە و گوڵەبەڕۆژەیە. ئاژەڵەکانیان بریتین لە: مەڕ، مانگا، بزن و گامێش. هەروەها بەری زۆربەی باخەکانیشیان سێوە.

گرفتەکانی خەڵکی ئاوایی: نەبوونی بنکەی تەندروستیی سەربەخۆ، نەبوونی شوێنێکی دیاریکراو بۆ کۆ کرنەوەی زبڵوزاڵ، نەبوونی قاناو لە کۆڵانەکانی ئاوایی و پێڕانەگەیشتن لە بواری پاکوخاوێنی.

خەڵکی ئاوایی بۆ ناشتنی مردووەکانیان لە گۆڕستانی ئاوایی "قەرەداغ" کە گۆڕستانی "شەبەک"ی پێدەڵێن، کەلک وەردەگرن.

## قزڵجەی خوارێ

لە ٣٢ کیلۆمیتری باشووری ڕۆژهەڵاتی شاری مەهاباد، بەشی ناوەندی و دێهستانی ئاختاچی ڕۆژاوا و لە ناوچەی محاڵ هەڵکەوتووە. لە ٢٠ ماڵ و ١١٥ کەس پێکهاتووە، لەمانە ٦٠ کەس پیاون و ٥٥ کەسیش ژنن، لە ٧١ کەسی خوێندەوار لەم دێیە ٣٩ کەس پیاون و ٣٢ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٣١ کەسی نەخوێندەوار ١٣ کەسیان پیاون و ١٨ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ٢٧٥٣/٥ هێکتارە، لەمە ٢٥٣/٥ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و ٢٥٠٠ هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.

قزڵجەی خوارێ خاوەن ٤١ هێکتار زەوی دێم، ٤٠ هێکتار زەوی بەراو، ١٤ هێکتار باخ، ٧ تراکتۆر و ٣ لاوێردەیە.

ئاواییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی بەیرەم

باکوور: ئاوایی قزڵجەی سەرێ (چۆل کراوە)

ڕۆژهەڵات: ئاوایی حوسێنئاباد و ئاوایی کولیجە

ڕۆژاوا: ئاوایی ئەمینئاباد

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باشوور: ساز

باکوور: سەرقەڵات

باکووری ڕۆژهەڵات: چەکوچ

ڕۆژهەڵات: ماڵووک، سێکونان

کانیاوەکان بە دۆڵەساز، توور، خیز، بن بەردی، سارد و حەوزی ناسراون.

لە بەری ڕۆژهەڵاتەوە ئەشکەوتی خڕێ نێوێ و ئەشکەوتی سێکونان هەڵکەوتووە.

خانووبەرەکانی ئاوایی لە قوڕ و بەردن و میچیان لە دارە، ماڵەکان حەوشەیان نییە و هەوراز هەڵکەوتوون و بە گشتی ڕوویان لە باشوورە، کۆڵانەکان کورت و نارێکن، چۆمی قزڵجە بە بەری ئاواییدا دەڕوا. لە باکووری دێ "سەرقەڵات" وەکوو ئاسەوارێکی مێژوویی چاو لێ دەکرێ.

قزڵجە ناوێکی تورکییە و بە مانای "شوێنی سوور"ە.

لە باشووری دێ ڕێگایەکی سەخڵەت ئاوایی بەیرەم دەگرێتەوە، لە باکوورەوە ڕێگایەکی خاکی دەچێتەوە ئاوایی قزڵجەی سەرێ، لە ڕۆژاوا ڕێگایەکی خاکی ئاوایی ئەمینئاباد دەگرێتەوە.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی ١٣٧٧/١٢/٥ کارەبای بۆ چووە، سیمکارتی مخابەراتی دێهات، قوتابخانەی سەرەتایی (کوڕانە ـ کچانە) بە ناوی "سەرباز"، کە بیناکەی حازربەدەستە، مزگەوت کە لە قوڕ و بەردە و ساڵی ١٣٤٠ی هەتاوی ساز کراوە. بۆ بنکەی تەندروستی هاتووچۆی شاری مەهاباد دەکەن، نەوت و کەلوپەل لە شەریکەی هاوبەشیی "پشتتەپ"ی مەهاباد وەردەگرن.

لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوەیان نییە و زیاتر لە کانی حەوزی کەلک وەردەگرن.

خوێندکاران دوای پۆلی سەرەتایی بە گشتی دەست لە خوێندن هەڵدەگرن و درێژە بە خوێندن نادەن.

کاروپیشەی خەڵکی ئاوایی ئاژەڵداری، وەرزێری و تا ڕادەیەکی کەم باخدارییە، ئاژەڵەکانیان مەڕ، بزن و مانگایە، وەرزێران گەنم، جۆ و نۆک دەچێنن. بەرهەمی باخەکانیشیان سێوە.

گرفتەکانی خەڵکی ئاوایی: ڕێگای خاکی و ناخۆش، نەبوونی بنکەی تەندروستیی سەربەخۆ، پێویستی بە لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوەیە، نەبوونی شووڕای ئیسلامی.

ئەم ئاواییە پێنج گۆڕستانی بە ناوەکانی، زوورکان، ورکەبەردان، بووزان، خڕێ مامخدری، دۆڵی سازە هەیە کە مردووەکانیان لە دۆڵی سازە دەنێژن.

## قزڵقۆپی

قزڵقۆپی لە 21 کیلۆمیتری باکووری شاری مەهاباد، بەشی ناوەندی و دێهستانی موکریانی ڕۆژاوا و لە ناوچەی شارۆیران هەڵکەوتووە. لە ٣٩٥ ماڵ و ١٩٣٥ کەس پێکهاتووە، لەمانە ١٠٠٤ کەس پیاون و ٩٣١ کەسیش ژنن، ژمارەی خوێندەوارانی ئەم ئاواییە ١٢٧٧ کەسە کە ٧٥٦ کەس پیاون و ٥٢١ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٤٥٣ کەسی نەخوێندەوار ١٢٥ کەس پیاون و ٣١٠ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ٢٤٣٤ هێکتارە، لەمە 1065 هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و 1369 هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.

قزڵقۆپی خاوەن ٦٠٠ هێکتار زەوی دێم، ١٢٠٠ هێکتار زەوی بەراو، ١٩٧ هێکتار باخ، ١٠٤ تراکتۆر، ١٤ لاوێردە و ٦ تووچێنەرە.

ئاواییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی دارەلەک

باشووری ڕۆژهەڵات: ئاوایی قجیئاوا

باکوور: ئاوایی قەرەقشلاق

ڕۆژهەڵات: ئاوایی گاپیس ڕۆژاوا: ئاوایی کۆزەکەرێز

ئەو دێیە کە لە دەشتی شارۆیرانە هیچ چیایەکی بە دەورەوە نییە، هەروەها هیچ کانییەکیشی نییە و خەڵک بۆ کاروباری پێوەند بە وەرزێرییەوە لە ژێر چاوەدێری ئاوەندی مەهابادن و چاڵاوی قووڵیان لێداون.

بەشێکی زۆر لە خانووبەرەکان لە خشت و بلووکن و بەشێکیش لە قوڕ و بەردن کە وەک ئاغەڵ و کارێز و... کەلکی لێ وەردەگرن، میچی ماڵەکان بە ئاسن یان دار داپۆشراوە، حەوشەیان هەیە و دەروازەی گەورەیان تێدایە. کۆڵانەکان ڕاست و ڕێکوپێک هەڵکەوتوون، هەروەها شەقامێک بە ناوەندی ئاواییدا تێپەڕ دەبێ کە قاناوی بۆ لێدراوە.

سەبارەت بە مێژووی ئاوایی دوو تەپۆڵکەی لێیە کە یەکەمیان بە بەرزایی 1389 میتر لە ڕووکەشی زەریاکانە و مێژووەکەی دەگەڕێتەوە سەر هەزارەی هەوەڵی پێش زایین ـــ سەدەی دەهەمی کۆچی مانگی، بە ژمارەی تۆمارکراوی 9701 لە میراتی فەرهەنگی.

تەپۆڵکەی دووەم بە ژمارەی تۆمارکراوی 15942 لە میراتی فەرهەنگی، مێژوویەکەی دەگەڕێتەوە سەر هەزارەی یەکەمی پێش زایین بە بەرزایی 1313 میتر لە ڕووکەشی زەریاکان کە لە ڕۆژاوای دێیە. قزڵقۆپی لە قزڵ بە مانای "سوور" و قۆپی بە مانای "زەلکاوی قامیشەڵان" پێکهاتووە.

لە باشووری دێ ڕێگایەکی قیلەتاو سێڕای دارەلەک دەگرێتەوە، لە باکوورەوە ڕێگایەکی قیلەتاو دەچێتەوە ئاوایی قەرەقشلاق.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی 1356/07/13 کارەباکەی هەڵکراوە، لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە کە لە ئاوایی خانەگیڕا بۆی کێشراوە، بەڵام عەنباراوەکەی لە نێو ئاواییە (ساڵی 1386)، دوو مزگەوت هەر دووکیان بە ناوی "محەممەدڕەسووڵڵا " (د.خ) کە یەکیان کۆن و کاولە و ئەوی دیکەیان ساڵی ١٣٧٦هـ ساز کراوە، خانەقای شێخ محەممەدئەمین واحیدی، قوتابخانەی سەرەتایی (کوڕانە ـ کچانە) بە ناوی "قودس"، قوتابخانەی ناوەندی (کوڕانە و کچانە) بە ناوی "نەسر" و "کابانی" (لە لایەن بنەماڵەی خێرخوازی کابانی ساز کراوە)، ئاکابیری، تەلەیفوونی ماڵ بە ماڵ، سیمکارتی مخابەراتی دێهات، پۆستبانک، بنکەی تەندروستی، دەرمانگا (1385)، شەریکەی هاوبەشیی نەوت و گازۆڵ، ئاش (کەرتی تایبەتی)، دوو نانەوخانە، کارخانەی ئاردی کابانی (کەرتی تایبەتی)، کارخانەی قیلەتاو، سێلوی ٥٠٠٠٠ تۆنی مەسرور (کەرتی تایبەتی) و هەروەها قزڵقۆپی خاوەن دێهیاری، شووڕای ئیسلامی و شووڕای چارەسەری کێشەکانە. خەڵکی قزڵقۆپی کەلوپەلی خۆیان لە شەریکەی هاوبەشیی"دارەلەک" وەردەگرن.

بە بوونی قوتابخانەی سەرەتایی و ناوەندی کچان و کوڕان لە قزڵقۆپی، کچ و کوڕ درێژەیان بە خوێندن داوە و بۆ پۆلی دواناوەندی ڕەوانەی گۆکتەپە و شاری مەهاباد دەبن.

ئاژەڵداری و وەرزێری سەرەکیترین کارپیشەی خەڵکی قزڵقۆپیین؛ هەڵبەت تا ڕادەیەکیش باخداری، مێشداری و هێندێک کارپیشەی دیکە وەک جۆشکاری، ڕاوێژکاری مڵک و زەوی، قەسابی، دارتاشی و هتد دەکەن.

ئاژەڵەکانیان بریتین لە: مەڕ، مانگا، بزن و گامێش. وەرزێران گەنم، جۆ، نیسک، چەوەندەر و گوڵەپێغەمبەرە دەچێنن و بەرهەمی باخەکان سێو و هڵوویە. گرفتەکانی خەڵکی ئاوایی: ڕێگاوبانی ناخۆش و نەگونجاو و گرفتی کەمئاوی.

ئەم ئاواییە و دارەلەک گۆڕستانەکەیان هاوبەشە و لە لای باشوور هەڵکەوتووە.

## قۆپی بابالّی

ئەم ئاوایییە لە ٢٨ کیلۆمیتری باکووری ڕۆژهەڵاتی شاری مەهاباد، بەشی ناوەندی و دێهستانی موکریانی ڕۆژهەڵات و لە ناوچەی شارویران هەڵکەتووە. لە ١١٨ ماڵ و ٥٩٧ کەس پێکهاتووە، لەمانە ٣١٠ کەس پیاون و ٢٨٧ کەسیش ژنن، لە ٣٨٨ کەسی خوێندەوار ٢١٩ کەس پیاون و ١٦٩ کەسیش ژنن، هەروەها لە ١٥٥ کەسی نەخوێندەوار ٥٩ کەس پیاون و ٩٦ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ١٠٩٠ هێکتارە، لەمە ٣٥٠/٥ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و ٧٣٩/٥ هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.

قۆپی بابالّی خاوەن ٥٦٠ هێکتار زەوی دێم، ٤٢٠ هێکتار زەوی بەراو، ٤٢ هێکتار باخ، ٤٢ تراکتۆر و ٤ لاوێردەیە.

ئاوایییەکانی دەورووبەر:

باشوور: ئاوایی بەردەڕەشان

باکوور: ئاوایی قزقەڵا

ڕۆژهەڵات: ئاوایی تاڵاو

ڕۆژاوا: ئاوایی گردەگرویّ

چیاکانی دەورووبەری ئاوایی:

باشوور: کێوی قزڵداخ

ڕۆژهەڵات: چاکی شێخی تەوێڵە

کانیاوەکان بە کانی نێودێ، کانی هەنجیر، کانی پەڵکان و کوێرەکانی ناسراون.

زۆربەی خانووبەرەکانی ئەم ئاوایییە لە قوڕ و بەرد و میچی دار ساز کراون، ئێستا خشت، چیمەنتۆ و ئاسن بە کار دێنن، ماڵەکان حەوشەیان نییە و زۆربەیان بەرەو هەورازن، کۆڵانەکان نارێکن و تەنیا شوێنێکی ڕێک و ڕاستی هەیە. لە ناوەندی ئاوایی هێندێک خانووی کاولبوو دێنە بەرچاو. خڕێک کە سێڵاوی پێدا دێ ماڵەکانی ئەم دێیەی کردۆتە دوو بەش.

" ئەم دێیە لە دوو ڕەگەزی کورد و ئازەری پێکهاتوون و دینی هەر دوو لایەن ئیسلامە، کوردەکان شافعی مەزەبن و ئازەرییەکان شیعەی دوازدە ئیمامین، پێکەوە زۆر تەبا و ڕەبان و بەختەوەرانە هیچ کات گرفتیان دەگەڵ یەکتر نەبووە.

کاک "ئەحمەد ئەحمەدی" یەکێک لە ئاغاکانی ئەم دێیە بووە کە سەردەمی خۆی لە تورکیا هاتووە و ئەم گوندەی کڕیوە، ساڵی گرانی گەلێک خەڵکی ئازەری ڕوویان لەم ئاوایییە کرد هەر وەکوو چوون ڕوویان لە ئاوایی "بادام" کرد و لەو ئاوایییەش نیشتەجێ بوون. ئەو زەمانی حرووسان گەیشتنە قۆپی بابالّی، کاک "ئەحمەد ئەحمەدی" بە دەستی ئەوان کوژرا.

لە ناوەندی دێ تەپۆڵکەیەکی مێژوویی لێیە. هەروەها تاڵاوی قۆپی بابالّی لە ڕیزی چەندین تاڵاوی ناسراوی جیهانییە.

لە بەری باشوور ڕێگایەک دەچێتەوە سەر جادەی قیلەتاوی مەهاباد ـ میاندواو، لە باشووری ڕۆژاواوە ڕێگایەکی خاکی ئاوایی "قزقەڵا" دەگرێتەوە.

ئیمکاناتی ئاوایی: کارەبا، لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە کە ئاوەکەی لە کانی ژنان دێ و دوو عەنباراویان بۆ داناوە، سیمکارتی مخابەراتی دێهات، قوتابخانەی سەرەتایی (کوڕانە ـ کچانە) و قوتابخانەی ناوەندی بە ناوی "خاتەم"، دوو مزگەوت، یەکیان بە ناوی "جامیع" بۆ سوننییەکان، ئەوی دیکەیان بە ناوی "ئیمام حوسێن" بۆ شیعەکان، بنکەی تەندروستی، نانەوەخانە، سێ جووجەخانە (کەرتی تایبەتی)، هەروەها خاوەن دێهیاری، شوورای ئیسلامی و شوورای چارەسەری کێشەکانە. بۆ وەرگرتنی نەوت و کەلوپەل سەر بە شەریکەی هاوبەشیی "گۆکتەپە"ن. قوتابیان بۆ درێژەپێدان بە خوێندن ڕەوانەی گۆکتەپە، مەهاباد و میاندواو دەبن. کارپیشەی خەڵکی ئەم گوندە لە وەرزێری، ئاژەڵداری و باخداری پێکهاتووە. وەرزێران گەنم، جۆ، وێنجە، گوڵەبەڕۆژەمبەرە و چەوەندەر دەچێنن و زۆربەی ئاژەڵەکانیان مەڕ و بزنن و تا ڕادەیەکیش مانگای ڕادەگرن. هەروەها چەند باخی لێیە کە بەرهەمەکانیان سێوە.

گرفتەکانی خەڵکی ئاوایی: کەم بوونی ئاو بۆ کشتوکاڵ، نەبوونی دێهیاری. دەگەڵ ئەوەی کە تاڵاوی ئەم ئاوایییە لە ڕیزی تاڵاوەکانی جیهانە و گەڕیدەکان لە هەموو لایەکەوە ڕووی تێدەکەن، بەڵام ئاوڕێک لە ئاوایییەکە نەدراوەتەوە و خەڵکەکەی هەژارن. گۆڕستانەکەی لە باشووری دێ هەڵکەوتووە.

## قۆرغان

قۆرغان لە ٤٣ کیلۆمیتری ڕۆژهەڵاتی شاری مەهاباد، بەشی ناوەندی و دێهستانی ئاختاچی ڕۆژاوا و لە ناوچەی محاڵ هەڵکەوتووە. لە ٥٢ ماڵ و ٢٤١ کەس پێکهاتووە، ١١١ کەس پیاون و ١٣٠ کەسیش ژنن، ڕادەی خوێندەواران ١٤١ کەسە کە ٦٩ کەس پیاون و ٧٢ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٧٨ کەسی نەخوێندەوار ٣٠ کەس پیاون ٤٨ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ١١٢٥ هێکتارە، لەمە ١٢٥ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و ١٠٠٠ هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.

قۆرغان خاوەن ٥٢٠ هێکتار زەوی دێم، ٧٠ هێکتار زەوی بەراو، ٤٨ هێکتار باخ و ٢٥ تراکتۆرە.

ئاواییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاواییەکانی قەڵاجۆغە و کانی کەوتێر

باکوور: ئاوایی سنجاغ

ڕۆژهەڵات: ئاواییەکانی شێخاڵی و غەوساباد

ڕۆژاوا: ئاوایی خاتوون خاس

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باشوور: کێوی قەڵاجۆغە

ڕۆژهەڵات: تەپکی ماڵان

ڕۆژاوا: کێوی ئاڵماڵوو

لە شاخی "گوێزێ" کە بە "ماهی سووری"ش ناسراوە ئەشکەوتێک هەڵکەوتووە. کانیاوەکان بە گۆلی هەمزە، گۆلی مژمژاوێ، کانی سپی، کۆنەکەرێز و تلاس ناسراون. خانووبەرەکانی ئەم دێیە زۆرتریان هەر لە قوڕ و بەردن و میچەکانیشیان لە دارن، بەڵام ئێستا لە خشت، چیمەنتۆ و ئاسن کەلک وەردەگرن. ماڵەکان خاوەن حەوشە و دەرگان، زۆرتریان ڕوویان لە ڕۆژهەڵاتە، کۆڵانەکان ڕاستن و لە ناوەندی ئاوایی هێندێک خانووی کاولبوو دێتە بەرچاو، باخەکان لە دەوری ئاوایی هەڵکەوتوون.

خەڵکەکە دەڵێن قۆرغان یەکەم مەزرای ئاوایی شێخاڵی بووە و خاوەنەکەی بنەماڵەی "حیسامی" بوون، نزیک بە ١٢٠ ساڵ لەمەوبەر بە بنەماڵەی "دێبۆکری ڕەسووڵی" فرۆشتراوە و ئاوەدان کراوەتەوە.

سەبارەت بە ناوی قۆرغان دەبێ بڵێین لە قۆرغ بە مانای گۆلاوی پڕ لە زەمەند* و (ان) کە نیشانەی کۆ یان ئاماژەیەکە بە شوێنێک پێکهاتووە. هەروەها لە زمانی تورکی بە مانای ئاتەشخانە هاتووە کە لێرەدا ڕوون نییە مەبەست کام مانایە.

لە ڕۆژهەڵاتی ئەم ئاواییە ئاسەواری ئاوەدانییەک دەبیندرێ کە ڕوون نییە هی چ سەردەمێکە، خەڵکی ئاوایی بەم شوێنە دەڵێن "کۆنەدێ". لە باشووری دێ ڕێگایەکی قیلەتاو دەچێتەوە ئاواییەکانی قەڵاجۆغە، کانی کەوتێر و جادەی بورهان، لە ڕۆژهەڵاتەوە ڕێگایەکی خاکی دەبێتە سێڕێیانێک، یەک بۆ ئاوایی شێخاڵی، یەک بۆ ئاوایی غەوساباد و یەک بۆ ئاوایی ئۆتەمیش دەچێتەوە.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی ١٣٦٨/١١/٧ کارەباکەی هەڵکراوە، لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە کە عەنباراویان بۆ داناوە و ئاوەکەی لە ئاڵماڵوو دابین دەبێ، تەلەیفوونی ماڵ بە ماڵ کە سەر بە بۆکانە، قوتابخانەی سەرەتایی (کوڕانە ــ کچانە) بە ناوی "ئومید"، دێهیاری (ساڵی ١٣٨٨)، بنکەی تەندروستی، مزگەوت کە ساڵی ١٣٧٨ی هەتاوی نۆژەن کراوەتەوە و هەروەها قۆرغان خاوەن شووڕای ئیسلامییە. نەوتی ئەم دێیە لە شەریکەی هاوبەشیی "قەڵاجۆغە" دابین دەبێ و کەلوپەلی پێویست لە بورهان وەردەگرن. قوتابیانی کوڕ و کچی ئاوایی بۆ پەرەپێدان بە خوێندن دەچنە قوتابخانەکانی شاری مەهاباد. وەرزێری، ئاژەڵداری، کرێکاری و تا ڕادەیەکی کەم باخداری کاروپیشەی خەڵکی ئەم گوندەن. دانەوێڵەکان گەنم، نۆک و جۆیە، هەروەها ئاژەڵداران خاوەن مەڕ، بزن و ڕادەیەکی کەم مانگان، بەرهەمی چەند باخی قۆرغان هەر سێوە.

گرفتەکانی خەڵکی ئاوایی: پێویستی بە نۆژەن کردنەوەی لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە و نەبوونی نانەوەخانە.

گۆڕستانی دێ لە بەری باشوور هەڵکەوتووە.

"حاجی قادر قادری" (هیوا) وەک شاعیر و نووسەر، ماوەیەکی زۆری ژیانی لەم گوندە تێپەڕ کردووە.

---

* هەنبانەبۆرینە لاپەڕەی ٥٦٣ ستوونی دووەم

## قۆزلووجە

قۆزلووجە لە ٢١ کیلۆمیتری باشووری شاری مەهاباد، بەشی خەلیفان و دێهستانی مەنگوڕی ڕۆژهەڵات و لە ناوچەی مەنگوڕایەتی هەڵکەوتووە. لە ٢٩ ماڵ و ٢١٣ کەس پێکهاتووە، لەمانە ١٠٨ پیاون و ١٠٥ کەسیش ژنن، لە ١٣١ کەسی خوێندەوار ٨١ کەس پیاون و ٥٠ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٦٧ کەسی نەخوێندەوار ١٩ کەسیان پیاون و ٤٨ کەسیش ژنن.
پانتایی ئاوایی ٤٦٩٨ هێکتارە، لەمە ١٩٨ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و ٤٥٠٠ هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.
قۆزلووجە خاوەن ١٩٠/١٨ هێکتار زەوی دێم، ٤٣/٣٤ هێکتار زەوی بەراو، ٤/٦٦ هێکتار باخ، ١٤ تراکتۆر و ٢ لاوێردەیە.

ئاواییەکانی دەوروبەر:
باشوور: ئاوایی خرەجۆ
باکوور: ئاواییەکانی گیادروان و حەوڵاکوردە
ڕۆژهەڵات: ئاواییەکانی عەینەمەلا و گردەبەردان
ڕۆژئاوا: ئاواییەکانی گوڵیار و مازەڵێ

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:
باشوور: دووبەردووکەی قارەمانی
ڕۆژهەڵات: کێوی سوور، بەردەخێوەتە

کانی سارد ناوی کانیاوێکە لە قۆزلووجە.
"سەید حوسێن ڕەسووڵی" بەساڵاچووی ئەم گوندە دەڵێ: "بەردەخێوەتە" دیوێکی گەورە بووە کە لە بەرد داتاشراوبوو و دەلاقەیەکی تێدابووە کە هەتا ئەم دوایانە مابوو و بە هۆی هەڵکۆڵینەکانی کانگایەکی بەرد، ئەم شوێنە تێکرووخا. هەروەها ئاماژە بەوە دەکا کە ئەم ئاواییە ماوەیەکی زۆر چۆڵ بووە پاشان کەسێک بە ناوی سەید "ڕەحمان ڕەسووڵی" ئاوەدانی کردووەتەوە. خانووبەرەکانی بە بەرد و قوڕ دانراون و خانووبەرەکانی ئێستا بە کەرەسەی نوێ ساز دەکرێن
لە زمانی تورکیدا قۆزلووجە بە مانای ئەو شوێنەیە کە دارە گوێزی لێبێ.
لە باشووری دێ ڕێگایەکی ئامادە بۆ قیلەتاو ئاوایی خرەجۆ دەگرێتەوە، لە بەری باکوور ڕێگایەکی تر لە مەودایەکی دوورتر لە ئاوایی دەگاتە دوو-ڕێیانێک و ئاوایی گیادروان و حەوڵاکوردە دەگرنەوە.
ئیمکاناتی ئاوایی: کارەبا، سیمکارتی مخابەراتی دێهات، بنکەی تەندروستی، قوتابخانەی سەرەتایی (کوڕانە - کچانە) بە ناوی "بەسیج"، مزگەوت کە لەم ساڵانەدا نۆژەن کراوەتەوە و ئەم دێیە خاوەن شووڕای ئیسلامییە. خەڵکەکەی نەوت و کەلوپەل لە شەریکەی هاوبەشیی ئاوایی "حەوڵاکوردە" وەردەگرن.
ئاوی قۆزلووجە لە کانیاو و چاڵاو دابین دەبێ و لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوەی نییە.
لەم ئاواییە مافی خوێندن بۆ کچان و کوڕان دە یەک ڕادەدا نییە، کوڕان بۆیان هەیە بۆ درێژەدان بە خوێندن بچنە شەوانەڕۆژی خەلیفان، بەڵام بەداخەوە ئەو مافە لە کچان زەوت دەکرێ و بەناچار دەست لە خوێندن هەڵدەگرن.
کاروپیشەی خەڵکی ئاوایی لە وەرزێری و ئاژەڵداری پێکهاتووە، وەرزێران گەنم و جۆ دەچێنن و ئاژەڵەکانیان مەڕ و مانگان.
گرفتەکان: پێویستی بە لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوەیە.
گۆڕستان لە ڕۆژاوای دێ هەڵکەوتووە.
هەروەها خەڵک قەدیم کە ناساز دەبوون و هاتووچۆ بۆ شار دژوار بووە و بەتایبەت لە کاتی زستاندا، بۆ چارەسەری نەخۆشی خۆیان دەچوونە لای "زڵەخای حەکیم" لە کیتکە و "حەسەن سەدرابادی" لە بەرەجۆ کە بە گیاوگۆڵ دەرمانیان ساز دەکردن.
قۆزلووجە یەکێکە لەو گوندانە کە حەیرانبێژ، بەیتبێژ و حەکایەتخوانی بەتوانای لێبووە و ئێستاش هەر ماون، یەکێک لەم کەسانە سەید "حوسێن

ڕەسووڵی"یە کە بە ڕاستی قامووسێکی نەنووسراوەیە لە قسەی نەستەق، بیرەوەری، ئەزموون و لێزانی.

سەید "حوسێن ڕەسووڵی" سەبارەت بە حرووسان دەگێڕێتەوە: کاتێک کە حرووسان خەڵکیان دەکوشتن، عەسکەرەکانی ئێرانی بەریەرەکانیان دەکرد، لە ئاوایی گردەبەردان حرووسان کە خەریکی وڵات ئاور تێبەردانن، عەسکەرێکی دەگرن و لە نێو ئاگری داوێن. لە پاش ڕۆینیان خەڵکەکە عەسکەرەکە دەنێژن. چەند شەوێک کە لەو ڕووداوە تێدەپەڕێ سەید ڕەحمانی باوکم خەون دەبینێ کە عەسکەرەکە پێی دەڵێ: سەید ڕەحمان! منیش سەیدم، جێگای قەبرەکەم ناخۆشە. سبەینێ کە دەچن قەبرەکەی دەدەنەوە دەبینن جێگاکەی پڕپڕ بووە لە ئاو ... و عەسکەرەکەی ڕادەگوێزن.

سەید حوسێن هەروەها گوتی: باوکم و کەسانێکی دیکە بۆیان دەگێڕامەوە حرووسان یەکەم جار کە هاتنە ئێرە لەگەڵ خەڵک باش بوون، هەر کە منداڵیان دەدیتن کۆشیان پڕ دەکردن لە مێوژ و قەند! لە پاشان ئەو جینایەتەیان لێرە کرد. ئەو لە درێژەی قسەکانی‌دا گوتی: لە دەراوی گیادروان ئاوایی‌یەک هەبوو بە ناوی "تیتلو" کە ئێستا نەماوە، حرووسان کە ڕوویان کردە ئاوایی‌یەکانی کوردستان و دەستیان کرد بە کوشت‌وکوشتار "سلەمانی ڕەسووڵ‌ئاغای" تفەنگێکی دەست دایە و گوتی دەچم بۆ بەرگری. ئەو کات تفەنگێکی وا نەبوو، جەماعەتی دەوروبەر نەیانهێشت بچێ و کوتیان بە تەنێ پێیان ناوێری. هەموو پێکەوە کۆ بوونەوە کە چ بکەن تاکوو حرووسان نەیانکوژن؛ لە ئاکام‌دا ئاوایان بڕیبووە کە گاوگەردوونیان بۆ بکەن تا نەیانکوژن. ئەوان کە گەیشتنە "تیتلو" و "قۆزلووجە"، خەڵکەکە گایەکی گەورەیان لە بەر پێی حرووسان کوشتەوە و ئەوانیش چاوپۆشیان لە کوشتنی خەڵکەکە کردبوو.

هەروەها سەید حوسێن لە زمانی باوکییەوە گێڕایەوە: "سەید ڕەحمان" لە گردەبەردان ژیاوە و حرووسان دەوری دێیەکەیان داوە، خەڵکی ئاوایی‌یەکانی ئۆزندەرێ، بەیرەم و... بە هۆی ئەستەم بوونی گردەبەردان هاتوونە وێ و هەموو چوون لە ئاغەڵ و کۆخی مریشکان خۆیان حاشار داوە، لەو کاتەدا ماینێکی سپی کە هی سەید ڕەحمانی دەبێ لە ئاغەڵ دەرپەڕیوە و دەستی کردووە بە ڕمبازێن. حرووسەکان کە ئەو ماینە جوانەیان دیوە لەگەڵ خۆیان بردوویانە و کاریان بە کەس نەبووە و بەم جۆرە ئەو ماینە بۆتە بەلاگێڕەوەیان.

## قۆزلووی چووک

له ٥٢ کیلۆمیتری باشووری شاری مەهاباد، بەشی خەلیفان و دێهستانی کانی بازاڕ و له ناوچەی گەورکایەتی هەڵکەوتووە. له ٣٩ماڵ و ٣٤٦ کەس پێکهاتووە، لەمانە ١٧٤ کەس پیاون و ١٧٢ کەسیش ژنن، ڕادەی خوێندەواران ٢٠٥ کەسە کە ١١٥ کەس پیاون و ٩٠ کەسیش ژنن، لە ٩٤ کەسی نەخوێندەوار ٣٥ کەس پیاون و ٥٩ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ١٨٦٢/٢ هێکتارە، لەمە ٣٦٢/٢ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و ١٥٠٠ هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.

قۆزلووی چووک خاوەن ٣١٠ هێکتار زەوی دێم، ٦٨ هێکتار زەوی بەراو، ٧ هێکتار باخ، ١٦ تراکتۆر و ٣ لاوێردەیە.

ئاواییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی قۆزلووی گەورە

باکوور: ئاواییەکانی کۆنەدێی شۆگای و ئافان

ڕۆژهەڵات: ئاوایی کۆنەدێی شۆگای

ڕۆژاوا: ئاوایی ئاغاسوور

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باشوور: کانێ بەنێ

باکوور: شێخان

ڕۆژهەڵات: مەربیلوو

ڕۆژاوا: زەردەبییان

کانیاوەکان بە خرێ گوڵان، حەمەساڵە، گەڵا چەوەندەری و ئەمەرە قووچە ناسراون.

خانووبەرەکان بە گشتی لە قوڕ و بەرد و میچی دارن، بەشیک لە ماڵەکان خاوەن حەوشەن و بەرەو هەر چوار لا خانوو ساز کراوە، کۆڵانەکان ڕێک نین و ئاڵۆزییەکەیان بەرچاوە. قۆزلوو ناوێکی تورکییە و بە مانای ئەو شوێنەیە کە دارگوێزی لێیە.

لە ڕۆژهەڵاتی دێ ڕێگای قیلەتاو جادەی سەرەکی مەهاباد ـ سەردەشت دەگرێتەوە.

ئیمکاناتی ئاوایی: ١٣٧١/١/٢٦ کارەباکەی هەڵکراوە، لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە کە عەنباراویان بۆ داناوە و ئاوەکەی لە کانی سێوەسوورە دابین دەبێ، بنکەی مخابەرات، قوتابخانەی سەرەتایی (کوڕانە ـ کچانە) بە ناوی "عەزیم" کە بیناکەی حازربەدەستە، مزگەوتی "حەزرەتی عومەر" کە ساڵی ١٣٨٠ی هەتاوی ساز کراوە و هەروەها ئاوایی خاوەن شووڕای ئیسلامی و شووڕای چارەسەری کێشەکانە. بۆ وەرگرتنی نەوت و کەلوپەل ڕێگای کاوڵانی خوارێ دەپێون و بۆ بنکەی تەندروستی سەر بە ئاوایی قۆزلووی سەرێن.

خوێندکارانی کوڕ و کچ لە دوای پۆلی سەرەتایی ڕەوانەی قوتابخانەکانی خەلیفان و مەهاباد دەبن.

کاروپیشەی خەڵکی قۆزلووی چووک وەرزێری، ئاژەڵداری، کرێکاری و تا ڕادەیەک باخدارییە. وەرزێران گەنم، نۆک و جۆ دەچێنن و ئاژەڵەکان مەڕ و مانگان، هەروەها سێو، گوێز و ترێ بەرهەمی چەند باخی دێیەکەیە.

گرفتەکانی خەڵکی قۆزلووی چووک: نەبوونی بینایەکی باش بۆ قوتابخانە، پێویستی بە سیمکارتی مخابەراتی، ڕێگاوبانی ناخۆش، پێویستی بە نۆژەن کردنەوەی لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوەیە.

لە بەری باشووری دێ، کۆنەگۆڕستانی "شێخ ئەحمەد" هەڵکەوتووە و لە بەری ڕۆژهەڵات، گۆڕستانی نوێی لێیە کە ناوی"قووڵەقەبران"ە.

حاجی "ساڵە تەورە" بەیتبێژی ناسراو، خەڵکی ئەم ئاواییە بووە.

## قۆزلووی گەورە

لە ٥٤ کیلۆمیتری باشووری شاری مەهاباد، بەشی خەلیفان و دێهستانی کانی بازاڕ و لە ناوچەی گەورکایەتی هەڵکەوتووە. لە ٦٨ ماڵ و ٤٠٢ کەس پێکهاتووە، ٢٠٢ کەس پیاون و ٢٠٠ کەسیش ژنن، ڕادەی خوێندەواران ٢١٩ کەسە کە ١٣٠ کەس پیاون و ٨٩ کەسیش ژنن، لە ١٣١ کەسی نەخوێندەوار ٥١ کەس پیاون و ٨٠ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ٤٣٦٨ هێکتارە، لەمە ٣٦٨ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و ٤٠٠٠ هێکتار پاوان و لەوەرگەی دێیە.

قۆزلووی گەورە خاوەن ١٧٩ هێکتار زەوی دێم، ٦٢ هێکتار زەوی بەراو، ٤ هێکتار باخ، ١٢ تراکتۆر و ٤ لاوێردەیە.

ئاواییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی یاراڵی

باکوور: ئاوایی قۆزلووی چووک

ڕۆژهەڵات: ئاوایی کولتەپە

ڕۆژئاوا: ئاوایی ئاغاسوور

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باشوور: سێکۆییان

باکوور: خرێ بناوان

ڕۆژهەڵات: بەری کورەخانە

ڕۆژئاوا: شیوەقووڵ

لە بەری ڕۆژئاوا سێ ئەشکەوت هەیە کە پێیان دەڵێن ترکەڕەشان. کانیاوەکان بە دۆغان، مایبان، شینکێ، لۆمان، بووزان، فەقێیان و خدرە بەرەی ناسراون.

گشت خانووبەرەکان لە قوڕ و بەرد و میچی دار ساز کراون و حەوشەیان نییە و بەرەو ڕۆژهەڵاتن، هەروەها کۆڵانەکان هەوراز هەڵکەوتوون. دەڵێن سەرەتا خەڵکی ئەم ئاواییە لە شوێنی گۆڕستانی "قەبری گروکێ" بوون دوایە گوندەکەیان گوازتۆتەوە شوێنی ئێستای.

به پێی ئەو ئاسەوارانەی وەکوو شمشێر، نێزە و هتد کە جارناجار لە ئاوایی دەردەکەن و دراون بە میراتی فەرهەنگی، دەبێ ئاواییەکی مێژوویی بێ*.

لە ڕۆژهەڵاتی گوندەوە ڕێگایەکی ئامادە بۆ قیلەتاو بە مەودای ٣/٧ کیلۆمیتری دەچێتەوە سەر جادەی مەهاباد ـ سەردەشت کە تەنیا ڕێگای هامووشۆی ئەم گوندەیە.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی ١٣٧١/٧/٩ کارەبای بۆ هاتووە، لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە کە عەنباراویان بۆ داناوە و ئاوەکەی لە کانی "درەلە" دابین دەبێ، قوتابخانەی سەرەتایی (کوڕانە ـ کچانە) بە ناوی "پەیام"، باخچەی ساوایان، بنکەی تەندروستی، بنکەی مخابەرات، مزگەوتێک بە ناوی "حەزرەتی عوسمان بنی عەفان" کە ساڵی ١٣٥٣ی هەتاوی ساز کراوە و ساڵی ١٣٨١ی هەتاوی بە خشت، بەرد و چیمەنتۆ نۆژەن کراوەتەوە؛ خێرخوازێک بە ناوی حاجی پیرۆتئاغا ئەم مزگەوتەی ساز کردووە. هەروەها قۆزلووی گەورە خاوەن دێهیاری، شووڕای ئیسلامی و شووڕای چارەسەریی کێشەکانە. نەوت و کەلوپەلیش لە شەریکەی هاوبەشیی ئاوایی "کاولان"ی خوارێ وەردەگرن.

خوێندکاران کەمتر وا هەیە بتوانن درێژە بە خوێندن بدەن؛ ئەوانەی ئەو هەلەشیان بۆ دەڕەخسێ زیاتر کوڕەکانن و بۆ درێژەدانی خوێندن دەچنە خەلیفان و مەهاباد. وەرزێری، ئاژەڵداری و کرێکاری کاروپیشەی خەڵکی ئەم گوندەن، وەرزێران گەنم، جۆ و نۆک دەچێنن.

زۆربەی ماڵەکان مانگا ڕادەگرن، تا بەر لە ساڵی١٣٨٧ی هەتاوی مەڕدار زۆرتر بوون کەچی بەهۆی ئیشکەساڵی ئەم دواییانە، ٢٩ ماڵی ئاوایی مەڕەکانی خۆیان فرۆشتن.

گرفتەکانی خەڵکی قۆزلووی گەورە: نەبوونی تەلەیفوونی ماڵ بە ماڵ و سیمکارتی مخابەراتی دێهات.

ئەم دێیە سێ گۆڕستانی لێیە: "قەبرەوردکان" کە لە بەری ڕۆژئاوایە و منداڵی لێ دەنێژن، "مەلا وسوو" لە بەری ڕۆژهەڵاتە و کۆنەگۆڕستانە، "چاڵەبەفر" کە لە باشووری ئاواییە و ئێستا مردووی لێ نانێژن. لە سەر جادەی قیلەتاوی مەهاباد ــ سەردەشتەوە کە بۆ لای ئەم گوندە دێی، گۆڕستانێک لە سەرەتای ڕێگایە کە گەلێک کۆنە و بە "قەبری بەرازان" ناسراوە. دوو برا بە ناوەکانی مەلا "عەبد" و مەلا "داود" کە گۆیا شارەزای حیسابە کۆنەکان بوون، وەکوو دیاری کردنی بەهار و ساڵی نوێ، گەلاوێژ ئەنگووتن و ... خەڵکی ئەم ئاواییە بوون و لەوێ ژیاون. هەروەها سەید "عەلی سەردەشتی" هونەرمەندی ناسراوی گەلەکەمان پەروەردەی ئەم گوندەیە.

---

* ئێستا هیچ ئاگادارییەک لەم ئاسەوارانە لە دەستدا نەماوە.

# قوڵقوڵە

قوڵقوڵە ٣٥ کیلۆمیتری باکووری ڕۆژهەڵاتی شاری مەهاباد، بەشی ناوەندی و دێهستانی موکریانی ڕۆژهەڵات و لە ناوچەی محاڵ هەڵکەوتووە. لە ٥٩ ماڵ و ٢٨١ کەس پێکهاتووە، لەمانە ١٣٨ کەس پیاون و ١٤٣ کەسیش ژنن، ژمارەی خوێندەوارانی ئەم ئاوایی‌یە ١٨٠ کەسە کە ١٠١ کەس پیاون و ٧٩ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٦٨ کەسی نەخوێندەوار ٢١ کەسیان پیاون و ٤٧ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ١٦٠٠ هێکتارە، لەمە ٢٨٧ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و ١٣١٣ هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.

قوڵقوڵە خاوەن ٩٨٠ هێکتار زەوی دێم، ١٦٥ هێکتار زەوی بەراو، ٢٣/٤ هێکتار باخ، ١٥ تراکتۆر و ١ لاوێردەیە.

ئاوایی‌یەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی‌یەکانی ئازاد و سنجاغ

باکوور: ئاوایی‌یەکانی گردەڕەش و تەنگباڵەکە

ڕۆژهەڵات: ئاوایی‌یەکانی باجەوەند و خەتایی

ڕۆژاوا: ئاوایی ئازاد

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باشوور: کانی دزان

ڕۆژاوا: شێخ مەحموود

باکووری ئاوایی ئەشکەوتێکی لێیە بە ناوی "زیندان".

ماڵەکانی ئاوایی بەرەو ڕۆژاوا و باکوور ساز کراون و زیاتریان لە قوڕ، بەرد و مۆرە ساز کراون و میچەکانیان بە دار داپۆشراون، شوێنی هەڵکەوتنی هێندێک لە ماڵەکان هەورازە. ئاوایی خاوەن چەند کۆڵانە و لە ناوەندی ئاوایی هێندێک خانووی کاولبوو وەبەر چاو دێن.

تەپەی قوڵقوڵە بە ژمارەی تۆماکراوی ١٥٩٩٢ لە لایەن بەڕێوەبەرایەتیی میراتی فەرهەنگی، بەرزایی ١٣٤٠ میتر لە ڕووکەشی زەریاکان، مێژوویەکەی دەگەڕێتەوە هەزارەی ١ و ٢ی پێش زایین.

سەبارەت بە ناوی ئاوایی خەڵک دەڵێن: سەردەمێک هەر شوێنێکی ئەم ئاوایی‌یەت هەڵکۆڵیبا دەسبەجێ ئاو هەڵدەقوڵی. بە پێی ئەم بۆچوونە "قوڵقوڵە" دەبێ دەربڕی دەنگی ئاو بێ و لە هەڵقوڵین سەرچاوە بگرێ، هەروەها قوڵقوڵە بە مانای حەرەکەت و جووڵەش هاتووە.

لە باشووری دێ ڕێگایەکی قیلەتاو دەچێتەوە ئاوایی "ئازاد"، لە باکوورەوە ڕێگایەکی خاکی "تەنگباڵەکە" دەگرێتەوە، لە ڕۆژهەڵات ڕێگایەکی خاکی کە لە ئاکامدا دەبێتە سێ لک، بۆ ئاوایی‌یەکانی گردەڕەش، خەتایی و باجەوەند دەچێ.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی 1365/08/14 کارەباکەی هەڵکراوە، لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە ـ ئاوی تەنگباڵەکەش لەم ئاوایی‌یە دابین دەبێ ـ، سیمکارتی مخابەراتی دێهات، تەلەیفوونی ماڵ بە ماڵ، پۆستبانک، شەریکەی هاوبەشیی نەوت و کەلوپەل، ناوەندی کڕینی گەنم، قوتابخانەی سەرەتایی (کوڕانە ـ کچانە) بە ناوی "مستەفا" کە بیناکەی حازربەدەستە، دێهیاری (ساڵی ١٣٨٨)، بنکەی تەندروستی، مزگەوت (لە ساڵەکانی هاتنە سەر کاری کۆماری ئیسلامی ئێران نۆژەن کراوتەوە). بۆ درێژەدان بە خوێندن قوتابیان ڕەوانەی ئاوایی گۆکتەپە و شاری مەهاباد دەبن.

ئاژەڵداری، وەرزێری، کرێکاری و باخداری کاروپیشەی خەڵکی ئەم گوندەیە. ئاژەڵەکانیان بریتین لە: مەڕ، مانگا و بزن، وەرزێران گەنم، جۆ و گوڵەبێغەمبەرە دەچینن، بەرهەمی باخەکانیان سێو و بادامە.

گرفت و داخوازیی‌یەکانی خەڵکی ئاوایی: نەبوونی بینایەکی باش بۆ قوتابخانەی سەرەتایی، پێویستی بە قوتابخانەی ناوەندی.

گۆڕستانەکەی ئاوایی لە نزیک ئاوایی هەڵکەوتووە.

کاک "مەناف عەبدوڵڵازادە" بەیتبێژ و حەیرانبێژی ناسراو، خەڵکی ئەو ئاوایی‌یە بووە و ئێستا لە شاری مەهاباد دەژی.

## قوومقەڵا

قوومقەڵا لە ١٣ کیلۆمیتری باکووری شاری مەهاباد، بەشی ناوەندی و دێهستانی موکریانی ڕۆژاوا و لە ناوچەی شارویران هەڵکەوتووە. لە ٥٥٢ ماڵ و ٢٥٧٢ کەس پێکهاتووە، لەمانە ١٣١٣ کەس پیاون و ١٢٥٩ کەسیش ژنن، لە ١٦٦١ کەسی خوێندەوار ٩٥٧ کەسیان پیاون و ٧٠٤ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٦٤١ کەسی نەخوێندەوار ٢٢٠ کەس پیاون و ٤٢١ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ١٦١٦ هێکتارە، لەمە ١٥٨١ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و ٣٥ هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.

قووم قەڵا خاوەن ٤٠٠ هێکتار زەوی دێم، ١٠٤١ هێکتار زەوی بەراو، ٣٩٣/٥ هێکتار باخ، ٦٣ تراکتۆر، ١٥ لاوێردە، ١ کۆمباین و ٢ تووچێنەرە.

ئاواییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی ئسووکەند

باکوور: ئاواییەکانی دارەلەک و قەرەخان

ڕۆژهەڵات: ئاوایی ئیندرقاش

ڕۆژاوا: ئاوایی درباز

ئەم گوندە لە دەشتایی هەڵکەوتووە، زۆربەی خانووبەرەکان بە خشت، چیمەنتۆ و ئاسن ساز کراون، حەوشەیان هەیە و کۆڵانەکانی ڕاست هەڵکەوتوون و قاناویان تێگیراوە. گەلاڵەی هادی لەم ئاواییە لە ساڵی ١٣٨٤ی هەتاوییەوە دەستی پێکردووە.

لە زمانی کوردیدا "قووم" بە مانای ڕەڵم هاتووە و "قەڵا"ش بە ماڵی ئاغاکان کوتراوە کە زۆرجار لە شوێنێکی بەرزتر لە ماڵەکانی ئاوایی هەڵکەوتووە. سەردەمێک لە ناوەندی دێ، قەڵای ئاغاوەتان هەبووە کە بە خشتی چوارگۆشە دانرابوو لە دوایەدا ئەم شوێنە تێکدرا، لەوانەیە ئەم ناوە هەر لەمەوە هاتبێ. هەروەها بە وتەی خەڵک لەوانەیە ئەو ناوە تورکی بێ کە بە مانای قەڵای قایم و پتەوە.

تەپەی گردی باخی لە ٧٠٠ میتری باشووری دێ بە ژمارەی تۆمارکراوی ١٥٩٧٤ لە میراتی فەرهەنگی، بە بەرزایی ١٣٢٠ میتر لە ڕووکەشی زەریاکان، دەگەڕێتەوە سەدەی ٤ تا ٦ی کۆچی مانگی ــ هەزارەی یەکەمی پێش زایین، تەپەی تیکان بە ژمارەی تۆمارکراوی ١٦٦٢٧ و بەرزایی ١٣١٨ میتر لە ڕووکەشی زەریاکانەوە، ئاماژە بە سەدەی ٦ تا ٨ی کۆچی مانگی دەکا.

لە باشووری دێ ڕێگایەکی خاکی دەچێتەوە سەر ڕێگای قیلەتاو، لە باکوور ڕێگای قیلەتاو بە مەودای دوو کیلۆمیتر دەڕوا بۆ ئاوایی قەرەخان، لە ڕۆژهەڵاتەوە ڕێگایەکی خاکی دەچێتەوە سەر جادەی مەهاباد ــ میاندواو، لە ڕۆژاواشەوە ڕێگای قیلەتاو دەچێتەوە سەر جادەی مەهاباد ــ ورمێ.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی ١٣٥٥/١٠/٢ کارەباکەی هەڵکراوە، لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە کە عەنباراویان بۆ داناوە و ئاوەکەی لە "خانەگێ" دابین دەبێ، تەلەیفوونی ماڵ بە ماڵ، سیمکارتی مخابەراتی دێهات، پۆستبانک، بنکەی تەندروستی، دەرمانگا، باخچەی ساوایان، قوتابخانەی سەرەتایی (کوڕانە ــ کچانە) بە ناوەکانی "حەوتی تیر" و "نەبی‌ئەکرەم"، قوتابخانەی ناوەندی (کوڕانە ــ کچانە) بە ناوی "دانیش"، قوتابخانە تا پۆلی یەکەمی دواناوەندی بۆ کوڕان بە ناوی "دارولفنوون" کە لەگەڵ پۆلی ناوەندی لە یەک بینا دان، ئاکابیری، شەریکەی هاوبەشیی نەوت و کەلوپەل، مزگەوت کە ساڵی ١٣٨٥ی هەتاوی نۆژەن کراوەتەوە و لە حەولی ساز کردنی مزگەوتێکی دیکە دان، خانەقا، هەروەها ئەو شوێنانەی کە تایبەت بە کەسانێکی دیاریکراون لەم ئاواییەدا وەکوو: مەهابادگاز، کوشتارگای ئاژەڵان، بلووکبڕی، جووجەخانە، بەردبڕی و هتد. قوتابییانی ئەم دێیە بۆ درێژەدان بە خوێندن دەچنە شاری مەهاباد.

کارووپیشەی خەڵکی ئەم گوندە باخداری، وەرزێری، کرێکاری، ئاژەڵداری و هێندێک کاری جۆراوجۆری دیکەیە. بەرهەمی باخەکانیان سێو، ترێ و هڵووبە. بەرهەمی کشتوکاڵیان گەنم، جۆ، کۆلزا، گوڵەبەڕۆژە و چەوەندەرە. زۆربەی ئاژەڵەکانی قوومقەڵا مانگایە و چەند ماڵ مەڕ و گامێشیان ڕاگرتووە.

گرفتەکانی خەڵکی ئاوایی: بێکاریی لاوەکان، نەبوونی پەرتووکخانە، پێویستی بە قیلەتاو کردنی کۆڵانەکانی نێو دێ، نەبوونی شوێنێکی تایبەت بۆ وەرزیش. کۆنەگۆڕستانی "دێوانە" و گۆڕستانە نوێیەکەی بە ناوی سەید "سمایل" تێکەڵ بوونەوە، پێشتر لە ڕۆژاوای دێ، گۆڕستانی سەید "ڕەحیم"ی لێبوو کە ئێستا هەر ئەو شوێنە کوشتارگای لێ ساز کراوە.

## قۆیتەڵ

قۆیتەڵ لە ٤٨ کیلۆمیتری باشووری شاری مەهاباد، بەشی خەلیفان و دێهستانی کانی بازاڕ و لە ناوچەی مەنگوڕایەتی هەڵکەوتووە. لە ٣١ ماڵ و ٢٠٤ کەس پێکهاتووە، لەمانە ١٠٤ کەس پیاون و ١٠٠ کەسیش ژنن، ژمارەی خوێندەوارانی ئەم ئاواییە ١٠٧ کەسە کە ٦١ کەسیان پیاون و ٤٦ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٦٩ کەسی نەخوێندەوار ٢٦ کەس پیاون و ٤٣ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ١٣٩٩/٦٦ هێکتارە، لەمە ٢٤٢/٦٦ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و ١١٥٧ هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.

خاوەن ٤٦٠ هێکتار زەوی دێم، ٧٢ هێکتار زەوی بەراو، ١٥ هێکتار باخ و ٢١ تراکتۆرە.

ئاواییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی شارەزوور

باکوور: ئاچێدەرێ، میرەدێ، شێخ یۆسف (گۆلان)

ڕۆژهەڵات: ئاوایی شارەزوور

ڕۆژاوا: ئاوایی خەلیفان

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باشوور: کێوی بەرماڵان یان خرێ قەبران

باکوور: قەڵاکۆن، موکریقران

ڕۆژاوا: بەردەکونت (نەزەرگە)شی پێدەڵێن

کانیاوەکان بە کانی سارد، کانی خرێ قەیسی، کانی ڕەسووجوامێر، کانی سەیدی، کانی سوێر و کانی پیاوان ناسراون، هەڵبەت ئەم سێ کانیاوەی کۆتایی بە هۆی سێڵاوی ساڵی ١٣٥٣ی هەتاوی لەنێو چوون.

خانووبەرەکان زۆرتر لە قوڕ و بەردن و تا ڕادەیەکیش بلووک دەکار کراوە، میچەکانیان لە دارە و ماڵەکان حەوشەیان هەیە.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی ١٣٦٤/١٠/٢٤ کارەباکەی هەڵکراوە، لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە کە عەنباراویان بۆ داناوە و ئاوەکەی لە چاڵاو دابین دەبێ، سیمکارتی مخابەراتی دێهات، قوتابخانەی سەرەتایی"کاوە" (کوڕانە ــ کچانە)، ئاکابیری، بنکەی تەندروستی، مزگەوتێک بە ناوی "حەزرەتی ئەبووبەکر" کە لە دەهەی شەستی هەتاویدا نۆژەن کراوەتەوە و هەروەها قۆیتەڵ خاوەن شووڕای ئیسلامییە. نەوت و کەلوپەل لە شەریکەی هاوبەشیی"خەلیفان" وەردەگرن.

خوێندکاران بۆ درێژەدان بە خوێندن ڕەوانەی خەلیفان، مەهاباد و بۆکان دەبن.

کاروپیشەی خەڵکی قویتەڵ وەرزێری، ئاژەڵداری و کرێکارییە. وەرزێران گەنم، نۆک و جۆ دەچێنن و ئاژەڵەکانیان مەڕ، مانگا و بزنن.

گرفتەکانی خەڵکی ئاوایی: کەمئاوی و خاوێن نەبوونی کۆڵانەکانی نێو دێ لە بواری بێهداشتەوە.

خەڵکەکە باسی مەلا "ئەحمە دۆنەخۆر" وەک کەسایەتییەکی ئەم ئاواییە دەکەن کە زانا و شاعیر بووە.

گۆڕستانی نوێ لە ڕۆژهەڵاتی دێ هەڵکەوتووە، کۆنەگۆڕستانەکەی بە شێخ حەسەن ناسراوە.

ڕۆژنامەوان کاک "سەلاح چەڵەبیانی"ش خەڵکی ئەم گوندەیە و ئێستا دانیشتووی شاری مەهابادە.

## قەرەبڵاغ

قەرەبڵاغ لە ٢١ کیلۆمیتری ڕۆژهەڵاتی شاری مەهاباد، بەشی ناوەندی و دێهستانی ئاختاچی ڕۆژاوا و لە ناوچەی محاڵ هەڵکەوتووە. لە ٣٩ ماڵ و ٢٤٥ کەس پێکهاتووە، لەمانە ١٢١ کەس پیاون و ١٢٤ کەسیش ژنن، ژمارەی خوێندەوارانی ئەم ئاواییە ١٣٤ کەسە کە ٧٢ کەس پیاون و ٦٢ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٧٧ کەسی نەخوێندەوار ٣٢ کەس پیاون و ٤٥ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ١٣٠٠ هێکتارە، لەمە ١٥٠ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و ١١٥٠ هێکتار پاوان و لەوەرگەی دێیە.

قەرەبڵاغ خاوەن ٢٥٠ هێکتار زەوی دێم، ٩٥ هێکتار زەوی بەراو، ٤٢ هێکتار باخ، ٢٢ تراکتۆر و ٤ لاوێردەیە.

ئاواییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاواییەکانی سارەوانان و دەرمان

باکوور: ئاواییەکانی کەپەکەند، بەردەمێش

ڕۆژهەڵات: ئاوایی حاجیالیکەند

ڕۆژاوا: ئاواییەکانی قەڵات و بەسری

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باشوور: هەورازەبڵیندە

باکوور: گردی چەقەی و گڕاو

ڕۆژهەڵات: کڵاوکووڕ

ڕۆژاوا: شێخ حەسەن بەسری

لە بەری ڕۆژهەڵاتی ئاوایی ئەشکەوتێکی بچووک بە ناوی "ئەشکەوتان" هەیە. سەرچاوەی هەوارەبڵیندە، تاقەدار و سەرچاوەی قەرەبڵاغ سێ کانیاوی بەناوبانگی ئاوایین.

خانووبەرەکان لە خشت، بلووک و بەردن، خانووی بە قوڕ و بەرد و میچی دار تا ڕادەیەک هەر ماون. لەم ئاواییە کۆڵانەکان بە شێوەیەکی ڕێکوپێکن و جەدوەلکێشی کراون، چەند ماڵ هەوراز هەڵکەوتوون و زۆربەیان ڕوو لە ڕۆژهەڵاتن. تەپەی قەرەبڵاغ بە ژمارەی تۆمارکراوی ١٦٦٠٣ لە میراتی فەرهەنگی بە بەرزایی ١٧٨٤ میتر لە ڕووکەشی زەریاکان، دەگەڕێتەوە قۆناغی کالکۆلیتیک.

سەبارەت بە مێژووی ئاوایی، "فاتمە عەبدوڵڵاپوور" تەمەن ٨٦ ساڵ، خەڵکی ئاوایی، بەم شێوە بۆمان دەدوێ: "بابم ناوی ڕەحیم بوو، ڕەحیمەسووریان پێدەکوت، ماڵمان لەو دەرمانەی بوو، بابم ماڵە خۆی لە برایان کرد و ئەو کاتی کە قەرەبڵاغ مەزرای ئێرە بووە، چۆتە ئەو شوێنە و ئەوێی ئاوەدان کردووەتەوە، پاش چەند ساڵ ئەمن بە وەلەد بوومە."

کە وا بوو بە وتەی ئەو خوشکە بەڕێزە مێژووی ئەو ئاواییە لە یەک سەدە تێپەڕ نابێ؛ بەڵام وەکوو لە بەشی ئاواییەکانی دەوروبەر باسمان کرد؛ کاتێک "ڕەحیمەسوور" ئەو دێیەی ئاوەدان کردووەتەوە چەند کاولەکۆنی لێبوونە کە وا بوو دەتوانین بڵێین بەر لەوە ئەم شوێنە گوندێکی چۆڵوهۆڵ بووە.

قەرەبڵاغ وشەیەکی تورکییە و بە مانایی "کانی ڕەش"ە، هۆی ئەو ناوەش دەگەڕێتەوە سەر ئەو کانیاوەی کە لە ناوەندی ئاواییە و ئێستاش بە "کانی قەرەبڵاغ" و "سەرچاوە" ناوبانگی هەیە.

ئاوایی قەرەبڵاغ لە سەر جادەی مەهاباد ــ بۆکان هەڵکەوتووە. لە باکووری گوند ڕێگایەکی خاکی دەچێتەوە ئاواییەکانی "کەپەکەند" و "بەردەمێش"، لە ڕۆژهەڵاتەوە ڕێگایەکی خاکی ئاوایی "کەپەکەند" دەگرێتەوە، لە ڕۆژاواوە ڕێگایەکی قیلەتاو لە ڕێگای سەرەکی مەهاباد - بۆکان جیا دەبێتەوە و ئاوایی بەسری و قەڵات دەگرێتەوە.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی 1357/10/19 کارەباکەی هەڵکراوە، لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە، سیمکارتی مخابەراتی ئاوایی، ناوەندی خزمەتگوزارییەکانی وەرزێری، بنکەی تەندروستی، بەشگەی هاوبەشیی نەوت، هۆڵی وەرزیشی سەرداپۆشراو (ئیمکاناتی تەواوی نییە)، قوتابخانەی سەرەتایی (کوڕانە ــ کچانە) بە ناوی"٢٢ بەهمەن"، مزگەوت (١٣٨٤ نۆژەن کراوەتەوە)، کارگەی فرۆشی گێچ و چیمەنتۆ (کەرتی تایبەتی). هەروەها ئاوایی خاوەنی دێهیاری و شووڕای ئیسلامی، ڕاهدارخانە و بنکەی بەسیجە. بۆ وەرگرتنی کەلوپەل سەر بە ئاوایی "حاجیالیکەند"ن.

قوتابیان بۆ درێژەدان بە خوێندن دەچنە ئاوایی گۆکتەپە و شارەکانی مەهاباد و بۆکان. مافی خوێندن بۆ کچان و کوڕان پارێزراوە.

وەرزێری، ئاژەڵداری، کرێکاری و باخداری کاروپیشەی خەڵکی ئەم گوندەیە. وەرزێران گەنم، جۆ و نۆک دەچێنن و ئاژەڵەکانیان مەڕ، مانگا و بزنن، هەروەها بەرهەمی باخەکان سێو و قەیسییە. گرفتەکانی خەڵکی ئاوایی: نەبوونی قوتابخانەی ناوەندی و گرفتی کەمئاوی.

گۆڕستانەکانی ئاوایی لە باشووری دێ هەڵکەوتوون (کۆن و نوێ).

## قەرەچەلان

قەرەچەلان لە ٢٣ کیلۆمیتری باشووری شاری مەهاباد، بەشی خەلیفان و دێهستانی مەنگوڕی ڕۆژهەڵات و لە ناوچەی مەنگوڕایەتی هەڵکەوتووە. لە ٦ ماڵ و ٤٦ کەس پێکهاتووە، لەمانە ٢٦ کەس پیاون و ٢٠ کەسیش ژنن، لە ٢٩ کەسی خوێندەوار ١٧ کەس پیاون و ١٢ کەسیش ژنن، هەروەها لە ١٣ کەسی نەخوێندەوار ٧ کەس پیاون و ٦ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ٧٥٠ هێکتارە، لەمە ١٥٤/٥ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و ٥٩٥/٥ هێکتار پاوان و لەوەرگەی دێیە.

قەرەچەلان خاوەن ١٥٦/٢٥ هێکتار زەوی دێم، ٤١/٧ هێکتار زەوی بەراو، ٧/٩٦ هێکتار باخ، ٧ تراکتۆر و ١ لاوێردەیە.

ئاواییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی گیادروان

باکوور: پشتتەپی مەهاباد

ڕۆژهەڵات: ئاوایی ئۆزندەرێ

ڕۆژاوا: ئاواییەکانی کەوڵەی سەرمێرگان و بەیتاس

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باشوور: کێوی بەردەخوار

باکوور: خەسرەوخان

ڕۆژهەڵات: شاخی ماڵان

ڕۆژاوا: خرێ کیسەڵان و هەوار شوژن

کانی ماڵان، کانی فەرخە، کانی بەردە خوار و قوڕە ڕەش چەند کانیاوی قەرەچەلانن.

خانووبەرەکانی ئەم ئاواییە بە گشتی لە قوڕ و بەرد و میچی دار ساز کراون، ماڵەکان ڕوویان لە ڕۆژاوایە و حەوشەیان نییە.

بەساڵاچووان دەڵێن کابرایەک بە ناوی "مینەی باپیرئاغا" ئەم دێیەی ئاوەدان کردۆتەوە. قەرەچەلان لە قەرە بە مانای ڕەش لە زمانی تورکی+ چەلان کە جۆرێک گیایە پێکهاتووە.

لە باشووری دێ ڕێگایەکی خاکی ئاوایی "حەوڵاکوردە" دەگرێتەوە، لە بەری باکوور ڕێگایەکی خاکی هەیە کە دەچێتەوە پشتتەپی بەری مەدرەسە.

ئیمکاناتی قەرەچەلان کارەبایە کە ساڵی ١٣٨٦ی هەتاوی هەڵکراوە، سیمکارتی مخابەراتی دێهات. پێشتر قوتابخانەیەکی سەرەتایی لە قوڕ و بەرد هەبووە کە لە بەر کۆن بوونی تێکڕماوە، قوتابیان ماوەیەک لە خوێندن بێبەهرە بوون کەچی ئەم ڕووداوە و نەبوونی ئیمکاناتەکانی دیکە بوو بە هۆکاری چۆل بوونی ئاوایی، تا ساڵی ١٣٨٧ی هەتاوی چەند ماڵێک کە مابوونەوە ناچار ئەوانیش کۆچوباریان تێکەوە پێچا و بوون بە نیشتەجێی شاری مەهاباد، هەڵبەت لە وەرزی کار و هەڵگرتنەوەی بەرهەمەکانی زەویوزاریان بۆ ماوەیەک لە دێ دەمێننەوە. بۆ وەرگرتنی نەوت و کەلوپەل سەر بە شەریکەی پشتتەپ لە مەهابادن. قەرەچەلان لولەکێشیی ئاوی خواردنەوەی نییە و لە کانیاوەکان کەلک وەردەگرن.

کاروپیشەی خەڵکی ئەم ئاواییە وەرزێری، باخداری و کرێکارییە؛ ئاژەڵدارییە. بەرهەمی وەرزێرانی ئاوایی گەنم، جۆ و گوڵەبەڕۆژەیە و ئاژەڵەکانیان مەڕ، بزن و مانگان، بەرهەمی باخەکانیشیان سێوە و قەیسی.

ئەگەر گرفتەکانی خەڵکی ئەم دێیە جێبەجێ بن بۆی هەیە خەڵکەکە بگەڕێنەوە سەر ماڵ و مووجە و مەزرای خۆیان. گرفتەکانی ئاوایی بریتین لە: ڕێگای خاکی و ناخۆش، نەبوونی لولەکێشیی ئاوی خواردنەوە، نەبوونی قوتابخانە، مزگەوت کە پێویستە نۆژەن بکرێتەوە، هەڵبەت قەرەچەلان مزگەوتی هەیە کەچی بەرەو کاول بوونە و کەلکی لێ وەرناگیرێ.

پێشتر خەڵکی ئاوایی مردووەکانیان لە گۆڕستانی "قەبری تیتیلو" دەناشت، ئێستا سەرەخۆشی و ناشتنی مردووەکانیان هێناوەتە شار.

## قەرەخان

قەرەخان لە ١٥ کیلۆمیتری باکووری شاری مەهاباد، بەشی ناوەندی و دێهستانی موکریانی ڕۆژاوا و لە ناوچەی شارویران هەڵکەوتووە. لە ١٠٢ ماڵ و ٦٣٧ کەس پێکهاتووە، لەمانە ٣١٦ کەس پیاون و ٣٢١ کەسیش ژنن، لە ٤٢٧ کەسی خوێندەوار ٢٣٥ کەس پیاون و ١٩٢ کەسیش ژنن، هەروەها لە ١٢٣ کەسی نەخوێندەوار ٤١ کەسیان پیاون و ٨٢ کەسیش ژنن.
پانتایی ئاوایی ٣٧٧ هێکتارە، لەمە ٣٤٠/٢٥ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و ٣٦/٧٥ هێکتار پاوان و لەوەرگەی دێیە.
قەرەخان خاوەن ٣٤٦ هێکتار زەوی بەراو، ١٤٩ هێکتار باخ، ١٧ تراکتۆر و ٦ لاوێردەیە.

ئاواییەکانی دەوروبەر:
باشوور: ئاوایی قوومقەڵا
باکوور: ئاوایی لەج
ڕۆژهەڵات: ئاوایی گۆکتەپە
ڕۆژئاوا: ئاوایی دارەلەک

قەرەخان لە دەشتایی هەڵکەوتووە و کێوی لێ نییە، بیناکانی ئاوایی چەشنی شار لە خشت، چیمەنتۆ و ئاسن ساز کراون، ماڵەکان حەوشەیان هەیە و کۆڵانەکانی ئاوایی ڕێک و ڕاست و بەرفرەوانن و قاناویان تێگیراوە.
هێندێک خەڵکی ئاوایی دەڵێن کە ناودێر کردنی ئەم دێیە وەک بەشێکی زۆر لە دێهاتەکانی شاری مەهاباد، دەگەڕێتەوە سەردەمی دەسەڵاتدارێتی تورکانی مەغۆل، بەڵام ئەوەی ئاشکرایە ئەم ناوە تورکییە، قەرە بە مانای ڕەشە و خان بە دەسەڵاتدار دەڵێن.
لە باشووری دێ ڕێگایەکی دوو کیلۆمیتری قیلەتاو دەچێتەوە ئاوایی قوومقەڵا، لە باکوورەوە ڕێگایەکی خاکی ئاوایی دارەلەک دەگرێتەوە، لە ڕۆژهەڵاتەوە ڕێگایەکی خاکی دەچێتەوە ئاواییەکانی گۆکتەپە و ئیندرقاش.
ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی ١٣٥٨ /١١/٢٤ کارەباکەی هەڵکراوە، لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە کە عەنباراویان بۆ داناوە، قوتابخانەی سەرەتایی و ناوەندی (کوڕانە ــ کچانە)ی "نەماز" کە هەردووک یەک بینان، ئاکابیری، باخچەی ساوایان، بنکەی تەندروستی، تەلەیفوونی ماڵ بە ماڵ، سیمکارتی مخابەراتی دێهات، مزگەوت کە ١٣٦٤ی هەتاوی نۆژەن کراوەتەوە، نانەوەخانە و هەروەها ئەم دێیە خاوەن دێهیاری، شووڕای ئیسلامی و شووڕای چارەسەری کێشەکانە. بۆ وەرگرتنی نەوت و کەلوپەل سەر بە ئاوایی "قووم قەڵا"ن.
کوڕانی ئاوایی بۆ درێژەپێدان بە خوێندن تا پۆلی یەکەمی دواناوەندی دەچنە قوتابخانەی "قوومقەڵا"، پاشان ڕەوانەی مەهاباد دەبن، کچانی ئاواییش هەرچەند کەمتر دواناوەندی دەخوێنن و ئەگەریش بخوێنن دەچنە شاری مەهاباد.
باخداری، وەرزێری، کرێکاری و هێندێک کاری جۆراوجۆری دیکە وەکوو دووکانداری، پیشەسازی و...، کاروپیشەی خەڵکی ئەو گوندەن. بەرهەمی باخەکان زیاتر سێوە، ئاژەڵەکانیش هەر مانگان و تا ڕادەیەکیش گامێش ڕادەگرن، بەرهەمی وەرزێران گەنم و چەوەندەرە.
گرفتەکانی خەڵکی قەرەخان: نەبوونی بینا بۆ بنکەی تەندروستی، نەبوونی قوتابخانەی دواناوەندی، قیلەتاو نەکردنی کۆڵانەکانی دێ، نەبوونی زەوی وەرزیشی باش.
خەڵکەکە پێشتر مردووەکانیان لە گۆڕستانی ئاوایی "لەج" دەناشت، بەڵام ئێستا لە "قوومقەڵا" خاکیان کڕیوە و مردووەکانیان لە وێ بە خاک دەسپێرن.

## قەرەداغ

قەرەداغ لە 40 کیلۆمیتری باکووری شاری مەهاباد، بەشی ناوەندی و دێهستانی موکریانی ڕۆژهەڵات و لە ناوچەی شارویران هەڵکەوتووە. لە ١٨٣ ماڵ و ٨٧٧ کەس پێکهاتووە، لەمانە ٤٢٨ کەس پیاون و ٤٥٩ کەسیش ژنن، ژمارەی خوێندەوارانی ئەم دێیە ٥٥٠ کەسە کە ٣١١ کەسی پیاون و ٢٣٩ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٢٣٨ کەسی نەخوێندەوار ٧١ کەسیان پیاون و ١٦٧ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ١٠٠٥ هێکتارە، لەمە ٣٤٩ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و ٦٥٦ هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.

قەرەداغ خاوەن ٣٢٨ هێکتار زەوی دێم، ٥١٠ هێکتار زەوی بەراو، ٧٧/٥ هێکتار باخ، ٣٩ تراکتۆر و ١٤ لاوێردەیە.

ئاوایییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی گاپیس

باکوور: ئاوایییەکانی بەفرەوان و قوڵەسەن (سەر بە میاندواون)

ڕۆژهەڵات: ئاوایی گابازەڵە

ڕۆژئاوا: ئاوایی خورخورە

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باشوور: چاکی ئایشێ خانم

باکوور: شاخە ڕەش

ڕۆژهەڵات: لێوی گۆلێ

ڕۆژئاوا: شەبەک

لە بەری ڕۆژئاوای دێ، ئەشکەوتێکی لێیە کە پێدەڵێن "کونەپێست"، لە ڕۆژهەڵات، ئەشکەوتی"گۆلێ" و لە بەری باشوور دوو ئەشکەوت بە ناوەکانی "کەرەماڵێ" و "گیادروان" هەڵکەوتوون.

کانی بەرازان، کانی دۆکڵیو، کانی ژنان، کانی پیاوان، قامیشێ، کوێرە، ڕەحیمەخولەچکۆڵە و کانی کۆمێلە کانیاوە بەناوبانگەکانی ئاوایین.

لەم گوندە کۆنەخانوو نابیندرێ و ماڵەکان زۆربەیان بە خشت، بلووک و چیمەنتۆ ساز کراون و میچەکانیان لە ئاسن یان لە دارە، گشت ماڵەکان حەوشەیان هەیە و دەرگایان تێگیراوە، کۆڵانەکان ڕاست و ڕێک هەڵکەوتوون.

ناوی ئاوایی وشەیەکی تورکییە و بە مانای "شاخەڕەش"ە، هەڵبەت شاخەڕەش لە بەری باکووری دێ هەڵکەوتووە. تەپەی "تەپە یشک" بە ژمارەی تۆمارکراوی 15984 لە میراتی فەرهەنگی بە بەرزایی 1294 میتر لە رووکەشی زەریاکان، دەگەڕێتەوە سەر قۆناغی برۆنز ــ سەدەی 8 تا 10ی کۆچی مانگی.

هەروەها ئەم ئاوایییە خاوەن تەپۆڵکەیەکی دیکەیە بە ژمارەی تۆمارکراوی 16609 لە میراتی فەرهەنگی بە بەرزایی 1320 میتر لە رووکەشی زەریاکان کە مێژوویەکەی دەگەڕێتەوە قۆناغی برۆنز ــ مەغۆل.

لە باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاوایی تەپەیەکی دیکە بە بەرزایی 1320 میتر لە رووکەشی زەریاکان و ژمارەی تۆمارکراوی 15982 لە میراتی فەرهەنگی هەڵکەوتووە کە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە قۆناغێ کالۆلیتیک.

لە باشووری ڕۆژهەڵاتەوە ڕێگایەکی قیلەتاو دەچێتەوە بۆ ئاوایییەکانی گابازەڵە و کێچاوا، لە باکوورەوە ڕێگایەکی خاکی ئاوایییەکانی قوڵەسەن و بەفرەوان دەگرێتەوە، لە ڕۆژئاوا ڕێگایەکی خاکی بۆ ئاوایییەکانی گاپیس و خورخورە دەچێ.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی 1363/08/14 کارەباکەی هەڵکراوە، لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە، سیمکارتی مخابەراتی دێهات، مزگەوتی "محەممەد ڕەسووڵەڵا "، لە ساڵی 1387 نۆژەن کراوەتەوە، بنکەی تەندروستی، قوتابخانەی سەرەتایی (کوڕانە ـ کچانە) بە ناوی "حوجەت"، نانەوەخانە و هەروەها ئەم دێیە خاوەن دێهیاری و شوورای ئیسلامییە. خەڵکی ئاوایی بۆ وەرگرتنی نەوت سەر بە ئاوایی خورخوڕەن، کەلوپەل لە شەریکەی هاوبەشیی ئاوایی "حاجیخۆش" وەردەگرن. قوتابیانی کوڕ دوای تێپەڕ کردنی پۆلی سەرەتایی ڕەوانەی ئاوایی کێچاوا دەبن، پاشان زۆربەیان دەچن بۆ قوتابخانەکانی ئاوایی گۆکتەپە یا شاری مەهاباد، کچانیش کەمتر هەڵدەکەوێ درێژە بە خوێندن بدەن. هێندێک لە کچان پۆلی ناوەندی لە ئاوایی حاجیخۆش تێپەڕ دەکەن.

کاروپیشەی خەڵکی ئاوایی وەرزێری، ئاژەڵداری، باخداری و کرێکارییە. بەرهەمی وەرزێران گەنم، جۆ، گوڵەپێغەمبەرە، وێنجە، کۆڵزا و چەوەندەرە، ئاژەڵەکانیان مەڕ، مانگا، بزن و گامێشن پێکهاتوون، بەرهەمی باخەکان سێو و هڵوویە.

نەبوونی قوتابخانەی ناوەندی و جێبەجێ نەبوونی هۆڵی وەرزیشی ـ هەر چەند زەوییەکەیان بۆ گۆڕەپانی وەرزش دیاری کردووە ـ لە گرفتەکانی خەڵکی ئەم گوندەن. گۆڕستانەکەی ئاوایی لە ڕۆژئاوا هەڵکەوتووە و بە "گۆڕستانی شەبەک" ناسراوە.

## قەرەقاچ (قەرەخاچ)

قەرەقاچ لە ٣٣ کیلۆمیتری باشووری ڕۆژاوای شاری مەهاباد، بەشی خەلیفان و دێهستانی مەنگوڕی ڕۆژهەلات و لە ناوچەی مەنگوڕایەتی هەڵکەوتووە.
لە ٨ ماڵ و ٤٤ کەس پێکهاتووە، لەمانە ٢٠ کەس پیاون و ٢٤ کەسیش ژنن، لە ٢٩ کەسی خوێندەوار ١٢ کەس پیاون و ١٧ کەسیش ژنن، هەروەها لە ١٢ کەسی نەخوێندەوار ٦ کەس پیاون و ٦ کەسیش ژنن.
خەڵکی ئەم گوندە پێشتر لە ئاوایییەکانی "مەزرای چۆمان" و "نێڵان" دەژیان و بە هۆی شەڕ و نائەمنی ناوچەکە، ئاوایییەکانیان بەجێ هێشت و خانووبەرەکانیان کاول بوو، دەوڵەتی کۆماری ئیسلامی لەم شوێنەی ئێستا کە لە ڕاستیدا بەشەزەوی ئاوایییەکانی دیکن، خانووی بۆ ساز کردوون و لەوێ تەنیا دەتوانن بژین و هیچ مافێکیان بەسەر مەزراکان و لەوەرگەکاندا نییە و ناتوانن کشتوکاڵ بکەن و ئاژەڵەکانیان بلەوەڕێنن، هەر بۆیە پانتایی قەرەقاچ تا ئێستا نەگیراوە.
ئاوایییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی باگردانی خوارێ

باکوور: ئاوایی مێرگەڕۆ

ڕۆژهەڵات: ئاوایی سێلم

ڕۆژاوا: ئاوایی باگردانی سەرێ

ئەم گوندە کۆڵانی نییە، هۆیەکەشی کەمبوونی ماڵەکانە، خانووبەرەکان لە قوڕ، بەرد، خشت و چیمەنتۆ ساز کراون و میچەکانیش لە دارن، هیچ کام لەو ماڵانە حەوشەیان نییە و بە گشتی بەرەو باشوورن.
مێژووی ئاوەدان کردنەوەی قەرەقاچ ساڵی ١٣٦٤ی هەتاوییە، گشت ماڵەکانی ئەو گوندە پێکەوە خزمن. وەکوو لە سەرەتادا باس کرا ئەم خەڵکە پێشتر لە ئاوایییەکانی مەزرای چۆمان و نێڵان دەژیان کە بە هۆی شەڕ و نائەمنی ئاوایییەکانیان بەجێ هێشت و دەوڵەت لەو شوێنە خانووی بۆ ساز کردن.
قەرەقاچ لە "قەرە" بە مانای ڕەش+ قاچ بە مانای "بەش" پێکهاتووە.
قەرەقاچ لە سەر ڕێگای دۆڵی شێخان هەڵکەوتووە، لە باکووری ئاوایی ڕێگایەکی خاکی دەچێتەوە ئاوایی مێرگەڕۆ، لە باشووریش باگردانی سەرێ و خوارێ بە ڕێگایەکی خاکیدا دەگرێتەوە.
ئیمکاناتی ئاوایی: کارەبا، سیمکارتی مخابەراتی دێهات، قوتابخانەی سەرەتایی (کوڕانە ــ کچانە) بە ناوی "شوهەدای دڵگۆداز" و ئاکابیری. بۆ وەرگرتنی نەوت و کەلوپەل سەر بە "سیاقۆڵی خوارێ"ن و بۆ بنکەی تەندروستی ڕێگای باگردانی خوارێ دەپێون.
ئەم ئاوایییە لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوەی نییە و ئاوەکەیان لە کانیاوی "نێومالان" دابین دەبێ.
خوێندکاران بۆ درێژەدان بە خوێندن دەبێ بچنە خەلیفان و مەهاباد، بەڵام دەگمەنە کەسێک لەم گوندە درێژە بە خوێندن بدا.
ئاژەڵداری کاروپیشەی خەڵکی قەرەقاچە، زیاتری ئاژەڵەکانیان مەڕ و بزنن و کشتوکاڵی کەم تێدا دەکرێ. هەموو ساڵێ لە وەرزی هاویندا بنەیەکیان دەچێتەوە مەزرای چۆمان و نێڵان کە وەک هەوار کەلکی لێ وەردەگرن و زەوی بۆ کشتوکاڵیان هەر لە وێیە.
گرفتەکانی خەڵکی ئاوایی: بەو هۆیەی لە زەوی و مەزراکانیان زۆر دوور کەوتوونەوە، دەخوازن هەر لە ئاوایییەکانی پێشووی خۆیان خانووبەرەیان بۆ ساز کەنەوە و ئیمکاناتیان بدەنێ.
گۆڕستانەکەیان لە باکووری قەرەقاچ هەڵکەوتووە.

## قەرەقشلاق

قەرەقشلاق لە ٢٨ کیلۆمیتری باکووری شاری مەهاباد، بەشی ناوەندی و دێهستانی موکریانی ڕۆژاوا و لە ناوچەی شارویران هەڵکەوتووە. لە ٢٥٥ ماڵ و ١٤٥٥ کەس پێکهاتووە، لەمانە ٧٤٥ کەس پیاون و ٧١٠ کەسیش ژنن، لە ٨٥٧ کەسی خوێندەوار ٤٩٣ کەس پیاون و ٣٦٤ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٤٤٩ کەسی نەخوێندەوار ١٦٨ کەس پیاون و ٢٨١ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ٣٧٧٣ هێکتارە، لەمە ٧٧٣هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە، ٣٠٠٠ هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.

قەرەقشلاق خاوەن ١٣٤ هێکتار زەوی دێم، ١٢٥٧ هێکتار زەوی بەراو، ٢٩١ هێکتار باخ، ٧٧ تراکتۆر، ١٥ لاوێردە و ٣ تووچێنەرە.

ئاوایییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی قزڵقۆپی

باکوور: ئاوایییەکانی گردیاقووب و کۆنەدێ

ڕۆژهەڵات: ئاوایی خوڕخوڕە

ڕۆژاوا: ئاوایی مەیمەند (سەر بە شاری نەغەدە)

شوێنی هەڵکەوتنی ئەم دێیە دەشتاییە و کێوی لێ نییە، بەڵام قەرەقشلاق تاڵاوێکی هەیە.

زۆرتری خانووبەرەکان لەم گوندە لە خشت، بلووک و جۆرە بەردێکی تاشراوی سپی و میچی ئاسن ساز کراون، دەتوانین بڵێین کۆنەخانووی تێدا نەماوە، ماڵەکان حەوشە و دەرگایان هەیە و کۆڵانەکان ڕێک و ڕاستن و لە سەر شێوازێکی نوێ هەڵکەوتوون.

قەرەقشلاق وشەیەکی تورکییە و مانای لەوەڕگە یان جێگای مانەوەی ڕەش لە وەرزی زستاندا.

ڕژیمی بەعسی ئێراق ڕێکەوتی ١٩٨٧/٢/١ی زایینی ١٣٦٥/١١/١٢ی هەتاوی، قەرەقشلاقی بوردومان کرد.

لە باشووری دێ ڕێگایەکی قیلەتاو دەچێتەوە ئاوایی قزڵقۆپی، لە باکوورەوە ڕێگایەکی قیلەتاو دەچێتەوە ئاوایییەکانی گردیاقووب، کۆنەدێ و خوڕخوڕە، لە ڕۆژهەڵاتەوە ڕێگایەکی خاکی ئاوایی خوڕخوڕە دەگرێتەوە، لە ڕۆژاواوە ڕێگایەکی خاکی دەڕواتەوە مووچە و مەزرای ئەم دێیە.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی ١٣٦٧/٤/٢٨ کارەباکەی هەڵکراوە، لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە کە عەنباراویان بۆ داناوە، تەلەیفوونی ماڵ بە ماڵ، سیم کارتی مخابەراتی دێهات، پۆستبانک، شەریکەی هاوبەشیی نەوت و کەلوپەل، بنکەی تەندروستی، قوتابخانەی سەرەتایی (کوڕانە ـ کچانە) بە ناوی شەهید "ئەحمەد حوسێنی" کە ساڵی ١٣٥٥ی هەتاوی ساز کراوە، قوتابخانەی ناوەندی بە ناوی "فەجر" کە ساڵی ١٣٧٩ی هەتاوی دانراوە، مزگەوت، نانەوەخانە و هەروەها ئەم ئاوایییە خاوەن شوورای ئیسلامی و دێهیارییە.

خوێندکاران بۆ درێژەدان بە خوێندن دەچنە قوتابخانەکانی شاری مەهاباد.

وەرزێری، ئاژەڵداری، باخداری و هێندێک کاروکەسبی تر کاروپیشەی خەڵکی ئەم گوندەن، بەرهەمی وەرزێران گەنم، جۆ، چەوەندەر، وێنجە و گوڵەبەڕۆژەیە و ئاژەڵەکانیان مەڕ، مانگا و گامیشن.

بەرهەمی باخەکانیش سێو، ترێ، قەیسی و ئاڵووباڵوویە.

گرفتی خەڵکی ئاوایی: نەبوونی زەوی بۆ ساز کردنی خانوو، پێڕانەگەیشتن بە ژینگەی ئاوایی، کەمئاوی.

لە بەری ڕۆژاوای گوند گۆڕستانی "قەبری سەیدی" و بەری ڕۆژهەڵاتیش گۆڕستانی "شەبەک" هەڵکەوتووە.

لە ناوەندی ئاوایی هێندێک کۆنەگۆڕی لێنە.

## قەرەنی‌ئاوا

ئەم ئاوایی‌یە لە 62/5 کیلۆمیتری باشووری شاری مەهاباد، بەشی خەلیفان و دێهستانی کانی بازاڕ و لە ناوچەی گەورکایەتی هەڵکەوتووە. لە ٧ ماڵ و ٤٩ کەس پێکهاتووە، لەمانە ٢٢ کەس پیاون و ٢٧ کەسیش ژنن، ژمارەی خوێندەوارانی ئەم ئاوایی‌یە ٣٣ کەسە کە ١٥ کەس پیاون و ١٨ کەسیش ژنن، هەروەها لە ١١ کەسی نەخوێندەوار ٤ کەس پیاون و ٧ کەسیش ژنن.
پانتایی ئەم ئاوایی‌یە دیاری نەکراوە.

ئاوایی‌یەکانی دەوروبەر:
باشوور: ئاوایی کانی ڕەش
باکوور: ئاوایی کاوڵانی خوارێ
ڕۆژهەڵات: ئاوایی سوێناس
ڕۆژاوا: ئاوایی کاوڵانی سەرێ

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:
باشوور: شناوێ
ڕۆژهەڵات: باسکی ڕژدی

"کانی شیلان"، کانیاوی بەناوبانگی ئەم دێیەیە.
خانووبەرەکان لە قوڕ و بەرد و میچیان لە دارە، ماڵەکان لە تەنیشت یەک ساز کراون و زۆربەیان ڕوو بە ڕۆژاوان و حەوشەیان نییە.
سەبارەت بە مێژووی ئاوایی خەڵکەکە دەڵێن بەر لەمە ئەم شوێنە مەزرا بووە و ساڵی ١٣٤٥ی هەتاوی بە دەست حاجی "حەسەن ئەحمەدی" ئاوەدان کراوەتەوە. حاجی حەسەن بۆ ماوەیەک بە تەنیا لەو شوێنە ژیاوە و بەرەبەرە کوڕەکانیشی هاتن و ماڵوحالی خۆیان لەوێ دامەزراندوە. پێشوو ئەم شوێنە بە "چۆپاندەرێ" و "حاجی حەمەحەسەن" دەناسرا، پاشان کاک "قەرەنی" کوڕەکەی حاجی حەسەن، وەک کەسێکی باوەڕپێکراوی دەوروبەر، لە ئاوەدانکردنەوە و بووژانەوەی زیاتری ئاوایی ڕۆڵی سەرەکی هەبووە و ئەو شوێنە بە "قەرەنی ئاوا" ناسرا. "قەرەنی ئەحمەدی" کە هەنووکە تەمەنی بۆتە ٦١ ساڵ، ئێستا وەک کوێخا و باوەڕپێکراوی ئاوایی هەر لەم شوێنە دەژی. ئەم ئاوایی‌یە ڕۆژ بە ڕۆژ ئاوەدانتر دەبێتەوە و جەماوەری پێوە زیاد دەبێ.
لە نزیک ٥٠٠ میتری ڕۆژاوای ئاوایی، جادەی سەرەکی مەهاباد ـ سەردەشت هەڵکەوتووە.
ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی 1380/03/02 کارەباکەی هەڵکراوە، بنکەی مخابەرات، گاوداری. بۆ بنکەی تەندروستی و وەرگرتنی نەوت و کەلوپەل سەر بە ئاوایی"کاوڵان"ی خوارێن. ئاوەی خواردنەوەی ئەم دێیە لوولەکێشیی نەکراوە.
بە هۆی نەبوونی مامۆستای قوتابخانە، قوتابییەکان دەستیان لە خوێندن هەڵگرتووە و هێندێکیان دەچنە ئاوایی "کاوڵان"ی سەرێ دەخوێنن.
وەرزێری، ئاژەڵداری، باخداری و کرێکاری کاروپیشەی خەڵکی ئەم گوندەیە. بەرهەمی وەرزێران گەنم، جۆ و نۆکە، ئاژەڵەکانیان مانگا، مەڕ و بزنن و بەرهەمی باخەکانیان سێوە.
بەرهەمی دارە خۆڕسکەکانیشن گێوژ، کرۆسک، سێوەتاڵەیە.
گرفتەکانی خەڵکی ئاوایی: خاکی بوونی ڕێگاوبان کە نزیک بە ٥٠٠ میترە تا سەر جادەی سەرەکی، نەبوونی پرد لە سەر ڕووبار، نەناردنی مامۆستا بۆ قوبخانە، نەبوونی شووڕای ئیسلامی.
خەڵکی ئاوایی مردووەکانیان لە گۆڕستانی "کاوڵان"ی سەرێ دەنێژن.

## قەشقوونەی خوارێ

ئەم ئاوایییە لە 41 کیلۆمیتری باشووری ڕۆژاوای شاری مەهاباد، بەشی خەلیفان و دێهستانی مەنگوڕی ڕۆژهەڵات و لە ناوچەی مەنگوڕایەتی هەڵکەوتووە. لە 7 ماڵ و 65 کەس پێکهاتووە، لەمانە 36 کەس پیاون و ۲۹ کەسیش ژنن، ژمارەی خوێندەوارانی ئەم ئاوایییە 39 کەسە کە 26 کەس پیاون و ۱۳ کەسیش ژنن، هەروەها لە ۱۹ کەسی نەخوێندەوار ٦ کەسیان پیاون و ۱۳ کەسیش ژنن.
پانتایی هەر دوو ئاوایی قەشقوونەی خوارێ و سەرێ بە یەکەوە حیساب کراوە کە 5072 هێکتارە، 62 هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و 5010 هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.
قەشقوونەی خوارێ خاوەن ۸۷/٤ هێکتار زەوی دێم، ٤۳/۷ هێکتار زەوی بەراو، ۱/۷۳ هێکتار باخ، ٤ تراکتۆر و ۱ لاوێردەیە.

ئاوایییەکانی دەوروبەر:
باشوور: ئاوایی باگردانی خوارێ
باکوور: ئاوایی قەشقوونەی سەرێ
ڕۆژهەڵات: ئاوایی مێرگەڕۆ
ڕۆژاوا: ئاوایی کورێ (سەر بە پیرانشار)

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:
باشوور: سووتەڵە و ئینجەدەرێ
باکوور: هەوار تاڵان
ڕۆژهەڵات: خورینج
ڕۆژاوا: سەردۆپ

کانی مسر، کانی سەرلێڕ و کانی حاجی قادری، چەند کانیاوی ئەم ئاوایییەن.
خانووبەرەکانی ئاوایی لە قوڕ و بەردە و میچەکانیان بە داران داپۆشراون، ماڵەکان حەوشەیان نییە و گشتیان ڕوو لە ڕۆژهەڵاتن، هێندێک لە ماڵەکان بەرەو هەوراز هەڵکەوتوون.
لە باشووری دێ ڕێگایەکی خاکی و سەخڵەت کە سەرەکیترین ڕێگای هامووشۆیە ئاوایی قەرەقاچ دەگرێتەوە،
لە باکوور ڕێگایەکی 1/5 کیلۆمیتری خاکی دەچێتەوە قەشقوونەی سەرێ، لە ڕۆژهەڵاتەوە ڕێگایەکی خاکی، دەڕواتەوە ئاوایی مێرگەڕۆ.
ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی 1382/07/04 کارەباکەی هەڵکراوە، بنکەی مخابەرات، قوتابخانەی سەرەتایی "غەفوور" (کوڕانە ـ کچانە)، بۆ بنکەی تەندروستی سەر بە ئاوایی "باگردان"ی خوارێن، نەوت و کەلوپەل لە ئاوایی "سیاقوڵ"ی خوارێ وەردەگرن.
ئاوی قەشقوونە لوولەکێشیی نەکراوە و ئاوەکەیان لە کانیاو و چاڵاو دابین دەبێ و کانی "بەردووکە" سەرەکیترین سەرچاوەیە.
قوتابیان زۆر بەدەگمەن هەڵدەکەوێ دوای تێپەڕ بوونی پۆلی سەرەتایی درێژە بە خوێندن بدەن.
ئاژەڵداری و وەرزێری کاروپیشەی خەڵکی ئەم گوندەیە. ئاژەڵەکانیان مەڕ، مانگا و بزنن؛ وەرزێران گەنم، نۆک و جۆ دەچێنن؛ بەرهەمی باخی ئەو دێیە سێوە.
ڕێگاوبانی یەکجار ناخۆش و سەخڵەت، نەبوونی ئاوی خواردنەوەی بێهداشتی و لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە، نەبوونی بینایەکی باش بۆ قوتابخانەی سەرەتایی، نەبوونی بنکەی تەندروستیی سەربەخۆ و نەبوونی شووڕای ئیسلامی بە هەر دوو ئاوایی قەشقوونەی سەرێ و خوارێ لە گرفتە سەرەکییەکانی خەڵکی ئەم گوندەیە.
لە ڕۆژهەڵاتی ئاوایی گۆڕستانێک هەیە بە ناوی شێخ "بایەزید بوستانی" کە هەر دوو ئاوایی قەشقوونەی سەرێ و خوارێ کەلکی لێ وەردەگرن.

## قەشقوونەی سەرێ

ئەم ئاوایی‌یە لە 42/5 کیلۆمیتری باشووری ڕۆژاوای شاری مەهاباد، بەشی خەلیفان و دێهستانی مەنگوڕی ڕۆژهەڵات و لە ناوچەی مەنگوڕایەتی هەڵکەوتووە. لە 6 ماڵ و 62 کەس پێکهاتووە، لەمانە 33 کەس پیاون و 29 کەسیش ژنن، ژمارەی خوێندەوارانی ئەم ئاوایی‌یە 28 کەسە کە ١٩ کەس پیاون و ٩ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٢٧ کەسی نەخوێندەوار ١١ کەس پیاون و ١٦ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی دەگەڵ قەشقوونەی خوارێ بەیەکەوە حیساب کراوە و ئێستا جیا نەکراوەتەوە.

قشقوونەی سەرێ خاوەن ٣٢ هێکتار زەوی دێم، ٢١/٩٥ هێکتار زەوی بەراو، ٢/٣ هێکتار باخ و ٨ تراکتۆرە.

ئاوایی‌یەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی قەشقوونەی خوارێ

باکوور: ئاوایی‌یەکانی قماریە (چۆڵ کراوە) و برایمە

ڕۆژهەلات: ئاوایی مێرگەڕۆ

ڕۆژاوا: ئاوایی کورێ (سەر بە پیرانشار)

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باشوور: سووتەڵە و ئینجەدەرێ

باکوور: هەوارتالآن

ڕۆژهەلات: خورینج

ڕۆژاوا: سەردۆپ

سەر لێڕ، تاقە گولان و کانی مالان لە ناودارترین کانیاوەکانی قەشقوونەی سەرێن.

خانووبەرەکانی ئەم ئاوایی‌یە گشتی لە قوڕ و بەردە و میچەکانیان لە دارە، ماڵەکان بەرەو هەوراز هەڵکەوتوون و ڕوو لە ڕۆژهەڵات ساز کراون و هیچیان حەوشەیان نییە. ئەم دێیە پێشتر مەزرای قەشقوونەی خوارێ بووە؛ پاشان کە ئاغاکانی قەشقوونەی خوارێ هەر کام ماڵە خۆیان کرد، ئەم مەزرایە بە هێندێک لە برایان بڕا و ئەوانیش کردیان بە ئاوایی و تێیدا نیشتەجێ بوون.

خوشکە "خەیاڵ محەممەدی" تەمەن ٧١ ساڵ و دانیشتووی ئاوایی "سمێنوو" ئاوا لە قەشقوونەی خوارێ دەگێڕێتەوە: "ئەو کات بابم و مامەکانم ئاغای قەشقوونە بوون بە یەکەوە لە ماڵێکدا دەژیان، پاشان وای لێهات کە ماڵە خۆیان کرد و مەزرای باشووری ماڵانمان وەبەر کەوت و بابم هات ئەوێی ئاوەدان کردەوە. ئەو دەمی من منداڵ بووم و بەوێشمان هەر دەکوت قەشقوونە، بەڵام چونکە شوێنەکەی ئێمە لە قەشقوونە بەرزتر بوو، خەڵکەکە بەو شوێنەی ماڵەکەی ئێمەی لێبوو پێیان دەکوت قەشقوونەی سەرێ و بە ماڵە مامەکانمیان دەکوت قەشقوونەی خوارێ. قەشقوونەی خوارێ وەبیرە کەس نایە لەوەتی باس دەکرێ هەر دێ بووە".

دەتوانین بڵێین مێژووی قەشقوونەی سەرێ دەگەڕێتەوە نێوان ساڵەکانی 1325- 1326ی هەتاوی و مام "بایز محەممەدی" ناسراو بە "کا بایزی قەشقوونە" ئەو ئاوایی‌یەی ئاوەدان کردۆتەوە.

لە باشووری دێ ڕێگایەکی خاکی نزیک بە 1/5 کیلۆمیتری دەچێتەوە ئاوایی قەشقوونەی خوارێ، لە ڕۆژهەڵاتەوە ڕێگایەکی خاکی و سەخڵەت بۆ ئاوایی مێرگەڕۆ دەڕوا.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی 1382/07/06 کارەباکەی هەڵکراوە، بنکەی مخابەرات، قوتابخانەی سەرەتایی (کوڕانە ـ کچانە) بە ناوی"سەتتار". بۆ وەرگرتنی نەوت سەر بە ئاوایی "سیاقۆڵ"ی خوارێن و کەلوپەل لە ئاوایی "سێلم" وەردەگرن. هەروەها بۆ کاروباری پێوەند بە بنکەی تەندروستی دەچنە ئاوایی "باگردان"ی خوارێ. خەڵک ئێستاش وەک زوو بۆ کەلک وەرگرتن لە ئاوی خواردنەوە لە کانیاو ئاو دێنن کە لەم ئاوایی‌یە "کانی مالان" زۆرترین کەلکی بۆ خەڵک هەیە.

زۆربەی قوتابیان لەم دێیە پاش تێپەڕ بوونی پۆلی سەرەتایی دەست لە خوێندن هەڵدەگرن، ئەوانەی کە درێژەش بە خوێندن دەدەن هەر کوڕەکانن.

خەڵکەکەی بە ئاژەڵداری و وەرزێری خەریکن، زۆربەیان مەڕیان هەیە، مانگا و بزنیش ڕادەگرن. وەرزێران گەنم و جۆ دەچێنن.

ڕێگاوبانی ناخۆش، نەبوونی مزگەوت، نەبوونی شووڕا، نەبوونی بنکەی تەندروستیی سەربەخۆ، نەبوونی بینا بۆ قوتابخانە و لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە، سەرەتایی‌ترین گرفتەکانی خەڵکی قەشقوونەی سەرێن.

کۆنەگۆڕستانێک لە ڕۆژهەڵاتی ئاوایی هەیە بە ناوی مەلا "برایم" کەچی خەڵکی ئاوایی مردووەکانیان لە گۆڕستانی شێخ "بایەزیدی بوستانی" لە قەشقوونەی خوارێ دەنێژن.

## قەڵات

قەڵات لە ٢٢ کیلۆمیتری ڕۆژهەڵاتی شاری مەهاباد، بەشی ناوەندی و دێهستانی ئاختاچی ڕۆژاوا و لە ناوچەی محاڵ هەڵکەوتووە. لە ٥ ماڵ و ٣٣ کەس پێکهاتووە، لەمانە ١٤ کەس پیاون و ١٩ کەسیش ژنن، ژمارەی خوێندەوارانی ئەم ئاواییە ١٤ کەسە کە ٥ کەس پیاون و ٩ کەسیش ژنن، هەروەها لە ١٢ کەسی نەخوێندەوار ٤ کەس پیاون و ٨ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی 342/3 هێکتارە، لەمە ١٤١ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و 201/3 هێکتار پاوان و لەوەرگەی دێیە.

قەڵات خاوەن ٦٣ هێکتار زەوی دێم، ٣٤/٥ هێکتار زەوی بەراو، ٢٢ هێکتار باخ و ٤ تراکتۆرە.

ئاواییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاواییەکانی حەوتەوانان و سارەوانان

باکوور: ئاوایی بەسری

ڕۆژهەڵات: ئاواییەکانی قەرەبڵاغ و دەرمان

ڕۆژاوا: ئاواییەکانی سەیداوا و پیربەلە

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باکوور: شێخ حەسەن بەسری

ڕۆژهەڵات: حەوت برایان

ڕۆژاوا: چاکەچکۆڵە

گوڵبەندان، گۆلی ئاغا و پلووسکێ کانیاوە بەناوبانگەکانی ئاوایین.

خانووبەرەکانی ئاوایی جگە لە مزگەوت هەموویان هەر بە شێوازی کۆن ساز کراون، مزگەوت لە ناوەندی ئاواییە. خانووبەرەکان ڕوو بە ڕۆژهەڵات و باکوور ساز کراون و باخەکان لە خوارەوەی ئاوایی لە لای باشووری ڕۆژاوا هەڵکەوتوون، ماڵەکان حەوشەیان هەیە و دەروازەیان تێگیراوە. هەر لە قەراغ ئاواییڕا دیمەنێکی جوان و سرنجڕاکێشی شاری مەهاباد دەردەکەوێ.

لە باشووری قەڵات ڕێگایەکی خاکی، ئاواییەکانی سارەوانان و حەوتەوانان دەگرێتەوە، لە باکوورەوە ڕێگایەکی خاکی بۆ ئاوایی بەسری دەڕوا.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی 1387/12/25 کارەباکەی هەڵکراوە، بنکەێ مخابەراتی، مزگەوت (ساڵی ١٣٨٦ی هەتاوی نۆژەن کراوەتەوە) و قوتابخانەی سەرەتایی (کوڕانە ـ کچانە) بە ناوی "شەکوور". خەڵکی ئاوایی بۆ کاروباری بنکەی تەندروستی سەر بە ئاوایی "لاچین"ن و نەوت و کەل- وپەلەکەیان لە شەریکەی هاوبەشیی "پشتتەپ" لە شاری مەهاباد وەردەگرن. ئاوی ئەم گوندە لە کانیاو دابین دەبێ و لوولەکێشییان بۆ حەوشەی ماڵەکانیان کردووە.

قوتابیان لە دوای پۆلی سەرەتایی زۆر کەم هەڵدەکەوێ درێژە بە خوێندن بدەن.

وەرزێری، ئاژەڵداری و باخداری کاروپیشەی خەڵکی قەڵاتە. وەرزێران گەنم، جۆ و نۆک دەچێنن و ئاژەڵەکان بریتین لە: مەڕ، مانگا و بزن، هەروەها بەرهەمی باخەکانیان سێو، بادام و ترێیە.

گرفتەکانی خەڵکی ئاوایی: گرفتی ئاو، ڕێگاوبانی خاکی و ناخۆش، نەبوونی شووڕای ئیسلامی و هێندێک ساڵ مامۆستای قوتابخانەیان نادەنێ و منداڵەکانیان لە خوێندن وەپاش دەکەون.

لە باکووری ئاوایی، گۆڕستانی "چاکەچکۆڵە" هەیە کە ئێستا مردووی لێ نانێژن، بەڵکوو لە گۆڕستانی هاوبەشی سارەوانان و حەوتەوانان کەلک وەردەگرن.

## قەڵاتی سنان

ئەم ئاوایی‌یە لە ٤٢ کیلۆمیتری باشووری ڕۆژاوای شاری مەهاباد، بەشی خەلیفان و دێهستانی مەنگوڕی ڕۆژهەڵات و لە ناوچەی مەنگوڕایەتی هەڵکەوتووە. لە ٩ ماڵ و ٤٠ کەس پێکهاتووە، لەمانە ٢٤ کەس پیاون و ١٦ کەسیش ژنن، ژمارەی خوێندەوارانی ئەم دێیە ٣٠ کەسە کە ٢٠ کەس پیاون و ١٠ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٨ کەسی نەخوێندەوار ٣ کەسیان پیاون و ٥ کەسیش ژنن.

ئەو دێیە لە ٥٠٥ هێکتار پێک هاتووە کە ٣٤/٥ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و ٤٧٠ هێکتار پاوان و لەوەرگەی دێیە.

قەڵاتی سنان خاوەن ٢١/٥ هێکتار زەوی دێم، ٤٠/٥ هێکتار زەوی بەراو، ٥/٢٠ هێکتار باخ و ١ لاوێردەیە.

ئاوایی‌یەکانی دەوروبەر:

باشوور: دوو ئاوایی چۆڵکراوی کۆخان و لەموونج

باکوور: ئاوایی سەرتەنگ

ڕۆژهەڵات: ئاوایی سێروو

ڕۆژاوا: گوندە چۆڵکراوەکانی مەزرای چۆمان و ئاوایی نێڵان

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باشوور: کێوی ڕەزی‌مامە

باکوور: شی‌باخەڵ

ڕۆژهەڵات: خەتیب

ڕۆژاوا: قەڵاتی شای

لەم دێیە خانووبەرەکان بە گشتی لە قوڕ و بەرد و میچی دار ساز کراون، زۆربەی ماڵەکان حەوشەیان نییە و بەرەو باشوور هەڵکەوتوون، کۆڵانەکان ڕێک نین و نەختێک هەورازن.

قەڵاتی سنان خاوەن هێندێک داری بادامەکێوی، هەرمێ و بەڕوویە.

کانیاوەکان بە ڕەزی مامە، ڕەشە، ڕەپاڵ و خەتیب ناسراون.

لە نزیک دێ شوێنێکی لێیە بە ناوی "قەڵاتی سنان" و ڕوون نییە هی چ سەردەمێکە و ناوی ئاواییش هەر لەم قەڵاتە وەرگیراوە، بەڵام پاشگری "سنان" هیچ مانایەکی بۆ نەدۆزراوەتەوە، بەڵام هێندێک بیر و بۆچوون هەیە بۆ وێنە دەڵێن کە "سنان" ناوی جۆرە نەخۆشییەکی یەکسم بووە.

لە باکووری ڕۆژهەڵاتی ئاوایی ڕێگایەکی خاکی دەگاتە دووڕییانێک، یەکیان بەرەو باکوور دەچێ و ئاوایی‌یەکانی سەرتەنگ و سەرهۆڵان دەگرێتەوە، ئەوی دیکەیان دەچێتەوە باکووری ڕۆژهەڵات بۆ ئاوایی سێروو، لە ڕۆژاواش ڕێگایەکی خاکی هەیە کە ئاوایی چۆڵکراوی مەزرای چۆمان دەگرێتەوە.

ئیمکاناتی ئاوایی: ساڵی ١٣٨٢ کارەباکەی هەڵکراوە، بنکەی مخابەرات، قوتابخانەی سەرەتایی (کوڕانە ـ کچانە) بە ناوی "مونتەزیم" کە لە قوڕ و بەردە. خەڵکی قەڵاتی سنان بۆ وەرگرتنی کەلوپەل و نەوت سەر بە ئاوایی "سیاقوڵ"ی خوارێن و بۆ بنکەی تەندروستیش دەبێ ڕێگای "باگردان"ی خوارێ بپێون. ئاوی خواردنەوەی ئەم دێیە لوولەکێشیی نەکراوە و ماڵەکان یان چاڵاوی لێداوە یان لە کانیاوی "ڕەپاڵ" کەلک وەردەگرن. خوێندکاران لە دوای پۆلی پێنجەمی سەرەتایی پێیان ناخوێنن.

ئاژەڵداری، وەرزێری و کرێکاری کاروپیشەی خەڵکی ئەو گوندەن، ئاژەڵەکان مەڕ و بزنن، وەرزێرانیش گەنم، نۆک و جۆ دەچێنن، چەند باخێکی لێیە کە بەرهەمەکانیان سێو، قەیسی و هڵوویە.

وەک ناسراوترین کەسایەتی ئەم دێیە، "هەمزاغای مەنگوڕ"ە کە لەم دێیە نیشتەجێ بووە.

ئەم دێیە سێ گۆڕستانی لێیە، دوویان کۆنەگۆڕەستانەکانی "داپیرە" و "چاکی زێوە" و هەروەها گۆڕستانێک کە تازەیە.

گرفتەکانی خەڵکی ئاوایی: ڕێگای ناخۆش، نەبوونی بنکەی تەندروستیی سەربەخۆ، نەبوونی بینایەکی باش بۆ قوتابخانە، نەبوونی مزگەوت.

## قەڵاجۆغە (محاڵ)

قەڵاجۆغە لە ٣٩ کیلۆمیتری ڕۆژهەڵاتی شاری مەهاباد، بەشی ناوەندی و دێهستانی ئاختاچی ڕۆژاوا و لە ناوچەی محاڵ هەڵکەوتووە. لە ٣٣ ماڵ و ١٦٢ کەس پێکهاتووە، لەمانە ٧٧ کەس پیاون و ٨٥ کەسیش ژنن، ژمارەی خوێندەوارانی ئەم ئاواییە ٩٢ کەسە کە ٤٩ کەس پیاون و ٤٣ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٥٦ کەسی نەخوێندەوار ٢٠ کەس پیاون و ٣٦ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی 642/8 هێکتارە، لەمە 242/8 هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و ٤٠٠ هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.

ئەو ئاواییە خاوەن ٢٣٣ هێکتار زەوی دێم، ١٢١ هێکتار زەوی بەراو، ٣٠ هێکتار باخ و ٨ تراکتۆرە.

ئاواییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی یالاوەی خوارێ

باکوور: ئاوایی قۆرغان

ڕۆژهەڵات: ئاوایی ئۆتەمیش

ڕۆژاوا: ئاوایی کانی کەوتێر

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باکوور: قەدی قەڵاجۆغە

باکووری ڕۆژهەڵات: گردی بێریان

ساردان و ژنان دوو کانیاوی بەناوبانگی ئاوایین.

ماڵەکان بە گشتی لە قوڕ و بەردە و مێچەکان لە دارن، لەو ئاواییەدا هێندێک کۆڵانی درێژ و ڕێک دەبیندرێن، ماڵەکان ڕوویان لە ڕۆژهەڵات و باشوورە. جێگای ئامازەیە هەر لە شاری مەهاباد و لە دێهستانی کانی بازاڕ گوندێکی دیکە هەر بەم ناوە هەیە.

تەپۆڵکەی "قەڵاجۆغە" بە ژمارەی تۆمارکراوی ١٥٩٨٩ لە لایەن میراتی فەرهەنگی بە بەرزایی ١٥٨٠ میتر لە ڕووکەشی زەریاکان، مێژوویەکەی دەگەڕێتەوە قۆناغی برۆنز ـ هەزارەی یەکەمی پێش زایین، سەدەی ٤ تا ٦ی کۆچی مانگی.

تەپۆڵکەیەکی دیکە هەر بە ناوی "قەڵاجۆغە" بە ژمارەی تۆمارکراوی ١٦٦٣٤ لە میراتی فەرهەنگی بە بەرزایی ١٥٨٠ میتر لە ڕووکەشی زەریاکان، مێژوویەکەی دەگەڕێتەوە هەزارەی هەوەڵی پێش زایین. "قەڵاجۆغە" بە مانای قەڵایێکی بچووکە.

لە باشووری ئاوایی ڕێگایەکی خاکی هەیە کە دەچێتەوە یالاوەی خوارێ، لە باکوورەوە ڕێگایەکی قیلەتاو ئاوایی قۆرغان دەگرێتەوە، لە ڕۆژهەڵاتەوە ڕێگایەکی خاکی دەچێتەوە ئاواییەکانی ئۆتەمیش و شێخاڵی، لە ڕۆژاواوە ڕێگایەکی قیلەتاو بەرەو ئاوایی کانی کەوتێر دەچێ.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی 1369/10/19 کارەباکەی هەڵکراوە، سیمکارتی مخابەراتی دێهات، مزگەوتی"محەممەد ڕەسووڵەڵڵا" کە ساڵی ١٣٧٩ نۆژەن کراوەتەوە، قوتابخانەی سەرەتایی "موقەدەس" (کوڕانە ـ کچانە)، شەریکەی هاوبەشیی نەوت و هەروەها ئاوایی لە شووڕای ئیسلامی بەهرەمەندە. بۆ کاروباری بنکەی تەندروستی سەر بە ئاوایی "قۆرغان"ن و کەلوپەلی پێویست لە ئاوایی "عیساکەند" وەردەگرن.

هێندێک لە قوتابیانی ئاوایی بۆ درێژەدان بە خوێندن ڕوو لە ئاوایی ئۆتەمیش، گۆکتەپە و شارەکانی مەهاباد و بۆکان دەکەن، لەم ئاواییە بەدەگمەن کچان دەتوانن درێژە بە خوێندن بدەن.

وەرزێری، ئاژەڵداری، کرێکاری و باخداری کاروپیشەی خەڵکی ئەو گوندەن. وەرزێران گەنم و جۆ دەچێنن، ئاژەڵەکانیان مەڕ، مانگا و بزنن و بەرهەمی باخەکان سێو، قەیسی و ئاڵووباڵوویە.

گرفتەکانی خەڵکی ئاوایی: نەبوونی لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە، نەبوونی بنکەی تەندروستیی سەربەخۆ.

گۆڕستانەکەی ئاوایی لە بەری ڕۆژاوا هەڵکەوتووە.

## قەڵاجۆغە (مەنگوڕ)

ئەم ئاوایی‌یە لە ٣٥ کیلۆمیتری باشووری ڕۆژهەڵاتی شاری مەهاباد، بەشی خەلیفان و دێهستانی کانی بازاڕ و لە ناوچەی مەنگوڕایەتی هەڵکەوتووە.
لە ٣٣ ماڵ و ٢٣٥ کەس پێکهاتووە، لەمانە ١١٥ کەس پیاون و ١٢٠ کەسیش ژنن، لە ١٢٤ کەسی خوێندەوار ٧٤ کەس پیاون و ٥٠ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٨٤ کەسی نەخوێندەوار ٣١ کەسیان پیاون و ٥٣ کەسیش ژنە.
پانتایی ئاوایی ٦٤٩٢/٣٣ هێکتارە، لەمە ٣٩٢/٣٣ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و ٦١٠٠ هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.
قەڵاجۆغە خاوەن ٢٥٠ هێکتار زەوی دێم، ٩٥ هێکتار زەوی بەراو، ٤ هێکتار باخ و ١٦ تراکتۆرە.

ئاوایی‌یەکانی دەوروبەر:
باشوور: ئاوایی کیتکە
باکوور: ئاوایی‌یەکانی خڕەجۆ، کامەم
ڕۆژهەڵات: ئاوایی‌یەکانی کانی میران، شیخ یۆسف
ڕۆژاوا: ئاوایی‌یەکانی گەنەدار، کامەم

چیاکانی دەورووبەری ئاوایی:
باشوور: گۆمەدەڵاو
باکوور: قامیشە، ویشکەشیو
ڕۆژهەڵات: سورماتان
ڕۆژاوا: گۆمەدەڵاو

کانیاوەکان بە کانی شاخی ڕەش و ویشکەشیو ناسراون.
خانووەکان لە بەرد و قوڕن و میچیان لە دارە، بەشێکی زۆر لە ماڵەکان خاوەن حەوشەن و کۆڵانەکان ئاڵۆز و هێندێکیان هەوراز هەڵکەوتوون. ناوی ئەو دێیە بە مانای قەڵای بچووکە.
ئاسەواری مێژوویی لە قەڵاجۆغە: قەڵای نێو ماڵان "قەڵاجۆغە"، کێلەژن: کێلێکی بلیند بوو لە نێو گۆڕستان کە لەم ساڵانەدا بە تاڵان چوو.
لە باشووری قەڵاجۆغە ڕێگایەکی خاکی ئاوایی کیتکە دەگرێتەوە و ئەمە تەنیا ڕێگای هاموشۆی ئاوایی‌یە.
ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی ١٣٧٢/٨/١٥ کارەباکەی هەڵکراوە، سیمکارتی مخابەراتی دێهات، قوتابخانەی سەرەتایی (کوڕانە - کچانە) بەناوی "مەرزییە"، مزگەوتی "نەبی‌ئەکرەم" کە هەر چەند دوو جاران چاکیان کردۆتەوە، بەڵام دیسان دیوارەکانی قەڵشیون و پێویستی بە نۆژەن کردنەوەیە.
هەروەها ئەم دێیە، دێهیاری و شووڕای ئیسلامی هەیە. بۆ بنکەی تەندروستی و وەرگرتنی نەوت، گازۆڵ و کەلوپەل سەر بە ئاوایی "کیتکە"ن.
خوێندکاران بۆ درێژەپێدان بە خوێندن هەڵبەت زیاتر کوڕەکان ناچارن ڕوو بکەنە مەهاباد و ناوچەی خەلیفان. ئێستاش لە قەڵاجۆغە ئەو مافە کەمتر دراوە بە کچان تا بخوێنن، بەڵام هێندێک بنەماڵە هەن کە بە کچەکانیان دەخوێنن.
کاروپیشەی خەڵکی ئاوایی وەرزێری و ئاژەڵدارییە ، وەرزێران گەنم، جۆ، نۆک و نیسک دەچێنن و ئاژەڵەکانیان مەڕ و مانگان.
گرفتەکانی خەڵکی ئاوایی: بینای قوتابخانە ڕووخاوە و ژوورێکی بچووکیان لە تەنیشت قوتابخانەکە ئاوەدان کردۆتەوە و قوتابیەکان لەوێدا دەخوێنن. قەڵاجۆغە چەند خڕێکی لێیە کە چەند جارێک لافاویان پێدا هاتووە و زەرەدی ماڵی بۆ خەڵکی ئاوایی هەبووە.
قەڵاجۆغە گرفتی ئاوی خواردنەوەی هەیە، ئاوەکەیان لە چاڵاو و کانیاوەکان دابین دەبێ و پێویستیان بە لوولەکێشیی ئاوە.
گۆڕستانی قەڵاجۆغە زۆر کۆنە و بە "کێلەژن" بەناوبانگە.
خودالێخۆشبوو شمشاڵژەنی هونەرمەند وەستا "عەلای مام وسێنی" لەم دێیە ژیاوە.

## قەمتەرە

قەمتەرە لە ٢٢ کیلۆمیتری ڕۆژهەڵاتی شاری مەهاباد، بەشی ناوەندی و دێهستانی ئاختاچی ڕۆژاوا و لە ناوچەی محاڵ هەڵکەوتووە. لە ٧٠ ماڵ و ٣٧٠ کەس پێکهاتووە، لەمانە ١٧٥ کەس پیاون و ١٩٥ کەسیش ژنن، ژماری خوێندەوارانی ئەم ئاوایییە ٢٣٢ کەسە کە ١١٧ کەس پیاون و ١١٥ کەسیش ژنن، هەروەها لە ١٠٣ کەسی نەخوێندەوار ٣٧ کەس پیاون و ٦٦ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی 2449/5 هێکتارە، لەمە 749/5 هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و ١٧٠٠ هێکتار پاوان و لەوەرگەی دێیە.

قەمتەرە خاوەن ١١٥/٥ هێکتار زەوی دێم، ٢٩٠ هێکتار زەوی بەراو، ٤١ هێکتار باخ و ٢٦ تراکتۆرە.

ئاوایییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی کولیجە

باکوور: ئاوایی حاجیاڵیکەند

ڕۆژهەڵات: ئاوایی بورهان

ڕۆژاوا: ئاوایییەکانی دەرمان و قزڵجەی خوارێ

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باشوور: دۆڵی گەورە

باکووری ڕۆژهەڵات: سووڵتان

ڕۆژاوا: دۆڵی سەرچاوە

سەرچاوە، گۆلەدرێژە، کونەپشیلە و قەمتەرە، کانیاوە بەناوبانگەکانی ئەم ئاوایییەن.

خانووەکانی ئاوایی لە قوڕ و بەرد یان بلوک و خشتەن، میچی ماڵەکان زۆربەی هەر لە دارە. گشت ماڵەکان حەوشەیان هەیە کە دەروازەی تێگیراوە. بەشێک لە کۆڵانەکانی ئاوایی ڕێکوپێک و بەشێکیش ناڕێکن، ماڵەکان لە دەوری یەک ساز کراون، زۆربەیان بەرەو ڕۆژهەڵاتن. کانی "سەرچاوە" بە ناوەندی ئاوایی‌دا تێپەڕ دەبێ و ئاوێکی زۆری هەیە کە خەڵک بۆ کشتوکاڵ کەلکی باشی لێ وەردەگرن. سەبارەت بە ئاوەدان کردنەوەی ئاوایی زانیارییەکمان لە بەر دەستدا نییە، تەنیا ئەو باسە هەیە کە ئەم ئاوایییە لە پێشدا مەزرای ئاوایی بورهان بووە و پاشان ئاوەدان بۆتەوە. لە لاپەڕەی٥٨٧ی "هەنبانەبۆرینە"دا، ئەستوونی هەوەڵ، سەبارەت بە "قەمتەرە" نوسراوە: ١. ئاوبارە ٢. گوندێکە لە کوردستان و لە فەرهەنگی "کوردستان"ی گیو موکریانی‌دا لاپەڕەی ٧٠٠ ئەستوونی دووەم نووسراوە: قەمتەرە: لە شێوەی موکریانی کۆن‌دا ئاوێکە وەسەرەوەی پردی بکەوێ و بە سەریشی‌دا تێپەڕێ، بە گرتنی جۆگەلە ئاوا بە قات قات بەرد و گەڵا و گیا و پلووسک دانانە لە هەموو چینێکیدا تا ئاو بە هێواشی داڕژێتە خوارەوە و زەوییەکەی دانەدرێ.

تەپەی قەڵای قەمتەرە بە ژمارەی تۆمارکراوی ١٥٨٩١ لە لایەن بەڕێوەبەرایەتی میراتی فەرهەنگی، بە بەرزایی ١٨٢٧ میتر لە ڕووکەشی زەریاکان و لە باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاوایی هەڵکەوتووە کە مێژوویەکەی دەگەڕێتەوە سەدەی ٤ تا ٦ی کۆچی مانگی.

لە باکووری ئاوایی ڕێگایەکی یەک کیلۆمیتری قیلەتاو هەیە کە تێکەڵ بە ڕێگایی سەرەکی (مەهاباد ـ بۆکان) ـ ڕێگەی بورهان ـ دەبێتەوە.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی١٣٥٨/٩/٧ کارەباکەی هەڵکراوە، لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە (عەنباراوەکەی هەر لەم گوندەیە و ئاوەکەی لە کانی گۆلەدرێژە دابین دەبێ)، سیمکارتی مخابەراتی دێهات، بنکەی تەندروستی، دەرمانگا (١٣٧٣هـ)، قوتابخانەی سەرەتایی "بیلال" (کوڕانە ـ کچانە)، قوتابخانەی ناوەندی "نوور"، دێهیاری (ساڵی ١٣٨٨)، مزگەوتی "ئیمامی عومەر" کە ساڵی ١٣٧٦ نۆژەن کراوەتەوە و هەروەها ئاوایی لە دێهیاری و شووڕای ئیسلامی بەهرەمەندە. بۆ وەرگرتنی نەوت و کەلوپەل سەر بە شەریکەی هاوبەشیی ئاوایی "بورهان"ن. قوتابیان بۆ درێژەدان بە خوێندن ڕوو دەکەنە گۆکتەپە و شاری مەهاباد.

وەرزێری، ئاژەڵداری، باخداری، کرێکاری و بە ڕادەیەکی کەمیش مێشداری، کاروپیشەی خەڵکی ئەم گوندەیە، وەرزێران گەنم، جۆ و نۆک دەچێنن، ئاژەڵەکانیان مەڕ، مانگا و بزنە، بەرهەمی باخەکانیان سێوە.

گرفتەکان: بەڕێوەنەچوونی گەڵاڵەی هادی.

گۆڕستانی ئاوایی لە ڕۆژهەڵات هەڵکەوتووە و بە گۆڕستانی "پشتماڵان" ناسراوە. خەڵکی ئاوایی بۆ ناشتنی مردووەکانیان لە گۆڕستانی "باب ڕۆستەم" هەڵکەوتوو لە ئاوایی "کولیجە"ش کەلک وەردەگرن. "عەزیزی حەیزە خرە"ی (گۆرانی‌بێژ) هونەرمەندێکی بەتوانای ئەم ئاوایییە بووە. هەروەها پیرێژنێکی ئەم ئاوایییە دەڵێ هونەرمەندی ناودار خاتوو "مەنیجە دەفی" ناسراو بە "مەنیج حەیران" لەم گوندە لە دایک بووە.

## کارگ

کارگ له ٥٢ کیلۆمیتری باشووری ڕۆژاوای شاری مەهاباد، بەشی خەلیفان و دێهستانی مەنگوڕی ڕۆژهەڵات و له ناوچەی مەنگوڕایەتی هەڵکەوتووە.
له ١١ ماڵ و ٨٦ کەس پێکهاتووە، لەمانە ٤٣ کەس پیاون و ٤٣ کەسیش ژنن، ژمارەی خوێندەوارانی ئەم ئاوایییە ٤٠ کەسە که ٢٧ کەس پیاون و ١٣ کەسیش ژنن، هەروەها له ٣١ کەسی نەخوێندەوار ١١ کەس پیاون و ٢٠ کەسیش ژنن.
پانتایی ئاوایی ١٨١٠ هێکتارە، لەمە ٣١٠ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و ١٥٠٠ هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.
کارگ خاوەن ٩٥/٥ هێکتار زەوی دێم، ٨٣/٢ هێکتار زەوی بەراو، ٤/٣١ هێکتار باخ و ٤ تراکتۆرە.

ئاوایییەکانی دەوروبەر:
باشوور: ئاوایییەکانی شەکربەگ، گاگەشی سەرێ و خوارێ
باکوور: ئاوایییەکانی بێهەنگوین و ئەسحاب
ڕۆژهەڵات: ئاوایییەکانی هەرمێ و میرەسێ
ڕۆژاوا: ئاوایییەکانی شارستێن و کانی کلێ (سەر به پیرانشار)

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:
باشوور: شاخی سپی و بنەخوێ
باکوور: سەرخیزان و ئالۆک
ڕۆژهەڵات: شاخەڕەشە
ڕۆژاوا: پیرەسەنان

له بەری باشووری ئاوایی ئەشکەوتێک به ناوی "شاخەسپی" هەڵکەوتووە.
پیرەسەنان، هەوارخەمە، بەردە کەشک و سەرخیزان، کوێستانە بەناوبانگەکانی ئاوایین.
کوێچکەدەرێ، مووسا قەڵلان، مەشکەهەڵدێر، کانی ژنان، کانی پیاوان و درۆزنە، چەند کانیاوێکی ئەم دێیەن.
خانووبەرەکانی له قوڕ و بەردن و میچیان له دارە که له خانووبەرەکانی نوێدا بلووک دەکار کراوە. کۆڵانێکی درێژ تا کۆتایی ئاوایی دەچێ و ماڵەکان هەمووی له ریزێک و له تەنیا کۆڵانی گوند هەڵکەوتوون و ڕوویان له شاخەسپییە، حەوشەیان نییە و زۆریان خاوەن پێشخانە یا هەیوانن.
له یەک کیلۆمیتری ئاوایی شوێنەوارێک هەیە که وێدەچێ زوو ئاوایی بووبێ، ئەم شوێنە تەندووری لێ دۆزراوەتەوە هەروەها له ڕۆژاوای ئاوایی قەڵایەک به ناوی قەڵای "خرێ لووێ" هەیە. ناودێر کردنی ئەم گوندە دەگەڕێتەوە سەر ئەوەی که ئەو ناوچەیە هەر له کۆنەوە کانگای پنجاڕ و گیای وەکوو: هەڵز، بیزا، مەندۆک، کیفۆک و بەتایبەت کارگ بووە و ناوچەیەکی کوێستانییە.
له ڕۆژهەڵاتی دێ ڕێگایەکی خاکی سەخڵەت بۆ ئاوایی هەرمێ دەڕوا، له ڕۆژاوا چەند کوێرەڕێگای خاکی و یەکجار سەخڵەت هەنە که دەچێتەوە کانگای بەردەکان و ئاوایییەکانی شارستێن و کانی کلێ.
ئیمکاناتی ئاوایی: ساڵی ١٣٨٤ کارەباکەی هەڵکراوە، بنکەی مخابەرات، قوتابخانەی سەرەتایی (کوڕانە ـ کچانە) به ناوی حاجی "ئیبراهیم بایەزیدی" و مزگەوت (ساڵی ١٣٨٥ی هەتاوی له بلووک و چیمەنتۆ ساز کراوە). بۆ کەلک وەرگرتن له بنکەی تەندروستی، وەرگرتنی نەوت و کەلوپەل سەر به ئاوایی "میرەسێ"ن. زۆربەی قوتابیان پاش تیپەڕ کردنی پۆلی سەرەتایی دەست له خوێندن هەڵدەگرن.
ئاژەڵداری، وەرزێری، باخداری، مێشداری و کرێکاری له کانگاکانی بەرد، کاروپیشەی خەڵکی ئەم گوندەیە.
ئاژەڵەکان بریتین له: مەڕ، مانگا و بزن ، وەرزێران گەنم و نۆک دەچێنن و بەرهەمی باخەکان سێو، قەیسی و هڵوویە.
ئەم ئاوایییە خاوەن چوار کانگای بەردە که چەند کەسی ئاوایی وەک کرێکار تێیدا کار دەکەن.
گرفتەکانی خەڵکی ئاوایی: ڕێگاوبانی سەخڵەت و خاکی، نەبوونی بنکەی تەندروستیی سەربەخۆ، پێویستی به لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوەیە، نەبوونی شووڕای ئیسلامی.
گۆڕستانی ئاوایی له ڕۆژاوای دێ هەڵکەوتووە و خەڵکی ئاوایی "هەرمێ"ش کەلکی لێ وەردەگرن.

# کامەم

کامەم لە ٣١ کیلۆمیتری باشووری شاری مەهاباد، بەشی خەلیفان و دێهستانی مەنگوڕی ڕۆژهەڵات و لە ناوچەی مەنگوڕایەتی هەڵکەوتووە. ١٦ ماڵ و ٩٨ کەس پێکهاتووە، لەمانە ٤٣ کەس پیاون و ٥٥ کەسیش ژنن، لە ٥٨ کەسی خوێندەوار ٣١ کەس پیاون و ٢٧ کەسیش ژنن، لە ٢٨ کەسی نەخوێندەوار ١٠ کەس پیاون و ١٨ کەسیش ژنە.

پانتایی ئاوایی ٢٦٥٠ هێکتارە، لەمە ١٨٨ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و ٢٤٦٢ هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.

کامەم خاوەن ٣٥٠/١ هێکتار زەوی دێم، ٩٠/٢ هێکتار زەوی بەراو، ٤٠/٧٢ هێکتار باخ، ٩ تراکتۆر و ٢ لاوێردەیە.

ئاواییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی گەنەدار

باکوور: ئاوایی دۆڵپەمۆ

ڕۆژهەڵات: ئاوایی خرەجۆ

ڕۆژاوا: ئاوایی ڕفتە

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باشوور: جەواڵەڕەشان

باکوور: بەندنی عەلیبابا

ڕۆژهەڵات: قارەمان

ڕۆژاوا: گێوژە

کانیاوەکانی ئاوایی بریتین لە: گۆلە غەریبە، گۆلی سەید ڕەحمان، گۆلی گرژاڵی، گۆلی گەورە، کانی خۆڵاوی، کانی جەواڵەڕەشان.

خانووبەرەکانی کامەم لە قوڕ و بەردن و میچەکانیان لە دارە، حەوشەیان هەیە و بەرەو ڕۆژهەڵات و باشوور هەڵکەوتوون.

ئەو ئاواییە وەکوو بەساڵاچووان دەگێڕنەوە زوو کە ئاوەدان بووە وردەوردە چۆل کراوە؛ کەچی لە لایەن ئاغاکانەوە ئاوەدان کراوەتەوە، شەش ئاغای ئەم دێیە لە سەردەمی ئاغا و ڕەعیەتی بریتی بوون لە: (حوسێن، حاجی سولەیمان، حاجی بایز، عەزیز، هەمزە و قەسیم)ی یەزدانفەر.

"کا" لە کوردەواریدا هەمان "کاک"ە کە بۆ ڕێزگرتن لە پیاوێک یان کوڕێک دەگوترێ، "مەم"یش سووکەناوی "محەممەد"ە، کە وابوو ناوی ئاوایی هەر لەوەوە هاتووە، بەڵام ڕوون نییە ئەم" کامەم"ە کێ بووە.

مەزرای ماڵە هەمزە، مەزرای سەید حوسێن، لەگەڵ خرێ تووتنان، سێ شوێنن کە وەکوو ئاسەواری مێژوویی چاویان لێدەکرێ، بەساڵاچووانی ئەم دێیە دەڵێن ئەم شوێنانە ئاوەدانیی بوونە و بناغەی خانووبەرەکانیان هەر ماوە؛ هەروەها لەوێ گۆزە و سواڵەتی شکاویش وەبەرچاو دێ.

لە ڕۆژاوای دێ ڕێگایەکی خاکی دەچێتەوە سەر جادەی مەهاباد ـ سەردەشت، لە ڕۆژهەڵاتەوە ڕێگایەکی خاکی بەرەو باشوور دەڕوا و ئاوایی دۆڵپەمۆ دەگرێتەوە.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی ١٣٧٢/٧/٩ کارەباکەی هەڵکراوە، سیمکارتی مخابەراتی دێهات، قوتابخانەی سەرەتایی "عارف" (کوڕانە ـ کچانە)، مزگەوت. بۆ وەرگرتنی نەوت، کەلوپەل و بۆ کاری بنکەی تەندروستی سەر بە ئاوایی "حەوڵاکوردە"ن.

ساز کردنی یەکەمین قوتابخانە لە مەنگوڕایەتیدا توانی ئاڵوگۆڕ لەم گوندەدا پێکبێنێ، قوتابخانەی "عارف" لە ساڵی ١٣٣٦ی هەتاوی یەکەم قوتابخانە بوو لەو ناوچەیەدا کە لە کامەم ساز کرا. هەروەها حەوزەی زانستی علوومی دینی بە مامۆستایەتی خوالێخۆشبوو مامۆستا مەلا سەعیدی ڕەسووڵی، ناسراو بە مەلا سەعید کامەم، شوێنێکی ئاشکرای لە سەر ئەم گوندە دانا، هەر وەک دانیشتووانی کامەم دەگێڕنەوە لە سەردەمی مامۆستا، کامەم زۆر ئاوەدانتر بووە. ئێستا کە شانزدە ماڵە، ئەو سەردەمی چل ماڵ بووە، حەوزەی زانستی ساڵی ١٣٣٣ی هەتاوی دانراوە کەچی دواتر کەس نەبووە درێژەپێدەری ڕێگای مامۆستای تێکۆشەر مەلا "سەعید ڕەسووڵی"بێ.

کۆنەمزگەوتی کامەم بەدەست وەستا شۆڕو و بە خەرجی خەڵکی ئاوایی ساز کرا کە لە ساڵی ١٣٨٥ی هەتاوی خەڵک دیسان پارەیان کۆ کردەوە و ئەم مزگەوتەیان تێکڕماند و لەبناغەڕا دایاننایەوە.

پێش ساز کردنی مزگەوت لە ١٣٣٣ی هەتاوی، لە سەردەمی ئاغاکان، خەڵک بۆ جومعە و جەماعەت دەچوونە دیوەخان، دیوەخان شوێنێکی گشتی

بوو کە هەموو پیاوانی ئاوایی لەوێدا کۆ دەبوونەوە، جێژنەی بەیانییان پیاوەکان لە سەر سفرەی دیوەخان جێژنیان دەگرت. دیوەخان، چوار کۆڵەکەی تێدابوو، چاپەز و مجێوری هەبوو، پێشنوێژیان "میرزا" بوو کە دەرسی سیپارەی بە منداڵان دەگوت، یەکێک لەو میرزایانە مەلا "محەممەد تەقە بارگین" ناسرا بوو.

سەرەڕای ئەوەی کە ئەم ئاواییە یەکەم ئاوایی بوو لەو ناوچەیەدا کە قوتابخانەی بۆ هات، بەڵام بەداخەوە ئێستا ڕادەی خوێندەواریی لە خوارێیە، منداڵەکان تا پێنجەمی سەرەتایی دەخوێنن، بۆ درێژەدان بە خوێندن تاقمێک دەنێردرێن بۆ مەهاباد یان خەلیفان و بەشێکیش لە خوێندن دەست هەڵدەگرن، زۆر بەدەگمەن هەڵدەکەوێ کچان پەرە بەخوێندنیان بدەن.

کاروپیشەی خەڵکی ئەم گوندە لە وەرزێری، ئاژەڵداری و باخداری پێکهاتووە، وەرزێران گەنم، نۆک و جۆ دەچێنن و ئاژەڵەکانیان بزن، مەڕ و مانگان، بەرهەمی باخەکانیش سێوە.

کامەم لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوەی نییە و لە چاڵاو کەلک وەردەگرن کە کێشەیەکی زۆری بۆ خەڵکی کامەم پێکهێناوە. گرفتێکی تری ئاوایی ئەوەیە کە خرێک بە نێو ماڵاندا تێدەپەڕێ کە ئاوەڕۆی پێدا دێ و لە بواری تەندروستی، بێهداشت و سلامەتی خەڵکی ئاوایی تووشی مەترسی کردووە.

کامەم یەکێکە لەم گوندانە کە لافاو دەگرێتەوە و چەند بەربەندی ئاوخیزداریان لێداوە، ئەم بەربەندانە توانیویانە تا ڕادەیەک پێشی سێڵاو بگرن.

ئەو سەردەمی دوکتۆر و بنکەی تەندروستی لە ئارەدا نەبوون خەڵک بۆ دەواودەرمان دەچوونە لای حاجی "فاتم" خێزانی حاجی "سلەمان" کە بە گیاوگۆڵ دەرمانی ساز دەکردن.

کاک "هەمزە یەزدانفەر" دەگێڕێتەوە: سەردەمی منداڵیم لە بیرە کە گرانی بوو، خەڵک دەچوونە عێراق گەنم بێنن، عەجەم هاتبوونە کامەم، مەنجەڵ و قابلمە و کەلوپەلی مسییان پێبوو، هاواریان دەکرد: مەنجەڵێک بە نانێکی! ئەوانە زەنگانی (خەڵکی زەنجان) بوون و خوالێخۆشبوو بابم کە ئاغا بوو دەستووری دا نانیان بدەنێ و هیچیان لێ وەرنەگرن.

چەند کەسایەتیی ناسراوی کامەم بریتین لە: مامۆستا مەلا سەعید ڕەسوولی، هەباسەخرە (بەیتبێژ و حیکایەتخوان)، کانەبی (نایەژەن).

مام "هەباس" لە دیوەخانی ئاغا حیکایەتی دەگێڕانەوە، حیکایەتی وابوو سی چل شەوی پێدەچوو. جیا لە مام هەباس، مام "ڕەشید"یش هەر حیکایەتی دەگێڕانەوە.

## کانی ڕەش

کانی ڕەش لە ٧٢ کیلۆمیتری باشووری شاری مەهاباد، بەشی خەلیفان و دێهستانی کانی بازاڕ و لە ناوچەی گەورکایەتی هەڵکەوتووە. لە ٥٤ ماڵ و ٣٥٥ کەس پێکهاتووە، لەمانە ١٧٣ کەس پیاون و ١٨٢ کەسیش ژنن، ژمارەی خوێندەوارانی ئەم ئاواییە ١٦٨ کەسە کە ١١٠ کەس پیاون و ٥٨ کەسیش ژنن، هەروەها لە ١٢٩ کەسی نەخوێندەوار ٤٢ کەس پیاون و ٨٧ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ٢٠٧٥ هێکتارە، لەمە 121/53 هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و 1953/47 هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.

کانی ڕەش خاوەن ٢٥ هێکتار زەوی دێم، ٦٣ هێکتار زەوی بەراو، ٧ هێکتار باخ و ١ تراکتۆرە.

مەودای ئاوایی تا ناوەندی خزمەتگوزاریی وەرزێری کانی بازاڕ ٣٥ کیلۆمیترە.

ئاواییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی نستان (سەر بە سەردەشت)

باکوور: ئاواییەکانی کاوڵانی سەرێ و قەرنیئاوا

ڕۆژهەڵات: ئاوایی سوێناس

ڕۆژئاوا: ئاوایی کانی سپی

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باشوور: تۆرە، هەواروەتمان و کانی کەچک

باکوور: قەڵات

ڕۆژهەڵات: دەربەند

ڕۆژئاوا: میرە

ئەم ئاواییە خاوەنی کوێستانەکانی وەکوو: تۆرە*، کانی کەچک، کانی بەرخ و میرەیە. لە بەری باشووری گوند ئەشکەوتی "کوبە لەیلی" و "کونەپێستی تۆرە" هەڵکەوتووە، جێگای باسە ئەشکەوتی "کونەپێستی تۆرە" یا "تۆرە" بە هۆی حەستەم بوونی تا ئێستا کەس نەیتوانیوە تا کۆتایی ئەشکەوتەکە بڕوا.

گورگەلوو، ڕیقنە، سەرچاوە، کرۆسکاوێ و سەرچاوەی کانی سپی لە کانیاوە بەناوبانگەکانی ئاوایین.

زۆربەی خانووبەرەکان لە قوڕ و بەردن و میچیان لە دارە، ماڵەکان ڕوویان لە باشوورە و بە شێوەی پێپلیکانی لە داوێنی کێوی پشت ماڵان هەڵکەوتوون. لە داوێنی شاخی "قووچ" لە لای باشوور، هێندێک ماڵی دیکەی لێن کە لێک دوور ساز کراون، خانووبەرەکانی بەری ڕۆژهەڵاتی گوند هێندێک لە قووڵدان و ڕێگای خاکی ئاوایی، لە سەرووی ئەو ماڵانەوەیە.

بە وتەی خەڵکی ئەم گوندە کانی ڕەش پێشوو مەزرا بووە کە دەوروبەری ساڵی ١٣٠٠ی هەتاوی ئاوەدان کراوەتەوە، خەڵکی ئەم ئاواییە پێشتر لە یەک کیلۆمیتری باشووری ڕۆژهەڵاتی شوێنی ئێستا، لە داوێنی کێوی دەربەند، لە گوندێک بە ناوی "دەربەند" ژیاون کە ئێستاش شوێنەواری کاول بووی خانووبەرەکانیان هەر ماون، پاشان بە هۆی سەخڵەت بوونی شوێنەکەیان و گرفتی ئاو، ئەوێیان بەجێ هێشت و ڕوویان لەم شوێنەی ئێستا کردەوە. شایانی باسە ئەو شوێنەی پێشوویان کە لە سێ لاوە کێو دەوریان دابوو بە دەربەند ناسرابوو، پێش هاتنیان بۆ کانی ڕەش ئەو شوێنە هەر بە مەزرای کانی ڕەش ناوی دەرکردبوو. زۆر کەس لە خەڵکی ناوچەکە بە کانی ڕەش دەڵێن "کانی ڕەشی دەربەند".

لە باکووری دێ ڕێگایەکی ئامادە بۆ قیلەتاو دووڕییانێک دەگرێتەوە کە یەکیان دەچێتەوە سەر جادەی مەهاباد ـ سەردەشت، ئەوی دیکەشیان ڕوو لە ڕۆژاوا دەکا و بەرەو ئاوایی کانی سپی دەڕوا.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی 1375/12/28 کارەباکەی هەڵکراوە، لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە (خاوەن عەنباراوە و زۆرترین ئاوی لە کانی پوور ڕابی دابین دەبێ)، بنکەی مخابەرات، قوتابخانەی سەرەتایی "ئیسحاق" (کوڕانە ـ کچانە) کە بیناکەی حازربەدەستە، دێهیاری (ساڵی ١٣٨٨)، مزگەوت (ساڵی ١٣٨٢ی هەتاوی نۆژەن کراوەتەوە). بۆ درێژەدان بە خوێندن تاقمێکی زۆر کەم لە کوڕان ڕەوانەی شارەکانی سەردەشت، مەهاباد و ڕەبەت دەبن و کچان بێبەش کراون. خەڵکی ئەم ئاواییە بۆ کەلک وەرگرتن لە بنکەی تەندروستی سەر بە ئاوایی "کەڵەکاوێ"ن و بۆ وەرگرتنی نەوت و کەلوپەل ڕێگای کاوڵانی خوارێ دەپێون. وەرزێری، ئاژەڵداری و کرێکاری کاروپیشەی خەڵکی کانی ڕەشیان پێکهێناوە، وەرزێران گەنم، جۆ و گوڵەبەڕۆژە دەچێنن، ئاژەڵەکان مەڕ، مانگا و بزنن، لە باخەکان دارسێو و ترێ لێدراوە کە ئێستا ساوان.

گرفتەکانی خەڵکی ئاوایی: نەبوونی قوتابخانەیەکی ناوەندی، نەبوونی بنکەی تەندروستیی سەربەخۆ. کانی ڕەش خاوەن دوو گۆڕستانی کۆن و نوێیە، گۆڕستانی کۆن بە "قەبرەورکان" و گۆڕستانی نوێ بە "دار قەبر" ناسراوە. مام "کەریم برنوو" حەیرانبێژ و فۆلکلۆرزانی ئەم گوندەیە.

* سەبارەت بە ئەشکەوتی "تۆرە" خەڵکی ئاوایی دەڵێن ساڵێکی ئاوی ئەشکەوتەکەیان قوڕاوی کردبوو کە چی ٢ کیلۆمیتر ئەولاتر لە کانی ڕیقنە ئاوە قوڕاوەکە هاتبۆوە دەر، ئەمە نیشان دەدا ئەم ئەشکەوتە زۆری بە بەرەوەیە.

## کانی سپی

لە ٧٠ کیلۆمیتری باشووری شاری مەهاباد، بەشی خەلیفان و دێهستانی کانی بازاڕ و لە ناوچەی گەورکایەتی هەڵکەوتووە. لە ٧ ماڵ و ٦٨ کەس پێکهاتووە، لەمانە ٣٣ کەس پیاون و ٣٥ کەسیش ژنن، ژمارەی خوێندەوارانی ئەم ئاوایییە ٤٠ کەسن کە ٢٥ کەسیان پیاون و ١٥ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٢٣ کەسی نەخوێندەوار ٧ کەس پیاون و ١٦ کەسیش ژنن.
پانتایی ئاوایی ١٦٥٣ هێکتارە، لەمە 75/6 هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و 1577/4 هێکتار پاوان و لەوەرگەی دێیە.
کانی سپی خاوەن ٢٠ هێکتار زەوی دێم، ٢٣ هێکتار زەوی بەراو، ١ هێکتار باخ و ٢ تراکتۆرە. مەودای ئاوایی تا ناوەندی خزمەتگوزاریی وەرزێری کانی بازاڕ ٣٣ کیلۆمیترە.

ئاوایییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایییەکانی سارتکێ، نستان و سیسێر
باکوور: ئاوایی کاوڵانی سەرێ
ڕۆژهەڵات: ئاوایی کانی ڕەش
ڕۆژاوا: ئاوایییەکانی زمزیران (سەر بە سەردەشت) و کەڵەکاوێ

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باشوور: کەکی
باکوور: پشت ماڵان
ڕۆژهەڵات: خیزۆک و وەستا شێخ
ڕۆژاوا: مەلا عەلی

سارد، سەیدان، خیزۆک و سەرچاوە چەند کانیاوی ئاوایین.
ئەم گوندە لە بەرزایی هەڵکەوتووە، خانووەکانیان لە قوڕ و بەردن و میچەکانیان لە دارە، ماڵەکان بەرەو باشوور وەها هەڵکەوتوون کە هیچ کۆڵانێک بەدی ناکرێ.
بەساڵاچووان دەڵێن پێشتر ئەم دێیە لە 1/5 کیلۆمیتری باشووری شوێنی ئێستای بووە کە پاشان گوێزراوەتەوە و ڕەنگە هۆی ئەو گوێزرانەوەش سەخڵەتبوون و بێ ئاوی شوێنی پێشوو بووبێ، هەڵبەت ڕێکەوتی ئەو گواستنەوەش ڕوون نییە. هەروەها ئەوان ئاماژە بەو خاڵەش دەکەن کە گۆیا ئەو ئاوایییە زووتر کاروانسەرا و قاوەخانە بووە و لە پاشان ماڵی لە دەوروبەر ساز کراوە و بۆتە ئەو گوندەی ئێستا.
کانیاوێک لە ناوەندی ئاوایی هەڵکەوتووە کە تا چەند ساڵ لەمەوبەر ئاوێکی زۆر و ساردی هەبووە و "کانی سپی"یان پێدەگوت، ناوی ئاوایی هەر لەم کانیاوەوە وەرگیراوە. لە باشووری ئاوایی کۆنەئەشکەوتێکی لێیە کە بۆی دەچێ خوارێ و پانتایی ئەم شوێنە دەگاتە ٤٠ میتری چوارگۆشە و "کۆخیکورتەک"ی پێ دەڵێن، وەک خەڵک باس دەکەن کاروانسەرا بووە و ئێستا بەرەو کاول بوونە.
لە ڕۆژهەڵاتی دێ باریکەڕێیەک هەیە کە پاش بڕینی مەودایەکی کەم دەچێتەوە سەر دووڕێیانێک، یەکیان بۆ ئاوایی کانی ڕەش و ئەوی دیکەیان بۆ سەر جادەی مەهاباد ـ سەردەشت دەڕوا.
ئیمکاناتی ئاوایی: ساڵی ١٣٨٥ کارەباکەی هەڵکراوە، بنکەی مخابەرات، مزگەوت، قوتابخانەی سەرەتایی"فەلەق" (کوڕانە ـ کچانە)، بۆ کەلک وەرگرتن لە بنکەی تەندروستی، وەرگرتنی نەوت و کەلوپەل سەر بە ئاوایی "کاوڵان"ی خوارێن. هێندێک لە قوتابیانی ئاوایی بۆ درێژەدان بە خوێندن ڕوو لە ئاوایی کاوڵانی خوارێ دەکەن و کچان دەرفەتی درێژەدان بە خوێندنیان نییە.
ئاژەڵداری، کرێکاری و وەرزێری کاروپیشەی خەڵکی کانی سپییانە. ئاژەڵەکانیان بریتین لە: مەڕ، مانگا و بزن، وەرزێران گەنم، جۆ دەچێنن و بەرهەمی باخەکان سێوە.
گرفتەکانی خەڵکی کانی سپی: ڕێگاوبانی خاکی و سەخڵەت، نەبوونی لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە، نەبوونی بینایەکی باش بۆ قوتابخانە، نەبوونی بنکەی تەندروستیی سەربەخۆ، نیاز بە مزگەوتێکی نوێ، نەبوونی شوورای ئیسلامی.
ئەم ئاوایییە خاوەن دوو گۆڕستانە کە یەکیان کۆنەگۆڕستانە و ئەوی تریان نوێیە.

## کانی سێو

کانی سێو لە ٥٨ کیلۆمیتری باشووری ڕۆژهەڵاتی شاری مەهاباد، بەشی خەلیفان و دێهستانی کانی بازاڕ و لە ناوچەی گەورکایەتی هەڵکەوتووە. لە ٧٦ ماڵ و ٤٧٠ کەس پێکهاتووە، لەمانە ٢٤٤ کەس پیاون و ٢٢٦ کەسیش ژنن، لە ٢٧٨ کەسی خوێندەوار لەم دێیە ١٦٨ کەسیان پیاون و ١١٠ کەسیش ژنن، هەروەها لە ١٤١ کەسی نەخوێندەوار ٤٧ کەسیان پیاون و ٩٤ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ٣٥٩٩/١٦ هێکتارە، لەمە ١١٩/١٦ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و ٣٤٨٠ هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.

کانی سێو خاوەن ٤٥٠ هێکتار زەوی دێم، ٢٢ هێکتار زەوی بەراو، ١٠ هێکتار باخ، ٣٨ تراکتۆر، ٣ لاوێردە و ٤ کۆمباینە. مەودای ئاوایی تا ناوەندی خزمەتگوزاریی وەرزێری کانی بازاڕ ٨ کیلۆمیترە. بەرزایی ئاوایی ١٤٢٥ میتر لە ڕووکەشی زەریاکانە.

ئاوایی‌یەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی‌یەکانی قالوێ زەندان و باراوا

باکوور: ئاوایی‌یەکانی شارەزوور و یەڵتەمر

ڕۆژهەڵات: ئاوایی گڵێنان

ڕۆژاوا: ئاوایی ئۆزونتاش

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باشوور: کێوەکانی خێزانەکەر و ورچ کوژراو

ڕۆژاوا: کێوی مێرگەسیر

کانی ڕێگای قالوێ، کانی سێو و کانی گردەلەس، چەند کانیاوی ئەم گوندەن.

ماڵەکان زۆرتریان هەر لە قوڕ و بەردن و میچەکانیان لە دارە، بە ڕادەیەکی کەم خشت و بلووک دەکار کراوە. هێندێک لە ماڵەکان حەوشەیان نییە و کۆڵانەکان ڕێکن و لە سەر شێوازی نوێ نین.

قەڵاتی کانی سێو بە ژمارەی تۆمارکراوی ١٢٣٣ لە میراتی فەرهەنگی، بە بەرزایی ١٤٧٥ میتر لە ڕووکەشی زەریاکان، دەگەڕێتەوە سەر هەزارەی دووەمی (٢٠٠٠ ـ ١٥٠٠) پێش زایین ـ دەورەی ساسانی. بەساڵاچووانی ئەم گوندە دەڵێن بەر لە ئێستا لە دەوروبەری کانیاوی ئەم دێیە چەند دارسێوێکی لێبووە، هەر بۆیە ناوی ئەم ئاوایی‌یە بۆتە "کانی سێو". لە باشووری دێ ڕێگایەکی ئامادە بۆ قیلەتاو هەیە کە بۆ ئاوایی قالوێ زەندان دەڕوا، لە باکوورەوە ڕێگای قیلەتاو دووڕییانێک دەگرێتەوە کە دەچنەوە ئاوایی‌یەکانی خەلیفان و یەڵتەمر، لە بەری ڕۆژهەڵاتەوە ڕێگایەکی خاکی دەچێتەوە ئاوایی گڵێنان، لە ڕۆژاواش ڕێگایەکی ئامادە بۆ قیلەتاو ئاوایی ئۆزونتاش دەگرێتەوە.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی ١٣٦٨/١١/١ کارەبای هەڵکراوە، لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە کە عەنباراویان بۆ داناوە، سیمکارتی مخابەراتی دێهات، بنکەی تەندروستی، قوتابخانەی سەرەتایی "سەبر" (کوڕانە ـ کچانە)، مزگەوتێک بە ناوی "محەممەدرەسووڵەڵا" کە ساڵی ١٣٣٦ هـ ساز کراوە و ساڵی ١٣٥٧ی هەتاوی بە خشتی گڵ و قوڕ نۆژەن کراوەتەوە و دەرەوەی بە چیمەنتۆ داپۆشراوە، شەریکەی هاوبەشیی نەوت و کەلوپەل، نانەوەخانە و هەروەها لە دێهیاری، شووڕای ئیسلامی و شووڕای چارەسەری کێشەکان بەهرەمەندن. بینای قوتابخانەی سەرەتایی ڕووخاوە، هەر بۆیە قوتابیان لە بینایەکی دیکە کە بۆ پۆلی ناوەندی تەرخان کراوە دەخوێنن.

قوتابییەکانی سەرەتایی کە زۆربەیان هەر کوڕن، بۆ درێژەپێدان بە خوێندن دەچنە خەلیفان و مەهاباد، کچان کەمتر بۆیان دەرەخسێ بتوانن درێژە بە خوێندن بدەن.

ئاژەڵداری، وەرزێری، باخداری و کرێکاری کاروپیشەی خەڵکی کانی سێوە، ئاژەڵەکانیان مەڕ، مانگا و بزنن، وەرزێران گەنم و جۆ و نۆک دەچێنن و بەرهەمی باخەکانیان سێوە.

گرفتەکانی خەڵکی ئاوایی: نەبوونی لەمپەرێک هەمبەر لافاوی چۆم، نەبوونی حەوشەیەک بۆ قوتابخانە. ئەو چۆمەی بە نێو ئاواییدا تێپەڕ دەبێ و ماڵەکان دەکاتە دوو بەش، زۆر جاران دەگەڵ وەڕێکەوتنی لافاو زەرەدی گیانی و ماڵی لێ دەکەوێتەوە، هەروەها ئەو چۆمە تا ئێستا حەوت کەسی خنکاندووە. دوایین کەسێک بوو کە لەم چۆمەدا خنکا ساڵی ١٣٦٢ی هەتاوی بووە.

گۆڕستانی کانی سێو لە بەری ڕۆژاوایە هەڵکەوتووە. لە ڕۆژهەڵاتیش "قەبری بانیان"ی لێیە و لە لای باکووری ڕۆژهەڵاتیش گۆڕستانێکی دیکە لێیە کە "کێلەشین"ی پێدەڵێن.

## کانی کەوتێر (کانی کەوتەر)

ئەم ئاوایی‌یە لە ٣١ کیلۆمیتری ڕۆژهەڵاتی شاری مەهاباد، بەشی ناوەندی و دێهستانی ئاختاچی ڕۆژاوا و لە ناوچەی محاڵ هەڵکەوتووە. لە ١٩ ماڵ و ١١٠ کەس پێکهاتووە، لەمانە ٥١ کەس پیاون و ٥٩ کەسیش ژنن، ڕادەی خوێندەواران ٥٦ کەسە کە ٢٩ کەس پیاون و ٢٧ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٤٦ کەسی نەخوێندەوار ١٦ کەس پیاون ٣٠ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ٨٨٦/٢٠ هێکتارە، لەمە ٤٠٤/١٥ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و ٤٨٢/٠٥ هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.

کانی کەوتێر خاوەن ٨١ هێکتار زەوی دێم، ١٢٨ هێکتار زەوی بەراو، ٣٤ هێکتار باخ و ١٥ تراکتۆرە.

بەرزایی ئاوایی ١٦٤٠ میتر لە ڕووکەشی زەریاکانە.

ئاوایی‌یەکانی دەورووبەر:

باشوور: ئاوایی‌یەکانی یالاوەی سەرێ و خوارێ

باشووری ڕۆژاوا: ئاوایی بورهان

باکوور: ئاوایی قۆرغان

ڕۆژهەلات: ئاوایی قەلاجۆغە

ڕۆژاوا: ئاوایی قۆرغان

چیاکانی دەورووبەری ئاوایی:

باکووری ڕۆژاوا: کێوەکانی گڵە زەرد و ئاڵماڵوو

ڕۆژهەلات: کێوی قەلاجۆغە

کانی ماڵان، گۆلی شینە، گۆلی ساڵحی، سۆرەکانی و سەرچاوە چەند کانیاوی ئاوایین.

زۆرتری خانووبەرەکان لە قوڕ و بلووک ساز کراون و میچەکانیان لە دارە، پێشتر لە خشتی گڵ کەلکیان وەردەگرت کە ئاسەواری لە هێندێک خانووبەرەدا هەر ماون، ئێستا خانووبەرەکان لە خشت و چیمەنتۆ ساز دەکەن. ئاوایی خاوەن چەند کۆڵانی ڕاست و بەرتەسکە، گشت ماڵەکان خاوەن حەوشە و دەرگان. سەبارەت بە ناوی دێ بەساڵاچووان ڕایان وایە کە ئەو دێیە بە هۆی هەبوونی کانیاوی یەکجار زۆر، کەوی زۆر لێ بووە و هەمیشە لەم کانیاوانە تێرئاو بوونە هەر بۆیە ناویان ناوە کانی کەوتێر.

لە باشووری ڕۆژاوا ڕێگایەکی خاکی بە مەودای ٢/٥ کیلۆمیتر، دەچێتەوە ئاوایی بورهان، لە ڕۆژهەلاتەوە ڕێگایەکی قیلەتاو ئاوایی قەلاجۆغە دەگرێتەوە.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی ١٣٧٣/٧/٢٠ کارەباکەی هەڵکراوە، سیمکارتی مخابەراتی دێهات، قوتابخانەی سەرەتایی (کوڕانە ـ کچانە) بە ناوی "گەوهەر" کە بیناکەی حازربەدەستە، مزگەوتێک بە ناوی "محەممەدڕەسووڵەڵڵا" (د.خ) کە ساڵی ١٣٧٥ی هەتاوی بە خشت و چیمەنتۆ نۆژەن کراوەتەوە، کانگای بەرد کە کەرتی تایبەتییە و هەروەها ئەم دێیە خاوەن شووڕای ئیسلامییە. نەوت لە ئاوایی قەلاجۆغە وەردەگرن و بۆ کەلوپەل وەرگرتنیش دەبێ ڕێگای ئاوایی بورهان بپێون، هەروەها بۆ بنکەی تەندروستی سەر بە ئاوایی "قۆرغان"ن.

لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە بۆ کانی کەوتێر نەکراوە و هەر کەس لە ماڵە خۆی چاڵاوی لێداوە و لە کانی ماڵان کەلک وەردەگرن. خوێندکارانی کوڕ بۆ درێژەدان بە خوێندن دەچنە قوتابخانەکانی گۆکتەپە، قەرەکەند و میراوێی بۆکان، زۆر کەم هەڵکەوتووە کچێک لەم ئاوایی‌یە بتوانێ درێژە بە خوێندن بدا. ئاژەڵداری، وەرزێری و باخداری کاروپیشەی خەڵکی ئەم گوندەن، ئاژەڵەکان زۆرتریان مەڕن، تا ڕادەیەکیش مانگا ڕادەگرن، هەروەها وەرزێران گەنم، نۆک، جۆ، نیسک و پەرش دەچێنن، بەرهەمی باخەکان زیاتر سێوە.

گرفتەکانی خەڵکی ئاوایی: نەبوونی بنکەی تەندروستیی سەربەخۆ، نەبوونی لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە، نەبوونی ئیمکانات بۆ قوتابخانە وەکوو ئاودەست و حەوشە.

لە بەری ڕۆژاوای دێ، گۆڕستانێکی لێیە بە ناوی "گۆلی ساڵحی" کە هەنووکە هەر منداڵی لێدەنێژن، مردووەکانی دیکەیان لە گۆڕستانی ئاوایی‌یەکانی خانەقا، عیساکەند، ئۆتەمیش و قەلاجۆغە بە خاک دەسپێرن.

## کانی میران

کانی میران لە ٤١ کیلۆمیتری باشووری ڕۆژهەڵاتی شاری مەهاباد، بەشی خەلیفان و دێهستانی کانی بازاڕ و لە ناوچەی مەنگوڕایەتی هەڵکەوتووە. لە ٢٠ ماڵ و ١٢٥ کەس پێکهاتووە، لەمانە ٦١ کەس پیاون و ٦٤ کەسیش ژنن، لە ٧٥ کەسی خوێندەوار ٤٢ کەسیان پیاون و ٣٣ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٣٢ کەسی نەخوێندەوار ١٠ کەس پیاون و ٢٢ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ١٨٠٠ هێکتارە، لەمە ٢٣٨ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و ١٥٦٢ هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.

کانی میران خاوەن ٣٩٠ هێکتار زەوی دێم، ٤٨ هێکتار زەوی بەراو، ٣/٥ هێکتار باخ و ٨ تراکتۆرە.

مەودای ئاوایی تا ناوەندی خزمەتگوزاریی وەرزێری کانی بازاڕ ١/٥ کیلۆمیترە.

ئاواییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی خەلیفان

باکوور: ئاواییەکانی خاڵدەلیل و قەڵاجۆغە

ڕۆژهەڵات: ئاوایی شێخ یوسف و بەشێک لە ئاوایی خەلیفان

ڕۆژاوا: ئاوایی کیتکە

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باکوور: کێوی بەردی مانگابەکەڵێ

ڕۆژاوا: گردی کوێخای

کانیاوەکان بە کانی پیاوان، کانی ژنان، کانی گوڵبەندان، کانی سەیدی و کانی نێرخاسان ناسراون.

ئاوایی لە شوێنێکی بەرز هەڵکەوتووە، خانووبەرەکان لە قوڕ و بەردن و میچەکانیان بە داران داپۆشراوە، زۆربەی ماڵەکان حەوشەیان نییە، کۆڵانەکانی ئەم گوندە زۆر ڕێک و ڕاست نین، هێندێک لە ماڵەکان ڕوویان لە باشوور و هێندێک ڕوویان لە ڕۆژهەڵاتە.

خەڵکی ناوچەکە پێیانوایە ڕەنگە بە هۆی زۆر بوونی کانیاو لەو دێیە، ئەو ناوەیان لەم دێیە نابێ یان لە سەردەمی ئاغایەکان ئەم ناوەی بەسەردا برابێ.

لە باشووری دێ ڕێگایەکی قیلەتاو هەیە کە دەچێتەوە ئاوایی کیتکە، لە باشووری ڕۆژهەڵاتەوە ڕێگایەکەی قیلەتاو دەڕواتەوە ئاوایی خەلیفان، لە باکووریشەوە ڕێگای قیلەتاو ئاوایی خاڵدەلیل دەگرێتەوە.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی ١٣٧٣/١٢/٨ کارەباکەی هەڵکراوە، لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە کە لە ئاوایی "قۆیتەڵ"ەوە بۆی هاتووە، سیمکارتی مخابەراتی دێهات، قوتابخانەی سەرەتایی "سەمەر" (کوڕانە ـ کچانە)، مزگەوت کە ساڵی ١٣٧٩ی هەتاوی نۆژەن کراوەتەوە. بۆ بنکەی تەندروستی و وەرگرتنی نەوت و کەلوپەلیش سەر بە ئاوایی "خەلیفان"ن. خوێندکاران بۆ درێژەدان بە خوێندن دەچنە خەلیفان یان مەهاباد.

کاروپیشەی خەڵکی کانی میران وەرزێری، ئاژەڵداری و کرێکارییە. وەرزێران گەنم و جۆ دەچێنن و ئاژەڵەکانیان پێکهاتەیەکە لە مەڕ، بزن و مانگا، هەروەها هێندێک دارسێو لەم گوندەدا هەیە.

گرفتەکانی خەڵکی ئاوایی: نەبوونی بنکەی تەندروستیی سەربەخۆ و تا ڕادەیەک هەژاریی خەڵکی ئاوایی.

کانی میران گۆڕستانی نییە، هەر بۆیە لە گۆڕستانی ئاواییەکانی قۆیتەڵ، قەڵاجۆغە و خەلیفان کەلک وەردەگرن.

## کاوڵانی خوارێ

کاوڵانی خوارێ له ٦١ کیلۆمیتری باشووری شاری مەهاباد، بەشی ناوەندی و دێهستانی کانی بازاڕ و له ناوچـەی گەورکایـەتی هەڵکـەوتووه. لـه ٦٣ ماڵ و ٣٧٨ کەس پێکهاتووه، لەمانه ١٧٥ کەس پیاون و ٢٠٣ کەسیش ژنن، ژمارەی خوێندەوارانی ئەم ئاواییه ٢٣٦ کەسه که ١٣٢ کەسیان پیاون و ١٠٤ کەسیش ژنن، هەروەها له ٩٩ کەسی نەخوێندەوار ٢٧ کەس پیاون و ٧٢ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی 3199/5 هێکتاره، لەمه ١٠٨/٥ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوه و ٣٠٩١ هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیه.

کاوڵانی خوارێ خاوەن ٨٠ هێکتار زەوی دێم، ٧٥ هێکتار زەوی بەراو، ٢٣ هێکتار باخ، ١٠ تراکتۆر و ١ لاوێردەیه.

بەرزایی ئاوایی ١٥٥٠ میتر له ڕووکەشی زەریاکانه.

ئاواییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاواییەکانی قەرەنیئاوا و کاوڵانی سەرێ

باکوور: ئاوایی یارالی

ڕۆژهەڵات: ئاوایی سوێناس

ڕۆژاوا: ئاوایی پاشبەرد

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باشوور: باسکۆڵه

ڕۆژهەڵات: شاخەڕەش

ڕۆژاوا: کۆنەباخان

"سێکانیان" کانیاوی بەناوبانگی ئەم گوندەیه. باشووری ئاوایی لێرەواره و پڕاوپڕه له داربەڕوو، گەڵوان، مازوو، گێوژ، کرۆسک، سێوەتاڵه و هتد.

خانووبەرەکان له قوڕ و بەردن و ئەو بینایانەی نوێن خشت و بلووکیان دەکار کردووه، میچی زۆربـەی ماڵـەکان لـه داره و حەوشـەیان هەیـه، ئاوایی خاوەن چەند کۆڵانێکه که بەشێکیان ڕێک و ڕاستن و بەشێکیان نارێکن. گەڵاڵەی هادی ساڵی ١٣٧٩ی هەتاوی له کاوڵانی خوارێ دەستی پێکردووه.

کاوڵانی خوارێ له ٦٢ کیلۆمیتری جادەی مەهاباد ـ سەردەشت واته له سەر جادەی سەرەکی هەڵکەوتووه، له بەری ڕۆژهەڵاتی دێ ڕێگایـەکی خـاکی ئاوایی سوێناس دەگرێتەوه، له ڕۆژاواوه ڕێگای قیلەتاوی ٣ کیلۆمیتری دەچێتەوه ئاوایی باخان.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی 1364/07/16 کارەباکـەی هـەڵکراوه، لووله‌کێشـیی ئـاوی خواردنـەوه، تەلـەیفوونی مـاڵ بـه مـاڵ، بنکـەی تەندروسـتی، ناوەندی خزمەتگوزارییەکانی دەرمانی، شەریکەی هاوبەشیی نەوت و کەلوپەل، قوتابخانەی سەرەتایی (کوڕانه ـ کچانه) به ناوی "تاهیر"، قوتابخانـەی ناوەندی "نەبیزاده" (هەر دوو قوتابخانـه لـه یـەک بینـا دان)، مزگـەوت و هـەروەها ئـەم دێیـه خـاوەن دێهیـاری، شـووڕای ئیسـلامی و پازگـای هێـزی ئینتیزامییه. هێندێک له قوتابیان بۆ درێژەدان به خوێندن پاش پۆلی ناوەندی ڕەوانەی مەهاباد دەبن که کچان به تەواوی له درێژەپێدان به خوێنـدن بێبەش کراون.

ئاژەڵداری، وەرزێری، کرێکاری و باخداری کاروپیشەی خەڵکی کاوڵانی خوارێیان پێکهێناوه. ئاژەڵـەکانیان بـریتین لـه: مـەڕ، مانگا و بـزن، وەرزێـران گەنم، جۆ و نۆک دەچێنن، بەرهەمی باخەکانیش سێو، هڵوو، گوێز و ترێیه.

گرفتەکانی خەڵکی کاوڵانی خوارێ: پاکوخاوێن نەبوونی کۆڵانەکان، نەبوونی شوێنێکی تایبەتی بۆ وەرزیش.

گۆڕستانی "سۆفی ئەحمەد" له باکووری ئاوایی هەڵکەوتووه.

مام "ڕەسووڵ ڕەسووڵیان" بەیتبێژ و شمشاڵژەن و کاک "عوسمان نەبیزاده" وەک شاعیر و فۆلکلۆرزانی ئاوایی ناسراون و ئێستا لەم گونده دەژین.

## کاوڵانی سەرێ

ئەم ئاواییە لە ٦٤ کیلۆمیتری باشووری شاری مەهاباد، بەشی خەلیفان و دێهستانی کانی بازاڕ و لە ناوچەی گەورکایەتی هەڵکەوتووە. لە ٣١ ماڵ و ٢٠١ کەس پێکهاتووە، لەمانە ١٠٨ کەس پیاون و ٩٣ کەسیش ژنن، ژمارەی خوێندەوارانی ئەم ئاواییە ١٠٠ کەسە کە ٧٠ کەسیان پیاون و ٣٠ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٧٨ کەسی نەخوێندەوار ٢٦ کەس پیاون و ٥٢ کەسیش ژنن.

پانتایی هەر دوو ئاوایی کاوڵانی سەرێ و خوارێ 3199/5 هێکتارە، لەمە 108/5 هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و ٣٠٩١ هێکتار پاوان و لەوەرگەی دێیە.

کاوڵانی سەرێ خاوەن ٣١ هێکتار زەوی دێم، ١٤ هێکتار زەوی بەراو، ٧ هێکتار باخ و ٢ تراکتۆرە.

مەودای ئاوایی تا ناوەندی خزمەتگوزاریی وەرزێری کانی بازاڕ ٣٣ کیلۆمیترە.

ئاواییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاواییەکانی کانی ڕەش، کانی سپی و کەڵەکاوێ

باکوور: ئاواییەکانی باخان و کاوڵانی خوارێ

ڕۆژهەڵات: ئاوایی قەرەنی ئاوا

ڕۆژئاوا: ئاوایی چۆمەڵ

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باشوور: ئاغەڵان

باکوور: کۆنەباخان یا لێرەوار

ڕۆژئاوا: کێچاوی

ئاغەڵان، سەرچاوەی کانی بەردێ و هەوار کێچاوی، لە کانیاوە بەناوبانگەکانی ئاواپین.

خانووبەرەکان لە قوڕ و بەرد و میچی دارە، ماڵەکان بەرەو هەوراز هەڵکەوتوون و ڕوویان لە ڕۆژهەڵات و باکوورە، حەوشەیان نییە و کۆڵانەکان دوور و درێژ هەڵکەوتوون.

لە ڕۆژهەڵاتی ئاوایی ڕێگایەکی خاکی نزیک بە 1/5 کیلۆمیتری هەیە کە دەچێتەوە سەر جادەی سەرەکی مەهاباد ـ سەردەشت.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی 1368/08/11 کارەباکەی هەڵکراوە، بنکەی مخابەرات، قوتابخانەی سەرەتایی (کوڕانە ــ کچانە) بە ناوی "ساڵح"، مزگەوت. بۆ بنکەی تەندروستی و وەرگرتنی نەوت و کەلوپەل سەر بە ئاوایی"کاوڵان"ی خوارێن. ئاوی کاوڵانی سەرێ لە کانیاو دابین دەبێ و بڕیارە لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوەیان بۆ جێبەجێ بکەن. ئەم گوندە پێشوو حوجرەی فەقێیانی لێبووە کە لە ژێر چاودێری شاعیری پایەبەرزی گەلەکەمان خوالێخۆشبوو مامۆستا مەلا "عەبدولکەریم هونەرمەند" (فیدایی) بووە. قوتابیان بۆ درێژەپێدان بە خوێندن تا دوای پۆلی ناوەندی دەچنە کاوڵانی خوارێ، پاشان هێندێک لەوان ڕەوانەی مەهاباد دەبن و ئەو مافە بۆ کچانی ئاواییش پارێزراوە.

کاروپیشەی خەڵکی ئەم ئاواییە لە وەرزێری، ئاژەڵداری، باخداری و کرێکاری پێکهاتووە، وەرزێران گەنم، جۆ و نۆک دەچێنن و ئاژەڵەکانیان مەڕ، مانگا و بزنن، بەرهەمی باخەکانیشیان سێو، بادام، گوێز و ترێیە.

گرفتەکانی خەڵکی ئاوایی: نەبوونی لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە و ڕێگاوبانی خاکی. خەڵکی ئەم گوندە تا ٤٥ ساڵ لەمەوبەر مردووەکانیان بۆ گۆڕستانی ئاوایی باخان دەبرد، بەڵام ساڵی ١٣٤٢ کە سەید حەسەن ماوەڵۆیی، خەڵکی ئەو دێیە، مرد، بردیان و لە گردێکی ڕۆژهەڵاتی ئاوایی ناشتیان و لەمەوبەدوا مردووەکانیان بردنە وێ و کردیانە گۆڕستان و ئەم شوێنە ئێستاش هەر بە " قەبری سەید حەسەن" ناسراوە.

چوار کەسایەتیی ناسراوی ئەم گوندە بریتین لە: مامۆستا مەلا کەریم هونەرمەند (فیدایی) وەک شاعیر، مەلا عەبدوڵڵا فاتحی (مەجنوون) وەک شاعیر و فۆلکلۆرزان، محەممەدئەمین حەیدەرپوور، وەک شاعیر و هەروەها کوڕی ئەو بەڕێزە، حوسێن حەیدەرپوور (هومێد) وەک شاعیر.

## کاوەیس

کاوەیس لە ١٦ کیلۆمیتری باشووری ڕۆژاوای شاری مەهاباد، بەشی خەلیفان و دێهستانی مەنگوڕی ڕۆژهەلآت و لە ناوچەی مەنگوڕایەتی هەلکەتووە.
لە ٨ ماڵ و ٦٢ کەس پێکهاتووە، لەمانە ٢٤ کەس پیاون و ٣٨ کەسیش ژنن، لە ٣٨ کەسی خوێندەوار ١٦ کەس پیاون و ٢٢ کەسیش ژنن، هەروەها لە ١٥ کەسی نەخوێندەوار ٣ کەس پیاون و ١٢ کەسیش ژنن.
پانتایی ئاوایی ١٥٨٠/٥ هێکتارە، لەمە ٨٠/٥ هێکتار بۆ خەلک جیا کراوەتەوە و ١٥٠٠ هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.
کاوەیس خاوەن ٦٤/٦ هێکتار زەوی دێم، ٢٠ هێکتار زەوی بەراو، ٦/٢ هێکتار باخ و ١ تراکتۆرە.

ئاوایی‌یەکانی دەورووبەر:

باشوور: ئاوایی گوڵیار

باکوور: ئاوایی بەیتاس

ڕۆژهەلآت: ئاوایی حەولآکوردە

ڕۆژاوا: ئاوایی‌یەکانی دووسەید و خاتوونئەستی

چیاکانی دەورووبەری ئاوایی:

باکوور: بەردەمێش

ڕۆژاوا: ماینەتۆپیو

کانیاوەکان بە گۆلی درێژی، گۆلی مام سایەقی، کانی چاڵە بەفر، کانی بلّقێ، کانی کۆنەکاوەیس، سێکانیان و کانی لاسان ناسراون.
گشت خانووبەرەکان، جگە لە یەکیان کە لە سەرووی ماڵانەوە، لە قوڕ و بەرد ساز کراون و میچەکانیان لە دارە، ماڵەکان حەوشەیان نییە و بە گشتی رووبیان لە ڕۆژهەلآتە.
ئەو ئاوایی‌یە پێشتر لە بەری ڕۆژاوا لە سەر شاخی "ماینەتۆپیو" بووە کە بە هۆی نەبوونی ئەمنییەت و دوور بوون لە ڕێگا و دژواری هاتووچۆ بەتایبەت لە کاتی بەفر بارینێدا گوێزتوویانەتەوە شوێنی ئێستای و لە نزیک حەولآکوردە لە داوێنی کێودا خانوویان ساز کردۆتەوە. ئەم ڕووداوە لە سەردەمی دابەشکردنی زەوی بەسەر ڕەعیەتاندا بووە.
یەکێک لە بەتەمەنترین کەسانی ئەو دێیە بە ناوی کاک "عەلی مەحموودی" دەڵێ: "سلێمانی ڕەسووڵئاغای" ناوی ئەم دێیەی ناوە، بەلآم هێندێک کەسی دیکەی خەلکی ئاوایی دەڵێن ئەم گوندە لەوانەیە بە ناوی سەید "وەیس" کە زوو لەم ئاوایی‌یە ژیاوە، کرابێ، ئەو سەید "وەیس"ە وەکوو بەساڵاچووان گوێیان لێبووە سەرەتا لەم دێیە تاقە ماڵە بووە. بە پێی قسەی خەلک تا چەند ساڵ لەمەوبەر لە نێوان کاوەیس ـ بەیتاس، لە شوێنێک بە ناوی "بەردەمێش"، کونێکی لێبووە و لە نێو کونەکەدا ژوورێکی تێدا بووە کە داتاشراوە؛ کاک عەلی مەحموودی دەڵێ: ڕۆژێکی بۆخۆم چرایەکم هەلگرت و چوومە نێو ئەو کونە و ئەم شوێنە ئێستا پڕ بۆتەوە.
تەنیا ڕێگای ئەو ئاوایی‌یە، پردێکە لە بەری ڕۆژهەلآتی دێ کە دەچێتەوە ئاوایی حەولآکوردە.
لە ڕێکەوتی ١٣٦٨/٧/٦ کارەبای بۆ هەلکراوە و بۆ دابینکردنی هەموو نیازەکانی تریان وەکوو: قوتابخانە، دەرمانگا، بنکەی تەندروستی، مخابەرات، نەوت و کەلوپەلی پێویست و هتد، دەبێ بچنە ئاوایی حەولآکوردە. ئاوی کاوەیس لە چاڵاو دابین دەبێ و ئاوی خواردنەوەی لوولەکێشیی بۆ نەکراوە.
لەو گوندە بایەخیکی زۆر بە چنینی هێندێک شتی وەکوو: گۆرەوی، کڵاو، دەستەوانە و... دەدرێ، هەروەها بەشێک لە کچان و کوڕانی ئاوایی سەرقاڵی تەون کردنن.
کاروپیشەی خەلکی ئاوایی وەرزێری، ئاژەلداری و کرێکارییە، هەروەها ئاوایی کاوەیس دوو باخی سێوی لێیە، وەرزێران گەنم، نۆک و جۆ دەچێنن و ئاژەلەکانیشیان مەڕ و مانگان.
خەلکی کاوەیس بۆ ناشتنی مردووەکانیان دەچنە گۆڕستانی ئاوایی‌یەکانی حەولآکوردە و دووسەید.

## کۆزەکەرێز (کۆسە کەرێز)

ئەم ئاواییە لە ٢٥ کیلۆمیتری باکووری ڕۆژاوای شاری مەهاباد، بەشی ناوەندی و دێهستانی موکریانی ڕۆژاوا و لە ناوچەی شارۆیران هەڵکەوتووە. لە ٣٢٨ ماڵ و ١٨٧٥ کەس پێکهاتووە، لەمانە ٩٧٧ کەس پیاون و ٨٩٨ کەسیش ژنن، لە ١١٨٨ کەسی خوێندەوار ٦٧٥ کەس پیاون و ٥١٣ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٥١٤ کەسی نەخوێندەوار ٢٠٣ کەس پیاون و ٣١١ کەسیش ژنن.

بە پێی سەرژمێرییەک کە دێهیاری ئەم ئاواییە لە کۆتایی ساڵی ١٣٨٧ی هەتاوی ڕایگەیاندووە، ژمارەی دانیشتووانی ئەم ئاواییە بۆتە ١٩٢٧ کەس.

پانتایی ئاوایی ١٢٠٠ هێکتارە، لەمە ٨٥٩ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و ١١٤١ هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.

کۆزەکەرێز خاوەن ٢٥٥٠ هێکتار زەوی دێم، ٤٦٤ هێکتار زەوی بەراو، ٢٩٢/٥ هێکتار باخ، ٦٦ تراکتۆر، ١٢ لاوێردە، ٥ تووچێنەر و ٢ کۆمباینە.

بەرزایی ئاوایی ١٣٢٥ میتر لە ڕووکەشی زەریاکانە.

ئاواییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی گۆلێ

باکوور: ئاوایی قەرەقشلاق

ڕۆژهەڵات: ئاوایی قزڵقۆپی

ڕۆژاوا: ئاوایی شێخ مارف (سەر بە شاری نەغەدە)

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باشوور: کێوی لێیە ناوێکی تایبەتی نییە

ڕۆژهەڵات: کێوی لێیە ناوێکی تایبەتی نییە

ڕۆژاوا: شاخی نەعنان و خرەهەنجیران

ئەشکەوتی خرەهەنجیران لە ڕۆژاوای دێ هەڵکەوتووە. ئاوی کەرێزە و کانی نێومالان دوو کانیاون لەو دێیە.

ئەم ئاواییە زۆرتر ڕەنگ و ڕوخساری شاری بەخۆوە گرتووە، بیناکانی لە قوڕ و بەردی خەریکن بە یەکجاری لەنێو دەچن و خانووبەرەکان بە خشت، چیمەنتۆ و کەرەسە نوێیەکان ساز دەکرێنەوە، میچی خانووەکان لە ئاسنە و ماڵەکان خاوەن حەوشەن، ڕێگای قیلەتاو بە ناوەندی ئاواییدا تێپەڕ دەبێ، کۆڵانەکان ڕێک و ڕاستن و قاناویان بۆ کێشراوە. گەڵاڵەی هادی ساڵی ١٣٨١ی هەتاوی لەم ئاواییە دەستی پێکردووە.

تەپۆڵکەی "چاکەچکۆڵە" لە باشووری ڕۆژهەڵات بە بەرزایی ١٣٤٩ میتر لە ڕووکەشی زەریاکان و ژمارە ی تۆمارکراوی ١٥٩٨٧ لە میراتی فەرهەنگی، دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی ٤ تا ٦ی کۆچی مانگی ـ هەزارەی یەکەمی پێش زایین.

تەپەی کۆزەکەرێز (گۆران‌تەپە) لە مەودای ٢ کیلۆمیتری باکووری ئاوایی بە ژمارەی تۆمارکراوی ١٥٩٨٥ و بەرزایی ١٣٠٢ میتر لە ڕووکەشی زەریاکان، ئاماژە بە هەزارەی دووهەمی پێش زایین ــ نیوەی دووهەمی هەزارەی یەکەم دەکا.

هێندێک لە دانیشتووانی ئاوایی بەتایبەت بە ساڵداچووەکان ڕایان وایە بە هۆی ئەمە کە زوو ئەم دێیە ڕووتەن بووە و داری لێ نەبووە، کۆسە یان کۆزەیان پێ گوتووە؛ هەروەها ئەم دێیە کەرێزەی هەبووە. لە باشووری دێ ڕێگایەکی خاکی دەچێتەوە ئاواییەکانی گۆلێ و چۆمەڵان، لە باکوورەوە ڕێگایەکی قیلەتاو دەچێتەوە سەر جادەی سەرەکی قیلەتاوی مەهاباد ـ ورمێ.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی ١٣٥٥/٧/١٨ کارەباکەی هەڵکراوە، لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە کە ساڵی ١٣٦٣ی هەتاوی جێبەجێ کراوە و خاوەن دوو عەنباراوە کە یەکیان لە کانیاوی نێو ئاوایی و ئەوی دیکەیان لە عەنباراوی ئاوایی "دارەلەک" درێژتە نێوی، تەلەیفوونی ماڵ بە ماڵ، سیمکارتی مخابەراتی دێهات، پۆستبانک، بنکەی تەندروستی، باخچەی ساوایان، ئاکابیری، قوتابخانەی سەرەتایی (کوڕانە ـ کچانە) بە ناوی "ڕەحیم شوکری" بۆ کوڕان و "خەدیجەی کوبرا" بۆ کچان، قوتابخانەی ناوەندی (کوڕانە ـ کچانە) بە ناوی "هەشتی شەهریوەر" بۆ کوڕان و "فەرزانە" بۆ کچان، شەریکەی هاوبەشیی نەوت و کەلوپەل، مزگەوت بە ناوی "ئیمام شافعی" کە ساڵی ١٣٧٥ی هەتاوی نۆژەن کراوەتەوە، کارخانەی کوودی کیمیایی (کەرتی تایبەتی)، دوو نانەوەخانە (کەرتی تایبەتی)، کارگەی بلووک زەنی (کەرتی تایبەتی)، سێ جووجەخانە (کەرتی تایبەتی). هەروەها سێ سەرتاشخانە، چوار بەرگدروو و قەسابییەکی لێیە و دوو شوێنی بۆ فرۆشتنی کەپسوولی گازی لێیە. خوێندکارانی کوڕ و کچ بۆ درێژەپێدان بە خوێندن دەچنە شاری مەهاباد. کارویپیشەی خەڵکی ئەم گوندە وەرزێری، ئاژەڵداری، باخداری، کرێکاری و شۆفێرییە (بەتایبەت ماشێنی گەورە)، بە پێیی نیاز و زۆر بوونی خەڵکەکە، هێندێک کارویپیشەی بەربڵاوی دیکەش لە نێو ئاواییدا دەکرێ.

وەرزێران گەنم، جۆ و چەوەندەر دەچێنن و ئاژەڵداران و مانگا، مەڕ و بزن ڕادەگرن. بەرهەمی باخدارەکانیش سێو، بادام و ترێیە.

گرفتەکانی خەڵکی کۆزەکەرێز: نەبوونی شوێنێکی تایبەتی بۆ ڕشتنی زبڵوزاڵی ئاوایی، نەبوونی ژێرگووزەرێک لە سێڕای کۆزەکەرێز، نەبوونی قوتابخانەی دواناوەندی و پەرتووکخانە، نەبوونی فەزای سەوزی نێو دێ. گۆڕستانی ئاوایی لە بەری باشوور هەڵکەوتووە.

## کۆرەگێ

کۆرەگێ لە ٤٥ کیلۆمیتری باشووری شاری مەهاباد، بەشی خەلیفان و دێهستانی کانی بازاڕ و لە ناوچەی مەنگوڕایەتی هەڵکەوتووە. لە ٩ ماڵ و ٥٤ کەس پێکهاتووە، لەمانە ٣٤ کەس پیاون و ٢٠ کەسیش ژنن، ژمارەی خوێندەوارانی ئەم ئاواییە ٢٦ کەسە کە ١٩ کەسیان پیاون و ٧ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٢١ کەسی نەخوێندەوار ٨ کەس پیاون و ١٣ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ٥٨١/٧١ هێکتارە، لەمە ١٢٢/٨١ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و ٤٥٨/٩ هێکتار پاوان و لەوەرگەی دێیە.

کۆرەگێ خاوەن ١٨٠ هێکتار زەوی دێم، ٣٢ هێکتار زەوی بەراو، ٣ هێکتار باخ و ٣ تراکتۆرە.

ئاواییەکانی دەورووبەر:

باشوور: ئاوایی چوارگا

باکوور: ئاوایی یەڵتەمر

ڕۆژهەڵات: ئاواییەکانی قۆیتەڵ، کانیسێو و ئۆزونتاش

ڕۆژاوا: ئاوایی کوێچکەدەرێ

باکووری ڕۆژاوا: ئاوایی کیتکە

چیاکانی دەورووبەری ئاوایی:

باشوور: حەوشەڕەشە، کەماجار

کانی سەلیم ساغۆڵ، کانی گیای حاجی و کانی گردی چەقەی سێ کانیاوی بەناوبانگی ئاوایین.

خانووبەرەکان لە قوڕ و بەرد و میچی دارە، ماڵەکان حەوشەیان نییە و زۆربەیان ڕوو بە ڕۆژهەڵات ساز کراون.

شایانی باسە کە خەڵکی ئاوایی دەگێرنەوە لە ساڵانی کۆتایی سەردەمی پەهلەویدا، زۆر جێگای ئاوایی کۆرەگێیان کۆڵیوتەوە و داوەتەوە و هەموو ئەو ئاسەوارانەی دۆزراوەنەتەوە بەتاڵانیان بردووە.

بەساڵاچووانی ئاوایی وا باس لە مێژووی ئەو گوندە دەکەن کە گۆیا ئەم گوندە پێشتر ئاشی ئاوی لێبووە و ئەو کەرەسەی کە ئاوەکەی لێدەدا و دەیسووڕێنێ "کۆرەگەی ئاشی" پێدەڵێن و بە بۆچوونی ئەوان ناوی "کۆرەگێ" هەر لەوەڕا هاتووە.

لە باشووری ئاوایی ڕێگایەکی خاکی و سەخلەت هەیە کە تێکەڵی ڕێگایی ئاوایی چوارگا دەبێتەوە، لە باکوورەوە ڕێگایەکی خاکی ئاوایی یەڵتەمر دەگرێتەوە.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی 1357/10/19 کارەباکەی هەڵکراوە، سیمکارتی مخابەراتی دێهات، مزگەوت. بۆ دەستپێڕاگەیشتن بە بنکەی تەندروستی، وەرگرتنی نەوت و کەلوپەل سەر بە ئاوایی "خەلیفان"ن.

بە هۆی نەبوونی قوتابخانە هێندێک لە قوتابیان دەچنە ئاوایی یەڵتەمر و پاش تێپەڕ کردنی پۆلی سەرەتایی بە دەگمەن هەڵدەکەوێ درێژە بە خوێندن بدەن.

وەرزێری، ئاژەڵداری، کرێکاری و تاڕادەیەک باخداری کاروپیشەی خەڵکی ئەم گوندەیە. وەرزێران گەنم، جۆ و نۆک دەچێنن، ئاژەڵەکان لە مەڕ، مانگا و بزن پێکهاتوون و بەرهەمی باخەکانیشیان سێوە.

گرفتەکانی خەڵکی کۆرەگێ: نەبوونی قوتابخانەیەکی سەرەتایی، پێویستی بە لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە، ڕێگاوبانی ناخۆش و نالەبار.

گۆڕستانی ئاوایی بە "شاوێردیبەگ" ناسراوە کە زۆرجار چەند ئاوایی دەورووبەریش کەلکی لێ وەردەگرن.

## کولیجە

کولیجە لە ٢٧ کیلۆمیتری رۆژهەڵاتی شاری مەهاباد، بەشی ناوەندی و دێهستانی ئاختاچی رۆژاوا و لە ناوچەی محاڵ هەڵکەوتووە. لە ١٢٥ ماڵ و ٦٨٢ کەس پێکهاتووە، لەمانە ٣٤٧ کەس پیاون و ٣٣٥ کەسیش ژنن، ژمارەی خوێندەوارانی ئەم ئاوایی‌یە ٣٩٦ کەسە کە ٢٢٧ کەس پیاون و ١٦٩ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٢١٧ کەسی نەخوێندەوار ٨٣ کەس پیاون و ١٣٤ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی 2666/66 هێکتارە، لەمە 666/66 هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و ٢٠٠٠ هێکتار پاوان و لەوەرگەی دێیە.

کولیجە خاوەن ٦٤٠ هێکتار زەوی دێم، ٢٣٣ هێکتار زەوی بەراو، ٢٢٥ هێکتار باخ و ٣٥ تراکتۆرە.

ئاوایی‌یەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی‌یەکانی سیچان‌بلاغ و سەهۆڵان

باکوور: ئاوایی بورهان

رۆژهەڵات: ئاوایی یالاوەی سەرێ

رۆژاوا: ئاوایی‌یەکانی قەمتەرە و قزڵجەی خوارێ

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باشوور: خەلکێ

باکوور: سووڵتان

رۆژهەڵات: حەسەن‌داروغە و قشەهوو

لە باشووری ئاوایی ئەشکەوتێک بە ناوی "کونەپێست"ی لێیە کە "ئەشکەوتان"یشی پێدەڵێن.

کوردبلاغ، قەرەبلاغ، قشەهوو و تالاوکە، کانیاوە بەناوبانگەکانی ئاوایین.

خانووبەرەکان زۆرتری لە قوڕ و بەرد و میچی دارە، لە شێوازی نوێدا بلووک و خشت بە کار هاتووە، ماڵەکان حەوشەیان هەیە و دەروازەیان تێگیراوە، لەم ئاوایی‌یە چەندین کۆڵانی رێک هەیە و لە دەسپێکی ئاوایی قاناویان لێداوە.

کولیجە هەر لە قەدیمەوە مەڵبەندی سەیدان بووە کەچی ئێستا تەنیا چەند ماڵی سەیدی لێ ماوە.

تەپەی قەڵای کولیجە هەڵکەوتوو لە باشووری ئاوایی، بە ژمارەی تۆمارکراوی ١٦٦٢٧ لە لایەن میراتی فەرهەنگی، بە بەرزایی ١٧٩٣ میتر لە رووکەشی زەریاکان، مێژوویەکەی دەگەڕێتەوە قۆناغی ئاسن.

لە باکووری ئاوایی رێگایەکی قیلەتاو، نزیک بە ٢ کیلۆمیتر، تێکەڵ بە جادەی سەرەکی مەهاباد ـ بۆکان دەبێتەوە.

ئیمکاناتی ئاوایی: رێکەوتی ١٩/١٠/١٣٥٧ کارەباکەی هەڵکراوە، لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە، مزگەوتی "حەزرەتی عایشە" کە ساڵی ١٣٨٢ نۆژەن کراوەتەوە، سیمکارتی مخابەراتی دێهات، قوتابخانەی سەرەتایی (کوڕانە ـ کچانە) بە ناوی "پەرتۆ" (١٣٧٨)، قوتابخانەی ناوەندی، ئاکابیری، بنکەی تەندروستی و هەروەها ئاوایی لە دێهیاری و شووڕای ئیسلامی بەهرەمەندە. بۆ وەرگرتنی نەوت و کەلوپەل سەر بە شەریکەی هاوبەشیی ئاوایی "بورهان"ن.

قوتابیان بۆ درێژەدان بە خوێندن رەوانەی مەهاباد و بۆکان دەبن.

وەرزێری، ئاژەڵداری، باخداری و کرێکاری سەرەکی‌ترین کاروپیشەی خەڵکی ئەم گوندەیە. وەرزێران گەنم و جۆ دەچێنن، ئاژەڵەکانیان مەڕ، مانگا و بزنن، بەرهەمی باخەکان سێوە.

گرفتەکانی خەڵکی ئاوایی: پێویستی بە بەرێوە چوونی گەلاڵەی هادی‌یە، تەلەیفوونی ماڵ بە ماڵ.

"بابەرۆستەم" و "سەربڕیو" دوو گۆڕستانی ئەم ئاوایی‌یەن، خەڵکی ئاوایی‌یەکانی قەمتەرە، سیچان‌بلاغ و کولیجە مردووەکانیان لە گۆڕستانی بابەرۆستەم دەنێژن، هێندێک لە خەڵکی ئەم ئاوایی‌یە مردووەکانیان لە گۆڕستانی ئاوایی خانەقا (سەر بە بۆکان) دەنێژن.

## کۆنەدێ (شارویران)

کۆنەدێ لە ٤٨ کیلۆمیتری باکووری شاری مەهاباد، بەشی ناوەندی و دێهستانی موکریانی ڕۆژاوا و لە ناوچەی شارویران هەڵکەوتووە. لە ٣٠ ماڵ و ١٦٤ کەس پێکهاتووە، لەمانە ٧٩ کەس پیاون و ٨٥ کەسیش ژنن، لە ٩٦ کەسی خوێندەوار ٥٤ کەس پیاون و ٤٢ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٤٨ کەسی نەخوێندەوار ١٣ کەس پیاون و ٣٥ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی دەگەڵ ئاوایی گردیاقووب پێکەوە حیساب کراون و هەر دووک ئاوایی لەسەریەک ١٥٠٠ هێکتارن، لەمە ٥٢٠ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و ٩٨٠ هێکتار پاوان و لەوەڕگەی ئەم دوو ئاوایییەیە.

کۆنەدێ خاوەن ٢٩٢ هێکتار زەوی بەراو(زەوێ دێمی نییە)، ٢٧ هێکتار باخ و ٦ تراکتۆر، ٤ لاوێردە و ١ تووچێنەرە.

ئاوایییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی قەرەقشلاق

باکوور: ئاوایی داشخانە

ڕۆژهەلات: ئاوایی گردیاقووب

ڕۆژاوا: ئاوایی مێمەند (سەر بە شاری نەغەدە)

بەو هۆیەی ئەو شوێنەی ئەو گوندەی لێ هەڵکەوتووە، دەشتایییە، هیچ کێوێک لە دەوروبەری دێ وەبەرچاو نایە و تەنیا لە بەری ڕۆژهەڵاتەوە تەپۆڵکەیەکی بە ناوی "شام"ی لێیە. شام شوێنێکی سروشتی و سەیرانگایەکە و خەڵک لێی دەحەسێنەوە.

قوڕ و بەرد وەک کەرەسەی سازکردنی خانوو و بیناکان، کەمتر دەکار کراوە و ئێستە کەرەسەی وەکوو خشت، چیمەنتۆ، بلووک و ئاسن دەکار دەکرێ، ماڵەکان خاوەن حەوشەن و کۆڵانەکانی ئاوایی زۆر ڕێک نین.

کۆنەدێ پێشتر وەک بەشێک لە ئاوایی "گردیاقووب" بە دەست ئاغاکانی ئەم دێیە ئاوەدان بۆتەوە، بەڵام بەساڵاچووانی ئاوایی دەڵێن بەر لەوەش کۆنەدێ هەر ئاوەدان بووە و بۆ ماوەیەک چۆڵ کراوە و لە پاشان ئاغاکان هاتوون و ئاوەدانیان کردۆتەوە.

لە باشووری دێ، ڕێگایەکی قیلەتاو، دەچێتەوە ئاوایییەکانی خوڕخوڕە و قەرەقشلاق، لە باکوورەوە، ڕێگایەکی خاکی، ئاوایی داشخانە دەگرێتەوە، لە ڕۆژهەڵاتەوە، ڕێگایەکی قیلەتاو، دەڕوا بۆ ئاوایی گردیاقووب.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی ١٣٦٧/٨/٥ کارەبای بۆ هاتووە، لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە کە عەنباراویان لە ئاوایی خوڕخوڕە داناوە، تەلەیفوونی ماڵ بە ماڵ، سیمکارتی مخابەراتی دێهات، قوتابخانەی سەرەتایی(کوڕانە ـ کچانە) بە ناوی "ڕەئووف"(ساڵی ١٣٥٨ی هەتاوی) و مزگەوت ساڵی ١٣٧١ی هەتاوی نۆژەن کراوەتەوە. بۆ بنکەی تەندروستی و وەرگرتنی نەوت و کەلوپەل سەر بە ئاوایی "خوڕخوڕە"ن.

خوێندکاران بۆ درێژەدان بە خوێندن دەچنە خوڕخوڕە، دارەلەک، مەهاباد و ئەم مافە بۆ کوڕان و کچان پارێزراوە.

کاروپیشەی خەڵکی کۆنەدێ وەرزێری، ئاژەڵداری، باخداری و کرێکارییە، وەرزێران گەنم، جۆ، چەوەندەر و گوڵەبەڕۆژە دەچێنن، ئاژەڵەکانیشیان زیاتری مانگان و دوو ماڵ مەڕدارن، کۆنەدێ گامیشی زۆر کەم لێیە. بەرهەمی باخەکانیشیان سێوە.

گرفتەکانی خەڵکی کۆنەدێ: نیازیان بە دەرکردنی ئاوەڕۆیە، نەبوونی بنکەی تەندروستیی سەربەخۆ.

گۆڕستانەکەیان دەگەڵ ئاوایی گردیاقووب هەر یەکە و بە "سەیدی باخچە" ناسراوە.

## کۆنەدێی شۆگای

ئەم ئاەاییە لە ٤٨ کیلۆمیتری باشووری شاری مەهاباد، بەشی خەلیفان و دێهستانی کانی بازاڕ و لە ناوچەی مەنگوڕایەتی هەڵکەوتووە. لە ٢٢ ماڵ و ١٧٢ کەس پێکهاتووە، لەمانە ٨٢ کەس پیاون و ٩٠ کەسیش ژنن، لە ١٠٢ کەسی خوێندەواری ٥٣ کەسیان پیاون و ٤٩ کەسیش ژنن، لە ٥٢ کەسی نەخوێندەوار ١٨ کەس پیاون و ٣٤ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ٨٢٠ هێکتارە، لەمە ٢٢٥ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە، ٥٩٥ هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.

کۆنەدێی شۆگای خاوەن ٢٠٠ هێکتار زەوی دێم، ٢٢ هێکتار زەوی بەراو، ٧ هێکتار باخ، ١٣ تراکتۆر و ٢ لاوێردەیە.

مەودای ئاوایی تا ناوەندی خزمەتگوزاریی وەرزێری ١٣ کیلۆمیترە.

ئاوایییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی قۆزلووی چووک

باکوور: ئاوایی گەنەدار

ڕۆژهەڵات: ئاوایی گوێچکەدەرێ

ڕۆژاوا: ئاوایی ئافان

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باشوور: تەپکی دۆڵەباخی

باکوور: قەڵاشەکر

(کە بەشێک لە ڕۆژهەڵاتیش دەگرێتەوە)

ڕۆژاوا: شاخی قەلێ یان (بڵێندە)

کانیاوەکان بە کانی زێڕە، کانی بڵێندە، کانی خراتان، کانی باخی، کانی خرەسێوێ، کانی خرەپەلکان، کانی سێو و کانی مێرزندین ناسراون.

خانووبەرەکان لەم دێیە زۆرتر هەر لە قوڕ و بەردن و میچەکانیان لە دارە. ئەو بینا نوێیانەی ئێستە ساز دەکرێن بلووک دەکار دەکەن. کۆڵانەکانی ئاوایی بەرتەسک و نارێکن، گەڵاڵەی هادی لە کۆنەدێ هێشتا دەستی پێ نەکردووە.

لە ڕۆژهەڵاتی دێ ڕێگایەکی خاکی دەچێتەوە سەر جادەی سەرەکی مەهاباد ـ سەردەشت.

ئیمکاناتی ئاوایی: کارەبا، بنکەی مخابەرات، قوتابخانەی سەرەتایی (کوڕانە ـ کچانە) بە ناوی "ڕەئووف"، مزگەوت کە ساڵی ١٣٧٩ی هەتاوی نۆژەن کراوەتەوە بە ناوی "حەزرەتی ئیبراهیم" (د. خ) و هەروەها کۆنەدێ شۆگای خاوەن شووڕای ئیسلامییە. بۆ بنکەێ تەندروستی سەر بە ئاوایی "گوێچکەدەرێ"ێن، نەوت و کەلوپەل لە شەریکەی هاوبەشیی ئاوایی "کیتکە" وەردەگرن.

ئاوی خواردنەوەی لوولەکێشیی نەکراوە و لە ئاوی کانی و چاڵاوان کەلک وەردەگرن.

خوێندکاران بۆ درێژەدان بە خوێندن دەچنە خەلیفان و مەهاباد و لەم بوارەوە مافی کوڕان و کچان پارێزراوە.

کاروپیشەی خەڵکی کۆنەدێ لە وەرزێری، ئاژەڵداری و باخداری پێکهاتووە. وەرزێران گەنم و جۆ دەچێنن.

ئاژەڵەکانیان مەڕ و مانگان. بەرهەمی باخەکانیان سێو، قەیسی، گوێز و بادامە.

گرفتەکانی خەڵکی دێ: ڕێگای خاکی، پێویستییان بە لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوەیە و بەڕێوە بردنی گەڵاڵەی هادی.

ئەو دێیە خاوەن دوو گۆڕستانە کە لە بەری ڕۆژاوای گوند هەڵکەوتووە.

## کۆنەدێی قازی

ئەم ئاوایییە لە ١٠ کیلۆمیتری باشووری ڕۆژهەڵاتی شاری مەهاباد، بەشی ناوەندی و دێهستانی ئاختاچی ڕۆژاوا و لە ناوچەی محاڵ هەڵکەوتووە. لە ٩ ماڵ و ٣٢ کەس پێکهاتووە، لەمانە ١٦ کەس پیاون و ١٦ کەسیش ژنن، ڕادەی خوێندەواران ٨ کەسە کە ٥ کەس پیاون و ٣ کەسیش ژنن، هەروەها لە ١٩ کەسی نەخوێندەوار ٩ کەس پیاون ١٠ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ١٠٦٦/٧٠ هێکتارە، لەمە ٩٠ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و ٩٧٦/٧ هێکتار پاوان و لەوەرگەی دێیە.

کۆنەدێی قازی خاوەن ٤٠ هێکتار زەوی دێم، ١٠٤ هێکتار زەوی بەراو، ٢٦ هێکتار باخ، ٦ تراکتۆر و ٣ لاوێردەیە.

ئاوایییەکانی دەورووبەر:

باشوور: ئاوایییەکانی ئۆزندەرێی خوارێ و سەرێ

باکوور: ئاوایی لاچین

ڕۆژهەڵات: ئاوایی شیلاناوێ

ڕۆژاوا: بەشێک لە ئاوایییەکانی ئۆزندەرێی سەرێ و خوارێ و بەشێک لە شاری مەهاباد

چیاکانی دەورووبەری ئاوایی:

باشوور: بەردەحەولا

باکوور: سەردەشتان

ڕۆژهەڵات: ئاغداغ

ڕۆژهەڵات: کونەکۆتر

ئاغ داغ و شێخ حەیدەر، دوو هەوارگەن کە تا چەند ساڵ لەمەوبەر خەڵکی ئاوایی دەچوون.

کانیاوەکان بە کانی پۆلکێ، مووچەی ئیسای و مەلا داود ناسراون.

لەم دێیە خانووبەرەکان زۆرتر لە قوڕ و بەردن و میچیان لە دارە، هەنووکە خشت و چیمەنتۆ دەکار دەکرێ کە ڕادەیان کەمە، ماڵەکان خاوەن حەوشەن و بەرەو هەورازن و زۆرتر ڕوویان لە باشوورە.

لە باشووری دێ ڕێگایەکی خاکی، دوو ئاوایی ئۆزندەرێی خوارێ و سەرێ دەگرێتەوە، لە باکوورەوە ڕێگایەکی خاکی دەڕواتەوە بۆ ئاوایی لاچین.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی ١٣٧٧/٨/١١ کارەباکەی هەڵکراوە، تەلەیفوونی ماڵ بە ماڵ. کێوی کونەکۆتر کانگای بەردی لییە. بۆ بنکەی تەندروستی سەر بە ئاوایی "ئۆزندەرێ"ن، نەوت و کەلوپەل لە شەریکەی هاوبەشیی "پشتتەپ"ی مەهاباد وەردەگرن.

ئەم دێیە لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوەی نییە و لە ئاوی کانییەکان کەلک وەردەگرن، مزگەوتەکەیان گەلێک کۆنە و خەریکە دەڕووخێ و دەرگاکەی گاڵە دراوە.

پێشتر قوتابخانەی سەرەتایی لەم گوندەدا هەبوو کە بیناکەی ڕووخاوە و ئیتر هیچ هەوڵێک بۆ سازبوونەوەی سەرلەنوێی نەدراوە و خوێندکاران هەر لە سەرەتاوە لە شاری مەهاباد دەخوێنن.

کۆنەدێ بە هۆی شەڕ و نائەمنی ساڵانێک لەمەوبەر، بە ماوەی پێنج ساڵان چۆڵ کرا و هەر ئەمە خۆی هۆکارێک بوو بۆ پاشکەوتنی لە بواری ئیمکاناتەوە.

وەرزێری، ئاژەڵداری و کرێکاری کاروپیشەی خەڵکی ئەم گوندەن، وەرزێران گەنم و نۆک دەچینن و زۆربەی ئاژەڵەکانیان مانگان، تا ڕادەیەکیش مەڕ ڕادەگرن. ئەم دێیە باخی کەمە و بەرهەمەکانیان سێو و سنجوویە. لە کۆنەدێ هێندێک داری خۆڕسکی وەکوو گێوژ، کرۆسک و شیلانی لێیە.

گرفتەکانی خەڵکی کۆنەدێی قازی: ڕێگای خاکی و ناخۆش، نەبوونی قوتابخانە، تەنانەت نەبوونی قوتابخانەی سەرەتایی، نیاز بە نۆژەن کرنەوەی مزگەوت، نیازی بە لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوەیە.

ئەم گرفتانە هەموو بوونەتە هۆکارگەلێک بۆ چۆڵ بوونی ئاوایی، زۆربەی ماڵەکان لە بەر منداڵەکانیان لە شار خانوویان بە کرێ گرتووە.

گۆڕستانەکەی ئاوایی لە بەری باکووری دێیە، بەڵام ئێستا مردووەکانیان کەمتر لە ئاوایی دەنێژن و دەیانبەنە گۆڕستانی شاری مەهاباد.

## کوران

کوران له ٦٣ کیلۆمیتری باشووری شاری مەهاباد، بەشی خەلیفان و دێهستانی کانی بازاڕ و له ناوچەی گەورکایەتی هەڵکەتووە. لە ٥٧ ماڵ و ٣٦٤ کەس پێکهاتووە، لەمانە ١٩٠ کەس پیاون و ١٧٤ کەسیش ژنن، له ٢٠٢ کەسی خوێندەوار ١٣١ کەس پیاون و ٧١ کەسیش ژنن، هەروەها لە ١٢٤ کەسی نەخوێندەوار ٤٣ کەس پیاون و ٨١ کەسیش ژنن.
پانتایی ئاوایی ١٦١١ هێکتارە، لەمە ٢٠٢ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و ١٤٠٩ هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.
کوران خاوەن ٥٥ هێکتار زەوی دێم، ١٢ هێکتار زەوی بەراو، ١٧ هێکتار باخ و ٢ تراکتۆرە.
مەودای ئاوایی تا ناوەندی خزمەتگوزاریی وەرزێری کانی بازاڕ ٣٢ کیلۆمیترە.

ئاواییەکانی دەوروبەر:
باشوور: ئاوایی کاوڵانی سەرێ
باکوور: ئاوایی یاراڵی
ڕۆژهەڵات: ئاوایی کاوڵانی خوارێ
ڕۆژئاوا: ئاواییەکانی سوورخاو و چۆمەڵ

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:
باشوور: بەردەقەڵ
باکوور: بەندەنی شەشڕێیەن
ڕۆژهەڵات: قەڵات
ڕۆژاوا: تەرازوان

کانیاوەکان بە بەردە سپیان، نەقشە، میرخاسان، بناوان، سەبەرس، شەکراوێ، کانی تەرازوان و کانی گوێز ناسراون.
لە باشوور تا ڕۆژهەڵاتی ئاوایی لێرەوارە، خانووبەرەکان گشتیان لە قوڕ و بەرد و میچی دار ساز کراون، ماڵەکان هەوراز هەڵکەوتوون و حەوشەیان نییە، هێندێک لە ماڵەکان هەیوانیان هەیە و لە بەر دەرگا داریان چەقاندوون.
سەبارەت بە ناوی ئاوایی دوو بۆچوون هەیە ١ـ کوران لە لێرەوارەوە هاتووە ٢ـ کوران یان بە واتایەک داری ئەستوور بۆ سووتاندن*. لە باشووری دێ شوێنەواری ئاوەدانی لێیە کە بە "کۆنەکوران"ی دەناسن. خەڵکی ئەم ئاواییە بە هۆی بێئاوی کۆچیان کردۆتە شوێنی ئێستا، بەڵام دەسپێکی ئەم کۆچە ڕوون نییە.
تەنیا ڕێگای قیلەتاوی کاوڵانی خوارێ ـ کوران کە بە مەودای ٤ کیلۆمیترە، لە ڕۆژهەڵاتی ئاوایی هەڵکەوتووە و دەچێتەوە ئاوایی کاوڵانی خوارێ و جاددەی مەهاباد ـ سەردەشت.
ئیمکاناتی ئاوایی: ١٣٧٢/٩/٨ کارەباکەی هەڵکراوە، لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە کە لە کانی گوێز دابین دەبێ، سیمکارتی مخابەراتی دێهات، قوتابخانەی سەرەتایی (کورانە ـ کچانە) بە ناوی "فەتح"، مزگەوتێک بە ناوی محەممەدرەسوڵەڵلا (د.خ) کە کۆنەمزگەوتە و خەڵکەکەی خەریکی ساز کردنی مزگەوتێکی تازەن. هەروەها کوران خاوەن دێهیاری، شووڕای ئیسلامی و شووڕای چارەسەری کێشەکانە. بۆ کاروباری بنکەی تەندروستی و وەرگرتنی نەوت و کەلوپەل دەبێ بچنە ئاوایی "کاوڵان"ی خوارێ.
کاروپیشەی خەڵکی کوران ئاژەڵداری، وەرزێری و تا ڕادەیەک باخداری و کرێکارییە، ئاژەڵەکان لە مەڕ، بزن و مانگا پێکهاتوون و وەرزێران گەنم و جۆ دەچێنن، بەرهەمی باخەکان سێو، گوێز و ترێیە.
گەورەترین گرفتی خەڵکی ئاوایی کەمئاوییە بەتایبەت لە دوای ویشکەساڵی ١٣٨٧ی هەتاوی، هەروەها تەقینەوە و مەترسی ئەو مینانەی زەمانی شەڕ و نائەمنی، هەر چەند دەڵێن بێدەنگ کراون، بەڵام هەر مەترسیان ماوە و خەڵکەکە هەنووکەش ناوێرن بە زۆر شوێناندا بڕۆن.
مام "حوسێن شێخەنیژاد" بەیتبێژە و لەم گوندە دەژی. گۆڕستانی **کوران** لە باشووری هەڵکەوتووە.

---

* هەنبانەبۆرینە. ل ٥٥٦، ئەستوونی یەکەم

## کولته‌په

کولته‌په له ٥٣ کیلۆمیتری باشووری ڕۆژهه‌ڵاتی شاری مه‌هاباد، به‌شی خه‌لیفان و دێهستانی کانی بازاڕ و له ناوچه‌ی گه‌ورکایه‌تی هه‌ڵکه‌وتووه. له ٤١ ماڵ و ٢٣٩ که‌س پێکهاتووه، له‌مانه ١١٣ که‌س پیاون و ١٢٦ که‌سیش ژنن، ژماره‌ی خوێنده‌وارانی ئه‌م ئاواییه ١١٤ که‌سه که ٦٦ که‌س پیاون و ٦٠ که‌سیش ژنن، هه‌روه‌ها له ٩٨ که‌سی نه‌خوێنده‌وار ٣٤ که‌س پیاون و ٦٤ که‌سیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ٢٥٠٠ هێکتاره، له‌مه ٢٨٨ هێکتار بۆ خه‌ڵک جیا کراوه‌ته‌وه و ٢٢١٢ هێکتار پاوان و له‌وه‌ڕگه‌ی دێیه.

کولته‌په خاوه‌ن ١٤٥ هێکتار زه‌وی دێم، ٢٧ هێکتار زه‌وی به‌راو، ٩ هێکتار باخ، ١٧ تراکتۆر و ٣ لاوێرده‌یه.

به‌رزایی ئاوایی ١٥٠٠ میتر له ڕووکه‌شی زه‌ریاکانه.

ئاواییه‌کانی ده‌ورووبه‌ر:

باشوور: ئاوایی پاشبه‌رد

باکوور: ئاواییه‌کانی قۆزلوێ گه‌وره و یارالّی

ڕۆژهه‌ڵات: ئاوایی زیندووقووڵ

ڕۆژاوا: ئاوایی یارالّی

چیاکانی ده‌ورووبه‌ری ئاوایی:

باشوور: کوێخا حه‌سه‌ن

باکوور: هه‌مزه‌کوژراو

ڕۆژهه‌ڵات: گاجووتان

ڕۆژاوا: کاروانسه‌را

بیسمیلا، کوێخا حه‌سه‌ن، نێوماڵان، چۆڕچۆڕه و مزوریان کانیاوه به‌ناوبانگه‌کانی ئاوایین.

خانووبه‌ره‌کان به گشتی له قوڕ و به‌رد و میچی داره، ئاوایی خاوه‌ن چه‌ند کۆڵانێکی باریکه‌لانه و به‌رته‌سکه، زۆربه‌ی ماڵه‌کان به‌ره‌و باشوور ساز کراون و جگه له چه‌ند ماڵێک هیچ کامیان حه‌وشه‌یان نییه.

سه‌باره‌ت به مێژووی ئاوایی، خه‌ڵکه‌که‌ی له سه‌ر ئه‌و باوه‌ڕه‌ن که نزیک به ٧٠ ساڵ له‌مه‌وبه‌ر، شوێنی ئاوایی له دم کانیاوی "بیسمیلا" له باکووری شوێنی ئێستا بووه که دواتر ئه‌وێیان به‌جێهێشتووه و شوێنی ئێستایان ئاوه‌دان کردۆته‌وه. قه‌ڵای نێوماڵان هه‌ڵکه‌وتوو له ناوه‌ندی ئاوایی و قه‌ڵای کوێخا حه‌سه‌ن له باشووری دێ، دوو شوێنی مێژوویین له کولته‌په. ناوی ئه‌و دێیه به مانای ته‌پکی خۆڵه‌مێشه.

له ڕۆژهه‌ڵاتی ئاوایی، ڕێگایه‌کی خاکی ده‌چێته‌وه ئاواییه‌کانی زیندووقووڵ و گامێشان، له ڕۆژاواوه ڕێگایه‌کی خاکی که‌متر له ٥٠٠ میتر جاده‌ی سه‌ره‌کی مه‌هاباد ـ سه‌رده‌شت ده‌گرێته‌وه.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکه‌وتی 1357/10/19 کاره‌باکه‌ی هه‌ڵکراوه، قوتابخانه‌ی سه‌ره‌تایی (کوڕانه ـ کچانه) به ناوی "ناسر"، بنکه‌ی ته‌ندروستی، بنکه‌ی مخابه‌رات، مزگه‌وت (ساڵی ١٣٨٠ی هه‌تاوی نۆژه‌ن کراوه‌ته‌وه)، ئاکابیری، هه‌روه‌ها ئاوایی خاوه‌ن شووڕای ئیسلامی و شووڕای چاره‌سه‌ری کێشه‌کانه. بۆ وه‌رگرتنی نه‌وت و که‌لوپه‌ل سه‌ر به ئاوایی "کاوڵان"ی خوارێن. کوولته‌په لووله‌کێشیی ئاوی خواردنه‌وه‌ی نییه و خه‌ڵکه‌که‌ی له ئاوی چاڵاو که‌لک وه‌رده‌گرن.

جێگای ئاماژه‌یه بینای قوتابخانه کاول بووه و حه‌رێکه ده‌ڕووخێ. هێندێک له قوتابییه‌کان بۆ درێژه‌دان به خوێندن ده‌چنه ئاواییه‌کانی کاوڵانی خوارێ، خه‌لیفان و شاری مه‌هاباد.

وه‌رزێری، ئاژه‌ڵداری و کرێکاری کاروپیشه‌ی خه‌ڵکی ئه‌م گونده‌ن. وه‌رزێران گه‌نم و جۆ ده‌چینن و ئاژه‌ڵه‌کانیان بریتین له مانگا، مه‌ڕ و بزن.

گرفته‌کانی خه‌ڵکی ئاوایی: نه‌بوونی پردێکی قایم و پته‌و له سه‌ر ڕووباره‌که‌ی ئاوایی، خاکی بوونی نزیک به ٥٠٠ میتری ڕێگا بۆ سه‌ر جاده‌ی سه‌ره‌کی، پێویستی به لووله‌کێشیی ئاوی خواردنه‌وه‌یه، نه‌بوونی بینایه‌کی باش بۆ قوتابخانه.

ئاوایی خاوه‌ن دوو گۆڕستانه، کۆنه‌گۆڕستانه‌که‌ی به ناوی "مامه‌جامی" و له باشووری گونده و گۆڕستانه تازه‌که‌ی ناوی "سه‌ید خدر"ه.

## کەپەکەند

کەپەکەند لە ٢٢ کیلۆمیتری ڕۆژهەڵاتی شاری مەهاباد، بەشی ناوەندی و دێهستانی ئاختاچی ڕۆژاوا و لە ناوچەی محاڵ هەڵکەتووە. لە ٣٨ ماڵ و ٢١٧ کەس پێکهاتووە، لەمانە ٩٩ کەس پیاون و ١١٨ کەسیش ژنن، لە ١٣٦ کەسی خوێندەوار ٦٦ کەس پیاون و ٧٠ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٦٢ کەسی نەخوێندەوار ٢٥ کەس پیاون و ٣٧ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ١٩٨٤ هێکتارە، لەمە ١٨٤ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و ١٨٠٠ هێکتار پاوان و لەوەرگەی دێیە.

کەپەکەند خاوەن ٢٥٥ هێکتار زەوی دێم، ١٠٤ هێکتار زەوی بەراو، ٢٧ هێکتار باخ، ٣٢ تراکتۆر و ١٣ لاوێردەیە.

ئاوایییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایییەکانی قەرەبڵاغ و دەرمان

باکوور: ئاوایی بۆزە

ڕۆژهەڵات: ئاوایی حاجیاڵیکەند

ڕۆژاوا: ئاوایی بەردەمێش

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باشوور: تەپکی قەبران

باکوور: چاکی مێردەکان

ڕۆژهەڵات: کانی کیسەڵان

هەروەها کانیاوەکانی کەپەکەند بە گۆلی بەرەی، کەرێزە، کانی قەبران و گۆلی کێشەی ناسراون.

خانووبەرەکان لە قوڕ، بەرد، خشت و چیمەنتۆن، هەروەها میچی ئەم خانووبەرانە بە دار یان ئاسن داپۆشراون، ماڵەکان بەرەو هەر چوار لا هەڵکەوتوون و خاوەن حەوشە و دەرگان، کۆڵانەکان پێچاوپێچ و ناڕێکن، مزگەوت لە ناوەندی ئاواییدا ساز کراوە.

تەپکی قەبران و چاکی مێردەکان، وەکوو دوو شوێنی مێژوویی لەم ئاوایییەدا دێتە ژمار.

لە بەری ڕۆژاوای کەپەکەند ڕێگایەکی ئامادە بۆ قیلەتاو دەچێتەوە ئاوایی بەردەمێش، لە باشووریش ڕێگایەکی خاکی ئاوایی دەرمان دەگرێتەوە، هەروەها لە ڕۆژهەڵاتەوە ڕێگایەکی دیکەی خاکی دەچێتەوە ئاوایی حاجیاڵیکەند و بە ڕێگایەکی خاکی دیکەدا لە بەری باکوورەوە ئاوایی بۆزە دەگرێتەوە.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی ١٣٧٣/١١/٢٣ کارەباکەی هەڵکراوە، لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە کە عەنباراویان بۆ داناوە و ئاوەکەی لە کانی "گۆلی کێشە"ی دابین دەبێ، سیمکارتی مخابەراتی دێهات، قوتابخانەی سەرەتایی (کوڕانە - کچانە) بە ناوی "بەرادەرانی شەڕەفکەندی" کە ساڵی ١٣٨٣ی هەتاوی بینایەکی نوێیان بۆ ساز کردووە، مزگەوتی "بیلال حەبەشی" کە بەهاری ١٣٨٥ی هەتاوی نۆژەن کراوەتەوە، ئەم مزگەوتە جێگای ١١ فەرشی سێ و چوار دەبێتەوە و هەروەها ئەم دێیە خاوەن شووڕای ئیسلامی و شووڕای چارەسەری کێشەکانە. بۆ بنکەی تەندروستی سەر بە ئاوایی "قەرەبڵاغ"ن. نەوت هەر لە قەرەبڵاغ وەردەگرن و بۆ کەلوپەل ڕێگای ئاوایی "حاجیاڵیکەند" دەپێون. لەم گوندە کانگایەکی بەردی لێیە کە بەردەکەی دەکەنە تۆز و لە ساز کردنی خانوودا بە کاری دێنن.

خوێندکاران بۆ درێژەدان بە خوێندن دەچنە شاری مەهاباد.

کارووپیشەی خەڵکی ئاوایی وەرزێری، ئاژەڵداری، باخداری و کرێکارییە، وەرزێران گەنم، جۆ و نۆک دەچێنن و زۆربەی ئاژەڵەکانیان مانگان، تا ڕادەیەکی زۆر کەم مەڕ و بزنیش ڕادەگرن. بەرهەمی باخەکانیشیان سێوە و قەیسی.

کەمئاوی لە گرفتە سەرەتایییەکانی خەڵکی کەپەکەند بە ئەژمار دێ.

گۆرستانەکەیان لە نیزیک دێیە و بە قەبری "سەیدەفەقیرە" ناسراوە.

## کەرێزەی ئاڵیبایز

ئەم ئاوایییە لە ١٣ کیلۆمیتری باکووری شاری مەهاباد، بەشی ناوەندی و دێهستانی مۆکریانی ڕۆژهەلات و لـە ناوچـەی شـارویران هەڵکـەتووە. لـە ٣ ماڵ و ٢٥ کەس پێکهاتووە.
کەرێزەی ئاڵیبایز خاوەن ٢٠٠ هێکتار زەوی دێم، ٦٠ هێکتار زەوی بەراو، ١٨ هێکتار باخ و ٢ تراکتۆرە.
تا بەر لە ساڵی ١٣٥٧ هەتاوی ئەم ئاوایییە ١٤ ماڵ بووە.

ئاوایییەکانی دەورووبەر:
باشوور: ئاوایی تیکانلووجە
باکوور: ئاوایی گۆکتەپە
ڕۆژهەلات: ئاوایی خاتوونباخ
ڕۆژاوا: ئاوایی ئیندرقاش

چیاکانی دەورووبەری ئاوایی:
باشوور: کێوی کاولان
باکوور: پشت ماڵان

لە بەری باشووری ئاوایی، ئەشکەوتێک بە ناوی ئەشکەوتی "ئاڵیشەیتان" هەڵکەوتووە.
لە باشووری کەرێزەی ئاڵیبایز، کەرێزەیەکی سوننەتی هەیە کە لە دوو ڕیزە و هەر ڕیزەی پێنج کولانکەی هەیە کە چاوەیـان پێدەڵێن، مـەودای هـەر چاوە دەگەڵ چاوەکەی دیکە ٣٠ تا ٤٠ میتر دەبێ، قووڵایییان دە میترە و بۆ زۆر بوونی ڕادەی ئاودێری و چاوەدێری کانیاوی ئاوایی لێدراون.
چەند خانووبەرەیەکی ئاوایی بە خشت، بلووک، چیمەنتۆ ساز کراون و میچـەکانیان بـە ئاسـن یـان دار داپۆشـراون. ماڵـەکان ڕوویـان لـە ڕۆژهـەلات و ڕۆژاوایە. کانیاوی کەرێزە لە ناوەندی ئەم سێ ماڵە هەڵکەوتووە. گەلێک خانووبەرەی ڕووخاو و کاولبوو لە ئاواییدا دێنە بەرچاو کە لە خشتی کاڵ، قوڕ و یان "مۆرە"ن.
خەڵک دەڵێن: پێشتر لەم ئاوایییە قاوەخانەیەکی لـێ بـووە چەشنی کاروانسـەرا، پاشـان چەنـد مـاڵ لـە دوو کیلـۆمیتری بـاکووری کـەرێزەی ئێسـتا گوێزتوویانەتەوە بۆ ئەم شوێنە، ڕەنگە ئاڵیبایز کە هەمان "عەلی بایەزید"ە، دەسەلاتدار و ئاغای ئاوایی یان کەسایەتییەکی تایبـەتی بـووبێ کـە لـەم ئاوایییەدا ژیاوە.
لە ڕۆژهەلاتی ئاوایی ڕێگایەکی ٢ کیلۆمیتری خاکی دێتەوە سەر ڕێگای قیلەتاوی خاتوونباخ، لە ڕۆژاواش ڕێگایەکی خاکی دیکە هەیـە کـە دەچێتـەوە سەر ڕێگای قیلەتاوی مەهاباد ـ میاندواو.
ئیمکانـاتی ئـاوایی: سـاڵی ١٣٧٢ی هـەتاوی کارەباکـەی هـەڵکراوە. بـۆ وەرگرتنـی نـەوت و کـەلوپـەل سـەر بـە ئـاوایی "خـاتوونبـاخ"ن، بـۆ بنکـەی تەندروستیش هاتووچۆی ئاوایی "ئیندرقاش" یان شاری "مەهاباد" دەکەن. ئەم دێیە لوولەکێشیی ئاوی خواردنـەوەی نییـە و ئاوەکـەیان لـە کانیـاوەی کەرێزە دابین دەبێ، تەلەیفوون، سیمکارتی مخابەرات.
خوێندکاران هەر لە دەسپێکەوە دەبێ لە قوتابخانەکانی شاری مەهاباد بخوێنن. ساڵان مزگەوتێکیان هەبوو کە بە مۆرە دانـدرابوو، بـەلام تێکڕووخا.
گەورەترین گرفت ئەوەیە کە هیچ ئیمکاناتێک جگە لە کارەبا نەدراوە بەم دێیە و هۆکاری ئاوەدان نەبوونەوەی هەر ئەم بابەتانەیە، هەڵبەت مانـەوە و ژیانی ئێستایان دژوارتر بووە چون ئاوایی بۆتە ٣ ماڵ. کاروپیشەی خەڵکی ئەم دێیـە ئاژەڵـداری و وەرزێرییـە، ئاژەڵـەکان مـەڕ و مانگـان، وەرزێـران گەنم، نۆک و نیسک دەچێنن. لە بـەری ڕۆژاوای ئـەم دێیـە بـاخی لێیـە، بـەلام هـەمووی هـی خـەڵکی دێیەکـە نـین، بەرهـەمی ئـەم باخانـە سـێوە.
کانگایەکی بەردی لێیە و خاوەنەکەی خەڵکی ئاوایی خاتوونباخە.
لە کەرێزە هێندێک کۆنەگۆڕێ لێنە. ئێستا خەڵکەکە مردووەکانیان لەم دێیە نانێژن و چەند ساڵێکە هەر لە گۆڕستانی شاری مەهاباد دەیانێژن.

## کەرێزەی شێخان

ئەم ئاواییە لە ٣/٥ کیلۆمیتری باکووری شاری مەهاباد، بەشی ناوەندی و دێهستانی موکریانی ڕۆژاوا و لە ناوچەی شارویران هەڵکەوتووە. لە ٨٩ ماڵ و ٥٠٨ کەس پێکهاتووە، لەمانە ٢٤١ کەس پیاون و ٢٦٧ کەسیش ژنن، لە ٢٨٥ کەسی خوێندەوار ١٦٤ کەس پیاون و ١٢١ کەسیش ژنن، هەروەها لە ١٦٥ کەسی نەخوێندەوار ٤٦ کەس پیاون و ١١٩ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ٢٥٠٠ هێکتارە، لەمە ٤٦٤ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و ٢٠٣٦ هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە. کەرێزەی شێخان خاوەن ٦٠٠ هێکتار زەوی دێم، ٢٩٣ هێکتار زەوی بەراو، ٢٣١ هێکتار باخ، ٢٥ تراکتۆر، ٩ لاوێردە و ٢ تووچێنەرە.

| ئاوایییەکانی دەوروبەر: | چیاکانی دەوروبەری ئاوایی: |
|---|---|
| باشوور: شاری مەهاباد | باشوور: کێوی کانی شێخان |
| باکوور: ئاوایی دریاز و بەشێک لە ئاوایی ئسووکەند | باکوور: کێوی زینوی پیسێ |
| ڕۆژهەڵات: ئاوایی ئسووکەند | ڕۆژهەڵات: خەڵۆ |
| ڕۆژاوا: ئاوایییەکانی ئاڵبلاغ و بایندەرێ | ڕۆژاوا: کێوی قوتب |

لە باشوور ئەشکەوتی "گوێلکان"، لە باکوور ئەشکەوتی "هەمین" و لە ڕۆژهەڵات ئەشکەوتی "خەلۆ" کە دەکەوێتە دیوی ئسووکەند، هەڵکەوتوون.

هەموو ساڵێ کەژەوان و ئەویندارانی سروشت، بەتایبەت وەرزی بەهاران، ڕوو لە کانی شێخان دەکەن و هەوای خاوێنی هەڵدەمژن و لە دیمەنی لاوێنەری دەحەسێنەوە. سێ کانیاوی ناسراوی ئاوایی کانی شێخان، کانی نێو دێ و کانی سپییە.

زۆربەی ماڵەکانی ئەم گوندە لە خشت، چیمەنتۆ و بلووک ساز کراون و میچەکانیشیان بە ئاسن یان بە داران داپۆشراون.

زۆربەی ماڵەکان بەرەو ڕۆژهەڵاتن و خاوەن حەوشەن و هێندێک هەوراز هەڵکەوتوون. کۆڵانەکانی قیلەتاو کراون و قاناویان تێگیراوە. گەڵاڵەی هادی ساڵی ١٣٨٤ی هەتاوی لەم ئاواییە دەستی پێکردووە. تەپەی کەرێزەی شێخان، بە ژمارەی تۆمارکراوی ١٥٩٧١ لە باشوور و باشووری ڕۆژهەڵات، بە بەرزایی ١٩٠٠ میتر لە ڕووکەشی زەریاکان، دەگەڕێتەوە سەر سەدەی ٦ تا ٨ کۆچی مانگی.

نزیک ١٢ ـ ١٣ کەرێزە لەو دێیە هەنە کە هەمووی لە نیزیکی یەک هەڵکەوتوون و هەموویان دێنەوە سەر کانیاوێک، ئەم کەرێزانە زەمانی ئەرباب ـ ڕەعیەتی لێدراون و ساڵی ١٣٨٦ی هەتاوی خاوێن و نۆژەن کراونەوە. جەماوەری دێیەکە دەڵێن: پێشتر ماڵە شێخ و سەیدان لەو دێیە بوونە و بۆ سەلماندنی ئەو قسەیەی خۆیان گۆڕستانی شێخ و شێخ مووسا لە بەری باشووری دێ دەکەنە بەڵگە. هەروەها ئاماژە بەو خاڵەش دەکەن کە ناوی ئاوایی هەر لە بوونی ئەم کەرێزانە و نیشتەجێ بوونی شێخەکان لەم گوندە هاتووە، ئێستاش چەند ماڵێکی سەیدی هەر لێماوە. لە باشووری ئاوایی، ڕێگای قیلەتاوی شاری مەهاباد دەگرێتەوە، لە باشووری ڕۆژاوا، ڕێگایەکی خاکی دەچێتەوە ئاوایی بایندەرێ، لە باکوور، ڕێگایەکی خاکی دەڕواتەوە ئاوایی ئسووکەند.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی ١٣٧٠/١١/٧ کارەباکەی هەڵکراوە، لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە کە عەنباراویان بۆ داناوە و ئاوەکەی لە کانی سپی دابین دەبێ، پۆستبانک، تەلەیفوونی ماڵ بە ماڵ، قوتابخانەی سەرەتایی (کوڕانە ـــ کچانە)، قوتابخانەی ناوەندی (کوڕانە ـــ کچانە) هەر دوو بە ناوی "تابان"، ئاکابیری، بنکەی تەندروستی، مزگەوت بە ناوی محەممەدرەسووڵەڵلا (د.خ) کە ساڵی ١٣٧٩ی هەتاوی نۆژەن کراوەتەوە، ئێزگەی تەلەویزیۆنی (لە لایەن دەنگ و ڕەنگی ناوەندی مەهاباد داندراوە)، چەند شوێنێکی تر وەکوو نانەوەخانە، کارگای بلووکبڕی، سێ جووجەخانە (کەرتی تایبەتین)، هەروەها ئەو دێیە خاوەن دێهیاری، شووڕای ئیسلامی و شووڕای چارەسەری کێشەکانە. نەوت و کەلوپەلیش لە شەریکەی هاوبەشیی شاری مەهاباد وەردەگرن. بۆ درێژەدان بە خوێندن هیچ جیاوازییەک لە نێوان کوڕان و کچاندا نییە و هەر دوو لایەن دەچنە مەهاباد.

کاروپیشەی خەڵکی ئەو دێیە وەرزێری، ئاژەڵداری و باخدارییە. وەرزێران گەنم، نۆک و جۆ دەچێنن و زۆربەی ئاژەڵەکانیان مەڕ، بزن و تا ڕادەیەکی مانگاش ڕادەگرن، بەرهەمی باخەکان زۆرتری هەر سێوە. گرفتەکانی خەڵکی کەرێزەی شێخان: نەبوونی شوێنێک بۆ کۆ کردنەوە و فەوتانی زبڵوزاڵی دێ، خاکی بوونی ڕێگای کەرێزەی شێخان بۆ ئسووکەند لە باکوورەوە. دوو گۆڕستانی کەرێزەی شێخان: یەکەم لە ناوەندی ئاواییە کە گشتییە، ئەوی دیکەیان کە تەنیا شێخ و سەیدەکانی لێ نێژراوە و لە بەری باشوورە و بە "شێخ" و "شێخ مووسا" ناسراون.

## کەڵەدەنداوا

ئەم ئاوایی‌یە لە ٢٥ کیلۆمیتری باشووری ڕۆژاوای شاری مەهاباد، بەشی خەلیفان و دێهستانی مەنگوڕی ڕۆژهەڵات و لە ناوچەی مەنگوڕایەتی هەڵکەوتووە. لە ٣ ماڵ و ٢٥ کەس پێکهاتووە.
پانتایی ئاوایی ١٤١٠/٠٧ هێکتارە، لەمە ١٣٥ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و ١٢٧٥/٠٧ هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.
کەڵەدەنداوا خاوەن ٣٠ هێکتار زەوی دێم، ٥ هێکتار زەوی بەراو و ٥/٤٢ هێکتار باخە.

ئاوایی‌یەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی سمێنوو
باکوور: ئاوایی‌یەکانی سێلم و داغە
ڕۆژهەڵات: ئاوایی مەزرا
ڕۆژاوا: ئاوایی باگردانی خوارێ

لە باکووری ئاوایی کێوی "بەرلانکێ" هەیە. ئەم دێیە کانیاوی نییە.
خانووبەرەکانی ئاوایی بە گشتی لە قوڕ و بەرد ساز کراون و میچەکانیان لە دارە، هیچ کام لە ماڵەکان حەوشەیان نییە و هەموویان بەرەو باشوور هەڵکەوتوون، بە هۆی کەم بوونی خانووبەرەکان کۆڵانێک نایەتە بەرچاو.
سەبارەت بە مێژووی ئاوایی دانیشتووان دەڵێن: ئەم ئاوایی‌یە چەند ساڵ بەر لە دابەشینی زەوی (تقسیم اراضی) نێوان ساڵەکانی 1335ـ1340 ئاوەدان کراوەتەوە و پێشتر یەکێک لە مەزراکانی ئاوایی "سێلم" بووە. سەبارەت بە ناوی "کەڵەدەنداوا"، پێش ئاوەدان بوونەوەی ئەم شوێنە مەزرا بووە و هەر بە مەزرای کەڵەدەنداوا ناسرابوو، بەڵام بۆچوونی زۆرینەی خەڵک ئەوەیە کە بە هۆی هەڵکەوتنی ئاوایی لە نێو کەندالّدا ناوی بووبێتە "کەندالاوا" و لە پاشان بۆتە "کەڵەدەنداوا".
لە باشووری دێ ڕێگایەکی خاکی کەمتر لە ٥٠ میتری تێکەڵی جادەی خاکی دۆڵی شێخان دەبێتەوە، لە باکوورەوە ڕێگایەکی خاکی دەچێتەوە ئاوایی "سێلمساغۆڵ".
ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی 1368/08/06 کارەباکەی هەڵکراوە، سیمکارتی مخابەراتی دێهات. بۆ بنکەی تەندروستی سەر بە ئاوایی "باگردان"ی خوارێن و نەوت و کەلوپەل لە ئاوایی "سیاقۆڵ"ی خوارێ وەردەگرن.
ئاوی خواردنەوەی ئەم دێیە لە ئاوایی سێلمڕا بۆی کێشراوە.
قوتابیان تا پێنجەمی سەرەتایی بەبێ جیاوازی کوڕ و کچ لە ئاوایی "سێلم" دەخوێنن و پاشان هێندێک لە قوتابیانی کوڕ ڕەوانەی ئاوایی خەلیفان و شاری مەهاباد دەبن. جێگای باسە ئاوایی لە سەرەتاوە مزگەوتی نەبووە.
وەرزێری، ئاژەڵداری و مێشداری کاروپیشەی خەڵکی ئەم گوندەن. وەرزیران گەنم، نۆک و جۆ دەچێنن و ئاژەڵەکان مەڕ، مانگا و بزنن، باخەکانی ئاوایی ساوان و ئەوەی لێدراوە دارسێوە.
گرفتەکانی خەڵکی ئاوایی: ڕێگاوبانی ناخۆش و خاکی، نەبوونی قوتابخانەی سەرەتایی، گرفتی ئاو.
خەڵکی ئاوایی‌یەکانی سمێنوو، کەڵەدەنداوا، سێلم و داغە مردووەکانیان لە گۆڕستانی "بەرلانکێ"، لە ئاوایی "سێلم" دەنێژن.

## کەڵەکاوێ

کەڵەکاوێ لە ٧٢ کیلۆمیتری باشووری شاری مەهاباد، بەشی خەلیفان و دێهستانی کانی بازاڕ و لە ناوچەی گەورکایەتی هەڵکەوتووە. لە ٣٧ ماڵ و ٢٢٥ کەس پێکهاتووە، لەمانە ١١٧ کەس پیاون و ١٠٨ کەسیش ژنن، ژمارەی خوێندەوارانی ئەم ئاواییە ١٠٨ کەسە کە ٥٩ کەس پیاون و ٤٩ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٨٢ کەسی نەخوێندەوار ٣٣ کەس پیاون و ٤٩ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ٣٧٠٠ هێکتارە، لەمە ١٣٠ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و ٣٥٧٠ هێکتار پاوان و لەوەرگەی دێیە.

کەڵەکاوێ خاوەن ١٥٠ هێکتار زەوی دێم، ٦٠ هێکتار زەوی بەراو، ١٨ هێکتار باخ و ٢ تراکتۆرە.

ئاواییەکانی دەورووبەر:

باشوور: ئاواییەکانی پاراستان و زمزیران

باکوور: ئاوایی کاوڵانی سەرێ

ڕۆژهەڵات: ئاوایی کانی سپی

ڕۆژاوا: ئاواییەکانی چواران و نستان، چۆمەڵ

چیاکانی دەورووبەری ئاوایی:

باشوور: وەنەوشان

باکوور: چوار داغولۆێ

ڕۆژهەڵات: سەفەر

ڕۆژاوا: برایم جەلال

بەردووکە، برایم جەلال، قامیشە و گڵەسوورە، چوار کوێستانی بەناوبانگی ئاواییین کە ئێستاش لە وەرزەکانی بەهار و هاویندا چەند ماڵ دەچنە هەوار. چوارداغولو و ناڵپارێز دوو کانیاوی کەڵەکاوێن.

خانووبەرەکان بە گشتی لە قوڕ و بەردە و میچەکانیان لە دارە، زۆربەی ماڵەکان بەرەو باکوور سازکراون و هێندێکیش بەرەو باشوورن، حەوشەیان نییە و ئاوایی خاوەن چەند کۆڵانێکی دووروودرێژ و باریکەڵانەیە.

خەڵکەکەی دەڵێن: ئەو ئاواییە نزیک بە ٦٠ ساڵ لەمەوبەر مەزرای ئاوایی "پاراستان"ی سەر بە سەردەشت بووە و ئاوەدان بۆتەوە، هەڵبەت بە بوونی چەند کۆنەگۆڕستانێک لەم گوندە، دەردەکەوێ کە ئەم شوێنە بەر لە ئاوەدان کردنەوەی ئەو جاری، لە پێشداش هەر ئاوایی بووە.

"مامڕەحمان" دانیشتووی ئاوایی تەمەن ٧٠ ساڵ، دەڵێ: زیاتر لە پەنجا ساڵە لەم ئاواییەدا دەژیم، ئەو کات کە هاتمە ئێرە سێ ماڵی لێبوو، کەڵەکاوێ مەزرای پاراستان بوو. وەکی لە بیرم مابێ کە هاتمە ئێرە هەر ١٠ ساڵ دەبوو ئاوەدان کرابۆوە.

بە قسەی خەڵکی، کوێخا "ڕەسووڵ ڕەسووڵزادە" یەکەمین کەس بووە ماڵی هاتۆتە ئەو شوێنە و ئاوەدانی کردۆتەوە. هەروەها باوەڕیان وایە کە ئەو سەردەمی ئەوێ مەزرا بووە و بە هۆی شاخاوی بوونی ناوچەکە، دە وەختی کێڵانێدا، بەردی زۆر بووە و بەردەکانیان کۆ کردوونەوە و لە سەر یەک کەڵەکەیان کردوون، کە وایە بەردەوام کەڵەکەبەردی لێبوون، هەر بۆیەش پێیان گوتووە کەڵەکاوێ.

ئەم ئاواییە لە ٧٢ کیلۆمیتری جادەی مەهاباد ـ سەردەشت، وەک دوایین ئاوایی لەم بەشە، لە سەر جادەی سەرەکی هەڵکەوتووە.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی 1365/06/19 کارەباکەی هەڵکراوە، لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە، تەلەیفوونی ماڵ بە ماڵ، بنکەی تەندروستی، ڕاهدارخانە (بەر لە ساڵی ١٣٥٥ دامەزراوە)، مزگەوت (نزیک ٢٠ ساڵە نۆژەن کراوەتەوە)، ئاکابیری، قوتابخانەی سەرەتایی (کوڕانە ـ کچانە) بە ناوی "تەوحید" و هەروەها ئاوایی خاوەن دێهیاری و شووڕای ئیسلامییە. بۆ وەرگرتنی نەوت و کەلوپەل سەر بە شەریکەی هاوبەشیی ئاوایی "کاوڵان"ی خوارێن. هێندێک لە قوتابیان بۆ درێژەدان بە خوێندن ڕوو لە ئاواییەکانی کاوڵانی خوارێ، خەلیفان و شاری مەهاباد دەکەن، کچان بە دەگمەن هەڵدەکەوێ درێژە بە خوێندن بدەن.

کاروپیشەی خەڵکی ئاوایی ئاژەڵداری و تا ڕادەیەک وەرزێری، کرێکاری و باخدارییە. مەڕ، مانگا و بزن ئاژەڵەکانی ئاوایین و وەرزێران گەنم دەچێنن، بەرهەمی باخەکان زیاتر هەر سێوە.

گرفتەکانی خەڵکی ئاوایی: کەمبوونی ئاو بە گشتی و ڕزینی لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە (ئاوەکەیان ئێستا لە کانیاو و چاڵاو دابین دەبێ)، قوتابخانەی ئاوایی کە کۆنە و بەرەو کاولبوونە.

ئاوایی خاوەن چوار گۆڕستانە بە ناوەکانی گاگەش، قامیشە، چاوشین و جەبریس. خەڵکی ئاوایی مردووەکانیان لە گۆڕستانی "جەبریس"دەنێژن.

## کەوتەر

کەوتەر لە 18 کیلۆمیتری باشووری ڕۆژاوای شاری مەهاباد، بەشی ناوەندی و دێهستانی موکریانی ڕۆژاوا و لە ناوچەی مەنگوڕایەتی هەڵکەوتووە. لە ٣٦ ماڵ و ٢٤١ کەس پێکهاتووە، لەمانە ١٤٤ کەس پیاون و ١١٧ کەسیش ژنن، لە ١٤٥ کەسی خوێندەوار ٩٢ کەس پیاون و ٥٣ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٨٦ کەسی نەخوێندەوار ٣٦ کەس پیاون و ٥٠ کەسیش ژنن.
پانتایی ئاوایی 13000 هێکتارە، لەمە 114 هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و 12886 هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.
کەوتەر خاوەن٢٥٠ هێکتار زەوی دێم، ٥٥ هێکتار زەوی بەراو، ٤٠ هێکتار باخ، ١٧ تراکتۆر و ٧ لاوێردەیە.

ئاوایییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایییەکانی سێلمساغۆڵ و پەڵکێ

باکوور: ئاوایی قازیاوا

ڕۆژهەڵات: ئاوایییەکانی هەمزاوا و داشتەمر

ڕۆژاوا: ئاوایی دێبۆکر

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

ڕۆژهەڵات: جیقناوێ

ڕۆژاوا: تەپکی خدرەکەڕ

زەوی سێوان و گێوژ، وەک دوو کانیاوی کەوتەر دێنە ئەژمار. بەرزایییەکانی ئەم گوندە شوێنێکە بۆ ڕوانی جۆرێک خاشخاشی ڕەش.
لە ڕۆژاوای کەوتەر ئەشکەوتێک بە ناوی ئەشکەوتی "بەڕۆژەقەوی" هەیە.
زۆرتری خانووبەرەکان لە قوڕ و بەردن و میچیان لە دارە، ئێستا خشت و بلووک بە کار دێنن. ماڵەکان زۆربەیان حەوشە و دەرگایان هەیە. "قەڵای مەتەرێز" لە باشووری ئاوایی هەڵکەوتووە، هەروەها ئاسەواری "کۆنەکەوتەر"یش لە بەری باشووری ئەم گوندەیە.
خەڵکی کەوتەر پێشتر لە باشووری ئاوایی نیشتەجێ بوون، بەڵام نیزیک بە 70 ساڵ لەمەوبەر گوێزراوەتەوە بۆ شوێنی ئێستای. شوێنی پێشوو بە "کۆنەکەوتەر" ناسراوە کە ئێستاش شوێنەوارەکانی، بەتایبەت شوێنەواری گۆڕستانەکەی هەر ماوە.
لە باشووری ئاوایی ڕێگایەکی ئامادە بۆ قیلەتاو لێیە کە دەچێتەوە ئاوایی پەڵکێ، لە ڕۆژهەڵاتەوە ڕێگایەکی 3 کیلۆمیتری ئامادە بۆ قیلەتاو، وەک سەرەکیترین ڕێگای هامووشۆ، دەچێتەوە سەر جادەی مەهاباد ـ پەسوێ، لە ڕۆژاوا ڕێگایەکی خاکی دەچێتەوە ئاوایی "سێلمساغۆڵ".
ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی 1362/10/15 کارەباکەی هەڵکراوە، بنکەی مخابەرات، مزگەوتی"محەممەدڕەسووڵەڵڵا" ساڵی 1375 بە خشت، چیمەنتۆ و ئاسن نۆژەن کراوەتەوە، قوتابخانەی سەرەتایی (کوڕانە ــ کچانە) بە ناوی "عەممار" کە لەو ساڵانەدا بیناکەی بە دەست خەڵکی ئاوایی ساز کرا، بنکەی تەندروستی، ئاکابیری و هەروەها ئاوایی خاوەن شووڕای ئیسلامییە. بۆ وەرگرتنی نەوت سەر بە ئاوایی "دێبۆک"ن و کەل-وپەلەکەشیان لە شەریکەی هاوبەشیی "پشتەتەپ"ی مەهاباد وەردەگرن. لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە بۆ ئەم دێیە نەکراوە و هەر ماڵەی لە چاڵاوی ماڵە خۆی کەلک وەردەگرێ.
قوتابیانی کچ و کوڕ بۆ درێژەپێدان بە خوێندن ڕەوانەی شاری مەهاباد دەبن.
وەرزێری، ئاژەڵداری، باخداری، کرێکاری و تا ڕادەیەکیش مێشداری کاروپیشەی خەڵکی کەوتەرە. وەرزێران گەنم، نۆک و جۆ دەچێنن و ئاژەڵەکانیان مەڕ، مانگا و بزنە. بەرهەمی باخەکان سێو و قەیسییە.
گرفتەکانی خەڵکی ئاوایی: لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە بۆ ئەم دێیە نەکراوە، نەبوونی دێهیار، نەبوونی تەلەیفوونی ماڵ بە ماڵ.
ناوەندی ئاوایی کۆنەگۆڕستانێکی لێیە، گۆڕستانی نوێی لە ڕۆژهەڵاتی دێیە.

# کەوڵەی سەرمێرگان

ئەم ئاوایییە لە ١٦ کیلۆمیتری باشووری شاری مەهاباد، بەشی خەلیفان و دێهستانی مەنگوڕی ڕۆژهەڵات و لە ناوچەی مەنگوڕایەتی هەڵکەوتووە. لە ٢ ماڵ و ٢٥ کەس پێکهاتووە.

کەوڵەی سەرمێرگان خاوەن ١٨٧ هێکتار زەوی دێم، ٥٠/٢ هێکتار زەوی بەراو، ٣/٨ هێکتار باخ، ٢ تراکتۆر و ١ لاوێردەیە.

ئاوایییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی حەوڵاکوردە

باکوور: ئاوایی هەمزاوا

ڕۆژهەڵات: ئاوایی قەرەچەلان

ڕۆژاوا: ئاوایی بەیتاس

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باشوور: کێوی هەوارشوژن

باکوور: خڕێ گورگی

ڕۆژهەڵات: مێرگەسیر و خڕێ شاری

ڕۆژاوا: کێوی کانیسەگان

کانیاوەکان بە مێرگان، خڕێ شاری و گیای ڕەحمانی ناسراون.

گشت ماڵەکان لە قوڕ و بەرد ساز کراون، میچی ماڵەکان لە دارە و بە هۆی کەم بوونی ماڵەکان کۆڵانی لێ هەڵنەکەوتووە، لەو دێیە کاولەکۆنێکی زۆر وەبەرچاو دێن.

بە ڕای خەڵکەکەی پێشتر خەڵکی ئەم ئاوایییە لە ئاوایی قەرەچەلان دەژیان. لە زەمانی "مینەئاغای باپیرئاغا"، کەسێک بە ناوی حاجی سەید "عەبدوڵڵا عەلەوی"، لە ساڵەکانی نزیک بە ١٣٠٧ی هەتاوی، ئەم شوێنەی کە پێشتر مەزرا بووە، ئاوەدان کردۆتەوە و بە بۆنەی زۆربوونی مێرگ، چیمەن و جۆرە گیایەکی بەهاری لەو هەرێمە، ئەو ناوەیان لێناوە. بەری باشووری ئاوایی قەڵاتی لێ هەڵکەوتووە.

لە بەری باشووری ئاوایی ڕێگایەکی خاکی لێیە کە دەچێتەوە ئاوایی حەوڵاکوردە، لە ڕۆژهەڵاتەوە ڕێگایەکی خاکی دەچێتەوە "پشتتەپ"ی بەری مەدرەسە، لە ڕۆژاواش ڕێگایەکی دیکەی خاکی هەیە بە مەودای ٤ کیلۆمیتر دەڕواتەوە ئاوایی بەیتاس.

ئیمکاناتی ئاوایی: کارەبا، قوتابخانەی سەرەتایی (کوڕانە - کچانە) بە ناوی "فارووق". نەوت لە شەریکەی هاوبەشیی "پشتتەپ"ی مەهاباد و کەلوپەلیش لە شەریکەی حەوڵاکوردە وەردەگرن، بۆ بنکەی تەندروستی دەبێ ڕێگای ئاوایی ئۆزندەرێ بپێون

لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە بۆ ئەم دێیە نەکراوە و دانیشتووانی لە کانیاو و چاڵاوەکان، بەتایبەت کانی داران، کەلک وەردەگرن. "کەوڵە" پێشتر مزگەوت هەبووە، بەڵام بە هۆی کۆن بوونی ڕووخاوە و ساز نەکراوەتەوە.

لە بواری مخابەرات ئەو دێیە نە بنکەی مخابەراتی هەیە و نە سیمکارتی دێهات و تەلەیفوون.

بۆ درێژەدان بە خوێندن قوتابیانی کوڕ و کچ دەچنە خەلیفان و مەهاباد.

وەرزێری، ئاژەڵداری، مێشداری و باخداری کاروپیشەی خەڵکی ئەو گوندەیە، وەرزێران گەنم، نۆک و نیسک دەچێنن و ئاژەڵەکانیان مەڕ، مانگا و بزنن، بەرهەمی باخەکانیش سێو و قەیسییە.

گرفتەکانی خەڵکی ئەو دێیە: ڕێگای خاکی و ناخۆش، نەبوونی لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە، نەبوونی بینا بۆ قوتابخانە (قوتابییەکان لە ماڵاندا دەخوێنن).

گۆڕستانەکەی لە بەری باشوور هەڵکەوتووە، بەڵام ئێستا کەمتر مردووی لێ دەنێژن و زیاتر لە گۆڕستانی شاری مەهاباد کەلک وەردەگرن.

# کیتکە

کیتکە لە 38/5 کیلۆمیتری باشووری ڕۆژهەڵاتی شاری مەهاباد، بەشی خەلیفان و دێهستانی کانی بازاڕ و لە ناوچەی مەنگوڕایەتی هەڵکەوتووە. لە ٣٦ ماڵ و ٢٩١ کەس پێکهاتووە، لەمانە ١٣٦ کەس پیاون و ١٥٥ کەسیش ژنن، ژمارەی خوێندەوارانی ئەم ئاوایییە ١٦٣ کەسە کە ٨٦ کەس پیاون و ٧٧ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٩٤ کەسی نەخوێندەوار ٣٤ کەس پیاون و ٦٠ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ١٨٠٠ هێکتارە، لەمە 376/5 هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و 1423/5 هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.

کیتکە خاوەن ٢٤٠ هێکتار زەوی دێم، ٦٢ هێکتار زەوی بەراو، ٨ هێکتار باخ و ١٦ تراکتۆرە. بەرزایی ئاوایی ١٦٠٠ میتر لە ڕووکەشی زەریاکانە.

ئاوایییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی گوێچکەدەرێ

باکوور: ئاوایییەکانی گەنەدار و قەڵاجۆغە

ڕۆژهەڵات: ئاوایییەکانی کانی میران و خەلیفان

ڕۆژاوا: ئاوایی ئافان

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

ڕۆژهەڵات: قەرەوڵان

ڕۆژاوا: مامەسێنە و قەڵای شەکر

مامەسێنە، کانی ماڵان و قەمبەرێ، سێ کانیاوی بەناوبانگی ئەم ئاوایییەن.

خانووبەرەکان زۆرتری لە قوڕ و بەردن و میچەکانیان لە دارە، هێندێک خانووبەرە لە خشت و بلووک ساز کراون، کۆڵانەکان باریک و بەرتەسکن، ماڵەکان حەوشەیان هەیە.

وەک بەساڵاچووانی ئاوایی باسیان کردووە ئەو ئاوایییە سێ جاران ئاوری تێبەربووە کە هۆیەکانی ڕوون نییە. خەڵکی ئاوایی لە شوێنێکی مێژوویی بە ناوی "بەردی حەمەلەتیف" دەدوێن کە گۆیا "کێل" واتا بەردێکی مێژووی لێ بووە و بە تاڵان چووە. هەروەها "قەڵا شەکر"، لە ڕۆژاوا و لە نێوان ئاوایییەکانی کیتکە ـ گوێچکەدەرێ و گەنەدار هەڵکەوتووە.

ئەم گوندە لە سەر جادەی سەرەکی مەهاباد ـ سەردەشت هەڵکەوتووە، لە باکووری ڕۆژهەڵاتەوە ڕێگایەکی خاکی لێیە کە دەچێتەوە ئاوایی قەڵاجۆغە، لە ڕۆژهەڵاتەوە ڕێگای قیلەتاو ئاوایی خەلیفان و کانی میران دەگرێتەوە.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی 1357/10/19 کارەباکەی هەڵکراوە، لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە، سیمکارتی مخابەراتی دێهات، قوتابخانەی سەرەتایی (کوڕانە ـ کچانە) بە ناوی "شەهید سپێهری"، باخچەی ساوایان "مەتین" (١٣٨٢)، ناوەندی بڵاوکردنەوەی وەرزێری دێهستانی کانی بازاڕ، بنکەی تەندروستی، بنکەی پزیشکی ئاژەڵ، هۆڵی وەرزیشی سەر داپۆشراو، زەوی وەرزیشی (ناتەواو ماوەتەوە)، مزگەوت، شەریکەی هاوبەشیی دابەشینی نەوت و کەلوپەل و هەروەها ئاوایی لە دێهیاری و شووڕای ئیسلامی بەهرەمەندە.

خوێندکارەکانی بۆ درێژەدان بە خوێندن دەچنە شاری مەهاباد و ئاوایی خەلیفان و کچان و کوڕان لەو مافە بێبەش نین.

وەرزێری، ئاژەڵداری، باخداری و کرێکاری سەرەکیترین کاروپیشەی خەڵکی ئەم دێیە پێکدێنن. وەرزێران گەنم و جۆ دەچێنن، ئاژەڵەکان لە مەڕ، مانگا و بزن پێکهاتوون، بەرهەمی باخەکان سێو، قەیسی، ئاڵووباڵوو، هڵوو و ترێیە.

گرفتەکانی خەڵکی ئاوایی کەمئاوی و نەبوونی قوتابخانەیەکی ناوەندییە.

کیتکە خاوەن دوو گۆڕستانە لە باکووری ئاوایی کە تازەیان دیوار بۆ کێشاوە و لە باکووری ڕۆژاوای دێ کۆنەگۆڕستانێکی لێیە.

"سۆفی خاڵەند" زوو لەو ئاوایییە چیرۆکبێژ و بەیتبێژ بووە، "برایم گوڵناز" تەمەن ٨٣ ساڵە گۆرانیبێژ بووە.

خاتوو "زڵەخای حەکیم" وەک ژنێکی لێهاتوو کە دەستی حەکیمایەتی بووە و لە زۆربەی ئاوایییەکانی ناوچەی مەنگوڕایەتی و گەورکایەتی باسی لێدەکەن، لەم ئاوایییە ژیاوە. سەرەڕای حەوڵدانێکی زۆرمان سەبارەت بەو خاتوونە نەمانتوانی بەسەرهات یان وێنە و زانیارییەک بدۆزینەوە.

## کێچاوا

کێچاوا لە 35 کیلۆمیتری باکووری شاری مەهاباد، بەشی ناوەندی و دێهستانی موکریانی ڕۆژهەڵات و لە ناوچەی شارۆیران هەڵکەوتووە. لە 83 ماڵ و 522 کەس پێکهاتووە، لەمانە ٢٥٦ کەس پیاون و ٢٦٦ کەسیش ژنن، لە ٣٢٨ کەسی خوێندەوار ١٨٣ کەس پیاون و ١٤٥ کەسیش ژنن، هەروەها لە ١٣٦ کەسی نەخوێندەوار ٤٦ کەس پیاون و ٩٠ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی 447 هێکتارە، لەمە 330/5 هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و 116/5 هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.

کێچاوا خاوەن ١٢/٥ هێکتار زەوی دێم، ٣٨٠ هێکتار زەوی بەراو، ١٠١ هێکتار باخ، ٢٠ تراکتۆر و ٦ لاوێردەیە.

ئاوایییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی لەج

باکوور: ئاوایی گابازەڵە

ڕۆژهەڵات: ئاوایی حاجیخۆش

ڕۆژاوا: ئاوایییەکانی گاپیس و قجیئاوا

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

ڕۆژهەڵات: سەوزەپۆش

کێچاوا هیچ کانیاوێکی نییە و وەرزێرەکان سەرەڕای لێدانی چاڵاوی قووڵ بۆ پاراوکردنی زەوییەکانیان، لە ژێر چاوەدێری ئاوبەندی مەهاباد دان.

لە ئاوایی کێچاوا کۆنەخانوو نەماون و بە گشتی خانووەکان بە کەرەسەی نوێ ساز کراونەوە و میچەکانیان بە ئاسن داپۆشراوە. کۆڵانەکانی ئاوایی ڕاست هەڵکەوتوون و ماڵەکان حەوشە و دەرگایان هەیە. لەم گوندە تەپۆڵکەیەکی لێیە بە ژمارەی تۆمار کراوی 606 لە میراتی فەرهەنگی بە بەرزایی 1318 میتر لە ڕووکەشی زەریاکان، کە بە پێی بەڵگەکانی ئەم ناوەندە دەگەڕێتەوە سەردەمی بەر لە مێژوو. هەروەها لە 10 کیلۆمیتری باکووری ڕۆژهەڵاتی ئاوایی تەپکەیەکی دیکە هەیە بە ژمارەی تۆمارکراوی 15990 لە میراتی فەرهەنگی بە بەرزایی1307 میتر لە ڕووکەشی زەریاکان، دەگەڕێتەوە سەر دەورانی کالکۆلیتیک - هەزارەی یەکەمی پێش زایین، هەر لە لای باکوور تەپکەیەکی دیکە هەیە بە ژمارەی تۆمار کراوی 15945 بە بەرزایی 1314 میتر لە ڕووکەشی زەریاکان کە دەگەڕێتەوە سەدەی 4 تا 6ی کۆچی مانگی ـ هەزارەی دووەمی پێش زایین.

جێگای سرنجە کە خەڵکی ئاوایی ناوی گوندەکەیان پێ خۆش نییە و پێیان وایە زوو بە هۆی نەبوونی بێهداشت ئەم ئاوایییە کێچی زۆر بووە و ئەم ناوەی بەسەردا دابڕاوە. خاڵی سرنجڕاکێش ئەوەیە کە هەر چەند مەودای نێوان دوو ئاوایی کێچاوا و گابازەڵە، تەنیا شەقامێکی ١٠ میترییە، بەڵام ئەوان تەواو دوو ئاوایی سەربەخۆن.

لە باشووری دێ ڕێگایەکی قیلەتاو هەیە کە دەچێتەوە ئاوایی حاجیخۆش و باریکەڕێیەکی لێ دەبێتەوە کە دەچێتە ئاوایی لەج. لە باکووری ڕێگاکەوە، نیزیک بە ٣٠ میتری دەگەڵ ئاوایی گابازەڵە مەودا هەیە، لە ڕۆژاوە ڕێگایەکی خاکی دەچێتەوە ئاوایییەکانی قجیئاوا و گاپیس.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی 1357/10/19 کارەباکەی هەڵکراوە، لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە کە عەنباراوەکەی لە ئاوایی گابازەڵەیە و لە قووڵەچاڵاوان دابین دەبێ کە لە ئاوایی "حاجیخۆش"ەوە ڕەوانەی عەنباراو دەبێ و بۆ 7 ئاوایی دەڕوا، تەلەیفوونی ماڵ بە ماڵ، سیمکارتی مخابەراتی دێهات، مزگەوتێک کە ساڵی 1375ی هەتاوی نۆژەن کراوەتەوە، قوتابخانەی سەرەتایی (کوڕانە ـــ کچانە) بە ناوی "شەفا"، قوتابخانەی ناوەندی کوڕانەی "فازڵ"، پۆلی یەکەمی دواناوەندیی کوڕانە. بۆ بنکەی تەندروستی سەر بە ئاوایی گابازەڵەن، نەوت و کەلوپەل لە شەریکەی گۆکتەپە وەردەگرن. کوڕانی ئاوایی پاش تێپەڕ بوونی پۆلی هەوەڵی دواناوەندی بۆ درێژەدان بە خوێندن ڕەوانەی شاری مەهاباد دەبن، کچان پاش تێپەڕ کردنی پێنجەمی سەرەتایی بەشێکی زۆریان دەچن بۆ ئاوایی حاجیخۆش و پۆلی ناوەندی لەوێ تێپەڕ دەکەن و پاشان دەچن بۆ شاری مەهاباد.

وەرزێری، ئاژەڵداری و باخداری کاروپیشەی خەڵکی ئەم گوندەیە. بەرهەمی وەرزێران گەنم، جۆ، گوڵەپێغەمبەرە و چەوەندەرە و ئاژەڵەکانیان مەڕ، بزن، مانگا و گامێشن، بەرهەمی باخەکان سێو و هڵوو و قەیسییە.

سەرەکیترین گرفتەکانی خەڵکی ئەم گوندە بەرپیوەنەچوونی گەڵاڵەی هادییە.

گۆڕستانەکەی گوند لە ڕۆژاوای دێ هەڵکەوتووە و دەگەڵ گابازەڵە هاوبەشن.

# کیسەڵان

کیسەڵان لە ٤٨ کیلۆمیتری باشووری ڕۆژاوای شاری مەهاباد، بەشی ناوەندی و دێهستانی مەنگوڕی ڕۆژهەڵات و لە ناوچەی مەنگوڕایەتی هەڵکەوتووە.
لە ١٦ ماڵ و ١٢٤ کەس پێکهاتووە، لەمانە ٦٨ کەس پیاون و ٥٦ کەسیش ژنن، ژمارەی خوێندەوارانی ئەم ئاواییە ٥٦ کەسە کە ٤٠ کەس پیاون و ١٦ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٥٠ کەسی نەخوێندەوار ١٧ کەس پیاون و ٣٣ کەسیش ژنن.
پانتایی ئاوایی ٢٥٠٠ هێکتارە، لەمە ٤٦٢ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و ٢٠٣٨ هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.
کیسەڵان خاوەن ١٤٢/٦ هێکتار زەوی دێم، ٥٢/٥ هێکتار زەوی بەراو، ٢/٢ هێکتار باخ، ٤ تراکتۆر و ٢ لاوێردەیە.

ئاواییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاواییەکانی سوورخاو و جانداران

باکوور: ئاوایی میرەسێ

ڕۆژهەڵات: ئاوایی مەحموودئاوا

ڕۆژئاوا: ئاواییەکانی شەکربەگ و گاگەشی خوارێ

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باشوور: گردەدوولک

باکوور: سێنەی

ڕۆژهەڵات: شەش‌ڕێیەن و هەوارەمانگ

ڕۆژئاوا: کۆنەکیسەڵان

هەوارەمانگ و تەنگشەمام دوو کانیاوی بەناوبانگی ئاوایین.
خانووبەرەکانی ئاوایی بە گشتی لە قوڕ و بەردن و میچەکانیان لە دارە، ماڵەکان حەوشەیان نییە و هەموو بەرەو باشوور هەڵکەوتوون، کۆڵانەکان بەرەو هەورازن، ڕووبار بە قەراغ ماڵاندا تێپەڕ دەبێ.
کیسەڵان پێشتر لە بەری ڕۆژاوای شوێنی ئێستای بووە کەچی بە هۆی نالەبار بوونی شوێنەکە و جمگە لێدانی زەوی، خەڵکەکەی ئەوێیان بەجێهێشتووە و شوێنی ئێستایان ئاوەدان کردۆتەوە، ئاسەواری بناغەی خانووبەرەکان هەر ماون.
جگە لە کۆنەکیسەڵان، شوێنەوارێکی دیکەی بناغەی خانووبەران کە وێدەچی ئەم شوێنە پێشتر ئاوایی بووبێ، لە بەری باشووری ڕۆژهەڵات دێتە بەرچاو.
بە وتەی خەڵکی ناوچەکە، بە پێی سەخڵەت بوون و کوێستانی بوون و ئەو ڕووبارەی کە لە دەم ماڵانەوە دەڕوا، ئەم ئاواییە، کیسەڵی زۆر هەبووە، هەر بۆیە ناوی ئاوایی بۆتە کیسەڵان.
لە باشووری دێ ڕێگایەی خاکی لێیە کە دەچێتەوە ئاواییەکانی چۆمەڵ، سوورخاو و جانداران، لە باشووری ڕۆژاوا ڕێگایەکی سەخڵەت و خاکی ئاوایی شەکربەگ دەگرێتەوە و لە باکووریش ڕێگایەکی خاکی بۆ ئاواییەکانی مەحموودئاوا و سەرتان دەچێ.
ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی 1379/07/07 کارەباکەی هەڵکراوە، بنکەی مخابەرات، قوتابخانەی سەرەتایی (کوڕانە ـ کچانە) بە ناوی "ڕەزاق" کە بیناکەی حازربەدەستە. بۆ بنکەی تەندروستی، نەوت و کەلوپەل سەر بە ئاوایی "میرەسێ"ن. ئاوی دێ لە کانیاو دابین دەبێ و بڕیارە لە سەر کانیاوی "تەنگشەمام" عەنباراو لێدەن.
قوتابیان دوای تێپەڕ کردنی پۆلی سەرەتایی زۆر بە دەگمەن هەڵدەکەوێ درێژە بە خوێندن بدەن.
ئاژەڵداری، وەرزێری و کرێکاری کاروپیشەی خەڵکی کیسەڵانیان پێکهێناوە. ئاژەڵەکان مەڕ، مانگا و بزنن و وەرزێران گەنم و نۆک دەچێنن.
گرفتەکانی خەڵکی ئاوایی: ڕێگاوبانی ناخۆش و خاکی، پێویستی بە لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە هەیە، نەبوونی بنکەی تەندروستیی سەربەخۆ.
ئاوایی خاوەن سێ گۆڕستانە کە دوویان لە بەری باشووری ڕۆژهەڵات هەڵکەوتوون بە ناوەکانی "گەنەداران" و "قەبری قەدیم"، ئەوەی دیکەیان کە تازەیە لە بەری باکوور هەڵکەوتووە.

## گابازەڵە

گابازەڵە لە 35 کیلۆمیتری باکووری شاری مەهاباد، بەشی ناوەندی و دێهستانی موکریانی ڕۆژهەڵات و لە ناوچەی شارویران هەڵکەوتووە. لە ١١٧ ماڵ و ٦٥٦ کەس پێکهاتووە، لەمانە ٣٣٢ کەس پیاون و ٣٢٤ کەسیش ژنن، ژمارەی خوێندەوارانی ئەم ئاواییە ٤٣٩ کەسە کە ٢٥١ کەس پیاون و ١٨٨ کەسیش ژنن، هەروەها لە ١٥٧ کەسی نەخوێندەوار ٤٨ کەس پیاون و ١٠٩ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی 500 هێکتارە، لەمە 253 هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و 247 هێکتاری پاوان و لەوەڕگەی دێیە.

گابازەڵە خاوەن ٣٦/٥ هێکتار زەوی دێم، ٣٦٣ هێکتار زەوی بەراو، ١٢١ هێکتار باخ، ١٩ تراکتۆر و ٩ لاوێردەیە.

ئاوایییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی کێچاوا

باکوور: ئاوایییەکانی قولەسەن و بەفرەوان (سەر بە میاندواو)

ڕۆژهەڵات: ئاوایییەکانی حاجیخۆش و گردەگرۆێ

ڕۆژاوا: ئاوایی قەرەداغ

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باکوور: زیندان

ڕۆژهەڵات: سەوزەپۆش

ڕۆژاوا: شێخ عومەر

ئەم گوندە هیچ کانیاوێکی لێ نییە. گابازەڵە خاوەن ئەشکەوتێکە بە ناوی "ئەشکەوتی خسرەوی" کە لە سەر کێوی "گولێ" هەڵکەوتووە.

لەم دێیە جگە لە چەند هۆڵ، کارێز و ئەمباری تفاق، خانووی بە قوڕ و بەرد نەماون،ماڵەکان بە گشتی لە خشت، بلووک و چیمەنتۆ ساز کراون و میچەکانیان لە ئاسن یان دارە، هەروەها ماڵەکان حەوشەیان هەیە، کۆڵانەکان تا ڕادەیەک ڕاست و ڕێکن.

لە بەری باکووری ئاوایی کێوی زیندان هەڵکەوتووە، شوێنێکی قووڵ کە لە شاخ داتراشاوە و بێگومان دەسکردی مرۆڤە، بەڵام ڕوون نییە هی چ سەردەمێکە. سەبارەت بە ناوی گابازەڵە بە بۆچوونی خەڵکەکەی بەو هۆیەی کە لە باکووری ئاوایی لەوەڕی لێ بووە و بە شام ناسراوە، ئەو کات خەڵک گامێشیان هەبووە و لەو شامەدا حاواندوویاننەوە و بە هۆی لەوەڕی خۆش و تێر خواردنی گامێشەکان، ئەم ئاژەڵە تێروتەسەل و بەکەیف بووە کە دواتر بە گابازەڵە ناسراوە.

لە باشووری دێ ڕێگایەک کە هەر ٥٠ میترێک دەبێ دەچێتەوە ئاوایی کێچاوا، هەروەها ڕێگایەکی قیلەتاو هەر لە بەری باشوورە دەچێتەوە ئاوایییەکانی حاجیخۆش و ترشەکان، لە باکووری ڕۆژهەڵاتەوە ڕێگایەکی قیلەتاو ئاوایی قەرەداغ دەگرێتەوە، لە ڕۆژهەڵاتەوە ڕێگایەکی خاکی دەچێتەوە ئاوایی گردەگرۆێ، لە ڕۆژاواشەوە ڕێگایەکی خاکی دەچێتە ئاوایییەکانی قجیئاوا و گاپیس.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی 1357/10/19 کارەباکەی هەڵکراوە، لولەکێشیی ئاوی خواردنەوە (عەنباراوییان بۆ داناوە و ئاوەکەی لە قووڵەچالاوان دابین دەبێ)، تەلەیفوونی ماڵ بە ماڵ، سیمکارتی مخابەراتی ئاوایی، پۆستبانک، بنکەی تەندروستی، مزگەوتی "ئیمام شافعی" کە ساڵی 1370 نۆژەن کراوەتەوە، هەروەها گابازەڵە خاوەن دێهیاری، شووڕای ئیسلامی و شووڕای چارەسەری کێشەکانە. بۆ وەرگرتنی نەوت و کەلوپەل سەر بە شەریکەی هاوبەشیی "گۆکتەپە"ن.

جێگای ئاماژەیە قوتابخانەی سەرەتایی ئاوایی بیناکەی ڕووخاوە، هەر بۆیە قوتابیان لە ئاوایی کێچاوا دەخوێنن، هەروەها کوڕان ئەو هەلەیان بۆ ڕەخساوە کە پۆلی ناوەندی و هەوەڵی دواناوەندی هەر لە کێچاوا تێپەڕ کەن، بەڵام کچان دەبێ ڕەوانەی حاجیخۆش بن. بۆ پۆلی دواناوەندی کچان و کوڕان (کوڕان لە دووەمی دواناوەندیڕا) ڕەوانەی ئاوایی گۆکتەپە و شاری مەهاباد دەبن، هەڵبەت مافی خوێندن بۆ کوڕان زیاتر پارێزراوە.

وەرزێری، ئاژەڵداری و باخداری سەرەکیترین کاروپیشەی خەڵکی ئەو ئاوایییەن. بەرهەمی وەرزێران گەنم، جۆ، وێنجە، گوڵەبەڕۆژە و چەوەندەرە و ئاژەڵەکانیان مەڕ، مانگا، بزن و گامێشە، بەرهەمی باخەکانیشیان سێو، هڵوو و قەیسییە.

گرفتەکانی خەڵکی ئاوایی: نەبوونی قوتابخانە، بەڕێوەنەچوونی گەڵاڵەی هادی.

گۆڕستانی گابازەڵە و کێچاوا هاوبەشە و لە ڕۆژاوای هەر دوو ئاوایی هەڵکەوتووە، ناوەندی ئاوایی گۆڕستانێکی کۆنی تێدایە کە ئێستا تێکدراوە و خانووبەرەی لێ ساز کراوە.

## گاپیس

گاپیس لە ٢٣ کیلۆمیتری باکووری شاری مەهاباد، بەشی ناوەندی و دێهستانی موکریانی ڕۆژاوا و لە ناوچەی شارویران هەڵکەوتووە. لە ١٠٤ ماڵ و ٥٤٢ کەس پێکهاتووە، لەمانە ٢٦٣ کەس پیاون و ٢٧٩ کەسیش ژنن، ژمارەی خوێندەوارانی ئەم دێیە ٣٤١ کەسە کە ١٨٠ کەس پیاون و ١٦١ کەسیش ژنن، هەروەها لە ١٤٢ کەسی نەخوێندەوار ٤٧ کەس پیاون و ٩٥ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ٥٥٣ هێکتارە کە ٢٧٠ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و ٢٨٣ هێکتار پاوان و لەوەرگەی دێیە.

گاپیس خاوەن ٧٠ هێکتار زەوی دێم، ٢٧٥ هێکتار زەوی بەراو، ٦٧ هێکتار باخ، ١٩ تراکتۆر و ٨ لاوێردەیە.

بەرزایی ئاوایی ١٢٧٥ میتر لە ڕووکەشی زەریاکانە.

ئاواییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی قجی‌ئاوا

باکوور: ئاوایی قەرەداغ

ڕۆژهەڵات: ئاواییەکانی کێچاوا و گابازەڵە

ڕۆژاوا: ئاوایی قزڵقۆپی

ئەم گوندە تەنیا لە بەری باکوور کێوێکی هەیە بە ناوی "تاقەدار". ئاوایی هیچ کانیاوێکی نییە.

سێ ئەشکەوت بە ناوەکانی شوانان، قەبران و کونەپێست لە گاپیس هەڵکەوتوون.

خانووبەرەکان لە خشت، بلووک و چیمەنتۆن، مێچەکان لە ئاسن و دارە، ماڵەکان حەوشەیان هەیە و دەرگای گەورەیان تێگیراوە، هێندێک لە کۆڵانەکان ڕێک و ڕاستن و بەشێکیش خێچوخوار و ناڕێک، ماڵەکان بەرەو ڕۆژهەڵات و ڕۆژاوا ساز کراون.

تەپکێک بە ناوی "تەپکی گاپیس" بە ژمارەی تۆمارکراوی ١٦٦١٧ لە میراتی فەرهەنگی کە ١٣٢٦ میتر لە ڕووکەشی زەریاکان بەرزایی هەیە و مێژوویەکەی دەگەڕێتەوە قۆناغی کالکۆلێتیک ـ برۆنز.

ناوەی گاپیس لە گا+ پیس پێکهاتووە کە هێندێک خەڵک دەڵێن ئەو سەردەمی ئەم گوندە گای پیس و پۆخڵی لێبووە و ناویان ناوە گاپیس.

ڕێکەوتی ١٩٨٧/٢/١ زایینی بەرانبەر دەگەڵ ١٣٦٥/١١/١٢ی هەتاوی، گاپیس، قەرەقشلاق و قجی‌ئاوا لە لایەن ڕژیمی بەعسەوە بۆردومان کران.

لە باشووری دێ ڕێگایەکی قیلەتاو دەچێتەوە ئاوایی قجی‌ئاوا و کەمەربەندی دارەلەک، لە باکوورەوە، ڕێگایەکی قیلەتاو ئاوایی خورخورە دەگرێتەوە، لە ڕۆژهەڵاتەوە ڕێگایەکی خاکی دەچێتەوە ئاواییەکانی کێچاوا و گابازەڵە.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی 1357/10/19 کارەباکەی هەڵکراوە، لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە (لە چاڵاوی قووڵ لە ئاوایی قجی‌ئاوا دابین دەبێ و عەنباراوەکەی لە سەر بەرزاییەک لە ئاوایی قەرەداغە)، تەلەیفوونی ماڵ بە ماڵ، سیمکارتی مخابەراتی دێهات، قوتابخانەی سەرەتایی (کوڕانە ــ کچانە) بە ناوی "شەقایەق"، ئاکابیری، نانەوەخانە، مزگەوت کە لە ساڵی ١٣٨٠ی هەتاوی نۆژەن کراوەتەوە و هەروەها ئاوایی خاوەن دێهیاری، شووڕای ئیسلامی و شووڕای چارەسەری کێشەکانە. زۆربەی قوتابیان بەبێ جیاوازی بۆ درێژەپێدان بە خوێندن ڕەوانەی ئاواییەکانی دارەلەک، خورخورە و پاشان شاری مەهاباد دەبن. بۆ بنکەی تەندروستی سەر بە ئاوایی "قزڵقۆپی"ین، نەوت و کەلوپەل لە شەریکەی هاوبەشیی ئاوایی دارەلەک وەردەگرن. وەرزێری، ئاژەڵداری، باخداری و شۆفیری سەرەکیترین کاروپیشەی خەڵکی ئەم ئاواییەن. بەرهەمی وەرزێران گەنم، جۆ، گوڵەبەڕۆژە، وێنجە و چەوەندەرە و ئاژەڵەکان مەڕ، مانگا، بزن و گامێشن، هەروەها بەرهەمی باخەکانیش سێوە.

گرفتەکانی خەڵکی ئاوایی: بەرێوەنەچوونی گەڵاڵەی هادی، پێویستی بە سیستێمی کۆکرنەوەی زبڵوزاڵ، نەبوونی بنکەی تەندروستیی سەربەخۆ و نەبوونی قوتابخانەی ناوەندی. خەڵکی گاپیس مردووەکانیان لە گۆڕستانی "شەبەک" لە ئاوایی "قەرەداغ" دەنێژن.

"سمایل شکووهی" قارەمانی قارەمانانی ئاسیا لە ڕشتەی وەزنەبەرداری قودرەتی ـ پاوێرلیفتینگ، وەک کەسایەتییەکی ناسراوی وەرزیشی، خەڵکی ئەم گوندەیە.

## گاگەشی خوارێ

ئەم ئاوایی‌یە لە ٥٠ کیلۆمیتری باشووری ڕۆژاوای شاری مەهاباد، بەشی خەلیفان و دێهستانی مەنگوڕی ڕۆژهەڵات و لە ناوچەی مەنگوڕایەتی هەڵکەوتووە. لە ٤٦ ماڵ و ٢٨٩ کەس پێکهاتووە، لەمانە ١٥٢ کەس پیاون و ١٣٧ کەسیش ژنن، ژمارەی خوێندەوارانی ئەم ئاوایی‌یە ١٧١ کەسە کە ١٠٦ کەس پیاون و ٦٥ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٨٩ کەسی نەخوێندەوار ٢٧ کەس پیاون و ٦٢ کەسیش ژنن.
پانتایی ئاوایی ١٨٠٠ هێکتارە، لەمە ٣٤١ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و ١٤٥٩ هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.
گاگەشی خوارێ خاوەن ٤٥ هێکتار زەوی دێم، ٨٩ هێکتار زەوی بەراو، ٧/٩٤ هێکتار باخ، ٥ تراکتور و ٢ لاوێردەیە.
بەرزایی ئاوایی ١٧٨٠ میتر لە ڕووکەشی زەریاکانە.

ئاوایی‌یەکانی دەورووبەر:

باشوور: ئاوایی جانداران

باکوور: ئاوایی‌یەکانی کارگ و هەرمێ

ڕۆژهەڵات: ئاوایی‌یەکانی شەکربەگ و کیسەڵان

ڕۆژاوا: ئاوایی گاگەشی سەرێ

چیاکانی دەورووبەری ئاوایی:

باشوور: کانیەبای

باکوور: گوێچکەدەرێ

ڕۆژهەڵات: گردەدوولک

ڕۆژاوا: گردی خمخان

گۆڕمووسا، ئەستێرۆک و دەشتی بۆڕی، سێ کوێستانی ناسراوی ئەم گوندەن. لە کانیەباریکە چەند کون و کەلێن هەیە کە دەتوانین وەک ئەشکەوت ئاماژەیان پێ بکەین. لووسی حرووسان، شێخی، فەقێیان، ڕەش و باریکە لە کانیاوە بەناوبانگەکانی ئاوایین.
بنەمای خانووبەرەکان لە قوڕ و بەرد و میچەکان لە دارن، ماڵەکان بە شێوەیەکی ئاڵۆز و ناڕێک ساز کراون. چەند ماڵێک لە قەراغ جادەن، ماڵەکان هەموویان حەوشەیان نییە و هێندێک هەیوانیان هەیە کە بە کۆڵەکەی دار ڕاوەستاوە.
بە وتەی خەڵکی ئاوایی، گاگەش شوێنێکی مێژووییە و "سەمبووریان" جێگەیەکە لە نێوان گاگەشی سەرێ و خوارێ هەڵکەوتووە کە لێکۆڵینەوەی لەسەر نەکراوە. "ناسر و ماڵماڵ" وەک دوو قارەمان لە بەیت و حیماسەی ئەدەبی سەر زارەکی کوردەواری‌دا، خەڵکی ئەم مەڵبەندە بوون. "گردی خمخان" و "چەگقوتابخانە"، دوو قەڵای مێژوویی ئاوایین کە ناویان تۆمار نەکراوە. لە باشووری ئاوایی شوێنێک بە ناوی "کانیەشینکێ" هەیە کە زوو ئاوایی بووە و نزیک بە ٣٠ ساڵە چۆڵ کراوە، بەڵام چەند کەس لە خەڵکی کانیەشینکێ ئێستاش هاوینان دێنەوە سەر مەزراکانیان.
لە ڕۆژهەڵاتی دێ ڕێگایەکی خاکی دەچێتەوە ئاوایی شەکربەگ، لە ڕۆژاواوە ڕێگایەکی خاکی ئاوایی گاگەشی سەرێ دەگرێتەوە.
ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی 1376/02/01 کارەباکەی هەڵکراوە، لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە، بەڵام چونکە ئاوەکەی کەمە خەڵکەکەی لە کانی "لووسێ حرووسان" کەلک وەردەگرن، بنکەی مخابەرات، قوتابخانەی سەرەتایی (کوڕانە ـ کچانە) بە ناوی "فریشتە"، ئاکابیری، بنکەی تەندروستی، مزگەوت (لەم ساڵانەدا نۆژەن کراوەتەوە)، جووجەخانە (کەرتی تایبەتی). هەروەها ئەم گوندە خاوەنی شووڕای ئیسلامییە. نەوت و کەلوپەلی پێویستی خەڵک لە شەریکەی ئاوایی "میرەسێ" دابین دەبێ. قوتابیانی ئەم ئاواییە پاش تێپەڕکردنی پۆلی سەرەتایی بە یەکجاری دەست لە خوێندن هەڵدەگرن.
ئاژەڵداری ، وەرزێڕی، باخداری و کرێکاری کاروپیشەی خەڵکی گاگەشی خوارێیە. ئاژەڵەکان بریتین لە: مەڕ، مانگا و بزن، وەرزێران گەنم، جۆ و نۆک دەچێنن و بەرهەمی باخەکان سێو، گوێز و قەیسییە.
گرفتەکانی خەڵکی گاگەشی خوارێ بریتین لە: نەبوونی قوتابخانەی ناوەندی، ڕێگاوبانی ناخۆش، گرفتی ئاو، نەبوونی حەوشە و ئاودەستخانە بۆ قوتابخانە، نەبوونی دێهیاری. خەڵکی ئەم گوندە مردووەکانیان لە گۆڕستانی گاگەشی سەرێ دەنێژن و جاری وایە لە گۆڕستانی ناسر و ماڵماڵ لە نێوان شەکربەگ و ئاوایی خۆیان بە خاکی دەسپێرن.

## گاگەشی سەرێ

ئەم ئاواییە لە ٥٢ کیلۆمیتری باشووری ڕۆژاوای شاری مەهاباد، بەشی خەلیفان و دێهستانی مەنگوڕی ڕۆژهەڵات و لە ناوچەی مەنگوڕایەتی هەڵکەوتووە. لە ٥١ ماڵ و ٣٠٨ کەس پێکهاتووە، لەمانە ١٥٦ کەس پیاون و ١٥٢ کەسیش ژنن، ژمارەی خوێندەوارانی ئەم ئاواییە ١٦٦ کەسە کە ٩٥ کەس پیاون و ٧١ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٩٩ کەسی نەخوێندەوار ٣٧ کەس پیاون و ٦٢ کەسیش ژنن.

پانتایی هەر دوو ئاوایی گاگەش (سەرێ و خوارێ) ١٨٠٠ هێکتارە.

گاگەشی سەرێ خاوەن ٢٠٦ هێکتار زەوی دێم، ١٨٤/٩ هێکتار زەوی بەراو، ٢٧/٦٩ هێکتار باخ، ٥ تراکتۆر و ٣ لاوێردەیە.

| ئاوایی‌یەکانی دەورووبەر: | چیاکانی دەورووبەری ئاوایی: |
|---|---|
| باشوور: ئاوایی گاگەشی خوارێ | باشوور: سێیەتمانی |
| باکوور: ئاوایی‌یەکانی کارگ و هەرمێ | باکوور: بایزگوژاو |
| ڕۆژهەڵات: ئاوایی شەکربەگ | ڕۆژهەڵات: پتاوسێ |
| ڕۆژاوا: ئاوایی شارستێن (سەر بە پیرانشار) | ڕۆژاوا: حەسەنەبەشە و پشتاو |

"سەمبووریان" کە لە نێوان هەر دوو گاگەشاندا هەڵکەوتووە، شوێنێکی سروشتی جوان و دڵلاوێنە، کانیاوێکی لێیە هەر بەو ناوەیە و لە وەرزی بەهار و هاوینان دەبێتە مەکۆی ڕێبواران و لایەنگرانی سروشت. قەرەوڵان، سەمبووریان، درۆڵە و حەسەنەبەشە (لە نزیک کانیاوی حەسەنەبەشە، لە داوێنی کێوێک هەر بەو ناوە ٣٧ کانیاوی هەیە) کانیاوە بەناوبانگەکانی ئاواییین. خانووبەرەکان لە قوڕ و بەردن و چەند ماڵێکیش بە خشت ساز کراون، میچی گشت ماڵەکان هەر لە دارە، ماڵەکان حەوشەیان نییە و زۆربەیان هەیوانیان هەیە و بە پلیکانان وەسەر دەکەون، کۆڵانەکان خواروخێچ و ئاڵۆزن، مزگەوت لە ناوەندی ئاواییە و بە شێوازێکی نوێ ساز کراوە.

سەبارەت بە مێژووی ئاوایی، بەڵگەیەک لە دەستدا نییە و هەر ئەو بابەتانەن کە لە بەشی (گاگەشی خوارێ)دا باسمان کردن.

"تاوسەپە" و قەبرە کەونەکانی ئاوایی بە ژمارەی تۆمارکراوی ١٢٣٨ لە میراتی فەرهەنگی، مێژوویەکەیان دەگەڕێتەوە نێوان هەزارەی دووەمی پێش زایین. دۆڵی پتاوسێ لە لایەن میراتی فەرهەنگی سەردانی کراوە و بڕیارە وەک شوێنەوارێکی مێژوویی تۆمار بکرێ.

لە باشووری ئاوایی ڕێگایەکی خاکی بۆ ئاوایی گاگەشی خوارێ دەچێتەوە.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی 1376/02/01 کارەباکەی هەڵکراوە، لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە (ئاوەکەی لە کانی قەرەوڵان دابین دەبێ)، بنکەی مخابەرات، قوتابخانەی سەرەتایی (کوڕانە ـ کچانە) بە ناوی "سەعید"، دێهیاری (ساڵی ١٣٨٨)، مزگەوت (ساڵی ١٣٦٨ی هەتاوی نۆژەن کراوەتەوە) و هەروەها ئاوایی لە شووڕای ئیسلامی بەهرەمەندە. بۆ کاروباری بنکەی تەندروستی سەر بە ئاویی "گاگەش"ی خوارێن و کەلوپەل و نەوتەکەیان لە شەریکەی ئاوایی "میرەسێ" دابین دەبێ. ئەو قوتابییانەی درێژە بە خوێندن دەدەن کە ڕادەشیان بەرچاو نییە، دەچنە ئاوایی خەلیفان و شاری مەهاباد، کچان بە تەواوی لە خوێندن بێبەش کراون.

ئاژەڵداری، وەرزێری، باخداری و کرێکاری کاروپیشەی خەڵکی ئەم گوندە پێکدێنن. ئاژەڵەکان مەڕ، مانگا و بزنن. وەرزێران گەنم و جۆ دەچێنن و بەرهەمی باخەکانیان سێوە.

گرفتەکانی خەڵکی ئاوایی: ڕێگاوبانی ناخۆش (جاری وایە زستانان بە ماوەی حەوتوویەک ڕێگاوبان دەگیرێ)، گرفتی ئاو لە وەرزی هاویندا (جێگای ئاماژەیە ئەو کانیاوانەی کە دێنەوە عەنباراوی ئاوی هاوبەش، خاوەن زەوییەکان لە وەرزی هاویناندا هەڵیاندەبڕن و ئاوەکەی دە باخ و بێستانان دەکەنەوە)، نەبوونی قوتابخانەی ناوەندی و نەبوونی بنکەی تەندروستیی سەربەخۆ.

ئاوایی دوو گۆڕستانی کۆن و نوێی هەیە، بۆ مردوو ناشتن لە هەردووکیان کەلک وەردەگرن، یەکیان لە تەنیشت ماڵانە بە ناوی "گۆڕستانی نێوماڵان" و تەنێ لە وەرزی زستاناندا مردووی لێ دەنێژن، گۆڕستانی نوێ کە لە بەری ڕۆژاوایە هەڵکەوتووە و ڕێگاکەی ناخۆش و سەخڵەتە کە کەشوهەواکەی خۆش بوو کەلکی لێ وەردەگرن.

## گامێشان

گامێشان لە ٦٢ کیلۆمیتری باشووری ڕۆژهەڵاتی مەهاباد، بەشی خەلیفان و دێهستانی کانی بازاڕ و لە ناوچەی گەورکایەتی هەڵکەوتووە. لە ٢١ ماڵ و ١٤٩ کەس پێکهاتووە، لەمانە ٧١ کەس پیاون و ٧٨ کەسیش ژنن، لە ٧٥ کەسی خوێندەوار لەم دێیە ٤٢ کەسیان پیاون و ٣٣ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٥٠ کەسی نەخوێندەوار ١٥ کەس پیاون و ٣٥ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ٢٤١٢ هێکتارە، لەمە ٢١٢ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و ٢٢٠٠ هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.

گامێشان خاوەن ٦٥ هێکتار زەوی دێم، ٣ هێکتار زەوی بەراو، ٣ هێکتار باخ، ٩ تراکتۆر و ١ لاوێردەیە.

مەودای ئاوایی تا ناوەندی خزمەتگوزاریی وەرزێری کانی بازاڕ ٢٥ کیلۆمیترە.

بەرزایی ئاوایی ١٦٥٠ میتر لە ڕووکەشی زەریاکانە.

ئاواییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی سوێناس

باکوور: ئاوایی زیندووقووڵ

ڕۆژهەڵات: ئاواییەکانی باراوا، گورگە و ئاغوەتمان

ڕۆژاوا: ئاوایی پاشبەرد

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باشوور: نیسکان

باکوور: زاخە

ڕۆژهەڵات: مەناڵە

ڕۆژاوا: خڕی مێشان

کانیاوەکان بە کانی سارد، پریشکە و پوورفاتم ناسراون.

ماڵەکان بە گشتی لە قوڕ و بەرد و میچی دار ساز کراون و کۆڵانەکان ناڕێک هەڵکەوتوون.

سەبارەت بە ناوی ئاوایی، هێندێک لە دانیشتووانی ناوچەکە ناودێرکردنی ئەم دێیە دەبەستنەوە بە "خڕێ مێشان" کە لەم دێیە هەڵکەوتووە.

لە ڕۆژاوای گوندەوە ڕێگایەکی خاکی هەیە کە ئاوایی پاشبەرد و جادەی سەرەکی مەهاباد ـ سەردەشت دەگرێتەوە.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی ١٣٧٧/٦/٢٤ کارەباکەی هەڵکراوە، سیمکارتی مخابەراتی، شێرەیەکی گشتی کە ئاوەکەی لە کانی پریشکە دابین دەبێ، قوتابخانەی سەرەتایی (کوڕانە ـ کچانە) بە ناوی "قەدر"، مزگەوت کە ساڵی ١٣٨٠ی هەتاوی نۆژەن کراوتەوە، هەروەها گامێشان خاوەن شووڕای ئیسلامییە. نەوت و کەلوپەل لە شەریکەی هاوبەشیی کاوڵانی خوارێ وەردەگرن و بۆ بنکەی تەندروستی سەر بە ئاوایی پاشبەردن. قوتابیانی کوڕی ئەو گوندە بۆ درێژەدان بە خوێندن لە دوای پۆلی سەرەتایی دەنێردرێنە کاوڵانی خوارێ، خەلیفان و مەهاباد،کچەکانی ئاوایی لەم مافە بێبەش کراون.

کاروپیشەی خەڵکی گامێشان وەرزێری، ئاژەڵداری و کرێکارییە، وەرزێران گەنم، جۆ و نۆک دەچێنن و ئاژەڵەکانیان مەڕ، مانگا و بزنن و هەروەها خەڵکی ئاوایی بێجگە لە چەند دارسێوێک باخیان نییە.

گرفتەکانی خەڵکی ئاوایی: ڕێگاوبانی خاکی و ناخۆش، پێویستی بە هەڵبەستنی پردێکە بۆ ئاوایی، نەبوونی بنکەی تەندروستیی سەربەخۆ.

ئاوایی خاوەن دوو گۆڕستانە لە ڕۆژهەڵات، یەکیان بە شێخ بایز ناسراوە و ئەوەی دیکەیان کە ئێستا کەلکی لێ وەردەگیرێ هەر بە قەبرستانی گامێشان ناوی لێ دەبەن.

وەک دوو کەسایەتیی بەرچاو لەم ئاوایییە دەتوانین ئاماژە بە مامۆستا مەلا "حەسەن شەیدایی" و کوێخا "عومەر گامێشان"ی بکەین.

## گراوێ

له ٥٠ کیلۆمیتری باشووری ڕۆژهه‌ڵاتی شاری مه‌هاباد، به‌شی خه‌لیفان و دێهستانی کانی بازاڕ و له ناوچه‌ی مه‌نگوڕایه‌تی هه‌ڵکه‌وتووه. له ٨ ماڵ و ٤٨ که‌س پێکهاتووه، له‌مانه ٢١ که‌س پیاون و ٢٧ که‌سیش ژنن، ژماره‌ی خوێنده‌وارانی ئه‌م ئاواییه ٢٨ که‌سه که ١٢ که‌س پیاون و ١٦ که‌سیش ژنن، هه‌روه‌ها له ١٨ که‌سی نه‌خوێنده‌وار ٨ که‌س پیاون و ١٠ که‌سیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ٧٢١هێکتاره، له‌مه ١١٠ هێکتار بۆ خه‌ڵک جیا کراوه‌ته‌وه و ٦١١ هێکتار پاوان و له‌وه‌ڕگه‌ی دێیه. گراوێ خاوه‌ن ٢٢٠ هێکتار زه‌وی دێم، ١٤ هێکتار زه‌وی به‌راو، ٤ هێکتار باخ و ٥ تراکتۆره.

| ئاواییه‌کانی ده‌وروبه‌ر: | چیاکانی ده‌وروبه‌ری ئاوایی: |
|---|---|
| باشوور: ئاوایی کانی سێو | باکوور: موکری قران |
| باکوور: ئاواییه‌کانی قوڵغه‌ته‌په (سه‌ر به بۆکان) و ئاچی ده‌رێ | ڕۆژهه‌ڵات: شاخه ڕه‌ش |
| ڕۆژهه‌ڵات: ئاواییه‌کانی قادراوا (سه‌ر به بۆکان) و گڵێنان | ڕۆژاوا: قاره‌مان |
| ڕۆژاوا: ئاواییه‌کانی شاره‌زوور و قۆیته‌ڵ | |

کوێره که‌رێ، کانی ژنان و حه‌وزی پیاوان سێ کانیاوی ئه‌م دێیه‌ن.

خانووبه‌ره‌کان له به‌رد و قوڕن و میچه‌کانیان له داره، زۆربه‌ی ماڵه‌کان ڕوویان له باشووره، به هۆی که‌م بوونی خانووبه‌ره‌کان هیچ کۆڵانێک له ئاوایی‌دا به‌دی ناکرێ.

"مامه نووره ئه‌ژراک" وه‌ک به‌ساڵاچووترین که‌سایه‌تی ئاوایی سه‌باره‌ت به‌و گونده ده‌ڵێ: ئه‌و دێیه مڵکی "شێخی بورهانی" بووه، "خه‌لیفه عه‌لی" داوا له شێخ ده‌کا ئه‌و ئاوایی‌یه‌ی یان پێ بفرۆشێ یان پێشکه‌شی بکا و "شێخی بورهان" به هه‌ر شێوه‌یه‌ک بووبێ ده‌یداتێ. "خه‌لیفه عه‌لی" ئه‌و ئاوایی‌یه ئاوه‌دان ده‌کاته‌وه. وه‌کوو باس ده‌کرێ ئاوایی قۆیته‌ڵ ئه‌و کات هه‌ر چوار ماڵ بووه که سه‌رده‌می قاجاران ده‌بێ.

"خه‌لیفه عه‌لی" کاتێک گراوێ ئاوه‌دان ده‌کاته‌وه شه‌ش کوڕی ده‌بێ و له‌و دێیه ته‌کیه‌ی خۆی داده‌مه‌زرێنێ، پاش تێپه‌ڕ بوونی چه‌ند ساڵێک که "خه‌لیفه عه‌لی" و چه‌ند کوڕی کۆچی دوایی ده‌که‌ن "نووره‌دین ئه‌رژه‌نگ" ناسراو به حاجی بابا خه‌لیفه، ته‌کیه‌که ده‌کاته مزگه‌وت و پێش‌نوێژی خه‌ڵک ده‌کا.

له باشووری دێ، ڕێگای قیله‌تاو بۆ ئاوایی گڵێنان ده‌چێته‌وه، له باکوور، ڕێگای خاکی ئاوایی قادراوا ده‌گرێته‌وه، له باشووری ڕۆژاوا، ڕێگای خاکی بۆ ئاوایی کانی سێو ده‌ڕوات، له ڕۆژاوا، ڕێگای قیله‌تاو ده‌چێته‌وه ئاوایی شاره‌زوور.

ئیمکاناتی ئاوایی: کاره‌با ڕێکه‌وتی 1372/12/15 هه‌ڵکراوه، ڕایه‌ڵی ئاوی خواردنه‌وه، سیم کارتی مخابه‌راتی دێهات، قوتابخانه‌ی سه‌ره‌تایی (کوڕانه ـ کچانه) به ناوی "شه‌ریعه‌ت" و مزگه‌وت. خه‌ڵکی ئاوایی بۆ که‌ڵک وه‌رگرتن له بنکه‌ی ته‌ندروستی سه‌ر به ئاوایی (گڵێنان)ن و که‌لوپه‌ل و نه‌وته‌که‌یان له شه‌ریکه‌ی هاوبه‌شیی ئاوایی "خه‌لیفان" دابین ده‌بێ.

هه‌موو خه‌ڵکی ئاوایی خزمن و گشتیان دوو بنه‌کین، به‌م چه‌شنه که بنه‌ی دیکه‌یان له شاری بۆکانه، هه‌ر بۆیه قوتابیان بۆ درێژه‌دان به خوێندن ڕه‌وانه‌ی شاری بۆکان ده‌بن.

کاروپیشه‌ی خه‌ڵکی ئاژه‌ڵداری و وه‌رزێرییه. ئاژه‌ڵه‌کان بریتین له: مه‌ڕ، مانگا و بزن، وه‌رزێران گه‌نم، جۆ و نۆک ده‌چێنن.

گرفته‌کانی خه‌ڵکی ئاوایی: نه‌بوونی شووڕا، نه‌بوونی بنکه‌ی ته‌ندروستیی سه‌ربه‌خۆ.

گۆڕستانی ئاوایی له ڕۆژاوا هه‌ڵکه‌وتووه که هێندێک له خه‌ڵکی ئاوایی شاره‌زووریش که‌لکی لێ وه‌رده‌گرن. جگه له‌م گۆڕستانه، گۆڕستانێکی تایبه‌تی که "خه‌لیفه عه‌لی" و کوڕه‌کانی لێ نێژراوه، له حه‌وشه‌ی ماڵه "حاجی بابا خه‌لیفه" (نووره‌دین ئه‌ژره‌نگ)دا هه‌ڵکه‌وتووه.

## گردشیلان

گردشیلان له 72 کیلۆمیتری باشووری ڕۆژهەڵاتی شاری مەهاباد، بەشی خەلیفان و دێهستانی کانی بازاڕ و له ناوچەی گەورکایەتی هەڵکەوتووە. له 33 ماڵ و 210 کەس پێکهاتووە، لەمانە ٩٩ کەس پیاون و ١١١ کەسیش ژنن، له ١٠٣ کەسی خوێندەوار لەم ئاوایییە ٦٤ کەسیان پیاون و ٣٩ کەسیش ژنن، هەروەها له ٨٥ کەسی نەخوێندەوار ٢٧ کەس پیاون و ٥٨ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی 4981/55 هێکتارە، لەمە 281/55 هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و 4700 هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.

گردشیلان خاوەن ٨ هێکتار زەوی دێم، ١٠ هێکتار زەوی بەراو، ٢ هێکتار باخ و ٢ تراکتۆرە.

ئاوایییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی گەنمان (سەر بە بۆکان)

ئاوایی نستان (سەر بە سەردەشت)

باکوور: ئاوایی سوێناس

ڕۆژهەڵات: ئاوایی ماژگێ

ڕۆژاوا: ئاوایی کانی ڕەش

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باشوور: شاخەسوور

باکوور: شاخەڕەش

ڕۆژهەڵات: شاڵەبەگ

ڕۆژاوا: کوێستانی تۆرە

کانی هەمین، کانی بەرخ، سێکانیان و چاوڕەشە کانیاوەکانی ئەم گوندەن.

دۆڵبەران، مەیدانچۆغە، کانی بەرخ و کانی هەمین و سێکانیان، هەوارە ناودارەکانی ئەم ئاوایییەن.

له گردشیلان خانووبەرەکان له قوڕ و بەرد ساز کراون و میچی ماڵەکان له دارە، کۆڵانەکان بەرەو هەورازن، زۆربەی ماڵەکان لە سەر تەپۆڵکەیەک هەڵکەوتوون و حەوشەیان نییە.

له باکووری ئاوایی باریکەڕێیەک هەیە کە پاش بڕینی مەودایەک دەگەیە دووڕێیانێک کە دەچێتەوە ئاوایییەکانی ماژگێ و سوێناس.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕیکەوتی 1377/04/01 کارەباکەی هەڵکراوە، لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە کە خاوەن عەنباراوێکە و ئاوەکەی له "کانی فەقێ" دابین دەبێ، تەلەیفوونی ماڵ بە ماڵ، قوتابخانەی سەرەتایی (کوڕانە - کچانە) بە ناوی "نەستەرەن" کە بیناکەی حازربەدەستە، مزگەوتی "محەممەدڕەسوڵەڵڵا" ساڵی 1386ی هەتاوی نۆژەن کراوەتەوە و هەروەها ئەم دێیە له شووڕای ئیسلامی بەهرەمەندە. بۆ بنکەی تەندروستی سەر بە ئاوایی "سۆیناس"ن، هەروەها بۆ وەرگرتنی نەوت و کەلوپەل سەر بە کاوڵانی خوارێن.

کاروپیشەی خەڵکی گردشیلان زۆرتر، ئاژەڵدارییە. بە هۆی سەخڵەت و بەرداوی بوونی زەوییەکانی ئەو شوێنە کاری وەرزێری و باخداری چەتوونە. ئاژەڵەکانیان مەڕ، مانگا و بزنن، وەرزێران بە ڕادەیەکی کەم گەنم دەچێنن، سێو، هڵوو و گوێز بەرهەمی باخەکانی ئاوایین. هێندێک داری خۆڕسکیشی لێیە کە بەرەکەیان گێوژ و کرۆسکە.

گرفتەکانی خەڵکی ئاوایی: ڕێگاوبانی ناخۆش و خاکی، نیاز بە پردێکی قایم و پتەو، قوتابخانەی ئاوایی کە حازربەدەستە.

له ڕۆژاوای گردشیلان کۆنەگۆڕستانێکی لێیە کە بە "قەبری قەڵات" ناسراوە، له باشووریشەوە گۆڕستانی "سەردۆڵ" هەڵکەوتووە کە ئێستا مردووی لێ دەنێژن.

## گردەبەردان

گردەبەردان لە ٤٤ کیلۆمیتری باشووری ڕۆژاوای شاری مەهاباد، بەشی خەلیفان و دێهستانی کانی بازاڕ و لە ناوچەی محاڵ هەڵکەوتووە. لە ١٧ ماڵ و ١٠٢ کەس پێکهاتووە، لەمانە ٥٣ کەس پیاون و ٤٩ کەسیش ژنن، ژمارەی خوێندەوارانی ئەم ئاواییە ٤٨ کەسە کە ٣٣ کەس پیاون و ١٥ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٤٠ کەسی نەخوێندەوار ١٤ کەس پیاون و ٢٦ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ٣٠٠ هێکتارە، لەمە ١٨٢ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و ١٧٢ هێکتار پاوان و لەوەرگەی دێیە.

گردەبەردان خاوەن ١٢٠ هێکتار زەوی دێم، ٢٧ هێکتار زەوی بەراو، ١/٥ هێکتار باخ و ٦ تراکتۆرە.

مەودای ئاوایی تا ناوەندی خزمەتگوزاریی وەرزێری کانی بازاڕ ١٨ کیلۆمیترە.

ئاواییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاواییەکانی عەینەمەلا و پیرمکائیل

باکوور: ئاواییەکانی ئەمینئاباد، ئۆزندەرێی سەرێ و خوارێ

ڕۆژهەڵات: ئاوایی بەیرەم

ڕۆژاوا: ئاوایی قۆزلووجە

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باشوور: ڕەسووڵئاغا

باکوور: ورچێ

ڕۆژهەڵات: چاکی شەهیدان

ڕۆژاوا: گۆلان

فەقێ سمایل، هەڵووچە، گۆلا، سەرکۆتان و قەواغان، کانیاوە بەناوبانگەکانی ئاواییین.

ماڵەکانی ئەم گوندە لە قوڕ و بەردن و میچەکانیان لە دارن، ماڵەکان حەوشەی بچووکیان هەیە و بە گشتی بەرەڕووی ڕۆژهەڵات ساز کراون، کۆڵانەکان زۆر بەرتەسک و باریکەڵانە هەڵکەوتوون.

بە وتەی بەساڵاچووان، ئاوایی گردەبەردان پێشتر لە بەری باکووری ئەو شوێنەی ئێستای بووە کە پاشان بە هۆی سەخڵەتی جێگا و کەمئاوی گوێزراوەتەوە. هەڵبەت ڕێکەوتی ئەو گوازتنەوە ڕوون نییە، بەڵام خەڵکی ئاوایی دەڵێن ١٥٠ ساڵێک دەبێ.

لە باشووری دێ، ڕێگایەکی خاکی لێیە و دەچێتەوە ئاواییەکانی عەینەمەلا و پیرمکائیل، لە باکوورەوە، ڕێگایەکی خاکی ئاوایی ئەمینئاباد دەگرێتەوە، لە ڕۆژهەڵاتەوە، ڕێگایەکی خاکی دەچێتەوە ئاوایی بەیرەم، لە ڕۆژاواوە، ڕێگایەکی خاکی بۆ ئاوایی ئۆزندەرێ دەچێتەوە.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی 1377/05/05 کارەباکەی هەڵکراوە، بنکەی مخابەرات، بنکەی تەندروستی، قوتابخانەی سەرەتایی (کوڕانە ـ کچانە) بە ناوی "پاسدار"، مزگەوتی"حەزرەتی عومەر" ساڵی ١٣٨٤ی هەتاوی نۆژەن کراوەتەوە و هەروەها ئاوایی لە شووڕای ئیسلامی بەهرەمەندە. بۆ وەرگرتنی نەوت و کەلوپەل سەر بە شەریکەی هاوبەشیی "پشتتەپ"ی مەهابادن. خەڵکی ئەم گوندە بۆ دابین کردنی ئاوی خواردنەوەیان لە کانی ماڵان، وەک سەرچاوەیەکی گشتی کەلک وەردەگرن.

قوتابیان پاش تێپەڕ کردنی پۆلی سەرەتایی دەست لە خوێندن هەڵدەگرن و زۆر بە دەگمەن هەڵدەکەوێ کەسێک بتوانێ درێژە بە خوێندن بدا.

وەرزێری و ئاژەڵداری سەرەکیترین کاروپیشەی خەڵکی گردەبەردانیان پێکهێناوە، هەڵبەت چەند باخێکی بچووکیشی لێیە. وەرزێران گەنم، جۆ، نۆک و نیسک دەچێنن و ئاژەڵەکانیان مانگا، مەڕ و بزنن، بەرهەمی باخەکانیش سێوە.

گرفتەکانی خەڵکی گردەبەردان: ڕێگاوبانی یەکجار ناخۆش و خاکی، پێویستیان بە لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوەیە.

لە ڕۆژهەڵاتی ئاوایی کۆنەگۆڕستانێکی لێیە بە ناوی "دارەگوێژ" و خەڵک بە شوێنێکی مێژوویی دەزانن. جێگای باسە ئەو شوێنە چەند دارەگوێژی لێیە کە تەمەنیان زیاتر لە ١٠٠ ساڵە. خوداڵێخۆشبوو مام "ڕەسووڵ باڵەکی" بەیتبێژ و فۆلکلۆرزانی ئەم ئاواییە بووە.

## گردەڕەش

لە ٤٠ کیلۆمیتری باکووری ڕۆژهەڵاتی شاری مەهاباد، بەشی ناوەندی و دێهستانی موکریانی ڕۆژهەڵات و لە ناوچەی محاڵ هەڵکەوتووە. لە ٦٤ ماڵ و ٣٧١ کەس پێکهاتووە، لەمانە ١٧٩ کەس پیاون و ١٩٢ کەسیش ژنن، ژمارەی خوێندەوارانی ئەم ئاواییە ٢١١ کەسە کە ١١٩ کەس پیاون و ٩٢ کەسیش ژنن، هەروەها لە ١٢٠ کەسی نەخوێندەوار ٣٨ کەس پیاون و ٨٢ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ٢١٢٤ هێکتارە، لەمە ٧٨٥/٨ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و ١٣٣٨/٢ هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.

گردە ڕەش خاوەن ٧٧٠ هێکتار زەوی دێم، ٢٧٠ هێکتار زەوی بەراو، ٤٠ تراکتۆر و ٢ لاوێردەیە.

بەرزایی ئاوایی ١٣٣٠ میتر لە ڕووکەشی زەریاکانە.

ئاوایییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی باجەوەند

باکوور: ئاوایی دێی مەلا (سەر بە شاری بۆکان)

ڕۆژهەڵات: ئاوایی خەتایی

ڕۆژئاوا: ئاوایی قوڵقوڵە

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باشوور: ماینیشا

باکوور: شابازاوا

ڕۆژهەڵات: گردی ڕەش

ڕۆژئاوا: خرێ گامێشان

ئەم ئاوایییە کەرێزەی هەیە.

خانووبەرەکان لە قوڕ و بەردن و میچیان لە دارە، ئێستا خشت و بلووکیش دەکار دەکەن، ماڵەکان حەوشەیان هەیە و کۆڵانەکان نەختێک هەوراز و خواروخێچن.

لە بەری ڕۆژهەڵاتی دێ لە نێوان "سمایلەکەت" و "گردەڕەش" گردێکی لێیە کە هەر لە کۆنەوە گردی ڕەشیان پێگوتووە. ناوی ئاواییش هەر لەم گردەوە هاتووە. دەڵێن لە بەری باکوور، ئاوایییەک هەبووە بە ناوی "شابازئاوا" کەچی نزیک سەد ساڵ دەبێ بە وتەی خەڵکی گردەڕەش تێکەڵی ئاوایی گردەڕەش بۆتەوە. لە باشووری دێ، ڕێگایەکی خاکی ئاوایی باجەوەند دەگرێتەوە، لە باکوور، ڕێگایەکی خاکی جادەی مەهاباد ــ میاندواو دەگرێتەوە، هەروەها لە ڕۆژهەڵاتی ئاوایی ڕێگایەکی خاکی دەگاتە دووڕییانێک و بۆ ئاوایییەکانی دێمەلا، زەنگیاوا و خەتایی دەچێتەوە، لە ڕۆژئاوا ڕێگایەکی خاکی دەڕواتەوە ئاوایی قوڵقوڵە.

ئیمکاناتی ئاوایی: کارەبا، لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە کە عەنباراویان بۆ داناوە و ئاوەکەی لە ئاوایی "زەنگیاوا"ی (میاندواو) دابین دەبێ، سیمکارتی مخابەراتی دێهات، بنکەی تەندروستی، قوتابخانەی سەرەتایی (کوڕانە ــ کچانە) بە ناوی "وەلحەسر" کە بیناکەی حازربەدەستە، دێهیاری (ساڵی ١٣٨٨)، ئاکابیری، مزگەوت کە لە خشت و چیمەنتۆ ساز کراوە و هەروەها ئاوایی خاوەن شووڕای ئیسلامییە. خەڵکی گردەڕەش نەوت لە شەریکەی هاوبەشیی ئاوایی "حاجیخۆش" وەردەگرن و بۆ کەلوپەل سەر بە ئاوایی "گۆکتەپە"ن. قوتابیانی ئاوایی لە مەهاباد و گۆکتەپە درێژە بە خوێندن دەدەن.

کاروپیشەی خەڵک وەرزێری، ئاژەڵداری، کرێکارییە. بەرهەمی وەرزێران گەنم، جۆ، کۆلزا و چەوەندەرە و ئاژەڵەکانیان مەڕ، بزن، مانگا و گامێشە. هەروەها تازە هێندێک پیشەی دارسێویان لێداون.

ڕێگای خاکی و ناخۆش، نەبوونی بینایەکی باش بۆ قوتابخانە و بنکەی تەندروستی، نەبوونی قوتابخانەی ناوەندی لە گرفتە سەرەکییەکانی خەڵکی گردەڕەشە. گۆڕستانەکەی ئاوایی لە بەری ڕۆژئاوایە.

# گردەگرویَ

ئەم ئاواییە لە 24 کیلۆمیتری باکووری ڕۆژهەڵاتی شاری مەهاباد، بەشی ناوەندی و دێهستانی موکریانی ڕۆژهەڵات و لە ناوچەی شاروێران هەڵکەوتووە، لە ۹۳ ماڵ و ۵۰۵ کەس پێکهاتووە، لەمانە ۲٦۰ کەس پیاون و ۲٤٥ کەسیش ژنن، ژمارەی خوێندەوارانی ئەم ئاواییە ۲۹۲ کەسە کە ۱۷٤ کەس پیاون و ۱۱۸ کەسیش ژنن، هەروەها لە ۱٤۹ کەسی نەخوێندەوار ٥٤ کەس پیاون و ۹٥ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی 2010 هێکتارە، لەمە 412 هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و 1598 هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.

گردەگرویَ خاوەن ۳۲۰ هێکتار زەوی دێم، ۳۸۰ هێکتار زەوی بەراو، ٤٥ هێکتار باخ، ۲۹ تراکتۆر و ٤ لاوێردەیە.

ئاواییەکانی دەورووبەر:

باشوور: ئاواییەکانی حاجیخۆش و ترشەکان

باکوور: ئاواییەکانی قوڵەسەن و قزقەڵا (سەر بە میاندواو)

ڕۆژهەڵات: ئاواییەکانی قۆپی بابالّی و بەردەڕەشان

ڕۆژاوا: ئاواییەکانی کێچاوا و گابازەڵە

چیاکانی دەورووبەری ئاوایی:

باشوور: سەوزەپۆش

باکوور: بەردەزەرد و زیندان

ڕۆژهەڵات: قەلەنتاغ

کانی سێمان و قەلەنتاغ وەک دوو کانی لەم گوندە ناسراون. لە بەری باکووری ئاوایی لە کێوی بەردەزەرد ئەشکەوتێک هەر بەو ناوە هەیە.

بێجگە لە چەند ماڵێک، زۆربەی خانووبەرەکان بە خشت، بلووک و چیمەنتۆ ساز کراون و میچی ماڵەکان یان بە ئاسن یان بە دار داپۆشراون و زۆربەیان حەوشە و دەرگایان هەیە، کۆڵانەکان پێچاوپێچ و درێژ هەڵکەوتوون.

سەبارەت بە مێژووی ئەم ئاواییە تەپەی گردەزەردی لێیە بە ژمارەی تۆمارکراوی 16605 لە میراتی فەرهەنگی کە مێژوویەکەی دەگەڕێتەوە قۆناغی کالکۆلیتیک، بەرزایی ئەم شوێنە 1326 میتر لە ڕووکەشی زەریاکانە.

خەڵکەکەی دەڵێن: ئەم دێیە پێشتر لە داوێنی کێوی "قەلەنتاغ" بووە (ڕۆژهەڵاتی ئێستای ئاوایی) دوایە گوێزراوەتەوە شوێنی ئێستای. سەبارەت بە ناوی گردەگرویَ، لە نێو ئاوایی گردێکی ڕووتەن هەیە کە گیای لێ ناڕوێ و لە قەدیمەوە پێیان گوتووە "گردەگرویَ" و هەر ئەم ناوە بەسەر ئاواییشدا براوە.

لە باشووری دێ، ڕێگایەکی خاکی هەیە کە دەچێتەوە بۆ ئاوایی حاجیخۆش، لە باکوورەوە، ڕێگایەکی خاکی، ئاوایی قوڵەسەن دەگرێتەوە و لە ڕۆژهەڵاتەوە ڕێگایەکی قیلەتاو دەچێتەوە سەر جادەی مەهاباد ـ میاندواو، لە ڕۆژاواوە، ڕێگایەکی خاکی دەچێتەوە ئاواییەکانی گابازەڵە و کێچاوا.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی 1358/11/18 کارەباکەی هەڵکراوە، لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە (عەنباراو هەر لەم شوێنەیە و لە کانیاوی قەلەنتاغ و کانی سێمان دابین دەبێ)، سیمکارتی مخابەراتی دێهات، قوتابخانەی سەرەتایی (کوڕانە ــ کچانە) بە ناوی "ئەدەب"، مزگەوت (لەم دواییانە نۆژەن کراوەتەوە)، شەریکەی دەوڵەتیی کشت و سەنعەتی مەهاباد، دوو گاوداری (بەشی تایبەتی) و هەروەها گردەگرویَ خاوەن دێهیاری و شووڕای ئیسلامییە. بۆ بنکەی تەندروستی سەر بە ئاوایی "گابازەڵە"ن، نەوت و کەلوپەل لە ئاوایی گۆکتەپە وەردەگرن.

قوتابیان دوای تێپەڕ کردنی پۆلی سەرەتایی ڕەوانەی دێیەکانی کێچاوا، گۆکتەپە و شاری مەهاباد دەبن کە ئەو مافە بۆ کوڕان زیاتر پارێزراوە.

بنەماڵەی "حاجی قوربانی"، یەکەم مزگەوتیان لەم گوندە، لە سەردەمی "موسەدیق"دا ساز کرد و لەم ساڵانەی دواییدا نۆژەن کرایەوە.

وەرزێری، ئاژەڵداری و باخداری سەرەکیترین کاروپیشەی خەڵکی گردەگروێیە، هەڵبەت تا ڕادەیەک کرێکاریش دەکەن. بەرهەمی وەرزێران گەنم، جۆ، چەوەندەر، گوڵەبەڕۆژە و وێنجەیە، ئاژەڵەکانیان بریتین لە: مەڕ، مانگا، بزن و گامێش، بەرهەمی باخەکانیش سێوە.

گرفتەکانی خەڵکی ئاوایی: نەبوونی قوتابخانەی ناوەندی، نەبوونی بنکەی تەندروستیی سەربەخۆ، نەبوونی شەریکەی هاوبەشیی نەوت و کەلوپەل، گرفتی ئاو، بەڕێوە نەچوونی گەڵاڵەی هادی. گۆڕستانی ئاوایی ناوی "قەلەنتاغ"ە و لە بەری ڕۆژهەڵات هەڵکەوتووە.

## گردیاقووب

گردیاقووب لە 30 کیلۆمیتری باکووری شاری مەهاباد، بەشی ناوەندی و دێهستانی موکریانی ڕۆژاوا و لە ناوچەی شارویران هەڵکەوتووە. لە ٦٢ ماڵ و ٣٢١ کەس پێکهاتووە، لەمانە ١٧١ کەس پیاون و ١٥٠ کەسیش ژنن، ژمارەی خوێندەوارانی ئەم ئاواییە ١٨٥ کەسە کە ١١٠ کەس پیاون و ٧٥ کەسیش ژنن، هەروەها لە ١٠٠ کەسی نەخوێندەوار ٣٤ کەس پیاون و ٦٦ کەسیش ژنن.
پانتایی هەر دوو ئاوایی گردیاقووب و کۆنەدێ بە یەکەوە حیساب کراوە کە 1500 هێکتارە کە 520 هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و 980 هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە. گردیاقووب خاوەن ٢٧٥ هێکتار زەوی بەراو، ٥٣/٥ هێکتار باخ، ١٦ تراکتۆر و ٧ لاوێردەیە.
بەرزایی ئاوایی ١٢٧٠ میتر لە ڕووکەشی زەریاکانە.

ئاوایی‌یەکانی دەوروبەر:
باشوور: ئاوایی قەرەقشلاق
باکوور: ئاوایی داشخانە
ڕۆژهەلات: ئاوایی خوڕخوڕە
ڕۆژاوا: ئاوایی کۆنەدێ

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:
باکوور: شاخەڕەش، گردەپانکێ و گەرووس (تەپکە)

ئەم ئاوایی‌یە هیچ کانیاوێکی نییە.
ماڵەکان زۆرتر لە خشت و بلووکن، بەرد و قوڕ دەکار ناکرێ، میچەکانیان بە دار داپۆشراون کە ساز دەکرێنەوە ئاسن دەکار دەکەن، ماڵەکان حەوشە و دەرگایان هەیە، کۆڵانەکانی دێ ڕاست و ڕێک هەڵکەوتوون، گەڵاڵەی هادی لەم ئاوایی‌یە دەستی پێکردووە، گردیاقووب لە دەشتایی هەڵکەوتووە.
سەبارەت بە مێژووی ئەم دێیە دوو بۆچوون هەیە:
"حوسێن خەلیفە"، دانیشتووی شاری مەهاباد بۆی باس کردین کە وەک بابی واتا کوێخا "حەولا غەڵیف" بۆی گێڕابێتەوە و ئەویش هەر گوێبیس بووبێ لە باب و باپیرانی، کابرایەک هەبووە بە ناوی "یاقووبەڕەش" کە خەڵکی کرماشان و لە تیرەی کەڵهوڕ دەبێ ، ناوبراو بە هۆی کێشەیەکی تایبەتییەوە تووشی شەڕ دێ و لە ئاکامدا کەسێک دەکووژێ، بە خۆی و بنەماڵە و کەس و کارەکەیەوە پەرەوازەی موکریان دەبن و لە شارویران سەقامگیر دەبن، حاکمی ئەوکات شوێنێکیان دەداتێ و ئەوانیش ئاوەدانی دەکەنەوە و ئەو شوێنە بە گردیاقووب دەناسرێ. پاش تێپەڕ بوونی چەند ساڵ لە مانەوەی "یاقووبەڕەش" لە ناوچەی شارویران، سەرلەنوێ تووشی شەڕێک دەبێ و بە ناچار بە خۆی و خێڵەکەیەوە ئەوێ چۆڵ دەکا و ڕوو لە ناوچەی مەنگوڕایەتی دەکا، دیارە ئەو سەردەمی هۆزی مەنگوڕ ڕوویان نەکردبووە ئەو شوێنە و لەوێ دەمێنێتەوە؛ تایفە و تیرەی کەڵهوڕی ئێستاش کە لە زۆربەی ئاوایی‌یەکانی مەنگوڕایەتی بەتایبەت لە دۆڵی ئافانێ نیشتەجێن لە ڕەگەزی ئەو کەسایەتییەن.
بۆچوونی دووەم کە ڕای چەند کەسێکی دێیەکە دەڵێن: ئەو سەردەمی کە چۆمی ئەم ئاوایی‌یە ئاوێکی زۆرتری هەبووە، ئاوەکەی دەوری ئاوایی داوە و گوندەکە وەک گردێک لە نێو ئەو چۆمەدا دیار بووە. ئەو کەسەی کە دێیەکەی ئاوەدان کردۆتەوە ناوی "یاقووب" بووە کە ڕوون نییە کێ بووە و کەنگێ ئاوەدانی کردۆتەوە.
لە باشووری ئاوایی، ڕێگایەکی قیلەتاو دەچێتەوە ئاوایی قەرەقشلاق ، لە باکوورەوە، ڕێگایەکی خاکی، لەوەڕگەی ئاوایی کە بە شام ناسراوە دەگرێتەوە، لە ڕۆژاواش، ڕێگایەکی دەچێتەوە ئاوایی کۆنەدێ.
ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی 1367/08/12 کارەباکەی هەڵکراوە، لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوەی هەیە، سیمکارتی مخابەراتی دێهات، تەلەیفوونی ماڵ بە ماڵ، مزگەوت بە ناوی "ئیمام ئەبووبەکر" لە ساڵی 1370ی هەتاوی نۆژەن کراوەتەوە، نانەوەخانە و هەروەها گردیاقووب خاوەن دێهیاری و شووڕای ئیسلامییە. خەڵکی گریاقووب بۆ کەلک وەرگرتن لە بنکەی تەندروستی و وەرگرتنی کەلوپەل سەر بە ئاوایی "خوڕخوڕە"ن، نەوتەکەشیان لە

شەریکەی ئاوایی "قەرەقشلاق" دابین دەبێ. ئاوی خواردنەوەی ئەم گوندە لە ئاوایی خورخورە دابین دەبێ و سەرچاوەی ئاو هەر لە ئاوایی ناوبراوە.

ئەوەی لێرەدا جێگای سرنجە زۆر ئاواییمان هەن کە حەشیمەتیان هەر 50 کەسێک دەبێ و لانیکەم لە قوتابخانەیەکی حازربەدەست بەهرەمەندن کەچی ئەم گوندە بە حەشیمەتێکی 321 کەسی هێشتا قوتابخانەی سەرەتایی نییە و سەرەڕای ئەوەی کە خەڵکەکەی زەویشیان بۆ تەرخان کردووە، بەڵام ساز هەر نەکراوە، هەر بۆیە کوڕەکانی قوتابی لە ئاوایی کۆنەدێ پۆلی سەرەتایی دەخوێنن و بۆ پۆلەکانی ناوەندی و دواناوەندی دەچنە ئاوایی خورخورە و کچەکانیش ئەو هەلەیان بۆ ڕەخساوە کە پۆلی ناوەندی هەر لە ئاوایی کۆنەدێ بخوێنن، بەڵام بە گشتی لە دوای ئەم قۆناغە دەست لە خوێندن هەڵدەگرن.

وەرزێری، ئاژەڵداری و کرێکاری کاروپیشەی خەڵکی گردیاقووبە. بەرهەمی وەرزێران گەنم، جۆ، چەوەندەر و وێنجەیە، ئاژەڵەکانیش زۆرتر مانگان و هێندێکیش مەڕ و بزنیان هەیە، لە گردیاقووب باخ زۆر کەمە و ئەوی هەیە دارسێوە.

سەرەکیترین گرفتی ئەم ئاوایییە، نەبوونی قوتابخانەی سەرەتایی و نەبوونی بنکەی تەندروستیی سەربەخۆیە.

گۆڕستانی "سەیدی باخچە" لە بەری باکووری ئاوایی هەڵکەوتووە.

خانووی بە بلووک سازکراو

## گلێنان

گلێنان له ٥٧ کیلۆمیتری باشووری شاری مه‌هاباد، به‌شی خه‌لیفان و دێهستانی کانی بازاڕ و له ناوچه‌ی مه‌نگوڕایه‌تی هه‌ڵکه‌وتووه. له ٥٨ ماڵ و ٣٦٨ که‌س پێکهاتووه، له‌مانه ١٨٢ که‌س پیاون و ١٨٦ که‌سیش ژنن، ژماره‌ی خوێنده‌وارانی ئه‌م ئاواییه ٢٣٤ که‌سه که ١١٨ که‌س پیاون و ١١٦ که‌سیش ژنن، هه‌روه‌ها له ٩١ که‌سی نه‌خوێنده‌وار ٤٠ که‌س پیاون و ٥١ که‌سیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ٤١٩٩/٦٦ هێکتاره، له‌مه ٣٨٣ هێکتار بۆ خه‌ڵک جیا کراوه‌ته‌وه و ٣٨١٦ هێکتار پاوان و له‌وه‌ڕگه‌ی دێیه.

خاوه‌ن ٨٥٠ هێکتار زه‌وی دێم، ٣٥ هێکتار زه‌وی به‌راو، ٤ هێکتار باخ، ٣٥ تراکتۆر و ١ لاوێرده‌یه.

ئاوایی‌یه‌کانی ده‌وروبه‌ر:

باشوور: ئاوایی‌یه‌کانی قالوێ زه‌ندان و قالوێ حه‌وڵائاغای بۆکان

باکوور: ئاوایی‌یه‌کانی گراوێ و قادراوای بۆکان

ڕۆژهه‌ڵات: ئاوایی‌یه‌کانی شاگێلدی و لاسه‌گوڵان (سه‌ر به بۆکان)

ڕۆژاوا: ئاوایی کانی سێو

چیاکانی ده‌وروبه‌ری ئاوایی:

باشوور: دیلان جۆلان

باکوور: قووڵه‌به‌رازه

ڕۆژهه‌ڵات: سه‌یدی سامه

ڕۆژاوا: کانیه خوڵای

کانیاوه‌کانیش به کانی حرووسان، کانی سه‌ید ئه‌حمه‌دی، کانی هه‌مزه و خدران و کانی چاکه‌چکۆڵه ناسراون.

خانووبه‌ره‌کان له قوڕ و به‌ردن و تا ڕاده‌یه‌کیش بلووک ده‌کار کراوه، میچی گشت ماڵه‌کان له داره، ماڵه‌کان خاوه‌ن حه‌وشه‌ن و کۆڵانه‌کان ناڕێک و خواروخێچن.

به‌ساڵاچووان ده‌گێڕنه‌وه سه‌رده‌می حرووسان ئه‌م دێیه دوو جار سووتاوه، جارێکیان به‌ر له‌وه‌ی حرووسان بگه‌نه نێو ئاوایی ڕوون نییه بۆچی ئاوری تێبه‌ربووه، جاری دووه‌م خه‌ڵکه‌که له ترسی گیانان له ده‌ست حرووسان هه‌ڵاتوون و ماڵوحاڵیان به‌جێ هێشتووه و ئه‌وانیش ئاگریان له ئاوایی به‌رداوه.

سه‌باره‌ت به ناوی گلێنان، دانیشتووان ڕایان وایه که به هۆی که‌م بوونی شاخ‌وداخ و هه‌روه‌ها گلێکی زۆری ده‌وروبه‌ری ئه‌و هه‌رێمه، ئه‌و ناوه‌ی به سه‌ر دابڕاوه. یه‌کێک له به‌ته‌مه‌ن‌ترین ژنانی ئاوایی "زارا ئه‌خته‌رچی" ده‌ڵێ: ئه‌من منداڵی ئێره‌م، زوو لێره دیزه و گۆزه‌یان ساز ده‌کردن و پاش ساز کردنیان له کڵیان ده‌ناوه. (دیزه و گۆزه‌کانیان له دیوێکی بچووکدا به ته‌پاڵان داده‌پۆشی و ئاگریان ده‌دا تا سوور ببنه‌وه).

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکه‌وتی ١٣٧٢/١٢/٢ کاره‌باکه‌ی هه‌ڵکراوه، لووله‌کێشیی ئاوی خواردنه‌وه که عه‌نباراویان بۆ داناوه و ئاوه‌که‌ی له کانی ژنان دابین ده‌بێ، سیمکارتی مخابه‌راتی، مزگه‌وتێک به ناوی "حه‌زره‌تی ئه‌بووبه‌کری سه‌دیق" که ساڵی ١٣٣٢ ساز کراوه و ساڵی ١٣٨٠ی هه‌تاوی نۆژه‌ن کراوه‌ته‌وه، قوتابخانه‌ی سه‌ره‌تایی (کوڕانه ــ کچانه) به ناوی "ڕازی"، قوتابخانه‌ی ناوه‌ندی به ناوی "شادروان بێبی دلشاد" که ساڵی ١٣٨٥ی هه‌تاوی ساز کراوه، دێهیاری (ساڵی ١٣٨٨)، ئاکابیری، بنکه‌ی ته‌ندروستی. هه‌روه‌ها ئه‌م دێیه خاوه‌ن شووڕای ئیسلامییه. بۆ وه‌رگرتنی نه‌وت و که‌لوپه‌ل سه‌ر به شه‌ریکه‌ی هاوبه‌شیی "خه‌لیفان"ن. خوێندکاران بۆ درێژه‌دان به خوێندن ده‌چنه خه‌لیفان و مه‌هاباد.

کاروپیشه‌ی خه‌ڵکی گلێنان وه‌رزێری، ئاژه‌ڵداری و کرێکارییه. وه‌رزێران گه‌نم و جۆ ده‌چێنن و ئاژه‌ڵه‌کان له مه‌ڕ و مانگا پێکهاتوون.

گرفته‌کانی خه‌ڵکی ئاوایی: گرفتی ئاو، پیس بوونی کۆڵانه‌کان، نه‌بوونی هێڵی ڕاگواستن.

گۆڕستان له به‌ری ڕۆژهه‌ڵاته و به "حه‌وزی قه‌بران" یان گۆڕستانی "سه‌ید عه‌لی" ناسراوه.

"عه‌لی گلێنانی" گۆرانیبێژی ناسراو، خه‌ڵکی ئه‌م ئاوایی‌یه بووه.

## گۆکتەپە

گۆکتەپە لە ١٢ کیلۆمیتری باکووری ڕۆژهەڵاتی شاری مەهاباد، بەشی ناوەندی و دێهستانی موکریانی ڕۆژهەڵات و لە ناوچەی شارویران هەڵکەوتووە. لە ٨٧٧ ماڵ و ٤٣٧٧ کەس پێکهاتووە، لەمانە ٢٢٥١ کەس پیاون و ٢١٢٦ کەسیش ژنن، ژمارەی خوێندەوارانی ئەم ئاوایییە ٢٨٧٨ کەسە کە ١٦٤٧ کەس پیاون و ١٢٣١ کەسیش ژنن، هەروەها لە ١٠١١ کەسی نەخوێندەوار ٣٤١ کەس پیاون و ٦٧٠ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ٢٢٩٤ هێکتارە، لەمە ٨٥٦/٥ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و ١٤٣٧/٥ هێکتار پاوان و لەوەرگەی دێیە. گۆکتەپە خاوەن ٤٣٠ هێکتار زەوی دێم، ١٠٠٠ هێکتار زەوی بەراو، ٤١٠ هێکتار باخ، ٦٩ تراکتۆر و ٢٠ لاوێردەیە. ئەم ئاوایییە ناوەندی دێهستانی موکریانی ڕۆژهەڵاتە بە پانتایی ٣١٦،٢٧٦ کیلۆمیتری چوارگۆشە. بەرزایی ئاوایی ١٣٠٥ میتر لە ڕووکەشی زەریاکانە.

ئاوایییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی خانەگێ — باشووری ڕۆژهەڵات: ئاوایی دۆستاڵی

باکوور: ئاوایییەکانی حاجیخۆش، کێچاوا، گابازەڵە

ڕۆژهەڵات: ئاوایییەکانی حەوڵاباد، خاتوونباخ

ڕۆژئاوا: ئاوایییەکانی قوومقەڵا، قەرەخان و دریاز

شوێنی هەڵکەوتنی ئەم دێیە دەشتاییە، تەنیا لە بەری باکووری ڕۆژهەڵاتەوە کێوێکی لێیە بە ناوی "کێوەسپی".

کەرەسەکانی ساز کردنی خانووبەرەکانی ئەم ئاوایییە هەر وەکوو شار خشت، چیمەنتۆ و ئاسنە. ماڵەکان حەوشەیان هەیە و دەرگایان تێگیراوە، لەم دێیە گەڵاڵەی هادی تا ڕادەیەک بەڕێوە چووە، کۆڵانەکانی ئاوایی ڕێک و ڕاستن و قاناویان تێگیراوە، شەقامی سەرەکی ئاوایی قیلەتاو کراوە.

لە بەری ڕۆژئاوای ئەم ئاوایییە، شوێنێک هەیە بە ناوی "گۆکتەپە"، سەبارەت بەو شوێنە بەڵگەکانی میراتی فەرهەنگی کە بە ژمارەی ١٦٦٢٨ تۆماریان کردووە، نووسیویانە: گۆکتەپە لە بەرزایی ١٣٢٠ میتری ڕووکەشی زەریاکان هەڵکەوتووە و دەگەڕێتەوە قۆناغی ئیسلامی ـــ سەدەی ٤ تا ٦ی کۆچی مانگی ـــ ئاسن.

"گۆکتەپە" ناوێکی تورکییە و بە مانای تەپکی سەرسەوزە. لە باشووری دێ، ڕێگایەکی قیلەتاو هەیە کە ئاوایی خانەگێ و شاری مەهاباد دەگرێتەوە، لە باکوورەوە، ڕێگایەکی قیلەتاو بەرەو شاری میاندواو دەچێ، لە ڕۆژهەڵاتەوە، ڕێگایەکی قیلەتاو ئاوایی خاتوونباخ و ئاوایی حەوڵاباد دەگرێتەوە، لە ڕۆژئاواوە، ڕێگایەکی خاکی دەچێتەوە ئاوایییەکانی قەرەخان و قوومقەڵا.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی ١٣٥٤/١٢/٩ کارەباکەی هەڵکراوە، لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە کە عەنباراویان بۆ داناوە و ئاوەکەی لە چاڵاو دابین دەبێ، سیمکارتی مخابەراتی دێهات، تەلەیفوونی ماڵ بە ماڵ، لوولەکێشیی گاز، پۆستبانک، قوتابخانەی سەرەتایی و ناوەندی و دواناوەندیی کوڕانە بە ناوەکانی "پازدەی خورداد" و "مێهرئەنگیز جەعفەری"، قوتابخانەی سەرەتایی و ناوەندی و دواناوەندیی کچانە بە ناوەکانی "فاخێرد" و "سەباد"، قوتابخانەی "شەوانەڕۆژی"ی کوڕانە، ئاکابیری، سێ باخچەی ساوایان، ناوەندی خزمەتگوزارییەکانی وەرزێری، ناوەندی فێرگەی فەنی و حێرفەیی، شەریکەی هاوبەشیی نەوت و کەلوپەل، سێ مزگەوت کە یەکیان "جامیع"ە و ساڵی ١٣٧٨ی هەتاوی نۆژەن کراوەتەوە، ئەوی تر بە ناوی "حەزرەتی ئیبراهیم"ە کە ساڵی ١٣٧٦ی هەتاوی ساز کراوە، مزگەوتی سێهەم "مەسجدولنەبی"، حەوت نانەوەخانە، گاوداری، دوو جووجەخانە، ناوەندی کۆکردنەوەی شیر، کارگەی قیلەتاو، کارگەی کلید و پریز و هەروەها ئەم ئاوایییە خاوەن دێهیاری، شووڕای ئیسلامی، شووڕای چارەسەری کێشەکان، پادگانی سپای پاسداران و مەقەڕی بەسیجە. خوێندکاران بۆ درێژەپێدان بە خوێندن (بەر لە چوونە زانکۆ) دێنە شاری مەهاباد.

کاروپیشەی خەڵکی ئاوایی وەرزێری، ئاژەڵداری، باخداری، کرێکاری و دووکانداری و هێندێک پیشەی ئازادی دیکەیە.

وەرزێران گەنم، جۆ و نۆک دەچێنن، ئاژەڵەکان مەڕ، بزن، مانگا و گامێشن، بەرهەمی باخەکانیش سێوە.

گرفتەکانی خەڵکی ئاوایی: پێویستی بە ئیمکاناتێکی زۆرتر بۆ کۆکردنەوەی زبڵوزاڵ (بۆ کۆکردنەوەی زبڵوزاڵی ئاوایی تەنیا تراکتۆرێک تەرخان کراوە کە دەرەقەت نایە و بە هەموو گەڕەکەکان ڕاناگا)، کەمبوونی بەشەئارد، نەبوونی ئیمکاناتی وەرزیشی و حەساوەیی و فەزای سەوز.

گۆڕستانەکەی ئاوایی لە باشووری ڕۆژهەڵاتی دێ هەڵکەوتووە.

## گۆلێ

گۆلێ لە ٣٢ کیلۆمیتری باکووری ڕۆژاوای شاری مەهاباد، بەشی ناوەندی و دێهستانی موکریانی ڕۆژاوا و لە ناوچەی شاروێران هەڵکەوتووە. لە ٦ ماڵ و ٣٨ کەس پێکهاتووە، لەمانە ٢١ کەس پیاون و ١٧ کەسیش ژنن، لە ٢٣ کەسی خوێندەوار لەم ئاواییە ١٥ کەس پیاون و ٨ کەس ژنن، هەروەها لە ٨ کەسی نەخوێندەوار ١ کەس پیاوە و ٧ کەس ژنن.

پانتایی ئاوایی ٨٠٠ هێکتارە، لەمە ٢٠٣ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و ٥٩٧ هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.

گۆلێ خاوەن ٢٥٠ هێکتار زەوی دێم، ٢٠٩ هێکتار زەوی بەراو، ١٣٥هێکتار باخ، ٦ تراکتۆر، ٥ لاوێردە و ١ تووچێنەرە.

ئاواییەکانی دەورووبەر:

باشوور: ئاوایی چۆمەڵان

باکوور: ئاواییەکانی کۆزەکەرێز و شێخ مارف (ئاوایی نەغەدە)

ڕۆژهەڵات: ئاوایی ئاڵبلاغ و بەشێک لە ئاوایی کۆزەکەرێز

ڕۆژاوا: ئاواییەکانی بەیرەمووغە و مەحمەشەی سەرێ و خوارێ (سێ ئاوایی شاری نەغەدە)

چیاکانی دەورووبەری ئاوایی:

باشوور: کێوکانی بەڵمەن و مام قووجاغ

باکوور: چاکی حەیزی و یەدیللەر

ڕۆژهەڵات: بەردەزەرد و کانی شیلان

ڕۆژاوا: شاخی فەرەنگی

دوو کانیاوی گۆلێ بە کانی "گۆلێ" و کانی "درۆزنە" ناسراون.

بە گشتی خانووبەرەکانی ئاوایی لە قوڕ، بەرد و خشتن، میچەکانیش هەر لە دارن، ماڵەکان حەوشەیان نییە و بە هۆی کەم بوونی خانووبەرەکان کۆڵانی لێ هەڵنەکەوتووە.

خەڵک دەڵێن: ناوی ئاوایی هەر بە پێی ئەو گۆلە ناودێر کراوە کە لە ناوەندی دێ هەڵکەوتووە، ئەم گوندە چەند جار چۆڵ کراوە و دیسان ئاوەدان کراوەتەوە، هۆیەکەشی نەبوونی ئەمنییەت و شەڕ بووە بەتایبەت لە کاتی هەبوونی هێزەکانی رووس لە مەهاباد.

ڕێگای هاتووچۆی ئاوایی بە کۆزەکەرێز دایە کە لە باکووری ئاوایی هەڵکەوتووە و خاکییە، لە باشووری ڕۆژاوا، ڕێگایەکی خاکی ئاوایی چۆمەڵان دەگرێتەوە، لە باشووری ڕۆژهەڵاتەوە، ڕێگایەکی خاکی دەڕواتەوە ئاوایی ئاڵبلاغ، لە ڕۆژاواشەوە، ڕێگایەکی خاکی دەچێتەوە ئاواییەکانی مەحمەشەی سەرێ و خوارێ.

ئیمکاناتی ئاوایی: کارەبا، تەلەیفوونی ماڵ بە ماڵ. جووجەخانە (کەرتی تایبەتی). خەڵکی ئەم ئاواییە بۆ وەرگرتنی نەوت و کەلوپەل سەر بە شەریکەی هاوبەشیی ئاوایی کۆزەکەرێزن.

ئاوی خواردنەوەی گۆلێ لوولەکێشیی بۆ نەکراوە و لە کانی ماڵان کەلک وەردەگرن، قوتابخانەی نییە و خوێندکاران لە سەرەتاوە دەنێردرێنە شوێنەکانی دیکە وەک کۆزەکەرێز، چۆمەڵان و مەهاباد، هیچ جیاوازییەک بۆ کوڕان و کچان لەم ئاستەدا نییە.

مزگەوتی دێ هەر چەند زۆر کۆنە و خەریکە دەڕووخێ، بەڵام هیچ حەولێک بۆ ساز کردنەوەی نادرێ.

وەرزێری، ئاژەڵداری و باخداری کاروپیشەی خەڵکی ئەم گوندەن، وەرزێران گەنم، جۆ و نۆک و نیسک دەچێنن و ئاژەڵەکانیان مانگایە. بەرهەمی باخەکانیش پێکهاتەیەکە لە سێو، قەیسی و بادام.

گرفتەکانی خەڵکی ئاوایی: نەبوونی ڕێگای قیلەتاو، نیازیان بە لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوەیە، نەبوونی تەنانەت قوتابخانەی سەرەتایی.

گۆڕستانی گۆلێ لە بەری باشوور هەڵکەوتووە.

# گوڵیار

گوڵبار لە ٢٢ کیلۆمیتری باشووری شاری مەهاباد، بەشی خەلیفان و دێهستانی مەنگوڕی ڕۆژهەڵات و لە ناوچەی مەنگوڕایەتی هەڵکەوتووە. لە 19 ماڵ و 108 کەس پێکهاتووە، لەمانە ٥٣ کەس پیاون و ٥٥ کەسیش ژنن، لە ٦٢ کەسی خوێندەوار ٣٥ کەس پیاون و ٢٧ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٣٧ کەسی نەخوێندەوار ١٣ کەس پیاون و ٢٤ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی 6111 هێکتارە کە 111 هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و 6000 هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.

گوڵیار خاوەن ١٧٥/٥ هێکتار زەوی دێم، ٣٣/٣ هێکتار زەوی بەراو، ١٧/٤٣ هێکتار باخ، ٨ تراکتۆر و ٢ لاوێردەیە.

ئاوایییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی مازەڵێ

باکوور: ئاوایی گیادروان

ڕۆژهەڵات: ئاوایییەکانی قۆزلووجە و خرەجۆ

ڕۆژاوا: ئاوایییەکانی خاتوونئەستی و دووسەید

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باکوور: خرێ بەرانان

ڕۆژهەڵات: پەڕەی گوڵان

ڕۆژاوا: قوڵکە و بۆگەنیوە

چۆڕ چۆڕە، کانی مێشان، چەقالان چکۆڵە و کانی سارد، کانیاوە ناودارەکانی ئەم گوندەن.

زۆرتری خانووبەرەکانی ئەم ئاوایییە هەر لە قوڕ و بەرد ساز کراون و میچەکانیان لە دارن، تا ڕادەیەکی نە زۆر بەرچاویش بلووک دەکار کراوە. ماڵەکان ڕوو لە باشوورن و زۆربەیان خاوەن حەوشەن و هێندێکیان هەوراز هەڵکەوتوون.

لە باشووری دێ، ڕێگایەکی خاکی هەیە کە دەڕواتەوە بۆ ئاوایی مازەڵێ، لە باکوورەوە، ڕێگایەکی خاکی دەچێتەوە ئاوایییەکانی قۆزلووجە و خرەجۆ، لە ڕۆژاواشەوە، ڕێگایەکی نزیک بە کیلۆمیترێک خاکی، جادەی مەهاباد ـ سەردەشت دەگرێتەوە.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی 1375/10/02 کارەباکەی هەڵکراوە، سیمکارتی مخابەراتی دێهات، قوتابخانەی سەرەتایی(کوڕانە ـ کچانە) بە ناوی "بەدر"، مزگەوت ساڵی 1387ی هەتاوی نۆژەن کراوەتەوە. بۆ بنکەی تەندروستی، وەرگرتنی نەوت و کەلوپەل سەر بە ئاوایی "حەوڵاکوردە"ن.

جێگایی ئاماژەیە خەڵکی ئەم ئاوایییە لە ئاوی خاوێن بێ بەشن و هەر کەس ئاوی لە کانیاو یا لە چاڵاوڕا هێناوە. زۆربەی خەڵک لە کانی "چۆڕچۆڕە" کەلک وەردەگرن.

قوتابخانەی ئاوایی خەریکە دەڕووخێ و بۆ درێژەدان بە خوێندن قوتابییەکان دەچنە خەلیفان و شاری مەهاباد و ئەو مافە بۆ کچان و کوڕانی ئاوایی پارێزراوە.

وەرزێری، ئاژەڵداری، باخداری و کرێکاری کاروپیشەی خەڵکەکەیە. وەرزێران گەنم، نۆک، جۆ و نیسک دەچێنن، ئاژەڵەکانشیان مەڕ، مانگا و بزنە. بەرهەمی باخەکانیان سێو، قەیسی و گوێزە.

قیلەتاو نەکردنی ڕێگای کەمتر لە یەک کیلۆمیتری بۆ ئاوایی، نەبوونی لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە، نیاز بە نۆژەن کردنەوەی بینای قوتابخانە و نەبوونی شووڕا لە گرفتە سەرەکییەکانی خەڵکی ئەم گوندەن.

لە باشووری ئاوایی گۆڕستانی مێژوویی "حەسەن ئەسڵان" لە خرێچەقالان هەڵکەوتووە و دوو گۆڕستانی دیکەش لە بەری باشوورن و یەکیان بە "چاکی شەهیدان" ناسراوە و ئێستا کەلکی لێ وەردەگیرێ، ئەوی دیکەشیان ناوی "چاکەچکۆڵە"یە کە منداڵی لێ دەنێژن.

## گۆمڵیان

گۆملیان لە ٤٠ کیلۆمیتری باشووری ڕۆژاوای شاری مەهاباد، بەشی خەلیفان و دێهستانی مەنگوڕی ڕۆژهەڵات و لە ناوچەی مەنگوڕایەتی هەڵکەوتووە. لە ٢٥ ماڵ و ١٤١ کەس پێکهاتووە، لەمانە ٧٥ کەس پیاون و ٦٦ کەسیش ژنن، لە ٦١ کەسی خوێندەوار ٤٦ کەس پیاون و ١٥ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٦٨ کەسی نەخوێندەوار ٢٤ کەس پیاون و ٤٤ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ١٥٠٠ هێکتارە، لەمە ٢١٤/٥ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و ١٢٨٥/٥ هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.

گۆمڵیان خاوەن ١٤٨ هێکتار زەوی دێم، ٧٨/٥ هێکتار زەوی بەراو، ٩/١٠ هێکتار باخ، ٥ تراکتۆر و ٢ لاوێردەیە.

ئاواییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی ئەسحاب

باکوور: ئاوایی خانەگێ مەنگوڕان

ڕۆژهەڵات: ئاوایی سەرتان

ڕۆژاوا: ئاوایی بێهەنگوین

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باشوور: بازرگە

باکوور: کەلیکە

ڕۆژاوا: کێوی کانی کێچان

دوو ئەشکەوت کە هەر دوو لە ڕۆژاوان بە ناوەکانی "کانی کێچان" و "ئەشکەوتی مەرەخیان" ناسراون.

کانیاوەکانیش بە کانی پیاوان، کانی ژنان، کانی فەقێیان و کانی مام قادر، ناویان دەرکردووە.

لە گۆمڵیان خانووبەرەکان بە گشتی لە قوڕ و بەردن و میچەکانیان داەڕایە، ماڵەکان ڕوویان لە باشوورە و هیچ کام حەوشەیان نییە.

خەڵکی ئاوایی ڕایان وایە لە دەراوەکانی ئەم گوندەدا گۆمی زۆر لێ بووە بۆیە ئەم ناوەیان لێناوە.

لە ڕۆژهەڵاتی ئاوایی، ڕێگایەکی سەخڵەت و ناخۆش دێتەوە سەر جادەی دۆڵی زێوە کە ئەمە تەنیا ڕێگای هامووشۆی ئاواییە.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی ١٣٧٦/٩/١٠ کارەباکەی هەڵکراوە، بنکەی مخابەرات، قوتابخانەی سەرەتایی (کوڕانە ــ کچانە) بە ناوی "سادق"، مزگەوت.

بۆ بنکەی تەندروستی سەر بە ئاوایی "سەرتان"ن و نەوت و کەلوپەل لە شەریکەی هاوبەشیی ئاوایی "میرەسێ" وەردەگرن. ئاوی ئەم گوندە لوولەکێشی نییە و لە دوو کانیاوی ژنان و پیاوان کەلک وەردەگرن.

تەنیا هێندێک لە کوڕەکان بە مەبەستی درێژەدان بە خوێندن دەچنە خەلیفان و مەهاباد.

کاروپیشەی خەڵکی ئەم ئاواییە، وەرزێری و ئاژەڵدارییە، وەرزێران گەنم، جۆ، نۆک، نیسک، پەڕش و بەهاروو دەچێنن، زۆرتری ئاژەڵەکانیان مانگا و مەڕن و تا ڕادەیەک بزن. لە گۆمڵیان تازە هێندێک دارسێو و قەیسی لێدراون.

گرفتەکانی خەڵکی ئاوایی: نەبوونی بنکەی تەندروستیی سەربەخۆ، ڕێگای سەخڵەت و یەکجار ناخۆش کە پێویستی بە چارەسەری هەیە، کەم ئاوی، نۆژەن نەکردنەوەی بینای قوتابخانە.

گۆڕستانەکەی ئاوایی لە بەری باشوورە.

## گوێچکەدەرێ

ئەم ئاوایییە لە ٤١ کیلۆمیتری باشووری شاری مەهاباد، بەشی خەلیفان و دێهستانی کانی بازاڕ و لە ناوچەی مەنگوڕایەتی هەڵکەوتووە. لە ٤١ ماڵ و ٢٣٣ کەس پێکهاتووە، لەمانە ١١٥ کەس پیاون و ١١٨ کەسیش ژنن، لە ١٤٥ کەسی خوێندەوار ٧٩ کەس پیاون و ٦٦ کەسیش ژنن، لە ٥٩ کەسی نەخوێندەوار ١٩ کەس پیاون و ٤٠ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ٢٥٠٠ هێکتارە، لەمە ٢١٠ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە، ٢٢٩٠ هێکتار پاوان و لەوەرگەی دێیە.

گوێچکەدەرێ خاوەن ٢٢٠ هێکتار زەوی دێم، ١٥ هێکتار زەوی بەراو، ٦ هێکتار باخ، ١٨ تراکتۆر و ٢ لاوێردەیە.

مەودای ئاوایی تا ناوەندی خزمەتگوزاریی وەرزێری ٩ کیلۆمیترە.

ئاوایییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی چوارگا

باکوور: ئاوایییەکانی کیتکە و گەنەدار

ڕۆژهەڵات: ئاوایییەکانی کۆرەگێ و یەڵتەمر

ڕۆژاوا: ئاوایی کۆنەدێی شۆگای

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باشوور: مام خاڵ، کەرخوراو

باکوور: قەڵاشەکر

ڕۆژهەڵات: تەپکی پشت ماڵان

ڕۆژاوا: کێلەسپی

کانیاوەکان بە خرێ کوێلکان، دۆڵە ساز، کانی سارد و کانی کێلە سپی ناسراون. خانووبەرەکانی ئەم دێیە زۆرتریان لە قوڕ و بەردن و کەرەسە نوێیەکانیش وردەوردە دەکار دەکرێن، میچی گشت ماڵەکان هەر لە دارە، کۆڵانەکان باریکەڵانە و بەرتەسک و ناڕێکن.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی ١٣٦٢/١١/٢٩ کارەباکەی هەڵکراوە، لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوەی هەیە، سیمکارتی مخابەراتی، قوتابخانەی سەرەتایی (کوڕانە ـ کچانە) بە ناوی "شەهادەت"، مزگەوت بە ناوی "حەزرەتی عایشە"، بنکەی تەندروستی، دەرمانگا، پۆمپی بەنزین و هەروەها ئەم دێیە خاوەن شووڕای ئیسلامی و پاسگای هێزی ئینتزامییە. ئەم ئاوایییە بۆ وەرگرتنی نەوت و کەلوپەل سەر بە شەریکەی هاوبەشیی ئاوایی کیتکەیە. خوێندکاران لە دوای پۆلی سەرەتایی لە قوتابخانەکانی خەلیفان و مەهاباد درێژە بە خوێندن دەدەن و لەم ئاستەدا جیاوازی نێوان کوڕان و کچان کەم بۆتەوە.

کاروپیشەی خەڵکی ئاوایی وەرزێری، ئاژەڵداری و باخدارییە، وەرزێران گەنم، جۆ و نۆک دەچێنن و ئاژەڵەکانیان زیاتر مانگان و کەمتر مەڕ ڕادەگرن. هەروەها ترێ، گوێز و ترش بەرهەمی چەند باخی ئەو دێیەن.

گرفتەکانی خەڵکی گوێچکەدەرێ: پێویستی بە ساز کردنی بینایەکە بۆ قوتابخانە، کەمڕەنگ بوونی چالاکی بنکەی تەندروستی و پێویستی بە بەرگرییە بەرامبەر ئەو لافاوانەی هەموو ساڵێ زیان و زەرەد دەگەێننە ئاوایی.

ئەم دێیە خاوەن گۆڕستانێکی تایبەتییە.

وەکوو ناسراوترین کەسایەتیی ئاوایی دەتوانین ئاماژە بە خوداڵێخۆشبوو مامۆستا مەلا "محەممەد مودەڕیسی" بکەین.

## گەنەدار

گەنەدار لە ٣٦ کیلۆمێتری باشووری شاری مەهاباد، بەشی خەلیفان و دێهستانی کانی بازاڕ و لە ناوچەی مەنگوڕایەتی هەڵکەوتووە. لە ١٣ماڵ و ١٠٤ کەس پێکهاتووە، لەمانە ٥٣ کەس پیاون و ٥١ کەسیش ژنن، لە ٦٠ کەسی خوێندەوار لەم ئاواییە ٤١ کەس پیاون و ١٩ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٣٦ کەسی نەخوێندەوار ٩ کەس پیاون و ٢٧ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ٣٥٩٩/٥ هێکتارە، لەمە ٢٨٢/٥ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و ٣٣١٧ هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.

گەنەدار خاوەن ٧٦ هێکتار زەوی دێم، ٧ هێکتار زەوی بەراو، ٢/٥ هێکتار باخ و ٤ تراکتۆرە. مەودای ئاوایی تا ناوەندی خەدەماتی وەرزێری "کانی بازاڕ" ١٠ کیلۆمیترە.

بەرزایی ئاوایی ١٦٠٠ میتر لە ڕووکەشی زەریاکانە.

| ئاواییەکانی دەوروبەر: | چیاکانی دەوروبەری ئاوایی: |
|---|---|
| باشوور: ئاواییەکانی کۆنەدێی شۆگای و گوێچکەدەرێ | باشوور: مەشکهەڵدێر |
| باکوور: ئاوایی قەڵاجۆغە | باکوور: ئیشکەشیو |
| ڕۆژهەڵات: ئاوایی کیتکە | ڕۆژهەڵات: خرێ گورگان |
| ڕۆژاوا: ئاواییەکانی کامەم و ئافان | ڕۆژاوا: جەواڵەڕەشان |

کانیاوەکان: کانی مەشک هەڵدێر، کانی سارد، کانی گۆڕەپان، کانی ئاسمان.

ماڵەکانی گەنەدار لە قوڕ و بەردن و میچەکانیان لە دارە، کۆڵانەکان ناڕێکن و هێندێکیان بەرتەسک و باریکەڵانەن، ماڵەکان ڕوو بە هەموو لایەک هەڵکەوتوون.

هۆی ناودێرکردنی: "حاجی ژن"، کە نەوەد ساڵی تەمەنە، دەڵێ: ئەم شوێنە گەنەیەکی زۆری لێ بووە و ئەگەر ئێمەش ماڵمان هاتە ئەم گوندە هەر وا بوو، جا گۆیا هەر لە بەر ئەوەیە ئەم ناوەی(گەنەدار)ی بە سەردا براوە.

لە باکووری ڕۆژاوای گەنەدار شوێنێک هەیە بە ناوی "کەڵەکاوێ" کە خەڵکەکەی دەڵێن شوێنێکی مێژووییە. قەڵاشەکر لە نێوان سێ‌ئاوایی کیتکە، گەنەدار و کۆنەدێیە.

گەنەدار لە سەر جادەی قیلەتاوی مەهاباد ــ سەردەشت هەڵکەوتووە، لە باشووری ڕۆژهەڵاتی جادەی مەهاباد ــ سەردەشتەوە ئاوایی کیتکە دەگرێتەوە، لە باکوورەوەهەش هەر ئەم جادەیە ڕێگای خاکی ئاواییەکان ئەو بەر و ئەم بەری جادە دەگرێتەوە.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی ١٢/٢١ ١٣٥٨ کارەباکەی هەڵکراوە، لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە کە عەنباراوەکەی ساڵی ١٣٦٣ دانراوە، سیمکارتی مخابەراتی دێهات، قوتابخانەی سەرەتایی(کوڕانە ـ کچانە) بە ناوی "زەکەریا" کە ساڵی ١٣٥٢ی هەتاوی دامەزراوە، مزگەوت بە ناوی "ئیمامی شافعی"، ساڵی ١٣٢٠ی هەتاوی بەردی بناغەی دانراوە و لە ساڵی ١٣٨٠ی هەتاوی نۆژەن کراوەتەوە و هەروەها ئەم دێیە خاوەن شووڕای ئیسلامییە.

بۆ بنکەی تەندروستی و وەرگرتنی نەوت و کەلوپەل سەر بە ئاوایی "کیتکە"ن.

خوێندکاران ناچارن بۆ درێژەدان بە خوێندن بچنە مەهاباد و خەلیفان و لەو بارەوە جیاوازییەک لە نێوان کچان و کوڕانی قوتابی بەرچاو نییە.

وەرزێری، ئاژەڵداری و باخداری کاروپیشەی خەڵی ئەم گوندەیە، وەرزێران گەنم و جۆ دەچێنن، ئاژەڵەکانیش بریتین لە: مەڕ، بزن و مانگا، بەرهەمی باخەکانیشیان سێو، قەیسی، بادام و گوێزە.

گرفتەکانی خەڵکی ئاوایی: لاوەکانی ئاوایی گەنەدار نەبوونی گۆڕەپانێکی وەرزشی بە گرفتێک بۆ خۆیان دەزانن و لەگەڵ ئەوەشدا نەبوونی کۆڵانێکی ڕێکوپێک لە نێو ئەم ئاوایییەدا گرفتێکی سەرەکی بۆ خەڵکی ئەم دێیە پێکهێناوە.

گەنەدار دوو گۆڕستانی هەیە، یەکیان بە ناوی "چاکەچکۆڵە" کە کۆنە و ئەوی دیکەیان بە "گۆڕستانی گەنەدار" ناسراوە و ئێستا کەلکی لێ وەردەگیرێ، ئەم گۆڕستانە لە باشووری ئاوایی هەڵکەوتووە.

## گیادروان

گیادروان لە ١٨ کیلۆمیتری باشووری شاری مەهاباد، بەشی خەلیفان و دێهستانی مەنگوڕی ڕۆژهەڵات و لە ناوچەی مەنگوڕایەتی هەڵکەوتووە. لە ٢٦ ماڵ و ٢٢٥ کەس پێکهاتووە، لەمانە ١٢٨ کەس پیاون و ٩٧ کەسیش ژنن، لە ١٢٤ کەسی خوێندەوار ٨٨ کەس پیاون و ٣٦ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٧١ کەسی نەخوێندەوار ٢٣ کەس پیاون و ٤٨ کەسیش ژنن.
پانتای ئاوایی ٤٥٠٠ هێکتارە، لەمە ١٥٠ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و ٤٣٥٠ هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.
گیادروان خاوەن ٢٣٩ هێکتار زەوی دێم، ٩٠ هێکتار زەوی بەراو، ٨/٣٥ هێکتار باخ، ١٣ تراکتۆر و ١ لاوێردەیە.

ئاوایی‌یەکانی دەوروبەر:
باشوور: ئاوایی قۆزلووجە
باکوور: ئاوایی‌یەکانی قەرەچەلان و کەوڵەی سەرمێرگان
ڕۆژهەڵات: ئاوایی گردەبەردان
ڕۆژاوا: ئاوایی حەولاکوردە

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:
باشوور: خرێ بەرانان
باکوور: کەونەکۆتان
ڕۆژهەڵات: کانی شیلان، تەقەگوێز
ڕۆژاوا: بەری گلێدان

کانیاوەکان: کانی گەوەی، کانی پیاوان، کانی ژنان.
بێجگە لە چەند ماڵێکی گیادروان کە کەرەسەکەیان خشت، چیمەنتۆ و بلووکە، زۆربەی خانووبەرەکانی بە بەرد و قوڕ سازکراون و گشتیان بە دار داپۆشراون. زۆربەی ماڵەکان حەوشەیان نییە، کۆڵانەکان ئاڵۆز و هەورازن، چۆمێک بە نێوەڕاستی ئاواییدا تێپەڕ دەبێ کە "تیتیلوێ"ی پێدەڵێن و ماڵەکان دەکاتە دوو بەش. ئەم چۆمە دەچێتەوە حەولاکوردە و لە وێشەوە دەڕژێتە نێو ئەو چۆمەی کە لە ئاغاسوورەوە دێ و تێکەڵ بە یەک دەبنەوە و دەڕژێنە ئاوبەندی مەهاباد. سەبارەت بە ناوی ئەم دێیە، دانیشتووانی ناوچەکە دەڵێن: سەرەتا ئەم ئاوایی‌یە مەزرا بووە و گیایان لێ دەرووە، بەڵام شوێنێکی تایبەتی و فێنک و خۆشی لێ بووە کە کرێکارەکان لێی دەحەسانەوە و ببوو بنکەیان، هەر لەو زەمانەوە ئەم شوێنە بە ناوی ئەوان کرا و ئەو گوندە هەر بەو ناوە "گیادروان" ناودێر کرا.
گیادروان تەنیا ڕێگایەکی هامۆشۆی لە بەری ڕۆژاوایە هەیە کە دەچێتەوە ئاوایی حەولاکوردە و ئامادەیە بۆ قیلەتاوکردن.
ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی ١٣٧٦/١٠/٢٠ کارەباکەی هەڵکراوە، سیمکارتی مخابەراتی دێهات، قوتابخانەی سەرەتایی (کوڕانە - کچانە) بە ناوی "محەممەدحوسێن بورهانی" کە ساڵی ١٣٨٤ی هەتاوی لەلایەن خێرخوازێکی ئیسفەهانی و هاوسەرەکەی خاتوو "عیسمەت بورهانی (دلخواە)" ساز کراوە، کۆنەمزگەوتی گیادروان کە "بایزئاغای بەیتاس" سازی کردبوو، ساڵی ١٣٨٠ی هەتاوی نۆژەن کراوەتەوە. بۆ بنکەی تەندروستی سەر بە ئاوایی "قۆزلووجە"ن، نەوت و کەلوپەلیش لە شەریکەی هاوبەشیی ئاوایی "حەولاکوردە" وەردەگرن.
ئاوی خواردنەوەی لوولەکێشیی نییە و خەڵکەکەی ئاوایی لە چاڵاو کەلک وەردەگرن و لە کانی گەورەش ئاو دێنن. خوێندکاران ناچارن بۆ درێژەدان بە خوێندن ڕوو بکەنە خەلیفان و مەهاباد، کچەکان لە دوای پۆلی پێنجەم لە خوێندن بێ بەش دەکرێن یان تاقمێکی کەمیان ڕێگای خوێندنیان پێدەدرێ.
کاروپیشەی خەڵکی ئاوایی وەرزێری، ئاژەڵداری، باخداری و کرێکارییە. وەرزێران گەنم، جۆ، نۆک و نیسک دەچێنن و ئاژەڵەکانیان مەڕ، بزن و مانگان، بەرهەمی باخەکانیشیان سێوە.
گرفتە سەرەکییەکانی خەڵک: چۆمی نێو دێ کە نە کاناڵی بۆ کێشراوە و نە پردێکی لە سەرە، هەموو ساڵێ لە چۆمی "بووزان"وە، هەر چەند لە دەوروبەرەکەی ئاوبەندیان بۆ لێداوە، بەڵام هەموو جارێ سێڵاو هەڵدەستێ و گرفتی بۆ خەڵک ساز کردووە و تاکوو ئێستا چارەسەرییەکی بنەڕەتی بۆ نەکراوە. گۆڕستانی ئاوایی ناوی "تیتیلوێ"یە و خەڵکی ئاوایی‌یەکانی قەرەچەلان و قۆزلووجەش مردووکانیان هەر لەم گۆڕستانە دەنێژن.

## لاچین

لاچین له ٥ کیلۆمیتری ڕۆژهەڵاتی شاری مەهاباد، بەشی ناوەندی و دێهستانی ئاختاچی ڕۆژاوا و لە ناوچەی محاڵ هەڵکەوتووە. لە ١٢ ماڵ و ٨٣ کەس پێکهاتووە، لەمانە ٤٤ کەس پیاون و ٣٩ کەسیش ژنن، ڕادەی خوێندەواران ٤٥ کەسە کە ٢٦ کەس پیاون و ١٩ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٣٠ کەسی نەخوێندەوار ١١ کەس پیاون ١٩ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ٣١٩٢ هێکتارە، لەمە ١٩٢ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە، ٣٠٠٠ هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.

لاچین خاوەن ١٨١/٥ هێکتار زەوی دێم، ١٧٣ هێکتار زەوی بەراو، ٥٦ هێکتار باخ، ٧ تراکتۆر و ٢ لاوێردەیە. بەرزایی ئاوایی ١٤٥٠ میتر لە ڕووکەشی زەریاکانە.

ئاوایییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایییەکانی کۆنەدێی قازی و ئۆزندەرێ

باکوور: ئاوایییەکانی پیربەلە و حەوتەوانان

ڕۆژهەڵات: ئاوایییەکانی شیلاناوێ و سارەوانان

ڕۆژاوا: شاری مەهاباد

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باکوور: قەڵای سارمێ

ڕۆژهەڵات: بۆزداغ

ڕۆژاوا: شاخەڕووخاو

دوو ئەشکەوتی ئاوایی یەکیان لە بەری باکوورە و "دووجارک"ی پێدەڵێن و ئەوی تریان لە بەری ڕۆژهەڵاتە و "قسل"ی ناوە. ناوی کانیاوەکانی ئاوایی: قەڵغانان، جووجە، پلوسکێ، گۆلی سیمۆنی. زۆربەی خانووبەرەکان لە قوڕ و بەردن و میچەکانیان لە دارە و خشت زۆر کەم دەکار کراوە. ماڵەکان حەوشەی بچووکیان هەیە و بەرەو باشوور سازکراون، کۆڵانەکان لێژ و بەرتەسکن و ناوەندی دێ بینایەکی زۆری لێیە کە ڕووخاون و کاول بوون.

"تەپکی کۆنەقەڵا"بە بەرزایی ١٧٣٠ میتر لە ڕووکەشی زەریاکان و ژمارەی تۆمارکراوی ١٥٩٩١ لە میراتی فەرهەنگی دەگەڕیتەوە سەدەی ٤ تا ٦ی کۆچی مانگی، "قەڵای سارمێ" لە باکوور و گۆڕستانی مێژوویی لە ڕۆژهەڵات، شوێنە مێژووییەکانی دیکەی ئەم گوندەن. لاچین* چەند مانای هەیە، بە باڵندەی سەقر دەڵێن، یان کاڵەی چەرمین.

لە بەری باشووری ئاوایییەوە، ڕێگایەکی خاکی دەچێتەوە ئاوایییەکانی کۆنەدێ و ئۆزندەرێ، لە ڕۆژهەڵاتەوە، ڕێگایەکی خاکی دوو ئاوایی شیلاناوێ و سارەوانان دەگرێتەوە، لە ڕۆژاواشەوە، ڕێگایەکی خاکی دەڕواتەوە شاری مەهاباد.

ئیمکاناتی ئاوایی: ١٣٧٧/٧/١٤ کارەباکەی هەڵکراوە، بنکەی مخابەرات، بنکەی تەندروستی، قوتابخانەی سەرەتایی (کوڕانە ــ کچانە) بە ناوی "پەیمان". ئاوی خواردنەوەی لوولەکێشیی نییە و ماڵەکان لە چاڵاو کەلک وەردەگرن. مزگەوتی ئاوایی ئەوە دەڕووخێ و دەرگای گاڵە دراوە و هیچ حەولێک بۆ ساز کرنەوەی نەدراوە. بۆ وەرگرتنی کەلوپەل و نەوت سەر بە شەریکەی هاوبەشیی "پشتتەپ" لە شاری مەهابادن. خوێندکارانی لاچین بۆ درێژەدان بە خوێندن دەنێردرێنە شاری مەهاباد و مافی خوێندن بۆ کوڕان و کچان پارێزراوە. پێشتر لاچین ئاوایییەکی قەرەباڵغ و ئاوەدان بووە، بەڵام بە هۆی نەبوونی ئەمنییەت و هێندێک گرفتی سروشتی وەکوو ئیشکەساڵی، ژمارەی دانیشتووانی کەم بۆتەوە.

ئاژەڵداری، وەرزێری، کرێکاری و باخداری کاروپیشەی خەڵکی ئەم گوندەیە. زۆربەی ماڵەکان مەڕدارن و کەمتر مانگا ڕادەگرن، وەرزێران گەنم، جۆ، نۆک و نیسک دەچێنن و بەرهەمی باخەکانیشیان سێو، قەیسی و هڵوویە.

گرفتەکانی خەڵکی لاچین: ڕێگای خاکی کە پێویستی بە قیلەتاوە، نەبوونی بینا بۆ مزگەوت و قوتابخانە، نەبوونی لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە.

لە باشووری دێ، گۆڕستانێکی لێیە و ئێستا کەمتر کەلکی لێ وەردەگیرێ و خەڵکەکە مردووەکانیان لە گۆڕستانی شاری مەهاباد دەنێژن.

"هێمن موکریانی" شاعیری نەتەوەیی گەلی کورد، لەم ئاوایییە لە دایک بووە و دوای ماوەیەک ماڵیان دەچێتەوە ئاوایی "شیلاناوێ".

---

* هەروەها ناوی یەکێکە لە گەورەپیاوانی گەلی "گورجی". ئەم گەلە لە سەردەمی دەسەڵاتداریتی شاە عەبباس سەفەوی لە شاری "کاخت" سەر بە گورجستان هاتنە ناوچەکانی ئێران و لە سەرکەوتنی مەشرووتە و وەدەرنانی پرتەغالییەکان لە باشووری ئێراندا ڕۆڵێکی بەرچاویان هەبووە.

## لەج

لەج لە ٢٢ کیلۆمیتری باکووری شاری مەهاباد، بەشی ناوەندی و دێهستانی موکریانی ڕۆژهەڵات و لە ناوچەی شارویران هەڵکەتووە. لە ٢٣٧ ماڵ و ١٢٩٧ کەس پێکهاتووە، لەمانە ٦٥٦ کەس پیاون و ٦٤١ کەسیش ژنن، لە ٨٤٢ کەسی خوێندەوار ٤٧٢ کەس پیاون و ٣٧٠ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٣١٧ کەسی نەخوێندەوار ١٠٩ کەس پیاون و ٢٠٨ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ١٠٤٦ هێکتارە، لەمە ١٠٢٨ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و ١٨ هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.

لەج خاوەن ٨٢٨ هێکتار زەوی بەراو، ٢٢٠ هێکتار باخ، ٢٧ تراکتۆر و ١٠ لاوێردەیە. بەرزایی ئاوایی ١٢٨٥ میتر لە ڕووکەشی زەریاکانە.

ئاوایی‌یەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی‌یەکانی حاجی‌ئاوا و قەرەخان

باکوور: ئاوایی‌یەکانی کێچاوا و قەرەداغ

ڕۆژهەڵات: ئاوایی‌یەکانی گۆکتەپە و ترشەکان و حاجی‌خۆش

ڕۆژاوا: ئاوایی‌یەکانی دارەلەک و قجی‌ئاوا

لەج دەشتاییە و هیچ کێوێکی لێ نییە، خانووبەرەکان چەشنی شار کەرەسەکەیان خشت، چیمەنتۆ و ئاسنە و خانووی بە قوڕ و بەرد و میچی دار کەمتر ماون، ماڵەکان حەوشەیان هەیە و کۆڵانەکان ڕێک و ڕاست و قاناون هەیە.

گەلاڵەی هادی لەم گوندە ساڵی ١٣٨٤ی هەتاوی دەستی پێکردووە.

سەبارەت بە ناوی ئاوایی زانیارییەکی ئەوتۆ لە ئارادا نییە، لە فەرهەنگی "هەنبانەبۆرینە"دا* "لەج" بە مانای لاسار و گێرە و کێشە هاتووە. ئەگەر ئەو مانایە مەبەست بێ ڕوون نییە بۆچ دەبێ ناوێکی ئاوا بە سەر ئاوایی‌یەکدا برابێ.

"تەپک (گرد)ی قالەڕەش" بە مەودای ٢/٥ کیلۆمیتر لە باشووری ڕۆژهەڵاتی دێ بە ژمارەی تۆمارکراوی ١٥٩٨٠ لە میراتی فەرهەنگی و بەرزایی ١٣٢٥ میتر لە ڕووکەشی زەریاکان دەگەڕێتەوە سەردەمی "کالکۆلیتیک".

"حەمامی لەج"ێ کە هی سەردەمی سەفەوییەکانە و شوێنەوارناسان دەڵێن دەگەڕێتەوە بۆ ساڵەکانی ١٠٥٠ تا ١١٠٠ی کۆچی مانگی، بە بەرزایی ١٤١١ میتر لە ڕووکەشی زەریاکان و ژمارەی تۆمارکراوی ٦١٨٨، ئێستا وەکوو ئەنبارێک کەلکی لێ وەردەگرن. هەروەها "گردی بەردین" لە باکووری ئەم دێیە شوێنێکی مێژوویی دیکەیە.

لە باشووری دێ، ڕێگایەکی خاکی هەیە کە ئاوایی قەرەخان دەگرێتەوە، لە ڕۆژهەڵاتەوە، ڕێگایەکی قیلەتاو دەچێتەوە ئاوایی ترشەکان و کەمەربەندی مەهاباد ـ میاندواو، لە ڕۆژاواشەوە، ڕێگایەکی کەمەربەندی بەرەو مەهاباد ـ ورمێ دەڕوا و لە سەرەتای جادەش ئاوایی دارەلەک دەگرێتەوە.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی ١٣٥٨/١٢/٥ کارەباکەی هەڵکراوە، لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە کە لە ئاوایی خانەگێ دابین دەبێ، تەلەیفوونی ماڵ بە ماڵ، سیمکارتی مخابەراتی دێهات، پۆستبانک، باخچەی ساوایان، قوتابخانەی سەرەتایی (کوڕانە - کچانە) بە ناوی "ئەنبیا"، قوتابخانەی ناوەندی (کوڕانە ـ کچانە) بە ناوی "سرات"، ئاکابیری، بنکەی تەندروستی، شەریکەی هاوبەشیی نەوت و کەلوپەل، مزگەوت کە ساڵی ١٣٧٠ی هەتاوی نۆژەن کراوەتەوە، نانەوەخانە، ٣ کوورەخانە، ٢ هێڵی ڕاگواستن و هەروەها لە دێهیاری و شوورای ئیسلامیش بەهرەمەندە. مەهاباد شوێنی درێژەدان بە خوێندنی خوێندکارانی کوڕ و کچی ئەم گوندەیە.

وەرزێری، کرێکاری، ئاژەڵداری، باخداری و هێندێک کاری جۆراوجۆری ئازادی دیکە کاروپیشەی خەڵکی لەجە. وەرزێران گەنم، جۆ، چەوەندەر و وێنجە دەچێنن و ئاژەڵەکانیان مەڕ، بزن، مانگا و گامێشن. بەرهەمی باخەکانیشیان سێو و هڵوویە.

گرفتەکانی خەڵکی لەج: پێڕانەگەیشتن، نیوەکار مانەوەی گەلاڵەی هادی، ڕێگای قیلەتاو بە ناوەندی ئاوایی‌دا تێپەڕ دەبێ و ماشێنێکی زۆر دێن و دەچن و بەردەوام خەڵکەکە مەترسی ئەوەیانە کەسێک بکەوێتە ژێر ئەو هەمووە ماشینە و تووشی ڕووداوێکی دڵتەزێن بن، نەبوونی قوتابخانەی دواناوەندی و پەڕتوکخانە، پێڕانەگەیشتن بە ئاسەواری مێژوویی دێ و پارێزگاری نەکردن و مەترسی فەوتانیان.

لە ڕۆژهەڵاتی دێ گۆڕستانی "پیرمحەممەد"ی لێیە کە ئێستا مردووی لێ دەنێژن، لە ڕۆژاواش گۆڕستانی "قەبری سەیدی" هەڵکەوتووە.

---

* هەنبانەبۆرینە، لاپەڕەی ٧٦٨، ستوونی دووەم

# مازەڵێ

مازوڵێ لە ٢٥ کیلۆمیتری باشووری شاری مەهاباد بەشی خەلیفان و دێهستانی مەنگوڕی ڕۆژهەڵات و لە ناوچەی مەنگوڕایەتی هەڵکەوتووە. لە ١١ ماڵ و ٧١ کەس پێکهاتووە، لەمانە ٣٧ کەس پیاون و ٣٤ کەسیش ژنن، لە ٤٤ کەسی خوێندەوار لەم ئاواییە ٢٣ کەس پیاون و ٢١ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٢٣ کەسی نەخوێندەوار ١٠ کەس پیاون و ١٣ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ٤٣٢٢ هێکتارە، لەمە ٣٢٠ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە، ٤٠٠٢ هێکتار پاوان و لەوەرگەی دێیە. مازەڵێ خاوەن ١٠٦/٥ هێکتار زەوی دێم، ٣٦/٥ هێکتار زەوی بەراو، ١٣/٦٧ هێکتار باخ و ١ تراکتۆرە. بەرزایی ئاوایی ١٦٥٠ میتر لە ڕووکەشی زەریاکانە.

ئاواییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی دۆڵپەمۆ، بەشێک لە ئاوایی ئامێد

باکوور: ئاواییەکانی گوڵیار، خاتوونئەستی، قۆزلووجە

ڕۆژهەڵات: ئاوایی خرەجۆ

ڕۆژاوا: ئاوایی ئامێد

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باشوور: باسکی کەڵەکێ

باکوور: سەیدەکۆڵە

ڕۆژهەڵات: چەقالان

ڕۆژاوا: نێوانانی گەورە، نێوانانی چووک، کۆترەقوڵە

کانیاوەکان بە کانی گەوە، دارمازوو، ئەمەرەهوول، پووربەسێ و باخوەڵکە ناسراون.

لەم ئاواییە خانووبەرەکان لە قوڕ و بەردن و میچەکانیان بە دار داپۆشراون، ماڵەکانی ئەم گوندە هەوراز هەڵکەوتوون و حەوشەیان نییە و بەرەو ڕۆژاوان، کۆڵانەکان نارێک و ئاڵۆزن.

بەساڵاچووانی مازەڵێ ڕایان وایە لە یەک کیلۆمیتری مازەڵێ لە بەری باشوورەوە، ئاواییەک هەبووە بە ناوی "ئەمەرەهوول". ئەمەرەهوول بە پیاوێکی ئەرمەنی زاڵم ناسراوە و لە تایفەی "فەلەڕەشکە" بووە. "گۆڕی کچان" لە مازەڵێ، شوێنێکە دەگەڕێتەوە زەمانی فەلەڕەشکان، ئەم شوێنە کە لە بەری باشووری گوندەکە هەڵکەوتووە و حەوشەیان لە دەوری کێشاوە، دەڵێن کچان مانگاکانیان لەوێ دۆشیون.

لە باشووری ئاوایی، ڕێگایەکی خاکی هەیە و ئاوایی دۆڵپەمۆ دەگرێتەوە، لە باکوورەوە، ڕێگایەکی خاکی دەچێتەوە ئاوایی گوڵیار و لە ڕۆژاواش، ڕێگایەکی خاکی دەچێتەوە سەر جادەی مەهاباد ــ سەردەشت.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی ١٣٧٦/١٠/٢٠ کارەباکەی هەڵکراوە، سیمکارتی مخابەراتی دێهات، قوتابخانەی سەرەتایی (کوڕانە ــ کچانە) بە ناوی "ئیمان". بۆ بنکەی تەندروستی و وەرگرتنی نەوت و کەلوپەل سەر بە ئاوایی "حەوڵاکوردە"ن. خوێندکاران کەمتر درێژە بە خوێندن دەدەن، ئەوانەی درێژە دەدەن زۆرتر هەر کوڕن و ڕەوانەی خەلیفان و شاری مەهاباد دەبن.

کاروپیشەی خەڵکی مازەڵێ لە وەرزێری، ئاژەڵداری و تا ڕادەیەک، باخداری پێکهاتووە، وەرزێران گەنم و جۆ دەچێنن و ئاژەڵەکان مەڕ، مانگا و بزنن، هەروەها بەرهەمی باخەکان لە سێو و ترێ پێکهاتووە.

گرفتی سەرەکی خەڵکی مازەڵێ ئاوی خواردنەوەیە کە لە چاڵاو دابین دەبێ و لوولەکێشی بۆ نەکراوە (ئێستا لە کانی گەوە کەلک وەردەگرن)، سەرەڕای ئەوە مازەڵێ تاکوو ئێستا مزگەوتی نەبووە.

لە ڕۆژهەڵاتی ئاوایی گۆڕستانێک هەیە بە ناوی "گۆڕی گوڵان" کە پێشتر مردوویان لەم شوێنە دەناشت و ئێستا کەلکی لێ وەرناگرن و مردووەکانیان لە گۆڕستانەکەی ئاوایی گوڵیار دەنێژن.

## مازگێ

مازگێ له ۷۰ کیلۆمیتری باشووری ڕۆژهەڵاتی شاری مەهاباد، بەشی خەلیفان و دێهستانی کانی بازاڕ و له ناوچەی گەورکایەتی هەڵکەوتووه. له ۷۰ ماڵ و ٤٩١ کەس پێکهاتووه، لەمانه ۲٤۰ کەس پیاون و ۲۵۱ کەسیش ژنن، ڕادەی خوێندەواران ۲۳۳ کەسه که ۱٤۹ کەس پیاون و ۸٤ کەسیش ژنن، هەروەها له ۱۹۵ کەسی نەخوێندەوار ۵۲ کەس پیاون و ۱٤۳ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ۲۳۹۳/۹ هێکتاره، لەمه ۲۹۳/۹ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوه و ۲۱۰۰ هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیه. مازگێ خاوەن ۸۵ هێکتار زەوی دێم، ۱۲ هێکتار زەوی بەراو، ۲ هێکتار باخ و ٤ تراکتۆره. بەرزایی ئاوایی ۱٦۹۰ میتر له ڕووکەشی زەریاکانه.

| ئاوایییەکانی دەوروبەر: | چیاکانی دەوروبەری ئاوایی: |
| --- | --- |
| باشوور: ئاوایییەکانی برایمخەسار و نستان (سەر بە شاری سەردەشت) | باشوور: کێوی شاخەسوور |
| باکوور: ئاوایی سوێناس | باکوور: دەستاڕان |
| ڕۆژهەڵات: ئاوایییەکانی ئاغوەتمان و گورگه (سەر بە شاری بۆکان) | ڕوژهەڵات: گردەڕەش |
| ڕۆژاوا: ئاوایی گردشیلان | ڕۆژاوا: کێوی دارەبەنبان |

له باشوور و له کوێستانی گۆمێ، ئەشکەوتی "کونەقاژوو" هەیه. هەموو ساڵێ ۱۵ تا ۲۰ ماڵ لەم گونده بۆ هەوار دەچنه کوێستانەکانی شاڵەبەگی، سێکانیان، کەپری و گۆمێ. سێ کانیان، شاڵەبەگی، پیرەخاڵه، فەته و گیای حەمه خدری چەند کانیاوی ئەو گوندەن. خانووبەرەکانی مازگێ بە گشتی له قوڕ و بەردن و میچیان داره، حەوشەیان نییه و کۆڵانەکان هەوراز و نارێکن. زۆربەی ماڵەکان ڕوویان له ڕۆژهەڵاته و چەند ماڵێک بەرەوڕووی ڕۆژاوا هەڵکەوتووه. سەبارەت بە ناوی ئەم دێیه خەڵکەکەی دەڵێن: ئێره شوێنێک بووه که زوو "ماش"یان زۆر لێ کردووه، هەر بۆیه سەرەتا بە"ماشگا"یانی (شوێنی کردنی ماش) ناسراوه و بە تێپەڕ بوونی زەمان پیتی "ش" سوواوه و بۆته "ژ". له قامووس و وشەنامەکان دا "ماژ" بە پەیرەوی ئایینی زەردەشتی مانا کراوەتەوه.

له باکووری دێ، ڕێگایەکی خاکی هەیه که دووڕێیانێکی لێ دەبێتەوه، یەکیان دەڕوا بۆ ڕۆژاوا بۆ لای ئاوایی گردشیلان، ئەوی دیکەیان بۆ باکوور دەچێ و ئاوایی سوێناس دەگرێتەوه، له ڕۆژهەڵاتەوه، ڕێگایەکی خاکی دەچێتەوه ئاوایی خورخورەی بۆکان. له مەودای ۷۰ کیلۆمیتری ئەم ئاوایییه بۆ شاری مەهاباد، نزیک ۱۱/۵ کیلۆمیتری خاکییه.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی ۱۳۷۷/٤/۱ کارەباکەی هەڵکراوه، شێرەیەکی ئاوی گشتی که عەنباراوێکی بچووکی بۆ داندراوه و ئاوەکەی له "کانی ئەمین" دابین دەبێ، هەرچەند هێندێک له ماڵەکان چاڵاویان هەیه، تەلەیفوونی ماڵ بە ماڵ، قوتابخانەی سەرەتایی (کوڕانه ــ کچانه) بە ناوی "ئۆفۆق"، مزگەوت که ساڵی ۱۳۷٦ی هەتاوی نۆژەن کراوەتەوه بە ناوی محەممەدڕەسووڵەڵڵا (د.خ) (زەوی مزگەوت وەقفی کوێخا "مستەفا عەزیززاده" بووه) و هەروەها مازگێ خاوەن دێهیاری، شووڕای ئیسلامی و شووڕای چارەسەری کێشەکانه. نەوت و کەلوپەل له شەریکەی هاوبەشیی ئاوایی کاوڵانی خوارێ وەردەگرن، هەروەها بۆ بنکەی تەندروستی، ڕێگای ئاوایی سوێناس دەگرنه بەر.خوێندکارانی ئاوایی بۆ درێژەدان بە خوێندن بەتایبەتی کوڕان ڕوو له خەلیفان و مەهاباد دەکەن و لەم نێوەدا کچان کەمتر ئەم هەلەیان بۆ دەڕەخسێ.

کاروپیشەی خەڵکی ئەو ئاوایییه له وەرزێری، ئاژەڵداری، کرێکاری و تەون کردن پێکهاتووه. وەرزێران گەنم، جۆ و نۆک دەچێنن، زۆربەی ماڵەکان مەڕدارن و بزن و مانگا کەمتر ڕادەگرن، باخەکانی مازگه له سێو و ترێ پێکهاتوون که بەرهەمەکەیان بەرچاو نییه و هەر بەشی خاوەن باخەکەیه.

گرفتەکانی خەڵکی مازگێ: ڕێگای ناخۆش و خاکی، پێویستی بە لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوەیه، نەبوونی بنکەی تەندروستیی سەربەخۆ.

سێ گۆڕستانی لێیه که هەر سێکیان له بەری ڕۆژهەڵاتن، کۆنەگۆڕستانەکەی بە ناوی "دار بەڕوو"، گۆڕستانی "شێخ ڕەحیم" و گۆڕستانی "سەید مینه" که ئێستا مردووەکانیان لەوێ دەنێژن. کوێخا "مستەفا عەزیززاده" له باشترین شکستەبەندەکانی ناوچه بووه که له زۆر شوێنان دەهاتنه لای، ئێستا کوڕەکەی هەر لەم دێیه پیشەی باوکی ڕەچاو کردووه.

## مرانه

مرانه له 42 کیلۆمیتری باشووری ڕۆژاوای شاری مەهاباد، بەشی خەلیفان و دێهستانی مەنگوڕی ڕۆژهەڵات و لە ناوچەی مەنگوڕایەتی هەڵکەوتووە. لە 56 ماڵ و 269 کەس پێکهاتووە، لەمانە 141 کەس پیاون و ١٢٨ کەسیش ژنن، ژمارەی خوێندەوارانی ئەم ئاواییە 141 کەسە کە ٨٧ کەس پیاون و ٥٤ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٩٣ کەسی نەخوێندەوار ٣٤ کەس پیاون و ٥٩ کەسیش ژنن.
پانتایی ئاوایی 2500 هێکتارە کە 336/5 هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و 2163/5 هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.
مرانە خاوەن ٣٦٨/٣ هێکتار زەوی دێم، ١٤١ هێکتار زەوی بەراو، ٩/٩٢ هێکتار باخ، ١٠ تراکتۆر و ٣ لاوێردەیە.

ئاواییەکانی دەوروبەر:
باشوور: ئاوایی ئەسحاب
باکوور: ئاوایی سەرتان
ڕۆژهەڵات: ئاواییەکانی ئافان و سۆڵغە
ڕۆژاوا: ئاواییەکانی دۆڵبەهاروو و سەرتان

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:
باشوور: میران
باکوور: خڕێ فەتاحی
ڕۆژهەڵات: خڕێ چاکی
ڕۆژاوا: هاوینەڕێ

خڕێ سۆڵغە، کانی سەرەوە، خۆلەپۆلێ، کانی پیاوان (کانی فەقێیان) چەند کانیاوی مرانەن.
ماڵەکان زۆرتر لە قوڕ و بەردن و هێندێکش لە خشت و بلووک کەلکیان وەرگرتووە، میچی ماڵەکان بە داران داپۆشراون، بەشێک لە ماڵەکان حەوشەیان هەیە. خانووبەرەکان بەرەو باشوور و ڕۆژهەڵاتن، ئاوایی خاوەن چەند کۆڵانی پێچاوپێچە، بەشێک لە ماڵەکان شوێنەکەیان هەورازە.
مرانە لە "مران" هاتووە، مران جۆرێک داری خۆڕسکە کە بۆ دەسکی درمەغ، شەنە و بەتایبەت بۆ گۆچان کەلکی لێوەردەگرن و ئەو دارە لەم ناوچەیە هەیە.
لە ڕۆژهەڵاتی دێ، ڕێگایەکی خاکی بۆ ئاوایی سۆڵغە دەچێتەوە، لە ڕۆژاوا، ڕێگایەکی خاکی تێکەڵاوی ڕێگایی ئاواییەکانی گۆمڵیان، سەرتان و هتد دەبێتەوە. هەر لە ڕۆژاواشەوە، کوێرەڕێگایەکی خاکی و سەخڵەت هەیە کە ئاواییەکانی دۆڵبەهاروو، مەحمووداوا و سەرتان دەگرێتەوە.
ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی 1375/01/28 کارەباکەی هەڵکراوە، لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە کە لە "کانی ژنان" دابین دەبێ، بنکەی مخابەرات، قوتابخانەی سەرەتایی (کوڕانە ــ کچانە) بە ناوی "یۆسف" کە بیناکەی حازربەدەستە، دێهیاری (ساڵی ١٣٨٨)، بنکەی تەندروستی، مزگەوت کە ساڵی 1383ی هەتاوی نۆژەن کراوەتەوە، کانگایەکی بەردی "باریت" (کەرتی تایبەتی) و هەروەها مرانە خاوەن شووڕای ئیسلامییە. بۆ نەوت و کەلوپەل سەر بە شەریکەی هاوبەشیی ئاوایی "مێرەسێ"ن. بۆ درێژەدان بە خوێندن قوتابیان دوای قۆناغی سەرەتایی دەچنە ئاوایی خەلیفان و شاری مەهاباد، هەڵبەت زۆر کەم وا هەیە درێژە بە خوێندن بدەن، ئەوانەی درێژە بە خوێندنیش دەدەن هەر کوڕەکانی ئاوایین.
وەرزێری، ئاژەڵداری و کرێکاری کاروپیشەی خەڵکی مرانەیە. وەرزێران گەنم، نۆک و جۆ دەچێنن، ئاژەڵەکان مەڕ، مانگا و بزنن. باخەکان ساوان ڕێگاوبانی ناخۆش، نەبوونی بینایەکی باش بۆ قوتابخانە، نەبوونی قوتابخانەی ناوەندی لەم ناوچەیە و کەمئاوی گرفتەکانی خەڵکی ئەم گوندەن.
مرانە خاوەن دوو گۆڕستانە، یەکیان کە خەڵکەکەی دەڵێن مێژووییە و بە "چاکەسوورە" ناسراوە و ئەوی دیکەیان نزیکی دێیە و زۆر لە مێژ نییە.

## مەحموودئاوا (مەحموودئاوای دۆڵ بەهاروو)

ئەم ئاواییە لە ٤٠ کیلۆمیتری باشووری ڕۆژاوای شاری مەهاباد، بەشی خەلیفان و دێهستانی مەنگوڕی ڕۆژهەڵات و لە ناوچەی مەنگوڕایەتی هەڵکەوتووە. لە ١١ ماڵ و ٦٣ کەس پێکهاتووە، لەمانە ٣١ کەس پیاون و ٣٢ کەسیش ژنن، ژمارەی خوێندەوارانی ئەم ئاواییە ٣٦ کەسە ٢٣ کەسی پیاون و ١٣ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٢٢ کەسی نەخوێندەوار ٧ کەس پیاون و ١٥ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ٧٥٠ هێکتارە، لەمە ٥٢ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە، ٦٩٨ هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.

مەحموودئاوا خاوەن ٤٦/٥ هێکتار زەوی دێم، ١٦/٥ هێکتار زەوی بەراو، ١/١٧ هێکتار باخ و ١ تراکتۆرە.

ئاوایی‌یەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی دۆڵبەهاروو

باکوور: ئاوایی سەرتان

ڕۆژهەڵات: ئاوایی سلۆک

ڕۆژاوا: ئاوایی گۆمڵیان

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باشوور: گۆزەڵ

باکووری ڕۆژهەڵات: بۆگەنیوە

ڕۆژهەڵات: شاخەڕەشە

ڕۆژاوا: قەبری وەتمان

هەباس ئاغا، گۆلان، گۆڕی مابنان، قەبری وەتمان و کانی شاخەڕەشە، کانیاوەکانی ئاواییین.

خانووبەرەکان بە گشتی لە قوڕ و بەردن و میچی ماڵەکان لە دارن. خەڵکی ئاوایی وەرزی بەهاران تا سەرەتای پاییز دەبنە دووبنەکی، بنەیەکیان هەوار هەڵدەدەن و بنەی دیکە لە ئاوایی دەمێننەوە، هەوارەکانیان "پیرەسەنان" و "جانداران"ە.

جێی ئاماژەیە بەشی خەلیفان و دێهستانی مەنگوڕی ڕۆژهەڵات، دوو ئاوایی لێیە و ناوی ئەو دوو ئاواییە لێک نزیکن و هەر دووکیان یەک ڕەگەز و هۆزن، هەر بۆیە زۆر کەس ئەم دوو گوندەی لێ تێکدەچێ، بەڵام خەڵکی ئەم ناوچەیە بۆ ئەوەی بە هەڵە نەچن بە یەکیان دەڵێن "مەحموودئاوای دۆڵبەهاروو" و بەوی دیکە دەڵێن "مەحموودئاوای کیسەڵان".

سەبارەت بە مێژووی ئاوایی خەڵکەکەی دوو بۆچوونیان هەیە، یەکەمیان دەڵێ: نزیک بە ٧٠ ساڵ لەمەوبەر کەسێک بە ناوی مام "مەحموودی وەتمانی" بەردی بناغەی ئەو دێیەی داناوە، ماوەیەک لەم ئاواییە دەژی پاشان بە هۆی کێشە دەگەڵ ئاغاوەتەکان ئەوێ بەجێ دەهێڵێ و دەچێ بۆ لای کیسەڵان و لەوێ مووچە و مەزرا دەکڕێ و دەست دەکا بە ئاوەدانی. دووەم بۆچوون دوڵێ ٧٠ تا ٨٠ ساڵ لەمەوبەر کەسێک بە ناوی مەلا مەحموود، ئەم گوندەی ئاوەدان کردووەتەوە، هەڵبەت سەبارەت بە مەلا مەحموود هیچ زانیارییەک لە بەر دەستدا نییە.

لە باشووری دێ، ڕێگایەکی خاکی نزیک بە ٥٠ میترێک، دەچێتەوە ئاوایی دۆڵبەهاروو و لەوێش بۆ سەر جادەی سەرەکی، لە ڕۆژهەڵاتەوە، ڕێگایەکی سەخڵەت دووڕییانێکی لێدەبێتەوە، یەکیان بۆ ئاوایی مرانە و ئەوی دیکەیان بۆ ئاوایی سەرتان دەچێ.

ئیمکاناتی ئاوایی: ساڵی ١٣٨٢ کارەباکەی هەڵکراوە، بنکەی مخابەرات، قوتابخانەی سەرەتایی (کوڕانە ـ کچانە) بە ناوی "دەهر" (هاوبەشە دەگەڵ ئاوایی دۆڵبەهاروو و لە نێوان هەر دوو ئاواییدایە). بۆ بنکەی تەندروستی سەر بە ئاوایی "سەرتان"ن، نەوت و کەلوپەلیش لە شەریکەی هاوبەشیی "سیاقۆڵ"ی خوارێ وەردەگرن. خەڵکی ئاوایی بۆ دابین کردنی ئاو لە دوو کانیاوی شاخەڕەش و کانی وەتمان ئاویان بۆ خۆیان کێشاوە. قوتابیانی ئاوایی پاش تێپەڕ کردنی قۆناغی سەرەتایی درێژە بە خوێندن نادەن.

ئاژەڵداری، وەرزێری و کرێکاری کاروپیشەی خەڵکی ئاواییین. ئاژەڵەکان مەڕ، مانگا و بزنن و وەرزێران گەنم، جۆ، نۆک و نیسک دەچێنن.

گرفتەکانی خەڵکی ئاوایی: نەبوونی بنکەی تەندروستی بە هەر دووک ئاوایی‌یان، پێویستی بە لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوەیە، ڕێگاوبانی ناخۆش و خاکی، هەر دووک ئاوایی مەحموودئاوا و دۆڵبەهاروو پێویستیان بە مزگەوت و شووڕایە. گۆڕستانەکانی هەردووک ئاوایی هاوبەشە و "قەبرەوردان"ی ناوە، هەڵبەت کۆنەگۆڕستانێکیشی بە ناوی "کانی باریکێ" هەیە.

## مەحموودداوا (مەحمووداوای کیسەڵان)

ئەم ئاوایییە لە ٤٧ کیلۆمیتری باشووری ڕۆژاوای شاری مەهاباد، بەشی خەلیفان و دێهستانی مەنگوڕی ڕۆژهەلات و لە ناوچەی مەنگوڕایەتی هەڵکەوتووە. لە ٩ ماڵ و ٧٣ کەس پێکهاتووە، لەمانە ٤١ کەس پیاون و ٣٢ کەسیش ژنن، لە ٥٠ کەسی خوێندەوار ٣٥ کەس پیاون و ١٥ کەسیش ژنن، هەروەها لە ١٧ کەسی نەخوێندەوار ٣ کەس پیاون و ١٤ کەسیش ژنن.
مەحمووداوا خاوەن ٨٥ هێکتار زەوی دێم، ٣٨ هێکتار زەوی بەراو، ١/٤هێکتار باخ، ٣ تراکتۆر و ١ لاوێردەیە.

ئاوایییەکانی دەوروبەر:
باشوور: ئاوایییەکانی کووران و یاراڵی
باکوور: ئاوایی میرەسێ
ڕۆژهەلات: ئاوایی ئاغاسوور
ڕۆژاوا: ئاوایی کیسەڵان

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:
باشوور: نێرخاسان
باکوور: ئەشکەوتە
ڕۆژهەلات: سێوەسوور
ڕۆژاوا: بەردەزەرد

کوێستانی نێرخاسان هەر ئەو کوێستانە و هەوارە بەناوبانگەیە کە دە ساڵێدا لە ئاوایییەکانی ناوچەڕا ڕووی تێدەکەن.
ناوی دوو کانیاوی ئەم گوندە "گۆلان" و "بەردەقەل"ن.
خانووبەرەکانی مەحمووداوا بە گشتی لە قوڕ و بەرد و میچی دار ساز کراون، ماڵەکان حەوشەیان نییە و بەرەو باشوورن. خانووەکان لێک بڵاو و بە مەودایەکی زۆر کەم لە یەکتر هەڵکەوتوون.
وەکوو خەڵک دەگێڕنەوە ئەم ئاوایییە لە دوای "مەحمووداوای دۆڵبەهاروو" ئاوەدان کراوەتەوە، بەم چەشنە کە هەر دوو ئاوایی لە لایەن کەسێک بە ناوی "مەحموود وەتمانی" ئاوەدان کراوەتەوە. ئەو کەسە سەرەتا مەحمووداوای دۆڵبەهاروو ئاوەدان دەکاتەوە و دوای ساڵی ١٣٠٠ی هەتاوی ئەوێ بەجێ دەهێڵێ و دێتە ئەم شوێنە و بناغەی ئاوایییەکی دیکە دادەمەزرێنێ کە پێشتر مەزرای ئاوایی "کیسەڵان" بووە، ئەو تا کۆتایی ژیانی هەر لەوێ دەمێنێتەوە، سەبارەت بەم کەسایەتییە هیچ زانیارییەک لەبەر دەستدا نییە.
زۆر جاران خەڵک لەگەڵ کێڵانی زەوی لەتکەسواڵەت، دیزە و گۆزەی شکاو دەدۆزنەوە کە لە مێژوویەکی نادیار لەو گوندە دەدوێ.
لە ڕۆژاوای دێ ڕێگایەکی خاکی هەیە کە دەچێتەوە ئاوایی کیسەڵان و ڕێگای هاتووچۆی خەڵکی ئاواییشە، لە ڕۆژهەلات و باشووری ڕۆژهەلاتەوە، دوو ڕێگای ناخۆش و چەپەک دەچنەوە ئاوایییەکانی ئاغاسوور و کوران.
ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی ١٣٧٧/٦/١٠ کارەباکەی هەڵکراوە، بنکەی مخابەرات، قوتابخانەی سەرەتایی (کوڕانە ـ کچانە) بە ناوی "سەداقەت". بۆ بنکەی تەندروستی سەر بە ئاوایی "میرەسێ"ن و نەوت و کەلوپەل لە سیاقۆڵی خوارێ وەردەگرن. ئەم گوندە لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوەی نییە و زۆربەی ماڵەکان هەر لە مەزراکانی خۆیانەوە ئاویان کێشاوە، چەند ماڵێک تروم‌پایان هەیە. خوێندکاران بە دەگمەن درێژە بە خوێندن دەدەن و ئەوەی خوێندنەکەشی درێژە پێدەدا دەبێ بچێتە خەلیفان و مەهاباد.
کاروپیشەی خەڵکی مەحمووداوا ئاژەڵداری، وەرزێری و کرێکارییە، ئاژەڵەکانیان مەڕ، بزن و مانگان، وەرزێران گەنم، جۆ، نۆک و نیسک دەچێنن. لەم گوندە تازە چەند باخێک لێدراوە و بەرهەمەکانیان سێو و قەیسییە.
گرفتەکانی خەڵکی ئاوایی: ڕێگای ناخۆش، نەبوونی بنکەی تەندروستیی سەربەخۆ و کەم‌ئاوی. گۆڕستانەکەی ئاوایی لە بەری باکوور هەڵکەوتووە.

## مەزرا

مەزرا لە ٢٣ کیلۆمیتری باشووری ڕۆژاوای مەهاباد، بەشی خەلیفان و دێهستانی مەنگوڕی ڕۆژهەلات و لە ناوچەی مەنگوڕایەتی هەڵکەوتووە. لە ٩ ماڵ و ٥٣ کەس پێکهاتووە، لەمانە ٢٦ کەس پیاون و ٢٧ کەسیش ژنن، لە ٣٣ کەسی خوێندەوار ١٧ کەس پیاون و ١٦ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٢٠ کەسی نەخوێندەوار ٩ کەس پیاون و ١١ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ٣٥٧٧/٥ هێکتارە، لەمە ٧٤/٥ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە، ٣٥٠٣ هێکتار پاوان و لەوەرگەی دێیە.

مەزرا خاوەن ٥٧ هێکتار زەوی دێم، ٢٣/٥ هێکتار زەوی بەراو، ٩/٦٤ هێکتار باخ، ٤ تراکتۆر و ١ لاوێردەیە.

ئاواییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی سمێنوو

باکوور: ئاوایی داغە

ڕۆژهەلات: ئاواییەکانی سیاقوڵی سەرێ و قاوەخانە

ڕۆژاوا: ئاوایی سێلم و کەلەدەنداوا

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باشوور: وسوو ئاڵیان

باکوور: زێندووێ سپی (گلەسپی)

ڕۆژهەلات: سەرلێر

کانیاوەکان بە ئەحمەدەخرە، سەید ساڵە و کانی مەزرا ناسراون.

لە مەزرا خانووبەرەکان لە قوڕ، بەرد، خشت و میچی دار ساز کراون، ماڵەکان حەوشەیان نییە و هەیوان و پێشخانەیان هەیە، خانووەکان هەموویان لە یەک ڕیزن و بە گشتی ڕوویان لە ڕۆژاوایە.

وێدەچی مەزرا پێشتر لەوەرگە و مەزرای ئاوایی داغە بووبێ و هەر لەم گوندەوە ئاوەدان کرابێتەوە چونکە مەزرا مڵکی ئاغاکانی ئاوایی داغە بووە و لە زمان خەڵکی ناوچەکەوە، هەر بە مەزرای داغە ناوی دێنن.

لە باکووری ئاوایی ڕێگایەکی ٥٠٠ میتری خاکی هەیە کە تێکەڵی جادەی دۆڵی سیاقوڵ دەبێتەوە، ئەمە تەنیا ڕێگای هاموشۆی خەڵکی ئەم دێیەیە.

ئیمکاناتی ئاوایی:ساڵی ١٣٨٥ کارەباکەی هەڵکراوە، سیمکارتی مخابەراتی دێهات، قوتابخانەی سەرەتایی (کوڕانە ــ کچانە) بە ناوی "خرەد". بۆ بنکەی تەندروستی، وەرگرتنی نەوت و کەلوپەل سەر بە ئاوایی "سیاقوڵ"ی خوارێن. مەزرا، ئاوی خواردنەوە لوولەکێشیی بۆ نەکراوە و ئاوەکەی لە کانیاوێک بە ناوی "کانی مەزرا" دابین دەبێ. خوێندکاران لە دوای پۆلی سەرەتایی کەم وا هەبووە درێژە بە خوێندن بدەن، تەنانەت ساڵی ١٣٨٧ بە هۆی کەم بوونی قوتابی، قوتابخانەی مەزرا داخرا و مامۆستایان بۆ نەناردرا، پاشان قوتابخانەیان بۆ کردنەوە.

کاروپیشەی خەڵکی ئەم دێیە ئاژەڵداری، وەرزێڕی، مێشداری و باخدارییە.

ئاژەڵەکانیان مەڕ و مانگان، وەرزێران گەنم، نۆک و جۆ دەچێنن. باخەکانی ئەم ئاواییە کە دارسێو و دار قەیسین تازە لێدراون و ساوان.

گرفتەکانی ئاوایی: ڕێگای خاکی و ناخۆش، نەبوونی بینا بۆ قوتابخانە و نەبوونی بنکەی تەندروستیی سەربەخۆ.

خەڵکی ئەم ئاواییە مردووەکانیان لە گۆڕستانی "بەرلانکێ"ی ئاوایی "سێلم" دەنێژن.

ناسراوترین کەسایەتی ئەم دێیە حاجی "ڕەسووڵ عەبدوڵلاهی"یە کە خەڵکی ئاوایی بە خێرخوازی ناو دەبەن و لایان خۆشەویستە.

## مێرگەڕۆ

مێرگەڕۆ لە 33 کیلۆمیتری باشووری ڕۆژاوای شاری مەهاباد، بەشی خەلیفان و دێهستانی مەنگوڕی ڕۆژهەڵات و لە ناوچەی مەنگوڕایەتی هەڵکەوتووە. لە 4 ماڵ و 33 کەس پێکهاتووە، لەمانە ١٩ کەس پیاون و ١٤ کەسیش ژنن، لە ١٣ کەسی خوێندەوار ١١ کەس پیاون و ٢ کەسیش ژنن، هەروەها لە ١٨ کەسی نەخوێندەوار ٨ کەس پیاون و ١٠ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ٢١٠٠ هێکتارە، لەمە 128/5 هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و ١٩٧١/٥ هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.

مێرگەڕۆ خاوەن ١٧٤/٥ هێکتار زەوی دێم، ٣٢/٩ هێکتار زەوی بەراو، ٢/٢٩ هێکتار باخ و ٢ تراکتۆرە.

ئاوایی‌یەکانی دەورووبەر:

باشوور: ئاوایی سێلم

باکوور: ئاوایی سێلمساغۆڵ

ڕۆژهەڵات: ئاوایی سێلم

ڕۆژاوا: ئاوایی‌یەکانی قشقوونەی سەرێ و خوارێ

چیاکانی دەورووبەری ئاوایی:

باشوور: قەڵای مێرگەڕۆ

ڕۆژهەڵات: کێوی ماڵان

ڕۆژاوا: بەری نیسێ

کانی ماڵان و کانی گۆلان دوو کانیاوی ئاوایین.

خانووبەرەکان بە گشتی لە قوڕ و بەردە و میچەکانیان لە دارە، ماڵەکان حەوشەیان نییە و هەر چوار ماڵ لە یەک ڕیزدا بەرەو ڕۆژاوا سازکراون.

سەبارەت بە ناوی ئاوایی دانیشتووانی ڕایان وایە کە ئەم گوندە مێرگی زۆرە و دەبێ ئەم ناوە هەر لەوەوە هاتبێ.

تا ساڵی ١٣٨٥ ئەم ئاوایی‌یە 9 ماڵ بوون، بەڵام لە بەر کەم بوونی ئاو، ویشکەساڵی و هێندێک گرفتی دیکە، 5 ماڵیان چوونە شاری مەهاباد.

لە باشووری مێرگەڕۆ، ڕێگایەکی خاکی هەیە کە دەچێتەوە ئاوایی قەرەقاچ، لە ڕۆژهەڵاتی دێ، ڕێگایەکی خاکی بۆ ئاوایی سێلم دەڕوا، لە ڕۆژاواوە ڕێگایەک کە دووڕییانێکی لێ دەبێتەوە دەچێتەوە ئاوایی‌یەکانی سێلمساغۆڵ و قشقوونەی سەرێ و خوارێ.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی 1382/07/05 کارەباکەی هەڵکراوە، شێرەیەکی ئاو بۆ گشت ماڵەکان، قوتابخانەی سەرەتایی (کوڕانە ـ کچانە) بە ناوی "عەتار"، تەلەیفوونی ماڵ بە ماڵ. خەڵکی ئاوایی بۆ کەلک وەرگرتن لە بنکەی تەندروستی سەر بە ئاوایی "باگردان"ی خوارێن، نەوت و کەلوپەل لە شەریکەی هاوبەشیی "سیاقۆڵ"ی خوارێ وەردەگرن.

قوتابیان دوای تێپەڕ کردنی قۆناغی سەرەتایی ڕەوانەی ئاوایی خەلیفان یا شاری مەهاباد دەبن.

وەرزێری، ئاژەڵداری و کرێکاری کاروپیشەی خەڵکی ئاوایین. وەرزێران گەنم، جۆ، نیسک و نۆک دەچێنن. ئاژەڵەکانیان مەڕ، مانگا و بزنن. باخەکانی ئەم ئاوایی‌یە ساوان و زۆرتر دارسێون.

ڕێگاوبانی یەکجار ناخۆش، نەبوونی بینایەکی باش بۆ قوتابخانە و نەبوونی مزگەوت و شووڕا، لە سەرەتایی‌ترین گرفتەکانی خەڵکی مێرگەڕۆ دێنە ئەژمار.

گۆڕستانی "قەڵات" لە بەری باشووری ئاوایی هەڵکەوتووە.

## میرەدێ

میرەدێ لە 51 کیلۆمیتری باشووری ڕۆژهەڵاتی شاری مەهاباد بەشی خەلیفان و دێهستانی کانی بازاڕ و لە ناوچەی محاڵ هەڵکەوتووە. لە 35 ماڵ و 239 کەس پێکهاتووە، لەمانە ١٢٧ کەس پیاون و ١١٢ کەسیش ژنن، لە ١٤٥ کەسی خوێندەوار لەم ئاوایییە ٨٦ کەس پیاون و ٥٩ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٦٨ کەسی نەخوێندەوار ٢٢ کەس پیاون و ٤٦ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی 400 هێکتارە، لەمە 278 هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و 122 هێکتار پاوان و لەوەرگەی دێیە.

میرەدێ خاوەن ٢٩٠ هێکتار زەوی دێم، ١٦٠ هێکتار زەوی بەراو، ٢٧ هێکتار باخ (٢٠ هێکتار سێوە) و ١٦ تراکتۆرە.

مەودای ئاوایی تا ناوەندی خزمەتگوزاریی وەرزێری کانی بازاڕ ٩ کیلۆمیترە.

ئاوایییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی قۆیتەڵ

باکوور: ئاوایی بەرەجۆ

ڕۆژهەڵات:ئاوایییەکانی ئاچی‌دەرێ و کانی ڕەشی بۆکان

ڕۆژئاوا: ئاوایی خاڵدەلیل

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باشوور: کاڵەشین

باکوور: پیرحەیز

ڕۆژهەڵات: شاخەڕەش

ڕۆژئاوا: دەروو

کانیاوەکانی ئاوایی بە مام پەو، خرێ بەفرێ و خرێ دەروێش ناسراون.

گشت ماڵەکان لە قوڕ و بەرد ساز کراون و میچی ماڵەکان لە دارە، زۆربەی ماڵەکان حەوشەیان نییە و کۆڵانەکان باریکەڵانە و بەرتەسک و ناڕێکن.

خەڵک دەڵێن بەر لە ئێستا ئەم ئاوایییە ئاوەدانتر بووە. لە نزیک دێ و بەری ڕۆژئاوا قەڵایەکی مێژوویی هەڵکەوتووە.

لە باکووری ئاوایی، ڕێگایەکی قیلەتاوی هەیە کە دەچێتەوە ئاوایی بەرەجۆ، لە ڕۆژهەڵاتەوە، ڕێگایەکی قیلەتاو ئاوایی ئاچی‌دەرێ دەگەڕێتەوە و لە ڕۆژئاواشەوە، ڕێگایەکی تری قیلەتاوکراو دەچێتەوە ئاوایی خاڵدەلیل.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی 1376/05/24 کارەباکەی هەڵکراوە، لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە کە لە کانیاوی دۆڵان و چاڵاو دابین دەبێ، بنکەی مخابەرات، مزگەوتێک کە بە قوڕ و بەرد ساز کراوە، ئاکابیری، قوتابخانەی (کوڕانە ـ کچانە) کە ساڵی 1386ی هەتاوی سەرلەنوێ ساز کراوەتەوە، جێی ئاماژەیە ئەم قوتابخانەیە دوو ناوی هەیە کە دانێکی قوتابییەکانی پۆلی سەرەتایی لێی دەخوێنن و بە ناوی "عەبدولنەبی نەجات"ە و دانێکیشی قوتابیانی پۆلی ناوەندین و بە ناوی "مووسا"یە، هەروەها ئەم دێیە خاوەن شووڕای ئیسلامییە. خوێندکاران پاش تێپەڕ بوونی قۆناغی سەرەتایی و ناوەندی ڕەوانەی مەهاباد و خەلیفان دەبن کە کوڕان زۆرتر لە کچان دەنێردرێن. خەڵکی ئەم دێیە بۆ بنکەی تەندروستی سەر بە ئاوایی "بەرەجۆ"ن و نەوت و کەلوپەل لە شەریکەی هاوبەشیی "خەلیفان" وەردەگرن.

وەرزێری، ئاژەڵداری، باخداری و کرێکاری کاروپیشەی خەڵکی میرەدێیە، وەرزێران گەنم، نۆک و جۆ دەچێنن و ئاژەڵەکانیان زیاتر مانگان و تا ڕادەیەکیش مەڕ و بزن ڕادەگرن، بەرهەمی باخەکانیان زیاتر سێوە.

نەبوونی تەلەیفوونی ماڵ بە ماڵ، پاک و خاوێن نەبوونی ئاوایی لە بواری بێهداشت و نەبوونی دێهیاری لە گرفتەکانی خەڵکی ئاوایییە.

گۆڕستانی ئاوایی لە ڕۆژئاوا هەڵکەوتووە کە بە "هەوارشایی" ناسراوە. وەرزی بەهاران و دە ساڵێدا سەدان لایەنگری سروشت بۆ سەیران دەچنە ئەم شوێنە دڵڕفێنە.

## میرەسێ

میرەسێ لە ٤٦ کیلۆمیتری باشووری ڕۆژاوای شاری مەهاباد، بەشی ناوەندی و دێهستانی مەنگوڕی ڕۆژهەڵات و لە ناوچەی مەنگوڕایەتی هەڵکەوتووە.
لە ٣٥ ماڵ و ٢٦٨ کەس پێکهاتووە، لەمانە ١٣٤ کەس پیاوە و ١٣٤ کەسیش ژنن، ژمارەی خوێندەوارانی ئەم ئاواییە ١٣٦ کەسە کە ٩١ کەس پیاون و ٤٥ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٩٠ کەسی نەخوێندەوار ٢٧ کەس پیاون و ٦٣ کەسیش ژنن.
پانتایی ئاوایی ٢٤٠٠ هێکتارە، لەمە ١٣٤ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و ٢٢٦٦ هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.
میرەسێ خاوەن ٨٩/٩ هێکتار زەوی دێم، ٦٣/٧ هێکتار زەوی بەراو، ١٣/٥٤ هێکتار باخ، ٩ تراکتۆر و ٥ لاوێردەیە.

ئاواییەکانی دەوروبەر:
باشوور: ئاواییەکانی کیسەڵان، مەحمووداوا و شەکربەگ
باکوور: ئاواییەکانی ئەسحاب و سۆڵغە
ڕۆژهەڵات: ئاوایی ئاغاسوور
ڕۆژاوا: ئاواییەکانی کارگ و هەرمێ

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:
باشوور: گردەدوولک
باکوور: دۆڵەسیر
ڕۆژهەڵات: مام ئەحمەدە
ڕۆژاوا: قوڵەمەندۆک

مام ئەحمەدە، کونەگورگ، هەوار مشکاوی، سەرمابردوان، هەوارەبڵیندە و هەوارە قووچە، کانیاوەکانی ئەم دێیەن.
ئەم ئاواییە سێ کوێستانی لێیە کە بریتین لە: ئەشکەوتان، مام ئەحمەدە و دۆڵەسیر.
جگە لە چەند خانوویەک کە بە خشت، بلوک و چیمەنتۆ ساز کراون، خانووبەرەکان بە گشتی لە قوڕ و بەردن و میچەکانیان لە دارن، ، زۆربەی ماڵەکان ڕوو بە ڕۆژهەڵاتن، هێندێکیان حەوشەیان هەیە، ئەم دێیە چەند کۆڵانی بەرتەسک و باریکەڵانەی هەیە، مزگەوتەکەی لە ناوەندی ئاواییە.
زۆربەی ماڵەکان لە دەشتایین و لە سەر چۆمی میرەسێن و هێندێکیان شوێنەکەیان هەورازە.
سەبارەت بە مێژووی ئاوایی بە ڕای خەڵک نزیک ١٠٠ ساڵ لەمەوبەر ئەم ئاواییە کاول بووە، پاشان هێندێک جەماوەر لە نزیک ئاوایی کارگ و هەرمێ لە شوێنێک بە ناوی "دۆڵەسیر "هاتن و ئەو شوێنەیان ئاوەدان کردەوە و ئێستا شوێنی پێشوویان بۆتە جێ هەواریان. سەبارەت بە ناوی میرەسێ، لە دوو بڕگەی میرە + سێ پێکهاتووە و ئەگەر بڕگەکان جێگۆڕکەیان پێ بکەین دەبێتە "سێ میر" کە بە وتەی خەڵکی ئەم دێیە، دە ڕابردوودا ئەم ئاواییە سێ میری بووە و لە ژیان و چۆنیەتی دەسەڵاتدارییان بەڵگەیەک بە دەستەوە نییە. لە بەری ڕۆژاوای گوند، شوێنێکی مێژوویی لێیە کە بە "قەڵای میرەسێ" ناسراوە. لە باشووری دێ، ڕێگایەکی خاکی هەیە و دەچێتەوە ئاوایی شەکربەگ، لە باکوورەوە، ڕێگایەکی خاکی، گەردەنەی خوولەپۆڵی و ئاوایی ئافان دەگرێتەوە، لە باشووری ڕۆژهەڵاتەوە، ڕێگایەکی خاکی دەچێتەوە ئاواییەکانی مەحمووداوا و کیسەڵان، لە ڕۆژاواشەوە، ڕێگایەکی خاکی و سەخڵەت دەچێتەوە ئاواییەکانی کارگ، هەرمێ و ئەسحاب.
ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی 1375/09/01 کارەباکەی هەڵکراوە، لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە (عەنباراویان بۆ داناوە و ئاوەکەی لە کانی مام ئەحمەد دابین دەبێ)، بنکەی مخابەرات، قوتابخانەی سەرەتایی (کوڕانە ـ کچانە) بە ناوی "حەیدەریان"، شەریکەی هاوبەشیی نەوت و کەلوپەل، بنکەی تەندروستی، مزگەوت (ساڵی ١٣٧٨ نۆژەن کراوەتەوە) و هەروەها خاوەنی شووڕای ئیسلامیشە. هێندێک لە قوتابیان بۆ درێژەدان بە خوێندن دەچنە ئاوایی خەلیفان و شاری مەهاباد و کچەکانیش بە دەگمەن درێژە بە خوێندن دەدەن.
ئاژەڵداری، وەرزێری و کرێکاری کاروپیشەی خەڵکی ئاوایین. ئاژەڵەکان مەڕ، مانگا و بزنن، وەرزێران گەنم، جۆ، نۆک، نیسک و پەڕش دەچێنن، باخ لەو ئاواییە تازە لێدراوە و ئەوەی هەیە دارسێوە.
گرفتەکانی خەڵکی میرەسێ: ڕێگاوبانی یەگجار سەخڵەت و ناخۆش، کەم بوونی ئاو، نەبوونی قوتابخانەیەکی ناوەندی، نەبوونی دێهیاری.
بەری ڕۆژاوا کۆنەگۆڕستانێکی لێیە و گۆڕستانێکی نوێ کە بە "ئاوزەویان" ناسراوە.

## هەرمێ

هەرمێ لە ٥٠ کیلۆمیتری باشووری ڕۆژاوای شاری مەهاباد، بەشی خەلیفان و دێهستانی مەنگوڕی ڕۆژهەڵات و لە ناوچەی مەنگوڕایەتی هەڵکەوتووە.
لە ٨ ماڵ و ٨٦ کەس پێکهاتووە، لەمانە ٥٠ کەس پیاون و ٣٦ کەسیش ژنن، لە ٥٣ کەسی خوێندەوار لەم گوندە ٣٢ کەس پیاون و ٢١ کەسیش ژنە، هەروەها لە ٢٠ کەسی نەخوێندەوار ٨ کەس پیاون و ١٢ کەسیش ژنن.
پانتایی ئاوایی ٩٠٠ هێکتارە، لەمە ١١٠/٥ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و ٧٨٩/٥ هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.
هەرمێ خاوەن ٢٧ هێکتار زەوی دێم، ٣٤ هێکتار زەوی بەراو، ٣٧/٣٧ هێکتار باخ و ٢ تراکتۆرە.

ئاوایی‌یەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی شەکربەگ
باکوور: ئاوایی‌یەکانی ئەسحاب و بێهەنگوین
ڕۆژهەڵات: ئاوایی میرەسێ
ڕۆژاوا: ئاوایی کارگ

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باشوور: شاخەڕەش
باکوور: ئاڵۆک
ڕۆژهەڵات: گردی پاڵی
ڕۆژاوا: شاخەهۆرە

ئەشکەوتی "کونەقاژوو" لە باکووری ڕۆژاوای هەرمێ هەڵکەوتووە، لە ژێر ئەشکەوتەکەوە خوڕەی ئاوێ دێ. تا ئێستا کەس نەیتوانیوە مەودای ئەم ئەشکەوتە ببڕێ.
ئاڵۆک و بەشێک لە پیرەسەنان کۆێستانەکانی هەرمێن.
کانیاوەکان بە کانی قاژوو و کانی ئاڵۆک ناسراون.
خانووبەرەکان لە قوڕ، بەرد، خشت و چیمەنتۆن، گشت ماڵەکان میچەکانیان لە دارە و هەوراز هەڵکەوتوون، حەوشەیان نییە بەڵکوو خاوەن هەیوانن و کۆڵەکەی داریان وەبەر داون، گشت ماڵەکان ڕوویان لە ڕۆژهەڵاتە.
ئەم دێیە لە نێوان ساڵەکانی ١٣٣٥ تا ١٣٤٠ی هەتاوی ئاوەدان کراوەتەوە، بنەماڵەی "بایەزیدی" لە ئاوایی هەمزاوا ڕوویان لەم شوێنە کرد و خەڵک دەڵێن کاتێک ئەوان هاتوون هیچ ماڵێکی لێ نەبووە. ئەو بنەماڵەیە خۆیان دەڵێن کاتێک هاتین چەند قەبرێلی لێبوو کە ڕوون نییە پێوەندی بە چ سەردەمێکەوەیە و چەند دارەهەرمێیەکەی لێبوو هەر بۆیە ناوی ئاواییش بۆتە "هەرمێ"، ئەوان دەڵێن ئەو شوێنە خانووە ڕووخاوی لێبووە و هەر ئەوە دەریدەخا کە پێشتر کەسانێک لە گوندە ژیابن و ئاوەدانی بووبێ.
لە ڕۆژهەڵات گوندەوە، ڕێگایەکی خاکی هەیە کە دەچێتەوە سەر دۆڵی ئافان، لە بەری ڕۆژاواشەوە، ڕێگایەکی خاکی ئاوایی کارگ دەگرێتەوە.
ئیمکاناتی ئاوایی: ساڵی ١٣٨٤ کارەباکەی هەڵکراوە، بنکەی مخابەرات، قوتابخانەی سەرەتایی (کوڕانە ــ کچانە) کە بیناکەی نوێیە (خشت، چیمەنتۆ و میچی ئاسن) و کەسێک بە ناوی "قادراغا" دایناوە و بە ناوی "ئیسفەندیار بایەزیدی" کردووە. بۆ بنکەی تەندروستی و وەرگرتنی نەوت و کەلوپەل سەر بە ئاوایی"میرەسێ"ن. ئاوی خواردنەوەی لوولەکێشیی بۆ نەکراوە و لە کانیاوی "ئاڵۆک"ەوە بە سۆندە ئاویان ڕایەڵ کردووە، خوێندکاران بۆ درێژەدان بە خویندن ڕەوانەی شاری مەهاباد دەبن. لە هەرمێ مزگەوت ساز نەکراوە، بەڵام زەوییەک بۆ ساز کردنی تەرخان کراوە.
کاروپیشەی خەڵکی ئەم دێیە ئاژەڵداری، وەرزێری، مێشداری و باخدارییە. هەروەها دوو ماڵ کانگای بەردیان هەیە، ئاژەڵەکانیان مەڕ و مانگان، وەرزێران گەنم و نۆک دەچێنن و بەرهەمی باخەکان لە سێو و هڵوو و گوێز پێکهاتووە.
گرفتەکانی خەڵکی هەرمێ: ڕێگای خاکی و ناخۆش، نەبوونی بنکەی تەندروستیی سەربەخۆ و کەم‌ئاوی.
ئەم ئاوایی‌یە گۆڕستانی نییە و بۆ مردوو ناشتن لە گۆڕستانی گوندی کارگ کەلک وەردەگرن.

## هەمزاوا

هەمزاوا لە ٨ کیلۆمیتری باشووری شاری مەهاباد، بەشی ناوەندی و دێهستانی موکریانی ڕۆژاوا و لە ناوچەی مەنگوڕایەتی هەڵکەتووە. لە ٨٤ ماڵ و ٤٩٥ کەس پێکهاتووە، لەمانە ٢٥٢ کەس پیاون و ٢٤٣ کەسیش ژنن، لە ٣٠٥ کەسی خوێندەوار ١٨٧ کەس پیاون و ١١٨ کەسیش ژنن، هەروەها لە ١٤٤ کەسی نەخوێندەوار ٤٦ کەس پیاون و ٩٨ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ١٦٠٠ هێکتارە، لەمە ٢٥٨ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە، ١٣٤٢ هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە. هەمزاوا خاوەن ٥٦٣/٧ هێکتار زەوی دێم، ١١٤/٧ هێکتار زەوی بەراو، ٢٩/٢ هێکتار باخ، ٢٩ تراکتۆر و ١٢ لاوێردەیە. بەرزایی ئاوایی ١٣٨٠ میتر لە ڕووکەشی زەریاکانە.

ئاوایییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی بەیتاس

باکوور: شاری مەهاباد

ڕۆژهەڵات: ئاوایی قەرەچەلان

ڕۆژاوا: ئاوبەندی مەهاباد و ئاوایی داشتەمر

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باشوور: ئالیگاری

باشووری ڕۆژاوا: بەردەڕەشان و بەردەسووران

باکوور: مام مووسەڵە

ڕۆژهەڵات: بەردە سپیان

ڕۆژاوا: میرەزا

گۆڕی مەلا قادر و کانی شیلان، سەرچاوەی ئاوی ئەم دێیەن و ئاوەکەی ئێستای لە کانی شیلان دابین دەبێ.

زۆربەی خانووبەرەکان لە قوڕ و بەرد و میچی دار ساز کراون، هێندێک بە کاگڵ لە دەرەوە سواغ دراون، هەروەها لە ساز کردنی هێندێک خانووبەرەدا خشت و چیمەنتۆ دەکار کراوە. کۆڵانەکان درێژ و باریکەڵانەن و بەرەو هەوراز هەڵکەوتوون، زۆربەی خانووبەرەکان لەم دێیە بەرەو باشوور ساز کراون و خاوەن حەوشە و دەرگان.

ئەو هەمزاوایەی کە ئێستا باسی لەسەر دەکرێ دوای هەمزاوای کۆن ئاوەدان بۆتەوە کە لە سەردەمی ساز کردنی ئاوبەندی مەهاباد وەبن ئاوێ کەوتووە و خەڵکەکەی گوێزراونەتەوە ئەم شوێنەی کە بە ناوی هەمزاوای ئێستا ناوی لێ دەبردرێ.

ئەم ئاوایییە دوو قەڵای لێیە بە ناوەکانی "ئالـــیگاری" و "دژقەڵات". لە سەردەمی شۆڕشی گەلانی ئێراندا قەڵای ئالیگاری تالان کراوە.

لە سەرەتای ڕێگای مەهاباد ـ سەردەشت ڕێگایەکی قیلەتاو لە بەری باشوور، دێتەوە ناوەندی ئاوایی هەمزاوا و "پشتتەپ".

ئیمکاناتی ئاوایی: کارەبا، لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە، تەلەیفوونی ماڵ بە ماڵ، قوتابخانەی سەرەتایی (کوڕانە ـ کچانە)، قوتابخانەی ناوەندی (کوڕانە ـ کچانە) بە ناوی "فەجر"، مزگەوت بە ناوی محەممەدڕەسوڵەڵڵا (د. خ) کە ساڵی ١٣٨٥ی هەتاوی بە یارمەتی خەڵکی خێرخواز ساز کراوە، باشگای کچان، بنکەی تەندروستی، گاوداری و هەروەها ئەم ئاوایییە خاوەن دێهیاری ساڵی ١٣٨٥ی هەتاوی و شووڕای ئیسلامییە. نەوت و کەلوپەل لە "پشتتەپ" وەردەگرن. قوتابیان بۆ درێژەدان بە خوێندن دەچنە شاری مەهاباد.

کاروپیشەی خەڵکی ئاوایی وەرزێری، ئاژەڵداری، کرێکاری و تا ڕادەیەکیش باخدارییە. وەرزێران گەنم، جۆ، نۆک، نیسک و وێنجە دەچێنن، ئاژەڵەکانیش مەڕ و مانگان. زۆربەی بەرهەمەکانی باخی هەمزاوا سێوە.

قوتابخانەی ئاوایی کە لە سەر ڕێگا هەڵکەوتووە و گیانی قوتابیانی خستۆتە مەترسییەوە، پێویستە حەسارێکی لە دەوری بۆ بکێشرێ و ئەوە یەکێک لە داخوازییەکانی خەڵکی ئەم گوندەیە.

ئەم دێیە دوو گۆڕستانی هەیە یەکیان لە ڕۆژاوای ئاوایی لە تەنیشت ڕێگای مەهاباد ـ سەردەشت هەڵکەوتووە، ئەوی دیکەیان لە ڕێگای سەرەکی ئاوایییە، هەر دوو گۆڕستان کەلکیان لێ وەردەگیرێ.

وەکوو ناسراوترین کەسایەتیی ئاوایی، دەتوانین ئاماژە بە خاتوو "خەیاڵ عەبدوڵڵازادە" بکەین کە دەرمانی گیایی ساز دەکا و لە کارەکەیدا زۆر سەرکەوتووە و ساڵی ١٣٨٧ی هەتاوی "کارئافەرینی نموونەی وڵاتی ئێران" بووە.

# یاڕاڵی

یاڕاڵی لە 56 کیلۆمیتری باشووری ڕۆژاوای شاری مەهاباد، بەشی خەلیفان و دێهستانی کانی بازاڕ و لە ناوچەی گەورکایەتی هەڵکەوتووە. لە 22 ماڵ و ١٨٣ کەس پێکهاتووە، لەمانە ٩٥ کەس پیاون و ٨٨ کەسیش ژنن، لە ١٢٠ کەسی خوێندەوار ٧٤ کەس پیاون و ٤٦ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٤٥ کەسی نەخوێندەوار ١٤ کەس پیاون و ٣١ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی 7500 هێکتارە، لەمە 1500 هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و 6000 هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە.

یاڕاڵی خاوەن ١٣٠ هێکتار زەوی دێم، ٦٢ هێکتار زەوی بەراو، ٦/٥ هێکتار باخ، ١١ تراکتۆر و ٤ لاوێردەیە.

ئاواییەکانی دەورووبەر:

باشوور: ئاواییەکانی کووران و کاوڵانی سەرێ

باکوور: ئاوایی قۆزلووی گەورە

ڕۆژهەڵات: ئاواییەکانی زیندووقووڵ و کولتەپە

ڕۆژاوا: ئاواییەکانی مەحموودئاوا و ئاغاسوور

چیاکانی دەورووبەری ئاوایی:

باشوور: تەپکی سێکانیان

باکوور: شاخی هەڵۆ

ڕۆژاوا: شەشڕێیان

کانیاوەکانی یاڕاڵی بە سێکانیان، چەقالێ، تووان و بێبێرییان ناسراون.

سەرەکیترین کەرەسەی سازکردنی خانوو لەم گوندە، قوڕ و بەرد و دارە، مزگەوت و قوتابخانەکەی بە خشت و چیمەنتۆ ساز کراون، هەڵبەت قوتابخانە خەریکە دەڕووخێ، زۆربەی ماڵەکانی ئەو ئاواییە حەوشەیان نییە و زۆریان بەرەو باشوور ساز کراون، هەروەها یاڕاڵی چەند کۆڵانێکی ناڕێک و بەرتەسکی هەیە. یاڕاڵی لە دوو وشە پێکهاتووە، "یار" کە بە مانای دۆست و هاوڕێ و "ئاڵی "یان"عەلی" کە ناوێکی عەرەبییە و بە مانای "بەرز"ە. لە باشووری دێ، ڕێگایەکی خاکی ئاوایی کووران دەگرێتەوە، لە ڕۆژهەڵاتەوە، ڕێگایەکی ٤ کیلۆمێتری دەچێتەوە سەر جادەی مەهاباد ــ سەردەشت و ئەوە ڕێگای هامووشۆی یاڕاڵییە، لە ڕۆژاواوە، باریکەڕێیەک دەچێتەوە ئاواییەکانی مەحموودئاوا و سوورخاو.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی 1376/09/11 کارەباکەی هەڵکراوە، لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە کە عەنباراویان بۆ داناوە و ئاوەکەی لە کانی تەرسەقولان دابین دەبێ، مزگەوتی"چوار یاری نەبی" کە ساڵی 1380 نۆژەن کراوەتەوە، قوتابخانەی سەرەتایی (کوڕانە ــ کچانە) بە ناوی "هەدەف" کە ساڵی 1348ی هەتاوی دامەزراوە، بنکەی مخابەرات و هەروەها ئەم دێیە خاوەن شووڕای ئیسلامییە. بۆ وەرگرتنی نەوت و کەلوپەل و کەلک وەرگرتن لە بنکەی تەندروستی سەر بە ئاوایی "کاوڵان"ی خوارێن. بینای قوتابخانە بە هۆی خەراپ بوونی چۆڵ کراوە و قوتابیان لە ژێرخانەی مزگەوتدا دەخوێنن و بۆ درێژەدان بە خوێندن دەچنە ئاواییەکانی کاوڵانێ خوارێ و خەلیفان و مەهاباد، کچان کەمتر لە کوڕان دەبەر خوێندن دەنرێن.

ئاژەڵداری، وەرزێری، تەون کردن و کرێکاری کاروپیشەی خەڵکی ئاواییە. زۆربەی هەرە زۆری دانیشتووانەکەی مەڕدارن و تا ڕادەیەکیش مانگا و بزنیان هەیە. وەرزێران گەنم، جۆ و کۆڵزا دەچێنن و چەند باخێکی دێیەکە بەرهەمەکانیان سێو و ترێیە.

ڕێگاوبانی خاکی و ناخۆش بەتایبەت لە وەرزی تەڕ و قوڕیدا، نەبوونی بەربەندی ئاوخێزداری بۆ بەرگری لە لافاو کە هەموو ساڵێ خەسارێکی زۆری لێ دەکەوێتەوە و نەبوونی بینای قوتابخانە وەکوو سێ گرفتی دیار و بەرچاوی ئەم دێیە ئاماژەی پێدەکرێ.

گۆڕستانی "شێخ هەمزە" لە ڕۆژهەڵاتی ئاوایی هەڵکەوتووە و تەنیا کەسانێکی تایبەت وەکوو کوێخا و ئاغا لێ نێژراون. "تەپکی سێکانیان" کە لە بەری باشوور هەڵکەوتووە، گۆڕستانی گشتییە. لە بەری ڕۆژهەڵاتی ئاوایی، گۆڕستانێکی دیکە هەیە کە بە "خڕێ قەبران" ناسراوە.

## یاڵاوەی خوارێ

لە ٣٥ کیلۆمیتری ڕۆژهەڵاتی شاری مەهاباد، بەشی ناوەندی و دێهستانی ئاختاچی ڕۆژاوا و لە ناوچەی محاڵ هەڵکەوتووە. لە ٢٠ ماڵ و ٨٦ کەس پێکهاتووە، لەمانە ٤٩ کەس پیاون و ٣٧ کەسیش ژنن، ژمارەی خوێندەوارانی ئەم ئاواییە ٥١ کەسە کە ٣٨ کەسی پیاون و ١٣ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٣٠ کەسی نەخوێندەوار ١٠ کەس پیاون و ٢٠ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی 435/4 هێکتارە، لەمە 335/4 هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و ١٠٠ هێکتار پاوان و لەوەرگەی دێیە. یاڵاوەی خوارێ خاوەن ١٥٥ هێکتار زەوی دێم، ١٩٤ هێکتار زەوی بەراو، ٧٢ هێکتار باخ و ٥ تراکتۆرە.

ئاواییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاواییەکانی یاڵاوەی سەرێ و عیساکەند

باکوور: ئاواییەکانی قەڵاجۆغە و کانی کەوتێر

ڕۆژهەڵات: ئاوایی ئۆتەمیش

ڕۆژاوا: ئاوایی بورهان

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باشوور: وەهاب بەکر

باکوور: تەپکە گەورە

ڕۆژاوا: قشەهوو

"کانی نێو دێ" کانیاوی بەناوبانگی ئاواییە.

خانووەکانی ئەم دێیە پێکهاتووە لە بەرد، قوڕ و بلووک، زۆربەی میچی ماڵەکان هەر بە دار داپۆشراون و ماڵەکان لێک بڵاون، باخەکانیان لە ناوەندی ئاواییدا هەڵکەوتوون و هەر ماڵەی لە پەنا باخەکەی خانووی خۆی هەیە و حەوشەکانیان گەورەن و جگە لە باخەکان هەر کەس چەند دارێکی لە حەوشە چەقاندووە کە زۆریان خوورمالوو، پستە و گوێزن، ئاوایی خاوەن چەند کووچەباخە و زۆربەی ماڵەکان بەرەڕووی باشوورن.

ئەم گوندە مێژوویترە لە یاڵاوەی سەرێ و ئاوایی یاڵاوەی سەرێ لێرەوە ئاوەدان کراوەتەوە، جێگای باسە زەوی و زاری ئاوایی کاتێک بەش کرا چەند برایەک ڕوویان لە یاڵاوەی سەرێ کرد کە ئەوکات مەزرا بووە و ئاوەدانیان کردووەتەوە.

ناوی یاڵاوە لە دوو وشەی یاڵ+ئاوێ پێکهاتووە کە لە زمانی کوردیدا مانای دووەمی "یاڵ" بە مانای شانی چیایە و پاشگری "ئاوێ" بە مانای ئاوەدانییە؛ جێگای باسە یاڵێک لە پێش هەر دوو ئاوایی یاڵاوەی سەرێ و خوارێیە. خەڵکی ئاوایی وەک گلەییەک ئەوە دەدرکێنن کە بەداخەوە ناوی دێیەکەیان لە تەواوی ئۆرگانەکانی دەوڵەتی بە "یادآباد" ناسراوە کەچی ئەوە هەڵەیە و مانایەکی دیکە دەگەیەنێ. مەسەلێک لە مەڵبەندی موکریان پێوەند بە لاوەکانی یاڵاوە باوە و لە زۆربەی شار و گوندەکانی موکریاندا کە لاوێک خۆ شەنگ و شۆخ دەکا و بەرگی ڕازاوە دەبەر دەکا و دەستی لە بەر پشتێندی دەنێ و قیت ڕادەوەستێ، پێی دەڵێن: "دەڵێی جعێڵی یاڵاوەی".

لە باشووری ئاوایی ڕێگایەکی قیلەتاو دەچێتەوە سەر جادەی مەهاباد ـ بۆکان، لە باکوورەوە ڕێگایەکی خاکی ئاواییەکانی قەڵاجۆغە و کانی کەوتێر دەگرێتەوە، لە ڕۆژاواش ڕێگای خاکی دەڕواتەوە بۆ ئاوایی یاڵاوەی سەرێ.

ئیمکاناتی ئاوایی: کارەباکەی ڕێکەوتی 1364/08/24 هەڵکراوە، سیم کارتی مخابەراتی دێهات، مزگەوت (دەوروبەری ساڵی ١٣٧٠ نۆژەن کراوەتەوە)، قوتابخانەی سەرەتایی (کوڕانە ـ کچانە) بە ناوی "موئمینین"، گاوداری و کارگەی کەرتی تایبەتی. بۆ بنکەی تەندروستی سەر بە ئاوایی عیساکەندن و نەوت لە ئاوایی قەڵاجۆغە وەردەگرن و بۆ کەلوپەل سەر بە شەریکەی ئاوایی "بورهان"ن. ئاوی دێ لە چاڵاو دابین دەبێ و لوولەکێشیی نەکراوە. بۆ درێژەدان بە خوێندن قوتابیان ڕوو لە شاری مەهاباد دەکەن.

باخداری و وەرزێری سەرەکیترین کارو پیشەی خەڵکی ئەم گوندەیە. بەرهەمی باخەکان پێکهاتووە لە سێو، گوێز، بادام، قەیسی، ئاڵووباڵوو و گێلاس. وەرزێران گەنم، نۆک و نیسک دەچێنن و مانگای ڕادەگرن.

گرفتەکانی خەڵکی ئاوایی: لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوەی نییە و نەبوونی شووڕای ئیسلامی.

ئاوایی خاوەن دوو گۆڕستانە کە یەکیان تایبەت بە منداڵانە و بە "قەبری پوور ئایشێ" ناسراوە و لە باکووری ئاوایی هەڵکەوتووە، لە ڕۆژاواش گۆڕستانێکی دیکە هەیە کە هەر دوو ئاوایی یاڵاوەی سەرێ و خوارێ کەلکی لێ وەردەگرن، هەڵبەت هێندێک لە خەڵکی ئاوایی مردووەکانیان لە گۆڕستانی شێخی بورهان لە ئاوایی خانەقا (سەر بە بۆکان) دەنێژن. "ئاغا ڕەش "ناسراوترین کەسایەتی ئاوایی بووە، ئەو پیاوێکی بەدەسەڵات و خاوەن هونەرە و شێعرێکی زۆری لە بەرن و شێعری "حافزی شیرازی" و "سەعدی شیرازی" بە دەسخەتێکی خۆش نووسیونەوە. "سولەیمان بەگی نەوزەری" کە شێعری وتووە لەم گوندە ژیاوە، بەڵام بەداخەوە هیچ کام لە شێعرەکانی کۆ نەکراونەوە و فەوتاون.

## یالاوەی سەرێ

له ٣٦ کیلۆمیتری ڕۆژهەڵاتی شاری مەهاباد، بەشی ناوەندی و دێهستانی ئاختاچی ڕۆژاوا و له ناوچەی محاڵ هەڵکەوتووه. له ١٧ماڵ و ٩٥ کەس پێکهاتووه، لەمانه ٥١ کەس پیاون و ٤٤ کەسیش ژنن، ژمارەی خوێندەوارانی ئەم ئاوایییه ٦٠ کەسه که ٣٧ کەس پیاون و ٢٣ کەسیش ژنن، هەروەها له ٢٦ کەسی نەخوێندەوار ٨ کەس پیاون و ١٨ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی ٦٣٧/٥ هێکتاره، لەمه ٥١٧/٥ هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوه و ١٢٠ هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیه.

یالاوەی خوارێ خاوەن ٢٦٠ هێکتار زەوی دێم، ٣٠٥ هێکتار زەوی بەراو، ٥٠ هێکتار باخ و ١٤ تراکتۆره.

ئاواییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی عیساکەند

باکوور: ئاوایی بورهان

ڕۆژهەڵات: ئاوایی یالاوەی خوارێ

ڕۆژاوا: ئاواییەکانی سەهۆڵان، سیچان بڵاغ و کولیجه

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

باشوور: کەڵکه خوومار

ڕۆژاوا: قەدی سەنگەران، بەردەمێشه و بەشێک له قۆتڕ

کانیاوەکان به باڵەبان (که له سێ بەشی دوو بەشی ئی ئەو گوندەیه و بەشێک ئی سیچان بڵاغ)ە، کانی سۆفی جوبرەئیل، کانی دوولکه، کانی بەردە قەڵەشته، کانی دێ بەری و کانی محەممەدی خەندان ناسراون.

خانووبەرەکان له یالاوەی سەرێ زۆرتر به بلووک، خشت و چیمەنتۆیه ساز کراون و میچەکانیان له داره، کۆڵانەکانی ناڕێکن.

سەبارەت به مێژووی دێ به پێی ئەو بەڵگەیەی له لای بنەماڵەی سوهرابی هەیه و خەڵکی ئەو گوندەن، خودالێخۆشبوو "بوداق سوڵتان موکری" زەوییەکانی سێ ئاوایی سیچانبڵاغ و یالاوەی سەرێ و خوارێ به کوڕەکەی واتا سوهرابەگی موکری دەفرۆشێ، هەر لەو سەردەمەوه ئەو ئاوایییانه وردە وردە ئاوەدان بوونەوه.

خەڵک دەڵێن سەرەتا یالاوەی سەرێ ئاوەدان کراوەتەوه پاشان سیچانبڵاغ و یالاوەی خوارێ که وەک زەوی و مەزرا کەلکیان لێ وەردەگیرا ئاوەدان کراونەوه. له باکووری دێ له تەپکێکی نزم سێ کون به دەستی مرۆڤ هەڵکەندراوه که خەڵکی ئاوایی دەڵێن دەگەڕێتەوه سەد ساڵ لەوەی پێش و وەکوو هۆڵ کەلکیان لێ وەرگیراوه، خەڵکی دێ بەم شوێنانه دەڵێن "زاخه".

له ڕۆژهەڵاتی دێ ڕێگایەکی خاکی ئاوایی یالاوەی خوارێ دەگرێتەوه، له ڕۆژاوا ڕێگایەکی دیکەی خاکی دەچێتەوه سەر جادەی سەرەکی مەهاباد ــ بۆکان.

ئیمکاناتی ئاوایی: کارەباکەی ڕێکەوتی ١٣٦٤/٨/١٥ هەڵکراوه، سیمکارتی مخابەراتی دێهات، قوتابخانەی سەرەتایی (کوڕانه ــ کچانه) به ناوی "حامید"، مزگەوت که ساڵی ١٣٧٤ به خەرجی کاک "محەممەد سوهرابی" نۆژەن کراوەتەوه. بۆ بنکەی تەندروستی ڕێگای ئاوایی عیساکەند دەپێون، هەروەها نەوت و کەلوپەل له شەریکەی ئاوایی قەڵاجۆغه وەردەگرن. خوێندکاران له یالاوەی سەرێ پاش تێپەڕ کردنی قۆناغی سەرەتایی ڕەوانەی قوتابخانەکانی شاری مەهاباد یان بۆکان دەبن. ئاوی ئەم دێیه لوولەکێشی بۆ نەکراوه و له کانی "دێ بەری" بۆ خواردنەوه کەلک وەردەگرن.

کاروپیشەی خەڵکی ئەو دێیه له وەرزێری و باخداری پێکهاتووه. وەرزێران گەنم و جۆ دەچێنن و بەرهەمی باخەکان قەیسی، بادام، گوێز و سێوه. خەڵکەکەی مانگا ڕادەگرن. گرفتەکانی خەڵکی ئاوایی: ڕێگاوبانی خاکی، پێویستی به لوولەکێشی ئاوی خواردنەوەیه، پێڕانەگەیشتن له بواری ئاوەدانی و گەلاڵەی هادییەوه. ئەو دێیه دوو گۆڕستانی هەیه یەکیان کۆنەگۆڕستانه و له نزیک ئاوایییه و ئەوی دیکه له بەری باشوور هەڵکەوتووه به ناوی "کەڵکه خوومار" که خەڵکی یالاوەی خوارێش کەلکی لێ وەردەگرن.

## یەڵتەمر

یەڵتەمر لە ٤٤ کیلۆمیتری باشووری ڕۆژهەڵاتی شاری مەهاباد، بەشی ناوەندی و دێهستانی کانی بازاڕ و لە ناوچەی مەنگوڕایەتی هەڵکەوتووە. لە ٢٧ ماڵ و ١٦٣ کەس پێکهاتووە، لەمانە ٨٠ کەس پیاون و ٨٣ کەسیش ژنن، ژمارەی خوێندەوارانی ئەم ئاواییـە ٩٥ کەسـە کـە ٥٠ کـەس پیـاون و ٤٥ کەسیش ژنن، هەروەها لە ٤٩ کەسی نەخوێندەوار ١٨ کەس پیاون و ٣١ کەسیش ژنن.

پانتایی ئاوایی 4499/33 هێکتارە، لەمە 174/33 هێکتار بۆ خەڵک جیا کراوەتەوە و ٤٣٢٥ هێکتار پاوان و لەوەڕگەی دێیە. یەڵتەمر خـاوەن ١٥٠ هێکتار زەوی دێم، ٨٥ هێکتار زەوی بەراو، ٤ هێکتار باخ و ١١ تراکتۆرە. مەودای ئاوایی تا ناوەندی خزمەتگوزاریی وەرزێری کانی بازاڕ ١ کیلۆمیترە.

ئاوایییەکانی دەوروبەر:

باشوور: ئاوایی کۆرەگێ

باکوور: ئاوایی خەلیفان

ڕۆژهەڵات: ئاوایی قۆیتەڵ

ڕۆژئاوا: ئاوایییەکانی کیتکە و گوێچکەدەرێ

چیاکانی دەوروبەری ئاوایی:

ڕۆژهەڵات: مانگ و ڕۆژان

ڕۆژئاوا: قەڵا

سەید قادر، کۆرەگێ، کانی سەرێ، کانی فەقێیان، مام عەزیز و کانی ئاشی، کانیاوە بەناوبانگەکانی ئاواییین.

خانووبەرەکان زۆربەیان لە قوڕ و بەرد ساز کراون، هێندێک لە ماڵەکان حەوشەیان هەیە و میچی ماڵەکان بە گشتی لـە دارە، ڕووبارێـک بـە ناوەنـدی ئاواییدا تێپەڕ دەبێ، یەڵتەمر خاوەن چەند کورتەکۆڵانێکی خواروخێچە، زۆربەی ماڵەکان ڕوویان لە ڕۆژهەڵاتە و هێندێکیشیان بەرەوڕووی ڕۆژئاوان.

"ئەمیرشەرەفخان بەدلیسی" لە کتێبەکەی خۆیدا بە ناوی "شەرەفنانە"، وەکوو کۆنترین سەرچاوە بۆ ناساندنی هێندێک کەسایەتی، ناوچـە، ئـاوایی و شارەکانی کوردستان لە دەفەری موکریاندا کە باسی هێندێک ئـاوایی و شـار دەکـا لـە یەڵتـەمریش دەدوێ. "ئـەمیرخان" لـە کتێبـەکەیدا کـە سـاڵی ١٠٠٥ی کۆچی مانگی نووسیوێتی باس لەوە دەکا کە لە سەدەی نۆهەمی کۆچی "ئەمیر سەیفەدین موکری" ناوچەی درپاس لە ترکەکان دەستێنێتەوە و دەیکاتە پێتەختی حکوومەتی خۆی و پـاش ماوەیـەک هەرێمەکـەی پـەرە پێدەدا و دەسـت بـە سـەر ناوچـەکانی دۆڵباریـک، ئاختـاچی، یەڵتـەمر، سڵدووزیش دادەگرێ. بە پێی ئەم بەڵگە مێژوویییە دەردەکەوێ کە یەڵتەمر شوێنێکی لەمێژینەیە و جگە لەوەش خاوەن تەپکێکە بـە ژمـارەی تۆمـار کراوی ١٦٦٣٢ لە میراتی فەرهەنگی بە بەرزایی ١٤٦٥ میتـر لـە ڕووکەشـی زەریاکان کـە مێژوویەکـەی دەگەڕێتـەوە هـەزارەی یەکـەمی پـێش زایین، هەروەها تەپەی "قەڵای یەڵتەمر" بە ژمارەی تۆمار کراوی ١٥٩٧٨ لە میراتی فەرهەنگی بە بەرزایی ١٤٩٧ میتر لـە ڕووکەشـی زەریاکـان مێژوویەکـەی دەگەڕێتەوە قۆناغی کالکۆلیتیک ـ سەدەی ٦ تا ٨ی کۆچی مانگی.

بەری ڕۆژهەڵاتی ئاوایی شوێنەواری کۆنەخانووی لێیە، خەڵکی ئاوایی دەڵێن ئەو کۆنەخانووانە، ماڵە جوولەکەکان بووە.

هەروەها وەکوو خەڵکی ئەم گوندە دەگێڕنەوە لە ڕۆژهەڵاتی ئاوایی کە ئێستاش بـە "مانـگ و ڕۆژان" ناسـراوە بـەردێکی گـەورەی لێبـووە کـە وەکـوو کێلێک لە عەرزی چەقیوە و وێنەی مانگ و ڕۆژی لە سەر هەڵقەندرابوو و نێوان ساڵەکانی 1357-1355 بە دەسـت کەسـێکی نەناسـراو کـە زەوی و زاری لەم ناوچەیە هەبووە، تالان کراوە.

جێگای باسە کە میراتی فەرهەنگی، لە دەسپێکی ساڵی ١٣٨٧وە، بە خەڵکی ئاوایی ڕاگەیاندووە کە ماڵەکانیان لە داوێنی قـەڵا بگوێزنـەوە بـۆ بـەری ڕۆژهەڵاتی ئاوایی. بڕیارە قەڵای یەڵتەمر بکەن بە شوێنەوارێکی توریستی.

لە باشووری دێ، ڕێگایەکی ئامادەی قیلەتاو بۆ ئاوایی کۆرەگێ دەچێ، لە باکوورەوە، ڕێگایەکی تری ئامادە بۆ قیلەتاو خەلیفان دەگرێتەوە.

وەرزێری و ئاژەڵداری سەرەکیترین کارویپیشەی خەڵکی ئەم ئاوایییە. وەرزێران گەنم، جۆ و نۆک دەچێنن، ئاژەڵەکان بریتین لە: مەڕ، مانگا و بزن. هەروەها چەند باخی تازە لێدراوە کە بەرەکەیان سێوە.

ئیمکاناتی ئاوایی: ڕێکەوتی 1357/10/19 کارەباکەی هەڵکراوە، لوولەکێشیی ئاوی خواردنەوە، سیمکارتی مخابەراتی دێهات، مزگەوت، قوتابخانەی سەرەتایی (کوڕانە ـ کچانە) بە ناوی "میعاد"، ئاکابیری و هەروەها ئاوایی لە دێهیاری و شووڕای ئیسلامی بەهرەمەندە. خەڵکی ئەو گوندە بۆ بنکەی تەندروستی و وەرگرتنی نەوت و کەلوپەل سەر بە "خەلیفان"ن.

قوتابیانی کچ و کوڕ بۆ درێژەدان بە خوێندن ڕەوانەی خەلیفان و پاشان مەهاباد دەبن.

گرفتەکانی خەڵکی ئاوایی: نەبوونی بنکەی تەندروستیی سەربەخۆ و قیلەتاو نەبوونی ڕێگا.

خەڵکی ئاوایی مردووەکانیان لە گۆڕستانی گوندی "کۆرەگێ" دەنێژن. یەڵتەمر کۆنەگۆڕستانێکی بە ناوی "شاوێردیبەگ" هەیە.

چەند ساڵ لەمەوبەر کاک "سەدیق خزری" و "عەولا کوڵی خدرەشەل" وەک دوو حیکایەتخوان لە یەڵتەمر حیکایەتی "حەسەنی چەکدار"، "ئەرسەلان" و "ئەسکەندەر"یان بۆ خەڵک دەگێڕاوە.

"ئەحمەدی کاڕەسووی" بەیتبێژ و فۆلکلۆرزانی بەناوبانگ، ماوەیەکی زۆری تەمەنی لەو ئاواییە تێپەڕ کردووە و زۆربەی کۆڕ و دانیشتنەکانی بە دەنگە زوڵاڵەکەی ڕازاندۆتەوە.

خەڵکی ئاوایی بەتایبەت بەساڵاچووان، ساڵی "محەممەد ڕەشیدخان" بە خۆشترین ڕووداو بۆ ئاواییەکەیان دەزانن. "محەممەد ڕەشیدخان" بۆخۆی و ٣٠٠ سوارەوە لە دیوی گەرمێن(کوردستانی عێراق) بۆ یارمەتی "پێشەوا قازی" ڕوو لە سابلاغ دەکا و بەو ئاواییەدا تێپەڕ دەبێ.

یەڵتەمر گۆڕانکاریی زۆری بەسەردا هاتووە و لە قامووسی دێخۆدا ئاوای باس لەسەر کراوە:

دێهستانێکە لە دەوروبەری شارەستانی مەهاباد، خاوەن ٧٩ ئاوایی، ئاوەکەی لە ڕووباری مەهاباد دابین دەبێ. حەشیمەتی ١٢٣٦٠ کەسە و بەرهەمی سەرەکی دەغڵودان، توتن و ئەو بەرهەمانەن کە لە ئاژەڵ وەدەست دێن. ناوەندەکەی ئاوایی "ئیسکیبەغدا"یە کە لە ٥٠ کیلۆمیتری باشووری ڕۆژهەڵاتی مەهاباد هەڵکەوتووە.

# داب‌ونه‌ریته‌کان

## به‌شی سێهه‌م

گۆرانییه‌کانی کاتی کار، لایه‌لایه، حه‌یران، ورده‌قام، گۆرانی، باللۆره، به‌یتی قه‌برێ،
هه‌ته‌رێ‌ومه‌ته‌رێ، به خه‌رمان هه‌ڵگوتن، چێشته‌کان، جێژن، هێندێک له حیسابه کۆنه‌کان، ئه‌ستێره‌کان، کایه،
وێنه‌ی کڵاوه کوردییه‌کان، پێوان، کێش، ئه‌ژمار، چاره‌سه‌ری هێندێک نه‌خۆشی

## گۆرانی کاتی کار

### (ئەم گۆرانییانەی کە لە کاتی کارکردندا دەیانگووتن)

(محەممەد ڕەسووڵی ـ "محەممەدخاڵە")

(لە کاتی دروێنە کردندا دەکوترا):

زەردی دەڵـــەی کـــارەبـــای　　شـیرنی دەڵـەی قـەنـد و چـای

ژنـــێ بـــۆ کـــوڕەکـــەم دێـــنم　　بـــە تـــەوفیقـــی زاتـــی خـــوای

(سەلاح خزری)

دەنـــگ نایـــە دەنـــگ هـــەڵێـــنم　　وەک کـــــــۆڕێ بچـــــــریکێنم

خـــەرمانـــەکـــەم تـــەواو بـــێ　　ژنـــێ بـــۆ کـــوڕەکـــەم دێـــنم

دروێنـــە دروێنـــە دروێنـــە

دەســـکی داســـێم بـــەڕۆنـــە

✽✽✽✽✽

بەندی مانگادۆشین

(خەدیجە مەلائەحمەدی)

نەنێ، نەنێ، نەنەکانم

دایک و بابەکانم

پێشڕەوی وڵاخەکانم

نێوی جەرگەکانم

عەزیزی لە دڵەکانم

نەنەکانم، نەنەکانم

نەنەکانم ڕەبی بە خێر بێیەوە لە دانێ

ماڵە بابەکەی خۆمت دەسەر دەگێڕمەوە

✽✽✽✽✽

تورێ تورێ بە خێر بێیەوە لە گاڕانێ

وەرەوە سەر چاوی دە کابانێ

تورێ تورێ گیان، نەنکم گیان

بە خێر بێیەوە لە بەندەنان، لە تەلانان

بە خێر بێیەوە لە گاڕانێ

وەرەوە سەر چاوی دە کابانێ.

## مەشکەمەشکێ

(شەم محەممەدپوور)

مەشکەم مەشکەی گیسکۆڵی     کاکە هەڵگرە زەردۆڵی
بۆخۆم دەچم لە تۆڵی     کیژۆڵێم کەوتە قۆڵی

هەی ماڵە بابم مەشکێ
هەی حەمر و چاوم مەشکێ

سەری مەشکێم بە پۆڕە     بنی مەشکێم بە بۆڕە
کابانی شەنگوشۆڕە     چیدی قەولان مەگۆڕە

هەی ماڵە بابم مەشکێ
هەی حەمر و چاوم مەشکێ

*****

(مەلا عەولا فاتحی)

مەشکەم مەشکەی بەرازی     خۆشە دەنگ و ئاوازی
مەلا هاتووە بمخوازی     پیرە و پێی نابم ڕازی

هەی ماڵە بابم مەشکێ
هەی حەمر و چاوم مەشکێ

*****

مەشکەم مەشکەی گیسکۆڵێ     هەوار لە "هەرزن دۆڵێ"
کاکم هەڵگرێ زەردۆڵێ     بۆخۆم دەچم لە تۆڵێ

هەی ماڵە بابم مەشکێ
هەی حەمر و چاوم مەشکێ

*****

مەشکەی نازێنم چڵکە     تەشیە نارێسم کوڵکە
ئەو ساڵ شەرتێکم کردووە     بۆ لاوەی دەچم ملکە

هەی ماڵە بابم مەشکێ
هەی حەمر و چاوم مەشکێ

*****

مەشکێم نازێ "چیانە"     سەت بارزانیم میوانە
حەیران شازی هەموانە

هەی ماڵە بابم مەشکێ
هەی حەمر و چاوم مەشکێ

❊❊❊❊❊

بەو قورئانەی قاجری        دەستم مەشکەی ناگری
حەیران چۆتە لەشکری

هەی ماڵە بابم مەشکێ
هەی حەمر و چاوم مەشکێ

❊❊❊❊❊

ئاوی "زەردەکیفارێ"        بە خورەخورِ دێتە خوارێ
لە بۆ مەشکەی نازدارێ

هەی ماڵە بابم مەشکێ
هەی حەمر و چاوم مەشکێ

❊❊❊❊❊

خەسووم حەمری نەمێنێ        لە هەیوانێم دەنوێنێ
سپەینان زووم هەڵدەستێنێ        ئاوی مەشکەم پێ دێنێ
ڕەببی ملانی دەقورِێ نێ

هەی ماڵە بابم مەشکێ
هەی حەمر و چاوم مەشکێ

❊❊❊❊❊

مەشکەم مەشکەی مەڕانە        کەف و ڕۆن لە هەنگڵانە
شۆڕەسوارم میوانە        قەدری لە سەر چاوانە
هەی ماڵە بابم مەشکێ
هەی حەمر و چاوم مەشکێ

❊❊❊❊❊

مەشکە سووریێم نەژاوە        بە کەف و ڕۆن تەکاوە
کابان سەر بە گوڵاوە

هەی ماڵە بابم مەشکێ
هەی حەمر و چاوم مەشکێ

❊❊❊❊❊

چەندەم کرد مەشکەژێنی        سەرم بوو تەپڵەگوێنی
حازاب نەبێ نامێنی        "کادەروێشی" و "گەرمێنی"
بە بار ئاوریشمان دێنی        بۆ گوریس و زاربێنی
بەڵکوو حەیران بیژێنی

هەی ماڵە بابم مەشکێ
هەی حەمر و چاوم مەشکێ

*****

مەشکەم دەژێ بە چواران    لە سەر کانیە "جانداران"

ڕۆنی دەگرین بە باران    لە بۆ پاییزەهەواران

هەی ماڵە بابم مەشکێ

هەی حەمر و چاوم مەشکێ

*****

مەشکەم دەژێ بە سێیان    دەگەڵ زەردەبەهێیان

دۆ و ڕۆنی فەقێیان

هەی ماڵە بابم مەشکێ

هەی حەمر و چاوم مەشکێ

*****

مەشکەم مەشکەی گامێشی    هەوارمان لە "گاگەش" ی

لە بەر ڕۆنی دەقەڵشی

هەی ماڵە بابم مەشکێ

هەی حەمر و چاوم مەشکێ

*****

مەشکەم مەشکەی مانگایە    لۆلۆب لە دار خورمایە

هەوارمان "گۆڕ مووسایە"

هەی ماڵە بابم مەشکێ

هەی حەمر و چاوم مەشکێ

*****

مەشکەم مەشکەی چوێشتیرێ    هەوار لە "دۆڵەسیر"ێ

شیر کەمە و ڕۆن ناگیرێ    بابانت بە قوڕێ گیرێ

هەی ماڵە بابم مەشکێ

هەی حەمر و چاوم مەشکێ

*****

مەشکەم مەشکەی گوێرەکان    هەڵم بەست لە سێپەکان

بە کەف و ڕۆن دامتەکان

هەی ماڵە بابم مەشکێ

هەی حەمر و چاوم مەشکێ

*****

مـــەشــــکەم دەژێ بـــە کـــوڕان    بـــە ئـــاوی چـــۆم و لاخـــڕان
شـــۆڕکابانی "کـــەڵهـــوڕ"ان

هـــەی ماڵـــە بـــابم مـــەشـــکێ
هەی حەمر و چاوم مەشکێ

*****

مـەشـکەم مـەشـکەی نێـرەگـای    هـەوار لـە نـواڵێ "شـێخ خـەزا"ی
دەست لە مـن قـەوەت لـە خـودای    ڕۆن لـــە بـــۆ فـــەقـــێ و مـــەلای
هـــەی ماڵـــە بـــابم مـــەشـــکێ
هەی حەمر و چاوم مەشکێ

*****

مـەشـکەم مـەشـکەی بزنـەکـوێرێ    مـــەڕ گـــەیـــشتە ســـەر بێـــرێ
کابـــان دەکـــا هـــاوێرێ

هـــەی ماڵـــە بـــابم مـــەشـــکێ
هەی حەمر و چاوم مەشکێ

*****

ئـەو سـاڵ دەچمـە "پیـر خـدر"ی    خودایـە مـەڕمـان لـێ نـەمـری
کابـــان کیـــژێ "کاخـــدر"ی

هـــەی ماڵـــە بـــابم مـــەشـــکێ
هەی حەمر و چاوم مەشکێ

*****

حێلـــی "مـــرۆت" و "ئامـــان"ێ    ســـەرکـــەوت بـــۆ کوێـــستانێ
کـــەوتنـــە بـــەزم و دیلانـــێ

هـــەی ماڵـــە بـــابم مـــەشـــکێ
هەی حەمر و چاوم مەشکێ

*****

حێلـــــی "گـــــەورک" و "زەرزا"    لـــە "ســـامرەنـــد"ێ هـــەڵیانـــدا
بێـــری ســـاچاغەی لێـــدا

هـــەی ماڵـــە بـــابم مـــەشـــکێ

هەی حەمر و چاوم مەشکێ

*****

بێـــــری کابـــــانی مـــــاڵان هاتـــــه دەرکـــــی ڕەشـــــماڵان

لاوی گـــــرتن بـــــه تـــــاڵان

هـــەی ماڵـــه بـــابم مـــەشـــکێ

هەی حەمر و چاوم مەشکێ

*****

ماڵـــه بـــابم مـــەشـــکەســـوور گـــوڕمم لێـــدای دووربـــەدوور

ڕۆنـــم بـــۆ خـــاڵ و خـــەزوور

هـــەی ماڵـــه بـــابم مـــەشـــکێ

هەی حەمر و چاوم مەشکێ

*****

ئـــەوڕۆ مـــەشـــکەی دەژێـــنم بـــەخـــۆم نییـــه دەنـــگ هـــەڵـدێنم

دەســت دە چـەڵـەی وەردێـنم

هـــەی ماڵـــه بـــابم مـــەشـــکێ

هەی حەمر و چاوم مەشکێ

*****

"لاجـــان"م پـــڕ لـــه خوێیـــه مـــاڵم لـــەو ســـەری دێیـــه

خـەسـووم فاتمـه کـەوچێیـه

هـــەی ماڵـــه بـــابم مـــەشـــکێ

هەی حەمر و چاوم مەشکێ

*****

(زبێدە ئەحمەدی)

مـــەشـــکەســـووری هانـــت بـــێ مـــەلـــەک بـــه قوربانـــت بـــێ

شـێخ مـحـەمـمـەد[1] بـه میوانـت بێ حەوت پووت بـەره مـەشـکەت بێ

---

١. شێخ محەممەد شەمسیبورهان کوڕی شێخ وسووی بورهان.

هـەی ماڵـە بـابم مـەشـکێ

✽✽✽✽✽

مـەشـکەی دەژێـنم لـە بڵینـدی لــە دەرکـی دەوڵــەمــەنـدی
بـۆ شـێخی بـازی بـەنـدی
هـەی ماڵـە بـابم مـەشـکێ

✽✽✽✽✽

مـەشـکەسـووری حـەلاڵــی لــە بــەر بایــە شــەمــاڵی
حـەک لـەبـەر ڕۆنـێ بنـاڵی
هـەی ماڵـە بـابم مـەشـکێ

✽✽✽✽✽

مـەشـکەی دەژێـنم بـە چـواران بـە خـۆم و بـە هـۆرەی گـواران
هـەی ماڵـە بـابم مـەشـکێ

✽✽✽✽✽

(حەلیمە شەریفی)

مـەشـکەم مـەشـکەی نێروڵــێ ئــاوی کانیــە ســـندۆڵێ
ڕۆنــی خۆشــە بــۆ بـابۆڵێ

✽✽✽✽✽

مـەشـکەمـان مـەشـکەی مامری چیغمــان لــە گــوێی چـادری
میـــــوان، "عبــــدالقادر"ێ هـــەر چـــی دێ و ڕادەبـــری
دەسـت بـە مـەشـکەی نـاگری نێــو داری دە خـــۆی بـــڕی

✽✽✽✽✽

مـەشـکەم مـەشـکەی بزنــێ حـەوت کـەسـم بـردە کنــێ
گـەلـێکم لــێ خـواردنێ

✽✽✽✽✽

ئـــاوی کانیـــە کیـــژان ڕێواسـی کـەنـدی و مـەنـدان
ئەوە "خـەجـیج" هاتـەوە لـە کوێستانی "سـامرەند"ان

✽✽✽✽✽

(خەدیجە مەلائەحمەدی)

مـــەشـکەسـوورەم هانییــە لــە ســەر بــەردی پانییــە
کابـــان بـــە قوربانییـــە

هەی ماڵە بابم مەشکێ

*****

مەشکە مەشکەی زۆروەپان     کەوتۆتە "جانەمەڕان"

هەی ماڵە بابم مەشکێ

*****

(زارا کەوانی)

مەشکەم مەشکەی بامەران     هەڵیان داون لە سەران

تێیکەن ئاوی "دێبەران"

*****

مەشکەم مەشکەی مانگاقوڵە     ئەو شوەی کردم نابەدڵە

پێم ناقایلە، خەرتەتووڵە

*****

مەشکەم مەشکەی مانگایە     نێو دارەکەی خورمایە

بێری دایکەکەت بمرێ     جا خەسووت بێحەیایە

*****

بار دەکەم بۆ "جانداران"     ڕۆنی دەگرین بە باران

ئەی بۆ پاییزەهەواران

*****

بار دەکەین بۆ "پیر خدر"ی     خودایە مەڕمان لێ نەمری

کابان زەینێ هەڵناگری

*****

مەشکەم مەشکەی مانگایە     دەیژێنم لە بێڵایە

لۆلۆب لە دارخورمایە     شەقڵان لێدە لە بەغدایە

*****

چەندم کرد مەشکەژێنی     سەرم بوو تەپڵەگوێنی

هەی گوڵە حەمرت نەمێنی     نەتزانی بمحەملێنی

*****

بەری ماڵان شین دەچێ     سەری ماڵان شین دەچێ

ئەگەر کاکم پێیدا دەچێ     لە بەر گوڵان دەرناچێ

*****

ئەو دۆڵەم چەند تاریکە     ئەو ڕێیەم چەند باریکە

گەنم و جۆی لێ فەریکە    کاکم لەوێ خەریکە

*****

چیغمان لە ڕووی چادری    ئەو ساڵ دەچییە "پیرخدر"ی

خوایە مەڕمان لێ نەمری    کابان ڕۆنی زۆر بگری

کاکم ژنێ هەڵبگری

*****

مەشکەم مەشکەی گامێشێ    ئاوی "سیروان" دەکێشێ

شان و باسکم زۆر دێشێ    لە خودای دەکەم تەڵەبێ

لە بەر ڕۆنی بقەڵشێ

*****

مەشکەم مەشکەی گیسکۆڵێ    ئاو لە خڕان بێ و لە دۆڵێ

کاکم هەڵگرێ زەردۆڵێ    بۆخۆم دەچم لە تۆڵێ

*****

بەری مەشکەم هەورازە    پێشی مەشکەم هەورازە

بە کلیل و دەروازە    ئەو ساڵ کاکم ژنخوازە

هەی ماڵە بابم مەشکێ

هەی دایک و خوشکم مەشکێ

*****

لە بەر بای بەنێ بام    لە بەر تۆزی شەنەی بام

بووکی خدری بۆرە بام

*****

مەشکەسوورە وا نابێ    دایک و خوشکم وا نابێ

پێستی ڕۆنێم پڕ نابێ    خەسووم لێم ڕازی نابێ

*****

(مریەم نمەکی)

زاری مەشکەم شیلانە    بەری بە گوڵ و ڕیحانە

هەی ماڵە بابم مەشکێ

*****

کابانی کاکە سوارە    ئاغاژن زۆر لەبارە

(پوور حوسنی)

مەشکەی دەژێنم ماڵم دەچێتە "ئێرخاسان"      ئێمە ڕۆنی دەگرین بە تاسان

دەیبەین بۆ نێو هەباسان

*****

مەشکەی دەژێنم لە "جانداران"      ڕۆنی دەگرم بە باران

دەیبەم لەبۆ شاران

*****

مەشکەم نازێ بەیانە      ڕۆنی دەگرم بەو جوانە

دەینێرم بۆ شارانە      تاقەکورەکەم میوانە

*****

مەشکەی دەژێنم لە کوێستانە      نێو دەستی من تێوسانە

مەوتەنم "غەڵیفان" ە      جێگای پیر و لاوانە

*****

(ڕابی حەسەنزادە)

چەندم کردووە مەشکەژێنی      سەرم بۆتە تەپڵەگوێنی

زەحمەت نەبێ پێم نامێنی

*****

مەشکەم مەشکەی مانگایە      هەوارم "گۆڕ مووسا"یە

*****

(سەیزادە زارا پیزی)

ئەو دۆڵەم نا ئەو دۆڵەم      ئەو دۆڵەم نا ئەو دۆڵەم

ئەو دۆڵەم زۆر تاریکە      گەنمە جۆی لێ فەریکە

کاکی خۆم قەدباریکە

*****

سەری مەشکەم هەورازە      بنی مەشکەم هەورازە

کاکی خۆم ژنخوازە      بە کلیل و دەرِوازە

(نازێ تازەیی)

مەشکەم مەشکەی مانگایە      لۆلۆب لە دارخورمایە

نێودار لە چڵەبیزایە      ئەورۆ دەنگی چاک نایە

کابان شەم و زارایە      بە پووتی ڕۆن تێدایە

ئەویش خەرجی ئاغایە

ئەی ماڵە بابم مەشکێ

*****

مەشکەم مەشکەی مانگا قوڵێ      لە بەری دەکەم زەنگوڵێ
رۆنی دەچتە "مووسڵ"ێ
ئەی ماڵە بابم مەشکێ

*****

مەشکەم مەشکەی "گاوەیس"ی      لە بێڵایەم هەڵبەستی
خودا کەم دەوڵەت ڕاوەستی      کابان دەبەر داوەستی
رۆنی دەگرم پڕی پێستی
ئەی ماڵە بابم مەشکێ

*****

رۆنی دەگرم بە باران      "خدر"* دەیبا بۆ شاران
بۆم دا بە دەرزی و گواران

*****

دەرزی و گوارەم بۆ دێنی      ئاوریشمم لە بۆ دێنی
بۆ گوریس و زاربێنی
ئەی ماڵە بابم مەشکێ

*****

مەشکەم مەشکێ بەرانی      دەیژێنم لە سەربانی
تێیکەم ئاوی سەرخانی      بۆخۆم خوارزایێ خانی
هێندی قفکەی گۆچانی      هێندەی دووگەی بەرانی
هێندەی سەری شوانی      هێندەی ڕۆن بێتە گیانی
کوڕەکان بیخۆن بە نانی      دەگەڵ هەر سێک خاڵانی
یا خودا بیبێ بە گیانی
ئەی ماڵە بابم مەشکێ

*****

مەشکەسووری هانت بێ      لە سەر بەردەپانت بێ
سەیزادە کابانت بێ      شای حەکیم میوانت بێ
خەسووم بە قوربانت بێ
ئەی ماڵە بابم مەشکێ

*****

سێوەسوور و سێو هەرمێ      خەسووڵەم سەر دە قوڕێ نێ

---

* خدر ناوی مێردی "پوورە نازێ"یە.

بە چوار شەوێم دەنوێنێ پارشێوێم هەڵدەستێنێ
ئاوی مەشکەم پێ دێنێ بۆ مەشکەم پێ دەژێنێ؟
ئەی ماڵە بابم مەشکێ
هەی حەمر و چاوم مەشکێ

❊❊❊❊❊

مەشکەم مەشکێ نێرەگای لەو لای دۆڵی "شێخە زا"ی
دەستم بەرەکەتێ خوڵای
ئەی ماڵە بابم مەشکێ
ئەی حەمر و چاوم مەشکێ

❊❊❊❊❊

مەشکەم مەشکەی چیچانێ نێودار لە چڵەڕیحانێ
"برایم"* مەردی مەیدانێ "محەممەد" شێری لە لانێ
"برایم" پیاوی دیوانێ "حەلی"م سواری تارانێ

❊❊❊❊❊

"حەوڵا"م میرزای تەورێزێ مەیتی نەکەوێ لە ڕێزێ
لە بن گەڵای دە گوێزێ
ئەی ماڵە بابم مەشکێ

❊❊❊❊❊

مەشکەسووری وا نابێ بە دوو شەقڵان چا نابێ
ڕۆنی لێ پەیدا نابێ کاروانم بۆ ساز نابێ
خەسووم لێم قاییل نابێ
ئەی ماڵە بابم مەشکێ

❊❊❊❊❊

مەشکەم هاڕەی لە گەوەی دێ ئەو باسکەم لە گەوەی دێ
بۆنی گوڵانی لێدێ ئەورۆ "برایم" پێیدا دێ

❊❊❊❊❊

"برایم" دێتەوە ماڵان دەگەڵ دۆست و دەڵاڵان
بۆی ڕاست دەکەن چاوکاڵان
ئەی ماڵە بابم مەشکێ

❊❊❊❊❊

---

* برایم، محەممەد، ئەسمەر و نازدار ناوی منداڵەکانی "پوورە نازێ"ن.

بۆ نازێ مەشکەسوورە؟ ... لە گوریسایێ وەک کوورە
لە عالەمێ مەشهوورە ... کابانێ بسکی سوورە
حەیفی کردووە و لێم دوورە
هەی ماڵە بابی من بێ ... هەی حەمر و چاوی من بێ

*****

مەشکەم مەشکەی گیسکۆڵێ ... بزن دەخوا گیای دۆڵێ
ڕووتەپووتەی دە دۆڵێ ... "برایم" هەڵگرێ زەردۆڵێ
"ئەسمەر"ێ دەدەم لە تۆڵێ
هەی ماڵە بابی من بێ ... هەی حەمرو چاوی من بێ

*****

مەشکەم بزێ هەژاوە ... وە کەف و ڕۆن گەڕاوە
"نازدار"ی لێ تۆراوە
هەی ماڵە بابی من بێ ... هەی حەمر و چاوی من بێ

*****

مەشکەسوورەی هەژارم ... ڕەنگزەرد و لێوبەبارم
بە پووت ڕۆن قەرزدارم
هەی ماڵە بابی من بێ ... هەی حەمر و چاوی من بێ

*****

مەشکە سوورێ حەی حەیە ... چەندم دێنی و دەبەیە
خەڵکم پێ خۆش دەکەیە ... نان و ڕۆنم نادەیە
لە کارانم دەکەیە
هەی ماڵە بابی من بێ ... هەی حەمر و چاوی من بێ

*****

(مەناف عەبدوڵڵازادە)

بێری مەشکەی دەژێنێ ... لێم کەوتۆتە کوڵێنێ
کوا "ئەستی" ئاوێ دێنێ ... مەشکەم زۆری دەردێنێ

هەی مەشکێ مەشکێ مەشکێ ... هەی ماڵە بابم مەشکێ
هەتیوە دەست مەبزێوە ... با، بازنەکانم نەشکێ

مەشکەم لە دارهەنارە ... بێری دەسرۆکەی لارە
دایدا ڕێژنەی بارانە ... ئەوەڵ مانگی بەهارە

هەی مەشکێ مەشکێ مەشکێ — هەی ماڵە بابم مەشکێ
هەتیوە دەست مەبزێوە — با، بازنەکانم نەشکێ

مەشکەم زێڕی نێو دارە — هەڵمئاوەسی خوارە
شۆڕەسوارم لێ دیار بێ — رووی مەشکەم بە بارە

هەی مەشکێ مەشکێ مەشکێ — هەی ماڵە بابم مەشکێ
هەتیوە دەست مەبزێوە — با، بازنەکانم نەشکێ

مەشکەم گەلێک نازدارە — "زاوا ماتێم" لێ دیارە
بەیانییە، کەمێک تارە — بۆیە ئەستۆنگ کەمێک سوارە

هەی مەشکێ مەشکێ مەشکێ — هەی ماڵە بابم مەشکێ
هەتیوە دەست مەبزێوە — با، بازنەکانم نەشکێ

مەشکەم مەشکەی مانگایە — مەشکەم زۆری تێدایە
بێر، قۆچاغەی دەبەر کرد — دەیژێنێ لە بەر بێڵایە

هەی مەشکێ مەشکێ مەشکێ — هەی ماڵە بابم مەشکێ
هەتیوە دەست مەبزێوە — با، بازنەکانم نەشکێ

وا کەوتوومە بەیانێ — مەشکەم نایەتێ ژانێ
دەرکەن مەڕ و بەرانێ

هەی مەشکێ مەشکێ مەشکێ — هەی ماڵە بابم مەشکێ
هەتیوە دەست مەبزێوە — با، بازنەکانم نەشکێ

مەشکەم مەشکەی مەڕانە — مەبەستی من بزانە
ئەی هەتیوەی زۆرزانە — دەبڕۆ ئەوە بەیانە

هەی مەشکێ مەشکێ مەشکێ — هەی ماڵە بابم مەشکێ
هەتیوە دەست مەبزێوە — با، بازنەکانم نەشکێ

مەشکەم نێوداری گوێزە — لەو گەنجەی چەند بزۆزە
بە جوانی پێم دادە — مەشکەم بۆ بڵێ بە سۆزە

هەی مەشکێ مەشکێ مەشکێ — هەی ماڵە بابم مەشکێ
هەتیوە دەست مەبزێوە — با، بازنەکانم نەشکێ

خەسووم حەمری نەمێنی — لە هەیوانێم دەنوێنی
ئاوی مەشکەم پێ دێنی — سەرم بۆ تەپڵە گوێنی

هەی مەشکێ مەشکێ مەشکێ — هەی ماڵە بابم مەشکێ
هەتیوە دەست مەبزێوە — با، بازنەکانم نەشکێ

مەشکەم مەشکەی گاپەشی — هەڵیاندا لە "گاگەش"ی
لە بەر ڕۆنی دەقەڵشی

هەی مەشکێ مەشکێ مەشکێ — هەی ماڵە بابم مەشکێ
هەتیوە دەست مەبزێوە — با، بازنەکانم نەشکێ

مەشکەم مەشکەی بەرانێ — هەڵیان دا لە کوێستانێ
هاوار دەکەم خودایە — مەشکەم نایەتە ژانێ

هەی مەشکێ مەشکێ مەشکێ — هەی ماڵە بابم مەشکێ
هەتیوە دەست مەبزێوە — با، بازنەکانم نەشکێ

## لایەلایە

شەمێ کاوڵانی
ئەرێ لای لای لای کۆرپەکەم لای لایە
ئەوە لانکۆڵێ خۆم دادەنێم لە سەربانێ لای لایە
ئەمن ڕووی دەکەمەوە دە شەماڵێ، پشتی دەکەمەوە دە زریانێ، ڕۆڵە لای لایە
ئەرێ کۆرپەڵە لای لای لای (لا ئیلاه ئیلەڵڵا)یە
ئەمن شتێکم لە بن سەری دانایە،
ڕۆڵە لە بن سێبەرت بحەسێمەوە، لای لای لایە
ئەرێ ڕۆڵە لای لای لای لایە.
❊❊❊❊❊❊

وەرە لای وەرە لای وەرە لای
دایکەکەی دایکم لای
بۆ خەوت نایی بابی دایی
لای لای لای
کۆرپەی نەخشینم لای لای
ڕۆڵەی شیرینم لای لای
هێزی ئەوینم لای لای
کۆرپە جوانەکەم لای لای
وەرە دە لای وەرە دە لای وەرە لای
خۆزگە بە مەلان هەر شەو لە شاخێ
نەک بە دەستی خۆم دایکەکەی دایکم لای لای هەتا دەمرم هەر ئاخ و داخێ
وەرە دە لای وەرە دە لای وەرە لای
بە وێنەی مەجنوون وێڵی کێوان خۆم
ڕۆڵە لای ڕۆڵە برام لای
بۆ خەوت نایە بابی دایی
ئازیز بە مەرگت گرانە دەردم
کاتێک بژنەوە دایکەکەی دایکم ئاوا من مردم
لایە لایەت بۆ دەکەم بە حەڤدە مندالێ کۆ
یا خودا هیچ کەسێ نەگرێ ڕۆڵە گیان نەدامێ و تینۆ
ئازیزە شیرینەکەی دایکی خۆت
وەرە دە لای وەرە دە لای
دایکەکەی دایکم دە لای لای
❊❊❊❊

ئەوە لانكێكت بۆ ساز دەكەم هەر لە داران ڕۆڵە هەر لە دارەكەی دە مێكووكێ،
ئەوە وەستا و شاگردانت بۆ دێنم لە شارەكەی دە كەركووكێ،
وەرە لایی وەرە لایی وەرە (لا ئیلاه ئیلەڵڵا)یە
دایكۆڵێت هیچی لە دەست نایە

*****

(نازێ تازەیی)

ئەڵڵا ڵا ڵا ڵا لا، ڕۆڵە لایی لایی لایی لایی بابە دایە
لایی لایی (لا ئیلاه ئیلەڵڵا)یە
ڕۆڵە بەو محەممەدەی كەم نییە غەمم لەوێ دنیایە
هەر چەندی دەكەم و دەكرێنم بەرخۆڵەی من، بەرخە چووكەڵەی من بە شتەقە فێڵی دنیایە خەو نایە

ئەمن لانكۆڵەی كۆرپەڵە چووكەڵەی خۆم ڕادەژێنم
نێوی خوڵا و ڕەسووی دە بەحەققی دەگەڵ دێنم
ئیشاڵڵا خودای دەگەڵ بێ بەرخۆڵەی خۆم، بەرخە چووكەڵەی خۆم، بە نازێ دایە بە ئی بابی لەو لانكەڵەی دەردێنم

ئەرێ ڕۆڵە لایی لایی لایی لایی لایی لایی لەو ڕێم
دە ڕۆڵە بەرخۆڵەی خۆم، بەرخە چووكەڵەی خۆم دێخەمەوە لە وان سەر و سمێڵان بابی دایە
ئەگەر هێستا نەبوون گۆزان گرێ

ئەرێ ڕۆڵە لایی لایی لایی لایی لایی لایی، بابی دایە
لایی لایی لایی (لا ئیلاه ئیلەڵڵا)یە

ئەرێ ڕۆڵە، ڕۆڵە بەو محەممەدەی كەم نییە غەمم لەوێ دنیایە
هەر چەندی دەكەم و دەكرێنم، بەرخۆڵەی من بەرخۆڵە چووكەڵەی من بە شتەقە فێڵی دنیایە خەو نایە

بابی دایە، لایی لایی لایی لایی هەر لایی لایی دە لانكێ
ئەرێ ڕۆڵە، ڕەببی بەرخۆڵەی من، بەرخە چووكەڵەی من نەخنكێ
هەتا ئەو ڕۆژەی نەبێتەوە بابی دە لانكێ

ئەرێ ڕۆڵە لایی لایی لایی (لا ئیلاه ئیلەڵڵا)یە
بابی دایە (لا ئیلاه ئیلەڵڵا)یە

ئەمن لانكەی كۆرپە چووكەڵەی خۆم ڕادەژێنم لە سەربانی
بە سەر ئەو كۆرپە چووكەڵەی خۆم هەڵدەكێشم گۆشەكلیلەی دە كەتانی

ئەرێ بەرخۆڵەی خۆم، بەرخە چووکەڵەی خۆم دێخمەوە لە سواران، بابی دایە خۆ، هەر لە سواری "ئاڕەحمان سووڵتانی"

ئەرێ ڕۆڵە لایی لایی لایی (لا ئیلاە ئیلەڵڵا)یە
بابی دایە (لا ئیلاە ئیلەڵڵا)یە

ئەرێ ڕۆڵە بەو محەممەدەی کەم نییە غەمم لەوێ دنیایە
ئەگەر بە شەو و ڕۆژ دەکاتەوە عیبادەتی خودایە

بابی دایە خۆم لایی لایی لایی لایی
ئەمن لانکێ کۆرپە چووکەڵەی خۆم ڕادەژێنم لە مێرگان بابی دایە خۆ لە مێرگەی دە شینە
ئەرێ ڕۆڵە ئەمن لانکێ بۆ کۆرپە چووکەڵەی خۆم دروست دەکەم لە دەسران بابی دایە خۆ، من لە دەسرۆکەی دە هەورینە
ئەرێ ئەوە باوەشێنێ لە لانکێ کۆرپە چووکەڵەی خۆم دەکەم بە دەسران، بابی دایە، هەر بە دەسرەی دە دەسرە پۆشینە

لایی لایی لایی لایی لایی بەرخۆڵەم لایی لایی لایی لە لانکێ بابی دایە،

ئەرێ ڕۆڵە بابی دایە خۆ، ئەمن چەندم پێخۆشە بچمەوە بن سێبەری دە بییان،
بابی دایە ئی ئەوان دە شەنگە بییان
ئەرێ بابی دایە خۆ چەندم پێخۆشە حەیتەحەیتی دە شوانان بابی دایە دەگەڵ نازەنازی دەوان بێرییان
ئەرێ ڕۆڵە ئەمن لانکۆڵێ کۆرپە چووکەڵەی خۆم دێخەمەوە لە سپیلکان
بابی دایە خۆم لە سپیلکەی دە سێ دەران بابی دایە هەر لە سپیلکۆڵێ دەوان سێ دەران ئەوان کانییان

ئەرێ ڕۆڵە لایی لایی لایی لایی، بابی دایە، لایی لایی لە لانکێ.

ئەرێ ڕۆڵە ئەمن لانکۆڵێ تۆ ڕادەژێنم لە بن داران بابی دایە خۆم لە بن سێبەری دارەگوێزێ،
دە ڕۆڵە بابی دایە ئەوە سەر لانێ لە بۆ کۆرپە چووکەڵەی خۆم دەکرم بابی دایە لە چیتی ئەرێ بابی دایە هەر لە چیتە شلەی تەورێزێ،

ئەرێ ڕۆڵە لایی لایی لایی لایی، بابی دایە، لایی لایی لە لانکێ.

ئەرێ ڕۆڵە با لە بن سەری تۆم ڕەشەڕیحانێکی دە ڕەش بێ
دە با لە بن سەری کۆرپە چووکەڵەی خۆم سوورەگوڵێکی دە سوور بێ
ئەرێ ڕۆڵە، ڕەببی دوژمن و نەتەوی دە خاڵ و بابی دە تۆم، بابی دایە خۆم، هەر لایەکیان لێ دە پەڵاسی دە ڕەش بێ
ئەرێ ڕۆڵە لایی لایی لایی لایی، بابی دایە، لایی لایی لە لانکێ.
ئەرێ ڕۆڵە بەرخۆڵێ خۆم لانکۆڵێ تۆ ڕادەژێنم،
ئەوە نێوی خودا و ڕەسووی دە بەحەقت دەگەڵ دێنم،
ئەوە بەرخۆڵەی خۆم بە لایی لایی هەر بە (لا ئیلاە ئیلەڵڵا)یە دەنوێنم.

# منداڵ لاواندنەوە

(فاتیمە عەبدوڵڵاپوور)

هـۆ کـوڕە نـان و هـۆ کـوڕە دۆ
بـەرغـەڵ بـاژۆێ، بـەرەو جـۆ
گـــوارەزێــــڕە دۆســــتی تــــۆ
شـــەکـــرەژنـــە دایکـــی تـــۆ
ڕەشـــەریحانـــە خـــاڵی تـــۆ
گـــوێبـــەگـــوارە پـــووری تـــۆ

❊❊❊❊❊

هـۆ کـوڕە نـان و هـۆ کـوڕە دۆ
بـەرغـەڵ بـاژۆێ، بـەرەو جـۆ
"مـــەراغـــە" مـــەیـــدانی تـــۆ
شـــۆڕەســـوارە بـــابی تـــۆ
شـــەکـــرەژنـــە دایکـــی تـــۆ
خودا بمکا بە قوربانی خاڵی تۆ
ئـــەمنـــی دا بـــە بـــابی تـــۆ

❊❊❊❊❊

کـەپـرێ دەکـا لـە "لکـبن"ێ
بـە خـۆی و بـە لینگـی ژنـێ
خوشکێ چاوت دەرێ مـەیە بنێ
دایـە چـاوت دەرێ مـەیـە بنـێ

[بۆ منداڵی کوڕ]:

حـــەوت ژنانیلـــەت بـــۆ دێـــنم
یـــەکیـــان تـــەشـــکی تـــەماشـــا
یـــەکیـــان دوختـــەری پادشـــا
یـــەکیـــان زەردی کـــولێنێ
یـــــەک ڕەشـــــی گـــــاوبێنێ
یەک چادر و چیغی ڕەنێو بێنێ
یـــەک هـــەر نـــانی بتـــەپێنـــێ
یـــەکیـــشیان شـــەنـــگوشـــۆخ
هـــەر ئـــەو کـــوڕەی بگـــەوزێنـــێ

❊❊❊❊❊

لـــە کـــێ بـــووە لـــە زۆران

لــه قــهنــدخــۆر و چــاخۆران
دایــک حــهســڵ و بــاب گــۆران

*****

(ئهو دوو دێڕه له زارا کهوانی)

بـــابی ڕۆســـتهمـــی زاڵـــه
دایکـــی مـــاینی حـــهداڵـــه

*****

(زبێده ئهحمهدی)

دهردت لــه خــۆم لــه مــامرم
لـــه داروبـــاری کـــهپـــرم
دهبـــهر نێـــوی دایکــت مــرم
بابــت نــهبــێ مــن دهمــرم

*****

چــهنــده جوانــه بــه تــهنــێ
دهتبــهنــه شــهڕی قۆشــهنــێ
دوژمــن کــوێر بــێ ناتگــهنــێ

*****

هــۆ کــوره کــورێنێ دهکــا
گــزرهی لــه گوێنیــه دهکــا
کــهپــرێ لــه شــاخی دهکــا
مــاڵێ بــۆ دایکــی دهکــا
دهڕوا بـــۆ نێـــو کوێـــستانان
بــۆ کــارگ و بــۆ کــوڕادان
کــوڕاده لـــه نێـــو خیزانـــه
ڕێـــواس لـــه نێـــو شـــاخانه
گللـــۆره لــه بــهر قــهدانــه
کیفـــۆک لـــه نـــهرمانـــه
لووشـــه لـــه چیمـــهنانـــه
سوێـــسنه لــه ســهر هــهدانــه
کــارگ لــه نێــو قــهیاغانــه
گێـــوژ لـــه مـــهزرایانـــه
شـــیلان لـــه نێـــو باخانـــه
کـــووزهڵـــه لــه نێــو چۆمانــه

*****

کورم گەورە کرد بە قەندی شاری　　ڕەزاشا بردی لە بۆ ئیجباری

*****

باغەوانی باغی پەڵت خۆم　　لانک ڕاژێنی کچی خەڵک خۆم

*****

(ئایشێ بەخشی)

نینوو نینوو نینکەڵە　　هەنگوین و ڕۆن تێکەڵە

ئەو کچە فێرە باغەڵە

*****

نینوو نینوو نیناوا　　دەینێم دە پای کەژاوا

بۆ کوڕی حاکمی ڕۆژئاوا

*****

کیر و گونەکەی بنێشتە　　لە کچۆڵانی دادەهێشتە

کچان برێکیان لێ دەچێشتە　　وایان دەزانی بنێشتە

*****

قەزات لە خۆم لە مامرم　　لە داروباری کەپرم

ئەتۆ نەبی من بمرم

*****

قەزات لە خۆم لە گشتم　　لە دەدانی ورد و درشتم

لە حەوت ماڵی دەور و پشتم

*****

(حەلیمە خەلیفە)

[مناڵ کاتێک شیری دایکی دەخوارد و نزگەرەی دەهاتێ]

نۆش، نۆش، نۆشت　　بستێک بالا و بستێک گۆشت

*****

"ڕەزا" جوانە لە تیشی　　لە پەلکی گوڵان دەنیشی

بۆ خۆی جوانە و خاڵیشی

*****

"ڕەزا" جوانە دە دێیدا　　چەکمەی سووری دە پێی دا

کچان دەیدزن دە جێیدا

*****

"ڕەزا" کەوی لانوالان    "ڕەزا" کۆتری لاپالان
"ڕەزا" جحێڵی ماڵە خالان

*****

بە قوربانت بم هەتیتە    وەکوو دایکەکەی دەچیتە

*****

(مەلا عەولا فاتحی)

لە کێ بووە لە خانان    بابی بەگی دیوانان
دایکی ورچی تەلانان

*****

لە کێ بووە لە شێران    لە بابی ئاڵ و وێران
دایک بیزای هەڵدێران

*****

لە کێ بووە لە زۆران    لە دمڕەش و خۆبۆران
دایک حەسڵە و باب گۆران

*****

لە کێ بووە لە خانی    یادگاری نێو دیوانی
دایک کیژی سۆرانی

*****

کوڕەسوورم کەوتە مێز    بابت تەتەری تەورێز
دایکت شازادەی بەڕێز

*****

لە کێ بووە لە قۆزی    لە کوڕی میری سەر هۆزی
دایکی جوانە و بە پۆزی

*****

لە کێ بووە لە جوانان    بابی لاوی سەربانان
دایکی گوڵی ناو ڕیحانان

*****

کوڕی دواڕۆژی عومرم    خۆزگە دیبام و نەمرم
بێیە باوەشی نەرمم

*****

لە کێ بووە لە ڕەندان    لە جاف و هەمەوەندان
دایک گەزووی نێو قەندان

*****

## حەیران

(ئیبراهیم ئەحمەدپوور ـ کارگ)

کیژێ ئەوە ڕاوکەران لە من ڕاوە، ئای چ ڕاوە؟

تووندیان دەکردنەوەی ڕکێفە و هەڵیان دەگاوتن لغاوە،

ڕاو لە "گەڵی عەلیبەگی" و نەوەڵا هەر لە پردێ ڕەواندزێ لە من دەبوونەوە بڵاوە بڵاوە،

ئەوە ڕاوی دە خەڵکی دە خەڵکان بە خودای لە دوای کار و کارمازان، کەروێشکان ناوەڵا ڕاوێ من لە دووی سوورەقورینگۆڵێی گەردن بەخوناوە.

❊❊❊❊❊

حەیران ئەوە لە کوێ لە هۆڵێ مەرزاوان نەوەڵڵا لە گەڵی شاسواری،

ئەوە گەواڵێکی دەهێنا بەری حاسمانێ بە خوای لە من ڕەشی تاری،

نەوەیە خۆشی کا نەوەیەش بباری،

ئەوە تەڕ دەکاتەوە مەغڵەت ومەغڵەتان، قەرەبێچک و قەرەبۆچکان، سەری سەفینێ، ڕەندۆڵێ زەرزەیان، گردی مەقسوودان هەڵا لە من کلکەی دارە بزماری،

بریا ئەوە ئەمن دوو دۆستم هەبان یەکیان لە بۆ سەر نەگەیبا ئەوی دیکەیانم برباوە هەواری،

ئەما خەرجئەستێن و باجئەستێنی دە ماچان بام لە کوێ؟ لە بەرەوبەری نەڵێنێ، لە بەری ئاڵۆتان لە مەمک قیتێ کەرکووکیان لە بە تاڵێ خۆشناوان لە خەزێمشۆرێ دە باڵەکان ناوەڵڵا هەموو ئێوارە و سبەینان نەرمنەرم سەبرسەبر وردەوردە ئای لە مێرگۆڵەی دە پاییزەهەواری.

❊❊❊❊❊

حەیران بۆم بڵێ بە خەزێمشۆڕی دە باڵەکان توو خواکەی با هەر دەگەڵ من دە یار بێ

ئەوە با سەری خۆم بۆ شۆڕ کا بەڵکوو کەلێنی دەربەندی بە قوڕێگیراوم لێڕا دیار بێ،

ئەوە من دەڵێم هەر کەسێکی ببێ بە باحیسی دوو دڵان ڕەببی هەر ژن هەڵگیراو بێ، هەر سەرشکاو بێ، هەر قوری سووتاو بێ، قەت خێر و خۆشیان لە خۆ نەبینێ کاکی خۆم هەتتا لە دنیای دە دیش هەر ئەزیەتکێش و ئامان بە خوای ڕەنج بەخەسار بێ.

❊❊❊❊❊

کیژێ وەرە لە کوێ؟ لە گۆڕاوان لە گۆڕاوان ئای لە گۆڕە دێمێ،

ئەمن دەڵێم گوارەت پیرۆز دەگەڵ خەزێمێ،

لە نەویانت بۆ دێم لە بڵێندانت دێمێ،

بە خودای دڵم نەدەهات لەبەر شەیتانان، شۆفاران دوو قسانت بگەیەنمێ،

ئەوە من سێ ماچم دەستاندن لە سەر ئەوێ ناسکێ حەیرانێ، یەکیان لە خەتوخاڵێ، یەکیان لە نێوان سینگ و مەمکان، ناوەڵڵا ئەوی دیکەم هەڵدەکێشیتەوە لە بەینی گوارە و خەزێمێ.

❊❊❊❊❊

ئەمن ئەوە دەڵێم براینە برادەرینە ئەستێرێک هەڵدێ لە من گزینگێ داوێ،

ئەمن دەڵێم کیژۆڵێ بچوو سەر ئەستێرەکەی چاوڕشتنێ، لە سەر بەختی منی ڕەبەن و ماڵ وێران تووخوڵاکەی سەبر برۆ هەر ورد شەقاوان باوێ،

ئەمن دەڵێم حەزی خۆ مەکەنەوە لە وان کیژانی مەمک نەهاتوو ئەگەر سبحەینان دەدەن قەولێ بە خودای لە ترسی دای و دە بابان هەر ئێوارێ دەگۆڕنەوە قەرارێ،

ئەوە حەزێ خۆ بکەنەوە لە دایکی کوڕی ئەگەر شەو لە شەوگاری دە شەوێدا لانکەی بە سەر گولەکەی دە گولەمێردانلدا بەجێ دێڵێ بەحام دچتەوە لە ژوانێ ئای لە شەوڕاوێ.

❊❊❊❊❊

ئەوە دەڵێم کاکی خۆم ئەمڕۆکە دە وەرە دەرێ لە بۆڵی ئەمان لە بۆڵان دزی،

جا ئەوە من دەمچەقاند ڕەشەڕیحانان، سوورگوڵ لە من سوور دەبوو لە سەر وارشی دە ڕەزی،
ئەمن دوو ماچم دەست قەرزە؛ یەکیان لە سەر "هومێدێ کاخدری" ئەوی دە دی لە سەر "ڕۆینازێ ئاغایێ بایزی"
*****
ئەوە دەڵێم کاکی خۆم شەرگە لە من شێواوە،
براینە برادرینە شەرگە لە من شێواوە،
ئەمن زەینێکی خۆم دەدا تەپکی نۆکەران، قەڵاتی شایی
ماینی شێ خەزاڵ لەوێ دەبەسراوە،
سینگی کچەتیوەحەیران بە من بمێنی بە جوانووماینی کاکەلاغای گەردی، سەرتۆپی حێل و غووربانان مەغموولی دێبۆکریان جا من بۆ خۆمم تاڵان و ماڵ دەگێڕاوە.
*****
ئەمن دەڵێم ئەو حەیفەی ئەمن دەکووژێ لە بۆ عەبدوڵڵاغای مەندەمەران هەموو پاییز و بەهاران لە من کەراسێکی مەرەز کەتان مەمکۆڵەی هەڵدێنێتەوە ژەنگێ،
بریا ئەمن خەرجئەستێن و باجئەستێنی ئەوان راموسانت بایەم ماڵخەراپ دەست دە تۆپی جانبێزاری دەوەرە دەرێ لاقم شل بوو ئای ئای لە پاش ئەوێ دیواری.
*****
ئەمن دەڵێم کاکی خۆم ئەمن لە مەیدانی مەنگوڕان وەسەر دەکەوتم بەرانبەر بە شینکەنە و سەرخانێ،
جا ئەوە کوڕ دەڵێ ئەمن مەمی برایم پاشای یەمەنێ نیم بە جوملەی حەوت ساڵان بمخەنەوە زیندانێ،
وا ئەمن سەربازی ماچانم لە وێ دەربەندی، لە حەمامی کۆیێ لە کاولێ قەنبەریان
ئەوڕۆ لە سەر پردی ڕەواندزی.
*****

(ئیبراهیم گوڵناز ـ کیتکە)

ئای های ئای کاکی خۆم
ئەوڕۆ بایی دێت شەماڵە،
کاکیلە لە سەرانم هەورە لە داوێنانم وردەساماڵە،
ئەوە کیژ دەڵێ کاکی خۆم ئەوە گولەکەی دە گولەمێردان لە ماڵ نییە بە خودای،
ئای ئامان کەلێن و بن بەتاڵە. *****
ئامان کیژۆڵێ ئەمن ئەوڕۆکانە نەخۆشم ناژیم بە ژینێ،
کێلانم بۆ بێنن لە کۆیێ،
تابووتان لە کاولەژەنگارێ،
ئەمان بەڵام شینم بۆ بکەنەوە بە پۆلی گەورەکچان ئامان لەوێ کاولێ دنیایێ،
ئامان بەڵام کیژۆڵێ کاکی خۆم ئەوە لە سەری مەزرایە،
کاکی خۆم ئەوە بارانێک دەبارێ،
بە خودای خوناوکە لە گیایە،
ئەوە مرادی کەس حاسڵ نەبێ کاکی خۆم،

ئەوە ئی من و بەژنەباریک پەنا وە غەوسەکەی ماڵ لە بەغدایە
❋❋❋❋❋
(محەممەد عەبدوڵڵازادە ـ مەحمەڵ)
ئای کیژێ لە خۆم غەریبێ بە خوای دڵ بە گەرداوێ،
کچەتیوەکەی حەیرانەکەم دەچیتە ماڵی گولەکەی دە گولەمێردان سبحەینان دەڕۆی، ئێواران بە بیانووی سەرئاوێ،
سەبر برۆ شەقاوان باوێ،
پەرچەمێ سوور بە سەر کوڵمەی ناسکتدا
سەت بریا خەرج ئەستێن و باج ئەستێنی ماچان بام لە سەر پردی ڕەواندزی بەرانبەر و پێشانپێش ئەمان بە تەنیا لە شەقڵاوێ.
حەیران دەنگێ قازێ قورینگێ دێ،
شەپۆلی بەژنیی دەدەمبەستۆڵێ،
بەژنی نازدارحەیرانێ بە من بمێنێت بە قورینگێ گەردن گۆزەڵێ،
بە وێ ئارەق گوڵ بەدەمێ،
بە وێ کەراس سندووسێ و توێلکێ ڕێواسێ،
هەموو پاییز و بەهاران شین دەبوو لە سەر قەبری حاجی مەمەندێ،
ئامان لە کەرکووکێ پیرەبێژاری.
❋❋❋❋❋
کیژێ بۆم بڵێ بە سەر سەفینێ ئامان با دەگەڵ من یار بێ،
سەرێ خۆم لە بۆ شۆڕە کا کەلێنی دەربەندی بە قوڕێگیراوم لێ دیار بێ،
کچەتیووحەیران ڕەببی هەرچی دوو دڵان لێک بکا ڕەببی ماڵە بابی ئاوری تێبەربێ بە هەموو نەوتی شاری کەرکووکێ،
بە هەموو گۆگردی شاری شنۆیە نەکووژێتەوە تەمەننا دەکەم لە خوداوەندی تەباڕەکتەعالا ئەمان ڕەنجبەخەسار بێ.
❋❋❋❋❋

(شەمێ محەممەدپوور)
وەرە حەیران کاکینە تەنگەنەفەسە، لە کێویان دێ،
ئەوە مەندۆک هەستا بابە ئامان بە خودای هەستا کوڕادێ،
ئەوە کیژێ دەڵێ بابە حەیران ئەوە ڕۆژێ سەت جار لە خۆم بێمرادێ.
❋❋❋❋❋
وەرە بابە ئەمرۆ زۆرم دە دڵی دایە کاکی دایە،
وەرە قەفار قەفارە کاکە قەفار قەفارە،
وەڵڵا ماڵە بابی من قەفار لە من بە تۆزە،
ئەوە خێڵەکەی کوڕەکەی من لێی نایدا بەرەو ماڵ ئامان بە خودای گەلێک بە دان و هۆزە. ❋❋❋❋❋
وەرە حەیران لە چیایان بە قاللۆران،
وەرە کیژۆڵێحەیران خۆ خوێنی ژنێ بە مێرد هێندە زۆر نییە
ئەمن نازانم بۆ هێندە بەزەحمەتە لە کن ئەوێ تەرەسێ تەرەس بابێ،
ئەوە کیژ دەڵێ ئەمن ڕۆژێ بیست و پێنج جەلان لە ماڵە بابی کوڕەحەیرانێ وەژوور دەکەوتمەوە بە بۆنەی حاجەتێ.
❋❋❋❋❋

وەرە کیژۆڵێ بۆخۆم پیرم بە خودای دڵ پیر نابێ،
ئەوە لە کوێستانان بابی دایە بە خودای مەندۆک شین نابێ
ئەوە کیژ دەڵێ بە خودای مەقسوودێ من و کوڕەحەیرانی بە خودای بە زەحمەت حاسڵ دەبێ.

*****

(ڕەسووڵ ڕەسووڵخەزاڵ ـ خاتوونباغ)
حەیران دەڵێم دونیا بە خەمان پێک نایە
ئەوە باران دەبارێ خوناوە لە گیایە
مرادی هەموو دۆست و برادەرانم حاسڵ بوو
ئامان هی من و تۆ هەر پەنامان بە غەوسەکەی ماڵ لە بەغدایە .

*****

کاکی خۆم ئەوە هەورێکی ڕەش دێنێ گەواڵان دەکاتەوە بە تاری
تەڕ دەکا مەغڵەت و مەغڵەتان، زینوێ قەرەبۆتان، گردە سوورێ سەفینی، ناوەڵڵا کلکەکەی دارەبزماری
چەند خۆشە دۆستێکی بە بەقا و بە بنیادی بێ سەر لە سەر سەرینێ و چاو دە شیرنخەوێدا ئامان خودا بتداتێ هەر بە حەڵاڵی.

*****

ئەوە ئەوڕۆ کاکە، ئەمن ناچمەوە "دیانێ" بابە ناچمەوە "دیانێ"
"دیانێ" گوندی فەلانێ
ئەمن دەچمەوە شارەکەی قۆچێ "مووسڵ"ی
سەری بە قەیسەرییە، بنی بە دووکانێ
ئەوە لە خەڵکی شاییە، گۆوەندە، هی من و بەژنێ باریک دەبێتەوە بە دەستبەردانێ.

*****

(مەناف عەبدوڵڵازادە)
ئەوە دەڵێم بابە زەینێکی زۆمت بۆ دەکەمە قەندیلی مامەکۆیان سەریان بە چەلەنگە،
ئەوە لە لێوم غومارە لە دەدانم ژەنگە،
ئەمن دەمرم ئەوە سەر وەسیەت بن بۆم قەبری من هەڵقەننەوە لە بیراز کەردنێدا لێم مەکەنەوە تەنگە،
ئەوە بۆم بگێڕنەوە شینێ، بۆم لێدەنەوە هاوارێ، بانگێ، توو خواکەی هەر بڵێن زووە مەڵێن درەنگە،
ئەوە من مەیلی بەژنێ باریک و دوو چاوی بەڵەک، پارچەمێکی سوور نانێم هەتا حەزرەتی قابیزم نێیەتە سەرێ، چۆکم لە سەر سینگی دانەدا،
ڕووحی من نەکێشێ لە گیانی، بەڵام هەر لە ڕووانم نەبڕێ ڕەنگە.
سەربەندی حەیران [وردەقام]

ئــــەرێ چــــادر و چیــــغ و ڕەشـــماڵی هـــەڵیانـــدابوو
دوو کیـــژی قـــۆڵ بـــەبـــازن ســـەریـــان لـــێ وەدەر نـــابوو
دەســت دەبـــەم بـــۆ مـــەمکـــانی دەڵـــێ ســـەڵام لـــێ ڕابـــوو

*****

ئــەرێ نــەخــۆش و دەردەدارم ســینم گــەیــشتۆتە شێــستی
پــشتێند و دەســرەی هــەوری بــە شــل و ملــی دەبــەستی
ئــەو گوڵــە چۆنی ئــەمن کوشت بــە خرینگــەی بازنــەی دەستی

*****

## وردەقام

(قالەشین)

جـــا لـــە ســـابڵاغێ بـــەولاوە، قـــازی ئـــەمریکـــی داوە
دەوڵـــەمـــەنـدی وا هـــەیـــە ســـەت لیـــرەی بـــە ژن داوە
بـــۆ فـــەقیرێکـــی وەک مـــن بـــەوەی جـــەرگـــم بـــڕاوە
یـــەکـــی لـــووس و لـــەبـــارە وەســـتا لـــە ڕەنـــدەی داوە
لێـرەم ماچێـک لـێ دەسـتاند جـا "نـەڵـێن" دەنگـی دەداوە
قـەرەخرچـەی نێـو مـەنگـوڕان تـرش و شـیرن و پـڕ ئـاوە
خۆش بـوو حـەبسی ئـەبـەد بـم ئـای لـە سـەر ئـەو دوو چـاوە

******

هـــەی نـــازدار دە بڵـــێ نـــازدار ناســـکۆڵەی نـــازەنیـــنم
بـــەو پـــەنجانـــە بمـــشێلە بـــا ســـارێژ بێـــت بـــرینم
حـەوت سـالان پـێش تـۆ بمـرم یـا ڕەببـی مـەرگـت نـەبیـنم

*******

هـــەی نـــازدار حـــەمـــرم نـــازدار، قـــەدباریکـــەی شـــەدەلار
جا لـە سـەر ئـەو چاوە جوانت سـەت جـار تۆبـە و ئیستیغفار
هـەی دەبـەر ئـەو سـینگەت دەمـرم بۆتـە کوێـستانی سـازگار

کـــارگی لـــە نێـــو ڕێواســـی
دووڕی لـــە نێـــو ئـــەڵماســـی
تـــا دوێنـــێ یـــاری خـــۆم بـــوو
دیـــارە ئـــەورۆ نامناســـی

*******

(ئیبراهیم گوڵنان)

تـۆ دوور و مـن دوور بـەینێـک ببـەسـتین　　　به فرمێسکی چاو جۆگێک هـەڵبـەستین

*******

ئـــەو ڕێ باریکـــەی بـــە شـــاخانەوە　　　　با گوڵەکەی مێردت بمرێ بە داخانەوە

(مەحمەڵ)

لـە گـوڵان و گـوڵان لـە گـوڵی کـەنێـرێ　　　　بریـا سـووریاش بـام لـە سـەر هـەولێـري

لـە گوڵان و لـە گوڵان لـە گوڵی هێرۆیـە　　　　بریـا سـووریاش بـام لـە سـەر شـنۆیە

لە گوڵان و لە گوڵان لـە گوڵی وەنـەوشان　　　　بریـا سـووریاش بـام  لـە نێـو مامـەشان

لە گوڵان و لـە گوڵان لـە گوڵی یانتۆری　　　　بریـا سـووریاش بـام لـە نێـو مـەنگوڕی

لـە گـوڵان و لـە گـوڵان لـە گوڵـە ورکـان　　　　بریـا سـووریاش بـام لـە نێـو گـەورکـان

❊❊❊❊❊

خـــەمـــان بـــارم بـــۆ خێـــڵـئـــەســـمەرم　　　　ئاورێـــک بـــەربـــووە دە خـــار بـــارم

شـــــێوەت وەداری بــــــە بـــــــەرم

❊❊❊❊❊

ناڵبـــەنـد و ناڵبـــەنـد هـــەی ناڵبـــەندانـــە　　　　نـــــاڵان ببـــــڕن بزمـــــار پانــــــە

بیـــدەن لــــەو پێـــی کـــــەحلانـــــە

❊❊❊❊❊

کــــەراسڕەشـــی، ئـــای بـــە تـــەنـــێ　　　　کاڵـــە لـــە پـــێ، شـــیک پۆشـــەنـــێ

یـــــاری خۆمـــــە و نامـــــدەنــــێ

(زبێدە ئەحمەدی)

"چـۆم" و "چۆمـەڵان" ، "قۆپیـەبابـاڵی"　　　　ئـەو کچـە زۆر جوانـە، حـەیفـە منداڵی

سـێوی نـەگـەیـوی، هـەڵووچـەی کـاڵی

❊❊❊❊❊

یـــا خـــودا خودایـــە دەربـــەدەرم کـــەی　　　　یـا بـە نـەسیبی "شـا یۆسـف"*م کـەی

❊❊❊❊❊

---

* شا یۆسف: یۆسف شا لە بنەماڵەی شێخی بورهان بوو کە ماڵیان لە "ئاتابلاغ" بووە.

خـــودای لـــه بـــانی ســـه‌ری لـــه کـــه‌س نـــه‌گـــۆڕی حـــاڵان
یـــارێکم پـــه‌یـــدا کـــردووه بـــــــه دۆســـــــت و ده‌ڵاڵان

*****

(محه‌ممه‌د ڕه‌سووڵی ـ "خاڵه")

بـه‌و خاڵـــه‌ی لـــه ســـه‌ر ده‌مـــی کـــوردی یانـــه حـــه‌جـــه‌مـــی
ده‌زانـم تـۆش لـێم پـڕ غـه‌مـی ئـــاورت ده مـــن بـــه‌رداوه
خـه‌جـیج وا لـه "بـه‌یـره‌م"ی

*****

داســـــتانی قـــه‌ت مـــه‌ڕۆیـــه پـــــشتێنده‌کــــه‌ی لۆلۆیــــه
ئـــــاورت ده‌مـــــن بـــــه‌رداوه مـــه‌نـــیج لـــه "بـــه‌ره‌جـــۆ"یـــه

*****

هـــه‌نـــار و ســـێو و بـــه‌هـــێ ده‌ردت لـــه مـــاڵم خـــه‌جـــێ
توخـــــــــــودا زوو وه‌ره‌وه بـــا مـــرادی دڵ حاســـڵ بـــێ
ڕه‌ببـــی بـــه قوربانـــت بـــێ "بـــه‌ره‌جـــۆ" ده‌گـــه‌ڵ "میـــره‌دێ"

*****

کـــه‌وای بـــه‌ری مـــه‌خمـــه‌ره جـــوانی لـــه حـــه‌د بـــه‌ده‌ره
لـــه ســـه‌ر بـــه‌ژنـــێ باریکی دایمـــه شـــه‌ڕه‌خـــه‌نجـــه‌ره

*****

کــــه‌وی قاقــــانی چینــــه ئافــــــاتی ڕووی زه‌مینــــــه
چرکـــه‌چرکـــی مـــه‌مکـــی دێ وه‌ک ســــــاحاتی نوێژینــــــه
ڕه‌ببـــی ماڵیـــان خـــه‌را بـــێ دایـــان بـــه‌و کـــابرا شـــینه

*****

وردەقام (ئەو گۆرانیانەی کە زۆربەی هونەرمەندەکان لە کاتی شاییدا دەیانکوتەوە)

یـــه‌ک دووره یـــه‌ک جیرانـــه یـــه‌ک خزمـــه یـــه‌ک بێگانـــه
کامیـان مـاچ کـه‌م لـه‌و دووانـه کێهـه‌ی مـاچ کـه‌م لـه وانـه
شـه‌مـێ لـه "شـێوه‌مێـر"ێ زڵـــه‌خـــا لـــه "ســـێپه‌کـــان"ه

*****

هاتم لە لای "سێلەکە"        شەڕی بەران و شەکە
حاشام کرد لەوی گەورە        کوشتمی ئەوی چکۆڵەکە
دایکی دەڵەی حەدوودە        پانیەی دەڵەی مەزرەقە
جووری منداڵی ساوا        بۆی دروست دەکەم شەقشەقە

*****

نەخۆش و دەردەدارم        ئارامت بردم "فاتێ"
سەفەرێکم کەوتە بەر        ڕێیە هات و نەهاتێ
مونتەزیرم دەرێدا        کاروان بێت و بمگاتێ
یارم دەگەڵ کاروانیە        قەولە دوو ماچم داتێ

*****

پێ لەو پەردەی دامەنێ        ئاڵوداڵی ڕزیوە
کراسی پارچەی گوڵدار        لە سەر سینگی خزیوە
دەستم برد بۆ بەرۆکێی        دەیکووت وا مەکە هەتیوە
بە حومری بابی خۆم بووم        قەت جوانی وام نەدیوە
دەتوانێم سوێندێی بۆ بخۆم        دەگەڵ تەرزەی باریوە

*****

هاتە خوارێ بە پەلە        سەری لێبوو بە سەلە
تێی هەڵدەن دەو سەگبابەی        دەڵەی کەوڵەخەرتەلە

*****

هاتە خوارێ لە لێژی        دەڵەی برنووی درێژی
سەلای گەورەم لێ ڕابوارد        ئەو کچە جێیان دەرێژی

*****

## گۆرانی

(کاک جەعفەر، سنجاخ)

هەی لە گۆوەندان وەی لە گۆوەندان کیژ لە "قالوێ" و کوڕ لە "زەندان"
مەلەنگێ، مەلەنگێ، مەیلەنگێنە ئامینێ گوارەکانت مەلەنگێنە
چاوڕەشەی بابی سەر هەڵێنە

*******

### گادەران گادەران [گۆرانی مەجلیسی]

گـــــــادەران، گـــــــادەران
ڕێم نییە و لە بەر شەیتانان جێم نییە
کانەبیم دەڵێم بە خووشکێ
شۆرنەبیم دەڵێم بە خوشکێ
خان هەستا سەر چۆکێ
خەنجەر نابڕێ پەستۆکێ

******

### تەیری گەرمێنێ بە دەنگی قالەشین

هاتەوە بێتەوە تەیری گەرمێنێ ئێشتا دوورەو دەخوێنێ
تیژباڵی خۆی لێکدەدان حەیات، هەر بۆ چۆمەکەی "نەڵێن"ێ

یارەکەم کچە کرمانجە حەیات، دووسەت بەگزادەی دێنێ
خۆ دەمرم دەبەر ئەو تەیرەی نیشانەی بەهارێم بۆ دێنێ

هاتەوە تەیری گەرمێنێ، بەو دەڵێن "خاسەسییە"
سینگەکەت بەفری کوێستانان خۆ دەڵەی کارگی سپییە
سەبارەت بە تۆ نەبێ، کارم بەو وڵاتەی چییە؟

هاتەوە تەیری گەرمێنی گەرم چۆن بەو دەڵێن "چووڕەی ساوە"
هات گەیشتە سەری قەندیلی جا کرێوەی کرد و گەڕاوە
دەمرم لە بەر خاو و پەرچەمی جوانت سوارە و پیادە ڕۆناوە

هاتـــەوە تـــەیـــری گـــەرمێنـــی گـــەرم بـــەوەی دەڵـــێن "مـــراوی"
تیـــژ و تیژبـــاڵی خـــۆی لێکـــدەدان لـــە نێـــوانی هـــەور و ســـاوی
نـــەمزانـــی تـــەیـــری "ئـــالان"ێـــی، بـــە دەســـتی خـــەبـــەرێـــک شـــەمـــزاوی

*******

(محەممەد خەلیفە و عومەر سولەیمانی ـ ئافان)

کانییە مرادان

دەچمـە سـەر کانیـە مـرادان شـەرحـێ خـۆم دەکـەم تـەواوە
بـۆت بـە کوێـستانان هـەڵـدەڵـێم بـەفـری کۆنیـان لـێ مـاوە

لـە بـابی خـۆم زیـز دەبـووم، لـە خـەڵکی وایـە ئـەمـن گێـژم
هـیچ بریـنـان دە خـۆمدا شک نـابم  لـە خـۆڕا زووخـاو دەرێـژم

دەچمـە سـەر کانیـە مـرادان شـەرحـێ خـۆم دەکـەم تـەواوە
بـۆت بـە کوێـستانان هـەڵـدەڵـێم بـەفـری کۆنیـان لـێ مـاوە

بـۆت بـە کوێـستانان هـەڵـدەڵـێم ئـەو سـاڵ کوێـستان زنـوێرە
لـە سـەر تـاوان گـوڵ دەپـشکووت لـە دامێنـان کـەنێـرە

چـاوت ئـەسـتێرەی سـەر گـردی
بـــە منـــداڵیم گـــەورە کـــردی
بـۆ مـن نـەبـووی حـەتمـەن مـردی

دەچمـــە ســـەر کانیـــە مـــرادان شـــەرحـــێ دەکـــەم تـــەواوە
حـەوت سـاڵی تـەواوە عـەبـداڵم لـە دوای نـەمـامی سـاوە

چـــاوت ئـــەســـتێرەی حاســـمانێ
دەکـــەن گـــەرمـــێن و کوێـــستانێ
کوشـــتەی تـــۆم دونیـــا دەزانـــێ

# ڕووبابە

ئەم گۆرانییە یەکەم جار هونەرمەند "حوسێنشەشە" وتوویەتی و دواتر "قالەشین"، "مەناف عەبدوڵلازادە" و بەشێکیش "برایم قادری" گوتوویانەتەوە. دیارە کاک "سەلاح پایانیانی" لە کتێبە پڕ بایەخەکەیدا بە ناوی "کانی مرادان" ئەو گۆرانییەی نووسیوەتەوە، ئێمەش بە پێویستی دەزانین دیسان بیگونجێنین، هەڵبەت لە بەشی کۆتاییدا کە بە بەندی ١ تا ٣ دەستنیشانمان کردووە و ئەو بەشانەی نەنووسرابوونەوە، لە زمان هونەرمەند "مەناف عەبدوڵلازادە" و "برایم قادری" نووسیومانەتەوە و کاک سەلاح، بەندە سەرەتاییەکانی لە زمان "قالەشین"ەوە لە کتێبەکەیدا بڵاو کردۆتەوە.

چ دەبوو هەموو دەمان     دووبەدوو لێدەین قەدەمان
مەمکە شەریک بۆ غەمان     ئەشهەدوو "ڕووبابە" جوانە

شانسی کورد و عەجەمان

*****

بۆت دەڵێم گەلاگەلا     "غەڵیفان" و "قۆیتەڵ"ە
"دۆڵپەمۆ"یە و "مازەڵە"     "کێچاوا" و "گابازەڵە"
لووس و عانە و مەنگەڵە     ترکی و کوردیم تێکەڵە
سەرجە و دەرد و بەلا     لە سەر پیسەی وەخرِ بێ
لێکرا دەڵێین ئیشەڵلا     دەبێ دەستم زیارەت کەن

چونکین فێرەباغەڵە

*****

"زەنبیل"ە و "گەردیگلان"ە     "کۆکە"یە و "دەروێشان"ە
"شاگێلدی" و "لاسەگوڵان"ە     "گراوێ" نێ، "گلێنان"ە
"قۆیتەڵ" نێ، "غەڵیفان"ە     "ئامێد" دەگەڵ "ئافان"ە
"قۆزلوێ" و "قۆزلوان"ە     "زیندووقۆڵ" نێ، "گامێشان"ە
"کاولان" نێ، "کوران"ە     "سارکێ"یە و "زمزیران"ە
ناوەڵلا "دەشتێ پان"ە     "دۆڵەتوێ" و "پاراستان"ە
"سێونە"یە و "زەرگەتان"ە     "قوڵتە" نێ، "شیوەشان"ە
"سۆستان" و "ئالوەتان"ە     "بێکۆسە" و "گرشەیتان"ە
"هەنگەوێ" نێ، "شەختان"ە     "شەکراوێ" و "مام هەیبان"ە
"باستامبەگ" نێ، "بازرگان"ە     "شارستێن" و "حوجران"ە
"گاگەش" و "کیسەلان"ە     "بێهەنگوێن" و "بۆدوان"ە
"سەرتان" دەگەڵ "مەڕانە"     "زێوە" و "حاجیمامیان"ە
"بەیتاس" و "گیادروان"ە     "وزندەرێ" و "قەرەچەلان"ە
"کولیجە" نێ، "دەرمان"ە     "قەمتەرە" نێ، "برهان"ە

"سەدراباد " نیّ، "ئاشی گولّان"ە     ئەوچەل نۆرەی شارانە!
"تازەقەلاّ" و "بۆکان"ە     "تەوریّز" دەگەلّ "تاران"ە
"زەنگان" نیّ، "هەمەدان"ە     "سەقز" نیّ، "مەریوان"ە
"سابلاّغ" و "شنۆ" و "بانە"     ئەو ولاّتانە پاک گەڕام
هەر "رووبابە"م پیّ جوانە

❊❊❊❊❊

بە حوکمی شای "حرووس"ی     یەک پارچەم کاغەز نووسی
دەینێرم بۆ "ڕووبابە"ی     لە "رادانە"ی "سندووس"ی

"محالّ"ی کوولەکەخۆر     "شارویّران"ی وشترزۆر
لەو "گەورک"ی هەرزنخۆر     لەو "مەنگوڕ"ی کەشکخۆر
لە "مامەش"ی رەش و بۆر     "لێڕەوار"ی پەستەکبۆر
خۆ "مەلا مستەفا" نیم     لە گولەت بستێنم بە زۆر
دەبەر ئەو کەللەت دەمرم     لێی دەبەستی شەدەی مۆر

❊❊❊❊❊

بۆت مردم بەلّیّ "ڕووبابە"     بە دم و ددانی وردی
هەروەک قەندی "میاندواو"یّ     نەرمی و سپی و جێوەردی
خوا لە مەلای خۆش نەبیّ     بۆ بە سیغەی مارە کردي؟
چووم "ڕووبابە"م گێڕاوە     بۆ سەر مەزهەبی کوردی

هاتە خواریّ لە کێوی     تۆ زێڕی یانە زێوي؟
وە گولەی دەخەم شەپڕێوی     دەیدمیّ دەرمانڕێوی
جا ئەگەر ژیا، ئەگەر نەژیا     بە قەبری بابی خێوی
لە گۆڕی بابی گولەی بەم     حەپسی کردووی لە کێوی
بۆ حالّی من و تۆ دەگرین     کەروێشک و گورگ و ڕێوی

❊❊❊❊❊

دە وەرە وەرە "ڕووبابە"     گەردنشووشەی شەڕابە
چەند بە مەکر و دۆلاّبە     سەر زارەکی تۆ چلۆنی
بە دلّ دەگەلّم وا بە     ئەگەر وەک من نەسووتابی
سەرەوبن بە قوڕێم دابە

چەند عەیشونۆش و دەماغ | دووڕ و لەعل و شەوچراغ
یارم وەک ماینێ چەلاغ | سینگەکەت کاغەزپەرداغ
"کەپەکەند" و "قەرەبلاغ" | "حاجیخۆش" و "قیلیانتاغ"
"گابازڵە" و "قەرەداغ" | "بەردەمێش" و "خاتوونباغ"
"داربەسەر " و "پاشبلاغ" | "سەهەند" و "ماینبلاغ"
"شنۆ" و "سەردشت" و "سابلاغ" | وجاغدار و بێوجاغ
بۆو "ڕووبابە"ی گەردن زەرد | لێکرا هەمووی دەڵێن ئاخ!
ئەشەدوو "ڕووبابە" جوانە | ئەو کیژەی "قەرەپەپاغ"

*****

بۆت مردم بەڵێ "ڕووبابە" | بە دم و ددانی وردی
ئەگەر هاتی و ڕابردی | سیلەی چاوم لێکردی
چەند کافر بووی نەمردی! | خوا لە مەلای خۆش نەبێ
چۆن بە سیغەی مارە کردی | چووم "ڕووبابە"م گێراوە

بۆ سەر مەزهەبی کوردی

*****

١-

لە "لاجان"ێ "بەرکەمران" | لە "شنۆ"یە "حەسەننووران"
بە قوڕێ گیرێ "چیانان" | "بادام " و "بەردەڕەشان"
دەبێ لە خۆت ببەستم | تەرزی دەمانچەی "مێرگان"
خۆشە پێکەوە بکوڵێین | وەک لەپەی "بەری مێرگان"
شەقەت لە کوڵمەی دێنم | وەکو دەمانچەی "مێرگان"

****

بۆت مردم بەڵێ ڕووبابە | گەردنشووشەی شەڕابە
دوو دڵ وەک یەک نەسووتێن | سەراوبن بە قوڕێی دابە
سەرزارەکی تۆ چلۆنی | جا بە دڵ دەگەڵم وابە

٢-

"حاجیالیکەند"و "سونجاغ" | "بۆزە" دەگەڵ "خاتوونباغ"
"زگدڕاو" و "قەرەبلاغ" | "بەردەمێش" و "سیچانبلاغ"
پەڕەی لە دڵم هەڵدەکا | لێم بۆتە کاغەزپەرداغ
یارەکەم مێردی کردووە | لە سەر دڵی دانام داغ
شەرتە تاریفی جوانیت | بەرمە "بۆکان" و "سابلاغ"

ئــــاوری دە مـــــن بــــەرداوە "ڕووبابـــەی"ی قـــەرەپـــەپـــاغ

*****

بـۆت مــردم بــەڵــێ "ڕووبابــە" بـــــــە دم و ددانـــــــــی وردی
هــەروەک قــەنــدی "میانــدواو"ێ نــەرمــی و ســپی و جــێ وردی
................................... بـۆ بـە سـیخەی مـارەی کـردی؟
چــــووم "ڕووبابـــــە"م گێـــڕاوە بـۆ سـەر مـەزهـەبـی کـوردی

-٣

"گــەســگەســک" و "بادینــاوێ" "قـــەلـــەڕەش" و "شــــیناوێ"
"خانلـــــەر" و "جبـــــریلاوێ" "ســــەوزە" دەگــــەڵ "پـــرداوێ"
شــــاری "شـــنۆ" و "ئاڵیـــاوێ" "نــەڵــۆس" دەگــەڵ "پووشــاوێ"
ئــەو دونیایـــەم پــاک دەنـــێ حاشـــا بــەبــێ تــۆم نـــاوێ
بــەحــەشتە "کـۆزەکـەرێــز" لــە بــەر "خــەجــیج پێتــاوێ"
"کۆخـــان"ت دەســــەر گێــرم دەگـــــەڵ کۆنــــە"میانـــــدواو"ێ
ئەگەر دۆست بە دڵی خۆت بێ دە بڵـــێ دەلاڵــــی نـــاوێ

*****

دۆلاری یـــــا فلووســـــــی دەڵەی چیتـــــی عرووســــــی
زۆرم حەول لە دوو دا چ بــکەم خــودا نەینووســــی
بــــۆ ڕوویـــابەی کێـــلگەردن لە ڕادانەی سندووســـــــــی

## باللۆره

(حەلیمە شەریفی)

بـــاللۆره بـــه شـــەمـــاڵی مـــەیـــتم بنـــێن لـــه داری
نـــانێم مـــەیلـــی یـــاری

*****

کیـــژێ مـــەکـــه دەنگـــێ هـــێ بـرام پێـت بکـا ژەنگـێ
قوونـت وەکو لوولـەی تفـەنگـێ

*******

بـــاللۆرەی بـــه لێـــوان وەختـــی توولـــەمێـــوان
ماچ کردن خۆشـه لـه کێـوان

*****

(مەلا عەولا فاتحی)

کوڕ:

بـــاللۆرەی بـــه لێـــوان لـــه ســـەر بـــەرزەکێـــوان
شـــەڕی توولـــەمێـــوان ماچ کردن خوشـن لـه کێوان

کچ:

خیـــزم خیـــزم خیـــزم کیژۆڵـــەیـــەکـی تـــەمیـــزم
تـــۆی دۆســـتی ئـــازیزم ده دم و لووتـــت میـــزم

کوڕ:

لـــه ســـەر دارەئـــەسـحابی قیـــرەی کـــەڵـــەبـــابی
حیـــزێ دەبـــێ وا بـــێ لێـــت نـــەدەن چـاک نـابێ

کچ:

شـوانی هـەکـێ و مـەکـێ ڕنـدێن خووریـه شـەکـێ
بـۆم وەره بـەر دەرکـێ دمـــت بـــه بـــۆراکێ

کوڕ:

کیـــژێ لـــه بـــەر پـــاڵی لێکـــرای بـــه منـــداڵی
فـــشی وەک جـــەواڵـــی وەک مـــاینی بـــەفـــاڵی

کچ:

کـــوڕەی بـــه تـــەلانـــی ڕووتـــی لـــه ســـەر بـــانی
بـــۆت لێنـــێم بریـــانی بـــڕۆ بیخـــۆ بـــه نـــانی

کوڕ:

کیژی زلفشۆرە — سواری جانووی تۆرە
دڵت لێم مەگۆرە — نیشانەت وەگۆرە

کچ:

شوانی مەڕەزاوی — لە شوێن هەستاوی
دانوم بۆ لێناوی — ئەی خۆم بۆ تێناوی

کوڕ:

لە سەر کونەماریێ — دێمە لات بە غاریێ
بۆ دەستبازی و قوماریێ — هەتا سێ مانگەی بەهاریێ

کچ:

شوانی لە بەر مەڕی — بۆم وەرە بۆ شەڕی
گوێت لێ بێ بۆچ کەڕی — شەرتی ساڵت پەڕی

کوڕ:

کیژێ لە حەوشێیان — مەمک وەک بەهێیان
بۆت دێمە سەر سوێیان — ماچ دەکەم بن گوێیان

کچ:

کوڕە جحێڵەی سەربانی — لفکە لە سەر شانی
کوڕی خانەدانی — وەرە بۆ شەو ژوانی

کوڕ:

کیژێ مەزنەمیری — لە بەندان ئەسیری
مەستم بۆ چوڕێ شیری — بۆ چی لێم دڵگیری

کچ:

شوانەکەی چێشتانێ — شەوێ لە کوێستانێ
توور دەگەڵ خوێدانێ — قەولم دەگەڵ دانێ

کوڕ:

کیژێ کەراسشینە — دەست لە مالان وەرینە
زولفت چین بە چینە — قەولت شەرت پەڕینە

کچ:

شوانی شەو لە دەرێ — شمشاڵ لە کەمەرێ
ڕندێن پەتکی کەرێ — سوارت گەینە سەرێ

کوڕ:

کیژۆڵەی لە داران — بۆم ڕاژێنە گواران

وەرە ژوان وەک جاران     بێباکم لە سواران

کچ:

کورەچکۆلەی پیاوچاکان     بەردەزاوە ماکان
بمخوازە لە کاکان     بمکە بووکی داکان

کوڕ:

گەر نەمرم دەتخوازم     شوانی بە بەرازم
بەبێ تۆ بێوازم     تۆ کۆتری من بازم

کچ:

بازی سەر چڵەدارم     کچی میر و سەردارم
بێری ناو هەوارم     مەڕدۆشی بەهارم

کوڕ:

ئەمن شوانی بەرغەلم     حەوشێ لە سەر کەلم
ئاغای ناو مێگەلم     دۆستێکی چەلچەلم

کچ:

باللۆرەم تەواوە     چی دەڵەی بەو چاوە
من بووکم تۆ زاوا     ئیتر بەسە و بڕاوا

کوڕ:

سواری سەر شەرتانم     کەپەنک لە سەر شانم
دەست بێن لە قۆڵانم     عاشقی کیژی جوانم

# بەیتی قەبرێ

(مەناف عەبدوڵلازادە)

خودامان هەر ئەو خودایە — کە داینــاوە ئەو دونیایە
سەردارمان "محەممەد"ە — خۆشەویستی خودایە
سەری لە عەرشی عەزیم — پێی لە تەختەسەرایە
نووری دەڕوا بۆ ئاسمانێ — شۆعلەی وەکوو چرایە
قەت نایە لە کوتنێ — قەت نایە لە بیستنێ
لا بدەن لە گوناحان — دڵخۆش مەکەن بە دنێ
سەت لە خۆن و مەجلیسێ — کە دەکەن بەحسی مردنێ
ئەز دەینووسم وەک نەخشی — دەردێک دێ لە حاسمانێ
بەوی دەڵێن نەخۆشی — ئەجەلی پێ مردنم بوو
ئەز کەوتم بەبێ هۆشی — لە وێ و لە وێندەرێ
هەر چوار دەورم جماعەتە — بۆم دەگێڕن چەمبەرێ
خورپەم لە دڵی پەیدا بوو — ئیزرائیلم هاتە سەرێ
بە عەزمی ڕووحکێشانێ — یا محەممەدی مەدینێ

لێم نەسێنێ ئیمانێ
حەزرەتی قابیز ڕووحی کێشام گەیشتوومە نۆرێ

بە چوار دەست هەڵیانگرتم — بردیانمە تاتەشۆرێ
پیاوچاکم هاتە سەر — دەمشوا بە ئاوەگەرمێ
لە خالەقی زیاتر — کەس نییە هاواری بەرمێ
خالەق هەر تۆ مەزنی — یا ڕەب هەر تۆ مەزنی
کراسی قیامەتێم جاوە — ئەز دەچمە باڵ کفنی
لە ترس ڕۆژی حەشرێ — قەت دڵم ناسکنێ
دڵم ناسەکنێ فیجارە — کاکە ڕەشی گوفتارە
هەڵیانگرتم بە چواران — نایانمە نێو دوو داران
لە ڕێپازەیان دانام — قاعیدە بوو سێ جاران
مەلەکێک دێتە ڕێیە — دەبێ وێی بدەم جوابێ
هەر کەس ڕووحدەبەر بێ — لە مردنێی ڕزگار نابێ
کەرەمی خودای زۆرە — ناترسێم لە عازابێ
پیاوچاک وەڕێ بوون لە مالان — قەبریان کردم تەواوە
قەبری قووڵی زیندانی — هەڵیانقەندبوو لە سینگی

راسته هەمووممان دەچینێ هەموو قالبی ئینسانی
بە بەردان بیرەزایە بە بەردی دە مەرمەرێ
دەبا گڵم وەسەر کەن بە پاچ و بە پێمەرێ
ڕووحم وەک تەیری تیژباڵ لە سەر قالبم دەگەرێ

بە مەلای بڵێن چیدی ڕانەمێنی
بە دەنگی بڵیند زوو تەڵقینم بخوێنی

دە ژێر بەرد و گلاندا زەریفم تێبگەینی
دە ژێر بەرد و گلاندا زەریفی تێگەیاندم
جەماعەتی دەورووپشتم گڵیان وەسەر کردم
کێل و بەردیان چەقاندم تەسلیم بە خاکیان کردم
گەردنیان ئازاد کردم بەجێ مام لە مەقبەرێ
بەجێ مام لە مەقبەرێ مەلایکەم هاتە سەرێ
مەلایکە کوتی ئەی بەندە پێم بڵێ خودای تۆ کێیە؟
خودای من هەر ڕەبییە ئەگە دەچوومە سەر نانێ
ئیمانم دێنا بە خودای شادەم دێنا بە "محەممەد"یە
دەڵێ بەندە قسەت بەجێورێیە پێم بڵێ ئوستادی عیلمت کێیە؟
ئوستادی عیلمم ئیمامە دایمە خوێندنی کەلامە

سەت ڕەحمەت لە مە و گوێگران
دەگەڵ نەبێ شەیتانی نەحلەتی ماڵوێران

## هەتەرێ و مەتەرێ (حەلاوە مەلاوە)

(جەلیل عەبدوڵلاپوور)

لێفەشرێک بە حەواوە سی و سێ کونی تێدا ماوە
هێلکەیەک بەشی من ماوە خوا کوڕەکەتان بکا بە زاوا

*****

سفرێ لە جەماتێ خوا کوڕێکی چاو ڕەشکەڵەت داتێ

*****

سەری چالێ بنی چالێ
نەمرێ گەورەی مالێ

*****

حەلاوە و مەلاوە جالّجالۆکەیەک بە حەواوە
سەت و بیست و چوار کچ بۆی ڕاوەستاوە یا ڕەبی خودایە کوڕەکەو ببێ بە زاوە

*****

حەلاوە و مەلاوە بەشی من دەو مالەی‌دا ماوە
کوڕەکەتان بێتە زاوە

*****

هەتەرێ و مەتەرێ شتێکم بۆ باوێنە پشت چەپەرێ
سەری هاوالّم بە قوونی کەرێ

*****

هەلووکان و مەلووکان دایک و بابی جندووکان
ناردوویانم بۆ هێلکان

## جێخوون پێوان یان بە سەر خەرماندا هەڵاگوتن

لە کاتی پێوانی دانەوێڵە بەتایبەت گەنم و جۆ لە زەمانی ئەرباب ـ ڕەعیەتیدا دە و دوویان دەکرد، (هەشت کیلە بۆ ڕەعیەت و دوو کیلە بۆ ئاغا) لە هێندێک شوێن بە کیلە دەیانپێوا و لە هێندێک شوێن بە تەغار. کوێخا خەرمانی دەپێوا و ئاغا لە پەنای دادەنیشت، دار کێلەیەکیان دەبڕی و بە سەر کیلەیاندا دەکێشا تا کەم و زۆری نەبێ، ئەگەر ٥٠ کیلەی دەپێوا، کوێخا بە نووکی چەقۆ خەتێکی بە دارەکەدا دەهێنا و دەیگووت: ئەوە "داڵیە"یەک و سەر لە نوێ دەهاتەوە سەر یەک و دوو و سێ. ئەگەر دەیانپێوا، ژمارەکانیان بە دەنگێکی بەرز دەگووت و دەیانکێشاوە:

(لە زمان مەلا عەولاّ فاتحی)

یەک: خودا یەکە و دوو نییە، کەس لە ڕەنگی وی نییە،

دوو: بەرەکەت بێ لە جانیبی توو، ساحبت بتکا بە توو،

سێ: بەرەکەتی شام و قدوسێ، لەو کۆگایەی برەخسێ،

چوار: بەرەکەتی هەر چوار یاری نەبی، "ئەبووبەکر و عومەر و عوسمان و عەلی"ت تێکەوێ،

پێنج: بەرەکەتی پێنج فەرزت تێکەوێ،

شەش: بەرەکەتی شەشەکانی هومێدت تێکەوێ،

حەوت: مەلەکەلمەوت، بەرەکەت دەو خەرمانەی کەوت،

هەشت: قاپیە*ی بەهەشت، نوور لە ئیلاهی بوو بە گەشت،

نۆ: نۆی نەبی، بەکەم نەبی، بە ڕزق و ڕۆژی سێحەبت بی،

دە: دە هەزار سڵاوات بێ لە دیداری پێغەمبەری (د.خ)،

یازدە: پسرانی یاقووب بە غەیری حەزرەتی یۆسف،

دوازدە: بەرەکەتی هەر دوازدە ئیمامی دەشتی کەربەلایەت تێکەوێ،

زیادە**: عومر و ماڵ زیاد دەبێ ئینشاڵڵا ،

چاردە: مەقسوودێکی پاکە، لە کن خودای بێباکە.

(هەروەها ئەم بەشە لە چەندین کەسی جیاواز کە هەر کام برێکیان دەزانی کۆ کراوەتەوە):

یەک: یەک نەبی، بە کەم نەبی، بە زیادەی خێرێ بی،

دوو: بیکەین بە توو،

سێ: بەرەکەتی حەدیسێ، دەو کۆگایەی برەخسێ،

چوار: یا پاشای پەروەردگار، هاوار بۆ تۆ غەوسی ئافەریدەگار،

پێنج: بەرەکەتی هەر پێنج فەرزان، گەنم و جۆی بکەی هەرزان، نەجاتمان دەی لە قەرزان،

شەش: شەشەکانی دە حاجیان، بە هیمەتی غەزاچیان،

---

* قاپیە: دەروازە

** زیادە: بە جێگای سێزدە دەیانگووت، پێیان وابوو سێزدە نەحسە.

حەوت: مەلەکەلمەوت، بەرەکەت دەو کۆگاییەی کەوت،
هەشت: قاپییەی بەهەشت، نوور لە ئیلاهی بوو بە گەشت،
نۆ: نۆی نەبی، بە کەم نەبی، بە زیادی خێری بی،
دە: دە هەزار سڵاوات بێ لە دیداری پێغەمبەر (د.خ)،
یازدە: پسرانی یەقووب بە غەیری یۆسف (د.خ)،
دوازدە: بەرەکەتی هەر دوازدە ئیمامی دەشتی کەربەلایەت تێکەوێ،
زیادە: زیاد بێ لە دینی محەممەدەلمستەفای (د.خ).

## چێشتەکان

لێرەدا ئاماژەیەک دەکەین بە هێندێک لەو چێشتانەی کە لەو ناوچەیەدا کەمتر باون یان باویان نەماوە، لە کۆتاییشدا چۆنیەتی ساز کردنی ڕسق (پەنیر، لۆرک، مەیلە، ڕۆنی کەرە، دۆ و شیرێژ) دێتە بەرباس.

**قوولەمیچە:**
گەنمیان لە دەستار دەکرد و دەگەڵ شیر تێکەڵیان دەکرد وەسەر ئاوریان دەنا و ڕۆنیان قاڵ کراویان بەسەر دادەکرد؛ ئەم جۆر چێشتە قوولە میچەیان پێ دەگووت.

**پەنیراو:**
شۆرباویان دروست دەکرد و هێندێک پەنیری کوپەیان تێدەکرد پاش چەند خولەکێک چێشتەکەیان دەستاندەوە.

**پیرەزاڵ:**
پەنیری تەڕیان قاش قاش دەکردن و لە نێو ڕۆندا سووریان دەکردەوە کە پیرەزاڵیان پێدەکوت.

**شێخانی:**
گوڵەپێغەمبەرەیان لە دەستاری دەکرد و بە شێوەی بروێش لێیان دەنا، نەختێکیان پیواز و گیای بۆنخۆش تێدەکرد، شل بوون و تووند بوونی چێشتەکە بە پێی ئیشتیای کابان و ئەندامانی ماڵێ ساز دەکرا.

**نانەڕەقە:**
کابانی ماڵێ شۆرباوهێلکەی لێدەنا، بەم چەشنە کە چەند هێلکەی لە نێو ڕۆن و پیوازدا سوور دەکردەوە و دەیکردە شۆرباوهێلکە و لە دوایی‌دا نانەڕەقەیان تێدەکوشی و لە مەنجەڵ یان قابڵەمەیەکی گەورەدا لێکی دەدا و پاشان لە قابانیان دەکرد و لە دەوری یەکتر کۆ دەبوونەوە و دەیانخوارد.

**سۆڵغان:**
پێوازیان چاک دەکردن و لە نێو مەنجەڵێکدا دەگەڵ ئاو دەیانکوڵاندن، کە پیوازەکان لێک بڵاو دەبوون، برینجیان لەپاڵ دەکرد و وەک دۆڵمە سەر و بنی پیوازەکانیان تێک دەنا و ترشیان لێ دەشورد ولە سەر ئاوریان دادەنا تا دێم بێنێ، جاری وا بوو بۆ ئەوەی تامی خۆشتر بێ چەند پلەگۆشتێکیان دەپاڵ دەکرد.

**برا سۆڵغان:**
هەروەک سۆڵغان لێدەنرێ، بەڵام لەوەیاندا برینجەکەیان لە پیوازەکە نەدەکرد، بەڵکوو ریزێکیان پیواز دەچنی و برینجیان لە سەر ڕۆ دەکرد و پاشان دایاندەنا هەتا دێم بێنێ.

بەلەچکی کولەکان:

کولەکەی سوور کە دەگەیشتن قاشقاشیان دەکردن و بۆ ئەوەی ئیشک بن لە بەر تاوێ هەڵیاندەخستن و دە وەرزی زستاناندا ڕۆنیان بۆ دەقرچاند و چەوەندەر و نیسکیان دەگەڵ دەکرد و لێیان دەنا.

دۆینە:

بروێشی دەکوڵێنن و دۆی تێدەکەن، پاشان ڕۆن و پیوازی بۆ دەکەن و بەو شێوە لێی دەنێن.

بۆدراوی سەر بە ڕۆن:

گەنمیان لە دەستاری دەکرد و قاوتیان لێ ساز دەکرد و لە پاشان دەیانکوڵاند و ڕۆنیان بە سەردا دەکرد.

سەمەنی:

دوو سێ حەوتە بەر لە هاتنی بەهار گەنمیان لە مەجوعمەی گەورە دەکردن و ئاویان دە بن دەکردن. گەنمەکان کە چەقەرەیان دەکرد و بە تەواوی بەرز دەبوونەوە، بنەکانیان دەگوتانەوە و دەیانشێلان و دەیانپاڵوتن و ئاوەکەیان دەگرت، ئاردی گەنمیان پێدا دەکرد و چەشنی هەڵوا توونددەبوو و تامی شیرین بوو.

مەترونجە:

هەمان قەیسی و ڕۆن بوو کە کشمیش و برینجیان دەگەڵ تێکەڵ دەکرد و لە کۆتاییدا ترشیان لێ دەشورد.

*****

هێندێک لەو چێشتانەی کە ئێستاش لە زۆربەی گوندەکان و تەنانەت لە هێندێک لە شارەکانیشدا هەر ماون و لێدەندرێن بریتین لە: ترخێنە، بروێش، شۆرباوکفتە، شۆرباوهێلکە، شۆرباونیسکێنە، شۆرباولەپە، هەلیماو، سەنگەسیر، بەربەسێڵ، ماشێنە، بۆرانی، خورماوڕۆن، کشمیشپلاو، کاردوو (کاردووپلاو)، دۆڵمە، شیربرینج، قەیسیوڕۆن، کووکی، هەریشتەپلاو و هتد.

*****

پەنیر:

کابان شیرەکە دەپاڵێوێ و لە شوێنێکی ساردی دادەنێ تا توێی دەگرێ، پاشان توێیەکەی بە جودا هەڵدەگرێ و شیرەکە لە سەر ئاور دادەنێ تا گەرم دابێ، پاشان بە هەوێنی پەنیرێ، شیرەکە هەوێن دەکا. دوای چەند خولەکێک شیرەکە لە سەر ئاورەکە دەڵەمە دەبێ و وردە وردە وەک پەنیر دەنوێنێ و خوێی درشتی پێدادەکەن. پاش تاوێک پەنیرەکەی لە سەر ئاور دەستێنێتەوە و دایدەنێن تا سارد بێتەوە و پەنیرەکە سەلک سەلک دەکوشن و بەم جۆرە پەنیری سەلک ساز دەبێ. (ئەم ئاوەی کە لە نێو شیرەکە دایە و بەشێکی زۆر لە شیرەکە دەخۆ دەگرێ و پاش ئەوەی پەنیرەکەی لێ گیرا بەم ئاوە دەڵێن تیزاو یا تیژاو.

لە ناوچەی ئێمە یان ڕاستەوخۆ لە سەلکەپنیرەکە کەلک وەردەگرن یان دەکوتنەوە و بە ڕەندە یا کەرەسەیەکی دیکە وردووردی دەکەن، پاشان خوێی پێدا دەکەن و دە چەلەنگەڕۆن یا دە کوپەی گڵی دەکەن و لە نێو عەرزدا دەیئاخننەوە، پاش ٥ تا مانگ دێهێننەوە دەری و کەلکی لێ وەردەگرن و "پەنیری کووپە"ی پێدەڵێن.

لۆرک:

ئاژەڵ بەو هۆیە کە ئاوێکی زۆر دەخواتەوە ئاوێکی زۆری تێکەڵاوی شیرەکەیەتی، هەر بۆیە کابانی ماڵ کە شیرەکە دەکوڵێنێتەوە و پاش ئەوەی پەنیری سەلکی لێ گرت ئاوێکی شینی لێ دەمێنێتەوە کە تیژاو یا تیزاوی پێ دەگوترێ. ئەگەر کابان پاش گرتنی پەنیر، ئەم تیژاوە بە جیا بکوڵێنێتەوە و پاشان بیپاڵێوێ "لۆرک" پەعەمەل دێ.

لۆرک و بیزا (لۆرک و گیا):

کابانی ماڵ ئەم برەلۆرکەی گرتوویە لە پێستی ئاژەڵێکی دەکا کە پێشتر ئامادەی کردووە، ئەو جار وێرای چەند گیای بەهاری کە پێشتر زەردی کردوون وەک "بیزا" و "هەڵز" لێکیان دەدا و لەنێو کووپە یا چەلەنگی بەتاڵی پۆنی دەکا و لە عەرزی دەیئاخنێتەوە یان هەر وا کاڵ، وەک پێخۆرێک دەیخۆن.

مەیلە:

کە پەنیری سەلکیان گرت و دیسان تیژاوەکە بکوڵێننەوە و سەلکێک پەنیری تازەی تێهاوێن و پاشان بیپاڵێون "مەیلە" پەعەمەل دێ.

ڕۆنی کەرە:

کابان کە شیری ئاژەڵەکەی دۆشی، دەیپاڵێوێ و لە شوێنێکی ساردی دادەنێ تا توێی دەگرێ، توێیەکە دەکوڵێنێ و پاش ساردبوونەوە هەوێنی دەکا و ماستێکی زۆر چەور دێتە بەرهەم، پاشان وێرای برێک ئاو لە مەشکەی دەکا و دەیژێنێ، پاش ئەوەی مەشکە ژا، ئەوەی لە مەشکەکەدایە ڕۆی دەکا و چەشنی گرتنی پەنیر ڕۆنەکە دەگرێ و دەیکاتە سەلک.

ڕۆنی کەرە پاش مانەوەی زیاتر لە ڕۆژ بۆن دەگرێ واتە بۆ با دەبێ، هەر بۆیە کابانی ماڵ ئەوەندە ڕۆنەی کە لە خواردنی بنەماڵە زیادە دە مەنجەڵی گەورەدا لە سەر ئاورێکی بەتین دەکوڵێنێتەوە و هەر چی خڵتەوخاڵی ڕۆنەکە بێ بە شێوەی کەف(دۆک) وەسەر دەکەوێ، پاشان کابان ئەم دۆکەی لێ فڕێ دەدا و ئەو ڕۆنە قاڵکراوەی کە ڕۆنی "زەنگی" پێدەڵێن دە تونگەی گەورە دەکا و بەم جۆرە ڕۆنی زەنگ زیاتر لە یەک ساڵ خۆ ڕادەگرێ و بۆ چێشت یا خواردنی بەیانیان کەلکی لێ وەردەگرن.

دۆ:

کابانی ماڵ پاش مەشکەژاندن کە ڕۆنەکەی دەگرێ، بەشێکی زۆر لەو ماست و ئاوەی کە تێکەڵ بە مەشکەی کردووە دەبێتە "دۆ"یەکی خەستوخۆڵ کە پاش هەڵێنجانی ڕۆن دەمێنێتەوە.

شیرێژ:

کاتێک کابانی ماڵ دۆی تازەی گرت لە سەر ئاگر دەیکوڵێنێ و پاشان بە پاڵوێنە دەیپاڵێوێ و لە "ڕاوەک *"ی دەکا و بۆ ئەوەی ئاوەکەی بچۆڕێتەوە بە جێگایەکیدا هەڵداوەسێ و بەم جۆرە "شیرێژ" ساز دەبێ کە لە هێندێک ناوچەی کوردستان "ژاژی" پێدەڵێن.

---

* جۆرێک پارچەیە (پارچەی خام) و شتی پێ دەپاڵێون، هەڵبەت " پاڵوێنە "ش هەر بەم جۆرەیە.

# جێژن

بێڵندانە:

مەلا عەولا فاتحی

بێڵندانە جێژنێکی مێژوویییە و ڕوون نییە دەگەڕێتەوە چ سەردەمێک. بەر لە ئێستا ئەم جێژنە بەتایبەت لە ئاوایییەکانی دەڤەری مەنگوڕایەتی بەڕێوە دەچوو و هەنووکەش لە هێندێک ئاوایی بەڕێوە دەچێ. دە ڕابردوودا ئەم جێژنە لە ناوچەی سوێسنایەتی (سەر بە شاری سەردەشت) بەڕێوە دەچوو و ئێستاش تا ڕادەیەک باوی هەر ماوە.

زۆربەی خەڵکی ناوچەی مەنگوڕایەتی ڕایان وایە کە "بێڵندانە" وشەیەکی تێکەڵاوە کە لە دوو بەشی بێڵ+ دانان پێکهاتووە، "بێڵ" هەر ئەو کەرەسەیە بۆ ڕامالینی بەفر کەلکی لێ وەردەگرن و لە بێڵندانەدا مەبەست ئەوەیە کە بێڵەکانمان دانا و وڵات نامالین چونکە ئیتر بەفر ناباری و بەهار بەڕێوەیە و جێژن دەگرین.

نیوەی زستان کە تێپەڕ دەبوو (بە حیسابی سێ مانگ سێ مانگ کە دەبوو بە پێنجی ڕێبەندان) خەڵکی ئاوایی، بەتایبەت گەنجەکان، لە نێوەڕاستی ئاوایی دارێکی زۆر لە سەر یەک کەڵەکە دەکەن و بەر لەوەی ئاوریان تێبەردەن ویشکەدارێکی کە پەلی هەبن، لەنێو ئەو کۆمەڵە دارەدا دەچەقێنن و گوێز، مێوژ، گەنم و مازووی بە لکەکانییەوە هەڵداوەسن و خەڵک لە دەوری کۆ دەبنەوە. هەر کات دارە پەلدارەکە ئاگری بگاتێ و بە لای هەر کام لە دانەوێڵەکاندا بکەوێ؛ بۆ وێنە ئەگەر بە لای "گەنم"ەکەدا بکەوێ دەڵێن ئەو ساڵ گەنم زۆر دەبێ، یا ئەگەر بە لای "مێوژ"ەکەدا بکەوێ، دەڵێن ئەو ساڵ ترێ زۆر دەبێ؛ پاشان تا دامرکانی تەواوی ئاگرەکە دەوێستن و بە کووژانەوەی ئاگر هەر کەس زووتر بەو کەسەی لە تەنیشتی دانیشتووە، بڵێ: "بێڵندانەت دە بەر بێ"، ئەو کەسە دەبێ شتێکی وەک خەڵات بداتێ، ئەم خەڵاتەش دەتوانی عەتر، دەسرۆکە، ئاوێنە، دەسحێب و ... بێ، پاشان خەڵکەکە بڵاوەیان دەکرد. کیژان و لاوان کاتێک تووشی یەک دەبوون هەر کەس زووتر گوتبای: "بێڵندانەت دە بەر بێ"، ئەوە دەبوو خەڵاتێکی وەرگرتبا. لە کۆتایی‌دا وەک "حەلاوە و مەلاوە" بە ماڵاندا دەگەڕان و دەیانگوت: "بێڵندانەتان دە بەر بێ"، ماڵەکانیش خەڵاتی وەک پارە، هێلکە، غوڕابی، مێوژ، گوێز و هتدیان دەدانێ.

جێژنی سەمەنی:

لە زۆربەی ناوچەی مەنگوڕایەتی و بۆ وێنە لە ئاوایی "زێوە" تا چڵ ساڵ لەمەوبەر، لە سەرەتایی مانگی ڕەشەمەدا خەڵک دەهاتن گەنمیان لە سەلە دەکرد و ئاویان دەدا و بۆ ماوەی ٧ ـ ١٠ ڕۆژان لەبەر خۆرەتاویان دادەنا و ئەو گەنمە تەواو شین دەبوو. ئەو گەنمە شینبووەیان لە مەنجەڵی زنجیرداری مس دەکرد و لەسەر ئاوریان دادەنا، پاشان کە هەڵیاندەشێلا و لێکیان دەدا دەیانستاندەوە، بە پاڵوێنە ئاوەکەیان لێ دەگرت و ئاوە خاوێنەکەیان بە جودا لە تاوەی گەورەی مسی دەکرد و ئاردی "بەهاروو"یان پێدادەکرد، جارێ وابوو لە دەوری مەنجەڵەکەدا کچان و کوڕان تا ساز بوونی سەمەنی هەڵپەڕکێیان ساز دەکرد، پاشان گشت خەڵکی ئاوایی لێک کۆ دەبوونەوە و سەمەنییان دەخوارد.

میرمیرێن:

بە پێی ئەو سەرچاوانەی ئێمە وەچنگمان کەوتن یەکەم کەس لە ساڵی ١٣٤١ی هەتاوی، لە کوردستان کە لە سەر "میرمیرێن" یان "میری نەورۆز"، نووسیوێتی ڕەنگە "عوبەیدوڵلا ئەیوبیان" بێ. دیارە لە یەک دوو گۆڤارانیشدا باس لە میرمیرێن کراوە، بەڵام نەک بە تێروتەسەلی. هەروەها کەسانێکی دیکە وەک "گیوی موکریانی" ئاماژەیان پێکردووە. میرمیرێن لە ناوچەکانی کوردستان و چەند وڵاتێکی وەکوو عێراق، تورکیا، سوریا و ئێران بەڕێوە چووە و لە هەر وڵاتەی بە شێوازێکی تایبەت کە دوور نییە ئەسڵی هەموویان بگەڕێتەوە سەر یەک شێوە و شێواز، بەڕێوە چووە.

لە کورتەیەک لە وتارەکەی کاک عوبەیدا باس لەوە دەکا کە "ژان دۆمۆرگان"، گەڕیدەی فەڕەنسی کە ساڵی ١٨٩٠ زایینی هاتۆتە شاری مەهاباد،

سەبارەت بە "میرمیرێن" توێژینەوەی کردووە و دەڵێ: سەرەڕای توێژینەوەکانی ناوچەیی نەمتوانی بنچینەی ئەو ڕەسمە بناسم، لە وڵامی پرسیارەکانمدا لە خەڵکەکە وڵامیان دەدامەوە کە ئەو بابەتە لە باب و باپیرانمان بۆ ئێمە ماوەتەوە. بنچینەکەی هەرچی بێ جێژنێکی زۆر سەیرە و هەڵبژاردنی سەرۆکێک لە تەواوی ناوچەدا لەوە پڕ سەیر و سەمەرەتر نییە. خەڵکەکە بە گشتی بە ئەشق و عەلاقەوە لەو مەڕاسیمەدا بەشداری دەکەن.

"میرمیرێن" بەرەبەریساڵی تازە بەڕێوە دەچوو و هەوەڵ چوارشەممەی ساڵی تازە "میر" کە تانجی گوڵەگەزیزەی بە نیشانی هاتنی ساڵی تازە لە سەر بوو ـ گوڵەگەزیزە سەرەتای ساڵی تازە و سەرەتای بەهار دەڕوێ ـ لە یەکێک لە مەیدانەکانی شار یان ئاوایی، پەڕەتاوسێکی لەسەر بوو و ئاڵا و چەتریان بۆ هەڵدەدا و لەگەڵ هەڵاتنی ڕۆژ لەسەر تەختی پاشایی دادەنیشت. دوایە پیاوی گۆپاڵزێوین خۆی دەگەیاندە خزمەت میری نەورۆز و بە کڕنۆشەوە تەڵەبی بەرایی دەکرد تا وەزیر، گوزیر و خزمەتکارانی دەرگای میری نەورۆزی بناسێنێ، میری نەورۆز ئیزنی دەدا و گۆپاڵزێوین کۆنە-وەزیری بەئەمەگ، وەزیری دەستی ڕاست، وەزیری دەستی چەپ، گوزیر، میرزا و خزمەتکارانی دەناساند.

پێویستە ئاماژە بەوە بکەین کە گۆپاڵزێوین، پیاوێک بوو کە گۆپاڵێکی زێوی لە دەستدا بوو و هەمیشە لەبەر دەرگای میری نەورۆز حازر بوو و لەگەڵ هەستان و ڕۆیشتنی میری نەورۆز کۆپاڵی لەسەر شانی دادەنا و هاوڕێ دەگەڵ "دەڵقەک" لە پێشەوەی میری نەورۆز دەڕۆیی. هەروەها "گوزیر" بە فەرمانبەری تایبەتی دەڵێن.

ئەندامانی دەزگای میری نەورۆز:

١ . میری نەورۆز
٢ . کۆنەوەزیر(پیری ژیر)، کە لە جێبەجێ بوونی هێندێک گرفتدا ڕاوێژکاریشی دەکرد، پیرێکی گاڵتەباز و قسەخۆشیان بۆ ئەم کارە هەڵدەبژارد.
٣ . وەزیری دەستی ڕاست: لە لایەن میری نەورۆز زۆرتر حوکمەکانی ئاسایی و گونجاو و ئەوەی کە بەڕێوە دەچێ، دەیدا دەرەوە.
٤ . وەزیری دەستی چەپ: لە لایەن میری نەورۆز زۆرتر حوکمەکانی سەیر و دژی نەریتی کۆمەڵگا کە هیچ کات بەڕێوە ناچێ دەیدا دەرەوە.
٥ . میرزا: کە خوێندەوار بوو و ئەرکی دەبیری و نووسینیشی لە ئەستۆ بوو.
٦ . فەڕاشان و خزمەتکاران: کە ژمارەی ئەوان ڕوون نەبوو، بەڵام کارەکانیان دیاری کرابوو.
٧ . دەستەی جەلادان کە زۆرتر جلکی سووریان لەبەردا بوو.
٨ . پیاوی گۆپاڵزێوین: کەسێک بوو کە مەزنەگۆپاڵێکی زێوی لە دەستدا بوو و فەرمانبەری ڕاگەیاندنی فەرمانەکانی میری نەورۆزی بوو.
٩ . دەستەی ئاهەنگ: تەواوی هونەرمەندان و ژەنیاران بە شانازی لە دەستەی ئاهەنگ خزمەتیان دەکرد و جاری وابوو ژمارەیان دەگەیشتە بیست و پێنج کەس.
١٠ . ئاوازخانان و سروودخانان: بە تێکڕایی، بە نۆرە و جاری وا بوو موشاعیرە ئاوازیان دەخوێند، ژمارەی ئەوان جاری وا بوو دەگەیشتە پتر لە سەد کەس.
١١ . وشکەڕن: کە جلکی پێستی ئاژەڵەکانی وەکوو شێر و پڵینگ، ئەگەر وەچەنگیان نەکەوتبا پێستی مەڕیان بە سەر خۆیان دەکێشا و زەنگوڵەی چکۆڵەچکۆڵەیان بە جلوبەرگەکەیان هەڵداوەسی و شانە و ئاوێنەیان لە سەر سینگی دەدا و لە بری کەوش، "کاڵەی شەمامەبەندی" یا "کەلاش"یان لە پێ دەکرد، هەموو جۆرە ئەدا و ئەتوارێک و زارەخوارەیەکیان دەکردن و جگە لە میری نەورۆز، گەیشتبانە هەر کەسێک هەرچی پێی خۆش بووبا پێیان دەگوت. ئەرکەسەرەکییەکانی جێژن لە ئەستۆی ئەو کەسانە بوو؛ خەڵکیش بۆ پیرۆزبایی و بەشداری لە جێژن دەچوونە دەرگای میری نەورۆز.

میر لێپرسینەوەی دەکرد و گەمژانەترین سکاڵاکانیشی وەردەگرت و دادپرسی دەکردن، تاوانبارەکان کە بریتی بوون لە: درۆزن، سوودخۆر، ئاژاوەچی، ئەوانەی میوان ڕاناگرن و...، بە خەڵکی دەناساندن و سزای دەدان و پارەی لێ وەردەگرتن و زۆر جار چەند قامچیشی لێ دەدان.

بۆ وێنە وەزیری دەستی ڕاست ئەو فەرمانانەی ژێرەوە کە لە لایان میر دەردەچوون بەڕێوەی دەبردن:

حاکم دەبێ زیندانییە بێتاوانەکان ئازاد بکا، ئەو ماڵانەی ناکۆکیان لە نێو دایە زۆر زوو ئاشت ببنەوە، بە پێی یاساکانی ئایینی، هەرچی دەوڵەمەندە، دەبێ زەکاتی خۆی بدا بە هەژارەکان. سبەی دەبێ لەسەر ڕووبارەکە پردێکی باش لێبدرێ، هەر کەسە لە سەرێتی دەوروبەری ماڵە خۆی خاوێن کاتەوە. هەر کەس ئەم دەستوورانە بەڕێوە نەبا، لە سەر فەرمانی میر، دە جاران وەبەر قامچیان دەدرێ خوا و یەک ڕۆژان دەکرێتە بەندیخانەوە.

وەزیری دەستی چەپیش ئەو فەرمانانەی میری دەدانە دەرێ:
ئەمڕۆ دەبێ هەموو پیاوەکان لایەکی سمێڵیان بتاشن و هەر کەس بۆ سپەی سمێڵی نەتاشیبێ گوێی دەبڕن. هەموو ئەو لاوانەی تەمەنیان لە ١٣ساڵ تێپەڕییەوە دەبێ تا سپەی ژن بێنن دەنا بە زۆرەملی دەبێ دەگەڵ پیرێژنێکی هەشتا ساڵە زەماوەند بکەن و...
شوێنی حەسانەوە و سەیرانگای میر وەکوو کاک عوبەید باسی دەکا دەبێ ئاواییەکانی "لاچین" ، "کانی شێخان" و "حاجی مامیان" بووبێ کە دەگەڵ هاوڕێکانی چەند ڕۆژێک لەو شوێنانە دەمانەوە و خۆشیان ڕادەبوارد.

نەمانی حوکمی میری نەورۆزی:
میری نەورۆز دەگەڵ ئەوەی پێکەنی و بێجگە لە وەزیران و پیاوی گۆپاڵزێوین، قسەی لەگەڵ هەر کەسێک کردبا لە میری دەکەوت، بەتایبەت کاتێک خەڵک وەڕز دەبوون و پێیان خۆش بوو ئەم جێژنە ببڕێتەوە، زۆرتریان گوشار دێنا.

لە ترسی پێکەنین، میری نەورۆز پەنای دەبردە ماڵە یەکێک لە پیاو ماقووڵان و خاوەن ڕێزان و بەم جۆرە لەو گرداوە ڕزگاری دەبوو، بەڵام ئەگەر کەوتبا چنگی خەڵکی ژێر دەستی، وایان لێ دەکرد کە تازە سەهلە تامی سەردەمی پاشایەتی لەبیر چووباوە.
هەروەها "ئەیووبیان" لە درێژەی بابەتەکەی‌دا دەڵێ: جێژنی میری نەورۆز، لەمێژە لە کوردستان و بەتایبەت لە نێو کوردەکانی موکری‌دا هەیە، بەڵام لەو دواییانەدا لە ساڵی ١٣١٥ هەتاوی لە مەهاباد بەڕێوە نەدەچوو و ئەو ڕەسمە کەونە وردەوردە لە بیر دەچۆوە کە لە ناکاو خەڵک لە ساڵی ١٣٢٤ هەتاوی سەر لە نوێ لە مەهاباد جێژنی میری نەورۆزیان بە گەورەیی بەڕێوە برد و میری نەورۆز ماوەی پازدە ڕۆژ لە مەهاباد میرایەتی کرد.

ئەم مەڕاسیمە هەر چەند ڕەسمێکی کەونی میللی و مێژووییە، بەڵام ناتوانین حاشا لە تایبەتمەندییەکانی سیاسی ئەو بکەین. بۆ وێنە جاری وا هەبووە کە جێژنی میری نەورۆزی لە شاری مەهاباد بۆتە هۆی هەژانی هەستی خەڵک دژی حاکمانی ناساڵح.
هەر چەند ئەم مەراسیمە ئێستا لە موکریان‌دا بەڕێوە ناچێ، بەڵام بەساڵاچووانی شار و لادێ هەر لە بیریانە و زۆر شتی لێ دەگێڕنەوە. ساڵێکی لە ئاوایی خەلیفان ئەم مەراسیمە بەڕێوە دەچێ و دەبێتە باو کە سێ مانگان دەخایەنێ و دەنگی داوە و هەر دەهات پەرەی دەستاند، بەڵام دەسەڵاتی پەهلەوی خڕی کردەوە.

❊❊❊❊❊

لە ئاواییەکانی مەهاباد بایخێکی تایبەتی دەدرێ بە جێژنەکانی ئایینی وەکوو جێژنی قوربان، جێژنی ڕەمەزان و جێژنی مەولوود، ڕۆژی لە دایک بوونی پێغەمبەری ئیسلام حەزرەتی محەممەد (د.خ) بە ڕۆژێکی پیرۆز دەناسرێ، خەڵکی ئاواییەکان لە ڕۆژەکانی جێژن‌دا، جلکی تازە دەبەر دەکەن و دەچنە ماڵی یەکتر و جێژنەپیرۆزە پێکتر دەڵێن.

# هێندێک لە حیسابەکانی کۆن

مەلا عەبد و مەلا داود، دوو برا بوون خەڵکی ئاوایی "قۆزلووی گەورە"، ئەم دووانە ئەستێرەناس بوون و حیسابی ساڵ و هاتنی وەرزەکانیان زانیوە، لێرەدا بەشێکی باس دەکەین:

**لەکلەک:**

هەموو ساڵێک کە هەژدە شەوی بمێنێ بۆ بەهار، (کە دەبێتە نزیک ١٢ و ١٣ی ڕەشەممە) لەکلەک دەگەڕێتەوە ناوچە.

**داڵ:**

دوازدە شەوی بمێنێ بۆ بەهار، داڵ دێنەوە (نزیک ١٧ و ١٨ی ڕەشەممە).

**با:**

دە شەوێکی بمێنێ بۆ بەهار، بایەک دەست پێدەکا کە پێی دەڵێن "بای وەعدە".

**کەو:**

هەشت شەوی مابێ بۆ بەهار، کەو دێنەوە بۆ ناوچە.

*****

**سێ شەشی هەیاسی:**

کۆتایی مانگی ڕەشەممە کە هەژدە ڕۆژ دەخۆ دەگرێ، سێ بەش دەکرێ کە بە "سێ شەشی هەیاس"ی مەشهوورە، شەش ڕۆژی هەوەڵێ کەشوهەوایەکی خۆش و تاووساو بوو. شەش ڕۆژی دووەم کەشوهەوایەکی ناخۆش، بەفر و کڕێوە، سارد و سەرما بوو. شەش ڕۆژی سێهەم کە کەشوهەوایەکی تێکەڵاو، جارێک خۆش و جارێک ناخۆش بوو.

**سەرمای پیرێژن:**

دەڵێن پیرێژنێکی لە خواترس لە نێو هۆزێکی خودانەترس‌دا دەژیا، لە وەرزی بەهاردا، بۆ ماوەی حەوت ڕۆژان، سەرما و کڕێوەیەکی سەیر بە سەریان‌دا دەبارێ و پیرێژنەکە دەگەڵ وشترەکەی، دە ماوەی ئەو حەوت ڕۆژەدا دەچنە نێو قوڵکەیەک و خۆیان حەشار دەدەن و بەو شێوە لە سەرما دەپارێزرێن.

**گیسکی بەلەمس:**

پازدە ڕۆژ لە بەهار دەچێ و وردەوردە هەوا گەرم دەبێ، "گیسکی بەلەمس" دەچێ بۆ لەوەڕێ و دەڵێ:

خـــواردم گڵـــۆفکی نیـــسانێ      دوو تـــرم کـــرد لـــە زســـتانێ

هەورێک دێ و دەست دەکا بە کڕێوە و سەرما، گیسکی بەلەمس لە بەرزایی چیاکان سەرما دەیبا و هەتا شوان دەگاتە سەری بەشکوو کەوڵی بکا، گەرمایەک دادێ و گۆشتەکەی بۆگەنیو دەبێ. یان: وا دەگێڕنەوە کابرای دەوڵەمەند لە یەکەم ڕۆژەکانی بەهاردا مەڕ و ماڵاتی وەپێش خۆی دان تا بچێتە هەوار، دوو سێ ڕۆژێک تێپەڕی و بوو بە سەرماوسۆڵێک و بەفر بارینێک کە هەر خوا بۆخۆی بزانێ؛ "گیسکی بەلەمس" لە بەرزایی چیا سەرما بردی و شوان هاواری کردە خەڵکی و گوتی: هۆ ماڵە فلانکەسی! وەرن گیسکی بەلەمس سەرما ڕقی کرد، بەڵام هەتا خەڵک گەیشتنێ گێردی نەگەیشتێ و لە ناکاو گەرمایەک داهات و کەلاکی گیسکەکە بە جارێک بۆگەنیو بوو.

**خاتوون زەمهەریر:**

برای خاتوون "زەمهەریر" لە مانگی ڕەشەمەدا، بە هۆی سەرما و بێ دەغڵودانی، سەرما دەیبا و خاتوون حەوت ڕۆژان شینی بۆ دەگێڕێ. چەند ڕۆژێک لە مانگی ڕەشەممە بەم ناوە ناسراوە.

**کوڕ بە بۆری و یار بە گواران:**

"کوڕ بەبۆری" و "یار بەگواران" خوشک و برا بوون، لە مانگی ڕەشەممەدا، سەرماوسۆڵێک دێ و تفاقیان لێ دەبڕێ و تەنیا یەک بارگینیان دەبێ. خوشکەکەی گوارەی زێوی دە گوێدا دەبن و لە گوێیان دەردێنێ و ماڵ بە ماڵ دەگەڕێ کە مامەڵەیەک بکا، بەڵام کەس مامەڵەیەکی دەگەڵ ناکا و کیژ بە هەناسەساردی دەگەڕێتەوە ماڵێ. "کوڕ بەبۆر" دەست دەداتە بێڵەی و بە کرێ سەربانان دەماڵێ و خوشکەکەشی بارگینی وەپێش خۆی دەدا و لە قەراغ چۆم و بن پەساران بارگینەکە دەلەوەڕێنێ، بارگین تێر دەخوا و وردەوردە هەوای خۆش دەبێ و وڵات ڕەش دەبێتەوە، کیژ دەڵێ:

کوڕ بەبۆری و یار بەگواران ڕەش بووە بنی دە داران

گووم بە دمی بابی کادێنداران

**خەرە مەبەرە:**

کەسێک تفاقی لێ دەبڕێ، وەسواڵی ئاوایییەکانی دەوروبەر دەکەوێ، سواری گوێدرێژ دەبێ و لە نیوەی ڕێگا هەڵیدەکاتە بەفر و بۆران، لەوێ گوێدرێژەکەی دەتۆپێ، باردانەکەی بە خۆی دادەدا و دێتەوە ئاوایی.

ئەوەیان بە کەسێک دەگووت کە لە مانگی ڕەشەممەدا تفاقی لێ بڕابایە و وەسواڵی ماڵان کەوتبا.

**چل و بڕ:**

ئەو سەردەمەیە کە پەلەوەر لە گەرمێنەوە بەرەو کوێستان دێنەوە (٣٥ ـ ٣٦ ڕۆژ بۆ بەهار).

**ئاڵەکۆک:**

بەفر لە دواڕۆژەکانی ڕێبەندان و هەوەڵ ڕۆژەکانی ڕەشەممەدا دەچێتە لای ئاڵەکۆک و پێی دەڵێ: ئاڵەکۆک! هاتووم مێردم پێ بکەی! دەڵێی چێ؟

ئاڵەکۆک دەڵێ: دەبێ دەست بە سەر و قژم داهێنم، شین بم، ئەوکات لێت ڕوون دەکەمەوە.

پاش ماوەیەک ئاڵەکۆک شین دەبێ و دەست بە سەر و قژی خۆیدا دێنێ، وڵامی بەفر دەداتەوە و دەڵێ بمخوازە.

بەفر بە ئاڵەکۆک دەڵێ:

ئاڵەکۆکەی پرچنە نەمماوە قەوەی ماڵ و ژنە

چۆرچۆرم کەوتۆتە بنە

*****

**پۆل کەوتن:**

پێوانەیەکە بۆ سەرما، لە مانگی ڕەشەممەوە هەر ٢٥ ڕۆژێک تێپەڕی، دەڵێن ئەوە پۆلێک کەوت، لە ساڵێدا چەندین پۆلمان هەیە.

**حیسابی گا بەڵەک:**

نێوان پاییز و زستان کەسێکی باوەڕپێکراوی ئاوایی، بە پێی ئەو ئەزموونانەی وەدەستی هێناون، لە شێوەی گیا خواردن و لەوەڕینی ماڵات، بۆی دەردەکەوت کە ساڵی داهاتوو ساڵێکی خۆش دەبێ یان ناخۆش و دەیگووت: گا بەڵەک دەڵێ ئەو ساڵ زستانێ ناخۆش دەبێ و ئازووقەی زۆر

داخەن، یان دەیگووت مەترسێن ئەو ساڵ خۆشە و خەڵکیش فەرمانی ئەویان بەجێ دەهێنا.

**حیسابی بەردەبۆر:**

بەردەبۆر کێوێکە لە باشووری ئاوایی دێبۆکر، ڕووی لە ماڵەکانی ئاواییە و بەردێکی گەورەی لە سەرە، لە زۆوە بە پێی سێبەری ئەو بەردە هاتنی بەهار، پاییز، زستان و هاوین و نوێژەکان دیاری دەکرا. ئێستاش بەساڵاچووانی دێبۆکر، بە نیشانە کردنی سێبەری ئەو بەردە کە ساڵێ جارێک لە شوێنێکی تایبەت دەردەکەوێ هەوەڵ ڕۆژی بەهار دیاری دەکەن.

**ڕێچکەی کێوی قۆتر:**

بەساڵاچووانی ئاوایی "کولیجە"ی (سەر بە مەهاباد) ئەو کاتی لە بەر دەرگای مزگەوتی ئاوایی ڕادەوەستان و بەرەبەری تاریک بوون کە دەیاندەی ئەوە ئەستێرەی گەلاوێژ دەگەڵ ڕێچکەی کێوی قۆتر لە یەک میزان دایە، دەیانزانی سبەینێ یەکەم ڕۆژی نەورۆز یان بەهارە.

**قۆری:**

قۆری هەمان گیشەیە، یان باقەگیای لەسەر یەک هەڵچنراوە، بەڵام هێندێک لە بەساڵاچووان بۆ حیساب کردنی تەمەنیان لە قۆری کەلک وەردەگرن، بۆ وێنە کاتێک لە "کاک سەدیق خزری" خەڵکی "یەڵتەمر"مان پرسی چەند ساڵە لە یەڵتەمری، وڵامی داینەوە ٥٦ قۆرییە لێرەم = ٥٦ ساڵ.

*****

**دیاری کردنی قیبلە (باشوور) بۆ نوێژ کردن یان بۆ ئەوەی ڕێگایان لێ ون نەبێ:**

زوو کە ئامرازەکانی ئەوڕۆیی لە ئارادا نەبوون، خەڵک ناوچە لە ڕووی ئەستێرە و چۆنیەتی ڕۆژهەڵاتن و ئاوا بوون و سێبەر و هتد کاتەکانی نوێژکردن و هەروەها لە سەفەردا، ڕێگاکانیان لێک دەداوە، بەڵام لە هێندێک شوێن وەکوو ئاوایی توتاخاج بەساڵاچووان باس لە دار چنار و دارە بی دەکەن کە لەوانیش کەلکیان وەرگرتووە، دەڵێن هەر لایەکی دار چنار و دارە بی بەرەو قوبلە بێ ئەو لایەی گرژ هەڵدێ، بەڵام بەرێژە لایەکانی دیکەی سافترن. لە ڕووی سێبەریش وەختی نوێژیان دیاری دەکرد، واتا بە پێی ئەو زانست و ئەزموونانەی لە پێشینیانیان وەریانگرتبوو، سێبەریان دەپێوا، بۆ وێنە ئەگەر دوو پێ بووبا ئەوە نوێژی نیوەڕۆیە بوو، یان سێ چوار پێ بووبا نوێژی ئێوارێ و هتد.

**لە هەوەڵ ڕۆژی بەهارەوە هەتاکوو ڕۆژی دەهەم، ئەو بەندانەیان ڕێک خستووە:**

یەک: یەکە پێکەڵ پێکە،

دوو: ..........................................

سێ: سێیە نۆبەتێیە،

چوار: چوارە ئەو ساڵ وەک ساڵی پارە،

پێنج: پێنجە ڕسق هەڵێنجە،

شەش: شەشە شەوی ڕەشە،

حەوت: حەوتە قیل و نەوتە،

هەشت: هەشتە وەک بەهەشتە،

نۆ: نۆیە هۆ بە هۆیە،

دە: دەیە بارت لێنێ، هەر کوێ دەچی ماڵە خۆیە.

# باوی کوردەواری

ئەم چەند لاپەڕەیە کە سەبارەت بە حیسابەکانی کوردییە لە پەرتووکی "باوی کوردەواری نووسینی "محەممەدساڵح ئیبراهیمی محەممەدی" ناسراو بە "شەپۆل" وەرگیراوە کە بەڕێزیان چەندین وتاریان سەبارەت بەم حیسابانە لە کاک "عوبەیدوڵڵا ئەیووبییان مەرکەزی" وەرگرتوە.

[لە نێو هەندێ بنەماڵە بەگزادەکانی لای بۆکان و سەقز و مەهاباددا ماوەی زستان بە سەد ڕۆژ دادەنێن و ئەڵێن، تەمەنی زستان سەد ڕۆژە، بەم مانایە کە زستان بە سێ مانگە و دە ڕۆژەی هەوەڵی بەهاریش واتە دە ڕۆژ لە مانگی (نۆسان)، خاکەلێوە، کە نەورۆزیشی پێ ئەڵێن، هەر بە زستان ئەیژمێرن و هەر ڕۆژێکیش لەم سەد ڕۆژانە بە ناوی یەکێکەوە تەنانەت بە ناوی مەزنی ماڵ و خێزانەوە ناو دەبەن و ئەیکەن بە بەختی خاو و خێزان، بۆ وێنە: ئەگەر کوێخای ئاوایی ناوی "ژیان" بێ و گاوانی دێیەکەش ناوی "بارام" بێ، هەوەڵ ڕۆژی زستانیان بە "ژیان"ی کوێخاوە ناو دەنا و ڕۆژی چل و نۆهەمی زستان کە ناویان ناوە "بارام"، ئەگەر خۆش و تاووساو بێ و لەو ڕۆژانەدا شتێک نەقەومێ، خەڵک هیوادار دەبن و لایان وا ئەبێ کە ئەوە ساڵێکی تەڕەساڵ و خۆش و باش دەبێ و هەموویان لە دەرد و بەڵا و کزی و هەژاری بە دوور ئەبن، جا ئەگەر وا هەڵبکەوێ کە چەند ساڵ لە سەر یەک هەوەڵ ڕۆژی زستان واتە (ژیان) بە خۆشی بێ گێرەوکێشە ڕابوێرین خەڵک ئەو ڕۆژەی (ژیان)ە - بە باش دەزانن و بۆیان دەبێتەوە بیرەوەرییەکی باش، جا بەم جۆرە کە وتمان بەگزادەکان ئەو نەوەد ڕۆژە زستانە و دە ڕۆژی هەوەڵی بەهار کە ئەوان هەر بە زستانی دەژمێرن بە ناوی مەزنی خێزان یان مەزنی عێل و عەشیرەت ناوی دێنن.

لە هێندێ لادێ کە ژمارەی خەڵکەکەی کەم بێ، ئەو سەد ڕۆژە بە ناوی یەکیەکی خاو و خێزان و تەنانەت ئاژەڵ و مەڕ و ماڵات ناو دێنن. تەنانەت ئاژەڵێ کە زۆریان خۆش بوێ وەک: ئەسپ و گاجووت و مەڕ. ئەبێ ئەمەش بزانین کە بە هەوەڵ مانگی زستان دەڵێن "بەفرانبار یا بەفران" (سەرەتای زستان) و "چلە گەورە" و "چلە پێشین"ی پێ دەڵێن و بە مانگی نێوەڕاستیش دەڵێن: "ڕێبەندان یا بەندان" (چلە چکۆڵە) و (چلە پاشین) و بە ئاخر مانگی زستانیش دەڵێن: "ڕەشەممە یا پۆلان" و "ڕەشەمێ" و "کەوبەدار".

کەڵەکترە (کەڵەفندە): کە لە شارویراندا "کەڵەفندە" و لە هێندێ شوێنی دیکە "کەڵەکوندە"شی پێدەڵێن.

ئەم باڵندەیە (کەڵەکترە) مەلێکی چکۆلەیە لە پاساری بچووکتر، ڕەنگی بۆرە و لای سینگ و شاباڵەکانی سپییە. دەڵێن: پاییزان نەوەد دەنک تۆوی کەنگەلاشک لە داتۆکە و دەندە لۆشکیشای پێ ئەڵێن بۆ تۆشەی زستانی خۆی لە هێلانەکەیدا کۆیان دەکاتەوە. جا کە زستان گەیشتێ لە هەوەڵ ڕۆژەوە، هەر ڕۆژێک دەنکێکی دەخوا و (٩٠) ڕۆژەی زستانیی پێ ڕادەبوێرێ، خەڵک لایان وایە ئەو کردەوەیە خۆرسکی و سرووشتێکی خواییە و بەڵگەیە بۆ ئەمە کە زستان نەوەد (٩٠) ڕۆژە. ئەم باڵندەیە چ مێ بێ چ نێر، ئەم کارە دەکات و هەر یەکەیان بە جوێ بۆ زستانی خۆیان نەوەد دەنک تۆوی کەنگەلاشک کۆ دەکاتەوە. لە کوردەواریدا بەم جۆرەش زستان دابەش دەکەن: لە هەوەڵ ڕۆژی زستانەوە، یانی لە هەوەڵی مانگی "بەفرانبار"ەوە تا دەیەمین ڕۆژی مانگی "ڕێبەندان" بە "چلەگەورە"ی دادەنێن و دەڵێن: تەمەنی کوڕی گەورەی زستان چل ڕۆژە و لە پازدەی مانگی ڕێبەندانەوە تا ئاخری، ناو دەنێن "چلەچکۆلە" و دەڵێن تەمەنی کوڕە چکۆلەی زستان بیست (٢٠) ڕۆژە. ئینجا نۆبەی سێ ڕۆژانەی خاتوو "زەمهەریر"ە کە "سەرمای پیرێژنێ"شی پێ دەڵێن. چریکە و چرۆکی عەمتەر (عەنەتەر) سەیاد ئوغلی، سەرمای پیرێژن (بەردە لعجوز) لە کوردستانی باکووردا دەم بە دەم دەیگێڕنەوە، هەر وەک لە عەرەبیا پێی دەڵێن: (بەردە لعجوز) دەڵێ: خاتوو زەمهەریر خوشکی چلە گەورە و چلە چکۆلەیە، بۆ تەواو بوونی تەمەنی دوو براکەی دەگری و فرمێسک بە بەفر و باران دەڕێژێ و ئەیکاتەوە تۆفان و کرێوە و شڵێوە و بەفرە لەکە. ئەو تۆفان و فەرتەنە و کرێوە و شڵێوە و بەفرە لەکەیە تا دوایی دێ. لە پاش سێ ڕۆژانەی خاتوو زەمهەریر نۆرەی "سێ شەشی هەیاسی" دێ کە بەفر دەبارێ و شەش ڕۆژ، واتا لە ٢٢ی مانگی پۆلان (ڕەشەممە)وە، شەش ڕۆژ بەفر دەبارێ و شەش ڕۆژی دەیکاتە بای سەخت و سڕ و گزە گز و شەش ڕۆژیش هەوای خۆش دەبێ و دەبێتەوە تاووساو. گیسکی بەلەمس یان (هەمس)، دەڵێن: ڕۆژی دوای سێ شەشی هەیاس نۆرەی گیسکی هەمسە. سەر لە بەیانی کە هەوا خۆش بووە ئەو گیسکەیان لە کۆز بەر داوە تا بچێتە لەوەڕ، گیسکەکە ڕووی کردۆتە کەژ و کێو و لە خۆشییان هەر جیفڕکی لێداون

و هەڵبەز و دابەزێ کردووە و گووتوویە: خواردم گڵۆفکی نیسانێ ، دوو ترِم دا لە زستانێ. بە کرمانجی ژووریش دەڵێ: لەعنەت لە شەداتی ئاورم هاتی. زستان لەو جنێوەی گیسکی هەمس توورِە بوو و بە ئاداری وتووە: خوشکە ئادار، بدە من دوو رِۆژیت ساردا گیسکی پێ بکەمە مردار، یا زستان گوتوویە: رِۆژێکم مابێ لە کاردا کلکت دەکەم بە داردا، ئیتر لە پرِ هەوا بۆتە تەم و مژ و سەرما و گیسک رِەق هەڵاتووە.
بە گێرِانەوەیەکی تر: گیسکی بەلەمس چۆتە سەر کێوێکی بەرز و لە خۆشی ئەوەی زستانی تەواو کردووە دەستی کردووە بە هەڵبەز و دابەز و گوتوویە: ئۆخەی خواردم گوڵی نیسانێ، دوو ترِم کەند لە زستانێ، بەزم نەبرِا لە نێو رِانێ، لەو وەختەدا هەڵیکردە با و بورانێ و گیسکە رِەق هەڵاتووە لە بەر سەرمای دە زستانێ و لە پاشان هەوا کردوویە بە تاووساوێ تا گەیشتن بە گیسکەکە بۆگەنی کردووە لە بەر تاوێ. جا ئەو رِۆژە لە نێو کوردەواریدا بە ناوی گیسکی بەلەمس یان گیسکی گرِوێ ناسراوە و باسی ئەو گیسکە بۆ بیرەوەری ئەو رِۆژانە ماوەتەوە.
١٥ی رِەشەممە لە کوردستانی باکوور کە قاوت (پوخین) ساز دەکەن، لە کاتی خواردنیدا دەڵێن: خدر ئەلیاس ساڵ (زستان) بوو خەڵاس. ئەم قاوتە بە نییەتی کچ و کورِانی لاو ساز دەکرێ و سێ شەو لە پشت سەری یەک حەوت نینۆک لە قاوتەکە، لە گەڵ حەوت نینۆک خۆی بە نینۆکە گەورە، کە لەگەڵ قاوتەکە تێکەڵاوی دەکەن و لە کاتی خەوتن دا نییەت دێنن کە ئەگەر لە خەودا ببینن ئاو دەخۆنەوە ئەو ئاو خواردنەوە لە هەر شوێن و لە هەر ماڵێکدا بێ، کورِ یا کچ لەوێ شوو دەکا یا ژن دێنێ. هەروا لە کوردستانی باکووردا مووی یاڵی ئەسپ یا ماین هەڵدەپاچن و دەیدەن بە دەم باوە، بۆ ئەوەی ئازار، رِەنج، نەخۆشی و ناخۆشی خۆیان و مەرِ و ماڵاتیان بە دەم باوە برِوا! هەروەها چوارشەممەی ئاخری رِەشەممە (پۆلان) بە نەحس دەزانن و ئەو حەوتووە بە رِۆژ ناخەون... خێر و شەرِ بە خوایە ...

بالندە مران:
"بالندە مران"یش ناوی رِۆژێکە و کە ٨٥ رِۆژ لە زستان تێپەرِێ، مەل و باڵندە دەستەدەستە و پۆلپۆل بەرەو هێلانەکانی ساڵانی پێشووی خۆیان، بۆ سەر چڵان و بن گوێسوانان، دەگەرِێنەوە و لە رِۆژانی ٢٦، ٢٧ و ٢٨ی مانگی رِەشەممەدا جارێکیان سەرما و سەخڵەت و گژەگژی با دەستی پێکردووە، بەفر گشت کەژ و کێوی داپۆشیوە و زەوی کراسی سپی لە بەر کردووە، مەل و باڵندە سەریان لێ شێواوە و لە برسان و لە سەرمان قرِیان تێکەوتووە، لەو کاتەوە ئەو سێ رِۆژە لە مێژووی کوردەواریدا بە باڵندە مران (مەلە مران) بەناوبانگە. خەڵکەکە دەگێرِنەوە لە ئاوایی قۆزلووی گەورە مەلا عەبد و مەلا داود دوو برا بوون کە لەو گوندە دەژیان، رِۆژێک مەلا عەبد دەڵێ: رِۆژی هەینی حاجی لەگلەگ دێتەوە دێی! مەلا داود دەڵێ: ناتوانێ، گرێوێ دەکەن. شەو مەلا عەبد تەماشا دەکا حاجی لەگلەگ نەگەرِاوەتەوە سەر هێلانەکەی، تەماشای ئاسمان دەکا، دەزانێ کە لە بەر سەرما کەسیرەیە و لەو نیزیکانە کەوتووە، کورِەکەی هەڵدەستێنێ و نیشانەی پێ دەدا تا برِوا حاجی لەگلەگ بێنێتەوە. دەیهێنێ لە بەر گەرمای کورسی برِێک گەرمی دەکەنەوە و دەیبەن لە سەر هێلانەی ساڵانی دایدەنێنەوە.
بۆ بەیانی کە مەلا داود چاوی بە لەگلەگ دەکەوێ، بە براکەی دەڵێ، ئەوە هێناویانەتەوە دەنا بۆخۆی بەو سەرمایە نەیتوانیوە وا زوو بێتەوە.

دە رِۆژەی شکاک یا شوقاق:
دە رِۆژەی "شکاک"یش ناوبانگێکی تایبەتی هەیە. خەڵکەکە دەڵێن: عێلی شکاک یا شوقاق لە هەوەڵ رِۆژی مانگی بەهاردا پێش هەموو عێلە کۆچەرەکان روویان کردۆتە هەوارە بەهار و لە رِۆژی دەهەمی (نۆسان) خاکەلێوەدا لە پرِ دنیا بۆتە تەم و مژ و کرِێوە و بەفر، بە جۆرێ کە سەری لە خاو و خێزان و مەرِ و ماڵات شێواندووە و بەشێکی لەو عێلە قرِ کردووە. لەو رِۆژەوە ئەو دە رِۆژە بە ناوی "ماف و هەژمار" و دە رِۆژانەی شکاک ناوبانگی هەیە. دەڵێن لەو کاتەوە بە دواوە خەڵک فریوی تاووساو ناخۆن و گوند بەجێ ناهێڵن و تا دە رِۆژ پاش جەژنی نەورۆز بیر لەوە ناکەنەوە کە بچنە بەهارە هەوار.

## ئەستێرەکان

**لەیلی و مەجنوون:**

دوو ئەستێرەی لەیلی و مەجنوون لە وەرزی پاییز و هەوەڵی بەهاردا خۆ لە یەکتر دەدەن و وڵات ڕووناک دەبێت، پێشینیان بڕوایان وایە هەر کەس لەم کاتەدا کە ئەستێرەکان لە ئاسمان خۆ لەیەکتر دەدەن چاوی لێیان بێ، هەر داوایەکی هەبێ، قەبووڵ دەبێ.

**گەلاوێژ:**

گەلاوێژ لە نیوەی زستان و لە نیوەی هاویندا لە ئاسمان دەردەکەوێ، لە وەرزی زستاندا نوێژی شێوان و لە وەرزی هاویندا بەری بەیانی هەڵدێ و دەدرەوشێتەوە. هاتنی ئەم ئەستێرە لە زستاندا مزگێنی ئەوە دەدا کە تەشقی سەرما دەشکێ و هەوا وردەوردە خۆش دەبێ، بەڵام لە هاوێندا نیشاندەری ئەوەیە کە هەوا وردەوردە فێنک دەبێ. ئەو کاتەی گەلاوێژ هەڵدێ دەڵێن گەلاوێژ ئەنگووتووە.

**حەوتەوانە:**

هەوەڵی هاوین حەوت ئەستێرە دێن بە ناوی حەوتەوانە یان "کۆ و تەرازوو"، ئاخری پاییز ئەو ئەستێرانە ئاوا دەبن.

**ئەستێرەی کۆ:**

پێنج ئەستێرەن و لە دەوری یەکترن، هەوەڵ شەوی زستان هەتا بەری بەیانی لە ئاسماندا دیارن، پێش سیواد دان لە ڕۆژئاوا، ئاوا دەبن.*

---

* باسی ئەو ئەستێرانە لە زمان "محەممەدئەمین ڕەسووڵی"یەوەیە. ئەو لە دایک بووی ١٣١٢ هەتاوی، دانیشتووی ئاوایی ئافانە.

# کایەکان

**خەپخەپێن:**
چاوی یەکێک لە یاریزانەکان وا دەبەستن  کە هیچ نبینێ، یاریزاکێکی دیکە شتێک لە ژێر جلکەکانییەوە دەشارێتەوە. ئەو کەسەی چاوی بەستراوە دەبێ زۆر زوو ئەو شتە ببینێتەوە و بە نۆبە و بەو شێوە ئەو یارییە درێژە پێدەدەن.

**پووشکە بە فوو:**
یەک دوو چنگ پووش (وردەگیای ویشک) دێنن و گلۆڵەی دەکەن و وەک تۆپێکی لێ دەکەن، بۆەوی لێک بڵاو نەبێ بە بەن دەیبەستن. لە پاشان بە بەنێکی درێژ لە بەری میچی قایم دەکەن و مەودای تا عەرزەکە دەبێ گەزێک بێ، ئەو جار تۆپە پووشەکەی ئاگر دەدەن و یاریزانەکان لێی نیزیک دەبنەوە و فووی لێ دەکەن و هەوڵی ئەوەی دەدەن تۆپە پووشەکە لە خۆیان دوور کەنەوە، فووی هەر کامیان بەهێزتر بێ باشتر خۆی لە ئاگرەکە ڕزگار کردووە و یاریزانی بەرانبەریشی هەروا دەکا. ئەم کایە زورتر پیاوان دەیکەن.

**کووزکووزێن:**
ئەم کایە کە زیاتر کچەکان دەیکەن چەند قوڵەدارێکی ڕاستیان لە سەر عەرزەکە ڕادەکێشا، قوڵەداراکان بە مەودای بستێک لێک دوورن. یاریزانەکان هەر کام لە نۆرەی خۆیدا، دەبێ لابەلا لاقی دانێ و بە نێو دارەکاندا وا تێپەڕێ کە لاقی لە دارەکان نەکەوێ. تا دوایین دار کە هەر بەو شێوە دەڕوا سەرەڕای ئەوەش لەگەڵ ڕۆیشتنەکەی بەردەوام دەبێ بڵێ: هەپک... هەپک.... هەپک. هەر دەگەڵ وەی لاقی لە یەکێک لە قوڵەدارەکان کەوت دەسووتێ و تارییەکەی دۆڕاندووە و بەشدارانی تری کایەکە دەڵێن: هەدار... هەدار... هەدار و بەو شێوە نۆرەی هاواڵەکانی دەهات.

**کەرەدانە [مامەگێژە]:**
چەند منداڵێک ـ کوڕ یان کچ ـ چاویان دەقووچێنن و وەک خوولخوولە لە دەوری خۆیان دەسووڕێن و بەردەوام ئەو وشانە دووپاتی دەکەنەوە: مامەگێژە، گێژم مەکە، مامەگێژە، گێژم مەکە.

**شاڵیاو:**
کەسێک لە سەر دیوارێک خێرا خێرا، بەم چەشنە خەت دەکێشێتەوە (//////) و یاریزانەکەی پەنای زووزوو بە سەر خەتەکانی ئەودا خەتێکی دیکە دەکێشێ (X)، دیارە نابێ وەپاش کەوێ و دەگەڵ وی نەیتوانی و لە یاریزانی یەکەم وەپاش کەوت یارییەکە دەدۆڕێنێ و خیچاوە. یاریزانی یەکەم بە کەیفی خۆیەتی تا کەی خەت بکێشێ، ئەمە پێوەندی بەوەیە کەی ماندوو بێ یان دیوارەکە جێی خەت کێشانی نەمابێ و یان گێچەکەی تەواو بووبێ.

**شەلاقێن:**
بەنێکیان بە دارێکەوە گرێ دەدا و دارێکیان دێنا و وەکوو تۆپێکی چکۆلە خڕیان دەکرد، ئەو جار بە دارەکەی دیکە کە بەنی پێوە بوو، لێیان ڕادەکێشا، بەم جۆرە تۆپە دارەکەیان هەڵدەسووڕاند و وەپێش خۆیان دەدا.

گولەگولێن:

بەرواڵەت یارێزانێک دەبێتە "گول" و یاریزانەکانی تر لێی دوور دەکەونەوە و لە دەستی ڕا دەکەن، چونکوو هەر کەس دەستی "گول"ەکەی وێکەوێ ئەویش گول دەبێ و بەرواڵەت ئەو دەبێ ڕۆڵی گول بیێنێ و خۆ بگەیێنێتە ئەوانی دیکە و گولیان بکا. هەر یاریزانێک کە دیتی "گول"ەکەی لە پەنایە و دەرفەتی خۆ دەرباز بوونی نەماوە، دەتوانێ هەر لە جێی خۆی دانیشێ و قامکی لە سەر لووتی دابنێ و وشەی "مووت" بڵێتەوە، بەو شێوە ئەو یاریزانە ئەو دەرفەتەی بۆ دەڕەخسێ و ئەو جارەی ڕزگاری دەبێ و گول نابێ، بە واتایەک یاریزانی گول کاتێک دەتوانێ یاریزانەکان بگرێ و گولیان بکا کە لە سەر پێ بن و ڕاوەستابن.

یاریزانەکان کە لە دەست گولە دەرباز دەبن ئەو شێعرە دەڵێنەوە:

گولــە گــولێنم مــەکــە لــە شــارانم دەرمــەکــە

خەفـخەفێن:

ئەو سەردەمی لە ئاوایی‌یەکان کارەبا نەبوو، لاوەکان (نێرینەکان) بە شەو لە ماڵێک کۆ دەبوونەوە و فانۆس و چرایان دەکووژاندنەوە و لەم تاریکاییەدا دادەگژانە یەکتر و کەس نەیدەزانی کێیە و لە کێ دەدا، ئەوەندە پێدەکەنین و یەکتریان دەکوتا تا ماندوو دەبوون، بەو کایەیان دەگوت "خەف خەفێن". هەروەها کایەی "گوورزی کوێر"یش هەر بەم شێوە بوو، بەڵام لەم کایەدا سەری پەڕۆ یان لێچکەیەکیان گرێ دەدا و دەیانکردە گورز و بە وی لە یەکتریان دەدا.

مامە واشە:

لەم یارییەدا جەغزێکی وا دەکێشنەوە کە دە دوازدە کەسێکی تێدا جێ بێتەوە و تێدا دادەنیشن، یاریزانی یەکەم مستێک یان شەپلاغەیەک یان کەوشێکی لە ئەوەی پەنا خۆی ڕادەکێشێ، ئەویش، لە پەنا دەستی خۆی ڕادەکێشێ و ئەویش لەوی دیکە تا بەو شێوە دەورەکە دەسووڕێتەوە و دێتەوە سەر یەکەم کەس.

منداڵەکان، بەتایبەت لە قوتابخانەکان ئێستەش ئەم کایە و شۆخییە دەکەن، ئەو کەسەی مستەکە دەوەشێنێ دەڵێ: بەرێی کە! یان حەواڵەی کە!

خووزێن:

لەم یارییەدا جەغزێک لە سەر عەرزی دەکێشنەوە، چەند کەسێک دەچنە نێو جەغزەکەوە، ئەو یاریزانەی تۆپێکی بچووکی پێیە و بەرەو ئەو کەسانەی داوێ کە لەنێو جەغزەکەدان، کەس نابێ لە جێگای خۆی ببزوێ، تۆپەکە لە هەر کەس کەوت ئەو کەسە دەخیچا و دەبوو لە جەغزەکە هاتبا دەرێ.

کڵاوی بن قوونێ:

دەستەیەک لە دەوری یەک و لە بازنەیەکدا دادەنیشن، ئەو یاریزانەی کڵاوێکی لە نێو دەستی‌دایە بە دەوری بازنەکەدا هەڵدەسووڕێ و کڵاوەکەی لە بن قوونی هەر کەس دانێ، ئەو کەسە دەبێ خێرا کڵاوەکەی پڕ داتێ و بە دوای یاریزانەکەدا هەڵێ و کڵاوەکەی پێ دادا. ئەو یاریزانە ئەگەر کڵاوەکەی وێکەوێ ئەوە یارییەکەی بردۆتەوە و ئەو یاریزانەی کڵاوەکەی وێکەوتووە دەبێ سەرلەنوێ بە دەوری بازنەکەدا بسووڕێتەوە و کڵاوەکەی بۆ کەسێکی دیکە دابنێتەوە، هەڵبەت دەتوانێ سەرلەنوێ هەر بۆ ئەم کەسەی دانێتەوە، ئەگەر کڵاوەکەی لێ نەکەوێ دەبێ بچێتە جێگای ئەو کەسە دابنیشێ کە لە ڕاکێشانی کڵاوەکەدا سەرکەوتوو نەبووە و ئەویش بە دەوری بازنەکەدا کڵاو بە دەست هەڵدەسووڕێ.

نیسک و نۆکێن:

دوو کەس لە یاریزانەکان دەستیان لە دەستی یەکتردا قفڵ دەکەن، منداڵێک یا کەسێک کە کێشی سووک بێ لە سەر دەستیان دادەنێن و لەگەڵ ئەوەی یەکڕا هەڵیدەتەکێنن، دەڵێن: "ئەوە نیسک و نۆک دەچێنین بۆ برایم ئاغا".

کاڵەمستێن:

ئەم یارییە بە دوو شێوە دەکرێ:

١. یاریزانەکان دەبنە دوو دەستە، دەستەیەک شتێکی وەک "مۆدنە" و یان هەر شتێکی بچووک، لە نێو پەڕۆیەکدا دەشارنەوە و لە بەر دمی یەکێک لە ئەندامەکانی دەستەی بەرانبەریان دادەنێن، ئەو کەسە دەبێ هەڵیدا ئەو شتەی کە پەڕۆکەی تێوە پێچراوە چییە و هەتا هەڵێنەدا دەستەی بەرانبەری دەیکوتن و ئەگەر هەڵیدا ئەوە نۆرەی دەستەکەی دیکەیە.

٢. یاریزانەکان بە دوو دەستە دابەش دەبن، یەکێک لە یاریزانەکان چارشێوێکی دەخۆیەوە دەپێچێ و قدوویەکی جگەرەی لە پەڕۆیەکەوە دەپێچێ و لە گیرفانی خۆی یان لە نێو جلکی یەکێک لە یاریزانەکانی دەستەی خۆی حەشاری دەدا، دەستەی بەرانبەر دەبێ وەک جۆرابێن "گوڵ" لێدەن و ئەو کەسەی قدوویەکی پێیە بدۆزنەوە.

هەمزەل:

چەند کەس لە ریزێک کە مەودایان لە یەکتر هەر چەند هەنگاوێک دەبێ، دادێنەوە و بە نۆرە، لە یەکەم کەسەوە، هەر جارەی یەکیان بە سەر ئەوانی دیکەدا باز دەدا. بازدانەکە بەم شێوەیەیە کە یاریزانەکە دوو دەستەکانی لە سەر پشتی ئەو کەسەی کە بە نیازە بەسەریدا باز بدا، دەکاتە ئەستوونێک و جووت لاقی بڵاو دەکات و دەپەڕێ، چەنە هەنگاوێک ئەولاتر دوایین کەس کە بازدی داوە، ئەویش هەر وەکوو ئەوانی دی دادێتەوە و بەو شێوە یارییەکە درێژەی دەبێ.

جۆڵاجۆڵێن:

کەسێک کە دوو داری پێ بوو دەیگووت "ئەمن جۆڵام"، یاریزانەکەی دیکە دوو هەنگاوی لێ دوور دەکەوتەوە و لاقی هەڵدەکردن. یاریزانەکانی تر بە مەرجێ دەستیان لە لاقی ئەو یاریزانە دابایە کە لاقەکانی هەڵکردوون و داری جۆڵایان وەنەکەوتبا ئەو یارییەکەیان بەردبۆوە، بەڵام ئەگەر داری جۆڵایان وێکەوتبا ئەوە دەدۆڕان. دەگەڵ ئەوەی جۆڵا دارەکەی لێدەدان دەیگووت: ئەوە شەتیتەی پێوە دەدەم!

سێ کوچکە:

دوو کەس کە یەکی دیکەیان لە مابەینە، بەرامبەر بە یەک ڕادەوەستن، ئەو دوو کەسە تۆپێکیان بە دەستەوەیە و دەبێ بە جۆرێک بۆ یەکتری باوێن کە نەفەری مابەینیان نەتوانێ تۆپەکە بگرێتەوە و ئەگەر تۆپەکەی بگرێتەوە، ئەو کەسەی کە تۆپەکەی خراپ هاویشتووە و دە دەستی کردووە، دەبێ جیگۆڕکێ بکەن و بچێتە مابەینی دوو یاریزانەکە و هەوڵ بدا تۆپەکە بگرێتەوە.

گزمووڵێن:

گڵەسوورەی بە ئاو دەگرنەوە و هێندەی بە عەرز دادەن تاکوو توونە دەبێ و لە پاشان هێندێک شت کە "گزمووڵە"ی پێدەڵێن، لەم قوڕە ساز دەکەن و لە سەریان دایاندەنێن تا ئیشک ببنەوە و لە کایەی "مێشێن" کەلکی لێ وەردەگرن و وەک نیشانە دایاندەکەن. هەر کەسێک بدۆڕێ دەبێ گزمووڵەیەک بدا بە بەرانبەری کە حەریفیان پێ دەگووت. ئەم کایە هەر بەم ناوە باو بوو هەر چەند وەک مێشێن بوو.

هەیباب:

یاریزانەکان دەبنە دوو دەستە، دەستەی یەکەم خۆیان دەشارنەوە و دەستەکەی دیکە هەڵدەتروشکێن و سەریان بە سەری یەکەوە دەنێن. ئەندامانی دەستەی یەکەم کە خۆیان حەشار داوە، سەردەستەی گرووپی دووەم کە "مەلا"ی پێدەڵێن دەچێ، دەچێ تا بیاندۆزێتەوە. مەلا دەگەڵ دۆزینەوەی هەر کام لە یاریزانەکان، دەبێ خێرا خۆی بگەێنێتەوە لای هاوڕێکانی کە دانیشتبوون و "جووجکە"یان پێدەڵێن و پارێزگاریان لێ بکا نەوەکوو

دەستەی بەرانبەر بگاتە سەریان. بەو شێوە ئەگەر بەر لە حەریفەکەی بگاتەوە لای جووجکەکانی و لە دەوریان هەڵسووڕێ، کەس ناتوانێ زەفەریان پێ بەرێ، بەڵام ئەگەر دەستەی بەرانبەر هەلیان بۆ هەڵکەوێ و زووتر لە مەلا بگەنە سەر جووجکەکان دەتوانن لە جووجکەکان بدەن و بە گاڵتە بڵێن: هەییاب... هەییاب.... هەییاب و بەو جۆرە سەرکەون و یارییەکە بەرنەوە.

**قۆچەقانی لەبێلەبێ:**

یاڤیزانەکان دەبنە دوو دەستە، سەردەستەیەک دەڵێ: قۆچەقانی لەبێلەبێ...

سەردەستەی گرووپی بەرانبەریش دەڵێ: کەوشەسوورەی من لە کوێ لە کوێ...؟

سەردەستەی یەکەم دەڵێ: لە فلانماڵ (ماڵە کاک حەسەن)

یەکێک لە یاریزانەکانی گرووپی یەکەم دەچێتە کۆڵی یاریزانێکی گرووپی دووەم و دەچن بۆ ئەو ماڵەی کە گوتوویانە، لەو ماڵە دەپرسن: ئەرێ بۆ کەوشەسوورەی کەر سواری بار بێ یان بار هەر لە سەر کەر بێ؟

ئەو ماڵە ئەگەر بڵێن: "با کەر سواری بار بێ"، ئەوەی لە کۆڵی ئەوەی دییە، دێتە خوار و جێگۆڕکێ دەکەن، بەڵام ئەو ماڵە ئەگەر بڵێن: "هەر بار سواری کەرێیە"، دەبێ بارەکەی دانەنێ و یاریزانەکەی هەروا لە کۆڵ بێ و بگەڕێتەوە ئەو شوێنەی لیی هاتووە.

**کەپرێ بە کەشکان:**

چوار کەس بە ڕاوەستانەوە سەریان پێکەوە دەنێن و دەستیان تووند لە ملی یەکتر دەکەن و هەوڵ دەدەن ئەو کەسەی لە پەنایان ڕاوەستاوە خۆی باوێتە سەر، بەڵام ئەو ئیزن نادا و بە شەپ هاویشتن بەرگری لە خۆی دەکا و شەپی لە کامیان بکەوێ، ئەو یاریزانە یارییەکە دەدۆڕێنێ و دەبێ لە کایەکە بچێتە دەر. هەر یاریزانێک بەبێ ئەوەی شەقی وێکەوێ بتوانێ خۆی باوێتە سەر شانی ئەو کەسە یارییەکە دەباتەوە.

**کۆسە بە داس:**

دەستەیەک پیاو [زیاتر لاوەکان ئەم کایەیان دەکرد] لە نێو خۆیان کەسێک هەڵدەبژێرن و بە مووی بزن ڕدێنی بۆ دادەنێن، برۆی سپی دەکەن، نێوچاوانی ڕەش دەکەن، باڵەنجێکی لە پشتی دەنێن، عەبای لە بەر دەکەن و گۆچانی دەدەنە دەست و ماڵ بە ماڵ و جاری وایە دێهات بە دێهات دەیگێڕن کە لە دەرگای ماڵەکان دەدەن هاوڕێکانی خۆیان دەشارنەوە. هێندێک خانەخوێ، بەتایبەت ئەگەر ئافرەت بوویا، دەترسێن دەرگای بکەنەوە.

پاشان ئەو کەسانەی دەگەڵ کۆسەن لە بەر دەرگای ماڵەکە دەست دەکەن بە هەڵپەڕکێ و خاوەن ماڵ هەر دیارییەک بێ دەیانداتێ.

سەبارەت بەوەی کە ئاخۆ "کۆسە بە داس" کایەیە یان نا، بیروڕای جیاواز هەیە. بەشێکی زۆر دەڵێن ئەمە زیاتر ڕێوڕەسمێکی تایبەت بە نەورۆزە.

**فڕفڕێن:**

چەند منداڵێک لە دەوری یەک کۆ دەبنەوە، قامکی شادەیان لە سەر عەرز لە لای یەک دادەنێن، کەسێک ناوی ئاژەڵەکان و باڵندەکان بە دەنگێکی بەرز دێنێ، بۆ وێنە ئەگەر بڵێ کۆتر، دەبێ دەسبەجێ هەموو یەکڕا قامکیان بەرز کەنەوە و بڵێن "فڕی". هەر ئەو کەسە دیسان بە دەنگی بەرز دەڵێ: فڕی... فڕی... فڕی... مانگا فڕی. دیارە چوونکە مانگا نافڕێ کە وایە کەس نابێ قامکی بەرز کاتەوە.

بەم چەشنە ئەو کەسە هەر جارەی ناوی ئاژەڵ یان باڵندەیەکی دێنێ و هەر کەس بە هەڵە قامکی بەرز کاتەوە یان بە وەخت قامکی بەرز نەکاتەوە دەسووتێ و لە گڕی کایەکە دەردەکەوێ.

**ئەلیاس:**

یاریزانەکان جغزێک لە سەر زەوی دەکێشنەوە لە مەودایەکی ٤ ـ ٥ میتریڕا بە نۆبە جگەکانیان داوێنە نێو جغزەکە و هەر کەس بتوانێ جگی بەرانبەری لە نێو جەغزەکەدا بهەنگێوێ جگی دۆستەکەی دەباتەوە.

خوگەمله (له "بێهەنگوین"١ بەم کایه دەڵێن تێکهەڵکێشەکێن):
دوو کەس بەرامبەر بە یەک دادەنیشن، پشتێندێکیان لە ملی دەکەن و ئەوانیش بە دانیشتنەوە لاقەکانیان بە یەکترەوە گرێ دەدەن و بەبێ ئەوەی کە پاڵ بدەنەوە، بە هەموو هێز و تواناوە یەکتر ڕادەکێشن، هەڵبەت هەر بە هێزی لاقان و دەستەکانیان لە سەر سینگیان دادەنێن. بەو شێوە هەر کامیان بە هێز و تاقەتی ملی بتوانێ ئەوی دیکە ڕاکێشێ و لە جێگای خۆی بەرزی کاتەوە، کایەکەی بردۆتەوە.

کەبابکەبابێن:
یەکێک لە یاریزانەکان هەر دووک بەری دەستی دادەنێتە سەر بەری دەستی یاریزانێکی تر و دەبێ وشیار بێ هاوکایەکەی لە پشتی دەستی ڕانەکێشێ. هەر جارێک وەپشتی دەستی کەوێ، دیسانەوە دەبێ هەر ئەو دەستەکانی لە بەری دەستی هاوکایەکەی دانێتەوە و دیسان وشیار بێ وێینەکەوێ و ئەگەر وەپشتە دەستی نەکەوێ لە کایەکە سەرکەوتووە و ئەو جار ئەو دەبێ دەستی دانێ و ئەگەر وشیار نەبێ وێکەوێ. جاری وا بووە ئەوەندی وەپشتەدەستی کەوتووە وەک کەباب سوور بۆتەوە و هەر بۆیە بەو یارییە دەڵێن "کەباب پێوەدان" یان "کەبابی پێوەدا".

دیوار بستە:
یاریزانەکان "قەرەپووڵ"ێک بە دەستیانەوە دەگرن، یەکیان دەست پێدەکا و قەرەپووڵەکەی بە دیواری دادەدا، چاو لە قەرەپووڵەکەی دەکەن بزانن لە کوێ دەکەوێ، پاشان یاریزانی دووەم قەرەپووڵەکەی بە دیواردا دەدات، ئەگەر پووڵەکەی یاریزانی دووەم بستێک یان کەمتر لە بستێک مەودای لەگەڵ قەرەپووڵەکەی یاریزانی یەکەم بوو، یاریزانی دووەم قەرەپووڵی یاریزانی یەکەم هەڵدەگرێ و قەرەپووڵەکانی خۆی دەبێ بۆ یاریزانی سێهەم بەجێ هێڵێ و کەسی سێهەم هەر ئاوا دەست پێدەکات، بەڵام ئەگەر مەودای لە بستێک زۆرتر بێ ئەو کەسەی دووهەم حەقی نییە قەرەپووڵی خۆشی هەڵگرێتەوە و یاریزانی سێیەمیش هەر بەو شێوە، بەڵام ئەگەر بستێک لەگەڵ هەر کامیان مەودای هەبێ ئەوی هەڵدەگرێ و ئی خۆی جێ دەهێڵێ ئەگەر لە هەر دووکیان نزیک بێ هەر دووکیان هەڵدەگرێ و ئی خۆی جێ دەهێڵێ، ئەگەر بستێک زیاتر لەگەڵ ئەوانی دیکە مەودای هەبوو بۆ ئەوانی دی جێ دەهێڵن، ئەگەر تا کۆتایی یارییەکە کەس نەیبردەوە سەرلەنوێ هەر کەس بە قەرەپووڵەکەی خۆی یارییەکە دەست پێدەکاتەوە.

هەشتا بەردێن:
هەشتا بەرد کە مەودای هەر کامیان لە یەکتر گەزێکە ڕیز دەکرا، دوو کەسیان هەڵدەبژارد و هەروەها داوەرێک کە "مەلا"یان پێدەگووت. خەڵکێکی زۆر سەیری ئەم کایەیان دەکرد. دوو کەسی بەرانبەر لە "شارە" ڕادەوەستان، مەودایێکی ٣ ـ ٤ کیلۆمیتریان بۆ یاریزانی یەکەم دیاری دەکرد و وایان دادەنا کە بچێ و لە شوێنێک فڵانە نیشانە یان شتێک کە پێشتر لەوێ داندراوە بێنێ. لەم دەرفەتەدا کە ئەو دەچوو ئەو شتە دیاریکراوە بێنێ، یاریزانی دووەم دەبوو ئەو هەلە بقۆزێتەوە ئەو هەشتا بەردە ڕیز کراوەی دەنکەدەنکە هێنابایەوە شارە.
بەو مەرجەی یاریزانی دووەم هەموو بەردەکانی هێنابا و لە شارە کۆی کردبانەوە، بەڵام کەسی یەکەم هێشتا نیشانەی نەهێنابا، ئەوە یارییەکەی بردۆتەوە، بەڵام ئەگەر یاریزانی یەکەم خۆی گەیاندباوە شارە و یاریزانی دووەم هێشتا بەردەکانی بەتەواوی کۆ نەکردبایەوە ئەو کایەکەی بردۆتەوە.

بەردە بە کۆشێن:
یاریزانەکان دەبنە دوو دەستەی دە کەسی و بەرانبەری یەکتر دادەنیشن و لاقیان درێژ دەکەن، هەر دەستەیەک سەردەستەیەکی دەبێ کە "مەلا"ی پێدەڵێن. لە نۆرەی هەر دەستەیەکدا مەلا یان سەردەستە، بەردێک لە نێو کۆشی یەکێک لەو دە کەسەی دەستەی خۆیدا دەشارێتوە، ئەو جار مەلای دەستەی بەرانبەر بە ئانقەست لەگەڵ ئەندامانی دەستەی خۆی ڕاوێژ دەکا تا بکەونە شک و گومانان، ئەوان شکەکانی خۆیان دەڵێن، بۆ وێنە دەڵێن: ـ بەردەکە لە لای فڵانە کەسەیە ـ ئەگەر بەردەکە لە کۆشی ئەو کەسە دابێ و دروستیان هەڵدابێ ئەو کایەکیان بردۆتەوە و دەستەی براوە تا شوێنی دیاریکراو کە شارەیان پێدەگووت سواری کۆڵی دەستەی دۆڕاو دەبن، بەڵام ئەگەر دروستیان هەڵنەدابا بە پێچەوانە ئەوان سواری کۆڵی دەستەی دۆڕاو دەبوون.

**ئاشی بە بای*:**

سەری دارێک بە کولانەدا دێننە ژووێ و کەسێک بە دزی بە ئافتاویەک ئاوەوە دەچێتە سەربانی، ئەو کەسانەی لە ژوورەوەش دانیشتوون دەڵێن وەرن با "ئاشی بە بای" دروست دەکەین. بەو شێوە سەری گوریسێکی دێنن لە دارەکەی سەر کولانەی دەبەستن و سەرەکەی دیکەشی لە سەوەتەیەکی دەبەستن، کەسێکی فەقیرحاڵ، یا ئەوەی بەو کایە نازانێ، دە سەوەتەکەی دەنێن و دەیسووڕێنن. دەگەڵ سووڕانی سەوەتەکە گوریسەکەش بادەدرێ و لێک دەهاڵێ و هەروا کورت دەبێتەوە تا ئەوەی سەوەتەکە دەگاتە نزیک بەری میچی. لەو وەختەدا کابرای سەربانی بە ئافتاوەکە ئاوی دە سەوەتەکە دەکا و ئەوانی خوارێش کە تا ئێستا سەوەتەکەیان لە ژێرەوە گرتبوو، بەریدەدەن، ئەو جار سەوەتەکە بەپێچەوانە دەسووڕێتەوە و ئاوەکەش بە کون و کەلێنی سەوەتەکەدا دەپرژێتە دەرەوە و خەڵکەکە لە قاقای پێکەنینێ دەدەن. هەتا گوریس خاو دەبێتەوە سەوەتەکە هەروا دەسووڕێ.

**بووکەبارانە:**

دەستەیەک منداڵ بۆ ساز کردنی بووکەبارانە بەتایبەت لە ویشکەساڵییەکاندا دوو قوڵەدار دێنن کە یەکیان ۵۰ سانتیمیتر تا ۱ میترە و ئەوی دیکەیان ۱ میتر تا ۲ میترە، ئەو دوو دارە بە شێوەی خاچ لێک قایم دەکەن، پاشان جلکی کوردی ژنانەی تێهەڵدەکێشن و دەیرازێننەوە.

یەکێک لە منداڵەکان بووکەبارانەکەی بە دەستەوە دەگرێ و وێڕای منداڵەکان بە کووچە و کۆڵانەکاندا دەسووڕێنەوە و لە دەرگای ماڵان دەدەن، خاوەن ماڵ ئاو بە بووکەبارانە و منداڵەکاندا دەپرژێنی و دیاریان دەداتێ، دیارییەکانی ناوچەی موکریان زۆربەی هێلکەیە. دوای تەواو بوونی مەراسمی بووکەبارانە منداڵەکان ئەو نوقڵ و نەبات، هێلکە و هەموو ئەو خەڵاتانەی وەریانگرتووە لە نێوان خۆیاندا بەشیان دەکەن.

منداڵەکانی موکریان کە بووکەبارانەیان پێیە و بە کۆڵانەکاندا دەسووڕێنەوە بە یەکەوە دەڵێن:

| | |
|---|---|
| بووکەبارانە ئاوی دەوێ | ئاوی نێو دەغڵانی دەوێ |
| دەرزیلەی گەورەکچانی دەوێ | هێلکەی بارۆکانی دەوێ |

لە کوردستانی باشوور بەتایبەت لای هەولێر دەڵێن:

هەیاران و مەیاران یاخوا ببارێ باران

گەنمی حەسەن و حوسەینان هەموو قڕ بوون لە تینان

*یان:*

| | |
|---|---|
| بووکەبارانێ | سەعاتی جارانێ |
| ئاوی نێو دەغڵانێ | هەیاران و مەیاران |
| یاخوا داکاتە باران | بۆ فەقیر و هەژاران |

هەروەها ئەوەش دەڵێن:

| | |
|---|---|
| بووکەبارانێ | سەمەنی جارانێ |
| ئاوی نێو دەغڵانێ | هەیاران و مەیاران |
| دەنگێ دێتە گوێمان | لە گرمەی هەور و باران |

بەڵام لە لای هەورامان دەگکوترێ:

| | |
|---|---|
| یاخوا وارۆ پەی خەلەی | گیواو بزیو پەی گەلەی |

---

* کایەی "ئاشی بە بای" لە فەرهەنگی زارەکی موکریاندا، پیتی "ئـ" نووسراوەی سەلاح پایانیانی، جوانتر ئاماژەی بەو بابەتە کردووە، هەر بۆیە راستەوخۆ دەقی ئەو بەرێزەمان هێناوە.

حەیبۆکێ:

(مەلا عەولا فاتحی)

کایەکە کچان دەکەین و هەڵدەتروشکێن و وەک "کەلاغپەر" دەێن و دەچن و بە نۆرە بەندان دەڵێن، هەر کەس بەندی تەواو بوو یا ماندوو بێ و لە عەرەکە دانیشتێ دەدۆڕێ. لەم کایەدا ئەو بەندانە دەڵێن:

لە دێران لە دێران / چاوی خۆم دەگێڕان / لە دووی گوارەزێڕان

لە سەر تەختەداری / سەلا لە بریندار / گرموهۆڕی سواری

برینداری گامێشێ / بەردان دەقەڵێشێ / هێنام پەڕی مێشێ / بۆ برینی دەرویشێ

لە سەران لە سەران / دەنگی گاو و گەران / مەمدەن بە نۆکەران / زوو دەچنە سەفەران

سەفەریان پیرۆز بێ / سواری ماینی بۆز بێ / لە ڕێی تەپوتۆز بێ / دۆستی کیژی قۆز بێ

قۆزێ لە منت کەوێ / هەستە نیوەشەوێ / بزانە لاوە چی لە تۆ دەوێ / سەنیر تووکی کەوێ / تا خەوی لێ دەکەوێ

خەوی بەربەیانی / دەسرۆکە و کۆڵوانی / دام بە دەسگیرانی / بابم پێی نەزانی / دەمکووژێ بە دەبانی

دەبان جەوهەرداره / لە دەست شۆڕەسواره / دەڵێن برینداره / بۆی دەفرۆشم گواره / برینی دەکەم چاره

لە سەران بۆ سیر دێ / لاوچاکی کورەمیر دێ / دەنگی گۆڵی پیر دێ

حەیبۆکێ بە مالانم / دەرزیلە و کلدانم / خوشکی دوو برالانم

دوو برالەم پێ بێڵی / لەسەر بەردەبێڵی / کیژی گوارەسێڵی

لەسەر بەردەبووکێ / هینام تاقە بووکێ / زاوام ڕەزاسووکێ

تاقە بووکێ میری / هێنام بە یەخسیری

یەخسیری قەڵاتێ / دەسرۆکێکم داتێ / لە بۆ برینی فاتێ

فاتێ چاو ئەستێرێ / دەنگ دەگەڵ بلوێرێ / نابێ خۆ ببوێرێ

برینداری خۆمە / سواری ئەرزەڕۆمە / تۆ لێم مەگرە لۆمە

بەردی دەبنە بانێ / بەختی خەجە جوانێ / کەوتووە لە کۆلانێ

خەجە جوان کوژراوا / مەمکی سەری هەڵداوا / جێی هێشت کۆزی ساوا

دەسرۆکەی هەورینی / پێچام لە برینی

قۆزێ لە منت کەوێ / هەستە نیوەشەوێ / زوو بگە نێو ڕەوێ / لاو ئەسپی لێت دەوێ / سەنیر تووکی کەوێ / تا خەوی لێکەوێ

زاوا زیلێ:

(مەلا عەولا فاتحی)

دەستەیەک کچۆڵە لێک کۆ دەبوونەوە و قامکیان لە قامکی یەکتر دەکرد و هەڵدەپەڕین و ئەو چەند بەندەیان دەگووت:

| | |
|---|---|
| زاوا زیلێ، بووک دەرزیلێ، حێلالانێ | زاوا قەلە، بووک خەرتەلە، حێلالانێ |
| زاوا مشکە، بووک دووپشکە، حێلالانێ | زاوا زێوە، بووک وەک خێوە، حێلالانێ |
| زاوا مارە، بووک بێعارە، حێلالانێ | زاوا زیلە، بووک وەک قیلە، حێلالانێ |
| زاوا شڕە، بووک دۆبڕە، حێلالانێ | زاوا کەڵە، بووک تەمبەڵە، حێلالانێ |
| زاوا لووکە، بووک باڕۆکە، حێلالانێ | زاوا کەوە، بووک وەک شەوە، حێلالانێ |
| زاوا لەڕە، بووکمان کەڕە، حێلالانێ | زاوا کۆڵە، بووک خەرتەلە حێلالانێ |

شووبەکان:

دوو کچ بەرانبەری یەکتر دەوەستن و شەڕەبەندان دەکەن و دەستیان بۆ یەک ڕادەدێرن، هەر کەس بەندێکی دەڵێ و هەر کامیان بەندی زیاتر بزانێ یارییەکە دەباتەوە.

ئەمەی کە لە ژێرەوە هێناومانە لە بنەڕەتەوە فۆلکلۆرە و جێگا جێگای "مەلا عەولا فاتحی" ڕاستی کردوونەوە:

شـووبەکـان حـەسـیر حـەسـیر     شـووبەکـان دوو کـوڕەوەزیـر
شـــووبەکـــان مـــاری ئـــاوێم     شـــووبەکـان خـۆت بـۆ داوێـم
شـــووبەکـــان مـــاری ڕەشـــم     شـووبەکـان خـۆت بـۆ دەکوشـم
شـــووبەکـــان هـــەرزن هـــەرزن     شـــووبەکـــان پێـــستەبـــزن
شـــووبەکـــان کـــەوی شـــاخم     شـــووبەکـــان لێـت بـــەداخـم
شـــووبەکـــان مـــاری ســـپیم     شـــووبەکـان لـــەســـەر چڵـــەبیم
شـــووبەکـــان غـــوولی کێـــوم     شـــووبەکـــان خـــۆ دەبزێـــوم
شـــووبەکـــان دەســـکەســـیرم     شـــووبەکـــان لـــە ملـــت گیـــرم
نـــــەمـــــرم دەتبـــــەزێـــــنم     دێخونـــــەکـــــەت دەپـــــسێنم

بـــۆ بـــرای خۆمـــت دێـــنم

شـــووبەکـــان دەســـکەپـــاچم     شـــووبەکـــان تێتـــڕادەچـــم
شـــووبەکـان بـــەزیـــو بـــەزیـــو     شـــووبەکـان هـــەڵـــێ کچـــەتیـــو
شـــووبەکـــان لـــە ســـەر دارێ     شـــووبەکـــان وەرە خـــوارێ
شـــووبەکـان لـــە ســـەر چـــۆمی     شـــووبەکـــان حیـــزی خـــۆمی
شـــووبەکـان لـــە ســـەر ئـــاوێ     شـــووبەکـــان ســـەر تاشـــراوێ
شـــووبەکـان لـــە ســـەر گـــردی     شـــووبەکـــان مـــارەم کـــردی
شـــووبەکـــان گـــوڵان گـــوڵان     شـــووبەکـــان دۆســـتی زۆڵان

(مەناف عەبدوڵلازادە)

شـــووبەکـــان ئـــەنـــەومـــەنـــە     شـــووبەکـــان دەســـکەشـــەنـــە
شـــووبەکـــانی بـــە ترکـــی     پاڵمـــــان داوە لــــە ملکـــی
ملکـــی خۆمـــان چـــەنـــد خۆشـــە     قـــەراغ مـــاڵان چـــەنـــد ڕەشـــە
گیـــسک، بـــزن، عـــاڕەبـــی     خـــــشەی داوا لــــــە زەوی
زێیـــــە پۆپـــــە لار دەکـــــا     کـــاکم ســـەر قـــەتـــار دەکـــا

"محەممەد ڕەسووڵی"

شـــووبەکـــان ئـــەمـــن و ئـــەتـــۆ     شـــووبەکـــانی نامـــدەن بـــە تـــۆ
شـــووبەکـــان ماڵمـــان لێـــرە     شـــووبەکـــان وەک ئـــەســـتێرە
شـــووبەکـــان ئـــەمـــن دەیڵـــەم     شـــووبەکـــان گـــوێ ڕادێـــرە

**شارەشارێن:**

کەسێک (یان جاری وایە دەستەیەک) چاو دەقووچێنێ و چەند کەسێکی دیکە لە کون و کەلێنان خۆیان حەشار دەدەن، ئەو کەسە دەبێ وریا بێ و پارێزگاری لە شوێنێک بکا کە "شارە"ی پێدەڵێن و نەهێڵێ کەس دەست لەم شوێنە بدا و سەرکەوێ، ئەو دەبێ هەموو ئەو کەسانە ببینێتەوە و دەرفەتی ئەوەیان نەداتێ بگەنە شارە و بەو شێوە کایەکە بەرێتەوە.

**شێر و خەت:**

قەرەپووڵێک کە لایەکی شێری پێدەڵێن و لایەکەی تری خەت، یەکەم یاریزان بەر لە هەڵاویشتنی قەرەپووڵەکە لە یاریزانی بەرانبەری دەپرسێ: شێر یان خەت؟ ئەگەر بۆ وێنە بڵێ "شێر" و لە دوای نیشتنەوەی قەرەپووڵەکە "شێر" بوو، ئەوە یارییەکە دەباتەوە و ئەگەر وا نەبوو (خەت) بوو، قەرەپووڵەکەی دەدۆڕێنێ و دەبێتە هی هاوکایەکەی. بەم جۆرە ئەم کایە درێژەی دەبێ.

**جۆرابێن:**

دە جووت گۆرەوی (گۆرەوی بن یان مەرەز) و مازوویەک بۆ ئەم کایە پێویستە. یاریزانەکان دەبنە دوو دەستە و لە بەرانبەری یەک دادەنیشن، گۆرەوییەکان هەموو ڕوویان لەو دەستەیە کە قەرارە مازووەکە لە نێو لینگە گۆرەوییەکاندا بشارێتەوە. بۆ دەستەی بەرامبەر وەشک نەکەون، ئەندامانی ئەو گرووپەی مازووەکە حەشار دەدەن نابێ چاو لەو گۆرەوییە ببڕن کە مازووەکەی تێدا شاردراوەتەوەیە. هەڵبەت زۆر جار بۆ فریودان چاو لە گۆرەوەییەک دەبڕن کە مازووی تێدا نییە، لە دوای حەشاردانی مازووەکە دەستەی بەرامبەر دەتوانێ تا چەند جار بەو دەستەیەی مازوویان شاردۆتەوە بڵێ "فڵان گۆرەوییەم بۆ وەرەوە" و دەستی پێدا بێنێ ـ یانی دیسان بیگەڕێتەوە ـ پاشان ئەو کەسەی خەریکە مازووەکە دەبینێتەوە، لە پرس بە ئەندامانی دەستەکە دەکا و دەڵێ شکت لە کامە گۆرەوییە و شکەکانیان دێڵنەوە و ئەوانی دیکە هەموو پووچ دەکەن.

لە نێو شکەکانیشدا شکە سەرەکییەکان دێڵنەوە و وردەوردە ئەوانی دیکە پووچەڵ دەکەن و لە کۆتاییدا گوڵێک لێدەدەن واتا ئەو گۆرەوییەی مازووەکەی تێدایە هەڵیدەدن، ئەوان حەقیان هەیە کە دوو گوڵی لێدەن و زۆرجار دوو گۆرەوی کۆتایی دێڵنەوە. ئەگەر ئەو دەستەیە بتوانێ لە لێدانی گوڵدا مازووەکە بدۆزێتەوە ئەوە بردوویانەتەوە و ئەو جار گۆرەوییەکان ڕوویان لە وان دەبێ و مازووەکەی دەشارنەوە.

# وێنەکانی کڵاوی کوردی

"سەید عەبدوڵڵا سەمەدی"

هەر نەتەوەیەک بە پێی زەوق و سەلیقە و لێهاتوویی خۆی، هونەرگەلی دەستکردی هەیە؛ ئەم هونەرانە بەشێکن لە کەلەپوور و فەرهەنگی ئەو نەتەوەیە. گەلی ئێمە لەم مەیدانەدا سەلیقە و لێهاتوویی خۆی نواندووە و لە زۆربەی چەشنەکانی ئەم هونەرانەدا ناوبانگی دەرکردووە، بۆ نموونە؛ ئامێرە دارینەکانی شاری سنە، قالی هەوشار، فەرشی ئیلام و لوڕستان، جاجم، بەڕە، بەرماڵ، پۆپەشمین، کڵاو، گۆرەوی، دەستەوانە، زەنگاڵ، کراس و بووزووی شارەکانی تری کوردستان، لووتکەی هونەرە دەستکردەکانیان بۆ خۆ تەرخان کردووە و هەروا تاقانە و بێ ڕەقیبن، بەڵام بەداخەوە بە هۆی پشتگری نەکردن و یاریدە نەدان هەروەها بە هۆی پەیدا نەبوونی مەکینە، ئەم هونەرە گرینگانە وردە وردە لە کزێ دەدەن و بەرەو فەرامۆشی و لە بیر چوونەوە دەڕۆن.

یەکێک لە هونەرە دەستکردەکانی کوردی، هونەری چنینە و لەم جەغزەشدا، چنین بە میل، کارێکی زۆر زەریف و ورد و گرنگە. چنین بە میل لە زۆربەی ناوچەکانی کوردستاندا باوە، بەڵام چوونکە نرخی کاری فۆلکلۆری لەوە دایە کە چوارچێوە جوغرافیاییەکەی دیاری بکرێ، چوارچێوەی ئەم کارەی من ناوچەی موکریانە، واتە ئەوەی لەم نووسینەدا باسی لێوە دەکرێ پێوەندی بە ناوچەی موکریانەوە هەیە و بەس. لەوانەیە لە ناوچەیەکی دیکە بەم جۆرە نەبێ. ئەو شتانەی کە بە میل دەچنرێن بریتین لە: کڵاو، گۆرەوەی، دەستەوانە و سەرمێز. "کڵاو" خۆی چەند جۆرە؛ کڵاوی میلی، کڵاوی شکاکی، کڵاوی تۆڕی، کڵاوی سیمی، کڵاوی سپی و کڵاوی قرمە و باقی. کڵاوی سپیش خۆی دوو جۆرە؛ کڵاوی ماشێن، کڵاوی دەستدروو، ئەم کڵاوانە ئەوانەن کە بە میل دەچنرێن، ئەگەر نا کڵاوی تریشمان هەن کە بە شیش دەچنرین، وەک کڵاوی لاسکدار(سەرکڵاوە)، کڵاوی بێ لاسک، کڵاوی ملدار، کڵاوی کون، کڵاوی بێ کون. دەستەوانەش خۆی بریتییە لە: پێنج قامک(پەنجە). چوار قامک. سێ قامک، دوو قامک. سەرمێز چەشنی گەلی؛ خڕ، هێلکەیی و چوارگۆشەی هەیە، سەرجەمی ئەو کارانە بە میل دەچنرێن، چنین بە میل تایبەتی ئافرەتانە و هیچ پیاوێک بە میل یا شیش خەریکی چنین نابێ، بەڵام چنینی سەوەتە کە بە دەست دەچنرێ، پتر بۆ پیاوە. ئەو شتانەی کە بە شیش دەچنرێن کەم وا هەیە نەخش و نیگارێکی ورد و بەرچاویان لە سەر بێ، بۆ وێنە: سەرکڵاوە، گۆرەوی، زەنگاڵ و کراس زۆر جار بێ نەخش نین و نەخشێکی درشتیان لە سەرە، بەڵام پتر ساکار و یەک ڕەنگ یا دوو ڕەنگ دەچنرێن و بەس، بەڵام ئەو شتانەی کە بە میل دەچنرێن سەرتاپا بە نەخش و نیگاری ورد ڕازاونەتەوە. ئەم نەخش و نیگارانە لە ناوچەی موکریانی "وێنە"یان پێدەگوترێ. کڵاوی میلی و گۆرەوی میلی و دەستەوانەی میلی و سەرمێزی میلی بە بێ وێنە نابن و ساکار و بێ نەخشیان بۆ نییە.

ئەم وێنانە چین؟ لە کوێڕا هاتوون؟ کێ دایاندێنێ و دەیانداتە دەست ئافرەتان تا لە سەر کرەکانیان دایانبەزێنن؟

وڵام ئەوەیە کە وێنەکان ڕاستەخۆ لە ژیان وەردەگیرێن. نەققاش لە سروشت دەڕوانێ و لە ژیانی ئاسایی بەهرە وەردەگرێ. دار، گوڵ، گوڵدان، گەڵا، وەنەوشە، سێوەڕە، چنار، گەنم، ئەسپەندەر، پەپوولە، ماسی، کۆتر، شانە، فانووس، ئافتاوە، لەگەن، پیاڵە، چرا، چلچرا، ئەسپ، سوار، قرژاڵ، خەنجەر، دەسکەخەنجەر، مشار و... دەبینێ و بەو جۆرە کە بیر و زەینی وەریدەگرێ، دەیخاتە سەر تابلۆی نەققاشی، بەڵام "بووم"ی نەققاشی هونەرمەندی کورد لە سەدەکانی ڕابردوودا، کڵاو، گۆرەوی، کراس، جاجم، بەرماڵ و پۆپەشمین بووە. هونەرمەندی ئێمە سەرەڕای هونەری چنین و تەنین، هونەری نەققاشی خۆیشی خستۆتە کار و لە ڕاستیدا هونەری لە نێو هونەردا بە کار هێناوە. ئەو جۆرە کە چناری بە بیر و زەیندا هاتووە لە سەر کرەکە دایبەزاندووە و بەو چەشنەش کە کۆتری بە خەیاڵدا هاتووە، لە کاتی چنیندا دەریخستووە. کە وایە ئەو وێنە و نەخش و نیگارانە سەربهورد و ڕابردووی نەققاشی کوردن و مامۆستا ناوبەدەرەوەکانی ڕەشتەی نەققاشیمان باش لەم ڕاستییە شارەزان، هەر وەکوو یەکێک لە نەققاشە گەورەکانمان فەرموویەتی: "ئێمە هونەرمەندی کوردمان وەک ڕەسسام نییە، سابیقەی ڕەسممان نییە وەک لە ئەورووپا سابیقەی کلاسیک و چەند سەدە ڕەسمیان هەیە. ئێمە ڕەسممان جاجمە، گۆرەوییە، بەڕەیە، کڵاوە و ڕەسسامەمان ئەو ژنانەن کە کڵاو دەچنن... "

کە وایە، وەک دانەری بەیتوباو، گۆرانی، بەستە و مەقامە فۆلکلۆر و ڕەسەنەکانمان شاراوە و نادیارە. دانەرەکانی ئەم وێنانەش شاراوە و نادیارن.

ئەم کارە، هۆنەرێکی فۆلکلۆرە و پێوەندی هەیە بە زەوق و سەلیقە و لێهاتوویی گەلی کوردەوە.

داهێنەری ئەم وێنانە دەچنە ڕیزی دانەرانی ئای ئای، حەیران، نیوەشەوی، تێهەڵکێش، سیاچەمانە و هۆرە، دەچنە ڕیزی ڕێکخەرانی سێ‌پێیی، گەڕانەوە، سوێسکە، شێخانی، ڕۆینە، لەنجە، داغە، چۆپی، مەریوانی و هەروەها دەچنە ڕیزی ئەو سەربازە ونانەی کە لە سەر بستەخاکێکی سووتاوماندا جێ پەنجەیان دیارە...

ئەمڕۆ تەنیا چینێکی پیر و بەتەمەن، کە پاشماوەی بەرەی ڕابردوون، ئەم وێنانە دەناسن و ناوەکانیان دەزانن و لە چنینیاندا شارەزان، ئەگەر نا کیژەکانمان لەم هونەرە دوور کەوتوونەوە و لەگەڵ "پەنجە پەری" و "میرزایی" و "جەفحەری" و "تەوریزی" و "مارانە" و "کرێشە" و "کرمەک" و "نەخودی" و "قولاپ" و "گەرچەک" بێگانە و نائاشنان.

لە ماوەی کۆ کردنەوەی ئەم وێنانەدا، تاکە کیژێکم نەبینی کە ناوی تاکە وێنەیەک بزانێ یا لە چنینی شارەزا بێت!

سەرجەمی ئەم وێنانە لە ئافرەتانی تەمەن سەرووی ٤٠ ساڵی وەرگیراون و ئەمە زۆر بە ڕوونی ئەوە پێشان دەدا کە تەمەنی وێنەکان لە ئاوا بوون دایە.

حاشیە و وێنەی تایبەتی سەر کێلی گۆڕەکان کە لە سەر بەرد هەڵدەکەنرێن، حاشیە و وێنەی تایبەتی خشتی سوور کە بۆ "کەتیبە" و "قرنیس" یا "پایە"، "تاق" و "سەردەرانە" بە کار دەبرێن، حاشیە و وێنەی تایبەتی دار، کە بۆ دەروازە و دەرکە کەلیان لێوەردەگیرێ و هەروەها هەندێکیان تایبەتن بۆ ئامێرە دارینەکانی وەک کەوچک، کەوچکی دۆ، گۆچان، مۆدنە، ژێرجگەرە، قوتوو جگەرە و تەختەنەرد، هیچیان چارەنووسیان لە هی وێنەی کڵاو باشتر نییە و هەموویان ڕوو لە فەوتانن. هێندەی من پێی بزانم، مامۆستا عەبدولرەقیب یووسف نەبێ، کە سووکەئاورێکی لە نەخشی سەر کێلەکان و دەروازە کۆنەکان داوەتەوە، هیچ کەسی دیکە خۆی پێوە ماندوو نەکردوون.

پێویستە ئەوە وەبیر بێنمەوە کە لایەنی زۆر گرینگی ئەم وێنانە "ڕەنگ"ەکانیانە. کارکردی جادووگەرانەی وێنەکان لە ڕەنگدا خۆی دەنوێنێ و کاتێک وەک کۆتر و لەتکەمیرزایی بە ڕەنگی زێوین لە سەر تەختی ڕەش سەیری دەکەی. هەروەها نەخشی "پەنجەپەری" بە ڕەنگی ئاوی لە سەر تەختی سپی چاو دەلاوێنێتەوە و ئارامی و حەسانەوەیەکی قووڵ دەبەخشێتە مرۆڤ. جاری وا هەیە دەیان ڕەنگ لە سەر تەپەی کڵاوێک دەستیان داوەتە یەک و تابلۆیەکی بێ وێنەیان پێک هێناوە. دنیای ڕەنگ خۆی لەم وێنانەدا دنیایەکی تایبەت و جیاوازە کە بەداخەوە لەم وێنانەدا نەمتوانیوە لە بەر چاوی بگرم، چوونکی گەلێک زەحمەتە و لە وزەی مندا نییە. هەر لە بەر ئەوەش دەبێ بڵێم مەبەستی من تەنیا پاراستنی لایەنی شکڵ و شێوەی وێنەکانی بووە و بەس. (هەڵبژاردەیەک لە ١١٢ وێنەی کۆ کراوە).

### پێوان، کێش، ئەژمار:

| | | |
|---|---|---|
| ١ هێکتاری بەراو بەرابەرە لەگەڵ | .... | ٣ تەغاری* بەراو |
| ١ هێکتاری دێمی بەرابەرە لەگەڵ | .... | ٢ و یەک دووەمی دێمی |
| ١ هێکتاری بەراو بەرابەرە لەگەڵ | .... | ٢ و یەک دووەمی کەویژ |
| ١ هێکتاری دێمی بەرابەرە لەگەڵ | .... | ٢ کەویژ |
| ١ هێکتاری بەراو بەرابەرە لەگەڵ | .... | ١٢ پووت |
| ١ هێکتاری دێمی بەرابەرە لەگەڵ | .... | ١٠ پووت |
| ١ تەغار بەرابەرە لەگەڵ | .... | ٤ پووت کێشی |
| ١ پووت (باتمان) بەرابەرە لەگەڵ | .... | ١٦ کیلۆ گرەم |
| ١ کەویژ بەرابەرە لەگەڵ | .... | ٥ پووتی کێشی |
| ١ باری بەراو بەرابەرە لەگەڵ | .... | ١٢ پووتی کێشی |
| ١ باری دێمی بەرابەرە لەگەڵ | .... | ١٠ پووتی کێشی |
| ١ هێکتار بەرابەرە لەگەڵ | .... | ١ بار |
| ١ بار بەرابەرە لەگەڵ | .... | ٢ کەویژ |
| ١ بار بەرابەرە لەگەڵ | .... | ٢/٥ تەغار |
| ٢ کەویژ بەرابەرە لەگەڵ | .... | ٢/٥ تەغار |
| ١ کیلە بەرابەرە لەگەڵ | .... | ١٦ کیلۆ |
| ٤ کیلە بەرابەرە لەگەڵ | .... | ١ تەغار |
| ٥ کیلە بەرابەرە لەگەڵ | .... | ١ کەویژ |
| ١٠ کیلە بەرابەرە لەگەڵ | .... | ١ بار |
| ١ داڵیە بەرابەرە لەگەڵ | .... | ٥٠ کیلە |
| ١ داڵیە بەرابەرە لەگەڵ | .... | ١٠ کەویژ |
| ١ داڵیە بەرابەرە لەگەڵ | .... | ١٢/٥ تەغار |
| سێ بەرابەرە لەگەڵ | .... | چوار کیلۆ گرەم |
| نیو سێ بەرابەرە لەگەڵ | .... | دوو کیلۆ گرەم |
| حەوت جۆش بەرابەرە لەگەڵ | .... | سێ کیلۆ گرەم |
| ١ جەواڵ بەرابەرە لەگەڵ | .... | ١٠ کیلە |
| ١ جەواڵ بەرابەرە لەگەڵ | .... | ٢ کەویژ** |

* لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان، هەر تەغارێک بەرامبەرە لەگەڵ چوار پووت یان چوار تەنەکەی ١٦ کیلۆیی ڕۆن، بەڵام لە باشووری کوردستان، هەر تەغارێک شەست و چوار تەنەکەیە.

** هەنبانەبۆرینە - لاپەڕەی ١٦٠، ئەستوونی یەکەم.

بۆ پێوانی دانەوێڵە لەسەر خەرمان، لە نێو مەنگوڕایەتیدا، لە "دارکیلە" کەلکیان وەردەگرت. کاتێک کیلەیان پڕ دەکرد دارێکی ساف و درێژ کە دارکیلەیان پێدەکوت، بەسەریاندا دەکێشا تا هەر چی زیادییە بڕژێ و دانەوێڵەکە لەگەڵ لێوی کیلەکە ڕێک بێ. ناوچەی محاڵ بەم دارە دەڵێن "کۆل".

لە ناوچەی مەهاباد لە دوو پێوانەی "کەویژ" و "تەغار"
کەلک وەردەگیرا.

گەز: کە "زەرع"یشی پێدەڵێن، پێوانەیەکە بۆ میتر (گەز) کردن نزیک بە نیو میترە (گیزە).

قامک: یەک بیست و چوارەمی گەز.

چارەگ: یەک چوارەمی گەز.

شەقاو: ٣٢ سانتیمیتر.

گۆترە: بێ ئەوەی شتێک بکێشن یان بیپێون بە گریمانە دەڵێن ئەوەندەیە.

سەر: پێوانەیە بۆ بژاردنی ئاژەڵ.

جەڵەب: بە چەند سەر ماڵات دەکوترێ کە ئامادەی فرۆشتنن یا فرۆشتراون.

گوێ: زیاتر لە کاتی فرۆشتنی مەڕ، بزن، کاوڕ یان گیسک دەکار دەکرێ، هەر سەر ئاژەڵ بە دوو گوێ دێتە ژمار، بۆ وێنە سەد گوێ بەرانبەرە دەگەڵ ٥٠ سەر ئاژەڵ.

مێگەل: دەیان سەر ئاژەڵی مەڕ، بزن، گیسک یان کاوڕ بە یەکەوە "مێگەل"ێکن.

گاڕان: چەندین سەر مانگا، جوانەگا بە یەکەوە "گاڕان"ێکن.

# چارەسەرکردنی هێندێک لە نەخۆشییەکان بە شێوەی کۆن و خۆماڵی

**دەست شکاندنەوە:**

"حاجی ژن" خەڵکی ئاوایی گەنەدار، ۹۳ ساڵی تەمەنە، وەکوو بۆخۆی باس دەکا، ئەگەر کەسێک جێگایەکی بشکێ و خواری بگرێتەوە، "بەردەسپیلکە" و "ڕەشکە" و "دەنکە خورما"ی دەکوتنەوە و بە دوگ لە کوتەپەڕۆیەکدا لە شوێنی شکاوی دەنێن، پاش چەند ڕۆژێک ئێسکەکە نەرم دەبێ و دەشکێتەوە، بەم شێوە ژانی دەست بۆ شکاندەوەی دووبارە کەمترە.

******

**قەبز بوون:**

لە ئاوایی قۆیتەڵ ئەگەر کەسێک قەبز (کارنەکردنی زگ) دەبوو، شیرەی گیای "هەمیشەبەهارە"یان لە کلۆقەندێک هەڵدەسوو و لەگەڵ خواردنی ئەو کەسە زۆر زوو چاک دەبووە.

******

**زگچوون و قەبزبوون:**

ئەو گیایانەی کە خەڵکی "مازەڵێ" وەک داوودەرمان دەکاریان دەکردن: "وێنجە کوێلکە" بۆ برین و زگچوون، "بێژان" بۆ قەبز بوون و زگئێشە.

******

**هەتوانی دوای پێوەدانی مار و دووپشک:**

لە ئاوایی "حاجی‌مامیان" مار یان دووپشک کە بە کەسێکێوە دەدا، گیایەکیان بە ناوی "گەڵا هەوێدار" لە جێگا برینەکەی دەبەست و ئەو گیایە هەرچی ژەهر و کێم و هەوا با دەکێشا.

******

**بۆ سڕینەوەی ئاسەواری سووتاون:**

لە ئاوایی "شۆڕاوا"، خەڵک گوڵی "قامیش" و گوڵی "بێژان"یان دەسووتاندن و لە شوێنی سووتاویان دەنان ـ هەڵبەت بەو مەرجە شوێنی سووتاوەکە تازە بووایە، بەو شێوە شوێنی سووتاوەکە نەدەما.

******

**دەرمانی زیبکە و ئاورە:**

لە ئاوایی "شۆڕاوا" کە شیرەی گیای "خووشیلک"یان دەگرت، لە "زیبکە" و "ئاورە"یان دەدان و پێی چاک دەبوونەوە.

❊❊❊❊❊❊

**بۆ خۆ شوردن:**

ئاوایی "کەپەکەند" و زۆربەی ئاواییەکانی ناوچە، بۆ سەرشوردن و خۆ شوردن لە گیایەکیان کەلک وەردەگرت بە ناوی "ئەسپۆن" کە بە ڕیشەوە هەڵیاندەکەند و لەتوکوتیان دەکرد و لە بەر خۆرەتاو هەڵیاندەخست و کە ئیشک دەبۆوە خۆیان پێ دەشورد.

❊❊❊❊❊❊

**دەرمانی ژانی گەدە:**

گیای وەکوو "جاترە" و "بێژان" کە بۆ ژانی گەدە بەکار دێن لە داوێنی کێوەکانی "دۆڵپەمۆ" کۆ دەکرێنەوە.

❊❊❊❊❊❊

**دەرمانی کێم و هەوا:**

لە ئاوایی "کولیج"ە گیایەکی گەڵاپان کە "گەڵا ڕکێشە"ی پێدەڵێن شەوێ تا بەیانی لە سەر برینیان دادەنا، ئەو گەڵایە هەرچی کێم و هەوا بوو دەکێشا.

❊❊❊❊❊❊

**دەست جەمام بوون، دەرمانی برین:**

کەسێک کە لە ئاوایی "کولیجە" دەستی جەمام بووبا گیای "مێکوک"یان هەر بە تەڕی لە سەر دادەنا و بە پەڕۆیەک دەیانبەست.

گیایەک بە ناوی "گیاباریکە"یان بۆ چاک بوونەوەی برین دەکار دەکرد. پاش ئەوەی ئەو گیایەیان ئیشک کرد دەیهاڕن و دەبێتە تۆز و لە دوایی لە جێگا برینەکەی دەدەن، هەڵبەت پێشتر دەبێ شوێنی برینەکە خاوێن کرابێتەوە و دوو سێ جاران ئەو کارە دووپات بێتەوە.

لە ئاوایی کولیجە، مانگایەک کە گوێلکی دەبوو بۆ ئەوەی زوو لێ بێتەوە دەستیان بە زگیدا دەخشاند و دارێکیان بە زگیدا دێنا کە "دارژان"یان پێدەکوت.

❊❊❊❊❊❊

دەرمانی کوان، دەرمانی ژانی پشت و لاق:

لە ئاوایی "کامەم" کەسێک کە کوانی لێدەهات، گیایەکیان دەکار دەکرد بە ناوی "بۆگەنیوە".

هەروەها ئەو کاتی پشت یان لاقیان دەیشا لە گیایەک کەلک وەردەگرت کە "قاللۆرەسوورە"یان پێدەکوت. لەم ئاوایییە ژنێک بە ناوی "حاجی فاتم" گیاوگۆڵی بۆ دەرمان کۆ دەکردنەوە.

******

زگئێشە، دەدانئێشە:

لە "قەلاجۆغە"ی محاڵ کەسێک کە زگی ژانی کردبا تۆوی گیای "شیوەران"یان دەکار دەکرد، هەروەها بۆ چارەسەری ژانی ددان لە تۆوی گیای "غەریبەنگ" کەلکیان وەردەگرت.

******

دەرمانی برین، زیبکە، زگئێشە:

لە ئاوایی "سمێنوو" بۆ چارەسەری برین لە گیای "وەرمزە" کە گیایەکی بەرزی گوڵکەسک یان وەنەوش یان شینە، کەلکیان وەردەگرت.

هەروەها ریشەی "ترشۆکەگایە"یان دەکوڵاند و ئاوەکەیان دەخواردەوە کە بۆ زگئێشە و دەرمانی زیبکە باش بوو.

ئەگەر کەسێک مەسموم بووبا لەو گیایەیان کەلک وەردەگرت کە زۆربەی وەرزەکانی ساڵ هەر شینە و "هەمیشەبەهارە" پێدەڵێن. شیرەی هەمیشەبەهارەیان لە کلۆ قەندێک هەڵدەسوو و دەیانخوارد، ئەو کەسە پاش ئەو کلۆ قەندەی دەخوارد دەرشایەوە و چاک دەبۆوە.

******

گیای وەرمەز:

بەساڵاچووانی ئەم گوندە دەیانگێڕاوە کە گۆیا ساڵێکی کابرایەکی خەڵکی ئاوایی "زێوە" مارێک دەکوژێ و فڕێی دەدا، لەو وەختەدا کیسەڵێک دێ و هەر نەختێک لە گۆشتی مارەکە دەخوا و قەپاڵێک لە گیای "وەرمەز" دادەگرێ، ئەو کابرایە کە ئەوەی دەبینێ، بە پێمەڕە ئەو پنچکەگیایەی هەڵدەقەنێ تا بزانێ ئەوجار کیسەڵەکە چ دەکا! کیسەڵە دیسان نەختێک لە گوشتی مارەکە دەخوا، بەڵام کە دمی دەبا بۆ گیایەکە و نایدۆزێتەوە یەکجێ دەمرێ! هەڵبەت هێشتا ئەو گیایە لێکۆڵینەوەی لە سەر نەکراوە و روون نەبۆتەوە بە کاری چ دێ. گیای "وەرمەز" لە هەموو وەرزاندا هەر شینە.

******

سرینەوەی شوێنی برین، چاوئێشە و زگهەڵمسان:

لە ئاوایی "خاتوونخاس" ئەگەر کەسێک جێگایەک لە لەشی سووتابا ریشاڵی "گوڵە پێغەمبەرە"یان دەسووتاندن و دەگەڵ هێلکە لێکیان دەدا و لە سەر برینیان دادەنا، بەم جۆرە شوێنی برین دەسڕایەوە و دیاری نەدەکرد.

هەروەها لە وەرزی بەهاردا گیای "سەیدۆکە"یان هەڵدەکەند و ئیشکیان دەکرد و لە وەرزی زستانان ئەگەر کەسێک چاوی بە بەفر(کەوتبا) ئێشابا، ئەو گیایەیان ئاگر دەدا و دووکەڵەکەیان لە بەر چاوی ڕادەگرت و چاک دەبۆوە. جاری وا بوو ئەم گیایەیان دەکوڵاند و ئارەقەکەیان هەڵدەگرت، ئەگەر کەسێک زگی هەڵماسیبایە چەند قوومیان دەدایە چاک دەبۆوە.

******

**ڕەنگ کردنی قماش و بەن:**

لە "یالآوە"ی سەرێ گیایەک هەیە بە "ڕۆیناس" ناسراوە کە بۆ ڕەنگ کردنی قماش و بەن دەکار دەکرێ، بەم شێوە کە گیاکە دەکوڵێنن و دەیپاڵێون و لە پاشان قماش و بەن یا هەر شتێکی لەم جۆرەی تێداوێن و دە ئاوەکەدا دەیکوڵێنن کە ڕەنگێکی سووری تاریک لێ دەنیشێ کە ڕەنگی "ڕۆیناس"ی پێدەڵێن.

******

**دەرمانی کوان، ژانی پشت و لاق:**

زوو ئەو کەسانەی کە لە ئاوایی "کامەم" کوانیان لێ هاتبا، گیایەکیان لێ دەنا بە ناوی "گیا بۆگەنیوە". بۆ ژانی پشت و لاق کەلکیان لە "کالۆرەسوورە" وەردەگرت.

****

# شایی و شین

## بەشی چوارەم

شایی، کۆڕی پرسە و ماتەمین و بیروبڕوا

## شایی

زمانی زوو کە شایلۆغان و زەماوەندێک بەڕێوە دەچوو، حەوت شەو و حەوت ڕۆژان بەزم و شادی و دەنگی دەهۆڵ و زوڕنا و هۆهۆی ڕەشبەڵک تا دووردەستەکان دەتەنیوە و بۆنوبەرامەی پڵاو و شۆرباووگۆشت لە هەموو کەلێن و سووچێک دەگەڕا، پیاوان بە ڕانکوچۆغەی شینکی و سوورگوێز و کەواوپاتۆڵی مرادخانی و پشتێندی گرێچن و ژنان بە جلوبەرگی ڕەنگاوڕەنگ و پشتێندی ئەسڵەپەشمینە و تاسکڵاو و...، تابڵۆیەکی ڕەنگین و بەشکو و ڕەسەنیان دەخوڵقاند، بەڵام ئەمڕۆ بە زۆر هۆیان و هەروەها قەیرانی ئابووری، ئەم جۆرە دابونەریتە توێژاڵێکی خەستی لەبیرچوونەوە و فەرامۆشی بەسەردا کێشراوە و تەنیا شکڵ و قالبێکی پووچەڵ و نێوبەتاڵ لەو ڕێوڕەسمە ڕەسەنە ماوەتەوە.

خەڵکی گوندەکان کە پاییزان سەریان سووک دەبێ و تا ڕادەیەک لە کاروباران دەبنەوە، شایی و زەماوندەکانیان زیاتر بۆ ئەم وەرزە ڕادەگرن.

**چۆنیەتی بەڕێوەبردنی زەماوەند:** دیارە لە پێشدا کوڕە و کچە یەکتریان بینیوە و یەکتریان پەسند کردووە، شەوێکی بابی کوڕە دەگەڵ چەند کەیخودا و پیاوماقووڵ و مامۆستا ـ کە پێشتر بنەماڵەی کچەیان ئاگادار کردووتەوە ـ بۆ خوازبێنی دەچنە ماڵە کچەی. بە پێی ناسینێک کە هەردک بنەماڵە لێکیان هەیە، ماڵە بابی کچە ڕەنگە هەر ئەو شەوە وڵام بدەنەوە یان دەرفەتێک بخوازن. پاش ئەوەی ماڵە کچەی ڕازی بوون ئەوجار لە سەر مارەیی و ڕۆژی مارە کردن پێک دێن.

ڕۆژی مارە کردن پیاوانی ئاوایی دەگەڵ مامۆستای ئایینی لە دوای خواردنی نەهار لە ماڵە زاوا، دەچنە ماڵە بووک و لە وێ بە پێی ئایینی پیرۆزی ئیسلام کچە لە کوڕە مارە دەکەن، زاوا هەڵدەستێ دەستی باوکی و باوکی بووک و مامۆستا و... ماچ دەکا و چا و شیرینی دەگێڕن. پاشان کە پیاوەکان گەڕانەوە، دەستەیەک ژن کە خزم و نزیکی ماڵە زاوان بۆ نیشانە کردن دەچنە لای بووک و هەر کام دیاری خۆیان دادەنێن و ڕۆژێک دیاری دەکەن بۆ جلک هەڵگرتن؛ لەم ڕۆژەدا بووک، زاوا، دایکی کوڕە و کچە یان پوور و... دەچنە شار و لە بازاڕ، هەرچی کەلوپەل و پێداویستییە بە زاوای دەکڕن.

ساڵان ڕۆژێک تایبەت دەکرا بە شیرینی خواردن و شەوی خەنەبەندان، ئێستا هەموو ئەو ڕێوڕەسمە دە یەک ڕۆژدا بەڕێوە دەچێ و ماڵە باوکی بووک و زاوا نەهار یان شامێک دەدەن.

ڕۆژی گوێزتنەوە دەستەیەک ژن و پیاو دەچنە ماڵە بووک و لەوێ کوڕێک یان پیاوێک کە نزیکترین کەسی زاوایە دەبێتە "برازاوا" و پشتێندی بووکێ دەبەستێ و پارەیەکی لە بەر پشتێندی دەنێ، ماڵە بابی کچەش دیاری خۆیان کە زیاتر کراسێکە، دەیدەن بە برازاوا.

لە شایی ئێستادا سێ ڕۆژانە و ناردنی بەربووک دەگەڵ بووکیش هەڵگیراوە و باویان نەماوە.

حەوتوویەک دوای گوێزتنەوەی بووک، دەستەیەک ژن لە ماڵە بابی بووکێڕا دێنە ماڵە زاوا و دیاری بۆ دێنن، لەوانەیە هەر لەم ڕۆژەدا یان ڕۆژی گوێزتنەوەدا جیازی بووکێ ڕاگوێزنە ماڵە زاوای. ماوەیەک پاش دەسپێکی ژیانی بووک و زاوا، ماڵە بابی بووکێ، بنەماڵەی زاوا بانگهێشتن دەکەن و لە پاشان خزم و کەس هەر کام بە نۆرەی خۆی بنەماڵەکانی زاوا و بووک بانگهێشتن دەکا.

هێندێک لەو ڕێوڕەسمانەی ئاوایییەکان کە دە ڕابردوودا بەڕێوە دەچوون:

ڕیتکە تێدان لە برازاوا:
برازاوا [برازاوا دەتوانێ برای زاوا، ئامۆزا یان یەکێک لە هاوڕێکانی زاوا بێ] کە دەچوو تا پشتێندی بووکێ ببەستێ و هەر کە پشتێندەکەی گرێ دەدا قابێکیان ڕیتکە (هەویری شل) وێ دەگێڕا، برازاواش کە لە ماڵە بووک دەردەکەوت کەوچک، قاب یان هەر شتێکی لەبەر دەست دابا هەڵیدەگرت و لە ماڵە زاوا نیشانی ئەوانی دیکەی دەدا. هەموو ئەو کارانە جۆرێک تۆڵەستاندنەوە و بە مانایەکی تر زاڵ بوون بە سەر کەسی بەرامبەر بوو. بووک هەر لە ماڵە زاوا دیارییەکەی خۆی کە ڕەشمە، زەنگاڵ، دەسرە و... بوو دەیدا بە برازاوا.

مانگرتنی بووک:
ماڵە زاوا کە دەهاتن بووکێ بەرن، بەڕواڵەت بووک مانی دەگرت یان دایکی بووک بە سەریدا دەگریا و جەماعەتی چاوەڕوان دەهێشتەوە، هەر بۆیە لەو نێوەدا گۆرانیبێژ وەدەنگ دەهات و دەیگووت:

نایــەتــە دەر نایــەتــە دەر    بووک یاغی بووە و نایەتـە دەر
لانکە و لۆکـەی بـۆ بنـێم لـە کـەر
دایکــی بــووکێم دەڕاوێنــــێ    مـەشـکـەڕەقـەی دەخووسـێنێ
بووکێمــان لــێ وەدرەنــگ دێنــێ
مــاینی بــووکێم شـین و بـۆزە    چارۆکـەی لـە مـلان هاڵـــوزە
بــووکێ مــەگـــری، زاوا قــۆزە

یان دەیانگووت:

هــــەی بـەنـاز بـەنـاز    نایەتە دەرێ بووک بە قەمزە و ناز
لێم دە بە چەکووچ مەمگرە بـە گاز

شووڵی حەڵاڵ:
کاتێک دەچوون بۆ بووک، زاوا نەدەبوو چووبا، بەڵکوو دەچوو لە سەربانی ماڵە خۆیان یان لە شوێنێکی بەرز ڕادەوەستا و چاوەڕوان دەمایەوە هەتا بووک دەگەییشتێ و ئەوجار ئەو لەتکەقەندە یان سێوەی لە دەستی دابوو بە بووکی دادەدا و بە لەز سواری ئەسپێک دەبوو و ڕای دەکرد، سوارەکان کە هاوڕێ و برا و ئامۆزای زاوا بوون، دەکەوتنە سەری. ئەگەر زاوا توانیبای دەرباز بووبا ئەوە ئازا و نەترس بوو، بەڵام ئەگەر سوارەکان گەیشتبانە سەری، دەسرە و کڵاویان لە سەر دەفڕاند و تازە نەیاندەداوە. پاشان زاوا دەهاتەوە کن بووک، بەر لە هاتنی بووک بۆ ژوورێ زاوا دەبوو شووڵێک بە ئەسپایی لەسەری بووک بدا و ئەمەش بە مانای حەڵاڵ کردنی بوو.
پاشان برازاوا دەبوو سواری وڵاغی بووک با و ڕای کردبا و ژن و پیاو دەکەوتنە سەری و تەپاڵەیان پێدادەدا و جاری وابوو لە سەر ئەسپێ ڕا بەریان دەداوە خوارێ.

بووک وەسەر کەوتن:
یەکێک لەو بابەتانەی هەنووکە زۆر باو نییە و تا ئەو ساڵانە، بەتایبەت لە ناوچەی مەنگوڕایەتی، هەر باو بوو "ژنبەژنە"یە. کاتێک ژن بە ژنە دەکرا،

شوێنێک کە مابەینی هەر دووک ماڵان بوو، دەستنیشانیان دەکرد کە بووکی لێ بگۆڕنەوە، هەر کە بووکیان دەگۆڕینەوە هەر لایەک کە بووکی وەسەرتر کەوتبا ئەوە نیشاندەری زاڵبوون بوو بە سەر لایەنەکەی دیکەدا و هەر ئەمە زۆر جاران کێشەی گەورەی لێ دەکەوتەوە.

باوەخوون:

پاش تێپەڕ بوونی حەوتوویەک یان دە پازدە ڕۆژێک بە سەر زەماوەندەکەدا، ماڵە زاوای بووکیان لەگەڵ سێ ژنی بەساڵاچوو [کە زۆر جار پێیان دەگووتن کوێخاژن] دەناردەوە ماڵە بابی و ئەو ژنانە پاش ماوەیەک دانیشتن بووکیان بۆ ماوەی چەند ڕۆژێک لە ماڵە باوکی بەجێ دەهێشت کە بەو دابەیان دەگووت "باوەخوون".

بیروباوەڕ:

دیارە بیروبڕوا یان هێندێک بابەت هەن کە خەڵکی کۆمەڵگایەک باوەڕیان پێیەتی و ڕەچاوی دەکەن. ئەو باوەڕانە ڕەنگە زۆر جاران بنەمایەکی مەنتەقی و عەقڵانی لە پشت نەبێ، بەڵام لە نێو زۆربەی گەل و نەتەوەکاندا دێنە بەرچاو کە وڵاتەکەی ئێمەش لەو بابەتە بێبەری نییە و دەمێنێتەوە سەر ئەوەی کە توێژینەرەکان چەند لەو بابەتانە بکۆڵنەوە و چۆنی لێکدەنەوە.

خەڵکەکەی دەڵێن: ئاوایی "بەیتاس" چاکێکی لێیە کە بە "ئەسحاب" ناسراوە. لە سەر ئەم چاکە داری لێ شین بووە، کەس نەیوێراوە لە داری ئەم چاکە ببڕێ. جارێکیان کوڕێک سەرەڕای ئەوەی کە زۆریان پێ گووتبوو ئەم کارە مەکە، بەڵام لە داری سەر ئەسحابی بڕیبوو، شەوێ کە نووستبوو بەیانی لە جێگاکەی هەڵنەستابۆوە.

هەر خەڵکی ئەم ئاواییە دەگێڕنەوە ئەگەر کەسێک نۆبەتێی هاتبا دەبوو چووبا سەربانی ماڵێک کە پیاوەکەیان دوو ژنی هەبا و لە کولانکەی سەربانەوە گوتبای: ئەی ساحیبی چوار چاوان دەرمانی شەوتیانی (نۆبەتێ لە شەودا) چییە؟ ئەویش هەرچی گوتبای دەبوو نەخۆش پەیدای کەردبا و خواردبای و پێی چاک دەبۆوە!

لە ئاوایی "زیندەقووڵ"، هێندێک قەبری شەخس و چاکان هەیە کە خەڵکی ئاواییەکە زۆریان لێ دەترسێن و زۆریان باوەڕ پێیانە، وەکوو: چاکەچکۆلە، شێخ وسوو، مەلای باغی. خەڵکەکە باوەڕیان وایە کەس نابێ شووڵ لە دارەکانیان ببڕێ و هەر کەس ئەو کارە بکات یان زمانی لاڵ دەبێ یان بەڵای بەسەر دێ.

لە ئاوایی "حاجی مامیان"، لە باشووری دێ، گۆڕی شەخسێکی لێیە کە بە شەخسی "کانیسێو" ناسراوە، هەر لەم ئاواییە کەسانێکی بەساڵاچوو دەڵێن: ساڵێکی هەویستمان دارەکانی سەر ئەم گۆڕە بڕین، کەچی دارەکان خوێنیان لێهات و دەستمان لەو کارە هەڵگرت و لە بن ئەو جێگایەی بڕیبوویان شوێنی پەنجە کە لە هی مرۆڤ دەچوو دیار بوو.

لە ئاوایی"بەیرەم"، هێندێک کەس دەچنە سەر گۆڕی شێخ حەیز و تەڵەبی منداڵی لێ دەکەن، هەروەها بۆ ژانەسەر و زگهێشان هەر پەنا بۆ وی دەبەن یان بۆ لاقئێشە دەچنە سەر قەبری بابا حەیدەر لە "قەرەداغ"، لە "گاپیس"یش دەڵێن پیرتەندوور کۆخەڕەشەی چاک دەکاتەوە. بە ساڵداچوویەکی ئاوایی کولیجە دەڵێ: کاتێک شێخ وسوو وەفاتی کرد خۆرەتاو وردەوردە نوورەکەی بێ هێز بوو و ڕۆژ گیرا.

لە گورستانی ئاوایی "قەرەبلاغ" قەبری چاکێکی لێیە کە بۆ باداری [ڕۆماتیزم] و بڕینی بالۆکە دەچنە سەر گۆڕەکەی. بە باوەڕی خەڵک گۆیا ئەو زەمانی کە ئەو شەخسە مابوو، جارێکیان پیرێژنێکی خەڵکی ئاوایی لێی دەپرسێ: جەنابی شێخ ئەحمەد بە سەدەقەت بم ئەگەر تۆ نەمای و مریشکەکانم کورک نەبوون چ بکەم؟

شێخ ئەحمەد دەڵێ: مستێک گەنم بێنە سەر قەبرەکەم دەگەڵ گڵی سەر قەبرەکەم لێکی بدە و بۆ مریشکەکانی باوێ، ئەگەر خواردیان کورک دەبن. دەڵێن خەڵک ماوەیەکی زۆر ئەم کارەیان دەکرد و کارەکەیان سەری گرتووە.

لە بەری دێی "بەردەڕەشان" گۆڕستانێکی زۆر کۆن هەڵکەوتووە کە بە قەبری بەری دێ ناسراوە، لەم گۆڕستانەدا ژنێک ناشتراوە کە بە چاک

مەشهوورە و لە زۆوە خەڵکانێک هاتوونە سەر قەبرەکەی، خەڵکەکەی دەگێڕنەوە کاتێک کە مردووە وتوویەتی هەر کەس زگی هێشا بێتە سەر گۆڕەکەم و زگی بە کێلەکەدا بخشێنێ چاک دەبێتەوە.

لە باکووری ئاوایی"تیکانلوجە"ش چاکی کێلەکونی لێیە (خەڵک ناوی چاکەکەی نازانن بۆیە وای پێدەڵێن)، ئەوان دەڵێن هەر کەس کۆخەڕەشەی بێ و بچێتە سەر ئەم گۆڕە و دەسرۆکەکەی لە کونی کیلەکەی بخشێنێ چاک دەبێتەوە.

خێڵکی ئاوایی"سەهۆڵان"دەڵێن ئێرە سەیدێکی لێ بووە کە بە سەیدی کاکە جانی مەشهوور بووە و وەک خەڵکی ئاسایی ژیاوە، بەڵام جارجارە غەیب بووە، جارێکیان ماڵێک کە خەریکن خانوو دادەنێن، کاریتەیەکیان نیو گەز کورت دێتە دێنێ و ناگاتە دیوارەکە، لەو دەمەدا سەیدی کاکەجانی دێ و بە دەستی کاریتەکە دەکێشی و کاریتەکە درێژ دەبێتەوە و دەگاتە دیوارەکە.

بە ساڵداچووانی ئەو ئاوایییە دەگێڕنەوە کە کاتی خۆی کەس لەم ناوچەیە کەڵی نەبووە، بەڵام ڕۆژێک دەبینن کەسێک ئەوە جووتی دەکا و کەڵی پێیە، دوایە روون دەبێتەوە کە لە غەیبەوە ئەو کەڵانە بۆ سەیدی کاکەجانی ناردراون و هەر ئەو بووە جووتی پێ کردوون.

یان سەبارەت بە چاکی سەید لە گۆڕستانی ئاوایی "قەمتەرە"، دەڵێن هێندە پاک و نوورانی بووە کاتێک ئاوی خواردۆتەوە لە ئەوکی‌دا دیار بووە.

هەروەها لە "یاڵاوە"ی سەرێ کانییەکی لێیە بە سۆفی جوبرەئیل ناسراوە، هێندێک لە خەڵک رایان وایە، جوبرەئیل فریشتەی وەحی، دەستنوێژی لەم کانیاوە هەڵگرتووە و ئاوەکەی متفەڕکە، یان لە ئاوایی "کانی سپی" کە مرۆڤ یان ماڵات نەخۆش دەبن، ئاوی کانیاوی لای گۆڕی ئەحمەد شەم کە بە چاک ناسراوە دەرخواردیان دەدەن.

لە گۆڕستانی ئاوایی "ئۆتەمیش" کەسێک نێژراوە بە ناوی شێخ باڵی کە مزگەوتی ئاواییش هەر بە ناوی ئەو کراوە، خەڵکەکەی دەگێڕنەوە ئەو کەسە کاتی خۆی چۆتە حەج و لەوێ بەردێکی پێ جوان دەبێ و دەستی پێدادێنێ و دەڵێ: بریا توانیبام ئەو بەردە جوانە لەگەڵ خۆم بەرمەوە و هی من با... کە دەگەڕێتەوە ئاوایی بەردەکە پێش ئەو لە ئاوایی بووە و هەمان بەرد دەبێ کە ئەو پێی جوان بووە و زۆریان پێ سەیر دەبێ.

یان دەڵێن لە باکووری ئاوایی "مەزرا" شوێنێک هەڵکەوتووە بە ناوی گردی خەزێنە، بوداق سوڵتانی موکری ئەو گردەی داوەتەوە و ٩ کوپەی زێڕی لێ دەرهێناوە و بەو زێڕانە پردی سوور و مزگەوتی سوور و... ساز کردووە.

هەروەها دەگێڕنەوە کە کابرایەک بە ناوی "مام ڕەحیم" لە گەرمێنەوە هاتۆتە "کیتکە"، ئەو کابرایە بۆ هێندێک بە ساڵاچووانی ئاوایی گێڕاوەتەوە کە جارێکی مارێکیان گرتبوو بستێک لە لای کلکی و بستێک لە لای سەریان فڕێ دابوو، ئەوی دیکەیان سوور کردبۆوە و خواردبوویان. مام ڕەحیم هەر نەختێکی دەخوا، بەڵام دوو کەسی تر کە هاوڕێی ئەو دەبن زیاتری دەخۆن و لە دوایی کە لە کێو و سەحرا گیایەک دەبینن، گیایەکان خۆیان هاوار دەکەن کە ئێمە بۆ فلان دەردە دەبین. مام ڕەحیم کە گۆشتی مارەکەی کەمتر خواردبوو وەک ئەوان شارەزا نابێ، بەڵام ئەویش دەستی حەکیمایەتی پەیدا دەکا.

لە ڕۆژاوای ئاوایی "باگردان"ی سەرێ شەخسی دار بالۆکێ مەشهوورە یان لە ئاوایی " ئامێد" چاکێکی لێیە کە بە چاکی بالۆکان ناسراوە و ئەگەر کەسێک بالۆکەی لێبێ دەچێتە ئەو شوێنە و لەوێ "گوێنی"یەک (جۆرە گیایەکی درکاوی کە بۆ سووتان و گرتنی کەتیرا بە کار دێ) بادەدا و بەردێکی لەسەر دادەنێ و نوێژێکی لەسەر دەخوێنێ، دەڵێن ئەگەر ڕۆیشتی نابێ ئاوڕ بدەیەوە پشتەوە و چاو لە چاکی بالۆکەی بکەی. هەر کات گوێنی ئێشک بوو بالۆکەکەش ئیشک دەبێ و هەڵدەوەرێ، چاکی بالۆکان پیرێژنێک بووە کە هەنووکە گۆڕەکەیان داوەتەوە، بەڵام هێندێک لە خەڵک بڕوایان پێیەتی و هەر دەچن.

هەر لە ئاوایی "ئامێد" چاکی فەقێ وەتمان و چاکەچکۆلە بۆتە مەکۆی مراد حاسڵ بوون و بەرد پێوەنان بۆ ئەوەی بزانن ئەو قەبرانە نیازەکەیان قەبووڵ دەکەن یان نا.

گۆڕستانی ئاوایی "دۆڵپەمۆ" لە ڕۆژئاوای دێیە و بە درێژایی مێژووی دۆڵپەمۆ چاکێک بە ناوی چاکی سەید عەلی لێیە کە خەڵک لە ئاواییەکانی دەوروبەرڕا دێن بۆ زیارەتی و باوەڕێکی زۆریان بەو چاکە هەیە و خێر و خێراتێکی بۆ دەکەن وەکوو دانوو لێنان یان پارەی دەدەن بە منداڵان.

لە ئاوایی "میرەسێ" کەسێکی لێ بووە بە ناوی مەلا عەوڵای سەیزادە کە ئیبنوعەبباسی بووە و خەڵک دەڵێن تفی زاری، دژی ژاری مار و دووپشک بووە هەروەها ئەگەر کەسێک سەگی هار گرتبایەی تفی ئەو شەخسەیان لە جێ برینەکەی دەدا و چاک دەبۆوە.

له "مەحموداوای دۆڵ بەهاروو" گۆڕستانێکی لێیە کە بە کانی باریکی ناسراوە، یەکێک لە دانیشتووانی بەساڵاچووی ئاوایی دەگێڕێتەوە کە بە چاوی خۆم دیتوومە بە شەوی جومعە لەو گۆڕستانە نوور هەستاوە.

*******

هێندێک باوەڕ لە نێو خەڵکدا:

چاو پەڕین (فڕین) خراپە.

خاڵی سپی سەر نینۆک، ئاماژەیەکە بە ڕادەی درۆ کردنی ئەم کەسە.

نزگەرە هاتن نیشانەی گەورە بوونە.

ئەگەر بەری دەستی ڕاستت بخورێ پووڵ و پارەت دێتە بەری دەستێ. ئەگەر بەری دەستی چەپت بخورێ پووڵ و پارەت دەچێ.

بەری پێ خوران نیشانەی سەفەر کردنە.

ئەگەر مانگ خەرمانەی بدا نیشانەی بارینە.

شێت تف لە "بیرۆ" بکات بیرۆکە چاک دەبێتەوە.

پێکەنینی زۆر شینی لە دویە.

کوڕ ڕۆژی بە ڕادەی دەنکە گەنمێک هەڵدەدا و کچ بە ڕادەی دەنکە جۆیەک.

ئەو کەسەی زەردوویی هەبێ چاو لە ماسی بکا چاک دەبێتەوە.

مقەست لێکدان باش نییە و شەڕی لە دوویە.

ئەگەر میوان هەر نەڕۆیی، خوێ لە پێڵاوی بکرێ هەڵدەستێ و دەڕوا.

ئەگەر کچ لە ناکاو گرێی لێچکەکەی بکرێتەوە دیاری بۆ دێ.

خانوو ئەگەر پێتەوە نەهات دەبێ بیگۆڕێ.

ئەگەر منداڵ بۆقڕە بگرێ دایکی دەبێ لە حەوت ماڵان سواڵی ئاردی بۆ بکا و نابێ قسە بکا، دوایە ئاردەکە دەکاتە هەویر و بە دیوارێوە دەدا، ئەگەر ئیشک بێتەوە منداڵەکەی چاک دەبێتەوە.

منداڵی بەرنە بەر ئاوێنەی هەڵنادا.

ئیستکان ڕیز بێ میوان دێ.

منداڵ وڵات بماڵی میوان دێ.

ئەگەر پیاو گنجی پاتۆڵی خوار بێ ژنەکەی جوانە.

ئەوەی کە گنجی لە پاتۆڵدا نییە خودا ڕزقی زۆر داوەتێ.

تازەبووک ئاوێنەی لێ بشکێ بەختی ڕەش دەبێ.

ئەگەر بووک لە ڕۆژی زەماوەندا پێ لە لاقی زاوا بنێ بە سەریدا زاڵ دەبێ.

پشمین نیشانەی سەبرە و ئی وایە دوو پشمینی پێوەدێ و ئی وایە یەک پشمین.

ئەگەر شتێکی زۆر بژمێری کەم دەبێتەوە.
ئەوەی دوو دەدانی پێشێی کەلێنی هەبێ دەوڵەمەندە.
ئەگەر ئاو بڕژێ ڕووناکاییە.
ئەگەر کەسێک لە وەختێکدا بگاتە سەر خواردن و خواردنەوەیەک و بەشی مابێ. دەڵێن: خەسووت خۆشی دەوێی.
ئەگەر کەسێک زۆر لەچەر و چاوچنۆک بێ، دەڵێن مووی لە منداڵی نایە.
هەر کەس سێوێک بخوا و حەوت دەنکی تێدا بێ بە ئاواتی دەگا.
مار هەڵداوێن بۆ ئەوەی بزانن ژنی ئاوس کوڕی لە زگدایە یان کچ.
جیقنەی چۆلەکە بەسەرتدا بڕژێ دەوڵەمەند دەبی.
شەوی بەرات هەر کەس تێر نەخوا تازە ئەوێ ساڵێ تێر ناخوا.
ئەنگوتکی لە تەندوور داوێن بۆ ئەوەی بزانن ژنی ئاوس کوڕی دەبێ یا کچ.
گەسک بە ژندا بێنی ژنی بەسەر دێ.
ئاوێنە لە وڵات گرتن باش نییە.
چاوت زۆر لەدووی شتێک بێ زوو دەفەوتێ.
دوو لینگی پێڵاو بکەونە سەر یەک دەچی بۆ سەفەر.
کەڵەباب بێوەخت بخوێنێ سەری گەورەی ماڵێ دەخوا.
پشیلە چاوان بشوا میوانت بۆ دێ.
هەر کەس ئاوی باڵی چەکچەکی بخواتەوە بە ئاوات دەگا.
شەوانە وڵات گەسکدان باش نییە.
قشقەڵە بقیرێنێ خراپە.
پەپوولەپایزە نیشانەی هاتنی خەبەری خۆشە.
دەڵێن ئەوەی مرۆڤێکی باش بووە و بە شەوی جومعە بمرێ دەبێتە پەپوولە و دێتەوە.
ڕاگرتنی کەروێشک لە ماڵێدا خراپە.
ئەگەر سێو یان یارەماسی وەهای پاک بکەی کە تا ئاخرێ نەهێڵی تووکڵەکەی ببسێ، خەونی خۆش دەبینی.
خەونی خراب و ناخۆش دەبێ لەسەر ئاو بیگێڕیەوە.
ئەگەر ژن سەری داهێنێ دەبێ تووکەکەی لە کەلێنی دیوار بنێ دەنا زۆر خراپە.
خواردنی میزی گوێدرێژ بۆ دەرمانی "کۆخەڕەشە" باشە.
منداڵێک کە "لەمەیی" بگرێ ئیبنیعەبباسی تفی لە زاری بکا چاک دەبێتەوە.
تفی ئیبنیعەبباسی پادزەهری ژەهری مار و دووپشکە.
زاوا سێو باوێ و کوڕی سەڵت بیگرێتەوە ژن دێنێ.
چەقۆ خۆی داوێ.

چوونەحەمامی بانگی شێوان خراپە و لەوانەیە جندۆکە دەستت لێ بوەشێنێ.
ئەگەر منداڵ لیکی بێتە خوار، خاڵی لە دمی بدا یان بە مقەست بیبڕێ تازە لیکی نایە.
سووتانی ئەسپەندەر بۆ تۆقینی چاوی دوژمنان و چاوەزار باشە.
لێوی نان نەخۆی لە قیامەت دەبێتە شێللاقەئاور و یان مار و لە ملتی دەکەن.
قسەی ڕاست یان لە منداڵ ببیسە یان لە شێت.
دووکەڵی جگەرە دەرمانی "گوێڕەپەیە".
سەری گەورە دەوڵەتە.
جگی گورگ خۆشبەختی دێنێ.
"ڕۆنگورگ" بە هەر ژنێک دابکرێ لە پێش چاوی مێردەکەی ڕەش دەبێ.
ئەگەر ئاشقە و ماشقە کە دوو مارن، یەکیان بکوژی، لە هەر شوێنێک بی دەدبینێتەوە و پێتەوە دەدا.
تاقبوونەوەی موو نیشانەی دیتنی خۆشەویستەکەتە.
ئەگەر بێحەیا برێشکە ببرژێنێ چاک دەتەقێ.
ئەگەر جندۆکە بۆت هاتن دەست بۆ دۆخینت بەری هەڵدێن.
خواردنی کوشتی پەڕەسلێرکە زۆر گوناحە، چوون بۆ کوژانەوەی ئاوری حەزرەتی ئیبڕاهیم کێشەوەی ئاوی کردووە.
هەر کەس حەوت سەرمازەڵە بکوژێ دەچێتە بەهەشت، چوون فووی لە ئاوری حەزرەتی ئیبڕاهیم کردووە و تینی خۆش کردووە.
موو ئەگەر لە مقەست بترسێ درێژ نابێتەوە.
بۆ دەرمانی نەخۆشیی "تۆبەتێ" دەچنە سەربانی ماڵە پیاوی دووژنە و هەر چی ئەو بیلێ نەخۆش بیخوا چاک دەبێتەوە.
ئەوەی لە ژیانیدا زۆر بەدبەختی و ناخۆشی دەبینێ کاتی مردن زووخاو هەڵدەڕێژێ.
بۆ چاوەزار مووررووی شین لە دەست و پێ دەکەن یان لە سەری منداڵی قایم دەکەن.
کوند لە سەر دیوای هەر ماڵێک بنیشێ خراپە و بەدبەختی دێنێ.
دەست لە بۆق بدەی "بالۆکە"ت لێدێ.
ئەگەر بە گۆرەوێوە بنووی یان شەوێ وەختی خەوێ لە بن سەریان نێی خەونی ناخۆش دەبینی.
بۆ ئەوەی خەونەکەت لە بیر نەچێتەوە بەر لەوەی وەبیرژ بێتەوە نابێ قسان بکەی.
ئەگەر قەیسیت خوارد بۆ ئەوەی تووشی زگچوون نەبی دەنکە قەیسیەکانیش بخۆ.
سەگ بە ژن ناوەڕێ.
ئەگەر منداڵی بچووک کۆشی بگرێتەوە پووڵی بۆ دێ.
بوونی جاڵجاڵۆکە لە ماڵێکدا هەژاریی دێنێ.
ڕژانی ورکەنان لە سەر وڵات هەژاریی دێنێ.
ئەگەر چاوت بخورێ دەڵێن گۆشتی دەخۆی.
لووتت بخورێ دەڵێن باست دەکەن.
هەر کەس حەوت مردوویان بشوا بە ئاوری جەهەننم ناسووتێ.
ئاو هێنان بە شەو، باش چونکە سێحەبی ئاوێ پێشت پێدەگرێ.
دەست لێدان لە هێندێک ئاژەڵی وەکوو پشیلە "تیراوێ" دێنێ.

**پرسە و سەرەخۆشی لە ئاواییەکان:**

بە گشتی بە پێی ئایینی خەڵکی ناوچەکە کە ئیسلامە، کەسێک کە مرد دەیشۆن و غوسڵی لێ دەردەکەن. لە مزگەوتەکان جێگای تایبەت بە مردوو شوردن هەیە، کە مردوویان شوشت لە دوایە کفنی بۆ دەبڕن و مردووکەی تێیهەڵدەکێشن و چەند کەسێک نوێژی لەسەر دەکەن و ئەگەر پێویست بێ بۆ دوایین جار بنەماڵەکەی سەری هەڵدەدەنەوە و چاوی لێدەکەن. ـ لە کوردەواریدا باوەڕیان وایە ئەگەر مردوو چاوی نەبەستبێ ئەوە چاوەڕوانی کەسێکە و دەگەڵ دیتنی ئەو کەسە چاوەکانی وێک دەنێ و ئەگەر هێشتا چاوی نەبەستبێ دەڵێن ئەوە تەماعی دونیایەی پڕ نەبووە ـ لە دواییدا چەند کەسێک مردووەکە لە سەر شانیان دادەنێن و دەیبەنە سەر قەبران و قووڵکەیەک هەڵدەقنن و مردووەکەی بەرەو قیبلە و لە سەر لاتەنیشتی ڕاستەی ڕادەکێشن و لە گۆڕی دەنێن. لە ، ، دوای دانانی بەردی "ئەلحەد"، گۆڕەکە دادەپۆشن و گڵی وەسەر دەگێڕن و دایدەشێلن. ئەو جار کە مامۆستای ئایینی تەلقینی مردووی دادا خەڵکەکە بڵاوەی دەکا، زۆر جار کەسێک یان چەند کەسێکی خزمی نیزیکی مردووەکە لە پاش چوونیوەی خەڵکەکەش، بۆ ماوەیەک لە سەر قەبران و لە سەر گۆڕی مردووەکە دەمێننەوە.

هێندێک لە خەڵکەکە دەڵێن: ئەو کاتی چەند کەسێک مردوویان لەسەر شانانە و دێننە قەبرستان، مردووەکانی دیکە دەڵێن: ئەها... ئەوە بە چەند مردوویان زیندوویەکیان هێنا. یان دەڵێن: مردوو کاتێک دەمرێ خۆی ئاگادار نییە، کاتێک خەڵکەکە ناشتیان و دەڵێن با بڕۆینەوە، ئەویش وێڕای ئەوان دەڵێ با بڕۆین! کەچی سەری لە بەردی ئەلحەدی دەکەوێ و تازە دەزانێ مردووە!

خەڵک دوای ئەوەی گەڕانەوە ماڵە خۆیان، ئەو جار بۆ هاودەردی لەگەڵ خاوەن مردوو و فاتیحا خوێندن، دەچنە مزگەوت و ماڵە مردووەکە. بەر لە ئێستا ئەگەر ماڵێک کەسێکی لێ دەمرد خەڵکەکە لە ڕێگای دوور و نێزیکەوە بۆ هاودەردی و پرسە و سەرەخۆشی دەهاتنە ماڵە ساحەب مردوو و میوانەکانی سەرەخۆشی دەچوونە مزکەوتی ئاوایی و بنەماڵەکانی ئاوایی هەر چێشتێکیان لێنابا برێکیان زیاتر لێدەنا و لە سەر مجوعمەیەکیان دادەنا و پەڕۆیەکیان پێدادەدا و بۆ ئەو میوانەیان دەبردن کە بۆ سەرەخۆشی لە مزگەوت کۆ ببوونەوە. دیارە ماڵی دەستڕۆیشتوو چێشتەکەی خۆشتر و چەورتر دەبوو و سەفرەی ماڵە هەژاریش هەرچی بووبا دەیهێنا بۆ مزگەوت، هەڵبەت زۆر جار ماڵە هەژارەکەش دەخۆی دەنووسا تا سەفرەیەکی ڕەنگینتر بۆ میوانەکانی سەرەخۆشی ئامادە بکا. جێی ئاماژەیە هەنووکەش لە ئاواییەکانی دوورەدەست ئەو دابونەریتە هەر ماوە. وەک خەڵکەکە دەگێڕنەوە سەردەمێکیش لە هێندێک ئاوایی، کوێخای دێ یان ئەوەی قسەی ڕۆیبا ئەمری دەکرد بۆ ئەوەی چێشتەکان یەک ڕەنگ بن، هەموو یەک جۆرە چێشت بێنن، بەڵام زۆر جاران ئەوەش بۆ ماڵە هەژارەکە دەبوو بە موسیبەتێک چونکە ئەو دەم دەبوو تووشی قەرزوقۆڵە بووبا و بە هەر شێوەیەک با چێشتەکەی لەگەڵ دەوڵەمەندەکە یەک بووبا، هەر بۆیە ئەم ڕەسمەش کۆ کرایەوە و تەمای ئەوە گیرا ماڵێک کە مردووی لێ مرد، بۆ میوانداری، هەرچی پێداویستیی ئەو چەند ڕۆژەیە بیکڕن و چێشتلێنەرێک بە کرێ بگرن، دوایە خەڵکی ئاوایی هەر کەسە لە قەدەر توانای خۆیەوە پارەیەک وەک یارمەتی بۆ خاوەن مردوو دابنێ. جێی ئاماژەیە کە لە ئاواییەکانی مەهاباد، هەر سێ شێوەی ئەو ڕێوڕەسمانە بەڕێوەدەچن، بەڵام لە چەند ئاواییەک، خاوەن مردوو هەژار بێ یان دەوڵەمەند، کەس دەفریای نایە و هەر بۆخۆی دەبێ دەرەقەتی خەرجی سەرەخۆشی بێ.

هەروەها دەڵێن لە هێندێک ئاوایی ڕێوڕەسمێک بەڕێوەدەچوو کە "کۆتەڵ ڕازاندنەوە"یان پێدەکوت و بەو شێوە بوو: پاش ئەوەی بنەماڵەیەک کەسێکیان لێ دەمرد و ماوەیەک بەسەر دەچوو، بنەماڵەکەی مردووەکە دارێکیان دێنا و بە کەوا و پاتۆڵ، پێچ و کڵاوی مردووەکە دەیانڕازاندەوە و دەسحێب و خەنجەریان دەبەر پشتێندی دەنا و وەک مرۆڤێک سواری ئەسبێکیان دەکرد، دەستەی شینگێران دەهاتن و پێیانهەڵدەگووت و جەماعەتی دەوروبەریش دەگریان، ئەم کارە بەتایبەت بۆ گەورەکان و ئاغاکان دەکرا. بۆ وێنە شینگێڕ دەیگووت:

شەماڵ هات کەندی ڕیشەی دڵەکەم "ئاغا" پساندی ڕیشەی دڵەکەم

یان:

ئاغای نێو ئاغایانم
کوێخای نێو کوێخایانم
سێحەبی چوار چاوانم
مەسڵەتکەری "سەکر"انم
بە قوربانی باخ و باخاتت بم سیس هەڵگەڕاوە
بە قوربانی باخ و باخاتت بم بەبێ باخەوان ماوە.

دەستەی شینگێڕان زۆرتر هەر ژن بوون بەتایبەت بەساڵاچوو و زگسووتاو و جەرگبڕاو.

ئەم ڕێوڕەسمەش کە هەتا ساڵەکانی ١٣٤٠ تا ١٣٥٠ی هەتاوی لە ناوچەی مەنگوڕایەتی هەر مابوو، نەما و لەبیر چۆتەوە.

*****

# ژیاننامە

## بەشی پێنجەم

ژیاننامەی کەسایەتی ئاوایی‌یەکان

## مامۆستا عەبدوڵڵا ئەحمەدیان*

مامۆستا حاجی مەلا عەبدوڵڵا ئەحمەدیان ساڵی ١٣١٢ی هەتاوی لە ئاوایی "دەرمان" چاوی بە دونیا هەڵێنا. مێرمنداڵ دەبێ کە باوکی (عەبدولقادر) کۆچی دوایی دەکا. ساڵی ١٣١٨ی هەتاوی لە مزگەوتی ئاوایی لە لای سەید "هاشم حوسێنی" دەخوێنێ، پاش چوار ساڵان دەچێتە حەوزەکانی کوردستان و لە ماوەی کەمتر لە دە ساڵان سەرف و نەحوی عەرەبی، بەلاغەت، مەنتق، فقە، کەلام، تەفسیر، عیلمولحەدیس، ڕیازیات، ئەستێرەناسیی و فەلسەفە لە لایەن مامۆستایانی ناسراوی ئەو سەردەم "عیسامەددین شەفیعی" لە بۆکان، "باقیر بالک" لە مەریوان، "عەلی وەلزی" لە حەمامیانی بۆکان فێر دەبێ و لە ماوەی ١٥ ساڵ خوێندنیدا، قۆناغە جۆراوجۆرەکان تەواو دەکا و بڕوانامەی ئەفتا و تەدریسی وەردەگرێ. ساڵی ١٣٣١ی هەتاوی بۆ تەواو کردنی زانست، ڕەوانەی شاری بەغدای عێراق دەبێ و لە لای مەلا "محەممەد قزڵجی" پەرە بە خوێندن دەدا.

ئەو بەڕێزە لە ساڵەکانی ١٣٣٢ ـ ١٣٥٠ وانەی علوومی بەلاغەت، مەنتق، فقە، کەلام، تەفسیر، عیلمولحەدیس، ڕیازیات، ئەستێرەناسیی و فەلسەفەی گووتۆتەوە.

مامۆستا نووسەر و بەڕێوەبەری پرۆگرامەکانی ئایینی ڕادیۆ مەهاباد لە ساڵەکانی ١٣٥١ ـ ١٣٥٩ هەتاوی بووە، هەروەها لە بەڕێوەبەرایەتیی پەروەردە و ڕاهێنانی مەهاباد ساڵی ١٣٥٧ هەتاوی تا ساڵی ١٣٨٢ هەتاوی وانەی گووتۆتەوە.

مامۆستا ئەحمەدیان بە ماوەی ٣١ ساڵ (١٣٥١ ـ ١٣٨٣) ئیمامی جەماعەتی مزگەوتی قیبلەی مەهاباد بووە، هەروەها بە ماوەی ١٠ ساڵ (١٣٧٢ ـ ١٣٨٢) لە زانکۆی ئازادی شاری مەهاباد وانەی کوتۆتەوە، پەرتووکە دەرسییەکانی وەک (کەلامی جەدید، قورئان شناسی، تاریخی حەدیس، کەلامی ئەهلی سوننەت) نووسیون. ئەو بەڕێزە ١٣٨٣/٣/٢٣ هەتاوی لە شاری مەهاباد کۆچی دوایی کرد و بە بەشداری سەدان کەس لەم شارە بە خاک ئەسپێردرا.

مامۆستا شازدە بەرهەمی لە چاپ دراوە و زۆرتر لە سەد وتاری ئامادەی چاپن لە بوارەکانی ئەدەبی، زمان و ئەدەبیاتی کوردی، ناساندنی کەسایەتییەکانی فەرهەنگی، نەتەوەیی و ئایینیی کورد. هەروەها کۆیەک لە بەرهەمەکانی جوان نووسینی لە جۆری خەتی ئیسلامی و ئێرانی ئەو بەڕێزە ئامادەی چاپن. پتر لە ٢٠٠ مەقالەی فەرهەنگی و ئایینی، تەفسیری سوورەی "یس" بە زمانی کوردی و تەفسیری سوورەی "فاتحە" بە زمانی کوردی و هتد ئامادەی چاپن. ئەو بەرهەمانەی لە چاپ دراون:

١. سیمای صادق فاروق اعظم، انتشارات محمدی، چاپ پنجم
٢. تجزیه و تحلیل زندگی امام شافعی، نشر احسان، چاپ دوم
٣. قرآن شناسی، نشر احسان، چاپ دوم
٤. کلام اهل سنت، نشر احسان، نشر احسان، چاپ اول
٥. کلام جدید، انتشارات رهرو، چاپ اول
٦.تفسیر سوره فاتحه، انتشارات رهرو، چاپ اول
٧.ترجمەی رسالەالتوحید، انتشارات محمدی، چاپ اول
٨. قبله محمد، انتشارات محمدی، چاپ اول
٩. به سوی جهان جاویدان، انتشارات محمدی، چاپ اول
١٠. گەلحۆ، تەنزی کوردی، نشر احسان، چاپ اول
١١. هەست و هاوار، نشر احسان، چاپ اول
١٢. مناجات ملا عبدالله، نشر احسان، چاپ اول (نثر مسجع کردی)
١٣. تاریخ‌الحدیث، نشر احسان، چاپ اول
١٤. الایضاح (عربی)، نشر احسان، چاپ اول

* گۆڤاری مەهاباد، ژمارە ٣٩، ل ٦١ ، لە فارسی‌را وەرگێردراوەتەوە سەر زمانی کوردی.

### شێخ وسوو شەمسەددینی بورهانی

شێخ وسوو ناسراو بە شەمسەددین سالّی ١٢٤٥ یان ٤٦ی کۆچی مانگی لە ئاوایی "ماوەت"، یەکێک لە ئاواییەکانی شاربازێڕی باشووری کوردستان، لە دایک بووە. باوکی وەرزێر بووە و لەم کارەدا یاریدەدەری باوکی بووە. لە سەردەمی لاوێتی وە دوای عیلم و زانست کەوت، بۆ خوێندن هاتووچۆی زۆر شوێنانی کرد و زانستگەلێکی وەچەنگ هێنا. پاشان ڕووی لە ئاوایی "تەوێڵە" کرد و هاتە ڕیزی ڕێڕەوانی تەریقەتی نەقشبەندی، هەروەها ماوەیەک لە خانەقای تەوێڵە مایەوە و دوای تێپەڕ کردنی قۆناغە جۆراوجۆرەکان پلەی جێنشینی (خلافت) وەرگرت و بە فەرمانی شێخ هاتە ناوچەی موکریان و لە ئاوایی "بورهان"ی مەهاباد نیشتەجێ بوو و سەرقاڵی خزمەت بە موسوڵمانان لە ڕێگای ئەمر بە چاکە و نەهی لە خراپە بوو.
ئەو لەو ئاواییە وەرزێری دەکرد و هیچ کات یارمەتی موریدانی قەبوڵ نەدەکرد و قەتیش لاف و گەزافی ئەوەی لێنەدەدا کە کەراماتی هەیە. پاش ماوەیەک بە سەرمایە و ڕەنجی چەند ساڵەی خۆی، دوو ئاوایی "شەڕەفکەند" و "ئاتابلاغی" دەکڕێ و وەقفی خانەقای دەکا.
ساڵی وەفاتی شێخ ڕوون نییە، بەڵام خەڵکی ناوچەکە دەڵێن لە تەمەنی ٨٣ تا ٨٦ ساڵی‌دا کۆچی دوایی کردووە و لە خانەقا بە خاک سپێردراوە.

### مەلا عەبدوڵلا پیرەباب

لە زانایان و بەناوبانگانی مەهاباد کە خەڵکی ئاوایی "دێبۆکر" بووە و علوومی قەدیمەی تا قۆناغی ئەفتا و ئیجتیهاد لە لای مەلا محەممەد ئەفەندی خەتی و مفتی زەهاوی و عەلامە قزڵجی درێژە پێداوە.
ئەو ماوەیەک لە ئاواییەکانی ئۆتەمیش، ئیندرقاش بە وانەگوتنەوە و ئیمامەت و پێشنوێژی ڕایبواردووە، پاشان هاتۆتە شاری مەهاباد و تا کۆتایی ژیانی ئیمامی جەماعەت و مامۆستای مزگەوتی هەباس‌ئاغا بووە.
ئەو بەپێزە جگە لەو زانستەی کە لەسەر زانستی ئوسوولی فقەی هەیبووە، لە جەبر و هەندەسە و زانستی بیرکاری دەستێکی باڵای هەبووە و وەها کەموێنە بووە کە زانایانی هاوچەرخ بۆ ئەو گرفتانەی کە لە بیرکاری‌دا هەیانبووە دەهاتنە لای ئەم بەڕێزە. هێندێک لە خەڵکی گوندەکە دەڵێن وەفاتی ئەم زانایە ساڵی ١٣٠٩ کۆچی مانگی بووە و هێندێکی تر دەڵێن ساڵی ١٣١٨ بووە.
نووسراوەکانی مەلای پیرەباب:
((حواشی برجواد شرح خلاصه الحساب، تعلیقات بر فرائض تحفه در فقه، حواشی بر اصول اقلیدس، حواشی بر شرح اسطرلاب بیرجندی، و کتێبێک لە هەیئەتی هەندەسە)).
(ڕای خەڵکەکەیە کە دەڵێن گڵکۆی مەلای پیرەباب لە حەوشەی دەنگ و ڕەنگی ناوەندی مەهاباد دایە کە لەگەڵ تێکدانی گۆڕستانی مەهاباد وەبەر کەوتووە و شوێنەکەی بەتەواوی ڕوون نییە.)

**********

## مەلا خدر ڕادمێهر (ئەشکانی)

خدر ڕادمێهر بە نازناوی شێعریی "ئەشکانی"، ساڵی ١٣٤٩ هەتاوی لە ئاوایی "ئەشکان"ی سەرێ سەر بە شارە جوانەکەی سەردەشت لە دایک بووە. خوێندنی سەرەتایی هەر لەم شوێنە تەواو کردووە و کتێبی پیرۆزی قورئانی لە خزمەت مەلا "مستەفا تەوحیدی" لەم گوندە خەتم کردووە و وێڕای خوێندنی قورئانی پیرۆز، فێرە خوێندنی دەرس بە زمانی کوردی بووە، پاشان بۆ دەرسی فەقێیاتی ڕەوانەی زۆر شوێن و ئاوایییان بووە کە لە ئاکامدا لە خزمەت مەلا "نەجمەدین حیکمەتی" بڕوانامەی مەلایەتی وەرگرتووە و ڕەوانەی شاری مەهاباد و ئاواییەکانی ئەو شارە بووە. مەلا خدر ساڵی ١٣٧٨ هاتۆتە ئاوایی "توتاخاج" و ئێستا پێشنوێژی مزگەوتی ئەو گوندەیە و خۆی بە کەسێکی خەڵکی ئەو دێیە دەزانێ.

نموونەیەک لە شێعری ئەو مامۆستا بەڕێزە کە بە شێوەی "مەسنەوی"یە و کۆتایی گشت دێڕەکان، بە پێی ئەلفوبێی کوردییە.

### وەسفی بەهار

یەزدان فەرمانی دا بە با — بەهار زستانی لادەبا
دەبزوێنێ هەستی ئەدیب — لە بن دێنێ قەستی ڕەقیب
خرمژنی هەوری وەکوو تۆپ — پێدەشتی دەگرێ و چڵەپۆپ
دەبارێنی ئاوی حەیات — دەتارێنی داوی نەبات
لە ڕێبەندان دەستێنێ باج — پەڕی زیندان دەست دێنێ تاج
وا ئەهریمەنی مرومۆچ — دای لە شێوەنی بەرەو کۆچ
بارانەی پڕ خێر و سەلاح — یارانەی جووتێر و فەلاح
دێمەکار و بەیار و شاخ — جێی نیسار و نزار و باخ
دەژێنەوە زنە و زەمەند — دەبرێنەوە ڕنوو کەمەند
بولبوولی شەیدا و ئەویندار — بە دڵی شەیدا و بریندار
پۆلی مەلانی بەرزەفڕ — چۆڵی تەلانی عەرزە چڕ
دیمەنی سروشت دەگەڵ نەورۆز — چیمەن پێدەشتی تێکەڵ بە هۆز
سەدا و ئاواز لە شاخ و بژ — دەکا لاواز لە ناخۆ دژ
ڕزگاری زەوی لە قەفەس — فراری کەوی لە هەرەس
کیژی کەماڵ بێری مەڕدۆش — دێنێ بۆ ماڵ شیری سەرپۆش
پەروانە دێنە لای شەمع — بروانە، بەتینە لای جەمع
هەتوان دەبنەوە زامی داغ — ڕوو جوان دەبنەوە عامی ساغ
بەزمی سەیر و تاقگە و کەیف — نەزمی تەیر و چاوگە و هەیڤ
نامێنێ تۆف نە ئێش نە ئۆف — نامێنێ خۆف لە پێش مرۆف
خۆری لە کەل ئەدا شەوق — نووری بە دڵ ئەدا زەوق
پەڵکی نەرم و شل و ناسک — جلکی سەر و مل و باسک
زەوی خۆ دەپۆشێ بە ڕەنگ — کەوی کۆ دەجۆشێ بە دەنگ
ئۆبەی شمشاڵی شوانی مێگەل — ئۆخەی لە نواڵ توانی بێ مەل

| | |
|---|---|
| نەغمەی دێ بۆ چڵی بە گوڵ | هەر سۆ دێ لە دڵی بە کوڵ |
| عەتر و ڕیحانەی گوڵ بە جەم | دەستڕێ تانەی دڵ بە غەم |
| خۆری بەفراوی کوێستانان | دووڕی نەخشاوی بێستانان |
| بە شنەی با هەر بەو سۆزە | دێنە سەما گوڵ نەورۆزە |
| بە بۆنی مسک و بەر و بۆ | بێرونی کەسک و کەژ و کۆ |
| لە وێنەی بەهەشتی ئەو دیو | دەبینی پێدەشتی غەملێو |
| سونبول وەنەوشە دێنە ڕوو | کەنگر بنۆشە بێ دروو |
| گزنگی خۆر لە دم کەلا | پرشنگی نوور بۆ مونجەلا |
| دەشت و چیا، زێوە تەلا | بژ و گیا پێوە گەلا |
| "ئەشکانی" سەیری گوڵ شەنی | بروانە تێری دڵ خەنی |
| شوکرانە بۆ خودای گەورە بێ | کێ توانای هاوتای ئەو دەبێ |

**********

## مامۆستا مەلا سەعید ڕەسووڵی*

مامۆستا مەلا سەعید ڕەسووڵی، ناسراو بە مەلا سەعیدی کامەمێ، لە ساڵی ١٣١٧ی هەتاوی لە ئاوایی "بەیرەم" [سەر بە شاری مەهاباد لە بەشی خەلیفان] لە دایک بووە، لە تەمەنی شەش ساڵیدا هەر لەو ئاوایییە دەبەر خوێندن نرا، لە دوای خوێندنی قورئان و کتێبە سەرەتاییەکانی ئەو سەردەمە بۆ درێژە پێدانی خوێندن بە گوندەکانی موکریاندا گەڕاوە و لە خزمەت مامۆستا بەناوبانگەکانی ئەو کاتدا کۆمەڵێک زانستی خوێندووە و لە ساڵی ١٣٣٨ لە خزمەت مامۆستا مەلا عەبدوڵڵا ئەحمەدیان ئیزنی مەلایەتی پێدراوە.

مامۆستا هەر لە سەردەمی فەقێیەتییەوە هەستی نیشتمانپەروەری هەبووە و لەو ڕێگایەدا زۆر تووشی تەنگوچەڵەمە، گیروگرفت، زیندان و دەربەدەری بووە. ساڵی ١٣٣٨ لە ئاوایی "کامەم"ی ناوچەی مەنگوڕایەتی وەکوو مەلا دامەزراوە و خزمەتی ئایینی پیرۆزی ئیسلامی کردووە. ساڵی ١٣٤٩ ماڵی هاتۆتە شاری مەهاباد، هاوکات دەگەڵ پێشنوێژیی لە مزگەوتی بوداق سوڵتان لە قوتابخانەکان دەرسی عەرەبی و قورئانی گووتۆتەوە.

مامۆستا هەر لە کاتی موستەعیدییەوە تا کاتی وەفاتی هەمیشە فەقێی هەبووە و بە سەدان مامۆستای ئایینی پێگەیاندووە.

مامۆستا مەلا سەعید شاعیر، قسەخۆش، سادق، نیشتمانپەروەر، دڵاوا بووە و کەیخودا بووە و کاروباری خەڵکی ڕاپەڕاندووە. لە دوای ڕووخانی ڕژیمی پاشایەتی لە ئێران و سەرکەوتنی شۆڕشی ئیسلامی بوو بە ئەندامی شووڕای ئینقلاب لە شاری مەهاباد.

دوای ماوەیەک دەربەدەری و دەستبەسەر بوون، ساڵی ١٣٦٣ گەڕایەوە مەهاباد و بوو بە پێشنوێژی مزگەوتی حاجی سەید حەسەن لە گەڕەکی هەرمەنیان. لە پاش دامەزرانی شووڕای ڕووحانییەت بوو بە ئەندامی کارای شووڕای ڕووحانییەت و تا سەردەمی مەرگ وەکوو بەرپرسی ئەو شووڕایە درێژەی بە خزمەتەکانی خۆی دا و سەرەنجام ٢ی ڕێبەندانی ١٣٨٢ دڵە گەورەکەی بۆ هەمیشە لە لێدان کەوت و ماڵاوایی لە نیشتمان و دڵسۆزان کرد.

---

* وەرگیراو لە: گۆڤاری ناوخۆیی وڵاتەکەم، لە ژێر چاوەدێری شووڕای ئیسلامی مەهاباد، لاپەڕەی ٢٦، خەرمانانی ساڵی ١٣٨٣ ی هەتاوی.

## مەلا خەلیل گۆڕەمەڕی

مەلا خەلیل یەکێک لە کەسایەتییە ناسراوەکانی ئایینی و زانستی کورد لە هۆزی مەنگوڕە. ساڵی ١٢٥٩ هەتاوی لە بنەماڵەیەکی ئایینی لە ئاوایی "گۆڕەمەڕ" چاوی بە دنیا هەڵێنا، باوکی مەلا عەبدوڵڵا یەکێک لە کەسایەتییە ئایینییەکانی ئەو سەردەمی بوو. مەلا خەلیل بیرێکی تیژی هەبوو هەر بۆیە بە زوویی قۆناغەکانی خوێندنی بڕی، لە خزمەت مەلا "وەسیم سەردەشتی" لە مەدرەسەی علوومی دینی مەهاباد، دەرسی خوێندووە و پاشان ڕووی لە شاری کەرکووک لە باشووری کوردستان کردووە و لە خزمەت مەلا "شاعەلی مەنسووری" درێژەی بە خوێندن داوە. مەلا خەلیل پاش ماوەیەک دەگەڕێتەوە شاری مەهاباد و لە خزمەت مەلا وەسیم ئیزنی مەلایەتی و وانە گوتنەوەی پێدەدرێ. مەلا ڕوو لە میراوای سەردەشت دەکا و لەوێ وانەی ئایینی دەڵێتەوە، جێگای باسە میراوا ئێستا بۆتە شار و بە میراوای مەلا خەلیل ناسراوە. مەلا خەلیل شەرحێکی باشی لە سەر کتێبی "ربعین ماردینی" لە کتێبە پڕ بایەخەکانی زوو نووسیوە. جگە لە پلەی ئایینی ئەو توانی ناوی خۆی لە سەراسەری وڵاتی ئێران بەرز ڕابگرێ و بە فتوا پڕ بایەخەکەی دژ بە "ڕەزاشا پەهلەوی" هەستێ. مەلا خەلیل گۆڕەمەڕی بەرهەڵستی یاسایی زۆرەملی دەبەر کردنی جلوبەرگی بیانی و دۆزینەوەی حیجاب بوو کە ڕەزاشا پەهلەوی بەبێ لەبەرچاو گرتنی ڕیشەی کۆمەڵایەتی و ئیسلامی دەیهەویست بە زۆرەملی ئەو یاسایەی لە ئێران داسەپێنێ. کاتێک مەلا خەلیل فتوای دا، ناوچەی مەنگوڕایەتی و بەشێکی زۆری بەری نەڵێن لە پاییزی ساڵی ١٣٠٦ هەتاوی دژ بە هێزی سەرکوتکەری دەوڵەتی ئەو کات، هاتنە گۆڕەپان و لە ماوەیەکی کورتدا هێزەکانی ئێرانیان لە ناوچە کوێستانییەکانی مەنگوڕایەتی و ناوچەکانی دەوروبەر وەدەرنان. زستانی ساڵی ١٣٠٦ هەتاوی بوو کە دەوڵەتی ڕەزاشا شاندێکی بۆ چارەسەری کێشەکان و ئاشتی و گفتوگۆ ڕەوانەی مەنگوڕایەتی کرد.

بەهاری ساڵی ١٣٠٧ هەتاوی هێزەکانی دەوڵەت بە توندی هێرش دەبەنە سەر ناوچەکانی مەنگوڕایەتی و نەڵێن و لە ئاکامدا خەسارێکی گەورە لە پێشمەرگەکانی مەلا خەلیل دەکەوێ. ساڵی ١٣٠٨ی هەتاوی هێزی ڕەزاشا پەلاماری ناوچەی مەنگوڕایەتی دەدا کە لە ئاکامدا ئاواییەکانی حاجی مامیان، بەیتاس تا دووسەید و پردی ئێستراتێژیکی قەڵاتاسیان لە دەست پێشمەرگەکانی مەلا خەلیل دەردێنن. مەلا خەلیل و چەند کەس لە دۆستانی وەفاداری پەرەوازەی دیوی گەرمێن واتا باشووری کوردستان دەبن و پاش ساڵێک ئیزنی هاتنەوەیان بۆ ئێران پێدەدرێ. مەلا خەلیل لە میراوا دەمێنێتەوە و وانەی ئایینی لە مەدرەسەکەی خۆی دەڵێتەوە.

مەلا خەلیل پاییزی ساڵی ١٣٣٤ هەتاوی لە تەمەنی ٧٥ ساڵیدا کۆچ دەکا و لە گۆڕستانەکەی ئاوایی گۆڕەمەڕ تەسلیم بە خاک دەکرێ.*

**********

## مامۆستا مەلا حوسێن مەجدی

مامۆستا مەلا حوسێن مەجدی ساڵی ١٢٦٨ هەتاوی لە ئاوایی "قالوێ" لە دایک بووە، خوێندنی سەرەتایی لە لای ملا "ساڵح واسیقبیللە " لە ئاوایی سەدرابادی بۆکان تەواو کردووە، پاشان لە لای زانای بەناوبانگ مەلا "عەبدووڕەحمان" فێرە زانست بووە.

لە مزگەوتەکانی داروغە، هەباسئاغا و بازاڕی مەهاباد خەریکی فێرکاری و ڕێنمایی خەڵک بووە.

ئەو قورئان و زۆربەی شێعرەکانی نیزامی، فێردۆسی، کەلیمی، سەعدی و... لە بەر بووە. ئەم بەڕێزە ساڵی ١٣٥٠ هەتاوی کۆچی دوایی کردووە و لە گۆڕستانی بوداق سوڵتانی شاری مەهاباد بە خاک سپێردراوە.

---

* وەرگیراو لە کتێبی (قیام ملا خلیل و رد فرمان رضاخان ص ٤ ـ ابراهیم افخمی، انتشارات محمدی سقز ١٣٦٨)

## مامۆستا عەبدووڕەحمان ئاشوفتە (فاتیحی)*

مامۆستا مەلا عەبدووڕەحمان ئاشوفتە کە بە (فاتیحی) ناسراوە، کوڕی سۆفی کەریم و خاتوو زێنەب بووە و دەوروبەری ساڵەکانی ١٤ ـ ١٣١٣، لە گوندی "یاراڵی"، ناوچەی گەورکی مەهاباد، لە دایک بووە. باوکی هەر لە منداڵییەوە دەبەر خوێندنی زانستە دینییەکانی دەنێ. لە تەمەنی دوازدە ساڵییەوە لە گوندی سۆغالوێ لە لایان مامۆستا ئەحمەد سەلیمی ناسراو بە (دۆنەخۆر) سیپارەی بۆ دەنوسرێتەوە، هەروەها لە خزمەت خوالێخۆشبوو مەلا عەبدووڵڵا سولێمانی، قورئانی ختم کردووە و گوڵستانی سەعدی خوێندووە. هەر لەو کاتەوە کە دەرگای حوجرەی بە ڕوودا دەکرێتەوە، زۆربەی ناوچەکانی کوردستانی ئێران و عێراق بۆ خویندن گەڕاوە و لە هەر دەڤەرێ گەوهەرێکی دەست کەوتووە، هاوکات لەگەڵ خوێندنی زانستە ئایینیەکان لە حوجرەدا فێری عەرووز و قافیە بووە و تەبعی شاعیرانەی لە شەڕەشێعری شەوانی جومعە و سێشەممانەدا گەشە دەکا و دەبێتە شاعیرێکی خاوەن هەست و کۆمەڵەشێعرێکی پاراوی بۆ جێ هێشتووین، بەڵام بەداخەوە تا ئێستا چاپ نەکراوە. مامۆستا فاتیحی لە ساڵی ١٣٣٩ی هەتاوی لە خزمەت مامۆستا نەجمەددین کەوکەبی لە گوندی "ئاڵوەتان"ی سەردەشت ئیجازەنامەی مەلایەتی وەرگرتووە و پاشان لەگەڵ خاتوو ئامینەی کچی خاڵ مەولوودی گڵەنانی زەماوەندی کردووە، بەرهەمی ئەم زەماوەندە سێ کوڕ (خالید، کاوە، هێمن) و دوو کچ (ئاشێ و تریفە) بووە کە خالید و تریفە شاعیرن. مامۆستا فاتیحی پیاوێکی خواناس و دیندار بووە و زیاتر لە ٣٠ ساڵ وەک مامۆستایەکی ئایینی خزمەتی دین و گەلەکەی کردووە. سەرەتا لە گوندەکانی چەکۆ و شیوەمێر مەلا بووە، پاشان بە هۆی هەستی خاوێن و بێگەردی نیشتمانپەروەریی، لە ساڵەکانی ٤٦ و ٤٧دا کە ڕژیمی دەستەڵاتداری پاشایەتی گوشارێکی زۆر دەخاتە سەر نەتەوەی کورد، بەتایبەت مامۆستاکانی ئایینی دەخاتە بەندیخانەوە و مامۆستا ئاشوفتەش دەگیرێ و لە چاڵەڕەشەکانی ساواکدا ئازار و ئەشکەنجەیەکی زۆر دەدرێ، دوای ئازاد بوون پەڕیوەی کوردستانی ئەو دیو دەبێ و لە گوندەکانی "دێلۆ" و "کەنجاڕە" مەلایەتی کردووە، هەروەها لە "سونێ" مازووچنی و لە "قەڵادزێ" کارگەریشی کردووە. لەگەڵ سەرکەوتنی شۆڕشی گەلانی ئێران بە سەر ڕژیمی پاشایەتی‌دا دەگەڕێنەوە پیرانشار و پاش چەند ساڵان دیسان پەڕیوەی ئەو دیو دەبێتەوە، سەرئەنجام لە ساڵی ١٣٧٠ی هەتاوی سەرلەنوێ دەگەڕێتەوە ئێران و لە گوندی "گردئاشەوان"ی پیرانشار دەبێتە مەلا و ژیانی ئاسایی خۆی دەست پێدەکاتەوە. بە دیتنی ئازار و کەمایەسییەکان و دۆخی نالەباری گەلەکەی، تەبعی سەرکێش و هەستی شاعیرانەی مامۆستا دەخرۆشا و کوڵ دەیگرت، دیمەنی دڵڕفێن و هەستبزوێنی نیشتمانە دیل کراوەکەی وەجۆشی دێنا، بۆیە مەڵئاسایەکی خۆشخوێن بە سەر سروشتی نیشتمانەکەی دەچڕێ و لە پێناوی‌دا ئاوارە و پەڕیوەی هەندەران دەبێ.

مامۆستا هێمن گوتەنی:

خەفەت، مەینەت، کەسەرە، ئەمڕۆ بەشی ئینسانی زانایە      ئەوەی نەتویست بڵێ: ڕەببی بە دەردی کوردی زانا چێ

خوالێخۆشبوو زانایەکی کورد بوو، ئەو هەموو وڵاتی کوردستانی بە زێد و خاکی خۆی دەزانی و خۆی تەرخانی خزمەت بە ئایین و گەلەکەی کرد و ئەو ڕۆژی مردیش بستێک زەوی و خانووبەرەیەکی نەبوو.

---

* www.piran.qendil.se سەرچاوە مێرگژان. نوسینەوە و پیداچوونەوە: ح. مەعروف پوور

مامۆستا فاتیحی، ڕۆژی یەکشەممە، ڕێکەوتی ١٣٨٢/٨/١٩، پێنجی مانگی پیرۆزی ڕەمەزان، دڵی گەرمی لە لێدان کەوت و لە گۆڕستانی "گردئاشەوان" بە خاک ئەسپێردرا.

شاعیر، مامۆستا محەممەد زوودی کە بە شانازییەوە خۆی بە قوتابی و هاوڕێبازی مامۆستا دەزانێ، لە مەڕ کۆچی دوایی مامۆستای خوالێخۆشبوو بەم شێعرە هەستی خۆی دەردەبڕێ:

| | |
|---|---|
| فاتیحی یەکشەم پێنجی ڕەمەزان | ماڵئاوایت کرد لە خاوخێزان |
| تاریخی چوونت بۆ نێو گۆڕ و خاک | "کانت جنەالفردوس ماواک" |

ئەم ڕستە عەڕەبییە بە واتای "یاخوا بەهەشتی بەرین جێگات بێ" کە بە حیسابی ئەبجەد دەکاتە ساڵی ١٤٢٣ مانگی کە ساڵی کۆچی دوایی فاتیحی شاعیرە.

ئەمەش یەکێک لە غەزەلە ناسکەکانی مامۆستا فاتیحی:

برا سەیرێکی دنیا کە

| | |
|---|---|
| بە چەشنی بولبوولی شەیدا شەو و ڕۆژ هەر دەکەم ناڵە | خوایە قانعم شوکرم، لە سەر ئەو وەزع و ئەحواڵە |
| شەوی دەیجووری مەهجووریت وەکوو بورکانە بۆ گیانم | ئەگەر مەیلت نەبێ قوربان، فیراقت تاڵە وەک ژاڵە |
| لە دووریت مەست و حەیرانم شەو و ڕۆژ هەر غەزەلخوانم | کە شادی بێ بە میوانم بە ڕۆژ ڕۆژە و بە ساڵ ساڵە |
| موریدی پیری مەیخانەم ئەگەر ساقی ئەجەل بێڵێ | شەرابی وەسڵی دڵداران بەژانە زەحمەتە تاڵە |
| ئەوەی دڵداری لەیلایە لە کۆڕی عاشقان مەستە | دەبێ مەستی خەرابات بێ ئەوەی ناپوختە و کاڵە |
| برام سەیرێکی دنیا کە چلۆن شێواوە بازاڕی | ئەوەی عەقڵی هەبێ شێتە ئەوەی بێ عەقڵە بەدحاڵە |
| ئەوەکوو بەردی ڕەشی حاجیان تەوافی گەر نەکەم نابێ | ئەمەتافی عامە ئەو بەردە نەزەرگەی خاسە ئەو خاڵە |
| بەئەوا پاییزی وەرزی ئەو بەهاریم هاتە کۆتایی | بووەسەرمان خە بە لوتفی خۆت لە ئەو هەورازە و قەدپاڵە |
| ئەعەتا و بەخشین لە تۆ جوانە لە هەر کات و سەعاتێکا | ئلە کاتی پیریدا فریام کەوە زۆر سەختە ئەو حاڵە |
| بخودا هەر تۆ غەفووری غافیروزەنبی گوناهانی | بلە فاتیحی ببوورە بیکە جەننەت بۆ وی ئەو چاڵە |

گردئاشەوان ١٣٨١/٣/١٨

**ناسر ئاغابرا**

بیستی خەرمانانی ساڵی ١٣٤٧ هەتاوی لە ئاوایی بەردەڕەشان لە بنەماڵەیەکی وەرزێر لە دایک بووە، لە تەمەنی سێ ساڵی‌دا تووشی نەخۆشی سوورێژە بووە کە بە چاو دەیگرێ و چاوەکانی لە دەست دەدا.

خۆی دەڵێ: "خووم بە دنیای تاریکەوە گرت، بەڵام ڕووناکاییم لە بیر نەبردەوە. بەڵکوو ئەوم بە وڵاتێک دەزانی و پێم وابوو بە جێم هێشتووە".

خوێندنی سەرەتایی وەکوو منداڵانی دیکە لە قوتابخانەی ئاوایی تەواو کردووە، لە پۆلی چوارەمی سەرەتایی دەست بە گوتنی شێعری فارسی دەکا، لە کۆڕ و کۆبوونەوەکانی شێعر و وتارنووسیی لە شاری مەهاباد بەشداری کردووە و لە زۆربەی کێبەرکێیەکاندا خەڵاتگەلێکی وەرگرتووە. لە هەوڵی دواناوەندی کە وەک قوتابیانی ئاسایی، لە قوتابخانەی دواناوەندی وانەی دەخوێند لە کێبەرکێیەکی شێعر نووسین لە قوتابخانەکانی ئێراندا بەشداری دەکا و خەڵاتی یەکەمی قوتابخانەکانی ئێران وەدەست دەهێنێ. جێگای ئاماژەیە ئەم بەڕێزە بۆ چەندین وانەی وەکوو ئینگلیزی، بیرکاری و عەرەبی جگە لە مامۆستایانی قوتابخانە، مامۆستای تایبەتی هەبووە و لە خەتی بریل کە تایبەتی نابینایانە، کەلکی وەرگرتووە.

ساڵی ١٣٧٠ هەتاوی لە لقی ئابووری کۆمەڵایەتی، دیپلۆمی وەرگرتووە، هەنووکە (١٣٨٩ هەتاوی)، خوێندکاری ماجستێر(فەوقی لیسانس)ی زمان و ئەدەبیاتی فارسی لە زانکۆی ئازادی شاری مەهابادە.

هەروەها لە بواری نووسینی تەنز، شانۆ و چیرۆک دەگەڵ دەنگ و ڕەنگی ناوەندی مەهاباد هاوکاری دەکا.

## گۆمەشووشە

ماسییەک لە شووشەیەکدا

بە دەم شین و گرینەوە سەری بە دیواری بلوورین دادەدا

بە خۆی دەگووت:

من کوڕی دەریای هەراوم

لە دەریادا لەگەڵ سەدەف و مرواری هاونشین و تێکەڵاوم

حەیفە دیلی گۆزەئاوم

حەیفە گیری تەشتەگولم!

من پەروەردەی لانکی خۆڕاژەی شەپۆلم

قەت باکم بە خەتەر نییە

مەلەی ئاوی کڕ و زەلکاو هونەر نییە

بەوەی نێ ورد و بێ سەنگم

لە جێی تەماعی نەهەنگم

ڕزگارم کەن با تۆڕەوان بە شەرتی ژین و مەرگم تۆڕەکەی باوێ

بەڵام ژینی مەیتە ئاوی گۆمەشووشەی تەسک و بێ شەپۆلم ناوێ.

## ئارەزوو ئەحمەدی

ساڵی ١٣٦٥ هەتاوی لە ئاوایی "کۆزەکەرێز" چاوی بە دنیا هەڵێنا، سەرەتا بە پەخشان دەستی بە نووسین کردووە و لە پاشان شێعر سرنجی ڕاکێشا. بەشێکی زۆر لە شێعرەکانی ئامادەی چاپن. ماوەی چەند ساڵێکە هاتووچۆی ئەنجومەنی ئەدەبی شاری مەهاباد دەکا.

نموونە شێعر:

### "خاوێرم تۆ خەواڵووی"

خاوێرم چاوانت وەکە
کە نوشتاوەیە نوشتەی خەملیوی نیگات
کە ئەستیورە ڕوانینی هەرێم قاچاغی گلێنەت
من ڕیسوا دەکەم خۆم و خۆت و...
تۆ خەواڵووی
خاوێرم چاوان وشیار کە
کە نوێژەبارانی هەنیسکم
لە حەشارگەی سینگتا
هەڵدەکا لێم ئیستیغفار ئیستیغفاری ئەوین و...
تۆ خەواڵووی
خاوێرم چاوت هەڵێنە
شەوارەی نەبانی ئەزرەتمە و
مەنشووری ئاوری لە وڵات
چیت لە دەمی ڕۆژا وا مشتۆ؟
دەستت لە دەستاژویی کام
هەناری لە سینگ بە تاڵی
بەرۆکی دەرچوونا
ئیرزا دەکا
هەوەسی ساکارانەی
بای باییەک منالانی؟؟؟
خاوێرم بنوو
کە چوو
عەرووزیی ئیتر. نە. تەقەلام
کە خەواڵووم و چاوت
کە من لە خەوم و
نوێنی گەدای
باوەشێک ترت

## خاڵەمین (سەید محەممەدئەمین بەرزەنجی)

سەید محەممەدئەمین بەرزەنجی، کوڕی حاجی شێخ مستەفا، ساڵی ١٣٢٨ کۆچی مانگی لە ئاوایی "کۆکە"، لە بنەماڵەیەکی ئایینی و ناسراو لە دایک بووە. وانەی ئایینی لە لای دکتۆر ئەحمەد تورجانیزادە خوێندووە، پاشان دەستی بە کاری وەرزێری کردووە. ئەو لە ڕیزی گەورەشاعیرانی کوردە و نازناوی خاڵەمین بووە. خاڵەمین ڕێکەوتی ١٣٧٠/١/٢٣ هەتاوی کۆچی دوایی دەکا و لە گڵکۆی شاعیرانی کورد لە مەهاباد و لە پەنا مامۆستایان هێمن و هەژار بە خاک دەسپێردرێ.

**********

## دکتۆر مستەفا خۆڕڕەمدڵ

دکتۆر خۆڕڕەمدڵ لە زانایان و موفەسیرانی قورئانی پیرۆزە، ساڵی ١٣١٥ی هەتاوی لە ئاوایی "دێبۆکر" سەر بە بەشی ناوەندی و دێهستانی موکریانی ڕۆژاوا، چاوی بە دنیا هەڵێناوە، پاش چەند ساڵێک مانەوەی لەم ئاوایییە، دەچێتە ئاوایییەکانی "لاچین" و "چەقەڵمستەفا". پاشان کە تەمەنی ٤ ساڵانە دەبێ، بە یەگجاری نیشتەجێی شاری مەهاباد دەبێ و قۆناغی سەرەتایی و دواناوەندی لەو شاری تەواو دەکا و ساڵی ١٣٤٦ی هەتاوی بڕوانامەی لیسانسی زمان و ئەدەبیاتی عەرەبی لە زانکۆی تاران وەردەگرێ.

ساڵی ١٣٥٢ لە هەمان زانکۆ توانی فەوقی لیسانس وەربگرێ و ساڵی ١٣٥٨ تێزی دکتۆرای لە کۆلێژی فەرهەنگی عەرەبی و علوومی قورئانی لە زانکۆی ئیلاهیاتی تاران وەرگرت، پاشان بوو بە مامۆستای زانکۆی سنە.

ئەو کتێبانەی کە تا ئێستا نووسیونی و بڵاوی کردوونەوە بریتین لە:

نماز فرمان خدا، مکالمه روزمره زبان کردی، صرف دستور زبان کردی سورانی، گلبن دانش، نحو زبان فارسی، گنجینه صرف زبان عربی، گنجینه نحو زبان عربی، نگاهی گذرا به اعجاز علمی قرآن، تفسیر نور، تفسیر المقتطف.

هەروەها کتێبەکانی الله، عنایت یزدان و فی الضلال القران (١٥ بەرگ) ی لە زمانی عەرەبییەوە وەرگێڕاوەتەوە سەر زمانی فارسی.

**********

## خالید حیسامی (هێدی)

"خالید حیسامی" کوڕی حاجی محەممەدئاغا لە ئێلی دێبۆکری ساڵی ١٣٠٦ی هەتاوی لە ئاوایی "شێخاڵی" لە دایک بووە. سەرەتای خوێندنی هەر لەم ئاوایییە دەست پێکردووە، سەرەتای لاوێتی بەرەوڕووی کێشە سیاسییەکان بۆتەوە، هەر بۆیە ساڵیانێک دەربەدەری و ئاوارەیی بینیوە. ئێستا لە شاری هەولێر لە باشووری کوردستان دەژی. ساڵی ١٣٨٧ لە شاری هەولێر، لە لایەن وەزارەتی ڕۆشنبیری حکومەتی هەرێمی کوردستان، کۆڕێکی گەورە بۆ ئەو بەڕێزە بە بەشداری شاعیرانی و نووسەرانی کورد گیرا.

نموونەشێعری خالید حیسامی (هێدی):

" کۆنەبرین "

حەز دەکەم گۆشەیە بگرم بەتەنێ بم، بەتەنێ — من بم و یادی تۆ، دێو و پەری دەستم نەکەنێ
من ئەگەر جارێ بڵێم بەژنی تۆ شووش و بەرزە — وەزمان دێ قەڵەمیش هێندی تری پێوە دەنێ
چاوی تۆ تیری نیگای چەند هەیە با بیهاوێ — من بەڵێنیت ئەدەمێ دڵ لە بەری ڕانەچەنێ
مەمی تۆ ناوی بڵاو بۆتەوە، ئەمما خۆیان — تازە خڕ بوون و زەمانێکی دەوێ تا دەگەنێ
بۆنی خۆش هەرچی بێ دەمکێشێ لە دووی خۆی ئیتر — چ لە بن پەرچەمی تۆ بێ و چ سەری یاسەمەنێ
دەبێ حاڵی چ بێ ئاوێنە کە وا ئەو شۆخە — چاوی تێدەبڕێ ئەوەندە و لەگەڵی پێدەکەنێ
گەر برین تازە بێ قەت شەرتە نەناڵم لە بەری — جا مەگەر کۆنەبرین بمکوژێ بینێ تەشەنێ
شێعری "هێدی" وەنەبێ شیرن و ناسک بێ کە چی — تا لە لێوی تۆ دوا هەر ئافەرینی دەکەنێ

**********

## مامۆستا عەبدولکەریم ڕەسوولی (ڕێبوار)

مامۆستا مەلا "عەبدولکەریم ڕەسوولی " نازناوی شێعریی "ڕێبوار"، یەکێکە لە شاعیرانی بەسۆز و بەهەست و بەیتبێژی نەتەوە و نیشتمانە، بەبێ شک ئەگەر ئاسەوارەکەی لە دەفتەران دەرکەون و چاپ و بڵاو ببنەوە، کەلێنەبەتاڵی کتێبخانەکانی کوردی پێ پڕ دەبێتەوە. مامۆستا لە درێژایی ژیانیدا هەر وەکوو بولبولێکی شەیدا ئاگری دڵی بڵێسەی داوە و ئاگری لە دڵانیش بەرداوە.

مامۆستا عەبدولکەریم ساڵی ١٣٠٣ی هەتاوی لە ئاوایی "گەنەدار"، سەر بە ناوچەی مەنگوڕایەتیی مەهاباد، چاوی بە دونیا هەڵێناوە، لە تەمەنی دوو ساڵیدا تووشی نەخۆشی ئاوڵە بووە، لە چوار ساڵیدا نەخۆشی "تەبنوبە" دەگرێ و نزیک پازدە ساڵان ئەم نەخۆشییە بەرۆکی بەرنادا.

نیشتمان بەر لە هەموو شتێک سەلام — نیشتمان چەندە بەنرخیت لە لام
نیشتمان پێشکەشی تۆیە سەر و ماڵ — سەرەڕای کۆشش و حەول و تەقەلام

هەر لە حوجرە فێر خوێندنەوە دەبێ، کتێبی فارسی لە لای "عەزیزئاغای عومەری" خوێندووە، هەروەها لە لای مەلا "عەبدوڵڵا محەممەدی" پەرەی بە خوێندن داوە.

ساڵی ١٣٢٥ی هەتاوی چووە بۆ لاجان و پێنج ساڵ بەردەوام وانەی ئایینی خوێندووە، لە دوای ئەم پێنج ساڵە بەرەو ئاوایی باغچە وەڕێ کەوتووە و لە لای مەلا سەیید حەسەن، درێژەی بە خوێندن داوە، پاشان چووە بۆ لای مەلا شێخ عێزەددین حوسێنی و دوو ساڵیشی لە لای ئەو خوێندووە. هەروەها لە "تازەقەڵا" لە لای مەلا محەممەد وەڵزی، لە "شێخ لەر" لە لای حاجی مەلا شێخ حەسەن، لە حەمامیان لە لای مەلا عەلی وەڵزی درێژەی بە خوێندن داوە. لە شاری مەهاباد هاتۆتە لای مەلا محەممەد ماوەڕانی لە مزگەوتی سەیید نیزام و مەلا حوسێن مەجدی لە مزگەوتی حاجی سەید

بایز، دەرسی ئایینی خوێندووە.
ساڵی ١٣٣٠ی هەتاوی بڕوانامەی مەلایەتی لە خزمەت مەلا حوسێن مەجدی وەرگرتووە و هەر لەم ساڵەدا ئەرکی مامۆستای ئایینی، ئاوایی قەرەبڵاغ (بەشی ناوەندی مەهاباد، دێهستانی ئاختاچی ڕۆژئاوا) وە ئەستۆ دەگرێ و ماوەی سێ ساڵ لەوێ دەمێنێتەوە.
ساڵی ١٣٣٧ی هەتاوی دەچێتە ئاوایی "گردەقیت" و دەبێتە مامۆستای ئەو ئاواییە. خەڵکی ئەم دێیە ڕەشەممەی ساڵی ١٣٤٢ی هەتاوی بە بۆنەی دابەش کردنی زەوی بە سەر ڕەعیەتاندا خەرێک بوو ئاژاوەیەک ساز کەن کە ڕژیمی شاهەنشاهی پەهلەوی سەرکووتی کردن و مامۆستا عەبدولکەریمیش لە بەندیخانە کرا و ماوەی چوار مانگ گوێزرایەوە "قزقەڵا". ساڵی ١٣٤٨ی هەتاوی وێڕای ٢٥٠ کەس لە مامۆستایانی ناوچەی موکریان بۆ فێر بوونی کاری گەشەپێدان و ئاوەدانی هەڵبژێردرا و ڕەوانەی تاران کرا.
ڕێکەوتی ١٣٤٩/١/١٥ی هەتاوی بوو بە مامۆستای مزگەوتی "قۆزلووێ"ی گەورە. ساڵی ١٣٥٠ی هەتاوی خەڵکی بەئەمەگی "گردەقیت" هێنایانەوە ئاوایی خۆیان و تا ساڵی ١٣٥٦ لەو گوندە مایەوە و لە دواییدا چوو بۆ ئاوایی "قوومقەڵا" (بەشی ناوەندی و دێهستانی موکریانی ڕۆژئاوای مەهاباد)، خەڵکی ئەم ئاواییە زۆریان خۆش دەویست. ساڵی ١٣٦٢ی هەتاوی شێرپەنجەی سیپەلاک بەربینگی پەدەگرێ و ساڵێک دوای ئەم نەخۆشییە لە قوومقەڵا کۆچی دوایی دەکا و هەر لە گۆڕستانی ئەو گوندە بە خاک ئەسپێردرا. بیرەوەرییەکانی مامۆستا ئێستاش لە بیری خەڵکی ئەم گوندانە نەچوونەوە و هەر بە باشی باسی دەکەن. مامۆستا عەبدولکەریم خەتێکی زۆر خۆشی هەبووە و دەستنووسەکانی هەر ماون. ئەو هەر لە سەرەتای لاوێتی هۆگری شێعر بووە، سێ دەفتەری شێعری کوردی هەیە کە بڕیارە لە چاپ درێن. کتێبی "فوائیز" کە بە زمانی عەرەبییە بە زمانی شێعریی وەرگێڕاوەتەوە سەر کوردی. زۆربەی شێعرەکانی غەزەلن، بەڵام مەسنەوی، پێنج خشتەکی، قەسیدە و تەخمیسیشی هەیە. نێوەرۆکی غەزەلەکانی ئەویندارین، قەسیدەکانیش باس لە بابەتەکانی ئایینی دەکەن.
نموونە شێعری مامۆستا ڕێبوار:

سڵاو ئەی کاکی جووتبەندە — دەڵێن دنیا بە تۆ بەندە
ئەوە نوکتێکە وەک قەندە — ئەوە گفتێکە هەر پەندە
لە هەر جێ نەک بە مەڵبەندە

دەچێژی تاڵی و مەینەت — دەڕێژی ئارەقەی زەحمەت
هەتا نانی هەبێ میللەت — بە زەبری شان و باهۆکەت
بە هێزی شیلەپە و دەندە

خۆشن نێوی ئامرازت — ئەوانەی دەبنە کارسازت
دە هەر شاد بی بە دڵخوازت — هەمیشەش هەر هەبێت وازت
بە پیرۆزی و بزە و خەندە

سەرای پیشەی بە قازانجت — هەمیشەش بەرزە ئامانجت
بە خوانی باوی کرمانجت — بە پیتاک و بدە و باجت
خەنین ئینسان و باڵندە

برای جووتیار خێو بەهرە — بە بەهرەی ماڵەکەم قەبرە
چ هۆزێک لێدەدەنێ قەدرە — ئەو گرچ و پڕ و نەمرە
ئەوە زانا و هونەرمەندە

## عەبدووڕەحمان شەڕەفکەندی (هەژار)

عەبدولڕەحمان شەڕەفکەندی ناسراو بە "هەژار" ساڵی ١٣٠٠ی هەتاوی لە بنەماڵـەیەکی ئایینی لـە ئـاوایی "شەڕەفکەند" لە دایک بووە، قۆناغی سەرەتایی خوێندنی لە خزمەت باوکی واتا مەلا محـەممـەد بـۆر تێپـەڕ کردووە، بۆ درێژەدان بە خوێندن و دەرسی فەقێیاتی ڕووی لـە خانـەقـای شـێخی بورهـان کـردووە و وێـڕای دۆستی وەفاداری مامۆستا "هێمن" لەم خانەقایە درێژەیان بە خوێندن داوە. سـاڵی ١٣١٧ی هـەتـاوی بـاوکی کۆچی دوایی دەکا و بە هۆی ئەوەی کە منداڵی گەورەی باوکی بووە ئەرکی سەرپەرەشتی ماڵێی دەکـەوێتـە سەر شان. سەرەڕای تەنگدەستی و چەرمەسـەرییـەکـی زۆر، درێـژە بـە خوێـندن دەدا و لـە سـاڵی ١٣٢٠ی هەتاوی دێتە نێو خەباتی سیاسی و دەبێتە ئەندامی کۆمەڵەی ژ.ک (ژیانەوەی کوردستان). مامۆسـتا هـەژار وەک کەسێکی ناسراو و کارامەی بواری فەرهەنگی، ڕۆڵێکی ئازایانەی لە دامـەزرانـدنی کۆمـاری کوردسـتان‌دا هەبووە، پـاش ڕووخـانی کۆمـاری کوردسـتان، مامۆسـتا هـەژار وێـڕای زۆربـەی کـەسایەتییـە فـەرهـەنگی و سیاسییەکان، هەڵوەدای غەریبایەتی دەبێ و ماوەیەک لە وڵاتەکانی عێراق، سووریا و لوبنان دەمێنێتەوە.

ساڵی ١٩٦١ی زایینی وەک دۆستێکی وەفاداری مەلا مستەفای بـارزانی دژی ڕژێمـی بـەعس بـۆ ئـەستاندنی مافی کورد لە باشووری کوردستان خەبات دەکا. ساڵی ١٩٧٥ی دەگەڕێتەوە ئێران و درێژە بە کاری فەرهەنگی و زانستی خۆی دەدا و لە ئاکام‌دا لـە ڕێکەوتی ١٣٦٩/١٢/١ لە تەمەنی ٧٠ ساڵی‌دا لە شاری کەرەج کۆچی دوایی دەکا و تەرمەکەی بۆ مەهاباد دەگـەڕێننـەوە و لـە نێـو هـەزاران کـەس و سەتان بارزانی لە گۆڕستانی "بوداق سوڵتان"، لە لای گڵکۆی دۆستی وەفاداری، مامۆستا هێمن، بە خاک دەسپێردرێ.

مامۆستا هەژار یەکێک لە ناسراوترین لێکۆڵەران، شاعیران، نووسەرانی کوردستانە کە خزمەتێکی زۆری بە زێد و نەتەوەکەی کردووە.

بەرهەمەکانی ئەم بەڕێزە: ئاڵەکۆک، بەیتی سەرەمەڕ، مەم و زین، بۆ کوردستان، وەرگێڕانی چوارینەکانی خەییام، وەرگێڕانـی شـەڕەفخـانی بدلیسی، هۆزی گاوان، شرحی دیوانی مەلای جزیری، فەرهەنگی هەنبانەبۆرینە، وەگێڕانی هەشت بەرگ کتێبی ئەبوو عەلـی سـینا، وەرگێڕانـی قورئـانی پیـرۆز، آثار البلاد و اخبار البلاد، چێشتی مجێور و هەروەها وەرگێڕانی چەندین پەرتووکی دیکە لە دکتۆر موتەهەری و شـەریعـەتـی لـە زمـانی فارسـیەوە بـۆ کوردی.

### سەید محەممەدئەمین شێخولئیسلامی موکری (هێمن)

سەید محەممەدئەمین ناسراو بە هێمن کوڕی سەید حەسەن شێخولئیسلامی موکری، بەهاری ساڵی ١٣٠٠ی هەتاوی لە ئاوایی "لاچین" سەر بە شاری مەهاباد لە دایک بووە.

خوێندنی سەرەتایی و فێربوونی قورئانی پیرۆز لە ئاوایی تێپەڕ دەکا و پاشان بە ماوەی چوار ساڵان لە خانەقای جەددی دایکی، واتە شێخ وسووی بورهان، دەمێنێتەوە و درێژە بە خوێندن دەدا، هەر لەوێ دەگەڵ شاعیری ناوداری کورد مامۆستا "هەژار" ئاشنا دەبێ و پەیمانی برایەتییان بە یەکتردا و تا دوایین پشووی ژیانیان وەک برا، هاوکار و پشتیوانی یەک مانەوە. پاشان بە قسەی باوکی چوو بۆ ئاوایی "کولیجە" و چەند ساڵێک لە لای مەلا ئەحمەد فەوزی دەرسی خوێند. ساڵی ١٣١٧ی گەڕایەوە باوەشی بنەماڵەکەی کە ئەو کات لە ئاوایی"شیلاناوێ" بوو و دەستی کرد بە کشتوکاڵ، بەڵام ساتێک لە مۆتاڵا و نووسین دوور نەبۆوە و دایمە هاتووچۆی شاری مەهابادی دەکرد و دەگەڵ کەسایەتییەکانی فەرهەنگی و سیاسی وەک پێشەوا قازی محەممەد دانیشتنی هەبوو. ساڵی ١٣٢٤ لە لایەن سەرۆککۆماری کوردستانەوە هاوڕێی مامۆستا "هەژار" وەک شاعیری نەتەوەیی ناسران. ئەو هەر لە سەرەتای نووسینی شێعرەوە نازناوی "هێمن"ی بۆخۆی هەڵبژاردبوو. مامۆستا هێمن ساڵی ١٣٢٣ی بە بانگهێشتی مامۆستا عەبدولڕەحمان زەبیحی (بیژەن) مودیرمەسئوولی گۆڤاری نیشتمان، بوو بە ئەندامی کۆمەڵەی ژ.ک (ژیانەوەی کوردستان) و شووڕای نووسەرانی ئەم گۆڤارە. ساڵی ١٣٢٤ی هەتاوی وەک شاعیر و نووسەرێکی بەئەزموون بەشداری جووڵانەوە دەبێ و لە دامەزراندنی کۆماری کوردستان لە شاری مەهاباد، شوێنپەنجەی دیارە و هەر ئەو ساڵە بوو بە ئەندامی دەستەی نووسەرانی گۆڤاری کوردستان. پاش ڕووخانی کۆماری کوردستان، مامۆستا هێمن ماوەیەک خۆی ون کرد و پاشان گەڕایەوە بۆ ئاواییەکەی.

ساڵی ١٣٣٢، مامۆستا هێمن لە ژێر چاوەدێری ڕژیمی شاهەنشاهیدا دەبێ و لە بزووتنەوەی چەکداری ساڵی ١٣٤٧ ـــ ١٣٤٦ لە مەهاباد ڕوو لە باشووری کوردستان دەکا و تا ساڵی ١٣٥٧، هاوکات دەگەڵ سەرکەوتنی شۆڕشی ئیسلامی ئێران، دەگەڕێتەوە شاری مەهاباد. پاش گەڕانەوەی بۆ مەهاباد و تێپەڕ کردنی قەیرانە جیاجیاکان، ساڵی ١٣٦٤ یەکەمین ژمارەی گۆڤاری "سروە" دەردەکات. هێمن شاعیری بێ نازی کورد پاش بە چاپگەیاندنی ژمارە سەرەتاییەکانی گۆڤارەکەی لە ڕۆژی ٢٩ی خاکەلێوەی ساڵی ١٣٦٥ لە تەمەنی ٦٥ ساڵیدا کۆچیدوایی دەکا و لە گۆڕستانی "بوداق سوڵتان"ی مەهاباد، لە گلکۆی شاعیران بە خاک سپێردرا. ئەم شاعیرە گەورەیەی کورد گەلێک بەرهەمی هەیە وەکوو:

تاریک و ڕوون، ناڵەی جوودایی، هەواری خاڵی، پاشەڕۆک (ئەو نووسراوە و وتارانەی کە لە پاش مردنی چاپ بوون)، قەڵای دمدم، تۆحفەی موزەفەریە، وەرگێڕانی شازادە و گەدا و خرمگس. هەروەها لە ڕۆژنامەی کوردستان، هەواری کورد، هەواری نیشتیمان، گڕوگاڵی مناڵان، ئاگر و هەڵاڵە بابەتی نووسیوە.

مامۆستا هێمن یەکێک لە باشترین نووسەر و شاعیرانی کورد بوو کە خاوەن شێوازێکی تایبەت بە خۆی بوو.

## قادر فەتاحی قازی

سالّی ١٣١٤ی هەتاوی لە ئاوایی "قزلّجەی سەرێ" سەر بە شاری مەهاباد لە دایک بووە، کارناسیی بالاّی بەشی "ئەدەبیاتی فارسی" لە زانستگای تەورێز وەرگرتووە (١٣٥٢)، پاشان وەک مامۆستای قوتابخانە و دواتریش وەک مامۆستای زانستگا وەرگیراوە. قادر فەتاحیقازی تا ئێستا بە دەیان دەقی فۆلکلۆری و وتار و لێکۆڵینەوەی سەبارەت بەم باسە لە گۆڤارەکانی خوێندکاری‌دا نووسیوە و خاوەن چەندین کتێبی بە نرخە کە بریتین لە:

مێهر و وەفا سالّی ١٣٤٥ هـ؛ شێخی سەنعان سالّی ١٣٤٦ هـ؛ بارام و گولّندام سالّی ١٣٤٧ هـ؛ شۆرمەحموود و مەرزینگان سالّی ١٣٤٨ هـ؛ شێخ فەرخ و خاتوون ئەستی سالّی ١٣٥١ هـ؛ سەعید و میرسێوەدین بەگ سالّی ١٣٥٥ هـ؛ ئەمسال و حیکەمی کوردی (امثال و حکم کردی) بەشی یەکەم سالّی ١٣٦٤ هـ؛ ئەمسال و حیکەمی کوردی بەشی دووهەم سالّی ١٣٧٥ هـ؛ لاس و خەزالّ سالّی ١٣٧٩ هـ؛ شیرین و فەرهاد سالّی ١٣٨٤هـ (گشت ئەم بەرهەمانە لە زانکۆی تەورێز بە چاپ گەیشتوون) هەروەها کتێبی گەنجینەی بەیتی کوردی کە سەرچاوەیەکی مەزنی بەیتی کوردی دێتە ئەژمار لە چاپخانەی ئاراس بە چاپ گەیشتووە. قادر فەتاحی قازی ئێستا لە شاری تەورێز دەژی و وانەی "فارسی و ئایینی نگارش" لە زانکۆ تەورێز دەڵێتەوە.

**********

## ئەحمەد قازی

سالّی ١٣١٥ی هەتاوی لە ئاوایی "قازیاوا" لە دایک بووە، سالّیانێک مامۆستای قوتابخانە بووە و وانەی زمان و ئەدەبیاتی ئینگلیزی لە قوتابخانەکانی دواناوەندیی شاری مەهاباد گووتۆتەوە. ماوەیەک سەرنووسەری گۆڤاری سروە بووە. سالّی ١٣٤٥ هەتاوییەوە دەستی بە کاری نووسین و وەرگێڕان کردووە، تا ئێستا زۆربەی بەرهەمەکانی لە چاپ دراون. ئەم بەڕیزە شێعریش دەنووسێ.

بەرهەمەکانی بریتین لە:

١. باقەبێن ٢. دەستور زبان کردی (بە دوو زمان) ٣. کۆکردنەوە و ساغ کردنەوەی دیوانی سەیفولقوزات ٤. وەرگێڕانی دوانەی سەیروسەمەرە ٥. وەرگێڕانی ئۆستوورەی گیلگەمێش ٦. وەرگێڕانی ڕۆمانی دوو بەرگیی دون کیشۆت ٧. کتک و مشک ٨. نسل اژدها ٩. دوقلوهای عجیب، مارک تواین ١٠. کوهسار حقیقت، دافن دوموریە ١١. عصر غولها، وینا دیلمار ١٢. صدام و بحران خلیج فارس ١٣. ژانی گەل، ئیبراهیم ئەحمەد بە هاوکاری محەممەد قازی ١٤. کردستان بعد از جنگ خلیج فارس (لە ژێر چاپدایە) ١٥. شب بی پایان، از جیمز ویلارد ١٦. غوغای درون، حسین عارف بە هاوکاری محەممەد قازی (لە ژێر چاپدایە) ١٧. مکالمات و خودآموز زبان کردی ١٨. خلاصە تاریخ کردستان ١٩. گردآوری و انتشار خاطرات من (عبدالله ناهید).

## حاجی قادر قادری (هیوا)

یەکەم شەوی مانگی ڕەمەزانی ١٣١١ی هەتاوی لە ئاوایی "شێخاڵی" لە دایک بووە، بابی "ڕەحمان" و دایکی ناوی "ڕەعنا" بووە. نازناوی شێعری "هیوا"یە و پێش کۆماری ئیسلامی نازناوی "ئاڵۆز" بوو. خوێندنی سەرەتایی هەر لەم ئاواییە و لە نێو فەقێیان دەست پێکردووە. دوای ئەوە کە ماڵیان هاتە شاری مەهاباد، پۆلی دووەمی سەرەتایی لە قوتابخانەی پەهلەوی تەواو کرد و پۆلی سێهەمی لە قوتابخانەی سەعادەت خوێند.

ساڵی ١٣٢٠ی هەتاوی بە هۆی شەڕی دووەمی جیهانی، ماڵیان بار دەکاتەوە ئاوایی و پاش ساڵێک دێنەوە شار. لە قوتابخانەی سەعادەت درێژە بە خوێندن دەدا و پۆلی شەشەم لە سەردەمی کۆماری کوردستاندا تەواو دەکا. خوێندنی قورئانی پیرۆزیشی هەر لە مزگەوتی سووری مەهاباد لە نێو فەقێیان دەخوێند، هەروەها گوڵستان و بووستانی سەعدی لەم سەردەمەدا خوێندووە.

ماوەی نۆ ساڵان مامۆستای تایبەتی منداڵانی ئاغا و ئەرباب لە ئاواییەکانی قۆرغان، خورخورە، گابازەڵە، هەمزاوا و تازەقەڵای بۆکان و عەنبار بووە. لەو ماوەیەدا سەرقاڵی خوێندنی خەمسەی نیزامی، دیوانی حافز و گوڵستان و بووستانی سەعدی بووە و وانەی عەرەبی لە لای مامۆستایانی ئایینی خوێندووە. ئەو کەسبی فەیزی لە لای "مامۆستا مەلا محەممەد" (حەفید ئەلوەلزی) و "مەلا حەمەدەمینی حەمامیان" لە عەنبار کردووە. پاشان دێتەوە شاری مەهاباد و لە بازاڕدا خەریکی کاسبی دەبێ و دەگەڵ کچی خودالێخۆشبوو مەلا محەممەد ماوەڕانی زەماوەند دەکا. بە ماوەی ساڵێک لە دانیشسەرای تەربیەت موعەلیمی ورمێ دەخوێنێ و بە ئیمتیازەوە قەبووڵ دەبێ.

ساڵی ١٣٣٧ی هەتاوی لە بەڕێوەبەرایەتیی فێرگە و ڕاهێنان دادەمەزرێ و لە ئاوایی قەرەداغ قوتابخانەی "نەوبونیاد" پێک دێنێ، پاشان دەچێتە ئۆزوندەرێ و گۆکتەپە و لە کۆتاییدا دێتەوە شاری مەهاباد. هەر لەو ساڵانەدا دەبێ کە دیپلۆمی ئەدەبی وەردەگرێ، ساڵی ١٣٤٦ی هەتاوی دەچێتە تاران و لە دانیشکەدەی ئیلاهیات و مەعاریفی ئیسلامی قەبووڵ دەبێ و لیسانسی حقووق وەردەگرێ و لە قوتابخانەکانی دواناوەندیی ناحیەی یەکی تاران دەرس دەڵێتەوە، هەروەها لە قوتابخانە دواناوەندییەکانی وەک دوکتور مەجد، کەیهانی نەو، خارەزمی دەرس دەڵێتەوە.

ماوەی سێ ساڵ بە ماڵ و منداڵەوە دەنێردرێتە بەحرەین و لە وێ عەرەبی لە لای شێخ عومەر عەبدولوەهاب قازی دەخوێنێ و لە پەنا ئەوەش خەریکی خوێندنی دەرسی ئینگلیزی دەبێ، هەروەها لەو ماوەیەی لە بەحرین بووە دوو جاری سەفەری حەجێ کردووە.

پاش سەرکەوتنی کۆماری ئیسلامی، دێتەوە ئێران. وتار و بابەت و سکاڵاکانی لە بارودۆخی نالەبار، لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکانی وەک "جمهووری"، ئینقلاب، ئارمانی میللەت، ئەسحابی ئینقلاب، ئامانج، سروە و ئاوێنەدا چاپ دەکرد. لە زۆربەی کۆڕ و شەوەشێعرەکاندا بانگێشتن دەکرا و مەجلیسی ئەوانی بە شێعرە جوانەکانی دەڕازاندەوە.

خۆی دەڵێ: لە پازدە ساڵییەوە شێعر دەڵێم و دیوانی شێعرم زۆرن و چەند ساڵە کە خانەنشین بووم و خەریکی چاپی کتێبەکانم و تا ئێستا ئەو کتێبانەی خۆم کە بە چاپم گەیاندوون بریتین لە:

١. هەژارنامە ٢. باخچەی بەهەشت ٣. ئاڵەکۆک ٤. چوارچیرۆک ٥. دایە مەمدە بە گورگی (بۆ منداڵان) ٦. تەفسیری دوو سوورە لە قورئانی پیرۆز بە شێعر ٧. گەنجینەی هیوا

مامۆستا ئێستاش لە شەقامی حافزی مەهاباد (گەڕەکی سەردەمی منداڵی خۆی) دەژی.

## مەلا مارف کۆکەیی

مەلا مارف ساڵی ١٢٥٣ هەتاوی لە ئاوایی "حاجیخۆش" سەر بە شاری مەهاباد لە دایک بووە، بابی ناوی "ئیبراهیم" و دایکی ناوی "زبێدە" بووە، لە تەمەنی دوازدە ساڵیدا ڕێگای گەرمێنیی گرتە بەر و پاش دوازدە ڕۆژ گەیشتە شاری سلێمانی لە باشووری کوردستان و لە خانەقای "مەحوی" ئەو شارە دەستی بە خوێندن کرد و لەوێ سەرف و نەحوی عەرەبی، تەفسیری قورئان و هتد فێر بوو، ماوەیەکیش بۆ درێژەدان بە خوێندن لە ئاواییەکانی قەرەکەند، قەرەگوێز، زەنبیلان و خانەقا مایەوە و هەر لە شاری سلێمانیە علووم و فنوونی عەرەبی فێر بوو. لە تەمەنی ٢٥ ساڵیدا کچی مەلا "ڕەزا" خواست کە خەڵکی دەوروبەری شاری بانە بوو. لە پاش زەماوەند لە ئاوایی قۆڵغەتەپە نیشتەجێ بوو، پاشان هاتەوە مەهاباد و لە مزگەوتی شادەرویشی ئەو شارە دەستی بە وانە گووتنەوە کرد و گەلێکی قوتابی لە دەوری خۆی کۆ کردنەوە.

مەلا مارف ساڵی ١٣٢٤ی هەتاوی، لە تەمەنی حەفتاو یەک ساڵیدا، کۆچی دوایی کرد و تەرمی ئەو بەڕێزە لە گۆڕستانی مەلاجامی مەهاباد بە خاک ئەسپێردرا. (١٩٤٥/٨/٢٨ ز ، ١٣٢٤/٦/٦ هەتاوی)

مامۆستا کۆکەیی شاعێرێکی پایەبەرز بوو کە بە هەر دوو زمانی کوردی و فارسی شێعری هەیە؛ لەو کەسایەتییانە بوو کە توانی نەزمی فارسی لە ناوچەی موکریان بگەیەنێتە لووتکە. غەزەلەکانی مامۆستا زۆرتر هاوشێوەی غەزەلەکانی "حافز شیرازی" و "سەعدی شیرازی"ن، چامەکانی لە چامەی "قائانی" و ئەمیری فیروزکووهی " دەچن. شێعرەکانی ئەو مامۆستایە ئاماژە بە کەسایەتییە مێژوویییەکان و ڕووداوەکانە، هەروەها شێعری عارفانەشی هەیە. بەرهەمەکانی بریتین لە:

دیوانی شێعری فارسی کە بە خەتی نەستەعلیق لە لایەن مەلا عەبدولڕەحیم ئەفشار نووسراوەتەوە.

دیوانی شێعری کوردی

شێعرە چاپ نەکراوەکانی

کتێبێک بە دەستخەتی خۆی سەبارەت بە (نموودار، موختەسات، جەبر و ئیحتیماڵ)

**********

## حاجی سەید محەممەد سەعید نوورانی

محەممەد سەعید کوڕی سەید محەممەد لە بنەماڵەیەکی سادات، ساڵی ١٢٤٥ لە ئاوایی "کولیجە" چاوی بە دنیا هەڵێنا، خوێندنی سەرەتایی لە حەوزەی علوومی ئاوایی کولیجە تێپەڕ کرد و بۆ درێژەدان بە خوێندن لە ژێر چاوەدێری مەلا عەبدوڵڵا پیرەباب ڕووی لە ئاوایی "ئۆتەمیش" کرد و پاشان دەچێتە باشووری کوردستان و لە شاری هەولێر لە خزمەت مەلا عومەر ئەفەندی خوێندنەکەی تەواو دەکا و دەگەڕێتەوە شاری مەهاباد و دەبێتە موریدی شێخ وسووی بورهانی.

سەید محەممەد سەعید ساڵی ١٢٩٥ وێڕای شێخ وسوو بۆ بەڕێوەبردنی ئەرکی حەج، ڕەوانەی وڵاتی عەرەبستان دەبن. سەید محەممەد سەعید کەسایەتییەکی ئایینی زانا و تێکۆشەر بوو. لەو بەڕێزە دوو کتێبچە سەبارەت بە عەقیدەیەکی کورت لە دینی پیرۆزی ئیسلام و کۆڵەکەکانی ئیمان (ارکان ایمان) بە زمانی کوردی بەجێ ماوە.

هەڵبەت چەند هۆنراوەی جوانیشی بە زمانەکانی کوردی،فارسی و عەرەبی هەیە.

پەرگەمای قەلبم بە رشتـــــــەی میهری مەولا ڕۆنـــــرا

ئیدی غەم ناخـــۆم کە مشتەی غەم پەڕۆی دڵمی کوتا

خولخولەی قەلبـــم لکە سەرگەردانی غـــەم بۆ ئەم هەلە

چاک لە سەودای عیشقی مەولا هەر وەکوو مەزرەق چەقا

## ماموستا عەبدولکەریم هونەرمەند (فیدایی)

ماموستا عەبدولکەریم هونەرمەند کوڕی "ئیسماعیل" و "ئامان"ە کە ساڵی ١٣٠٧ی هەتاوی لە ئاوایی "سیسێر"ی سەردەشت چاوی بە دنیا هەڵێناوە و پاش چەند ساڵ ڕەوانەی ئاوایی "کانی ڕەش"ی مەهاباد بووە و لە وێ لە خزمەت ماموستا مەلا عەبدوڵڵا خەندانی، قورئان فێر بووە. ماموستا هەروەها چەند کتێبی دیکەی وەک اسماعیل‌نامە، ناگهان، عقیده و باب اول گلستان سعدی، هەر لە وێ فێر بووە و پاش چەند ساڵ مانەوە لەم ئاواییە دیسان گەڕایەوە ئاوایی سیسێر. ماموستا هونەرمەند لەوێ چوو بۆ حوجرەی مەلا سەید حوسێن حوسێنی و کتێبی گوڵستانی سەعدی لە لای ئەو بەڕێزە تەواو کرد و چەند دەرسی عەرەبی و عیلمی هەر لە لای ئەو ماموستایە فێر بوو. هەر لەو ئاواییە بوو کە بابی بەڕێزیان لە دەست دا و بۆ فێر بوونی زیاتری زانست و زانیاری پەرەوازەی "سێوچ"ی بانە بوو و لە خزمەت مەلا برایم پەرەی بە خوێندن دا، بەڵام هێندەی پێ نەچوو بە هۆی شەڕ و تێکهەڵچوون و ئاگر تێبەر بوونی شاری بانە، لە سەردەمی "حەمە ڕەشید خانی بانەیی"، ناچار بۆ "سیسێر" گەڕایەوە و لە خزمەت مەلا عەبدولڕەحمان سیسێری، زۆربەی کتێبەکانی پێویستی دیکەی تەواو کردن. ئەو ماموستایە زۆر ئاوایی دیکەی وەک هەنداوێ، تورجان، نەمەشیر و نستان دەچێ. لە ئاکامدا ساڵی ١٣٣٢ی هەتاوی ماموستا ماڵی دێتە ئاوایی "کاوڵان"ی سەرڕێی سەر بە شاری مەهاباد و تا دوایین ساتی ژیانی لەو ئاواییە دەمێنێتەوە و هەر لەوێ زەماوەند دەکا و دەبێتە خاوەن ٤ کوڕ و ٢ کچ.

ماموستا فیدایی پاش ٤٠ ساڵ مانەوەی لە کاوڵانی سەرێ بە هۆی نەخۆشی شێرپەنجە کاتژمێر ١١:٣٠ شەوی پێنج شەممۆ، پێنجی خاکەلێوەی ١٣٧٢ی هەتاوی لە شەوی جێژنی پیرۆزی ڕەمەزاندا کۆچی دوایی دەکا و هەر لەم گوندە بە خاک دەسپێردرێ.

هەر وەک خۆی باسی کردووە زۆربەی شێعرەکانی بە هۆی تایبەتییەوە لە نێو چوون (نزیک بە ٣٠٠ شێعر).

بەرهەمەکانی ئەو ماموستایە:

١ ـ لاس و خەزاڵ (بەیتێکی بەناوبانگی کوردییە کە ماموستا لە ٣ دەفتەر و ٤٧٥٠ بەیت بە شێوەی شێعر هۆندوویەتەوە).

٢ ـ مێژووی ژیانی فیدایی (بیۆگرافی ماموستا لە سەرەتاوە تا ساڵی ١٣٥٧ هەتاوی کە لە ١٠٠٠ بەیتدا باسی کراوە).

٣ ـ دمدم‌نامە (بەیتێکی بەناوبانگی کوردییە کە ماموستا لە ٧٠٠٠ بەیتدا بە شێوەی شێعر هۆندوویەتەوە)

٤ ـ کۆمەڵەشێعر (کلیات فدایی) (بە هەموو قاڵبە شێعرەکانەوە) بە هەر دوو زمانی کوردی و فارسی کە لە ٤٠٠٠ بەیتدا وتراوە.

❊❊❊❊❊❊❊❊❊❊

## سەید حوسێن ڕەسووڵی

"سەید حوسێن ڕەسووڵی" لە دایک بووی ساڵی ١٣٠٦ی هەتاوی، وەکوو خۆی باس دەکا: ناوی باوکی سەید ڕەحمان و باپیری سەید ڕەسووڵ، بووە. چەندین ساڵ پێش دابەش کردنی زەوی و زار بە سەر ڕەعێتاندا لە قۆزلووجە ژیاوە و ئێستاش هەر نیشتەجێی ئەوێیە، پێشتر لە ئاواییەکانی سلۆک، ئامید، هەمزاوا و ئەمین‌ئاباد بووە و ڕەگەزی دەچێتەوە سەر سەیدی کولیجە.

زۆربەی بەیتەکان دەزانێ و سەرەڕای نەخوێندەواری، زانیارێکی زۆر چاکی لە ڕابردوو و کاتی ئێستا هەیە و زۆر بە باشی شتەکان لێکدەداتەوە.

ئەو بەیتانەی کە ئەو دەیزانێ بریتین لە: ناسر و ماڵماڵ، خەج و سیامەند، شێخ فەرخ و خاتوون ئەستی، کاکەمیر و کاکەشێخ، لاس و خەزاڵ، میرە مەم (مەم وزین)، برایمۆک، ئاڕەحمان پاشای بەبەیان و سەعیدی میر سێوەدین بەگی و هتد. سەید حوسێن زۆربەی بەیتەکان لە "ڕەسووڵ باڵەکی" و "حوسێن شەشە" فێر بووە.

# خەیاڵ عەبدوڵڵازادە

خەیاڵ عەبدوڵڵازادە ساڵی ١٣٤١ی هەتاوی لە شاری مەهاباد لە دایک بووە. لە منداڵییەوە هۆگری ژیان لە لادێ بووە و هەر بۆیە لە تەمەنی ٢١ ساڵیدا لە ئاوایی هەمزاوا شووی کردووە.

کاروپیشەی ئەو بەڕێزە کۆکردنەوەی گیا دەرمانییەکانە و لە پەنا ئەوەشدا ئاژەڵداری دەکا و بەرپرسی باشگای کچانە لە ئاوایی هەمزاوا.

سروشت و فەزای بەرفرەوانی لادێ دەبێتە هۆکاری ئەوەی کە لە کوێستانەکان و شوێنە دووردەستەکانی ئاوایی چەندین جۆرە گیا بدۆزێتەوە و بە هۆی ئەزموونێک کە هەیبووە و یا موتاڵای کردووە وەکوو دەرمان تاقییان بکاتەوە و لێکۆڵینەوەیان لە سەر بکا.

شێوەی کۆکردنەوەی گیایەکان هەر کام بە جۆرێکە هەر وەک خۆی دەڵێ: هێندێک دەبێ بە ئیشکی، هێندێک بە سەوزی، یان لە کاتی باران بارین، هێندێک بە شەونەمەوە و لای بەربەیانی و هێندێک لە کەشوهەوای گەرمدا کۆ بکرێنەوە.

بە کار هێنانی گیایەکان چەندین جۆرە کە هێندێک بە شێوەی خواردەمەنی، هێندێک دێم کراو، هێندێک خووساو و هێندێک بە شێوەی تۆز و تێهەڵسوون لە لەش بە کار دێن.

ساڵی ١٣٧٦ی هەتاوی، بۆ یەکەم جار توانی ٣٠ جۆر گیای بناسێنی و ناوەکەیان بە تۆمار بگەیێنێ و تا هەوەڵی ساڵی (١٣٨٧) ٢٨٩ جۆر گیای ناساندووە، هەروەها ئێستا پارێزگاری لەم جۆرە گیایانە دەکا کە بەرەو فەوتانن. خاتوو خەیاڵ لە ساڵەکانی ١٣٨٢، ١٣٨٤، ١٣٨٦ و ١٣٨٧ نموونە-ژنی پارێزگای ئازەربایجانی ڕۆژئاوا هاتۆتەوە، هەروەها وەک ژنی نموونەی کارئافەرین لە وڵاتی ئێراندا لە ساڵی ١٣٨٨ی هەتاوی ناسراوە. هێندێک لەم گیا دەرمانییانە بۆ عێراق و وڵاتانی دیکە هەنارده دەکرێن.

ئەو حەوتووی ٤ ساعەت بە شێوەی کاری لە زانکۆی ئازادی مەهاباد وانە دەڵێتەوە.

چالاکییە جۆراوجۆرەکانی خاتوو خەیاڵ عەبدوڵڵازادە:

١. ئەندامی کۆڕی گیادەرمانییەکانی پارێزگای ئازەربایجانی ڕۆژئاوا.

٢. کارگێڕی کرێکاری کۆڕی کشتیاری کارزانی مەهاباد و ناوچە.

٣. یارمەتیدەری نموونەی پەرەپێدانی مەزرینگەی کشتیاری شارستانی مەهاباد.

٤. ئەندامی کانوونی ژنانی فەرمانداری مەهاباد.

٥. ئەندامی یارمەتی ژینگە.

٦. ئەندامی شوورای تەندروستی ئاوایی هەمزاوا.

٧. ئەندامی خانووی کشتیار.

٨. بەرپرسی باشگای کچانەی ئاوایی هەمزاوا.

٩. بەرپرسی وەرزێرانی کارامە.

## ئیسماعیل شکوهی

ساڵی ۱۳٦۰ی هەتاوی لە ئاوایی"گاپیس" هەڵکەوتوو لە بەشی ناوەندی شاری مەهاباد چاوی بە دنیا هەڵێناوە.
ڕادەی خوێندەواری دووهەمی ناوەندییە، ساڵی ۱۳۷۹ی هەتاوی وەرزیشی وەزنەبەرداری لە ژێر چاوەدێری "عەبدولباقی ئاهی" دەست پێکردووە، پاشان ئەم ئەرکە کەوتۆتە سەر شانی "عەبدوڵڵا شاە زەمانی".
ساڵی ۱۳۸٤ی هەتاوی یەکەم باشگای لە ئاوایی گاپیس دامەزراندووە. ساڵی ۱۳۸۵ی هەتاوی باشگایەکی دیکە لە ئاوایی "حاجی حەسەن" داناوە، پتر لە ۲۰۰ کەسی لە ناوچەی شامات و شاروێران لەم باشگایانەدا پەروەردە کردووە.
ئێستا لە شاری مەهاباد باشگایەکی دیکەی کردۆتەوە و دوو باشگای گاپیس و حاجی حەسەن هەر لە ژێر چاوەدێری "ئیسماعیل شکوهی"ن.
تا کۆتایی ساڵی ۱۳۸۷ی هەتاوی لە سی کێبەرکێ لە شار و پارێزگا و دەرەوەی وڵات (عێراق) بەشداری کردووە، لە پاوێرلیفتینگی ورمێ پلەی یەکەمی بەدەست هێناوە، زیاتر لە دە حوکم بە پلەکانی یەک و دوو و سێی هەیە.
ساڵی ۱۳۸٦ی هەتاوی لە کێبەرکێی بەهێزترین پیاوانی کوردستان لە شاری هەولێر بەشداری کردووە، بەڵام تا بەشی کۆتایی درێژەی بەم کێبەرکێیە نەداوە. زۆرتر لە پازدە شاگردی ئەو بەڕێزە لە کێبەرکێیەکانی پارێزگا و شاردا پلەی باشیان وەدەست هێناوە.
بەرزایی ئەو ۱۷۷ سانتی میترە، کێشی۱۳۷ کیلۆیە، ڕۆژانە نزیک بە چوار سەعات وەرزیش دەکا، ئەو پەڕتووکانەی موتاڵایان دەکا زۆرتر سەبارەت بە وەرزیش و وەزنەبەردارین.
سمایل شکوهی لە بەشداریەکەی ساڵی ۱۳۸۸ی هەتاوی لە وڵاتی فیلیپین توانی دەسکەوتێکی باش بۆ خۆی و نەتەوەکەی تەرخان بکا؛ بەڕێزیان براوەی پلەی قارەمانی قارەمانانی ئاسیا لە بەشی وەزنەبەرداری هێزی بوو و توانی مێداڵیای زێڕ لە حەرەکەی ئیسکات (۳٦۰ کیلۆ)، مێداڵیای زێڕ لە حەرەکەی پرێسی سینگ (۲٤۵ کیلۆ)، مێداڵیای زێوین لە حەرەکەی لیفت (۳۱۰ کیلۆ) و مێداڵیای زێڕ لە کۆی ۳ حەرەکە (۹۱۵ کیلۆ) بەرێتەوە. هەروەها کاک سمایل توانی براوەی کاپی قارەمانی قارەمانانی ئاسیا (IPF)، کاپەکانی باشترین وەرزیشوان لە بواری ئەخلاق و تکنیک بێ و جەوازی چوون بو کێبەرکێیەکانی جیهانی وەرگرێ.

## میرزا سەلیم موکری

میرزا سەلیم یەکێک لە شاعیرە گەورەکانی ناوچەی موکریانە کە بە زمانی فارسی شێعری وتووە، جگە لەوانە میرزا سەلیم کەسایەتییەکی ئەدەبی، قسەخۆش و نوکتەزان بووە و لە شێعرەکانی‌دا نازناوی "سالم" و "سەلیم"ی بۆ خۆی هەڵبژادبوو.
بەڕێزیان لە سەرەتادا وەک میرزا و نووسەر لە لای "قادرئاغا" کوڕی "هەباس‌ئاغا"ی دێبۆکری، لە ئاوایی "ئیندرقاش" بووە، پاشان کە "ئەمیرنیزام گەڕووسی" لە لایەن حکومەتی ناوەندی بۆ ناوچەی مەهاباد ڕەوانە کرا، میرزا سەلیم بۆ شاری مەهاباد بانگهێشت کرا و داوای لێکرا کە لە مەهاباد بمێنێتەوە و ببێ بە مونشی دەرباری ئەمیرنیزام. ئەمیر نیزام کە خۆی یەکێک لە مونشییەکانی دەورەی قاجار بوو و لە نامە نووسین و ئەدیب بوون‌دا هاوتای نەبووە، هەر میرزا سەلیمی ناسی و کارەکەی دێت لەقەبی "ملک الشعرا"ی پێدا. میرزا سەلیم تا ئەو کاتی لە مەهاباد بوو کاتیبی ئەمیر نیزامی گەڕووسی بووە. ساڵی لە دایک بوون و مردنی میرزا سەلیم بەتەواوی ڕوون نییە.

## حوسێن ڕەحیمی (حوسێنەسوور)

ساڵی ١٣٤٦ی هەتاوی لە ئاوایی "ئیندرقاش" هەڵکەوتوو لە بەشی ناوەندی شاری مەهاباد لە دایک بووە، لیسانسی ئەدەبیاتی دە زمانی فارسیدا هەیە. لە تەمەنی ١٥ ساڵیدا بە هۆی چەند کەرەسەی وەرزیشی کە خۆی سازی کردبوون دەستی بە وەرزیشی لەشجوانیی کردووە و ساڵی ١٣٦٥ی هەتاوی بۆ یەکەم جار چۆتە ژێر چاوەدێری ڕاهێنەری لەشجوانیی کاک "یۆنس ئەفراسیابی". ساڵی ١٣٧٠ توانی لە یەکەمین بەشداری خۆی، لە کێبەرکێیەکانی پارێزگای ورمێ، پلەی یەکەم وەدەست بێنێ، تا ئێستا ٨٤ پلەی وەرزیشی (یەکەم، دووەم، سێهەم)ی هەیە وەک: پلەی دووەمی بەهێزترین پیاوانی کوردستان لە شاری هەولێر، پلەی سێهەمی زوور بازووی پاڵەوانانی ئێران لە چوار محاڵی بەختیاری.

کاک حوسێن ئێستا بەرپرس و ڕاهێنەری باشگای ڕادمان لە شاری مەهابادە و پێشتریش بەرپرس و ڕاهێنەری باشگای قارەمانان و جەوانمەرد بووە، ئەم بەڕێزە تا ئێستا زیاتر لە ٢٠٠ شاگردی پەروەردە کردووە و وەک خۆی باس دەکا زۆرینەی شاگردەکانی پلەی وەرزیشی باشیان لە کێبەرکێیەکاندا هەیە. کێشی ئەم بەڕێزە ١١٠ کیلۆیە، دەوری بازووی ٥١/٥، باشترین جار ٢٤٢/٥ کیلۆی پرێسی سینگ ڕۆیشتووە، ٣١٠ کیلۆش ئیسکات دەڕوا. جێگای سرنجە کاک حوسێن بەردەوام هاتووچۆی ئەنجومەنی ئەدەبی مەهاباد دەکا و ماوەی ١٥ ساڵە بە ناز ناوی "بریا" شێعر دەنووسێ و ئەگەر دەرفەتێکی بۆ بڕەخسێ دەفتەرێک لە هۆنراوەکانی بە چاپ دەگەیەنێ.

## عەلی قادرپوور ئەقدەم (کاعەلی شۆڕاوا)

کاک عەلی قادرپوور ئەقدەم کوڕی قادر لە بنەماڵەی مرۆت (یەکێک لە شەش تایفەی هۆزی مەنگوڕ) ساڵی ١٣٠٥ی هەتاوی لە ئاوایی"سلۆک" هەڵکەوتوو لە بەشی خەلیفان و دێهستانی مەنگوڕی ڕۆژهەڵات لە بنەماڵەیەکی ئاغاوەت لە دایک بووە، منداڵ دەبێ کە بابی لە لایەن حکومەتی درندەی شاهەنشاهی ئێرانەوە ناجوامێرانە دەکوژرێ. هەر لە سەرەتایی منداڵییەوە لە خوێندنی ئەو سەردەمی (قورئانی پیرۆز، گوڵستان و بووستانی سەعدی) بەهرەمەند بووە.

یای "مرۆت"، دایکی کاک عەلی، حەکیمی بەناوبانگی ناوچە بووە کە ئەم پیشەیە لە " زڵەخای حەکیم " فێر بووە. یای مرۆت، حەکیمایەتی فێری کوڕەکەی دەکا. کاک عەلی کە خاوەن بیرێکی تێژ بووە دەبێتە حەکیمێکی کارامە و شکستەبەندێکی زۆر باش.

ساڵی ١٣٢٥ی هەتاوی زەماوەند دەکا. هەر لە ساڵی ١٣٢٦ کە ئاوایی شۆڕاوا ئاوەدان دەکرێتەوە، کاک عەلی ماڵی بۆ ئەو ئاواییە دەگوێزێتەوە و بە هۆی مانەوەی لەم گوندە تا کۆتایییەکانی تەمەنی بە "کاعەلی شۆڕاوا" دەناسرێ. سەرەتای ساڵی ١٣٦٠ لە کاتی شەڕی نێوان ئێران و ئێراق، فڕۆکەوانێکی ئێرانی لە ناوچەی دۆڵی شێخان بە هۆی سووتانی فڕۆکەکەی بە چەتر دێتە خوار و لەشی بە ١٢ جێگا دەشکێ، بە شێوەیەک کە کەس بڕوای بە زیندوو مانەوەی نامێنێ، بە هۆی شەڕ و پێکدادان دەرفەتی ڕاگواستنی بۆ نەخۆشخانە نەبووە، هەر بۆیە لە یەکێک لە ئاوایییەکانی دۆڵی شێخان ڕایدەگرن و دەنێرن لە دووی کاک عەلی شۆڕاوا و بە هۆی لێزانین و مامۆستا بوونی کاک عەلی لە بواری شکستەبەندییەوە، پاش ٤٠ ڕۆژان ئەو فڕۆکەوانە

ئێرانییە چاک دەبێتەوە و بە لاقی خۆی دەگەڕێتەوە باوەشی بنەماڵەکەی. ئەوە تەنیا گۆشەیەکی بچووک لە خزمەتی کاک عەلی شۆڕاوا بە خەڵکی ناوچەکە بووە، جگە لەوە کاک عەلی بە سەدان کەسی چاک کردۆتەوە و ئێستاش خەڵکی ناوچەی موکریان بە مامۆستایەکی بلیمەتی دەناسن. جگە لە شکستەبەندی، زۆر نەخۆشی دیکەی هەر بە گیاوگۆڵ چاک کردوونەوە. "یۆسف" و "جەمشید" دوو نەوەی کاک عەلی تا ڕادەیەک درێژەدەری ڕێگای باپیریان بوون. هەروەها ئایشێخانم، خوشکی کاک عەلی، خێزانی کاک "ڕەسووڵ ئاریا" لە بواری حەکیمایەتی شارەزا بووە و خزمەتێکی زۆری بە ئاواییەکانی دۆڵی "حاجی مامیان" کردووە. کاک عەلی پاش ٧١ ساڵ ژیانی سەربەرزانە لە ڕێکەوتی 1376/06/16 لە شاری مەهاباد کۆچی دوایی کرد و لە گۆڕستانی "بوداق سوڵتان" بە خاک ئەسپێردرا.

*********

**قادر ئوستاد ئیبراهیمی (ناسراو بە قالەشین)**

ساڵی شۆڕشی "مەلا خەلیل گۆڕەمەری" (١٣٠٧ هەتاوی) لە ئاوایی "خەلیفان" سەر بە شاری مەهاباد لە دایک بووە، هۆی ئەوەی کە پێی دەڵێن قالە شین ئەو جۆرەی خۆی دەگێڕێتەوە: کاتێک لە دایک بووم لە بەرهەڵبێنەیەکی شینیان وەرپێچاوم، هەر ئەو کات بە پێکەنینەوە لە ماڵێ دەڵێن ئەوە بۆ لەو بەرهەڵبێنە شینەیان وەرپێچاوە؟ کە ناوم لێدەنێن قادر بە قالەشین ناوم دێنن، خۆشم پێم خۆشە هەر وام پێ بڵێن چوون بەوە ناسراوم.

لە تەمەنی حەوت ساڵیدا چۆتە میراوای مەلا خەلیل بۆ خوێندن لای ئەم بەرێزە، ماوەیەک لە وێ دەبێ، بەڵام خێزانی مەلا خەلیل دەنگی ئەم منداڵەی زۆر پێ خۆش دەبێ و وەکوو خۆی باس دەکا ئیزنی خوێندنی پێ نادا و لە لای خۆی دایدەنێ و گوێ لە دەنگی دەگرێ. پاش حەوت مانگ دەچێتەوە خەلیفان لای بنەماڵەکەی، باوکی وەستا "ڕەحیم"، چوار ژنی دەبێ، بەڵام کاک قادر تاقەکوڕە دەبێ. لە تەمەنی دە ساڵیدا دەستی کردووە بە گووتنی گۆرانی، ماوەیەک خۆشخانی ئاغا بووە، بەڵام قەتی بۆ پارە بە سەر کەس هەڵنەگووتووە.

تەمەنی شازدە ساڵانە دەبێ کە ژن دێنێ، خۆی دەگێڕێتەوە کە قەتم کاری وەرزێری و ئاژەڵداری و... نەکردووە.

مەم و زین لە "کەریم مەرزینگ" فێر بووە، لاس و خەزاڵ لە "ئەحمەد کاڕەسووی"، پاشان هەرچی بەیت و باللۆرە بووە تەنیا بە گوێ هەڵخستن لە وی فێر بووە و بیرێکی زۆر تیژی بووە.

هێندێک شتی دیکە لە "حوسێن مەحموود شەشە" و " ئەحمەد کەپۆ سوور" فێر دەبێ. ساڵی ١٣٤٠ی هەتاوی هاتۆتە شاری مەهاباد، لە چەندین کۆڕ و کۆبوونەوە لە شارەکانی ئێران و عێراق بەشداری کردووە و ڕێزنامەیان ئاراستە کردووە.

برایمۆک، مەم و زین، مێهر و وەفا، لاس و خەزاڵ، ناسر و ماڵماڵ، سەیدەوان، ئازیزە و پاییزە و... دەزانێ.

قۆنگرۆکێ لە "حاجیلە" فێر بووە و "بەیتی بارزانی" خۆی دایناوە.

**برایم قادری**

ڕێکەوتی ١٣١٣/٢/٦ لە ئاوایی "عیساکەند" لە دایک بووە، باوکی ناسراو بە "کەریمی ڕەحمانی عەبدولقادری" لە موکریاندا پیاوێکی سەرناس و پیاوچاک و خاوەن سامان بووە، دایکیشی بە "سەیزادە ئامین" ناسراوە.

ساڵی ١٣٢٠ی هەتاوی ماڵیان لە عیساکەندەوە کۆچی کردۆتە خەلیفەلیان (سەر بە شاری نەغەدە)، پاش چوار مانگ مانەوە لە وێ خەڵکی ناوچەی سەهۆڵان و بەتایبەت ئاغاکان کە هۆگریان بەم بنەماڵەیە بووە ماڵیان دێننەوە ئاوایی سەهۆڵان، بەڵام هەر لەو ساڵەدا دیسان کۆچ دەکەن و ئەمجار ڕوو لە ئاوایی قەڵاجۆغەی محاڵ دەکەن، پاش هەشت ساڵ مانەوە لەو گوندە بەرەو ئۆتەمیش بار دەکەن و هەشت ساڵیش لەم ئاواییە سەقامگیر دەبن.

.ساڵی ١٣٢٧ لە ئاوایی قەڵاجۆغە دایکی کاک برایم کۆچی دوایی دەکا، باوکیشی لە ساڵی ١٣٣٠ی هەتاوی کە کاک برایم ١٧ ساڵانە دەبێ وەفات دەکا. کاک برایم هەر لە ساڵی ١٣٣٠ی هەتاوی زەماوەند دەکا.

یەکەم شایی کە ئەو گێڕاوێتی لە ئاوایی "پیر وەلی باغی" بووە. خۆی دەڵێ: ئەو کات گۆرانی "عەلی خەندان"م دەگووتنەوە، بەڵام لاسای جۆری گووتن و دەنگی ئەویم نەدەکردەوە، پاشان گۆرانییەکانی "حوسێن شەشە"م دەگووتنەوە. ساڵی ١٣٣٩ لە کەرێزەی پەنا کانی تۆمار دەسبەسەر دەکرێ و بە ماوەی نۆ مانگ لە گرتووخانەی قەسری شیرین ڕایدەگرن، بۆخۆی دەڵێ تەنیا هۆی ئەم گیرانەم سەردانێکی ئاسایی بووە بۆ باشووری کوردستان.

کاک برایم بۆخۆی گەلێک گۆرانی داناون و لەم بوارەدا بیر و هەستێکی ناسک و جوانی هەیە، هەروەها هێندێک لە شێعرەکانی مامۆستا هێمن و مامۆستا هەژار، سەید کامیل ئیمامی و کاک عەلی حەسەنیانی (هاوار)ی بە گۆرانی کوتوونەوە. لە سەردەمی پەهلەویدا بۆ ماوەی حەوت ساڵ لە فەرهەنگ و هونەری مەهاباددا کاری کردووە.

جێگای ئاماژەیە سی و دوو ساڵیش دەگەڵ مەلا "حوسێن عەبدوڵلازادە" گۆرانییان پێکەوە گوتووە. ئەو بەڕێزە لە چەندین کۆڕ و کۆبوونەوەکانی هونەری ئێران و عێراق و سوێد و هێندێک وڵاتی دیکە بەشداری کردووە و خەڵاتی زۆری وەدەست هێناوە.

ساڵی ١٣٥٣ لە تاران دیپلۆمی ئیفتخاری وەرگرتووە، لە کرماشان پلەی یەکەمی کێبەرکێی وەدەست هێناوە. ساڵی ٢٠٠٢ی زایینی دەگەڵ خوداڵێخۆشبوو "قالەمەڕە" سەردانی مام جەلال تاڵەبانیان کردووە و مانگێک لە عێراق ماونەوە. کاک برایم قادری ئێستا لە شاری مەهاباد دەژی.

# حاجی ساڵە تەورە*

حاجی ساڵە تەورە، بەیتبێژی ناسراوی ناوچەی مەنگوڕایەتی و گەورکایەتیی مەهاباد، ساڵی ١٢٧٠ی هەتاوی لە ئاوایی "کیتکە" چاوی بە دنیا هەڵێناوە. باوکی "محەممەدئەمین" و دایکی "خانمێ" بووە. پاش چەند ساڵ مانەوە لە ئاوایی کیتکە بنەماڵەکەی ڕوو لە ئاوایی "بەرەجۆ" دەکەن و لەوێشەوە پەرەوازەی "خەلیفان" دەبن و ١٥ ساڵی تەواو لەوێ دەمێننەوە و دیسان ماڵیان دێتەوە کیتکە، دوای چەند ساڵێک ماڵیان دەچێتە ئاوایی "قۆزلووی چووک".

ساڵی ١٣٦٦ بە یەکجاری ماڵیان هاتە شاری مەهاباد و لە گەڕەکەکانی مەیدانی ئیستقلال و باغی شایەگان گیرسانەوە.

حاجی ساڵە هەر لە منداڵییەوە زەینێکی باشی هەبووە و فێرە بەیت بووە و لە مەجلیسان گوتوونێوە.

ئەو بەیتەکانی کاکە میر و کاکە شێخ، خەج و سیامەند، محەممەد حەنیفە، سەیدەوان، مێهر و وەفا، شێخ فەرخ و خاتوون ئەستی، مەحموودەشۆڕی مەرزینگان، ناسر و ماڵماڵ، شێخی سەنعان، سەعید و میرسێوەدینبەگ، لاس و خەزاڵ، گەلۆ، سوارۆ، ئازیزە، پاییزە، گوڵە جوان و هتدی دەزانی.

ئەو کەسانەی کە بەیتیان لێ فێر بووە:

مەندە، خەڵکی لاجان، ئەحمەدی کارەسووی، خەڵکی خەلیفان بوو و لە یەڵتەمر کۆچی دوایی کرد، مستەفای عەزیز قۆیلەری، خەڵکی گردە بەردان، حەولا کۆڵی خدر شەمێ، خەڵکی یەڵتەمر بوو و لە کوولتەپە کۆچی دوایی کرد، حەولا گۆج، خەڵکی دارەلەک، ئەحمەد کەپۆ سوور، کانی ڕەش، سەعید نادری، حەمە قازی، خەڵکی خەلیفان، برایمی شەریفی، وسووی سمایلی خەڵکی بەرەجۆ.

حاجی ساڵە تەورە لە زۆر کۆڕ وکۆبوونەوەدا بە دەنگە زوڵاڵەکەی خۆی ئەو شوێنەی دەڕازاندەوە. لە زەمانی پەهلەوی‌دا چەند جار لە لایان دەنگ و ڕەنگی ناوەندی مەهابادەوە بانگهێشت کرا و بەرهەمی پێشکەش کرد.

حاجی ساڵە، زۆرترین ساتەکانی تەمەنی خۆی تەرخانی خزمەت کردن بە فەرهەنگی گەلەکەی کرد و سەرەنجام لە ڕۆژی ٤ بەفرانباری ١٣٧٥ی هەتاوی ئەمری خوای مەزنی بەجێ گەیاند و لە گۆڕستانی مەهاباد تەسلیم بە خاک کراوە.

---

* سەرچاوە: گۆڤاری سروە ژمارە ٥

## حوسێن خۆشئاواز (حوسێنی مەحموود شەشە)

ساڵی ١٢٩٠ی هەتاوی لە ئاوایی "شەرەفکەند" چاوی بە دونیا هەڵێناوە، لە منداڵییەوە لە ناوچەی شارویران ژیاوە، ماوەیەکی زۆر لە نێو هۆزەکانی گەورک و مەنگوڕدا بووە، چوار ژنی هێناوە، هەر لە مێرمنداڵییەوە هۆگری گۆرانی و بەیت بووە، ئێران و عێراقی کردووە و زۆربەی بەیتەکانی کوردی فێر بووە، ماوەیەک لە کوردستانی عێراق لە لای "خدرە ڕەقە" فێری بەیت بووە.
کاک حوسێن، بەیتەکانی لاس و خەزاڵ، کاکە میر و کاکە شێخ، خەج و سیامەند، شێخ فەرخ و خاتوون ئەستی، سەعید و میر سەیفەددینبەگ، مێهر و وەفا، ئایشێگوڵ، سوارە، عوسمان پاشا، و تەواوی بەیتەکانی عەلی بەردەشانی لە "خدرە ڕەقە" فێر بووە. هەروەها بەیتەکانی حاتم و محەممەد حەنیفە لە سەیید "ڕەحمان دەفزەن" فێر بووە.
بۆ خۆی زۆری بەیت و گۆرانی داناوە، ماوەیەکی زۆر لە دیوەخانەکانی پشدەری عێراق و ناوچە لێرەوارەکانی سەردەشت و لاجان و ناوچەی مەنگوڕایەتی ماوەتەوە.
ڕێکەوتی ١٣٧٣/٧/١٢ی هەتاوی کۆچی دوایی کردووە و لە گۆڕستانی شاری مەهاباد بە خاک سپێردراوە.
بۆچی پێیان گوتووە کەنیلە؟ مام حوسێن جگە لەوەی "حوسێن شەشە"یان پێدەگووت بە "حوسێن کەنیلە"ش ناسرابوو، هۆیەکەی ئەوە بوو کە لە شاریکەند چەند ماڵێکی جوولەکەی لێبووە کە جارێکیان زەماوەندیان دەبێ، کچێک لە بنەماڵەی ئەو جوولەکانە لە نێو زەماوەندەکەدا ناوی "کەنیلە" بووە و مام حوسێن زۆری پێ جوان دەبێ و بەردەوام پێی هەڵدەڵێ و هەر لە دوای ئەو زەماوەندە ئەم ناوەی بەسەردا بڕا.
مام حوسێن بۆخۆی چەندین گۆرانی داناوە کە یەکێک لەوان ڕوویابەیە، ئەوە نموونەیەک لە گۆرانی ئەم بەڕێزەیە کە بە "کەنیلە"ی هەڵکوتووە:

مەجلیسێکیان گرتووە قورحە وا لە تارانێ      چوار کەسیان پەسند کردوون وا لە مڵکی ئێرانێ
"کەنیلە" لە شاریکەند، "پەشمین" وا لە بۆکانێ      "ستارە" لە قەرەگوێز، "جەیران" وا لە جەمیانێ

***********

## سەید عەلی ڕەحیمپوور(سەید عەلی سەردەشتی)

سەید عەلی ڕەحیم پوور، نازناوی شێعری، "ڕەحیمپوور"، ساڵی ١٣١٦ی هەتاوی لە ئاوایی قۆزلووی گەورە لە بنەماڵەیەکی سادات لە دایک بووە، دایکی ئیبنوعەبباسی بووە و باوکی سەید. ساڵی ١٣٣٢ی هەتاوی بۆ خوێندن چۆتە خانەقای شێخی بورهان، ساڵێک دوایە بۆ درێژەدان بە خوێندن ماوەی پێنج شەش مانگ لە سەرتان و مرانە دەمێنێتەوە، ئەو جۆرەی خۆی دەگێڕێتەوە: "کوڕێک هەڵیفریواندم کە دەنگت بۆ گۆرانی گوتن خۆشە، پێکەوە چووینە کوردستانی عێراق و پاش ماوەیەک مانەوە لە وێ دەگەڵ کودەتای "عەبدولکەریم قاسم" فەرمانی وەدەرنانی ئێرانییەکانی ئەم وڵاتە دەدرێ و ئەویش دەگرن و دەیهێننەوە شاری کرماشان، پاشان نیشتەجێی شاری سەردەشت دەبێ، هەر لەم شارە لە ساڵی ١٣٣٨ی هەتاوی زەماوەند دەکا.
تا ئێستا شێعر و گۆرانی کەسی نەگوتۆتەوە، بەڵام زۆربەی هونەرمەندان لە شێعر و ئاهەنگەکانی کەلک وەردەگرن. تەبعی شێعر و ئاهەنگسازی ئەم بەڕێزە دەنگی داوەتەوە.

تەنیا جارێک شێعرێکی مامۆستا هێمنی بە دڵ دەبێ و بە دەنگ دەیخوێنێ، مامۆستا هێمن کە لە عێراق هاتەوە داوای دیداری دەگەڵ سەید عەلی کرد و زۆری پێخۆش بوو کە ئەم شێعرەی ئاوا بە گۆرانی گوتووتەوە. وەک خۆی باس دەکا لە سەردەشت لە ماڵە کاک "کەریم حەدادی" چاوی بە مامۆستا هێمن کەوتووە.

نزیک بە حەوسەد هەڵبەست و سی بەیتی ئایینی هەیە، پێنج کتێبی شێعر و پەند و ئامۆژگاری هەیە کە لە چاپ نەدراون.

لە شارەکانی تاران، ئیلام، سەردەشت، سلێمانی عێراق و کاناڵەکانی سەتەلایتی کوردی بانگهێشت کراوە.

بە هۆی مانەوەی چەندین ساڵەی لە شاری سەردەشت بە سەید عەلی سەردەشتی ناوبانگی دەرکردووە، ئێستا ساڵیانێکە لە شاری مەهاباد دەژی.

**********

## محەممەد ڕەسووڵی (محەممەدی خاڵە)

محەممەد ڕەسووڵی کوڕی "مام ئەحمەد" ساڵی ١٣٠٩ی هەتاوی لە ئاوایی "بەیرەم" چاوی بە دنیا هەڵێناوە.

ئەو هەر لە منداڵییەوە هۆگری بەیت و باوی کوردی بووە و خەڵکی ئەو ئاواییە ڕێژێکی زۆریان لە حەیران و فۆلکلۆری کوردەواری دەگرت و هەر بە دڵگەرمی خەڵکی ئەو ناوچەیە توانی ببێت بە حەیران و بەیتبێژێکی لێهاتوو.

کاک محەممەد ڕەسووڵی منداڵ بوو کە کاک "محەممەدی بەیتان" لەو گوندە دەژیا و بۆ دڵی خەڵک دەیکوت و دەیلاواندنەوە و هەر بۆیەش کاک محەممەد ڕەسووڵی زۆرتر و زۆرتر بوو بە ئەوینداری هونەر و هاتە گۆڕەپانی فۆلکلۆری کوردییەوە.

بابی کاک محەممەد واتا مام ئەحمەد ڕەسووڵی، کاری جۆڵایەتی و هەللاجی دەکرد و کاک محەممەد وەک بەردەستێک لە پەنا بابی فێری ئەو پیشەیە بوو.

لە تەمەنی ١٥ ساڵانەدا ژنی هێنا و ئێستا خاوەن ٣ کوڕە، ساڵی ١٣٥٧ ماڵی هاتۆتە شاری مەهاباد. خەڵک بە محەممەدی خاڵەی دەناسن، بەیتەکانی ئارەحمان پاشا، وەسمان پاشا، عەلی بەردەشانی، دمدم، زەنبیل فرۆش، لاس و خەزاڵ، محەممەد حەنیفە، عەبدوولڕەحمان، ناسر و ماڵماڵ، برایمۆک، کاکە میر و کاکە شێخ، سەعید و میر سێوەدینبەگ، سەیدەوان، لەشکری، شێخ فەرخ و خاتوون ئەستی و مێهر و وەفا دەزانێ و هەروەها شارەزایی تەواوی بە سەر گەلۆ، ئازیزە، پاییزە، گوڵە جوان، گوڵە گوڵێ، ئایشەگوڵ، سوارۆ، بەهارە و حەیراندا هەیە.

زۆربەی بەیتەکانی لە محەممەدی بەیتان، هەباسە خرە، ئەحمەد کەپۆ سوور، ڕەحیم شایەر و حوسێن شەشە فێر بووە و حەیران و گەلۆ، سوارۆ، ئازیزە و چەند شتی دیکەش لە "خەجیج دۆنەخۆر" فێر بووە کە لە ئاوایی قزڵجەی خوارێ ژیاوە.

کاک محەممەدی خاڵە، ساڵی ١٣٨٥ی هەتاوی لە شاری سنە و چەندین جار لە کۆڕەکانی فۆلکلۆر و حەیران و بەیت لە شاری مەهاباد بانگهێشتن کراوە. ئەو هونەرمەندە بەڕێزە ئێستا لە گەڕەکی مەیدانی ئیستقلالی مەهاباد دەژی.

## قادر عەبدوڵڵازادە (قالەمەڕە) *

قادر عەبدوڵڵازادەساڵی ١٢٩٥ی هەتاوی لە ئاوایی" کولیجە"ی سەر بە شاری مەهاباد چاوی بە دنیا هەڵێناوە و بۆ ماوەی چەند ساڵێک لە ناوچەی "محاڵی ئاختاچی" مایەوە. باب و براکانی شارەزای ژەنینی شمشاڵ بوون، ئەوەش ببوو بە هۆی ئەوە کە مام قادر هەر لە سەرەتای منداڵییەوە هۆگری شمشاڵ بێ، بەڵام باب و براکانی لە فێرکردنیدا کەمتەرخەم بوون و هیچ سەرنجێکیان پێنەداوە و تەنانەت بۆ هیچ کۆڕ و کۆبوونەوەیەکیش ڕێیان نەداوە.

مام قادر دەگێڕێتەوە: "باب و براکانم منیان پێ منداڵ بوو، فێریان نەدەکردم، دەگەڵ خۆیان بۆ ئێرە و ئەوێیان نەدەبردم، منیش ناچار دەگریام، لەبیرمە ڕۆژێکیان ئەوەندە گریام هەتاکوو لە پەنا دیوارێک خەوم لێکەوت و دەخەومدا دەنگێک پێی گوتم: عەبدولقادر.. عەبدولقادر... هەستە مەگری... هەستە... شمشاڵ بژەنە، منیش ڕاچڵەکیم و بە خێرایی دەستم کرد بە شمشاڵ ژەنین... دیتم ئیتر عەبدولقادری جاران نەمابووم".

خۆی لەمەڕ شمشاڵەکەیەوە دەڵێ: "لە سەرانسەری کوردستان شمشاڵێکی ئاوا چاکی لێ نییە، شتێکی بێ هاوتایە، مێژوویەکەی دەگەڕێتەوە بۆ زیاتر لە سەت و بیست ساڵ لەمەوبەر، من کە خۆم لاو بووم لە "سەید"ێکم کڕی بە ٥ قرانی ئەو کات."

مام قادر هەتا تەمەنی بوو بە هەژدە ساڵ، وێڕای بنەماڵەکەی خەریکی وەرزێری و ئاژەڵداری بوو و پاشان بۆ ماوەی دوو ساڵان شوان بووە، لە ماوەی ئەو دوو ساڵەدا لە چیا و پێدەشتەکان بەردەوام خەریکی ژەنینی شمشاڵ بووە و لە ئاکامدا توانی ببێت بە شمشاڵژەنێکی لێهاتوو و کارامە و مامەقالەی بەناوبانگ بژێوی خۆی و بنەماڵەکەی لەو ڕێیەوە دابین بکا. شێخ "محەممەد شەمسەدینی" ناسراو بە (شێخ محەممەدی بورهان) نازناوی "قالەمەڕە"ی بۆ هەڵبژاردووە.

قالەمەڕە، شاری"بۆکان"ی بۆ شوێنی نیشتەجێ بوونی دیاری کردبوو و تا کۆتایی ژیانی هەر لەوێ مایەوە. ساڵی ١٣٧٠ی هەتاوی زەماوەندی کرد کە خاوەنی دوو کوڕی دووانە بە ناوەکانی "محەممەد" و "ئەحمەد"ە.

شمشاڵەکەی قالەمەڕە هەر لە سەرەتاوە ئاهەنگە فۆلکلۆرییەکانی ناوچەی موکریانی ژەنیوە. ساڵی ١٣٨٦ قالەمەڕە خۆی لەو بارەوە دەڵێ: "زۆربەی هەرە زۆری فۆلکلۆری ناوچەم لە بەر بوو، ئێستاش پیر بووم و زۆرم لە بیر چوونەوە." ئەو بۆخۆی بەیتی "کانبی خواز"ی لە لای خۆشەویستر بووە.

*- بەیتێکی حیماسییە کە دەو بەیتەدا "کانەبی فەقێ وەیسە" دەگەڵ "ئەحمەدخانی نام"، یەکێک لە دەسەڵاتدارانی ئەو کاتی شاری مراغە، ڕووبەڕوو دەبێتەوە و لە ئاکامدا هەر دووکیان بە دەستی یەک دەکوژرێن. "خواز" کە خوشکی "کانەبی"یە، لە پاش مردنی کاکی شینگێڕی بۆ دەکا و پێیدا هەڵدەڵێ -*

قالەمەڕە بۆ دڵی خەڵک شمشاڵی لێدەدا و ئەوانیش بەپێی توانا یارمەتییان دەدا. ئەو زۆر جاران لە شارەکانی تری کوردستان، بەتایبەت لە مەهاباد و سەقز دەبیندرا و بە هەوا بەسۆزەکانی کە لە شمشاڵە سێحراوەییەکەی بڵاو دەبوونەوە و لەو ڕێیەوە نهێنییەکانی ناخی قالەمەڕەشی دەدرکاندن، ئۆخژن و ئەهوەنی دەبخشییە دڵ و دەروونەکان و بە ئاشکرا پەیکەرەی ڕەسەنایەتی بۆ دادەتاشی. سێحری هەواکانی شمشاڵی قالەمەڕە، لە ناخی مێژووە دەهاتن، مێژوویەکی پڕ کارەسات و لە سەرچاوەیەکی ڕوونی ئەدەبی زارەکی نەتەوەیەکی مێژینە و بێدادە.

---

* سەرچاوە: گۆڤاری خوێندکاریی هەژێن، سەر بە زانستگای پەیامی نووری مەهاباد، ژمارەی دووەم ، لاپەڕەی ٣١-٣٠

مامەقالە لە زۆربەی کۆڕ و کۆبوونەوەکانی هونەریدا بەشداری کردووە و خاوەنی دەیان خەڵات و ڕێزنامەیە.
بۆ وێنە:
ساڵی ١٣٧١ی هەتاوی براوەی خەڵاتی باشترین "نەیژەنی" لە وڵاتی ئاڵمان بووە کە بەداخەوە بە هۆی هێندێک کێشە و گرفتی تایبەتییەوە هەلی چوونە دەرەوەی لە وڵات بۆ نەرەخساوە.
ساڵی ١٣٧٩ی هەتاوی یادوارەی هەڵەبجە لە شاری ئیلام و هەروەها ساڵی ١٣٨٠ی هەتاوی لە یادوارەی قوربانیانی ئەنفال لە شاری سولەیمانیە بەشداری کردووە.
ساڵی ١٣٨١ی هەتاوی لە شاری بۆکان مەراسیمی ڕێزلێنانی بۆ گیراوە.
ساڵی ١٣٨٤ی هەتاوی لەسەر بانگهێشتی سەرۆککۆماری ئێراق "جەلال تاڵەبانی" سەردانی باشووری کوردستانی کردووە و خەڵاتی ڕێزلێنانی تایبەتی پێبەخشراوە. هەروەها شایانی باسە کە مامەقالە خاوەنی دەیان ڕێزلێنان و مێداڵیای دیکەیە.
مام قادر خۆی وەسییەتی کردبوو لە دوای کۆچکردنی، شمشاڵەکەی کە زیاتر لە سەت و بیست ساڵ هەیە، پێشکێشی مووزەی شاری هەولێر بکرێ.
"قالەمەڕە" شەوی پێنجشەممە، ڕێکەوتی ٣١ی گوڵانی ١٣٨٨، لە تەمەنی ٨٤ ساڵیدا، لە شاری بۆکان کۆچی دوایی کرد.

**********

### محەممەد عەبدوڵلازادە ئەقدەم (مەحمەڵ)

"محەممەد عەبدوڵلازادەئەقدەم" ناسراو بە مەحمەڵ (بەیتبێژ، حەیرانبێژ)، لە ڕیکەوتی ١٣٠٤/٣/١ هەتاوی لە ئاوایی "قالوێ زەندان" چاوی بە دنیا هەڵێناوە. ساڵی ١٣٣٥ی هەتاوی ژیانی هاوبەشی پێکدێنێ، ساڵی ١٣٥٥ی هەتاوی هاتۆتە ئاوایی"سلۆک" و ساڵیانێک لەم شوێنە و ئاواییەکانی دۆڵی ئافان گۆرانیبێژ بووە و پاشان دێتە شاری مەهاباد و دوای چەند ساڵ مانەوە لەم شارە لە ئاوایی "ئیندرقاش" دەگیرسێتەوە.
ڕێکەوتی ١٣٨٤/١/١٦ی هەتاوی هەر لەم ئاواییە کۆچی دوایی کردووە و لەوێ بە خاکی دەسپێرن.
خەڵک زۆریان خۆش دەویست و پێیان دەگووت "مەحمەڵ"، هەندێک پێیانوایە بە هۆی دەنگی خۆشی ناویان لێناوە "مەڵحەم" و پاشان وشەکە وردەوردە سوواوە و بۆتە مەحمەڵ.
ئەو زۆری حەز لە زاراوەی کرمانجی بووە و هەر بۆیە زۆر جاران لاوکی دەگوتنەوە. مەحمەڵ بەیتەکانی ناسر و ماڵماڵ، خەج و سیامەند، لەشکری، مەم و زین، سەیدەوان و برایمۆکێی زانیوە و حەیرانیشی زۆر گوتوونە، هەروەها سوارۆ، ئازیزە و پاییزەشی زانیوە.

## مەناف عەبدوڵلاهی (عەبدوڵلازادە)

ساڵی ١٣١٢ی هەتاوی لە ئاوایی "تەنگباڵەکە" لە دایک بووە، تەمەنی هەشت ساڵانە دەبێ ماڵیان دەچێتە ئاوایی "قوڵقوڵە" لە باشووری تەنگباڵەکە و تا تەمەنی بیست و یەک ساڵی لەوێ دەمێننەوە، پاشان دەچنە شاری نەغەدە و تا ساڵی ١٣٤٢ی هەتاوی نیشتەجێ ئەم شارە دەبێ، هەر لەم ساڵەدا هاتۆتەوە شاری مەهاباد و بەو هۆیەی کە زۆربەی بەیت، حەیران و گۆرانییەکانی کوردی دەزانین و هەر لە سەردەمی منداڵییەوە فێریان ببوو، لە دەنگ و ڕەنگی شاری مەهاباد دادەمەزرێ. مناجاتی لە سەید عەولای بورهانی و حوسێن مەحموودشەشە فێر بووە و زۆربەی بەیتەکانیش لە قادر وەرمەزیار خەڵکی ئاوایی "مەمەلیان" سەر بە شاری نەغەدە، فێر بووە. ماوەی دە ساڵ لە فەرهەنگ و هۆنەری مەهاباد کاری کردووە، لە فیستیواڵەکانی تاران، کرمانشان و مەهاباد چەندین جار بەشداری کردووە و ڕێزنامەی وەرگرتووە. کاک مەناف سەرەڕای نەخوێندەواری بیرێکی زۆر باشی هەیە و زۆر شت دەزانێ و لێکدانەوەی باشی لە سەر شتەکان هەیە. کاکە سەعید، سوارۆ، پاییزە، گەلۆ، بەهارە، ئەزیزە، گوڵەگوڵێ، بەیتی قەبرێ، حەیران، شێعر و مناجات دەزانێ.

**********

## محەممەد غەزاڵی (محەممەدی بەیتان)*

ساڵی ١٣٠٠ی هەتاوی لە ئاوایی "بەیرەم" لە دێهستانی کانی بازاڕی بەشی خەلیفان شاری مەهاباد لە دایک بووە، ناوی باوکی "محەممەدئەمین" و ناوی دایکی "زڵەخا"یە. لە سەرەتایی منداڵییەوە وەک زۆربەی منداڵانی ئەو سەردەمی لە خوێندن بێبەش بووە و بە کاریوباری کشتوکاڵەوە خەریک بووە. هێشتا خەتی سمێڵانی نەدابوو کە ئاوایی "بەیرەم"یان بەرەو " قوڵغەتەپە" بەجێ هێشت، هەر لەوێ بوو باوکی ئەمری خوای بەجێ هێنا. لە پاش نەمانی بابی، وێڕای بنەماڵەکەی چوونە ئاوایی "قادراوا " و لەوێ دەگەڵ کەنیشکێکی لادێیی بە ناوی "ئاشێ حەیزی مەحموودی" کە خەڵکی ئاوایی قزلجەی خوارێ بوو زەماوەندی کردەوە و بناغەی ژیانی هاوبەشی پێک هێناوە، بەرهەمی ئەم زەماوەندە دوو کوڕ و کچێک بوون.

پاش پازدە ساڵ مانەوە لەو ئاواییە، سەرلەنوێ گەڕایەوە"بەیرەم"، ئەو گوندەی کە شوێنی لە دایک بوونی و بیرەوەرییەکانی سەردەمی منداڵیی بوو. محەممەد غەزاڵی پیاوێکی قسەخۆش و خۆشڕاوێژ بوو، جگە لە کاری کشتوکاڵ و ئاژەڵداری، "لێفەدروو"ش بوو. وەک خۆی باسی دەکا هەر لە منداڵییەوە ئەویندار بەیت و حەیران بووە و هەر بۆیە هەر کەس شتێکی زانیوە لە پەنای دانیشتووە و بە وردی گوێبیستی بووە. بەیتی مەم و زین و ئایشێگوڵ لە "کەریم مەرزینگ" (کەریم ملخوار) فێر بووە. بەیتی کاکە میر و کاکە شێخ و خەج و سیامەند لە "ئەحمەد سەعیدی" فێر بووە. بەیتی محەممەد حەنیفە، لاس و خەزاڵ، شێخ مەند و شێخ ڕەش، ناسر و ماڵماڵ، سەیدەوان و هەمزاغا، لە "ساڵەکوردەی قادراوا" فێر بووە. بەیتی دمدم لە مەلا محەممەد غەفووری (پێشنوێژی ئاوایی بەیرەم لەو سەردەمیدا) کە لە ڕووی پەرتووک بۆی خوێندۆتەوە و ئەویش فێری بووە. جگە لە بەیت حەیرانێشی دەزانین و بە دەنگە خۆشەکەی دەیگووتنەوە و لە نێو خەڵک بە "محەممەدی بەیتان" ناسراوە. ساڵی ١٣٤٥ی هەتاوی لە ناوەندی دەنگ و ڕەنگی مەهاباد بەیتەکانی تۆمار کردن. ساڵی ١٣٦٢ی هەتاوی ماڵەکەی ڕاگوێزتە مەهاباد، بەڵام "چەپەڵکەی هەراسانکەر" و هەرا و زەنازەنای شار، ئەهوەنی و ئۆخژنی نەخستە دڵ و دەروونان و کۆچ و کۆچباری کرد و بەرەو لادێ گەڕایەوە.

گەڵاڕێزانی ساڵی ١٣٦٤ی هەتاوی، ئاوایی بەیرەم ئازیەتبار بوو و خاکی ئەو مەوتەنە، تەرمی ئەو گەورەپیاوەی لە ئامێز گرت.

---

* سەرچاوە: گۆڤاری سروە، ژمارە ٥

مەلا عەبدوڵڵا فاتحی (مەجنوون)

ساڵی ١٣٢٥ی هەتاوی لە ئاوایی "ئافان" سەر بە بەشی خەلیفانی شاری مەهاباد چاوی بە دونیا هەڵێنا، باوکی "مەلا ڕەحمان"، مامۆستای ئایینی ئەم گوندە بووە و بە مەلا "ڕەحمانی مۆتانێ" ناسراوە.

مەلا عەبدوڵڵا تەمەنی هەشت ساڵانە دەبێ کە ماڵیان دەچێتە ئاوایی "گاگەش"ی خوارێ و پاش ساڵێک مانەوە لە ئاوایی "کیسەڵان" دەگیرسێنەوە. هێندەی پێ ناچێ ئەو گوندەش بەجێ دێڵن و دەچنەوە "ئافان" و لە دوای ساڵێک "گاگەش"ی خوارێ، هەر لەم هاتووچۆیانەدا باوکی کۆچی دوایی دەکا و لە گۆڕستانی قوڵەقەبرانی ئافان بە خاک دەسپێردرێ.

مەلا عەبدوڵڵا تەمەنی دوازدە ساڵ دەبێ کە دەبێتە فەقێ و لە گاگەشی خوارێ لە خزمەت مامۆستا "ئەحمەد گۆزەڵێ" قورئان دەخوێنێ و لە دوایی دەچێتە ئاوایی "زێوە"، لە دەڤەری سوێسنانی سەردەشت و درێژە بە خوێندنەکەی دەدا.

لە ئاوایی "لاسەگوڵان" لە خزمەت مامۆستا "کەریم فەرەنگیس"، لە ئاوایی"لەج" لە خزمەت مامۆستا "مەلا عەزیز کەرێزە" و لە ئاوایی "کاوڵان"ی سەرێ لە خزمەت مامۆستا "مەلا کەریم هونەرمەند" (فیدایی) بەردەوام درێژە بە خوێندن دەدا.

لە ساڵەکانی ١٣٤٧ ـ ١٣٤٩ی هەتاوی کە یەک دوو ساڵی مابوو ئیجازەنامەی مەلایەتی وەرگرێ، دەستەنگی و بێدەرەتانی ناچاری کرد دەست لە خوێندن هەڵگرێ. هەر لەم سەروبەندەدا ماڵەکەی دەگوێزێنەوە بۆ ئاوایی "کاوڵان"ی سەرێ و ماوەیەکی زۆر لەم ئاواییە دەمێنێتەوە و لە پاشان ماڵی دێتە شاری مەهاباد و لە گەڕەکی مەیدانچەی حەسەنزادە دەگیرسێنەوە و لە وەرزی کشتوکاڵدا دەچێتەوە کاوڵانی سەرێ. ٢٥ ساڵ تەمەنی دەبێ کە زەماوەند دەکا و ژیانی هاوبەشی پێکدێنێ.

مەلا عەبدوڵڵا هەر لە سەردەمی منداڵییەوە دەنگێکی خۆشی هەبووە و هۆگری شێعر و فۆلکلۆری نەتەوەکەی بووە، هەر بۆیە زۆربەی بەیتەکانی کوردی لە خزمەت مامۆستای بەناوبانگی موکریان "حوسێن مەحموودشەشە" فێر بووە و هێندێکی دیکەش لە بەیتەکان لە "محەممەدی خدری خەزاڵێ" فێر بووە، حەیرانیش لە "پوورئامانی حەمەشوان" فێر بووە.

ئەو بەیتەکانی سەیدەوان، خەج و سیامەند، برایمۆک، ئایشەگوڵ و سوارۆ دەزانێ. هەروەها خۆی بەیتەکانی مەڕان، بێکابانی، چێنگ و ئاو، کوونە و هەڵۆ و...ی داناون. هەروەها مەلا عەبدوڵڵا بەیتی "زەنبیل‌فرۆش"ی بە زمانێکی ساکارانەی شێعریی دارشتۆتەوە و قسە خۆشەکانی مەلا نەسرەددینی کردوونە شێعر و هێندێک شێعری فارس کردۆتە کوردی. هەتا ئێرە پێنج هەزار دێڕی شێعر بە چوار زمانی کوردی، فارسی، عەرەبی و تورکی هۆندوونەوە، بەڵام هێشتا نەیتوانیوە بەرهەمەکانی چاپ بکا. مەلا عەبدوڵڵا لە ناوچەکەدا و لە نێو خەڵکدا بە مەلا "حەوڵای کاوڵان" ناسراوە، پێشتر نازناوی "پڵینگی" هەبووە کە دوایە نازناوی کردۆتە "مەجنوون".

### ئیبراهیم محەممەد ڕەشپوور (حاجیلەی ئیندرقاشی)

لە نێوان ساڵەکانی ١٢٧٥ ـ ١٢٧٠ لە ئاوایی "ئیندرقاش" لە بنەماڵەیەکی دەنگخۆش و ناسراوی (بنەماڵەی حاجی حەمەدەڕەش)، لە دایک بووە. هەر لە تەمەنی منداڵییەوە گۆرانی گوتووە و لە خۆشەویستیان "حاجیلە"یان پێ گوتووە. بەرهەمی ژیانی هاوبەشی حاجیلە سێ کوڕن بە ناوی مستەفا، سمایل و حاجی محەممەد. کاک "سمایل" هونەرمەندێکی هێژا بووە کە لە بەشی "ژیاننامە"ی ئەو کتێبەدا باسی کراوە. حاجی محەممەد یەکێک لە حیکایەتبێژەکانی بەناوبانگی شارۆێران بووە و تا ڕادەیەکیش بەیتی کوردی زانیوە.

دەنگە خۆشەکەی حاجیلە لە سەردەمی لاوێتیدا، وەهای ناوبەدەرەوە دەکا کە لە شاری مەهاباد و ناوچەکانی دەوروبەر کەم کەسی وا هەیە نەیناسێ. کاتی خۆی کە هونەرمەندی بەناوبانگی کورد، سەید "عەلیئەسغەر کوردستانی" دێتە مەهاباد و داوای گۆرانی لێ دەکەن، دەڵێ دەنگ-خۆشێکی دیکە بێنن تا بە دووقۆڵی بتوانن کوڕەکە بڕازێننەوە. بە سواری ئەسپ دەچن لە دوای حاجیلە و دەیهێنن، مامۆستا سەید عەلی دەڵێ با لە پێشدا  پێشتر حاجیلە گۆرانییەک بڵێ، مامۆستا سەید عەلی دەنگی حاجیلەی زۆر پێخۆش دەبێ و هەر لەوێ خەڵاتی دەکا.

حاجیلە هەر چەند سەوادی نەبوو، بەڵام پیاوێکی تێگەیشتوو و زانا بوو. ئەو لە شاری سولەیمانی و بەغدا بەرهەمی پێشکەش کردووە. حاجیلە زیاتر هونراوەی فۆلکلۆری گوتۆونەوە. بنەماڵەکەی کە ئێستا دانیشتووی ئاوایی ئیندرقاشن دەڵێن خۆی هۆنراوەیەکی هەبووە بە ناوی "خانی" کە کاک ئیسماعیلی کوڕی بۆی تەواو کردووە. هەروەها ئەو حەیرانبێژێکی کارامە بووە.

حاجیلە ساڵی ١٣٥٠ی هەتاوی لە ئاوایی ئیندرقاش کۆچی دوایی کردووە.

**********

### سمایل محەممەد ڕەشپوور (سمایلی حاجی)

ڕێکەوتی ١٣٢٢/٤/٥ لە ئاوای "ئیندرقاش" لە دایک بووە، کوڕی هونەرمەندی لێهاتوو حاجیلەی ئیندرقاشییە، هەر لە تەمەنی منداڵییەوە هۆگری فۆلکلۆر بووە و گۆرانی گوتوون، زۆربەی گۆرانییەکان لە باوکی فێر بووە و بە هاندانی باوکی پێگەیشتووە. کاک سمایل حەیرانبێژێکی باش بوو و زۆربەی گۆرانییە ڕەسەنەکانی کوردی زانیوە. ساڵی ١٣٤٥ لە ئاوایی ئیندرقاش زەماوەندی کردووە. کاک سمایل چەندین جار لە فیستیواڵی مۆسیقای سوننەتی بەشدار بووە و لە پرۆگرامی "ژیلەمۆ" لە کاناڵی کوردسات، بۆتە میوانی بەرنامە و چەند هۆنراوە و حەیرانی پێشکەش کردوون.

کاک سمایل "قۆنگرۆکێ"ی (بەیتێکی حیماسی کوردی)، بە باشترین شێوە زانیوە. تا ڕادەیەکی هۆگری بە شێعر بووە کە خەڵکەکە دەڵێن ئەو زۆر جاران هەر بە هۆنراوە دەگەڵ خەڵک دواوە. سەردەمی لاوێتی لە زەماوەندان گۆرانی گوتوونەوە و زۆر جاران دەگەڵ هونەرمەندی ناسراو "عەلی خەندان" بە یەکەوە بوون. هۆنراوەی ئایینی زانیوە و لە زۆربەی مەراسیمە ئائینییەکان بەشدار بووە.

کاک سمایل لە ڕێکەوتی ١٣٨٦/٧/٢٠ی هەتاوی لە ئاوایی ئیندرقاش ئەمری خوای بەجێ هێنا و هەر لە گۆڕستانی ئەو ئاواییە تەسلیم بە خاک کرا.

## محەممەد خەلیل مەولوودپوور (خەلیل شا)

ساڵی ١٣٠٠ی هەتاوی لە ئاوایی "خاتوونخاس" لە دایک بووە، تا سەرەتای مێرمنداڵی هەر لەم ئاواییە بووە، پاشان ماڵیان گوێزتۆتەوە بۆ ئاوایی "سنجاغ" و دەورانی لاوێتی لەم ئاواییە تێپەڕ کردووە و هەر لەم گوندە زەماوەندی کردووە. حەیران لە "مامەشێرە" فێر دەبێ و لە لای سەیید "عەبدوڵڵا بورهانی" و "حوسێنشەشە" فێری زۆربەی بەیت و حەیرانەکان دەبێ.

ساڵی ١٣٤٠ی هەتاوی ماڵی دێتە ئاوایی "ئازاد" و تا ساڵی ١٣٥٨ی هەتاوی خەریکی کشتوکاڵ دەبێ و هەر لەم ساڵەوە هاتووچۆی شار و ئاوایی کردووە و تەنیا وەرزی کاروبار چۆتەوە ئاوایی ئازاد. ساڵی ١٣٦٢ی هەتاوی کە خێزانی شێخزادە "مریەم بەرزەنجی" کۆچی دوایی دەکا، دەست لە گووتنی بەیت و حەیرانان هەڵدەگرێ.

"خەلیل شا" خوێندەوار نەبوو، بەڵام قسەخۆش و نوکتەزان و کوێخا بوو. بەشێکی زۆر لە قورئانی پیرۆز، گوڵستان و بوستانی سەعدی شیرازی لەبەر بوو. گەلۆ، ئازیزە، گوڵەگوڵە، زەینەڵ، خەج و سیامەند، سەیدەوان، لاس و خەزاڵ، مەم و زین، بەیتی محەممەد حەنیفە و مناجات و شێعرەکانی ئەحمەدی کۆری دەزانی و لە بەری بوون. ئەم بەڕێزە هەشت منداڵی هەیە کە چواریان کوڕ و چواریان کچن، هیچ کام لە کوڕەکانی هونەری باوکیان ڕەچاو نەکردووە، بەڵام برازکەی کاک "عوسمان" کە ماڵی لە "سنجاغ"ە حەیرانان دەزانێ.

خەلیل شا لە ڕێکەوتی ١٣٧٨/٦/٢١ی هەتاوی کۆچی دوایی کردووە و لە گۆڕستانی سنجاغ بە خاک سپێرردراوە.

**********

## نادر نادرزادەئەقدەم (ڕەسووڵ نادری)

ساڵی ١٣١٢ی هەتاوی لە ئاوایی "ئۆزونتاش" بەشی خەلیفانی شاری مەهاباد، لە دایک بووە. سەردەمی منداڵی لەبەر بێدەرەتانی و هەژاری، کارداریی خەڵک دەکا، پازدە ساڵی تەمەن دەبێ کە دەسی دەکا بە گۆرانیگوتن، باوکیشی حەیران و بەیتی زۆر زانیون. نیشتەجێی ئاوایی "کانی سێو" دەبێ و هەر لەوێ لە تەمەنی بیست و شەش ساڵیدا زەماوەند دەکا. ساڵی ١٣٤٧ی هەتاوی بە تاوانی دژایەتی دەگەڵ ڕژیمی شاهەنشاهی بە ماوەی سێ ساڵ دەسبەسەر دەکرێ، هەر لە گرتووخانە چوار پۆلی وانەی سەرەتایی تەواو دەکا و ساڵی ١٣٥١ی هەتاوی ماڵی دێتە شاری مەهاباد.

ئەو سەردەمی ئەو دەستی کردووە بە گورانیگوتن، ئامێرەکانی مۆسیقا لە ناوچەکەدا بەدەگمەن بوون و هەر بە چەپڵە، زەرب و پاشان نایە ئاهەنگیان گێڕاوە. یەکەم جار دەگەڵ کانەبی (نایەژەن)، لە ئاوایی "دۆڵپەمۆ" داوەتیان گێڕاوە.

کاک ڕەسووڵ، حەیران و بەیت و گۆرانی دەڵێتەوە و نەقڵەکانی بەناوبانگن. زۆر شتان لە سەیید "عەلی سەردەشتی" فێر بووە. هەڵبەت "ڕەسووی نادری" زۆرتر بە نەقڵەکانی ناسراوە و وەک بۆخۆی باس دەکا ئەم نەقڵانە یا بە سەر خۆی هاتوون یان دیتوونی و بیستوونی.

سەردەمی حکومەتی پاتشایی هاوکاری فەرهەنگ و هونەری مەهاباد بووە، لە کۆڕەکانی بەیت و حەیران، لە پارێزگا و شارەکانی دیکەی ئێران بەشداری کردووە، هەروەها لە چەندین سەتەلایتی کورد بانگهێشتن کراوە و بەرنامەی بەڕێوە بردووە.

# ئامار و ئەژمار

## بەشی شەشەم

بنکەی تەندروستی، ڕێگاوبان، بیمە، باخچەی ساوایان، کانگای بەرد و ...

| ڕیز | گوندەکانی خاوەن "بنکەی تەندروستی" |
| --- | --- |
| ١ | ئوزندەرێی سەرێ |
| ٢ | گردەبەردان |
| ٣ | بەرەجۆ |
| ٤ | سیاقوڵی خوارێ |
| ٥ | هەمزاوا |
| ٦ | دێبۆکر |
| ٧ | چۆمەلان |
| ٨ | خانەگێ |
| ٩ | کەرێزەی شێخان |
| ١٠ | کەوتەر |
| ١١ | ئسووکەند |
| ١٢ | لاچین |
| ١٣ | حاجیاڵیکەند |
| ١٤ | قەمتەرە |
| ١٥ | ئۆتەمیش |
| ١٦ | کولیجە |
| ١٧ | عیساکەند |
| ١٨ | قۆرغان |
| ١٩ | کیتکە |
| ٢٠ | قۆزلووی گەورە |
| ٢١ | کولتەپە |
| ٢٢ | گوێچکەدەرێ |
| ٢٣ | ئیندرقاش |
| ٢٤ | سنجاغ |
| ٢٥ | خاتوونباغ |
| ٢٦ | قەرەبلاغ |
| ٢٧ | کەڵەکاوێ |
| ٢٨ | پاشبەرد |
| ٢٩ | سوێناس |
| ٣٠ | کاولانی خوارێ |
| ٣١ | قۆیتەڵ |
| ٣٢ | قالوێ زەندان |
| ٣٣ | گڵێنان |
| ٣٤ | کانی سێو |
| ٣٥ | خەلیفان |
| ٣٦ | قۆپی باباڵی |
| ٣٧ | گردەڕەش |
| ٣٨ | بەردەڕەشان |
| ٣٩ | قولقوڵە |
| ٤٠ | خوڕخوڕە |
| ٤١ | قەرەقشلاق |
| ٤٢ | قزڵقۆپی |
| ٤٣ | گۆکتەپە ١ |
| ٤٤ | گۆکتەپە ٢ |
| ٤٥ | قەرەداغ |
| ٤٦ | گابازەڵە |
| ٤٧ | لەج |
| ٤٨ | حاجیخۆش |
| ٤٩ | باگردانی خوارێ |
| ٥٠ | میرەسێ |
| ٥١ | سەرتان |
| ٥٢ | مرانە |
| ٥٣ | ئافان |
| ٥٤ | قۆزلووجە |
| ٥٥ | گاگەشی خوارێ |
| ٥٦ | ئامێد |
| ٥٧ | حەولاکوردە |
| ٥٨ | دریاز |
| ٥٩ | قەرەخان |
| ٦٠ | کۆزەکەرێز |
| ٦١ | دارەلەک |
| ٦٢ | قووم قەلا |

*بەرزاییەکانی زیاتر لە ٢٠٠٠ میتریی ناوچەی مەهاباد*

| ریز | ناوی شوێن | بەرزایی بە میتر |
|---|---|---|
| ١ | ئامێد | ٢٠٠٠ |
| ٢ | فەقێ وەیس | ٢٠٠٠ |
| ٣ | سەرمێرگانی برایمە | ٢٠٠٠ |
| ٤ | بەرزاییەکانی قازیاوا | ٢٠٠٠ |
| ٥ | قەرەچەلان | ٢٠١٥ |
| ٦ | مێرگەرۆ | ٢٠٤٤ |
| ٧ | ئافان | ٢٠٤٥ |
| ٨ | سارەوانان | ٢٠٥٠ |
| ٩ | کێوی کیسەڵان ـ کەپەکەند | ٢٠٦٨ |
| ١٠ | قەڵات | ٢٠٧٠ |
| ١١ | سیاقوڵی سەرێ | ٢٠٧٢ |
| ١٢ | کێوی خێرس چایی ـ زێوە | ٢١٠٠ |
| ١٣ | بەرزاییەکانی شیلاناوێ | ٢١٠٠ |
| ١٤ | ئەسپینگ داران | ٢١٠٠ |
| ١٥ | جەواڵەڕەشان | ٢١٠٠ |
| ١٦ | گۆمڵیان | ٢١٠٠ |
| ١٧ | ئاڵماڵوو | ٢١٩٥ |
| ١٨ | شێخ خەزاڵی ـ ئەسحاب | ٢١٩٥ |
| ١٩ | شێخ حەیدەر ـ ئەمینئاباد | ٢٢٠٠ |

*بەرزاییەکانی زیاتر لە ٢٠٠٠ میتریی ناوچەی مەهاباد*

| ریز | ناوی شوێن | بەرزایی بە میتر |
|---|---|---|
| ٢٠ | گردەبەردان | ٢٢٠٠ |
| ٢١ | بەرزاییەکانی بەیرەم | ٢٢٠٠ |
| ٢٢ | شێخان | ٢٢٠٠ |
| ٢٣ | بێهەنگوین | ٢٢٠٠ |
| ٢٤ | جۆغانتوو | ٢٢٠٩ |
| ٢٥ | مام قوچاق | ٢٢٠٩ |
| ٢٦ | قۆتڕ | ٢٢٢٢ |
| ٢٧ | سوڵتان | ٢٢٢٦ |
| ٢٨ | بەرزاییەکانی قەشقوونە | ٢٢٧٥ |
| ٢٩ | باژارگا | ٢٣٣٩ |
| ٣٠ | جانداران | ٢٣٤٢ |
| ٣١ | بەرزاییەکانی خەلیفە | ٢٣٤٧ |
| ٣٢ | زمزیران | ٢٤٠٠ |
| ٣٣ | سپیسەنگ | ٢٤٠٠ |
| ٣٤ | پیرستان | ٢٥٠٠ |
| ٣٥ | چەکووچ | ٢٥٣٦ |
| ٣٦ | ماڵووک | ٢٥٩١ |
| ٣٧ | ئالۆک | ٢٦٠٠ |
| ٣٨ | مەیدان ئەستەر | ٢٧٠٠ |

ئاواییەکانی خاوەن هێڵی ڕاگواستن (تا کۆتایی ساڵی ١٣٨٨ی هەتاوی)

| | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ١ | ئسووکەند | ٥ | دارەلەک | ٩ | گردیاقووب | ١٣ | ترشەکان[1] |
| ٢ | درياز | ٦ | قزڵقۆپی | ١٠ | خانەگێ | ١٤ | حاجیخۆش |
| ٣ | قوومقەڵا | ٧ | قەرەقشلاق | ١١ | ئیندرقاش | ١٥ | لەج |
| ٤ | قەرەخان | ٨ | کۆنەدێی شارویران | ١٢ | گۆکتەپە | ١٦ | خورخورە |
| کۆ: | ١٦ ئاوایی | | ٢١ هێڵی ڕاگواستن | | | | |

بەرێوەچوونی گەڵاڵەی هادی لەو گوندانە، تا کۆتایی ساڵی ١٣٨٧ی هەتاوی

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| | قوومقەڵا | ٦ | ئیندرقاش | | کیتکە |
| | کەرێزەی شێخان | | خەلیفان | | کاوڵانی خوارێ |
| | ئسووکەند | | درياز | | خورخورە |
| ٤ | قەرەداغ | | سەهۆڵان | ٤ | لەج |
| ٥ | کۆزەکەرێز | | حەولاکوردە | | |

1. هەروەها جەهادئاباد لە نزیک ترشەکان کە تازە ئاوەدان کراوەتەوە، وێڕای ئەم ئاواییانە لەم هێڵی ڕاگواستنە بەهرەمەندە.

لە کۆی دێهاتەکانی مەهاباد تەنیا "گۆکتەپە" گازی بۆ کێشراوە و بڕیارە ساڵی ١٣٩٠ی هەتاوی ئاوایییەکانی خانەگێ، ئسووکەند، ئیندرقاش، قوومقەڵا، قەرەخان، دارەلەک و دریاز گازیان بۆ بکێشرێ.

**بەڕێوەبەرایەتی و ناوەندەکانی یارمەتیدەر و بیمە:**

لە حەشیمەتی ٩٩٦٣ کەسی یارمەتیخواز لە کۆمیتەی یارمەتیدەری ئیمام خومەینی مەهاباد، ساڵی ١٣٨٧ی هەتاوی چ لە شار و چ لە ئاوایییەکان، ٨٣٧٩ کەس یارمەتیخوازی ئاساین کە تەمەنیان لە ٦٠ ساڵ بەرەو خوارەوەیە. هەروەها ١٥٨٤ کەسیش کە تەنیا خەڵکی ئاوایییەکان دەگرێتەوە، تەمەنیان پتر لە ٦٠ ساڵە.

کۆی یارمەتیخوازان لە ئاوایییەکان ٤٠٠٠ کەسە بەرانبەر دەگەڵ ١٥٠٠ ماڵ، ٥٠٩ کەس لە یارمەتیخوازان ئیمکاناتیان دراوەتێ بۆ بەڕێوەبردنی گەڵاڵە داخوازییەکانیان، لەم ٥٠٩ کەسە ١٣٠ کەس تایبەتە بە تەونکردن.

ئەم کۆمیتەیە ١٧٠٠ قوتابی شار و ئاوایی لە ژێر چاودێرییە و ١٩٠ خوێندکاری زانکۆ کە خەڵکی مەهابادن لە زانکۆکانی وڵاتدا لەو هەلانەی کە کۆمیتە بۆی ڕەخساندوون کەلک وەردەگرن. هەروەها ١٧ ماڵ لە نەخۆشانی ئاوایی بەسری سەر بەم ئۆرگانەن.

ئەم کۆمیتەیە لە بوارەکانی فەرهەنگی، ئاوەدانی، سەربەخۆیی، ڕاوێژکاری، دانی پارە، دەرمان، جیازی بووک، سەهامی عەدالەت و... خزمەت گەیاندن دەکات.

**بیمە:**

لە ٢٠١١٠ کەسی شار و ئاوایییەکانی مەهاباد کە بیمەن و لە ژێر چاوەدێری دایرەی دابینی کۆمەڵایەتی (اداره تامین اجتماعی) دان، بەراورد دەکرێ ٣٢٠٠ کەسی خەڵکی ئاوایییەکان بن کە ٩١٢ کەسیان بیمەی شۆفێرییان هەیە.

**ئەنجومەنی خاتەمولئەنبیا:**

یارمەتیخوازانی پارێزگای ئازەربایجانی رۆژئاوا ٤٧٩ کەسە کە ١٧٣ کەسیان لە شارەکانی سەردەشت، بۆکان، پیرانشار، شنۆ، میاندواو و مەهاباد لە ژێر چاوەدێری ئەنجومەنی خاتەمولئەنبیا دان. ئەو کەسانەی تووشی نەخۆشی گولی بوون و دانیشتووی ئاوایی "بەسری"ین، ٢٣ کەسن، ئەوان وێڕای بنەماڵەکانیان دەژین و بە گشتی مناڵەکانیان ساخن و تووشی ئەو نەخۆشییە نەبوون.

دەتوانین بڵێین بەخۆشییەوە ئەو نەخۆشییە خەریکە بە یەکجاری بنەبڕ بێ. هەموو ساڵێ لە لایەن ناوەندی بنکەی تەندروستییەوە، ئەو نەخۆشانە تاقی دەکرێنەوە و ئەگەر چۆنییەتی نەخۆشییەکەیان بەرەو خرابوون چووبێ دەچنە ژێر چاوەدێری ئەو بنکەوە.

**بیمەی ئاواییڵشینەکان:**

گەڵاڵەی بیمە کردنی ئاواییەکان و عەشیرەتەکان، لە ساڵی ١٣٧٥ی هەتاوییەوە بەڕێوە چووە و ٢٣ میلیۆن خەڵکی ئاوایییەکانی ئێران، کارتی پێناسەی بیمەی دەرمانییان وەرگرتووە و لە هەموو ئەو دەرفەتانەی ئەو ناوەندە دابینی دەکا بەهرەمەند بوون. روون نەکراوەتەوە چەند کەس لە دانیشتووانی ئاوایییەکانی مەهاباد لە ژێر چاوەدێری ئەم ناوەندەدان.

**بەڕێوەبەرایەتی ئاسایشت (اداره بهزیستی):**

بەڕێوەبەرایەتی ئاسایشت خزمەتی خەڵکی ژێر چاوەدێری (تەحتی پوشش) لە شار و ئاوایی دەکا و لە بوارەکانی وەکوو: پێدانی پارە، بەرگەی کڕینی کەلوپەلی پێویست، پێدهانی کۆپین، ئارد، سەهامی عەداڵت و... هەنگاو هەڵدەگرێ.

هەروەها گەڵاڵەی سی. بی، یان بەرگری لە گیرۆدەیی لە ئاواییەکانی ئیندرقاش، کۆزەکەرێز و خەلیفان بەڕێوە دەبات.

لە مەودای ساڵی ١٣٨٨ی هەتاوی، ٢٣ خوێندکارانی زانکۆ لە شار و ئاوایی کە پێنج کەسیان خەڵکی لادێن لە دانی پارە و ئەو هەلانەی کە لە زانکۆکان بۆیان ڕەخساوە، بەهرەمەندن.

٥٧٦ منداڵی خەڵکی گوندەکان لە ژێر چاوەدێری باخچەی ساوایان دان. (تا کۆتایی ساڵی ١٣٨٨ی هەتاوی)

| ڕیز | ئەو ئاواییانەی خاوەن "باخچەی ساوایان"ن |
|---|---|
| ١ | ئسووکەند، خاوەن دوو باخچەی ساوایە. |
| ٢ | بەیتاس |
| ٣ | ترشەکان |
| ٤ | خاتوونباغ |
| ٥ | خانەگێ (شارۆێران) ٢ |
| ٦ | خورخورە |
| ٧ | خەلیفان |
| ٨ | حاجیخۆش |
| ٩ | دارەلەک |

| ڕیز | ئەو ئاواییانەی خاوەن "باخچەی ساوایان"ن |
|---|---|
| ١٠ | درياز |
| ١١ | دۆستاڵی |
| ١٢ | قۆزلووی گەورە |
| ١٣ | قولقولە |
| ١٤ | قەجیئاوا |
| ١٥ | قەرەقشلاق |
| ١٦ | قەرەخان |
| ١٧ | قزڵقۆپی |

| ڕیز | ئەو ئاواییانەی خاوەن "باخچەی ساوایان"ن |
|---|---|
| ١٨ | کەرێزەی شێخان |
| ١٩ | کێچاوا |
| ٢٠ | کیتکە |
| ٢١ | گابازەڵە |
| ٢٢ | گاپیس |
| ٢٣ | گۆکتەپە، خاوەن سێ باخچەی ساوایە. |
| ٢٤ | لەج |
| ٢٥ | هەمزاوا |

دیاری کردنی کۆی بەرهەمی وەرزێرانی شاری مەهاباد لە ساڵی ٨٧ ـ ١٣٨٦ی هەتاوی، (دایرەی کشتوکاڵ)

| بەرهەم | کشتوکاڵ بە گوێرەی هێکتار | وەبەر هاتن بە گوێرەی تۆن |
|---|---|---|
| گەنمی ئاوی | ٨٦٣٠ | ٢١٨٠٠ |
| گەنمی دێم | ٣٥١١٠ | ٤١٣٦ |
| جۆی ئاوی | ١٠٠٠ | ٢٨٣٥ |
| جۆی دێم | ١٦٠٠ | ١٠٧٠ |
| چەوەندەر | ١٢٠٠ | ٤١٦٠٠ |
| وێنجە | ٥٤٥٠ | ٥٢٢١٥ |
| نۆکی ئاوی | ١٠٠ | ١٦٨ |
| نۆکی دێم | ٨٣٠٠ | ٣٠١٠ |
| گوڵەبەڕۆژەی ئاوی | ٥٠ | ٢٥ |
| گوڵەبەڕۆژەی دێم | ١٥٠ | ٦ |
| نیسکی دێم | ٧٠٠ | ٦٧ |

| بەرهەم | کشتوکاڵ بە گوێرەی هێکتار | وەبەر هاتن بە گوێرەی تۆن |
|---|---|---|
| تووتن | ٠ | ٢٥ |
| فاسولیا | ٢٠ | ٤٠ |
| سەبزییەکان | ٤٥ | ٦٧٥ |
| گوڵڕەنگ | ٥ | ٠ |
| سێوی داری | ٤٩٨٠ | ٥٨٩٠٠ |
| بادام | ٧٨١ | ٦٩٦ |
| گوێز | ١٢٠٢ | ٩٠٠ |
| ترێی ئاوی | ٣٨٩/٥ | ١٤٧ |
| ترێی دەیم | ٢٥٧/٥ | ٣٦ |
| هەرمێ | ٣٩/٥ | ٧١١ |
| گێلاس | ٦١/٥ | ٥٧٠ |

| بەرهەم | کشتوکاڵ بە گوێرەی هێکتار | وەبەر هاتن بە گوێرەی تۆن |
|---|---|---|
| باینجانی سوور | ٥٥٠ | ١٩٢٥ |
| یارەڵماسی | ٢٠٠ | ١٠٠٠ |
| گوڵەپێغەمبەرە | ٦٥٠ | ٣٥٩١ |
| پیواز | ٥ | ١٥٠ |
| کاڵەک | ٥٥ | ١٦٠٠ |
| شووتی | ٦٠ | ١٨٠٠ |
| هاروێ | ١٠٠ | ٢٠٠٠ |
| کەلەم | ٠ | ٠ |
| کولەکە | ١٥ | ٢٢٥ |
| کۆلزا | ٥٠٠ | ٧٣ |

| بەرهەم | کشتوکاڵ بە گوێرەی هێکتار | وەبەر هاتن بە گوێرەی تۆن |
|---|---|---|
| ئاڵووباڵوو | ٩٩ | ٣٣٦ |
| قەیسی | ٢٧٢ | ٣٧٠٥ |
| هڵوو | ٢٩٩ | ٣٧٠٥ |
| هەڵووچە | ١٢ | ١٤٠ |
| شەلیل | ١٨ | ١٥٦ |
| شەفتالوو | ١٠ | ١٠٠ |
| بێ | ٨/٥ | ١٢٧ |
| سماق | ٦ | ٨ |
| ئەو دارانەی بەرهەمیان نییە | ٤٢٥ | ٠ |

**پانتایی لەوەرگەی شاری مەهاباد بە پێی سەرژمێری بەڕێوەبەرایەتی سەرچاوە سرووشتییەکانی (منابع طبیعی) شاری مەهاباد:**

کوران و کاوڵان: ١٠٠ هێکتار

دەسکرد: ٥٣ هێکتار

بە بەربڵاوی: ١٥٠ هێکتار لە حەوزەی شاری مەهاباد

ئەو دارانەی کە لە سروشتدا خۆڕسکن: بەڕوو، ئاڵووباڵوو، گێوژ، بادامی کێوی، هەرمێ، سێوەتاڵە.

**تاڵاوەکان:**

کەنارەکانی باشووری پارکی میللی زەریاچەی ورمێ کە دەبێتە ناوچەی مەهاباد، چەند تاڵاوێکی لێ هەڵکەوتووە کە گرینگترینیان تاڵاوی "کانیبەرازان"ە، بە پانتایی ٩٠٧ هێکتار کە نێونەتەوەییە و بڕیارە ببێتە ئەندامی چوار ناوچەی ژینگە = پەناگای حەیاتی وەحش.

ئەم چوار ناوچانە بریتین لە: پارکە میللیەکان، ئاسەواری سروشتی نەتەوەیی، پەناگای حەیاتی وەحش، ناوچە پارێزراوەکان.

هەروەها لە کۆنوانسیۆنی تاڵاوەکان لە ساڵی ١٩٧١ زایینیدا "قۆپی باباڵی"، وەک تاڵاوێکی نێونەتەوەیی، دیپلۆمی ئیفتیخاری وەرگرتووە.

تاڵاوی "گەرووس" کە ژینگەی زیندەوەرانی ورد و درشت و باڵندەکانی ناوچەیی کۆچەرییە، لە ڕیزی ئەو تاڵاوانەیە کە ئەندامی چوار ناوچەی ژینگەیەن.

ناوچە تەپۆڵکەیەکان کە گەنم و دانەوێڵەی تری لێدەکرێ، بریتین لە پێدەشتەکانی قوڵقوڵە، باجەوند، سنجاغ، باستامکۆن، کانی سێو و ئازاد و هەروەها شوێنێکن بۆ پەروەردە کردن و ژینگەن بۆ باڵندە کەموێنە و دەستەمۆی "چرگ"، دیارە هێندێک باڵندەی تریش لەو ناوچەیە دەژین. هەروەها

ڕووباره وەرزییەکانی قالوێ و کانی سێو و ئۆزونتاش وەک ئاسەواری سروشتی دێنە ئەژمار.

کوێستانەکانی قزڵجە و ئەو کێوانەی بەرزاییان لە ٢٥٠٠ تا ٢٦٠٠ میترە کە تا بەر لە ساڵانی ٥٦-٥٧ ژینگەی گیانلەبەری وەکوو کەو، هەڵۆ و... بووە. هەنووکەش لە بەرزاییەکانی لەندی شێخان، قەڵاتی شای، سپیسەنگ و مەیدانئەستەر "ورچ" هەر ماوە. هەروەها ئەو شوێنە ژینگەی کەڵە کێوی، بزنە کێوی، گورگ، کەروێشک، ڕێوی، سمۆرە و بوونەوەری ترە.

ئەو باڵندانەی لە نێو ئاو و قەراغ تاڵاوەکانی مەهاباددا دەژین ناوچەیین یان کۆچەرین:

١. سوورەقورینگ ٢. مراوی سەر سووری بەحری ٣. مراوی سەر سوور ٤. مراوی قوونڕەش ٥. مراوی سەر سەوز ٦. ڕەشبەشە ٧. دوو کوڕە ٨. خاسەسی ٩. سوورەقانگ ١٠. هەڵەتانج ١١. ماسیگرە ١٢. ڕەشبەشەی دندووک سوور ١٣. قەلمراوی بچووک ١٤. کانوونی گەورە ١٥. واقی گەورە ١٦. هەڵۆی خاڵخاڵ ١٧. شاوەسپیلکە ١٨. لەکلەک ١٩. قشقەڵە ٢٠. هەڵەکەسەمای گەورە ٢١. شاوە سوڵتانی ٢٢. باشوو ٢٣. سێروو ٢٤. قەشان ٢٥. جورە

سەیرانگا سرووشتییەکانی شاری مەهاباد:

١. ئەشکەوتی سەهۆڵان.

٢. تاڵاوی کانی بەرازان.

٣. تاڵاوی قۆپی باباڵی.

٤. تاڵاوی گەرووس.

٥. سەیرانگای ئاوبەندی مەخزەنی مەهاباد - ٤٣ کیلۆمیتر(لکی هەمزاوا و قازیاوا لە باشووری مەهاباد).

٦. سەیرانگای جادەی مەهاباد - پسوێ (بەرزاییەکانی مەیدان) - ١٥ تا ٣٠ کیلۆمیتری مەهاباد.

٧. دۆڵی شێخان - بەرزاییەکانی قەڵاتی شای.

٨. دۆڵی گوێچکەدەرێ - بەرزاییەکانی سپیسەنگ.

٩. تۆرە - مەیدان چۆغی (بەرزاییەکانی کانی ڕەش دەربەند) ٦٠ کیلۆمیتری مەهاباد - سەردەشت.

١٠. دۆڵی قزڵجە - بەرزاییەکانی چەکووچ - ٢٥ کیلۆمیتری جادەی مەهاباد - بۆکان.

١١. دۆڵی لاچین و کونەدێ.

١٢. بەرزاییەکانی کانی شێخان.

١٣. تاڵاوی ئسووکەند.

مەوقووفات:

| ڕیز | جۆری مەوقووفە | ژمارە |
|---|---|---|
| ١ | مزگەوت | ٥٥ |
| ٢ | تەکیە | ٣ |
| ٣ | خانەقا | ٦ |

لیستی مڵکی موقوفاتی مەهاباد بە گشتی

| ڕیز | جۆری مڵک | ژمارە |
|---|---|---|
| ١ | خانووبەرە | ١٧١ |
| ٢ | بازرگانی | ٤٥٧ |
| ٣ | ئیداری | ٧ |
| ٤ | کشتوکاڵ | ٧٤٠ |

| ڕیز | ناوی مەوقووفە | شوێن | ژمارەی ڕەقەبە | جۆری ڕەقەبە |
|---|---|---|---|---|
| ١ | ئەمینولئیسلام | ئاوایی بەسری | ٤ ڕەقەبە | زەوی کشتوکاڵ |
| ٢ | مەجیدخانی موکری | ئاوایی بەردەمێش | ٢٧ ڕەقەبە | زەوی کشتوکاڵ |
| ٣ | مەجیدخانی موکری | ئاوایی بۆزە | ٢٠ ڕەقەبە | زەوی کشتوکاڵ |
| ٤ | مەجیدخانی موکری | ئاوایی خاتوونباغ | ٦٣ ڕەقەبە | زەوی کشتوکاڵ |
| ٥ | مزگەوتی ئاوایی درياز | ئاوایی درياز | ١ ڕەقەبە | زەوی کشتوکاڵ |
| ٦ | عەبدولقادر حەللاجی | ئاوایی کولیجە | ١ ڕەقەبە | زەوی کشتوکاڵ |
| ٧ | محەممەدئەمین ئەڕژەنگ | ئاوایی دەرمان | ٢ ڕەقەبە | زەوی کشتوکاڵ |
| ٨ | مەجیدخانی موکری | ئاوایی کەپەکەند | ٢٢ ڕەقەبە | زەوی کشتوکاڵ |
| ٩ | مزگەوتی ئاوایی کولیجە | ئاوایی کولیجە | ١ ڕەقەبە | یەک باغچە |
| ١٠ | سەیید محەممەد بنی ئەبی بەکر | ئاوایی لاچین | ١٧ ڕەقەبە | زەوی کشتوکاڵ |
| ١١ | ڕەحیم عەبدوڵلاپوور | ئاوایی کانی سێو | ١ ڕەقەبە | زەوی کشتوکاڵ |
| ١٢ | ئامینە میرابیان | ئاوایی گردەگرۆێ | ١ ڕەقەبە | زەوی کشتوکاڵ |

